# ژنێك لە میسر

جیهان سادات

وەرگێرانی : دیندار حەمۆ

کۆمەڵگای فەرهەنگی
ئەحمەدی خانی
KOMELGEHA FERHENGÎ YA EHMEDÊ XANÎ

کۆمەڵگای فەرهەنگی ئەحمەدێ خانی
KOMELGEHA FERHENGÎ YA EHMEDÊ XANÎ


ناوی کتێب : ژنێک لە میسر

نووسینی: جیهان سادات

وەرگێرانی: دیندار حەمۆ

دیزاینی بەرگ : ڤیان عبدالحکیم

نۆبەتی چاپ: یەکەم

تیراژ : (١٠٠٠) دانە

نرخ : (٩٠٠٠) دینار

چاپ و دابەش کردن: کۆمەڵگای فەرهەنگی ئەحمەدێ خانی

(لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٨٨٢)ی ساڵی ٢٠١٩ی پێدراوە)





کۆمەڵگای فەرهەنگی ئەحمەدێ خانی

سۆران ـ بەرامبەر یاریگا

0751 249 0907

ahmad_khani98@yahoo.com

Ehmedê xanî

ahmade_xani

# پێڕێست


| | |
|---|---|
| بەشی یەکەم: مەرگی هاوسەرم | ٥ |
| بەشی دووەم: سەردەمی منداڵی لەقاهێرە | ٢٨ |
| بەشی سێیەم: پیاوێکی شۆڕشگێڕو کچەقوتابی | ٧٠ |
| بەشی چوارەم: ئازادکردنی میسر | ١١٢ |
| بەشی پێنجەم: سەردەمی جەماڵ عەبدولناسر | ١٤١ |
| بەشی شەشەم: ژیانی لادێی | ١٩٤ |
| بەشی حەوتەم: کارەساتی میسر | ٢٢٦ |
| بەشی هەشتەم: خائینان‌و خیانەت | ٢٧٣ |
| بەشی نۆیەم: خوێنی ئیبراهیم | ٢٩٨ |
| بەشی دەیەم: نووسینگەی خاتوونی یەکەم | ٣٢٧ |
| بەشی یانزدەهەم: ژن لەئیسلامدا | ٣٥٧ |
| بەشی دوانزدەهەم: ڕێگای ئاشتی | ٤٠٣ |
| بەشی سیانزدەهەم: بەناوی خودا | ٤٥٣ |
| بەشی چواردەهەم: خەمێکی بێکۆتایی | ٤٩٢ |
| بەشی پانزدەهەم: وتەی کۆتایی | ٥١١ |

# سوپاس‌و پێزانینم

چەندین ساڵ پێش کەبیرم لەنووسینی کتیبێك لەسەر ژیانی هاوبەشم لەگەڵ هاوسەرم دەکردەوە، بیرم دەکرد کتێبێکی بچووك دەبێت. بەڵام بەسەفەرەکانی زۆرم بۆدەرەوەی میسرو گفتوگۆ لەگەڵ خەڵك، زیاتر ئاگادار دەبووم بیانییەکان زۆر بەهەڵە بیر لەفەرهەنگی میسر دەکەنەوە، زۆر خەڵکی رۆژئاوا تاکو ئێستاش ئێمە بەحوشتر سوارو پشت پەردە دەزانن، وەك چیرۆکی لاورنس لەسعودیا، کەهیچ پەیوەندی بەمیسرەوە نییە.

لەم لایەنەوە باسکردنی مێژووی میسر لەسەردەمی شۆڕشی ١٩٥٢ تاکو سەفەری مێژوویی ئەنوەر بۆقودس لە١٩٧٧، ئاشتی لەگەڵ ئیسرائیل لە١٩٧٧و لەئەنجامدا رووداوی تیرۆرکردنی لە١٩٨١، قەبارەی کتێبی زیاترکرد. ئەم کتێبە پێك دێت لەشرۆڤەکردنی ئایینی ئێمە ئیسلام، نەریتەکانی جۆراوجۆر کەدەوری کاریگەریان لەژیانی ئێمە میسرییەکان‌و کۆمەڵگەی خێزانی بێ بەشان هەیە. کتێب گەورەتربوو لەتوانای بیرم لەباسکردنی هەموو وردەکارییەکان، لەم لایەنەوە ناچاربووم بگەڕێمەوە بۆکتێبەکانی مێژوویی دیار لەسەر میسری ئەمڕۆ، میسری مۆدێرن لەنووسینی پ.ج. واتیکیوتیس، ماموستای زانستەکانی سیاسی لەزانکۆی لەندەن، جان واتر بری، ماموستای زانستەکانی سیاسی لەپەیمانگای وودرو ویڵسۆنی سەربە لەزانکۆی پرینستۆن.

چەندینجار کتێبی هاوڕێم موسا سەبری، سادات حەقیقەت‌و ئەفسانەو دوو کتێبی هاوسەرم، بەدوای ناسنامە، لەبڵاوکراوەکانی١٩٧٧، ئەوانەی کەدەمناسین، لەدوای مەرگی لەساڵی ١٩٨٤ چاپکران خوێندەمەوە. لەناوەندی ژوورەکەم دانیشتم کەپڕبوو لەبەڵگەو رۆژنامەکانی مەقەسکراوو گۆڤارەکانی میسری.

هەڵەچن ئالیس میهیو، لەناوەندی چاپ‌و بڵاوکراوەکانی سایمون‌و شوستر لەتەواوی هەورازو سەراوژێرییەکانی ئەم کتێبە پشتیوان‌و یاوەڕمبوو، دانیل وولف لەلێکۆلینەوەو خوێندنەوەی زۆر هاوکاری کردم. زاوای من، حەسەن مەریعی، لەقاهیرە، دەستنووسی کتێبی خوێندنەوە پێشنیاری زۆر بەنرخی پێشکەش کردن. سوپاسی هەموویان دەکەم.

ئێستا کتێب بەکۆتایی هاتووە. ئەم کتێبە ئیتر پەیوەندی بەمنەوە نییە، کتێبی ئێوەیە. هیوادارم کاتێك خوێندنەوەتان بەکۆتایی هێنا، باشتر لەوارو دیاری جوانی ئێمەتان لەجیهان هەبێت‌و سەردانمان بکەن. میسر بەناسازگاری خیزەلانەکانی بیابان‌و کێڵگەکانی سەوزو بەپیت‌و

بەرەکەتی، کانیو شینایی پڕبەرەکەتی تەنیشت ڕووباری نیل هەموویان لەپەیوەندی لەگەڵ یەکتر لەڕێگای ئیسلام، خاکی شارستانیەتە، لەسەردەمی دێرینو لەجیهانی ئەمڕۆیی. ئەم کتێبە ببێت بەپردێك لەنیوان فەرهەنگی منو ئێوە. ڕێگا بدەین کتێب ئومێدێك بێت. کتێبێك بێت بۆئاشتی.



## بەشی یەکەم

## مەرگی هاوسەرم

ڕۆژی شەشی تشرینی یەکەمی ساڵی١٩٨١یەکێك لەڕۆژەکانی ئەنگوستە ژمێری ڕۆژەکانبوو لەنێوان هەزاران ڕۆژی کەنیگەرانی مەرگی هاوسەرم نەبووم. ڕۆژی شەشی تشرینی یەکەم یەکێك لەڕۆژەکانی پڕ لەشانازی سالوەگەڕەکانی میسر، جەژنی ساڵڕۆژی ساڵی ١٩٧٣ کەسەربازانی ئێمە بۆ وەرگرتنەوەی هەمان خاکی کەئیسرائیل لەئێمەی وەرگرتبوو لەنۆکەندی سوئێز تێپەڕیان کرد. لەم ڕۆژەدا کێشەکانی خێزانیو پێکدادانی مەزهەبیو سیاسیو جیاوازییەکانی چینایەتی لەیاد دەکران. هەموو ساڵێك لەڕۆژی شەشی تشرینی یەکەم. میسر دەبوو یەکدڵو یەکپارچە، بۆهاوسەرم، ئەنوەر سادات. ولاتی ئێمەی لەهەلومەرجێکی سووکایەتی ڕزگار کردو گەیاندنی بەسەردەمی عەدالەت، خەڵك چەپلەیان دەکوتاو هاواریان دەکرد. لەهەمان ڕۆژی تایبەت. ئەوندە لەسەلامەتی گیانی ئەنوەر خەیاڵم ئاسوودەبوو تاکو ڕادەیە لەڕێورەسمی نەریتی سەربازی سوپا لەشاری نەسر، لەداوێنی کێوەکانی قاهیرە نەکرد. لەجیاتی بەشداربوون بەدوعای خێر ئەنوەرم بەڕێکردو بڕیاربوو منو سێ کچم ڕێورەسمی سەربازی ساڵانە لەتەلەفزیون تەماشا بکەینو دواتر پێداچوونەوەیەك بەتێزی دکتۆراکەم لەزانکۆی قاهیرە بکەم کەلەسەر ڕەخنەی شێعربوو. کوڕەکەمان جەمال. سەفەری ئەمەریکای کردبوو.ئایا دەبێت سوپاسگوزاربم. کە ئەفسەری پاسەوانم. لەچرکەساتەکانی کۆتایی، بیرم لەم لایەنە نەکردبوو کەئایا لەگەڵ ئەنوەر سادات بەشداری ئەم ڕێورەسمە بکەم یان نا ئەوەندە

لۆمەیکردم کەبیروڕام گۆڕیی‌و ڕۆیشتم؟ نازانم زۆر پشتراست نیم. تاکو ئەمەنم ماوە دەنگی دەست ڕێژی گولەکان دەبیستم کەگیانی هاوسەرم‌و نۆکەسیتری گرت، دڵۆپەکانی خوێنی ئەنوەر سادات لەسەر کورسییەکانی داری بەسەریکدا کەوتوو لەشوێنی تەماشاکردنی ڕێورەسمی سەربازی دەبینم‌و بەیادهێناوەی نەوەکانی بچوکم کاتێك کەدەست ڕێژی گولەکان شوشەی پەنجەرەکانی سەرەوەی جێگای ئێمەی دەهەڕشاندن‌و لەدیواری چیمەنتۆیی دەچوونەخوارەوە کەلەپشت ئێمەبوو گریانم دێت. پێنج ساڵ درێژەی کێشا تاکو نەوەکانم بتوانن بەبێ بینینی مۆتکەی شەوانە خەو بەچاویاندا بێت، بەلآم خۆم هیچ شەوێکم نەبینی کەخەو بەئاسوودەیی بەچاوەکانم دابێت.

هاوسەرم چەند بەلێهاتوویی بەجلوبەرگەکانی سەربازی کەبۆهەمان ڕێوڕەسمی سەربازی شەشی تشرینی یەکەم داوایکردبوو دەهاتە بەرچاو. لەهەمان ساڵ جلوبەرگی نوێی دەبەرکردبوو، وەك هەموو جلوبەرگەکانی سەربازی زۆر دلگیرو لەشێوەی مۆدێلی یۆنیفۆرمی سەربازی ئەڵمانیا ئامادە کرابوو کەزۆر بەدڵیبوون. سالآنی پێشتر کاتێك من‌و کچەکانم هاوکاریمان دەکرد بۆدەپێکردنی چەکمەکانی بەرزو تەنگ لەسەر نیوشلواری بەردەوام جاڕزمان دەکرد. کاتێك دەمان بینی دەپیکردنی ئەم چەکمانە ئەوەندە زەحمەتە گلەیم دەکرد:((ئایا باشتر نەدەبوو ئەم جلوبەرگانەی سەربازی برێك گەورەتردەبوون؟)) زۆر بەبێ مەیلی خۆی نیشاندەداو دەیگوت:((وای جیهان، تۆسەر لەکاروباری سەربازی دەرناکەیت، قسەی زۆر نەکە.)) بۆئەنوەر سادات خۆدەرخستن لەم ڕۆژەدا گرنگی زۆری هەبوو. هیچ نەبێت بۆپێداگری وەك ئەفسەرێك لەخزمەت سوپای میسر هەستی پێدەکرد، بەدانانی داری ئەفسەرانی بالآ لەژێر ملیەوە ڕازانەوەی تەواوتر دەهاتە بەرچاو، من ئەم شێوازم بەلآوە پەسەند نەبوو. گلەیم دەکرد:((خەڵك بیردەکاتەوە کەتۆ خۆنوێنی، لەکاتێکدا خۆنوێن نیت.)) بەلآم پێداگری دەکرد ((ئەمەیان داری پەروەردەی بەناوبانگ‌و ئەفسەرێکی ڕاستەقینەیە لەخزمەت سوپای میسر))، بەردەوام لەگەڵ خۆیدا دەبرد. جگە لەڕۆژی شەشی تشرینی یەکەم. لەبیری کردبوو؟ لەبەرقسەکانم لەگەڵ خۆی نەبرد؟ هیچ کاتێك نازانین.

لەهەمان شەشی تشرینی یەکەم هەمووشتێك بەجۆرێکیتربوو. سالآنی پێشتر خۆم زووتر ئامادە دەکردو هاوکاری هاوسەرم دەکرد بۆ پۆشینی جلوبەرگەکانی سەربازی. کاتێك ئامادە دەبوو پێکەوە دەڕۆیشتین بۆنهۆمی خوارەوە تاکو گفتوگۆ لەگەڵ جێگری سەرۆککۆمارو وەزیری

بەرگری بکەین. چونکە ئەوان زووتر دەهاتنە ماڵەکەی ئێمە لەجیزە قەراخ رووباری نیل تاکو پێکەوە سەردانی مەیدانی رێورەسمی سەربازی بکەن. کاتێك ئەنوەر ئامادەی رۆیشتنبوو لەقادرمەکان دەهاتەخوارەوە هەموومان پێکەوە چاكو چۆنیمان لەگەڵدا دەکرد. من نەمدەتوانی بەئامادەبوونی بەرپرسانی فەرمی حکومەت گاڵتەی لەگەڵدا بکەم. بەشێوازێکی فەرمیتر پیرۆزبایی ئەم رۆژەم لێدەکرد:((هیوادارم هەموو رۆژێکتان وەك ئەم رۆژە پیرۆزو خودا هەمووتان لەپەنای خۆی بپارێزێت.)) هەموویان پێکەوە بۆ کۆبوونەوەی پێش رێورەسمی سەربازی کەلەوەزارەتی بەرگری بەرێوەدەچوو سواری ئۆتۆمبیلَ دەبوونو من دوای بیست خولەك بەئۆتۆمبیلێکیتر دەگەیشتمە مەیدانی رێورەسم.

بەڵام لەهەمان رۆژی شەشی تشرینی یەکەم بەتایبەت، چونکە لەکۆتایە ساتەکان بڕیاری رۆیشتنمدا، بەپەلەجلوبەرگم گۆڕیو بانگی خانمی تایبەت بەخۆرازاندنەوەم کرد، بۆیە بەهیچ شێوەیەك ئاگاداری دەرچوونی ئەنوەر نەبووم لەماڵەوە. وەك رۆژانیتر بەیانی زوو بەخەبەرم هێنایەوەو رۆژنامەم بۆبرد کەبخوێنێتەوە، چونکە رۆژێکی تایبەتبوو، نەوەی دوو ساڵەمان یاسمین، کچی جەمالم لەسەر تەختی نووستن دانا، ئەنوەر لەهەوڵدانی نەوەکەمان بۆدەرهێنانی سمبێڵەکانی زۆر پێدەکەنی. جارێکیان لەکاتی ریش تاشین نەوەکەمان ئامادە نەبوو ماچی بکات زۆر پێکەنی. نەوەی پێنج ساڵی ئێمە کەناوی شەریفە بەمنی گوت:((جیهان شەریف بەجلوبەرگی سەربازی بۆتەماشاکردنی رێورەسمی سەربازی بێنە، ئێستا گەورەبووە. دەمەوێت تەماشای رێورەسمی سەربازی بکات.))

وەڵامم دایە: ((بێگومان دێنم)).

ئەنوەر لەگەڵ کوڕەکەی خۆمان جەمال لەمنداڵی ئەم جۆرە هەڵسوکەوتەی دەکرد. بەجلوبەرگی سەربازی ئامادەی رێورەسمی سەربازی دەکردو چاوەڕێی دەکرد بە ئامادەبوونی لەم بۆنانەی فەرمی بەرپرسیارەتی پیاوانەی خۆی فێربێت. جەماڵ تەمەنی پێنج ساڵانبوو کاتێك کەسەفەری دەکرد بۆی باسدەکرد:((بەرپرسیارەتی چاودێریکردنی سێ خۆشکی خۆت لەئەستۆ دایە.)) جەماڵ بەردەوام ئەم ئەرکەی بەهەند وەردەگرت. کاتێك خوشکی گەورەی دەیویست لەماڵ بچێتەدەرەوە. بەشێوازی بەرپرسیارانە پرسیاری دەکرد:((لوبنا، بۆکوێی دەچیت؟)) بەبوونی ئەوەی کچەکان نەیاندەویست بەڵام وەڵامیان دەدایەوە.

ئەنوەر دەیویست لەشەریف پیاوێك دروست بكات. بەلأم من نەمدەویست منداڵەكە جلوبەرگی سەربازی كەئەنوەر پێشنیاری كردبوو هاوشێوەی جلوبەرگەكانی بۆئامادە بكریێ دەبەری بكەم. شەریف نەخۆشی هەناسەسواربوونی هەبوو، كەش‌و هەوای گەرم، دەترسام بەجلوبەرگی سەربازی زۆری گەرم بێت بڕیارمدا جلوبەرگی لەبارتری دەبەربكەم‌و دواتر بۆ ئەنوەر روونی بكەمەوە. بەلأم ئەگەر پەلەم نەدەكرد نەمدەتوانی شەریف لەگەڵ خۆم ببەم. بیرەوەری كۆتایی كەلەهاوسەرم بۆم بەجێماوە ئەوكاتەبوو كەلەناو حەمام ڕدێنی دەتاشی، كاتی ئەوەم لەبەردەست نەبوو بۆ بەرێكردنی ئاسایی بڕۆمە نهۆمی خوارەوە. خواحافیزی لەگەڵدا بكەم. نەمتوانی ماچی بكەم. نەم بینی تەنیا لەپەنجەرەی ژووری خەوتن، گوێی بیستی دەنگی ئۆتۆمبێلی بووم كە لەدەروازەی ماڵەكەمان رۆیشتە دەرەوە. ئەوكات بیرم دەكردەوە كێشە نییە. زۆر بەخێرایی لەمەیدانی رێورەسمی سەربازی دەبینم‌و دواتر پێكەوە دەگەڕێینەوە بۆماڵەوەو سالڕۆژی سەركەوتن دەكەین بەجەژن وەك هەموو جاران لەدەرگای ماڵەوە بەهلهلەكێشان پێشوازی لێدەكەین. هەمان هلهلەی كەژنانی میسری بەدەمی خۆیان دروست دەكەن. لەكاتی گەڕانەوەی لەمەراسیم دراوسێكانمان دەهاتنە هەیوانەكانی ماڵەكانیان لەگەڵ من هاوارو شادیی‌و خۆشیان دەكرد كەش‌و هەوایەكی پڕلە هەست‌وخۆشی دەبوو. ئەم بەرنامانە هەموویان بەدڵی من بوون، وێنەكانی خێزانی كەساڵانەی هەمان رۆژ لەناو باخی ماڵەكەی ئێمە دەمانگرتن. لەراستیدا وێنەگر رۆژی پێشتر سەردانی ماڵی ئێمەی كردو وێنەی ئەنوەرو یاسمینی لەناو حەوشەكە دەگرتن. لەیەكێك لەوێنەكان ئەنوەر بەئارامی دانیشتبوو سەرقاڵی خوێندنەوەبوو كەنەوەكانی لەدەوروبەری دەسوڕانەوە. وێنەگر بانگی كردم:((خاتوو سادات، وەر وێنەیەك بگرە.)) بەلأم من دەمویست بۆ كۆبوونەوەیەك بڕۆم‌و گوتم:((سبەینێ،ئێستا ناتوانم.)) من چۆن دەمزانی جگە لەهاوسەرم، وێنەگر لەناو هەمان كوشتارەكە دەكوژرێت.

كاتێك لەگەڵ شەریف خۆمان ئامادە دەكرد بۆمەیدانی رێورەسمی نەمایشی سەربازی، نەوەكانیترم دەستیان بەگریان كرد:((دایە گەورە، دایەگەورە، ئێمەش دەمانەوێت لەگەڵدابین، ئێمەش لەگەڵ خۆت ببە.)) گوتم بۆچی هەموویان لەگەڵ خۆم نەبەم؟ ئەمڕۆ بۆ باپیرو ولأتی ئێمە رۆژێكی زۆرگرنگە. ئەگەر لەشوێنەكە هەستیان بەماندوو بوون كرد لەگەڵ، چاودێرەكانیان بەئۆتۆمبێل ڕەوانەی ماڵەوەیان دەكەم. هەموومان پێكەوە ڕۆیشتین. بێگومان خودا مەبەستی خۆی هەبوو كەئەم ساتە خۆشە بۆ ئەنوەر لەبەرچاو بگرێت. هیچ كاتێك زەردەخەنەی لەكاتی

گەیشتنی بۆجێگای دیاریکراو دەنگی بەرزی هڵهەلەی خەڵکو چەپڵەڕێزانی خەڵکو لەهەمان کات چاوی بەهەرچوار نەوەکەی لەتەنیشت من لەڕێزی سەرەوەی شوێنەکە کەوت، لەیادی ناکەم. روخساری ئارامو تێڕامانی کاتێك دەستی بۆلآی ئێمە بەرزکردەوە، لەناکاو وەك نوری تابان دەدروشایەوە. دکتۆر زەینەب سوبکی، یەکێك لەئەندامانی پەرلەمان، بەنەرمی بەمنی گوت:((چ زەردە خەنەیەك!)) راستی دەکرد. زەردەخەنەیەکی ئاسایی نەبوو. زەردەخەنەی کەسێکبوو خۆشەویستی بۆولآتو بەتایبەتی هەمان رۆژی تایبەت هەبوو، پیاوێکبوو خێزانی خۆی زیاتر لەگیانی خۆشدەویست. ئێستاش، جوانی هەمان زەردەخەنەی کۆتایی بەردەوام لەناو بیروهزرم تێپەڕ دەکەمەوە بەیادی شادی کەلەروخساری دەباری دەکەمەوە.

سوزان موبارك، خێزانی جێگری سەرۆککۆمار حوسنی موبارك کەلەتەنیشتم دانیشتبوو گوتم:((بۆچی ئەمانە دواکەوتن)) یەکێك لەماتۆرەکان کێشەی هەبوو بەلآم جگە لەم لایەنە دواکەوتنێکیتر لەرێگاوە گەیشت.

پێشکەشکار بەدەنگی بەرز دەیگوت:((ئێستاش هێزەکانی پارتیزانو ئازاکانی ئێمە دەبینن.)) دوو سێ خولەکە تێپەڕ دەبن بەلآم هیچ نەمایشێك نەکرا. رێورەسمی هەمان ساڵ وەك ساڵی رابردوو بەرێوە نەدەچوو، ئەوکات لەژێر چاودێری وەزیری بەرگری رابردوو، ئەلجمسی بەرێوە دەچوو. چرکەیەك کات بەفیرۆ نەدەدرا.

نەمتوانی رێگا لەخۆم بگرمو بۆخاتوونی موبارك باسمکرد: ئەمساڵ مەراسیم رێکوپێك نییە.)) بۆچی رەخنە لەشتێك دەگرم کەپەیوەندی بەم خاتوونەوە نییە؟ دەبێت تەنیا قسەی باش بکەمو ئەوەی لەدڵمدایە دەری نەکەم.

دواتر هێزەکانی ئاسمانی بەرێکوپێکی لەئاسمان بەدەر دەکەون، جێتەکان فانتۆم رەنگەکانی جۆراوجۆریان دەردەکرد، چەندینجار رەنگەکانی سوورو شینو سەوزیان وەك راستە هێل لەخۆیان دەردەکرد.

خاتوو موبارك، کەهاوسەری لەتەنیشت ئەنوەر دانیشتبوو یەکێك لەفرۆکەوانەکانی هێزی ئاسمانیبوو، پێدەکەنێتو دەلێت:((ئەمەیان لەهەموویان جوانتربوو.)) من لەگەڵیدا بەهەستێکی خۆش لەگەڵ دەنگی فرۆکەکان پێدەکەنم، هەرچەند نیگەرانی گیانی فرۆکەوانەکانبووم. ئەنوەر چەند تامو چێژی دەبرد. لەپشتەوەی جێگا لەسەرەوە تەماشای خوارەوەم دەکرد کەئەنوەر وەستابوو وەك ئەوانیتر، سەری بەرەو ئاسمانبوو، کولآوی لەپێشەوەی دانابوو.

ئەمەیان چییە؟ بۆچی یەکێك لەئۆتۆمبێلەکانی تۆپخانە لەناکاو رێگای دەگۆڕێت‌و لەبەرامبەر شوێنی ئێمە رادەوەستێت؟ سێ پیاوی چەك بەدەست بەپەلە بەرەو شوێنی دانیشت دێن، لەهەمان کات دەنگی تەقینەوەی رۆمانەیەك دەبیستم بەلاّم لەبەر دەنگی جێتەکان دەنگ وندەبێت. دۆکێلّ بەرز دەبێتەوە. دەستبەجێ تەماشای ئەنوەر دەکەم دەبینم لەشوێنی خۆی وەستاوە وەك دیار داوای لەپاسەوانەکانی دەکرد: ((رێگایان بگرن.)) وێنەی کۆتایی هاوسەرم بوو لەبیرمدایە.

هاوار. گولەکان هەمان شوشەی پێشەوەی ئەنوەر ورد دەکەن کەلەپشتەوە تەماشای رێورەسمی دەکرد. هەڵدەستم بۆنەوەی بەرەو هاوسەرم برۆم، بەلاّم پارێزەرم رێگای گرتم‌و دەلێت:((خاتوون داواتان لێدەکەم لەشوێنی خۆت بمێنەوە.)) بەلاّم دەبێت خۆم گەیاندبا ئەنوەر.

بەپاسەوانەکەم گوت: ((رێگام بەردە.))

بەلاّم پاسەوانەکە هێزی لەمن زیاتربوو من دەخاتە خوارەوە بۆماوەی دوو هەفتە دەستم شین هەڵگەرابوو. لەدەوروبەرم هەمووشتێك تێکەلاّوی یەکتربوو. نەوەکانم دەگریان بەتەقینەوەی رۆمانەیەکیتر بەردەوام دەگریان. دەنگی گولەکان لەگویچکەمان دەزرینگایەوە. بۆچی هەموو کەسێك هاوار دەکات؟

سڕ هاوسەری یەکێك لەوەزیرەکان، لەگەڵ ئێمە هاوڕا لەگەڵ هاوسەری فەرماندەکانی سەربازی‌و بەرپرسانی ولاّت‌و کەسایەتییەکان لەرێزی خوارەوەی ئێمە دانیشتبوون‌و لەرێزۆیەکە قەڵەباڵغی زۆر هەبوو، هاوار دەکەم:((بێدەنگ بن!)) هاوسەری حوسنی موبارك‌و سکرتێری من لەتەنیشت من دانیشتبوون. گوتم:((ئیخوانییەکانن.))

چەندین مانگبوو کەمیسر گیرۆدەی توندوتیژی مەزهەبییە. بۆیەکەمجار لەمێژووی میسر، ناکۆکی لەنێوان توندرەوەکانی مەزهەبی بوون بەهۆکار کەموسلمانان بەرامبەر کەمینەکانی قبتی مەسیحی کەلەکۆنەوە لەمیسر بەجێماون ببنەوە. لەم نێوانەدا کەسانێکی زۆربوون بەقوربانی‌و خوێنێکی زۆر رژا لەناو ئەم شەپۆلاّنەی توندوتیژی کە ئارامی ولاّتی دەخستە مەترسییەوە. ئەنوەر لەئەیلوولی رابردوو ناچاربوو هەندێك کەس بۆماوەیەك بگرێت کەنزیکەی هەزار کەسی توندرەو سیاسی بوون. چونکە بڕیاربوو قۆناخێکیتر لەگەڕاندنەوەی بیابانی سینا، خاکی میسر کەلەسەردەمی شەڕی ١٩٦٧ لەژێر دەستی ئیسرائیل بوو بخرێتە واری

جێبەجێکردن، ئەنوەر نەیدەویست بەهیچ شێوەیەك ئەم هەلومەرجە لەبەر نائارامییەکانی ناوخۆ دوابکەوێت.

کێشەکانی مەزهەبی دژایەتی کەمایەتییەکانی بۆدەسەلاتی ئەنوەر زیاتر دەکرد. موسلمانانی توندڕەو هەندێك لەدەسەلاتدارانی ولاتانی عەرەبی لەبەر ئاشتی نێوان میسرو ئیسرائیل ئەنوەریان بەخائین دەزانی چونکە ئەنوەر بەردەوام هەولێدەداو هیوای بۆ ئاشتیو تەبایی لەنێوان ئایینەکانی مەسیحیو جولەکەو موسلمانان هەبێت بۆیە لەم لایەنەوە بەکافر ناویان دەبرد. بەهۆکاری کرانەوەی سیاسەتی ئابووری میسر بەرووی جیهاندا کەکۆمپانیاکان بتوانن وەبەرهێنان لەمیسر بکەن ئەنوەر بەبووکە شووشەی دەستی رۆژئاوایان دەزانی. توندڕەوانی مەزهەبی منیان بەهۆکاری هاندانی ژنانی موسلمان بۆبەدەستهێنانی مافی خۆیان، لەهەمانکات بەلاوەنانی خۆداپۆشینی ئیسلامی تاوانبار دەکرد. لەهەمان سەردەمی قەیرانوویی، لەهاوینو پاییزی سالی ١٩٨١، زۆرنیگەرانی گیانی هاوسەرم بووم. بوونی توندوتیژی دوو هەفتەی دوایی هەموو رۆژێك پێش دەرچوونی ئەنوەر دوعام بۆدەکردن، تاکو درەنگانی شەو چاوەڕێی مەرگی بووم. هەموو رۆژێك جگە لەهەمان رۆژ نەبێت.

بەردەوام دەنگی تەقە لەمەیدانی ڕێورەسم دەهاتو زۆرجار توندتر دەبوو. ئێمە لەناو ڕێڕۆیەکی بێپەنجەرە بووین نەمان دەتوانی هیچ شتێك ببینین، بەلام بێگومانبووم کە تەقەی کەدەکرێ لەلایەن پاسەوانانی سەرۆککۆماربوو کەدەیانوویست کۆتایی بەئاژاوەگێران بێنن. بەردەوام دەمگوت:((خاتوونەکان ئارامبن.)) جێگای سەرسوڕمانە کەخۆم ئارامبووم. نەدەگریامو نەدەترسام. نیگەرانی گیانی هاوسەرم نەبووم. باوەڕم دەکرد کەهیچ ئازارێکی پێنەگەیشتووە. چونکە ئەنوەر سەربازەکانی بەکوڕی خۆی بانگ دەکردن. لەبەرامبەردا سەربازەکان خۆشەویستییەکی زۆریان بۆفەرماندەی گشتی هێزەکانی سەربازی هەبوو.

هێزەکانی سوپای میسر، لەهێرشێکی لەناکاو لەسالی ١٩٧٣، زۆربەخێرایی گەیشتنە ئەوبەری نۆکەندی سوئێزو هێلی بارلیو، سەنگەرەکانی کەبەرزاییان دەگەیشتە چواردە مەتر، چونکە ئیسرائیل بانگێشەی ئەوەی دەکرد کەئەم سەنگەرەکانە زۆر پتەوەن. تێکشکانی ئیسرائیل بۆیەکەمجار دوای بیستو پێنج سال، سەرکەوتنمان بەسەریدا دوای سێ تێکشکانی بەدوای یەکی زەلیل. ئەنوەر کارێکی کرد سەربەزی دووبارە بۆ سوپای میسر بگەڕێتەوە. لەبەر ئەمەبوو کەسانی سەربازیو ئەوانیتر ئەنوەریان بە ((سەرداری تێپەڕیوون)) ناودەبرد.

بەنەمانی تەقەکردن بالیوزی ئەمەریکا لەمیسر، یەکەم کەسبوو دەمبینی، بانگی دەکەم: ((جەنابی ئاتێرتۆن! جەنابی ئاتێرتۆن!)) ئاگای لەدەنگی من نەبوو. لەهەموو لایەکەوە کورسییەکان بەسەریەکدا کەوتبوون هەندێك کەس بەسەر زەویدا کەوتبوون‌و هەندێك بۆناو ئۆتۆمبێلی فریاکەوتن دەگوازرانەوە. کەسانی سەلامەت لەشوێنی خۆیان هەڵدەستانەوەو ماتو داماوبوون وەك بێهۆشەکان بەسەر پێی وەستابوون. تەماشای شوێنی هاوسەرم دەکەم، بەلام دیارنەبوو. زۆر لەسەرخۆ بەرەو شوێنەکە دەڕۆم. نامەوێت لەم هەلومەرجەدا خۆم بەگرژی نیشانبدەم کەنیگەرانی هاوسەرو ولاتم.

دەمویست خوێنی کەبەسەر جلوبەرگی یەکێك لەپاسەوانەکانی سەرۆککۆمار دیاربوو بەنەبینراوی ببینم گوتم:((سەرۆك سادات لەکوێیە؟))

دەلێت: زۆرباشە خاتوون، خاتوو سادات سوێند دەخۆم من گەیاندم بەکۆپتەر بۆ ئەوەی بگەیێنێت بەنەخۆشخانەی معادی. وەك دیار تەنیا دەستی بریندار بوو.))

بەئارامی بەپاسەوانەکەم گوت:((بابڕۆین بۆنەخوشخانە)) بەلام لەزۆر شتدا بێهەواڵم. ئایا بەرنامەیەك بۆداگیرکردنی ولات لەئارادایە؟ کچەکانم لەماڵەوە سەلامەتن؟ هاوسەرم چی؟ فەوزی عەبدولحافز، سکرتێری هاوسەرم دەبینم، برینەکانی زۆربوون. بەیادم دێتەوە کەلەپشت هاوسەرم دانیشتبوو. بەلام تاکو ئەوکات باوەڕم نەدەکرد کەهیچ شتێك بەسەر هاوسەرم هاتبێت. دەزانم حوسنی موبارەك جێگری سەرۆککۆمار سەلامەتە. تاکو ئەوکات کەخۆمان لەپشت دیوار حەشاردابوو یەکێك لەپاسەوانەکانی حوسنی موبارك هاتوو گوتی خاتوون هاوسەرت سەلامەتە. بەخێرایی نەوەکانم سواری ئۆتۆمبێل دەکەم تاکو بگەین بەکۆپتەرێك لەنزیك کۆشکی قوببە چاوەڕێی ئێمەی دەکرد کەبمان گەیێنن بەنەخوشخانە. منداڵەکان زۆر ترسابوون. لەناو ئۆتۆمبێل هەوڵمدا ئارامیان بکەم. بڕیارمدا کەکۆپتەر لەناو ماڵی ئێمە دابنیشێتەوە تاکو نەوەکانم دابەزنەخوارەوە. دەتوانم رێگایتری نەخۆشخانە بەئۆتۆمبێل بڕۆم. چونکە شوێنی کۆپتەر لەدەرگای نەخۆشخانە زۆر دووربوو دەترسام لەهەمان شوێن هیچ ئۆتۆمبێلێك نەبێت بۆگەیاندنمان بەدەرگای نەخوشخانە. چونکە نێوانی لەگەڵ دەرگای نەخوشخانە زۆربوو کاتەکە بەفیڕۆ دەچوو. بەدوای خاتوونی موبارك دەگەڕێم کەلەگەل خۆم بێت بەلام نەمتوانی بیدۆزمەوە.

دکتۆر سوبکی هاورێی ئازیزم لەتەنیشتم وەستابوو دەلێت:((من لەگەڵت دەمێنمەوە رێگا نادەم بەتەنیا بیت.))

کاتێك دەگەینە نەخوشخانە تێنەدەگەیشتم هەموویان وشکببوونو تەماشای منیان دەکردو هیچ قسەیەکیان لەگەڵدا نەدەکردم. تەواوی دکتۆرو پەرستارەکانی کەلەسەر رێگا وەستابوون دەیان ناسم. کاتێکی زۆرم لەگەڵ ئەمانە لەکاتی بریندارەکانی شەڕی ١٩٦٧و١٩٧٣، پێکەوە لەناونەخوشخانە تێپەڕمان کردبوو.

پیاوێك کەوەك دیار پەریشانبوو بەدوامدا دێتو بەزمانی فەرەنسی پرسیاری حاڵی بالیوزی بەلجیکا جەنابی رۆئێل دەپرسێت. بەلآم کاتێك دەم ناسێت دەلێت:((داوای لێبوردن دەکەم خاتوو سادات.)) بالیوزی فەرەنسابوو. دواتر ئاگادار دەبم باڵیوزی بەلجیکا جەنابی رۆئێل، برینەکانی دژوارن بەلآم بەزیندوویی دەمێنێتەوە.

دواترو زیاتر نیگەرانی هاوسەرم دەبم، چونکە بۆیان باسکردم کەلەژووری نەشتەرگریە. بەرەو ژووری نەشتەرگری دەڕۆم کەبەرپرسانو ئەندامانی خێزانەکەمان چاوەڕێی منیان دەکرد، هیچ کاتێك ئەم رێڕۆیانە ئەوەندە درێژ نەبوون. سوپاس بۆخودا کچەکانم سەلآمەتبوونو چاوەڕێیان دەکرد. دواتر بەبیرم هاتەوە کەلەتەلەفزیون تەماشای رێورەسمیان دەکرد. لەکۆتایدا گەیشتمە پێش دەرگای ژووری نەشتەرگەری کچو زاواکانم بەشێك لەبەرپرسانی حکومەت بەتایبەتی ئەوانی سەلآمەتبوون لەچاوەڕوانی دابوون. برینی کەلەسەر دەستی حوسنی موبارکبوو درمانکرابوو. بێدەنگییەکی زۆر بەسەر ژوورەکەدا زاڵبوو. من بەبێدەنگی دەڕۆم بۆناویان. لەجیاتی قسەکردن چاوەڕێی دکتۆر دەمێنینەوە کەبۆم باس بکات کەنیگەران نەبم، بۆی باس بکەم هەلومەرجی هاوسەرم باشە، بەلآم هیچ کەسێك نەهاتە دەرەوە. کوڕی بیستو پێنج ساڵەم، جەماڵ، لەکالیفۆرنیا پەیوەندی تەلەفۆنی بەزاواکەمان حەسەن مەریعییەوە کرد کەلەرێگای تەلەفزیۆنەوە ئاگاداربووە کەهێرشکرایتە سەر باوکی. تەلەفزیونی ئەمەریکا باس لەبرینداربوونی سادات لەسینگی دەکات، نزیکی دڵی. جەماڵ بۆحەسەن باسدەکات کەبالیوزی میسر لەواشنتۆن فرۆکەیەکی ئامادە کردووە کەبەخێرایی بگەڕێنێتەوە بۆوڵات جەمال بۆحەسەن ئەبوسیدا بالیوزی میسر لەلەندەن تەلەفۆن دەکات تاکو کارئاسانی بکات بتوانێت لەسەر رێگای خۆی دکتۆر مەجدی یەعقوب، شارەزاو پسپۆر لەبواری نەخۆشی دڵ کەخەڵکی میسربوو باوبانگێکی جیهانی هەبوو لەگەڵ خۆی بۆمیسر بێنێت. دکتۆر مەجدی یەعقوب

نەشتەرگەری بۆکەسێکیتر دەکرد بەڵام نەشتەرگەری دەسپێرێتە دکتۆرێکیترو بەهەموو پێداویستییەکانی پێویست دەچێتە فرۆکەخانە.

ئێمە لەنەخوشخانەی معادی، بەردەوام چاوەڕوانین. بەڵام نیوکاتژمێر تێپەڕدەبێت هیچ دکتۆرێك نابینین بێتە ژوورەکەی ئێمە. هەرچەند نەمدەویست راستییەکەی بزانم، بەڵام هەستی پێدەکەم. دەبێت ئەرکی خۆم جێبەجێ بکەم. هەناسەیەکی قوول هەڵدەمژم، روو لەجەنابی حوسنی موبارك دەکەم.

بەئارامی بۆی باسدەکەم:((وەك دیار سادات نەماوە، ئێستا رێبەرایەتی وڵات لەدەستی تۆدایە. جەنابی موبارك، داوا دەکەم، ئاگات لەمیسربێت.)) بەناباوەڕی تەماشای کردم.

دەنگی کەسێك دەبیستم هاوار دەکات:((نەخاتوو سادات نا!)) بەرەو دەنگەکە دەسوورێمەوە ئەنیس مەنسور سەرنووسەری گۆڤاری تشرینی یەکەمبوو، هاورێیەك کەهەموو هەفتەیەك بۆچاوپێکەوتن لەگەڵ ئەنوەر دەهاتە لامان. هیچ وەڵامی نادەمەوە

دەبێت بڕۆمە بۆلای هاوسەرم.

بەتەنیایی بەرەو ژووری نەشتەرگری دەڕۆم کەئەنوەری تێدابوو. کەسێك رێگام لێدەگرێ. لەنیوەی رێگا گەیشتمە دکتۆری سەرپەرشتیاری نەشتەرگەری کە کوڕی لەشەڕی ١٩٦٧ کوژرابوو. بەردەوام لەنەخوشخانە لەتەنیشتی دادەنیشتمو دڵنەوایم دەکرد. پاڵی بەدیوارەوە دابوو بەبێ هاوکاری نەیدەتوانی خۆی رابگرێت. بۆچی بۆرزگارکردنی گیانی هاوسەرم لەژووری نەشتەرگەریدا نییە؟

بەچاوەکانی پڕ لەفرمێسك دەڵێت:(( توانای بینینی ئەوم نییە.))

پێشتر حەقیقەتم قەبوولکردبوو. ئێستاش دەزانم. بۆی باسدەکەم:((ئاگادارم دکتۆر، بۆهەمووشتێك سوپاست دەکەم.))

دەرگای ژووری نەشتەرگەری بەخێرایی زۆر دەکەمەوە. لەکاتی بێ هیوای هیواداربووم. بەڵام هیچ نیشانەیەك لەهیوا نەبوو، ئەنوەر لەسەر تەختێك درێژکرابوو، جلوبەرگی سەربازی دەبەردابوون. دکتۆرەکان بۆئەوەی خوێنی پێبدەن جلەکانیان هەڵدڕاندبوون بەڵام نەیانتوانیبوو هیچ شتێك بکەن. بەرەو لای هاوسەرم بەڕاکردن دەڕۆم، بەگریان خۆم فڕەدایە سەرسینگی. ئەوندە نقرۆی شین گێڕانم ماوەیك پێدەچێت تاکو ئاگاداری دکتۆرو پەرستیاران دەبم کەلەچوار

دەوری ژوورەکەدا وەستاون، هەموویان دەگریان‌و فرمێسکیان دەهاتنەخوارەوە، چاوەکانی ئەنوەر داخرابوون پارچەیەك بۆبەستنی دەمی لەدەوری سەریان ئالاَندبوو.

لەباسکردنی هەمان ساتەکان بێتوانام. بینینی پیاوێك ئەوەندە لەسەرخۆ، بینینی کەسێك کەچەند کاتژمێرێك پێشتر بەپرشەنگی هەزاران مۆم لەروخساری لەگەڵمدا بەزەردەخەنەبوو، بینیی بەبێ جولاَنەوە ئارامی گرتبوو. فرمێسکەکانم بەبێدەنگی دەهاتنەخوارەوە. دەبێت وریابم تاکو ئەوکات کەس بەفەرمی نەدەزانی کەسادات نەماوە تاکو کاتێك کەپشتراست نەبێ ولاَت لەئارامیدا دەبێت، کەسێك نابێت هیچ بزانێت. دەست بەسەر سەریدا دەکێشم‌و دەستەکانی ماچ دەکەم. چۆن دەکرێت مردبێت؟ هیچ برینێك نابینم. تەنیا چەند دڵۆپەخوێنێك لەسەر جلوبەرگەکانیبوو. زۆرم پێخۆشبوو لەخەو هەستێنمەوە، بەلاَم ناتوانم.

لەپشت فرمێسکەکانی خۆمەوە یەکێك لەزاواکانم دەبینم کەدێتەژوورەوە. ئارام دەڵێم: ((حەسەن، منداڵەکانم بێنەژوورەوە.))

سەرپێچی لەقسەکانم دەکات: ((نە، نە!))نایەوێت ئەوەی کەدەبینیت باوەڕ بکات. زۆر توندتر دەڵێم:((حەسەن منداڵەکان بێنە تاکو خواحافیزی لەباوکیان بکەن.))

کچەکانم لەگەڵ هاوسەرەکانیان هاتنەژوورەوە، روخسارو دەستی باوکیان چەندینجار ماچ دەکرد، فرمێسکەکانیان دەکەوتنە سەر جەستەی باوکیان. ئەوان وەك من عاشقی باوکیانبوون نەیاندەتوانی رێگا لەخەم‌و خەمباری خۆیان بگرن. هەموومان پێکەوە ئایەتی باوی موسڵمانەکان بەپێی سوننەت بۆ مردووەکان دەخوێنن: ((اناللەو انااليه راجعون. لااله‌الاالله، محمدا رسول الله. بۆلای خودا ئامادەین بۆلاَی دەگەڕینەوە. هیچ خوایەك جگە لەخوا، کەمحەممەد(د.خ) رەسوڵی ئەوە.))

دوای چەند خولەکێك بەمنداڵەکانم دەڵێم:((بابڕۆین.)) رووله پزیشکەکان دەکەم‌و دەڵێم:((بۆهەموو کارەکانی کەبۆهاوسەری منتان کرد سوپاستان دەکەم، ئێستاش ئەم چاکەی کۆتایی لەگەڵمدا بکەن. نامەوێت هیچ کەسێك سەردانی ئەم ژوورە بکات. نامەوێت هیچ پیاوێك بۆتەماشاکردنی بێتە ژوورەوە، ئارامی هاوسەرم تێك نەدەن.)) سەری خۆیان بەنیشانەی پێداگری لەقسەکانم دەهەژاند.

وەزیرانی کابینە دەبێت بزانن. حوسنی موبارك دەبێت بزانێت. هاوسەرم پانزدە ساڵ سەرۆککۆماری میسربوو. ئێستا ئەم بەرپرسیارەتییە دەکەوێتە سەرشانی حوسنی موبارك.

كاتێك دەگەڕێمەوە بۆژووری چاوەڕوانی، دەڵێم:((جەنابی سەرۆككۆمار، ئەنوەر سادات ڕۆیشتووە. ئیتر زیندوو نییە. ئەمەیان خواستی خوابوو. بەڵام میسر هەرزیندووەو لەمەترسی زۆردایە. ئێستا تۆی دەبێت ڕێبەری ئێمە بەدەستەوە بگریت.)) بەڵام بەبێ جوڵانەوە لەشوێنی خۆی دانیشتبوو. بەردەوام دەبم: ((داواكاری من ئەوەیە تاكو هەست بەهەلومەرجی وڵات نەكەیتو كۆنترۆڵی وڵات بەدەستەوە نەگریت، باكەس هەواڵی نەمانی سادات نەزانێت.))

وەزیرەكان بۆبەستنی كۆبوونەوەی نائاسایی بەدوای یەك ڕۆیشتنە دەرەوە، بەڵام حوسنی موبارك لەشوێنی خۆی دانیشتبوو. یەكێك لەوەزیرەكان دەگەڕێتەوە كەلەگەڵ خۆی ببات، بەڵام وەك دیار ئاگاداری دەنگی نەبوو.

بەموباركم گوت:((تاكو ئێوە نەڕۆن بۆكۆبوونەوە من لەنەخۆشخانە ناڕۆمە دەرەوە. هەرئێستا بڕۆن. ئەركی ئێوە ڕزگاركردنی میسرە.)) دواتر موبارك هەستایە سەرپێی. دەنگوباسەكان زۆر بەربڵاوبوون كەئەنوەر سادات تەنیا دەستی بریندارە، بەڵام لەنەخۆشخانە هەمووكەسێك حەقیقەتی دەزانی. كاتێك لەگەڵ كچەكانم ڕێڕۆیی درێژی نەخۆشخانەمان دەبڕی، دكتۆرەكانو پەرستیارەكان هەندێك لەپاسەوانەكانمان بەدەنگی بەرز دەگریان. بەشاردنەوەی فرمێسكەكانم لەژێر چاویلكە ڕەشەكانم، هەوڵی خۆمدەدا كەبەئارامی خۆم نیشانبدەم، بەڵام كارێكی زۆر دژواربوو. لەسەرپەرستارێك كەباش یەكترمان دەناسی منی لەباوەشگرتو بەبێدەنگی دەگریاین.

خەڵكانێكی زۆر لەدەرەوەی نەخۆشخانە كۆببوونەوە، لەناویاندا ئەندامانی پەرلەمانی تێدابوون. هەموویان وەستابوونو شێوەنیان دەگێڕا. خاتوونی وەزیری كاروباری كۆمەڵایەتی، بەشێوەی دابو نەریتی شێوەی فیرعەونەكان شێوەنی دەگێڕا بۆدەرگای خودا شێوەنو دەست لەسینگی خۆیدەدا. خەمباری بۆمەرگی هاوسەرم زۆربوون. شوفێری تایبەتی من لەرێگای گەڕانەوەمان بۆماڵەوە بەردەوام بەدەنگی بەرز دەگریا. كاتێك گەیشتینە ماڵەوە شێوەنو گریان گەیشتە ئاسمان. خزمەتكارانی ماڵەوە تاكو ئەوكات هەستیان دەكرد كەئەنوەر سادات تەنیا بریندارە، هەستیان دەكرد هەلومەرجی سەرۆككۆمار باشە، بەڵام كاتێك چاویان بەشوفێرو منو منداڵان كەوت، هەستیان بەڕووداوەكە كرد. ئەوكات نەمدەتوانی قسەیان لەگەڵدا بكەم منو كچەكان ڕۆیشتینە نهۆمی سەرەوە لەهەمان ئەیوانی كەئەنوەر بەردەوام دادەنیشتو تەماشای ڕووباری نیلی دەكردو نقرۆی ناوبیركردنەوەكانی دەبوو. ئەوكات دەمتوانی بۆپیاوێك بگریم كەسیو یەك ساڵ هاوسەرم بوو، پیاوێك كەتێڕوانینی بۆ ئاشتیو دیموكراسی بەنرخی گیانی كۆتایی هاتبوو.

دەمتوانی دەنگی گریانو شیوەن لەماڵەوە ببیستم. پرسیاری نەوەکەم جلوبەرگەکانی هەڵدەدڕێنێتو هاوشێوەی خەڵکانی لادێی خۆی بەرزو نزم دەکاتەوەو هاواری دەکرد. داوام لێکرد:((تەواویکە)) دەترسام ئازار بەخۆی بگەیێنێت.

دەنگی تەلەفۆنی ماڵەوە بەرز دەبێتەوە، جەماڵی کوڕم، لەفرۆکەخانەی ئەمەریکابوو دەلێت:((دایە دەڕۆم دکتۆر یەعقوب لەگەڵ خۆم بێنم))

هەناسەیەکی قووڵ هەڵدەمژم. هێڵی تەلەفۆنی کەقسەمان پێدەکرد زۆر ئەمین نەبوو. بەئارامی پێم گوت:((جەماڵ راستەوخۆ وەرە بۆقاهیرە. دکتۆر پێویست ناکات.))

بێدەنگی دڵخرۆشان لەنێوانمان روودەدات لەکۆتایدا دەڵێت:((دەزانم دایە، پەیوەندی بەبالیوزی میسر لەلەندەن دەکەم کەدکتۆری پێویست لەقاهیرە بوونیان هەیە پێویست بەدکتۆر یەعقوب ناکات.))

پرسیاری لێدەکەم :((حالت باشە؟))

دەلێت:((بەڵی دایەگیان دکتۆری بالیوزخانەمان بۆئارامی حەبی والیومی پێداوم.))

بەکوڕەکەم دەڵێم :((ئازابە، هەروەك باوکت دەیویست.))

لەهەمان ساتدا دڵم بەرەو جەماڵ هەڵدەکشا. چونکە زۆر لەباوکی نزیکبوو، زۆرنزیك. باوکی رۆژانە کاتژمێرێك لەناو باخی حەوشەکەمان رێڕەویی دەکرد زۆربەی کاتەکان جەماڵ هاوڕێیەتی دەکرد. ئەنوەر دەیویست جەماڵ لەبەرامبەر وڵاتو خێزانی بەرپرسیاربێتو ئاشنایەتی تەواوی لەگەڵدا هەبێت. لەمیسر، لەناو هەموو خێزانەکان بەچاوی بەرپرسی دووەم تەماشای کوڕی گەورەیان دەکرد. بەرپرسی چاودێریکردنی دایكو خوشکانی بێت. جەماڵ تەنیا کوڕی ئێمەبوو، ئەنوەر کاتێکی زۆری بۆئامادەکردنی تەرخان دەکرد کاتێك کەخۆی نەبێت. ئێستا کاتی دەرکەوتنی جەماڵبوو. بەڵام لەمیسر کەس راستی رووداوەکانی نەدەزانی. لەساتی تەقەکردن لەمەیدانی رێورەسمی سەربازی گواستنەوەی راستەخۆی تەلەفزیون بڕابوو ئەمەیان هۆکاری زیاتربوونی گومانەکانبوو. بانگێشەیان دەکرد کەسەرهەڵدانی شۆڕشێکی گەورە بەرێوەیە. دەنگۆیەك هەبوو کەموسلمانانی توندڕەو هەوڵی خۆیان دەدەن کەدەست بەسەر ناوەندی رادیو بگرنو خەڵك بەناوی خۆبەش ئامادە بکەن. دەنگۆیەکیتر بەربڵاوبوو کەگوایە بکوژەکان هەڵاتوونو زانکۆی ئەسیوت کەناوەندی بناژۆ خوازانبوو دەستی بەسەردا گیراوەو هەرکەسێك ڕێیان ببێت کوژراوە، گومانەکان لەسەر سەرۆککۆمار لەسەر زارەکان دەگەڕا کەهیچ ئازارێکی

پێنەگەیشتووە سەرقاڵی سەرکوتکردنی شۆڕشگێڕەکانە، بەڵام سەرۆککۆمار کوژرابوو. نزیك ڕۆژئاوا ئایەتێك لەسەر شاشەی تەلەفزیۆن دەرکەوت.((خواستی خودایە کەبەئێمە گرێدراوە. پارێزەری ئێمەیەو پشت بەستنی باوەڕداران تەنیا هەر ئەوە.)) خەڵك بەبینینی ئایەتی قورئان هەستیان بەکارەسات کرد، لەشەقامی بەرامبەر ئێمە خەڵك لەیەکتر کۆبوونەوە لەخەمی هێرشکردنە سەر ڕێبەری خۆیان دەستیان بەشێوەنو گریانکرد. دەنگی تەلەفۆنی ماڵەوە بۆساتێك بێدەنگ نەدەبوو، بەڵام خزمەتکارەکان بۆهاوکاریکردنی من وەڵامیان دەدایەوە کە دکتۆر دەرمانی ئارامکەرەوەی بەخاتوو سادات داوە. ڕێگایان نەدا جیمی کارتەری سەرۆککۆماری پێشووی ئەمەریکا، کاریگەری زۆری لەسەر ئاشتی نێوان ئیسرائیلو میسر هەبوو، قسە لەگەڵ من بکات. نەمدەتوانی لەتەلەفۆن نزیك ببمەوە. نەمدەتوانی قسە لەگەڵ خەڵکدا بکەم. منو منداڵەکان زیاتر لەڕادەی خۆی حەپەساو سەرسوڕماو بووین. کاتژمێر هەشتی شەو، حەوت کاتژمێر دوای هێرش کردنە سەر هاوسەرم حوسنی موبارك لەسەر تەلەفزیۆن بەدەرکەوتو هەواڵی مەرگی هاوسەرمی ڕاگەیاند. بەڕوخسارێکی پشت ڕاست گوتی:((خواستی خودابوو کەسادات لەڕۆژێکدا لەدونیا ڕۆیشت هەرخۆی هێمای هەمان ڕۆژبوو، لەنێوان سەربازو دلاوەرانو خەڵکی کەبەسەر بەرزی ئەم ڕۆژەیان کردبوو بەجەژن کەمیللەتی عەرەب بڕوا بەخۆبوونی بۆخۆی گێڕایەوە.)) دواتر گوێبیستی بووم کەرادیوی دەنگی ئەمەریکا کەزۆر لەمیسرییەکان گوێگریبوون، لەکاتی پەخشکردنی مارشی ماتەمینی شوپن ڕادەگرێتو تاکو بەزمانی عەرەبی هەواڵی کۆچی ئەنوەر سادات، سەرۆککۆماری میسری عەرەبی ڕابگەیێنێت.

ئەم چەند کەسانەی سەربازی چۆن توانیان ئەنوەر بکوژن؟ چ کەسێك بەرپرسی نائارامی مەیدانی ڕێوڕەسمی سەربازیبوو؟ جەماڵ لەدرەنگانی شەو گەیشت منو کچەکان هەوڵی خۆماندا کەڕێگا لەفرمێسکەکانی خۆمان بگرینو وەڵامێك بۆئەم پرسیارانە بیدۆزینەوە. وەڵامی هەندێکمان هەبوو. خۆدی ئەنوەر سادات داوای لە پاسەوانەکان کردبوو نەکەونە نێوان خۆییو سوپای. چونکە بیری دەکردەوە لەناو سوپا پێویستی بەپاسەوان نییە، نەمایشی سەربازی پاراستنی ئاسایش بەم شێوەیە نیشانەی لاوازییە. لەم ڕۆژە تایبەتە، پاسەوانانی تایبەتی سەرۆککۆمار لەدوورترین شوێنی سەرۆك لەچاوەڕوانیدا وەستابوون.

بەلأم وەلأمی زۆرمابوون. لەسالەکانی پێشتر هێزێکی شۆرشگێرەکان لەپێشەوەی نەمایشی سەربازی دەرۆیشتن‌و لەنێوان سەرۆککۆمارو هێزەکانیتر جێگیر دەکران. بەلأم لەهەمان سالّ ئەم هێزانە بوونیان نەبوو. لەسالأنی پێشوو کەسانی قەناس بەدەست لەسەر هەموو خانووەکان جێگیر دەکران‌و چاودێری بارودۆخیان دەکرد. بەلأم لەهەمان سالّ هیچ کەسێك لەم قەناس بەدەستانە دیارنەبوون. بڕیاربوو پێش ئەوەی هەموو هێزەکان بگەن بەشوێنی سەرۆککۆمار پشکنین بۆ هەموو هێزەکان بکرێت نەوەك کەسێك تەقەمەنی یان فیشەکی پێی بێت. بەلأم ئەم سیّ کەسە، ئەفسەرێك‌و دوو سەرباز توانیان خۆیان بەتەقەمەنی بەشوێنی هاوسەرم بگەێنن.

ئایا پێی پیلأنێکی گەورەتر لەئارادابوو؟ هەموو کەسانی ئامادەبوو لەم مەیدانەدا بەم شێوەیە بیریان دەکردەوە. کاتێك کەدەنگی رۆمانەو تەقەکردن‌و فرینی فرۆکەکانی جێت لەسەر سەری ئێمە، بۆزۆر لەخەلّك جێگای گومانبوو کەدەیانوویست بۆمبارانمان بکەن. هەموویان خۆیان درێژکردبوو چاوەڕوانی ئەوەبوون کەکارەکەیان تەواوبۆوە. هیچ کەسێك باوەڕی نەدەکرد هێرشکردنە سەر سەرۆککۆماری میسر کاری چەند کەسێك بێت نەك پیلانگێری بەرفراوان.

کاتژمێرەکان تێپەڕدەبوون. لەمیسر هەموویان کەموکورتییەکانیان دەخستە ئەستۆی یەکتر. گاردی تایبەتی سەرۆککۆمار سوپایان تاوانبار کردو بەپێچەوانەش. هەردووکیان پێکەوە پاسەوانە تایبەتەکانی سەرۆکیان تاوانبار دەکردن. بەم شێوەیە دەنگی شێوەن لە شەقامی ئێمە زیاتردەبوو.

گومانەکان فرمێسکەکانی منیان وشك دەکرد. گومان لەهەموو کەسێك. ئایا کەسێکی نەناس لەشوێنەکەبوو کەئێمە نەماندەناسی؟ رۆژی دواتر، کاتێك لەمالّەوە پێشوازیم لەبالیوزەکان دەکرد کەبۆهاودەردی ئێمە سەردانیان دەکردین، سەرۆك وەزیر فوئاد محیبەدین، پەیوەندی کرد تاکو رێگا بدەم بۆبەشێك لەلێکۆلّینەوە گولە لەسینگی ئەنوەر دەربێنن. من رازیبووم، بەلأم بەمەرجێك بەئامادەبوونی من‌و کوڕم جەمالّ. ئەمەیان دەبێتە دەرفەتێك بۆجەمالّ کەخواحافیزی لەباوکی بکات چونکە ئەمەیان خواستی خودابوو کەبەبیّ ئەوەی یەکتر ببینن لەم دونیایە کۆچی کردبوو.

هۆکاری راستەقینەم بۆباس نەکرد. جەمالّ ئەندامی یانەی تیرکەوانەکانی قاهیرەبوو زۆربەی کاتەکان لەگەلّ باوکی دەرۆیشتە نێچیری مراوییەکان. شارەزایی تەواوی لەچەك‌و تەقەمەنی هەبوو دەیتوانی بزانێت هەمان گولەی کەلەسینگی باوکیدابوو گولەی تیروریستەکانە یان

لەچەکیتربوو. یان بەدەمانچە تەقەی لێکراوە. نەماندەزانی ئایا لەپشتەوە لەلایەن موسلمانێکی توندڕەو یان کەسێك لەناو پاسەوانەکان، باوەڕمان بەهیچ کەسێك نەبوو.

پێداگری من لەسەر ئەوەی کەمنو جەماڵ لەپشکنین ئامادە دەبین سەرۆك وەزیری گیرۆدەی سەرسوڕمان کردبوو گوتی:((بینینی ئەم دیمەنە بۆئێوە کارێکی دەردو ژان دەبێت.))

پێداگریم کرد:((بەهەرشێوەیەك بێت من دەبێت ئامادەبم.))

لەرێگای نەخۆشخانە زیاتر لەخۆم نیگەرانی جەماڵ بووم کەدەبێت جەستەی باوکی ببینێت. پشتراست بووم ئەوەندە تەقەکرا دەبێت جەستەی هەڕشابێت. بۆئامادەکردنی جەماڵ بیروباوەڕکانم بۆباسکردن چارەنووس ئەمەبوو کەجەستەی باوکی بمرێت بەلاًم روحی دەچێتە بەهەشت. ئەنوەر کەسێکبوو باوەڕی زۆری بەئاینو مەزهەب هەبوو. لەم دوایانە رووی لەعیرفان کردبوو، رۆژووی (موستەحەب)ی دەگرتن، رۆژانە زیاتر لەپێنجار نوێژی دەکرد. بۆجەماڵی کوڕم باسدەکەم بێگومان روحی دەچێتە بەهەشتو بەرزترین پلە وەردەگرێت.

بەجەماڵم گوت:((ئەوەی دەبینی نابێت ناروحەتان بکات، دەبێت خوشحاڵ بیت کەلە بەهەشتە. من هاوسەرمو تۆش کوڕی تاکو ئێستاش لەم دونیایەداین، ئەمەیان ئەرکی ئێمەیە کەرێز لەجەستەی بگرین نابێت بەتەنیایی پشکنین بۆجەستەی بکەن. ئێمە دەبێت لەگەڵیدابین.))

باسی گومانەکانم بۆکرد. بەدەنگی زۆرنەرم بۆم باسکرد: ((دەبێت زۆر بەوردی تەماشای گولە بکەیت، بزانە لەچ جۆرە چەکێك ئاراستەکراوە تۆ لەم لایەنەوە شارەزای من نازانم. ئەگەر گولە لەچەکی تیرۆریستەکان دەرنەچۆبێت ئەوکات دەزانین کەسانی دەستیان لەم تیرۆرکردنەدا هەیە.))

لەنەخوشخانە نۆرەی سەرپەرشتیاری پشکنین هات کەمن بەزمانێکی نەرم پەشیمان بکاتەوە. گوتی:((ئەمەیان وێناکردنی کۆتایی دەبێت لەهاوسەرتان بۆتان دەمێنێتەوە وەك یادەوەری ئارامیان تێکدەدات.))

بەپێداگری گوتم:((من لەتەنیشت هاوسەرم دەمێنمەوە داواتان لێدەکەم لەم لایەنەوە هیچ پێویست بەگفتوگۆ نییە. ئەگەر ئێمە ئامادە نەبین رێگای بەپشکنینی نادەم.))

بەلاًم لەپێداگری خۆی بەردەوام دەبێت. لەکۆتایدا جەماڵ پەیوەندی بەسەرۆككۆمار حوسنی مبارك کرد. لەوەلاًمدا موبارك رایگەیاند ناتوانم رێگری لەهاوسەری بکەم. داوای لەتیمی پشکنین کرد رێگا بەئامادەبوونی من بدەن. جەستەی ئەنوەر سادات لەساردخانەی نەخۆشخانەیان

دەرهێنا. هەناسە لەسینگمدا تەنگەتاوبوو چۆن دەبوو؟ هیچ کاتێك ئەوەندە ئارامو خوشحالْ نەمدیبوو، زەردەخەنەی لەسەر لێوانبوو. هەموو رۆژێك کاتژمێر نۆیی بەیانی لەخەوم هەڵدەستاند. بەردەوام بەچاوەکانی باگرتوو لەبێخەوی گلەیی دەکرد:((تەنیا دەخولەکیتر دەخەوم)) ئێستا لەم خەوەی کۆتایی باشترو ئارامتر لەهەر رۆژێکیتر دەهاتە بەرچاو. گوایە نورێك لەسەر روخساریبوو ئەگەر چاوەکانی داخراو نەبان چاوەڕێی ئەوەم دەکرد قسەم لەگەڵدا بکات.

جەستەی زۆر سەلامەت دەهاتە بەرچاو گولەکان پارچە پارچەیان نەکردبوو. بەپێچەوانە، کاتێك کرایەوە تەنیا سێ کونی زۆر بچوك لەجەستەیدابوون یەکێك لەپێیو دوویان بەسینگی کەوتبوون، دروست تەنیشت دڵی. زیاتر لەوەی برینەکانی گەورەبن زۆربچوکبوونو شوێنیان شین هەڵگرابوون زۆر بچوك بەومانایی کەبتوانن پیاوێکی وەك ئەنوەر بخاتەخوارەوە. ئەوەندە زیندوو دەهاتەبەرچاو دەستم بۆبرد بەڵام کاتێك دەستم گەیشتە جەستەی بستراوبوو... هیچ نیشانەیەك لەژیان نەبوو. بۆجاری کۆتایی نیوچاوانم ماچکرد. وەك سهۆڵبوو.

جەمالْ نەیدەتوانی رێی لەفرمێسکەکانی بگرێت. بەڵام دواتر فرمێسکەکانی سڕینەوە لەتەنیشت دکتۆر راوەستا دکتۆر یەکێك لەگولەکانی دەرهێناو جەمالْ تەماشای کرد هەمان گولەبوو کەلەچەکی تیرۆریستان تەقەی پێکرابوو. هیچ کەسێك تەقەی لەهاوسەرم نەکردبوو.

رووم لەجەمالْ کردو گوتم:((ئێستا دەتوانین بڕۆین.)) کاتێك پزیشکان سەرقاڵی کۆتایی کاری خۆیانبوون ئێمەش گەیشتینە ماڵەوە.

ـوای تیرۆری هاوسەرم لەمیسر حکومەتی سەربازیان راگەیاند. کاتژمێرەکانی هاتووچۆ ـیریکران. سوپا هەزاران توندڕەویی دەستەسەرکردن پشکنین بۆماڵەکانیان دەکرا جگەلە ـۆزینەوەی ئەنبارەکانی چەك نەخشەی کودەتا بەوردەکارییەکانی دەستکەوت. بۆچی پۆلیسی ـهێنی ئێمە پێشتر ئاگاداری نەبوون؟

ـابەرپرسیارەتیو بێئاگای گیانی هاوسەرمی بەبادا. وردنەبوونەوە هاوسەرمی کوشت. ـوەربوونی خۆدی ئەنوەر بەهێزەکانی چەکدار، بەباوەڕێك کەتوند ئاژۆکانی مەزهەبی ناتوانن جێگای خۆیان لەناو هێزی سەربازی بکەنەوە، بوون بەهۆکاری مەرگی هاوسەرم، هەمووماں وەستابووینو تەماشامان دەکرد کەچۆن سەربازانی خۆی بەرەو رووی هاتنو تەقەیان لێدەکرد، قسەی کۆتایی بۆحوسنی موبارك ئەوەبوو:((باوەڕ ناکەم.))

ئەنوەر سادات لەئارامگایەکی شێوەی هەرمی بچوك بەخاکیان سپارد، لەوبەری مەیدان ڕێورەسمی سەربازی لەشاروچەی نەسر لەشوێنەك کەکوژرابوو. ئەمەیان بڕیاری من بوو نەك خۆی. بۆشوێنی بەخاکسپاردنی گفتوگۆی زۆرمانکرد. بەتایبەتی لەمانگەکانی کۆتایی ژیانی من بۆئەوەی ئەم بابەتە بەگرنگ وەرنەگیرێتو باس لەمەرگی نەکرێ بەلآم خۆی پێداگربوو کەدەگاتە هیوایەتی خۆی دەیویست لەگوندی خۆشەویستی سەردەمی منداڵی،(میت ئەبوئەلکۆم) لەدڵتای ڕووباری نیل بەخاك بسپێرن. زۆرجار لەم لایەنەوە بەگاڵتە بەم ئەنوەرم دەگوت:((وای ئەنوەر ئەگەر منو منداڵەکان بۆبینی تۆ سەردانی ئەم شوێنە بکەین کاتژمێرێكو نیو کاتی دەوێت.))

بەلآم بابەتەکەی نەدەگۆڕی. چەندینجار لەکاتی پیادەڕەویی لەناو باخی ماڵەکەمان بۆی باسدەکردم:((ئەگەر میت ئەبوئەلکۆم نەبوو، لەژێر کێوی سینا، لەتەنیشت پەرستگەی سنت کاترین، شوێنەك کەدەمەوێت مزگەوتێكو کنیسەیەك دروست بکەم. ئەگەر من لەم شوێنە بەخاك بسپێرن خەڵك تێدەگات هەموو ئاینەکان یەکنو خودای هەموومان یەکە...))

بەراستی بیرۆکەیەکی جوانبوو. گەورەترین هیوای ئەنوەر ئەمەبوو موسڵمانو جولەکەو مەسیحی بەئاشتی پێکەوە بژین. کێوی سینا بۆهەموومان گرنگبوو. پیغەمبەر موسا (د.خ) لەکێوی سینا دەفەرمانی لەخودا پێگەیشتنو ئاگری توری بینی، پێغەمبەر عیسا(د.خ) لەکاتی هەلآتنی لەدەستی شا هرود لەفەلەستین لەبیابانی سینا تێپەڕیکرد.

ئاشتنی لەژێر کێوی سینا بۆئەنوەر هێمابوو: ژیانی خۆی بۆگەڕاندنەوەی ئەم ناوچەیە کرد کەئیسرائیل لەسەردەمی ناسر، لەئێمەی وەرگرتبوو. جێی سەرسوڕمانە کەهاوسەرم بەدروستکردنی ئاشتی لەم ڕێگایە سەرکەوتو ئەمەش لەکۆتایی فەرمانی مردنیان لەسەر ئەم لایەنە بۆدەرکرد. بەلێ ڕاستە بەخاکسپاردنی شوێنێکی زۆرباشبوو، بەلآم دیسان دەمویست بەگاڵتەکردن بیری لەسەر مەرگو شوێنی ناشتنی لابدەم. ئەگەر هاتن بۆمیت ئەبوئەلکۆم ئەوەندە ئاسان نەبێت بۆداوێنی کێوی سینا دژوارتر دەبێت. بەگلەیی گوتم:((بۆهاتنمان بۆهەمان شوێن دەبێت بەفڕۆکە بینو بەشێکیش بەئۆتۆمبێل لەوانەیە تەنیا بتوانین سالی جارێك دووجار سەردانت بکەین. باشتر وایە لە میت ئەبوئەلکۆم بەخاکتان بسپێرین.))

بەلآم ئێستا گاڵتەکردن بوونی نەبوو. پێش بینییەکانی ئەنوەر گەیشتبوونو کاتێك سەرۆککۆمار حوسنی موبارك پرسیاری لەمن کرد لەچ شوێنێك ئەنوەر بەخاك بسپێرین بڕیارمدا هیواکانی

ئەنوەر بەهەند وەرنەگیرێن. چونکە بیرم دەکردەوە کەسێکی ئاسایی نەبوو، پیاوێکی گەورەبوو. بۆچی دەبێت لەشوێنێك بەخاك بسپێرن کەدیداری گڵکۆی ئەوەندە دژواربێت؟ بۆچی لەهەمان شوێن بەخاك نەسپێرین کەتیرۆرکرا. لەشوێنێکی سەربازی کەشانازی پێدەکرد؟ هەمووسالێك کاتێك بۆداگیرساندنی ئاگری سەربازی ون دەرۆیشت، بەبیستنی مارشی جوانی سەربازی کەلەشەشی تشرینی یەکەم دەستی پێدەکردو تەماشای رێورەسمی سەربازەکانی دەکرد کەدلێرانە خزمەتی میسریان کردبوو، تامو خۆشی لێوەردەگرت. بەخاك سپاردنی لەهەمان شوێن هەموو کەسێك بیری بۆخزمەتکردنی دەگەڕایەوە کەبۆئەم وڵاتە ئەنجامی دابوون. هەموو سالێك لەرێورەسمی سەربازی شەشی تشرینی یەکەم تەواوی سەربازو ئەفسەران، لەکاتی تێپەڕبوون لەئارامگەی، دەزانن کەئەنوەر سادات لەتەنیشتیانە سڵاوی سەربازی بۆدەکەن.

ئەوکات نەمدەزانی کەحوسنی موبارك، بەدروستی بۆخۆپاراستن لەهەمان هەلومەرجی مەترسیدار وەك رابردوو بۆنەی شەشی تشرینی یەکەم هەڵدەوەشێنێتەوە.نەمدەزانی دوای دووسالیتر حوسنی موبارك رۆژی فەرمی مەرگی سادات دەکاتە پێنجی تشرینی یەکەمو رۆژی شەشی تشرینی یەکەم دەکاتە جەژنی سەرکەوتن بەسەر ئیسرائیلدا. بێگومان ئەنوەر بەئەمەیان رازی نەبوو. هەمووکاتێك دەیویست خێرو شەڕ پێکەوە ئەزموون بکات. رۆژی پێنجی حوزەیران بۆجەژنی کرانەوەی نۆکەندی سوئیز لەساڵی ١٩٧٥ هەڵبژارد چونکە رۆژی تێکشکانی ئێمەبوو بەدەستی ئیسرائیل لەشەڕی شەش رۆژەی ساڵی ١٩٦٧، بەم کارانەی رۆژی شەرمەزاری نیشتیمانی بەجەژنی نیشتیمانی گۆڕیی.

بەڵام حوسنی موبارك بیری لەم جۆرە لێکدانەوانەی ئاشکرا نەدەکرد. داوام لەموبارك کرد:((داوادەکەم سادات گرێدراوە بەشەشی تشرینی یەکەم. ناتوانی ئەم رۆژە لەسادات وەربگریت.)) بەڵام دوای دووساڵ وەڵامی دایەوە دەترسێت لەهەمان رۆژی جەژن کەرۆژی کوژرانی هاوسەرتبوو ببێتە هۆی خەمو خەفەتی زیاتری ئێوە. زۆر بەئارامی بۆم باسدەکرد:((من خەمی شتێکیترم هەیە.)) دەبێت لەکۆتایدا باوەڕی بەقسەکانی من کردبێت، چونکە ئێستا رۆژی شەشی تشرینی یەکەم رۆژێکی تاڵو شیرینەو جەژنو خەماوییە. لەهەرشوێنێکی جیهانبم. لەم رۆژە بۆرێزگرتن لەهاوسەرمو گەیشتن بەگڵکۆی لەقاهیرە دەگەڕێمەوە.

لەرۆژی بەخاکسپاردنی لەهەمان شوێنو هەمان کورسی دانیشتم کە ئەنوەر دانیشتبوو. هەستم دەکرد لەمەراسیمێك دانیشتووم نازانم چ لایەنێکی حەقیقەتو چ لایەنێکی خەیاڵییە. بەردەوام لەگەڵمدا دەمگوت لەسەر ئەم کورسییە تەقەی لێکرا، دوو سێ رۆژ پێشبوو زۆربەهێزو باوەڕەوە، بەخۆشەویستییەکی ڕادەبەدەر بۆ وڵات، ئێستا دووبارە گەڕایەوە، ئەمجارەیان تەنیا جەستەی. دوای دوو سێ رۆژیتر هەموو ژیانمان بەجارێك دەگۆڕێت.
ژمارەی کەسانێك کەبۆناشتنی هاتبوونە سەرشەقامەکانی قاهیرە زۆر کەمبوون. چونکە دوای کوژرانی هاوسەرم کۆبوونەوەی پێنج کەس زیاتر قەدەخەکرابوو. خەڵك دەیانوویست لەرێگای تەلەفزیۆن تەماشای مەراسیمی ناشتنی بکەن. پێش دەستپێکی مەراسیم فیلمێك لەسەر ژیانی نیشاندرا: ئەنوەر بەبوونی مەترسی شەڕی ١٩٧٣ دەچێتە بەرەکانی شەڕ، ئەنوەر لەمزگەوتی ئەقسا لەلەماڵی پیرۆز لەساڵی ١٩٧٧، بەسەردانێکی ئازایانە بۆئاشتی لەگەڵ ئیسرائیل نوێژ دەکات، ئەنوەر لەپەرلەمانی ئیسرائیل وتارێك پێشکەش دەکات. هاوسەرم قوربانی شەڕ نەبوو قوربانی ئاشتیبوو.
لەمیسر بەپێی دابو نەریت تەنیا پیاوەکان هاوڕێیەتی مردوو دەکەن. لەنیویاندا جیمی کارتەر، ریچارد نیکسۆنو جراڵد فۆرد، سەرۆککۆمارەکانی پێشووی ئەمەریکا، شازادە چارلز لەبریتانیا، بۆدۆێن پاشای بەلجیکا، گراندۆك جان لەلۆکزامبۆرگ، راوێژکاری ئەڵمانیا هەلموت ئەشمیت، سەرۆککۆماری فەرەنسا فەرانسۆ میتران، سەرۆککۆماری پێشووی فەرەنسا والری ژیسکار دستن، رێبەرانی یەکێتیی سۆڤیەتو ئەفریقیا ئامادەبوون. سەدان کەسایەتی گەورەی بیانی بۆرێزگرتن لەهاوسەرم ئامادە بوون، ئەوەی لەهەموویان جێگای باسو گفتوگۆی زیاتربوو سەرۆك وەزیر بگین لەئیسرائیل. هاوڕێی خۆشەویستم فەرەح دیبا، مەلیکەی پێشووی ئێران، وەك رۆزالین کارتەر، بالیوزی ئەمەریکا لەنەتەوەیەکگرتووەکان، جین کیرك پاتریك، بۆتانیا نۆمیری، هاوسەری سەرۆککۆماری سودان، لەشوێنەکە گەیشتنە لام.
زۆر خەمبار دەبووم لەوەی کەدەمبینی جگە لەنۆمیری، سەرۆککۆماری سودان، زیاد بارە، سۆرککۆماری سومالی، هیچ یەکێك لەسەرانی عەرەب بۆرێزگرتن لەبرای شەهیدیان نەهاتبوون. کاتێك کەئەنوەر توانی لەگەڵ ئیسرائیل بکەوێتە گفتوگۆی ئاشتیو توانی سەربکەوێ نێوان میسرو وڵاتانی عەرەب ناکۆکی دروستبوو. دوای واژۆ کردنی پەیمانی ئاشتی کەمپ دیوید، تەواوی وڵاتانی عەرەبی، کۆماریو پاشایەتی، جگە لەسودانو عومانو سومالی، پەیوەندی

سیاسی خۆیان لەگەڵ میسر بڕین. بەڵام ئیسلام دەڵێت هەمووکێشەکانی ئەم دونیایە دوای مەرگ کۆتایی دێن. ئەرکی رێبەرانی عەرەب و موسڵمانی راستەقینە، رێزگرتن لەیەکێك لە مردووەکانی خۆیانبوو. بەڵام ئەم ئەرکەیان جێبەجێ نەکرد. دواتر هۆکارم لەزۆر سەرانی عەرەب دەپرسی یەکێك لەوەڵامەکان ئەوەبوو:((چونکە بگین ئامادەبوو من بەشداریم لەپرسەکدا نەدەکرد کە سەرۆکوەزیری ئیسرائیلی تێدابێت.)) بەڵام من دەمزانی ئەمەیان تەنیا بیانوویەکبوو. نەبوونیان منیان ئازاردا.

ماتۆرەکانی پێشەوەی جەستەی ئەنوەر سادات نزیك دەبوونەوە ئۆتۆمبێلی پۆلیس لەپێشەوەی کاڵیسکەی ئەنوەر دابوو کەبەئەسپ رادەکێشرا، ئۆتۆمبێلێك لەپشتەوە، دوو ماتۆر سوار لەتەنیشتەکانی دەهاتن. بەناباوەڕی سەر دەهەژێنم. لەگەڵ منداڵەکانم بۆئەوەبەری شەقام بەرەو ئارامگەی دەڕۆم تاکو بگەم بەسەرۆککۆمار موبارك‌و نۆمیری. تابوتی ئەنوەر بەئاڵای میسر داپۆشرابوو. دەستی لەسەرسینگبوو، جەستەی بەبوونێکی خۆش شوڕابوو لەناو حەوت دانە پارچەی کەفن پێچرابوو. حەسەن مەریعی، زاوام، تەلعەت، برای ئەنوەر لەکاتی شوشتنی جەستەی ئەنوەر ئامادەبوون. بەڵام جەماڵ لەبەر خەم‌و خەفەت نەیتوانیبوو بمێنێتەوە.

لەکاتی تابۆت دەخرایە ناو گۆڕی ناتوانم رێگا لەگریانم بگرم. تاکو ڕادەیەك دەموویست خۆراگریم، دەبینم کەجەماڵ‌و زاوام‌و براکانی ئەنوەر لەناو گۆڕی ئەنوەردان تاکو ئەرکی کۆتایی بۆ ئەنوەر جێبەجێ بکەن‌و بۆجاری کۆتایی خواحافیزی بکەن. چونکە من ئافرەتبووم بەپێی نەریتەکان رێگا بەمن نەدرا لەگەڵ جەستەی ئەنوەر تاکو ناگوڕی بڕۆم، بەڵام دەمزانی چی تێپەڕ دەبێت. پارچەکانی سەر روخساری لادەبران‌و رووی لەقیبلە دەکرا چەند ئایەتێك لەقورئان دەخوێندرانەوە:((خودای تۆکێیە؟ ((الله.)) ((ئایینت چییە؟)) ((ئیسلام.)) ((پێغەمبەرت کێیە؟)) ((محەممەد)) جەماڵ‌و ئەوانیتر بۆئەنوەریان دووبارە دەکردەوە کەدەبێت وەڵامی فریشتەکان بداتەوە تاکو بتوانێت بچێتە بەهەشت. لەخاکەوە هاتووین بۆخاك دەگەڕینەوە. مارشی سەربازی تایبەت بەمردووەکان دەست پێدەکات کەلەلایەن ئۆرکیسترای سەربازی پێشکەش دەکراو ئاڵای وڵات لەسەر تابۆتی ئەنوەر هەڵگیراو پیاوەکان دێنەدەرەوە گۆڕەکەی بەخاك دادەپۆشن. ئەنوەر بەتەواوی بوونی خۆی عاشقی ئاڵاو وڵاتی خۆی میسربوو.

ئەنوەر! ئایا ئەمەیان حەقیقەتە؟ دوای بەخاکسپاردن خۆم لەسەرتەختی ئەنوەر درێژ دەکەم. لەناکاو لەتەنیشت خۆم هەستی پێدەکەم، بەخەوتوو لەتەنیشت خۆم دەبینم. ئایا ئەمەیان خەونێکبوو؟ نا. هوشیارم. خۆیبوو لێرەیە. لەتەنیشتم. روو لەمن دەکات. چاوەکانی دەکاتەوەو زەردە خەنە دەکات. هێزی جوولآنەوەم نامێنێت، دوعا دەکەم کەدووبارە نەڕۆت. لەناوگۆڕدایە دەستی بۆدرێژ دەکەم زەردەخنەی لەسەر لێوانبوو دواتر رویشتووە.

دەنگی جەمالَ دەبیستم، هاوار دەکات:((دایە باوکم لەژوورەکەی من بوو. قسەی لەگەلَ دەکردم.)) بەبینینی جەمالَ چاوەکانی لەسەرسوڕمان کراوتربوون، فرمێسك لەچاوەکانم کۆدەبنەوە. ((لەسەر تەختی خۆم شتێکم دەخوێندەوە جارێکیان دەنگم بیست دەیگوت: جەمالَ من خوشحالَم لەئارامیدا بەسەر دەبەم، بۆدایك‌و خوشکەکانت باس بکە نیگەرانی من نەبن، هەلومەرجم زۆرباشە، لەتەختی نووستن خۆم فڕەدایە خوارەوە تاکو بەدوایدا بڕۆم، بۆهەموو ژوورێك رۆیشتم بەلآم نەمبینی.)) چل رۆژ دوای مەرگی هاوسەرم بۆبەرێوەچوونی چلەی ماتەمینی لەتەنیشت گۆڕی. زیاتر لەپەنجا کەس لەخزمانی ئەنوەر ئامادەبوون، براو خوشکەکانی، خوارزاو برازاکانی، سێ کچی لەهاوسەری یەکەمی. کاتێك شێخی ئایینی چەند ئایەتێکی لەقورئان دەخوێندنەوە، من‌و مندالَەکان دەستمان بەگریانکرد. نەمدەتوانی ئەوەی کەسکرتێری ئەنوەر فەوزی عەبدولحافز پێشتر بۆی باسکردم لەبیرم دەرکەم. خۆشی یەکێکبوو لەبریندارەکانی رووداوەکەو کەوتبوو تەنیشت ئەنوەر ئەنوەر سەری بەرزدەکاتەوەو تەماشای هەمان شوێن دەکات کەئێمە دانیشتبووین. هاوسەرم نەیتوانیبوو هیچ قسەیەك بکات دەیزانی دەمرێ. بەلآم بەنیگاکانی قسەی خۆیکردبوو، چاوی بەهاورێی وەفاداری کەوتبوو ئەم نیگایەیی بۆ ئەوەبوو:((چاوت لەخێزانەکەی من بێت فەوزی چاودێریان بکە.))

فەوزی یەکێك لەوەفادارترین هاورێیانی مایەوە بەردەوام سەردانی دەکردین‌و پێکەوە دەگریان. ئێستا من بەتەنیا سەردانی مەزاری ئەنوەر دەکەم، رادەوەستم‌و قورئانی بۆدەخوێنم. هەمووکات کەسەردانی گلَکۆی دەکەم، بەیانیان، ئێواران‌و زۆرجار شەوان کەخەو بەچاوەکانمدا نەدەهات، هەمووکاتێك خەلَکانێکم لەشوێنەکە دەبینین، پێیان راگەیاندم دوای ئەهرامەکان‌و پیکەری (ابوالهول) گلَکۆی ئەنوەر لەسێیەم ئەم شوێنانەیە کەخەلَك بەردەوام سەردانی دەکەن. ئێستاش هەرکاتێك کەبیر لەهاوسەرم دەکەمەوە فرمێسك لەچاوەکانم دێنەخوارەوە. بەلآم لەهەمان دەستپێك دەمزانی دەبێت مەرگی قبوولَ بکەم‌و بەردەوامی بەژیان بدەم.

لەبەرخێزانەکەمان دەبێت ئازایانە روبەرووی نەبوونی ببمەوە، لەبەر میسر. فێربوونی ژیان بەم هەموو خەم‌و پەریشانییە ئاسان نەبوو. دوای سی‌و یەك ساڵ ژیانی هاوبەش بەهەمان ڕادە کەخۆشم دەویست خۆشەویستی بۆمن هەبوو زۆر ئاسان نەبوو. ئێمە وەك هاوسەرانی ئاسایی نەبووین، دووهاوڕێی‌و دووکەسبووین کەیەکترمان تەواو دەکرد. بەتەواوی لەیەکتر تێدەگەیشتین لەهەموولایەنەکەوە رێزمان بۆیەکتر هەبوو. ئەنوەر هێزی من‌و منیش نوریبووم. لەدەست رۆیشتنی بۆمن زۆر دژواربوو.

ئێستا هەوڵی خۆمدەدەم کەچیتر نەگریم. لەجیاتی گریان، دەمەوێ بزانم کەدەیویست چۆن بژیم. ئەگەر منی بەماتەم دەبینی شادو گەشاوە دەبوو. منی بەژنێکی تێکۆشەر دەزانی‌و شانازی بەمنەوە دەکرد. ئێستاش دەبێت بەهەمان شێوەبم کەدەیویست‌و ئارزویی دەکردو بەردەوامی پێی بدەم. هەمووکاتێك چاوەڕوانییەکانی لەبیرمدان هەرکاتێك هەستمکرد خەم‌و لاوازی رووم تێدەکەن‌و بەسەرمدا زاڵدەبن، دەستبەجێ لەگەڵ خۆم دەڵێم: بەم شێوەیە نابێت، سادات نایەوێ تۆبەم شێوەیە بیت، ئەنوەر دەیویست بەردەوام بەهێز ببینێت. لەبەرئەم جۆرە وێناکردنانە کەبەردوام لەبیرمدان بەردوامی بەرێگای خۆمداوە بەسەر کێشەکانی خۆم سەردەکەوم، بەبوونی تەواوی لایەنەکانی کەدەبینم.



## بەشی دووەم
## سەردەمی منداڵی لەقاهیرە

تاکو تەمەنی پانزدە ساڵی نەمدەزانی ناوم جیهانە، ناوێکی ئێرانی بەهەڵبژاردەی باوکم بەمانای (دونیا). دایکم، ئینگلیزبوو، منی بەجین بانگ دەکرد. باوکم فەرمانبەری وەزارەتی تەندروستیبوو، مامۆستاکانم لەقوتابخانە پیاوانی مەسیحی بوونو هاورێیانم بەهەمان ناوی دایکم بانگیان دەکردم. بەباوەڕی منو هاورێیانم لەقوتابخانە جێگای سەرسوڕمان نەبوو کەناوێکی رۆژئاوایم لەسەر بێت. هەندێك هاورێم هەبوون ناویان می میو فی فی، یان هێلێنو بتی بوو. لەسەد ساڵی رابردوو کاتێك محەممەد عەلی پاشا، پاشای میسر دەرگای وڵاتی بەسەر بیانییەکان کردەوە، میسرییەکان دابونەریتی ئەورپا ستایش دەکەن باوەڕیان دەکرد کەئەورپییەکان زۆر لەئێمە پێشکەوتوترن. بەڵام جێگای سەرسوڕمان ئەوەبوو کاتێك ئەنجامی تاقیکردنەوەکانی سەرەتایی خۆم وەرگرتنو دەچووم بۆقۆناغی ناوەندی، ناوی راستەقینەی خۆم نەدەزانی. کاتێك ئەنجامی تاقیکردنەوەکانم وەرگرت جگە لەناونیشانم ئەم ناوە نووسراوە، پرسیارم لەمامۆستام کرد:((جیهان کێیە؟))

گوتی:((تۆی.))

بەراکردن بۆماڵ گەڕامەوە پرسیارم لەدایکم کرد:((ناوی من چییە؟)) گوتی:((لەئێستا بەدواوە لەقوتابخانە ناوت جیهانە، لەماڵەوە جین.)) تاکو ئێستاش خوشكو براکانم بەجین ناوم دێنن.

من لەناو دوورگەی روزە لەدایکبووم، یەکێك لەدوو دوورگەکانی ناو رووباری نیل کەلەرێگای بەرزە پەردێك لەرۆژهەڵات بەقاهیرە گرێدراوە لەرۆژئاوا بەجیزە. دوورگەی روزە ناوچەیەکی زۆرجوانبوو، پڕ لەباخو خانووەکانی هاوین هەواری زۆرجوان بەبەردی سووری کاڵو دانیشتوانی لەخەڵکانی مام ناوەندنی میسر بەهەژمار دەهاتن، دوورگەی تەنیشتی بەناوی زقاریق ناوچەیەکی دەرەبەگی کەزیاتر خێزانەکانی ئەم ناوچەیە ئینگلیزیی‌و میسرییەکانی چینی سەرتربوون. دوورگەی زقایق خاوەن یانەی وەرزشی جۆراوجۆری وەك کرکێت، چۆگانو تێنسو مەلەوانگەو یانەی شەوانەی بەناوبانگبوو بەخواردنەوەکانی کحوولی پێشوازی لەمیوانەکان دەکرا. بەڵام خێزانەکەی من ئەندامی ئەم جۆرە یانەیانەی شەوانە نەبوون. لەمنداڵی بیرم دەکردەوە ئەم شوێنانە تەنیا گرێدراوە بەکەسانیتر، زۆر لەمیسرییەکان بەم شێوەیە بیریان دەکردەوە. پاشای میسر، مەلیك فارۆق وەك زۆر لەخێزانەکانی بیانی، ئەندامی ئەم شوێنانەبوون، بەڵام ئەندامی میسرییەکان لەسەر بنەمای بەش بەشێن بوو. من سێیەم منداڵ لەخێزانێکی چوار منداڵیبووم من کچی گەورەبووم جیاوازی تەمەنم لەگەڵ براکانم زۆربوو. مجدی دەساڵ لەمن گەورەتربوو، عەلی حەوت ساڵ. بۆیان باسدەکردم کەدایکم هیوایەتی بووە کچی هەبێت. کچێك شانە لەمووەکانی بداتو جلوبەرگەکانی بەگول بینەخشێنێت لەدایکبوونم دەبێتە هۆکارێك کەبکرێتە جەژنو هاوکاتبوو لەگەڵ زیادبوونی مووچەی باوکم. لەهەمان دەستپێك دایكو باوکم منیان پێی بەخێر دەزانی. دوای بیستو یەك مانگ دواتر خوشکم داڵیا لەدایك دەبێتو خێزانەکەمان تەواوتر دەبێت.

رەنگی روخساری هەمووومان رووناکبوو، ئەمەیان دەگەڕایەوە بۆدایکی ئینگلیزمو باوکم، باوکی باوکم لەهۆزی سەعیدییەکانی میسر لەکەسانی سەروتربوو، بەرزە بالاً زۆربەیان بەروخساریان رەش ئەسمەرە ئەمانە لەتیرەکانی بێگەردی فیرعەونی بوون. بەڵام جگە لەم لایەنەوە، باپیرم روخساری سپیو چاوی شینبوون. منداڵەکانی باوك، مامەکانمو دوو لەپوورەکانی میسریم هەموویان روخساریان روونبوو، ئێمەش وەك تەواوی خێزانەکانی میسری، زۆر لەیەکتر نزیکبووین.

لەمنداڵیم لەگەڵ تەواوی ئەم کەسانە لەناو خانوویەك دەژیاین، تەمەنم پێنج ساڵنبوو کەلەیەکتر جیابووینەوە. بەڵام لەیەکتر دوور نەکەوتینەوە. ماڵی مامی موستەفا کەهاوسەرگیری نەکردبوو خانوویەك نێوانیبوو لەگەڵ خوشکی تەلاقدراوی عەزیزە. وەك ئەرکی برایەتی چاودێری خۆشکی

عەزیزەو کچی بچوکی ئایدای دەکرد. من هەموو ڕۆژێك سەردانی پوورە عەزیزەم دەکرد کەپیمان دەگوت پوورە زوزو، خۆی زۆربەی شەوەکان سەردانی ئێمەی دەکرد، ئەم پوورە عەزیزە خۆشەویستو دایکی میسریم بوو بەخۆشەویستی بێکۆتایی منی بەناز دەکرد.

کاتێك مام مستەفا لەتەمەنی سیو هەشت ساڵی ژیانی هاوبەشی دروستکرد. پوورە زوزو لەگەڵیاندا بەردەوامی بەژیاندا. چونکە لەهەمان سەردەم باش نەبوو ئافرەتێك بەتەنیا بژیت. بێگومان پوورم هەستی بەتەنیایی دەکرد بەلأم دەترسا لەگەڵ کەسێك هاوسەرگیری بکات کەلەگەڵ کچی خراب بێت، خوازبینی زۆری هەبوون بەلأم هەموویان بەوەلأمی نا دوور دەخرانەوە.

خانووی پوورە فاتم کەئێمە لەرووی خۆشەویستی پێمان دەگوت پوورە بەتەت ـ پوورە ((سۆنە))، لەدەرەوەی قاهیرە لەجادەی ئەهرامەکانبوو. بەڕادەی پوورە زوزو خۆشەویستی بۆ دەوروبەر نەبوو، بەلأم ئافرەتێکی زۆر بەتوانابوو. دوای مەرگی داپیرم پوورە بەتەت بەکردەوە شوێنی گرتەوە. هەموو ئەندامانی خێزان ڕۆژی یەکەمی مانگی ڕەمەزان بانگی خۆیان لەماڵی ئەم پوورە دەشکاند. بۆچارەسەری کێشەکانی خۆیان پرسو ڕایان پێدەکرد. پوورە بەتەت هاوسەر گیری لەگەڵ حوسنی ئەبوزید کردبوو یەکێك لەبەرپرسانی پارتی ناسیونالیستی (وەفد) بوو. پارێزگاری پارێزگای منوفیەو مینابوو. حوسنی ئۆتۆمبێلێکی حکومی لەبەردەستبوو ئەوکات هێمای دەوڵەمەندەکان بوو. من شەیدای ئۆتۆمبێل سواربووم لەگەڵیدا کەئێمەی بەدەوری قاهیرەدا دەسوڕاندەوە. ئەم ئۆتۆمبێلە بەژمارەی حکومیو ئالأی پارێزگای منوفیە لەسەر پێشەوەبوو، سەربازەکانی ناچار دەکرد کەسلأوی سەربازی بۆبکەن. لەدونیای منداڵی خۆمدا هەستم دەکرد کەئەمانە سلأو بۆمن دەکەن.

ئیبن خەڵدون، مێژوو نووسی سەدەی چواردەی زایینی، قاهیرە بە((دایکی دونیا)) ناودەبات من لەروزە گەورە ببووم، بەئاسانی هۆکارەکەم دەزانی. هەمووشوێنێك پڕبوو لەنیشانەکانی دەوڵەمەندی قاهیرە. دروست لەرۆژهەلأتی رووباری نیل، قاهیرەی قبتی هەڵکەوتبوو، زیاتر لە١٥٠٠ساڵ پایتەختی هونەرییو مەزهەبی مەسیحییەکانی میسربوو. لەرێگای قوتابخانە دەمتوانی تەپڵی سەری بۆرجەکانی کڵێسای سەدەی چوارمی ئەبو سێرجا ببینم. ئەم کڵێسایە لەشوێنێك دروستکرابوو کەدەیانگوت خێزانی عیسا مەسیح (د.خ) کاتی هەلأتن بەرەو میسر لەم شوێنە نیشتەجێ دەبێت. زۆرجار لەپشتەوەی کڵێسای ئەبو سێرجا منارەکانی باریکی مۆدێلی

عوسمانی مزگەوتی ((ئالاباستر))م دەبینین، دەگەڕانەوە بۆسەردەمی موحەممەد عەلی پاشا لەسەدەی نۆزدە. بڕێك دوورتر، شارێکی کۆن هەبوو، کەخاندانەکانی فاتمی لەساڵی ٩٧٣ زایینی دروستیان کردبوو، لەهەمان شوێن زانکۆی ئەزهەر هەڵکەوتووە. کۆنترین زانکۆی جیهان زیاتر لەسەد هەزار قوتابی لەخۆ دەگرێت لەوڵاتانی دوور دەست وەك موریتانیو ئەندونزیا. هەموو قوتابیانی ئەم زانکۆیە زانستی ئیسلامی دەخوێنن، هەرچەند ئەزهەر (الازهر) زۆر کۆنە بەڵام مەزهەبی ئێمە تاکوئێستاش گەنجو لەهەڵچوونە.
لەلایەکیتر دورگەی روزە، دەمتوانی رۆژئاوی رووباری نیل ببینم. لەگەڵ باخەکانی دەوروبەری کەهەموویان موڵکی کەسانی دەوڵەمەندبوون هەموویان لەجیزە پشت زانکۆی قاهیرە دەژیان. دەمتوانی جادەی ئەهرامەکان تاکو بیابانەکانی لیبیا رادەکێشران ئەگەر خۆڵبارینو ئاسمان سافو بێگەردبا سەرەوەی ئەهرامی گەورە دەست نیشان بکەم. رۆژانە پێنجار گوێبیستی بانگ دەبووم کەلەمنارەی هەزاران مزگەوت هەڵدەستا لەسەرتاسەری قاهیرە دەنگی دەدایەوە بانگی موسڵمانەکانی دەکرد بۆ نوێژکردن.
لەسەردەمی منداڵیم دوورگەی جیزە شوێنێکی زۆرخۆشو ئارامبوو. حەوشەی هەموو ماڵێك سەوزو گوڵی تێدابوو لەناو ڤیلاکان دەمتوانی لەهەردوو لایەنی دوورگەکە رۆیشتنی رووباری نیل ببینم. لەساڵی ١٩٣٣ ژمارەی دانیشتوانی میسر نزیکەی پانزدە ملیون کەسبوون دانیشتوانی قاهیرە کەمتر لەملیونێك بوون.
دایکم زۆر ئازایەتی کردبوو کەتوانیبوو شوێنی لەدایکبوونی خۆی بریتانیا بەجێبێڵێتو لەمیسر بمێنێتەوە. باوکم زۆر ئازابوو کەتوانیبوو لەگەڵ ئافرەتێکی بیانی هاوسەرگیری بکات ئەمەیان پێچەوانەی یاساکانی ئایینی هەژمار نەدەکران، چونکە منداڵانی موسلمانێك هەمووکاتێك موسلمان هەژمار دەکرێن. تەنیا بۆئافرەتی موسلمان هاوسەرگیری کردن لەگەڵ کەسێکی ناموسلمان رێگا پێدراو نییە، چونکە منداڵانیان دەبێت پەیڕەویی ئایینی باوکیانبن. بەڵام نارازیبوونی باپیرو داپیرم لەم هاوسەرگیرییە لەبەر هۆکاری ئایینی نەبوو ریشەی لەناو دابونەریتی خێزاندا هەبوو.
باوکم، سەفوەت رەئوف، لەگەڵ دایکم، گلادیس چارلز کاترڵ لەساڵی ١٩٢٣ لەشاری شفیلد، یەکێك لەشارەکانی بریتانیا، یەکتر دەناسن. باوکم قوتابی دەبێت لەبەشی پزیشکی لەزانکۆی شیفلد، دایکم مامۆستای موزیك. وەك دیار هۆگریان بۆیەکتر لەسەرەتاوە زۆر بەهێزبووە چونکە

پێشتر هاوسەرگیری باوکم لەگەڵ کچی مامی لە قاهیرە ئامادە کرابوو. باپیرم بۆباوکم لەبریتانیا دەنووسێت:((تاکو ئێستا هیچ کەسێك لەئەندامانی خێزانی ئێمە هاوسەرگیری لەگەڵ کەسێکی بیانیدا نەکردووە. رێگا بەتۆ نادەم هاوسەرگیری لەگەڵ ئەم ئافرەتە ئینگلیزە بکەیت.))

هەرچەند، باپیرو داپیرم لەگەڵ ئینگلیزەکان راهاتبوون. چونکە لەهەمان سەردەم ژمارەی خەڵکی بریتانیا کەلەمیسر دەژیان زۆربوو. لەدەیەکانی ١٨٨٠، زیاتر لەدەهەزار سەربازی بریتانی بۆپاراستنی حکومەتی میسر جێگیر کرابوون. لۆرد کرۆمر، فەرماندەی گشتی هێزەکانی بریتانیا، بەکردەوە حکومەتی میسری لەژێر دەستدابوو. بەرێوەبەرایەتی کاروباری دارایی میسر لەدەستی بریتانیاو فەرەنسابوو. بەشی میسر لەتۆکەندی سوئیز کەتەواوکردنی لەساڵی ١٨٦٩ کۆتایی هاتبوو لەلایەن پاشا ئیسماعیل لەجیاتی قەرزی زۆری کەڵەکەبوو دەفرۆشێتە بریتانیا. بێگومان لەهەلومەرجێکی لەم شێوەیەدا بینینی ئینگلیزەکان زۆر لەبیانییەکانیتر لەقاهیرە شتێکی ئاسایی دەبێت. بەڵام بۆکەسانی نەریتخوازی وەك باپیرو داپیرم خۆگونجاندن لەگەڵ ئەم دابونەریتە کارێکی ئاسان نەبوو.

باوکم لەوەڵامی باپیرم دەنووسێت:((ئەگەر رێگا لەهاوسەرگیری من بگریت، خواردنم ئەوەندە کەم دەکەم تاکو دەمرم.)) کەڵەشەقی باپیرم لەئەمەیان کەمتر نەبوو وەڵامی دەداتەوە:((رێگات پێنادەم.)) ئەم نامەگۆرینەوەیە بەردەوامی هەبوو تاکو داپیرم نیگەران دەبێت نەوەك باوکم بەلایەك بەسەرخۆی بێنێت، یان خراپتر لەئەمەیان، هیچ کاتێك نەگەرێتەوە بۆمیسر، داوا لەباپیرم دەکات:((دەبێت رێگای پێی بدەیت، باشتر دەبێت ئەگەر کوڕو ژنی لەوڵاتی ئێمە قەبووڵی بکەین نەوەك ناچاری بکەین لەوڵاتێك ژیان بەسەر ببات کەلەگەڵ داب و نەریتی ئێمەدا بێگانن.))

باپیرم زۆر بەدژواری رێگای پێداو داپیرم نیشانیەیی دەزگیرانی لەمیسر بۆدایکم رەوانە دەکات کەپێدێت لەئەنگوستیلەیەکی ئەڵماس و گەردنبەندێکی ئەڵماس و یاقوت کەلە باپیری بۆی بەجێمابوو لەگەڵ هەندێك پارە بۆئەوەی بتوانن مانگی هەنگوینی خۆیان تێپەڕ بکەن. باوك و دایکم لەیەکێك لەنووسینگەکانی شارەوانی لەبریتانیا مارەبڕینی خۆیان دەکەن و دەبن بەهاوسەری یەکتر. دوای سێ ساڵ کاتێك باوکم لەگەڵ دایکم دەگەڕێنەوە بۆوڵات، براکەم کەلە لیورپوڵ لەدایك دەبێت لەگەڵیان دەبێت. بەپێی نەریتی هەمان سەردەم، دایك و باوکم لەماڵی باپیرم لەدورگەی رۆزە مانەوە. باپیرو داپیرم زۆر بەخێرا دەبنە هۆگری دایکم. بێگومان

بۆهەردوو لایەن ئاسان نابێت. لەهەمان سەردەم کۆمەڵگەی ئێمە زۆر زیاتر لەئێستا گرێدراوی دابونەریتی خۆیبوو، دابونەریتی ژیانی دایکم بۆیان جێگای سەرسوڕمانو غەریب دەهاتە بەرچاو.

دایکم هیچ کاتێك دەمی لەخواردنەکانی میسری نەدەداو پێداگری دەکرد کەچێشت لێنەری سودانی ئێمە بەجیاخواردنی بۆدروست بکات خواردنی گوشتی کوڵاو، سەوزیجاتی کوڵاو هەمووشتێکی کوڵاو. بەڵام ئەندامانیتری خێزان هەمان خواردنی ئاسایی میسریان دەخوارد. کۆتری برژاو، ماسی برژاو کەبابو گوشتی برژاو، کفتەو دۆڵمە، شۆربای خەستی سەوزەی وردکراو لەگەڵ دڵو جەرگی مریشك ئامادە دەکرا. بامیەیی سوورکراوە بەنیشکو پیازو سیرو ئاوی تەماتە کەبەردەوام لەگەڵ برنج دەخورا. لەگەڵ زۆر جۆری دانەوێڵەو زەڵات. بەڵام دایکم گوشتی مەڕی بەکوڵاوو پەتاتەی کوڵاوی بەدۆشاوی پوونگەی دەخوارد.

چێشتی بەیانیان جیاوازبوو لەگەڵ ئەوانیتر. نەریتی میسرییەکانە بەیانیانو لەگەڵ زۆر لەکاتەکانیتری خواردن باقڵەی کوڵاوی خست بەبەهارات بیخۆن زۆرجار هێڵەی بەسەردا دەکرێ. بەڵام لەماڵەکەی ئێمەدا (کورن فلکس)، هێلکەی کوڵاو، لەجیاتی نانی خۆماڵی کەبەهەویری ترش نەکراو دروست دەکرا، ئێمەی نانیترمان هەبوو کە بەچەقو پارچەکانی نازوکی لێدەکرانەوە لەگەڵ مورەبای خۆماڵی کەدایکم خۆی دروستی دەکرد. خواردنەوەی چا لەکاتژمێر چواری ئێوارە پێرزبوو، بەڵام دایکم لەجیاتی چا شیرینی پوونگی کەتایبەت بەمیسرییەکانبوو چای بریتانی لەگەڵ کێکو شیرینییەکانی خۆشی بریتانی کەبەدەستی خۆی دروستی دەکردن بەئێمەی دەدا بەراستی زۆر خۆشو بەتام بوون. بەتایبەتی کۆنسومە بەتامی لیمو لەمیسر دەست نەدەکەوت.

هەندێك دراوسێمان هەبوون دانیشتووی نهۆمی سەرەوە بوون لەکریسمەسەکانی دایکم، لەبەرچاوی سەرسوڕماویانو تەواوی دراوسێکان، دارێکی کاجی جوانی دەهێنایە ماڵەوە بەئەستێرەکانی جوان دەیڕازاندەوەو بابا نوئێلێکی بەسەرەوەی داری کاجی هەڵدەواسی. نادییەو تهانی، منداڵانی نهۆمی سەرەوە، وەك هەموو منداڵەکانی دراوسێ بۆبینینی کاجی رازاوەی ئێمە دەهاتنە ماڵەکەمان. چونکە لەهەمان سەردەم ژمارەی خێزانەکانی میسری زۆر کەمبوون کە کەرۆژی کریسمەس بکەن بەجەژن دەمانتوانی بەئەنگوستەکانی خۆمان هەژمار بکەین. هەموو منداڵەکان تاکو هەمان سەردەم داری کریسمەسیان نەبینیبوو. ئیرەیبردنی

منداڵان بەئێمە تەنیا لەبەر داری کریسمەس و شیرینییەکان نەبوو لەبەر دیارییەکانبوو کە وەریان دەگرتن.

بۆدایکم ئەوەند ئاسان نەبوو تاکو ئەم ڕادەیە دوور لەوڵاتی خۆی ژیان بەسەر ببات. لەسەردەمی شەڕی جیهانی دووەم هەموو جۆرە پەیوەندییەك لەگەڵ بریتانیاو میسر بڕابوون. نەبوونی هەواڵێك لەخێزانی زۆر نیگەرانی دەکرد. ڕۆژێکیان کاتێك لەقوتابخانە دەگەڕامەوە، بینیم کەلەژووری خۆی دەگریا.

بتی یەکێك لەهاوڕێیانی دایکم بۆدیدارمان هاتبوو پرسیارم کرد:((دایکم بۆدەگری چی بووە؟))

بتی گوتی:((ئێستا هەواڵی کۆچی باوکی پێگەیشتووە، خێزانەکەیان هەندێك پارەو کاتژمێری باوکیان بۆ ڕەوانەکردووە.)) دوای دوو سێ مانگ دایکی دەمرێت.

دڵم بۆیدەسووتا. من هیچ کاتێك ئامادە نەبووم ئەوەندە ساڵە لەخێزانی خۆم دووربم، بەڵام نەیدەویست بۆبینینیان لەهاوسەرو منداڵەکانی جیاببێتەوە. دایکم سی ساڵ سەردانی بریتانیایی نەکرد، کاتێك گەڕایەوە شەقامەکانی نەدەناسینەوە، نەیتوانی ماڵی باوکی لەشفیلد بیدۆزێتەوە بۆدۆزینەوەی ئەندامانی خێزانی، ئاگادارییەك بەنیشانەی هوتێلی دەداتە ڕۆژنامەیەکی خۆجێی. ئێوارەی هەمان ڕۆژ تەنیا خوشکی کەمابوو لەگەڵ خزمانیتری بەپەلە بۆدیداری سەردانی هەمان هوتێل دەکەن. دوای ئەم ماوە درێژە کەلەیەکتر جیابوون، دیدارێکی زۆر هەست خرۆشێنبوو، ڕۆژنامەی شفیلد هەواڵەکەی بڵاوکردەوە.

دایکم ئێمەی بەبریتانی پەروەردە نەکرد. لەماڵ هەموومان بەزمانی عەرەبی قسەمان دەکردن، خۆشی زۆر بەباشی فێربوو. کەسێکی دیندار نەبوو بەهیچ شێوەیەك هەوڵی نەدا سوود لەکاریگەری خۆی بەسەرئێمەدا وەرگرێت و ئێمە لەدابونەریتەکانی ئیسلامی جیابکاتەوە. بەڵام لەمنداڵی هەلومەرج بۆمن تاکو ڕادەیەك شێواوبوو. دایکم پیکەرێکی بچوکی لەپیغەمبەر مەسیح بەسەر شوێنی نووستنی هەڵواسیبوو، زۆرجار دەمبینی لەبەرامبەریدا بەچوکدادەهات و بەدەستەکانی یەکتر گرتووی هاوشێوەی مەسیح دوعای دەکردن. ئێمە ئەوکات زۆر بچوکتربووین کەنوێژ بکەین. بەڵام من دەمزانی کەنزاو پارانەوەی موسڵمانان جیاوازە، بەدەستی کراوە دەوەستان بۆکرنۆشبردن نیوچاوانی خۆیان دەگەێنن بەزەوی. لەجیاوازییەیی دایکم لەگەڵ تەواوی ئەندامانی ماڵەوە گێژ دەبووم.

ڕۆژێکیان پرسیاری یەکێك لەهاوپۆڵەکانم بۆدایکم گێڕایەو:((بۆچی تۆ مەسیحی ئێمەش هەموومان موسڵمان؟))

بەشێوەیەکی زۆرجوان بۆی باسکردم:((هیچ کەسێك ئایینی خۆی دیاری ناکات، ئێمە هەموومان بەهەمان ئایین لەدایك دەبین کەدەبێت بین، بەڵام گرنگترین لایەن دەبێت لەبیرمان دابێت هەموو ئایینەکان تەنیا خاوەنی خودایەکی گەورەن. تاکو کاتێك خاوەنی ئیمان بین گرنگ نییە کەچۆن پەرستین دەکەین.))

بەڵام تاکو ئێستاش ئەم بابەتە ئازارم دەدات، شێوازەکانی پارانەوەکانی دایکم بەئایینی مەسیحی دەبوون بەهۆکار کەزیاترو قووڵتر لەداب و نەریتەکانی ئیسلامی خۆم وردبینی بکەم بۆکەسانیتر بەتەواوی ڕوون و ئاشکرابوو. لەقوتابخانەی ئایینی قبتی، هەموو منداڵەکان لەهەمان شوێن دەیانخوێند تەنیا قوتابخانەی دورگەی روزە بوو، مامۆستامان لەهەفتەدا چەندینجار چیرۆکەکانی کتێبی پیرۆزی بۆئێمە دەخوێندەوە، چیرۆکەکان لەهەموو پێغەمبەرەکان عیسا و موسا. هەموو ڕۆژێك بەیانی، پێش ئەوەی قوتابخانە بکرێتەوە. مەراسیمی نوێژی مەسیحیمان هەبوو. مامۆستا بەئێمەی دەگوت هەرکەسێك بەشداری نەکات ناچاری نییە. لەم لایەنەوە من بەشداریم نەدەکرد، هەموو منداڵەکان بەشداریان دەکرد خۆشکی من بەشدار دەبوو بچوکتر کەلەهەندێك لایەن تێگەیشتنی هەبێت. ڕۆژێکیان خۆشکم پرسیاریکرد:((بۆچی لەگەڵمندا نایت؟))

گوتم:((ئەمەیان نوێژی مەسیحییەکانەو ئێمە موسڵمانین.))

گوتی:((مامۆستا لەتۆ تووڕە دەبێت.))

بۆمن زۆرگرنگ نەبوو. لەسەر قسەی خۆم ڕاوەستام:((نامەوێت لەبەرخاتری مامۆستام گوێی لەقسەکانی قەشە بگرم.))

بەڵام خوشکم ڕاستی دەکرد، ماموستا هەموو ڕۆژێك لەکاتی پشوودان ناچاری دەکردم لەقوژبنێك ڕووم لەدیوار بکەم بۆماوەیەکی درێژ.

مامۆستا بۆی باسکردم:((خوشکی خۆت بەشداری لەمەراسیمی پارانەوە دەکات، هەموو منداڵەکانیتر ئامادە دەبن، دایك و باوکیان موسلمانن، تۆ جیاوازیت لەگەڵ ئەماندا چییە؟))

لەوەڵامدا گوتم:((من مەسیحی نیم.)) دووبارە ڕەوانەی قوژبنی پۆڵەکەمانی دەکردم. هەمان سەردەم تەمەنم هەشت ساڵانبوو دوای سێ هەفتە لەگەڵ باوکم باسکرد کەهەڵسوکەوتی

ماموستا لەگەڵمدا زۆر زاڵمانەیە. رۆژی دواتر باوکم بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ بەرێوەبەری ئینگلیزی سەردانی قوتابخانەی کرد. بۆبەرێوەبەری قوتابخانەی روونکردەوە:((نامەوێ هیچ یەك لەکچەکانم بەشداری لەمەراسیمی پارانەوەی مەسیحی بکەن، کچەکانی من مەسیحی نین ناچاریان بکەیت بەشداری بکەن.))

کاتێك باوکم بۆ بەرێوەبەر روونی دەکردەوە کەماموستا هەڵسوکەوتێکی زۆر توندی هەبووە زۆر شڵەژا بێگومان ئامۆژگاری مامۆستای ئێمەی کردبوو، چونکە دوای سەردانی باوکم هەڵسوکەوتی لەگەڵمدا گۆڕابوو. لەهەمان رۆژ بەدواوە کاتێك هەموویان بۆدوعاو پارانەوە دەرۆیشتن بۆژووری نوێژکردن منو داڵیا لەپۆلەکەی خۆمان دەماینەوە.

دایکم هیچ کاتێك نەبوو بەموسلمان، هەرچەند زۆر لەئینگلیزەکان کەهاوسەرگیریان لەگەڵ میسرییەکان کردبوو دەبوون بەموسلمان. بوون بەموسڵمان زۆر ئاسانبوو. بەڵگەیەی بوون بەموسڵمان بەئامادەبوونی دوو شاهێد لەمزگەوتی ئەزهەر پڕدەکرایەوە پێنجار بەسەر یەکەوە شادەی دەهێنا:((شایەتی دەدەم کەهیچ خودایەك نییە جگە لە اللەو محەممەد (د.خ) پیغەمبەری ئەوە.)) پێداگری دایکم لەسەر ئایینی خۆی پوورو مامەکانمی ماتو حەیرانکردبوو. ئەندامانی خێزانو هاوڕێیانی باوکم زۆرجار پرسیاریان لەباوکم دەکرد:((بۆچی گلادیس ئایینی ناگۆڕێت؟)) بەڵام خۆشەویستی باوکم بۆدایکم رێگاینەدا کەشتێك بەزۆری بەسەریدا بیسەپێنێت. بەپێچەوانە، بۆنەکانی ئایینیو مەزهەبی ئێمە لەگەڵ ماڵی باپیرمانبوو. دایکم هەندێکجار بەجۆرێك لەجۆرەکان بەشداری لەگەڵ ئێمە دەکرد، زۆرجار بۆهاندانی ئێمە لەمانگی رەمەزان چەند رۆژێك بەرۆژوو دەبوو. ئێمە خێزانێکی موسلمان بەدایکێکی مەسیحی بووین.

دایکم یەکێك لەدایکەکانی میسری نەبوو کەبەردەوام بەدەوری منداڵەکانیدا بخولێتەوە. ئەگەر لەکاتی یاریکردن دەکەتینەخوارەوە پوورەکانمان بەپەلە دەهاتن ئێمەیان هەڵدەگرت. بەڵام دایکم دەیگوت:((دەبێت خۆیان هستنە سەرپێی.)) بەپێچەوانەی دایکانی میسر کاتێك دەیانبردن بۆحەمام رێگایان بەمنداڵەکانی خۆیان نەدەدا بێنە دەرەوە تاکو مووەکانی سەریان وشك دەبوونەوە، بەڵام دایکم دەیگوت:(( ئەمەیان چ قسەیە رێگایان پێی بدەن بڕۆنە دەرەوە باو خۆر مووەکانیان وشك بکاتەوە.))

زۆر لەدایکانی میسری لەشەودا ئەوەندە لەتەنیشتی منداڵەکانیان دەمانەوە تاکو خەو بەچاوەکانیاندا دەهات، دواتر چرا بەرووناکی دەمایەوە نەوەك بەئاگا بێتەوە ترسێك بۆی

دروست ببێت. دایکم دژی ئەم لایەنەبوو. دەیگوت ئەم هەڵسوکەوتە منداڵەکان زیاتر هۆگری دایكو باوکیان دەکاتو ترسنۆك دەبن. شێوازەکانی پێچەوانەبوون. هەموو شەوێك بەتەنیا ئێمەی دەنارده ناو حەوشەی ماڵەوە تاکو سێجار لەتاریکایدا بسوڕێینەوەو لەتاریکایدا ڕێگای خۆمان بیدۆزینەوە.دەیگوت بەم شێوەیە فێردەبن چۆن بەتەنیایی‌و لەتاریکایدا ترسیان نەمێنێت. ڕاستی دەکرد.

ماڵەکەمان خاوەن کەش‌و هەوایەکی پڕلەخۆشەویستی، باوکم ڕۆژانە کاتژمێر دووی دوای نیوەڕۆ، کاتژمێرەکانی کۆتایی کار لەمیسر دەگەڕانەوە ماڵەوە. هەمووجارێك شیرینی‌و جۆرێك لەپەنیری فەرەنسی یان زمانی گۆلکی دوکێڵ دراوی لەگەڵ خۆیدا دەهێنایەوە. خواردنی سەرەکی ئێمە نیوڕۆ بوو. دوای خواردنی نیوەڕۆ ئێمەی خەڵکی قاهیرە تاکو کاتژمێر پێنجی ئێوارە پشوودانبوو. باوکم کاتێك لەخەوی دوای نیوەڕۆ بەئاگا دەهاتەوە، بەپێچەوانەی زۆر لەباوکانی میسری بۆخواردنەوەی قاوەو کێشانی نێرگلە دووبارە دەڕۆیشتە دەرەوە. یان پێکەوە دەڕیشتینە دەرەوە یان لەگەڵ ئێمە دەمایەوە.

هەندێك لەرۆژانی هەینی یان پشووەکان، باوکم ئێمەی دەبردە گەڕەکە کۆنەکانی شار. ناوچەیەکی بەناوبانگ هەبوو بەناوی (باب المتولی)، یان دەروازەی پیرۆزز، بەناوی یەکێك لەشێخەکانی سۆفیگەر کەچەند سەدەیەك پێش لەم شوێنە دادەنیشت‌و گەورەیی لەخۆی نیشاندەدا زۆر لەرێبوارەکان بینیانبوو. ئەم لایەنانەبوون کەمن قاهیرەم بەشاری خۆم دەزانی، هیچ کاتێك لەبینینی سەرسورهێنەرەکانی مێژوویی ئەم شارە تێر نەدەبووم. کۆڵان‌و گەڕەکەکانی کۆنی شار، لەبەرتەنگەبەریی ئۆتۆمبێل نەیدەتوانی بەناویدا بڕوات. زۆرجار لەبەربوونی ئەسپ‌و گوێی درێژەکان ڕێگا بۆ ماوەیەك دەگیران. باری ئەم ئەسپ‌و گوێی درێژانە سەوزەواتی نوێی‌و داری سووتاندن برنج‌و خواردنەکانی لەم شێوەیان بۆفرۆشتن دەبردە بازاری خان خەلیل. قاهیرە بۆچەندین سەدە قەڵەبالغترین بازرگانیترین شاری جیهان بەهەژمار دەهات، لەکاروان سەراکانی خان خەلیل بازرگانەکانی سەدەکانی ڕابردووی سەرتاسەری جیهانی عەرەب بارەکانی خۆیان بەحوشتر هاوشێوەی شەمەندەفەڕ بەدوایەکتردا دەهێنا بۆ قاهیرە، لەنزیکی هەمان بازاربوو کەفاتمییەکان شوێنێکیان بۆ بەخێوکردنی زەرافەو حوشتر مریشكوو فیلەکانی ئەفریقایی دروستکردبوو. زیاتر لەدوانزدە هەزار دوکان لەبازاری خان خەلیل پڕبوون لەکەلوپەلی سەردەمی ڕابردوو بەشێوەیەك لەشێوەکان کاریان پێدەکرا. دایك‌و باوکم زۆرجار

ئێمەیان لەناو كۆلآنەكانی لەناویەكترو تاریك دەبردن بۆ بازاری زێرینگەران بۆپاراستن لەدەستی توندڕەو هێرشبەرەكان لەناو دڵی بازاردا هەڵكەوتبوو. لەهەمان بازار منو خوشكم دەمانتوانی بەدە سنت بازنی زیو بكڕین. كاتێك دایكم لەبازاری بەهارات فرۆشەكان رادەوەستا بۆدروستكردنی (سوس)ی ئینگلیزی پوونگەو جاترو گوڵی مریەمی دەكڕین. ئێمەش وەك هەموو منداڵەكان چاودێری دەنگی زەنگوڵی شەربەت فرۆشی گەڕۆكمان دەكرد، باوكمان بۆكڕینی گلآسێك شەربەتی ڕەش‌و شیرینی تەمەر هیندی بێزارمان دەكرد.

لەنێوانێكی نەچەندان دوور لەناو بازاری خان خەلیل، مزگەوتی (الحكیم) هەبوو، مانەوەی دەگەڕایەوە بۆ سەردەمی یەكێك لەسوڵتانەكانی فاتمی كەبەتەواوی مێشكی پەریشانبوو لەسەدەی پانزدە. سوڵتان حەكیم هەوڵیدا بەقەدەخەكردنی دروستكردنی پێڵاوی ئافرەتان، ئافرەتەكان ناچار بكات لەماڵی خۆیان بمێننەوە. بڕیارێك دەردەكات هەموو سەگەكانی شار بكوژن. هیوای دەبێت شەوان بەسواری گوێی درێژی بەناوشاردا بسوڕێتەوەو هەڵسوكەوتی خەڵكی خۆی ببینێت ئەگەر لەكەسێك بێزار دەبوو دەكوژرا. ئەم جۆرە كوشت‌و كوشتارەی بێمانای روخسارێكی زۆر خرابی لەم كەسایەتییە دروستكردبوو. كاتێك لەساڵی ١٠٢٠ زایینی شەوێك بەسواری گوێی درێژی دەچێتە كێوەكانی موقەتەم‌و هیچ كاتێك نەگەڕایەوە، لەچەند كەسێك زیاتر بۆی خەمبار نەبوون. سوڵتان حەكیم وەك زوربەی سوڵتانەكانیتری فاتمی لەسەدەی دەیەم بۆ فەرمانڕەوایی میسر لەباكووری ئەفریقا هێرشیانكرد، موسڵمانی شیعە مەزهەببوون، بەلآم ئێستا ئێمەی میسری٩٠٪ لەرێژەی هەشت سەد ملیون موسڵمانی دونیا، سوننە مەزهەبین.

لەمنداڵی من هیچ كەسێكم نەدەناسی كەشیعە بێت، شیعەكان كەمایەتین لەناو موسڵمانەكان كەناوەندیان ئێرانە. بەبوونی ئەوەی كەشیعەو سوننە پێكەوە لەپەیڕەوانی پێغەمبەر محەممەد (د.خ). لەدوای كۆچی پێغەمبەر (د.خ)لەساڵی ٦٣٢ زایینی كەهیچ وارسێكی نەبوو، لەسەر جێگرتنەوە پێغەمبەر كێشە دروست دەبێت. موسڵمانای سوننە دەڵێن باوكی خێزانی پێغەمبەر، ئەبوبەكر، جێگرەوەی پێغەمبەرە. بەلآم كەمایەتییەكانی شیعە دەڵێن ئەمەیان مافی عەلی كوڕمامی پێغەمبەربوو. گرووپی یەكەم ناویان بەسوننە دەركردو دژبەریان واتە شیعەكانبوون. لەسەدەی هەڤدەی زایینی، سوپای یزید رێبەری شیعەكان حوسێن كوڕی عەلی دەكوژن. لەهەمان سەردەم بەدواوە شۆڕش دژی بەهێزەكان رێزگرتن لەشەهیدبوون، كەدوای

١٣٠٠ ساڵ لەدامەزراندنی حکومەتی ئیسلامی لەئێران جێگای خۆی گرتو بووبە نەریتی شیعەکان.

جیاوازی لەنێوان سوننەکانی میانەڕۆو شیعەکانی زۆرینەتوندڕۆ زیاتر لەهەمووکاتێك لەجەژنەکانی جیاوازی لەدایکبوونی ئیمام حوسێن، نەوەی پێغەمبەر، بەباشی دەردەکەوێ. لەدایکبوونی حوسێن بەشێوەی جەژن بۆماوەی هەفتەیەك لەسەرتاسەری میسر بەڕێوەدەچوو کەمن خۆشم دەویست. ساڵی جارێك ئەندامانی خێزانی ئێمە زۆربەی خەڵکی قاهیرە دەڕۆیشتینە مزگەوتێك لەشاری کۆنی قاهیرە کەناوی ئیمام حوسێن بوو. لەخەڵك تامو چێژی لەسرودەکانی ئایینی بەش بەش وەردەگیرا کەدواتر بەکۆمەڵ لەیەکتر وەردەگیرێ بەدوای یەکدا. لەدەوروبەری مزگەوت بەجۆرە ئاهەنگێک لەژێر خێمەکان دروست دەبوو کەزۆر لەهونەرمەندەکانی ئەم بوارە بەشدار دەبوون. دەست فرۆشەکانی گەڕیدە شیرینی نانەقەیسیو هەندێکیان یاری منداڵانیان لەسەر عارەبانەکان دەفرۆشت. ئێمەسواری چەرخو فەلەكو جۆلانە دەبووین ئەمەیان تایبەتبوو بەم رۆژەی جەژن. لەئێرانو کۆمەڵگەکانی شیعەمەزهەب ساڵوەگەری رۆژی لەدایکبوونی ئیمام حوسێن دەگێڕا، بەڵام بۆشیعەکان ساڵرۆژی شەهیدبوونی گرنگتر هەژمار دەکرێت.

هەندێك لەشیعەکان لەم رۆژە بەزنجیر لەسەرو سینگی رووتی خۆیان دەدەن بۆ ئەوەی بەشدارین لەدەردو رەنجو گریانو شین گێڕان. من خۆم مەراسیمی زنجیر لەخۆدانم نەبینی. من زیاتر لایەنگری شێوازی نەرمو نیانم لەجەژنو مەولودەکانی حوسێن. بەتایبەتی خوێندەوەی دوعای پێکەوەی سۆفییەکان کەلەناو خێمەکانی ڕەنگاوڕەنگ بەڕێوە دەچێت.

سوفییەکان لەگەڵ دەفو ئاوازێکی خۆشی شێخێك، کەشانەکانی خۆیان بۆراستو چەپ پێکەوە دەبەن. هەموویان پێکەوە هاوار دەکەن:(الله) هەمووجارێك لەبازنەیەکدا دەسوڕێنەوە. بەبەردەمی ئاهەنگی سۆفیانە بازنەی موریدەکان خێراتر دەبێتو بەناوهێنانی خودا دیسان زیاتر دەبێت. هەلومەرجی بەردەوامی پاڕانەوەی موریدەکان بۆنێوان خەو وشیاری ڕادەکێشێت زۆر لەموریدەکان بانگێشە دەکەن لەبەردەوامیدا لەدونیای خاکی دەڕۆنە دەرەوە لەگەڵ خودا دەبن بەیەك. بۆزیاتر نیشاندانی هێزی زکر، هەندێك لەگروپەکانی سۆفی لەکاتی بەڕێوەچوونی زکرو خوێندنەوەی مەولود لەسەر سینگ خۆیان درێژ دەکەنو ئەسپ سوارەکان بەسەر پشتیان تێپەڕ دەبن یان مار بەتەواوی قووت دەدەنو خەڵۆزی ئاگرین لەناو دەمیان دادەنێن. کارەکانی

کەزیان بەخەڵکی ئاسایی دەگەێنن بەڵام سۆفییەکان لەم کاروبارانە دەرباز دەبن بەبێ ئەوەی زیانیان بەربکەوێت.

من پەیوەندی نزیکی سۆفییەکان لەگەڵ خودا ستایشم دەکردن‌و ئیرەیم پێدەبردن بەپێچەوانەی پیاوانی وشکی ئایینی کەپەیوەندیان لەگەڵ خودا بەشێوەیەکی دارێژراوە. بەڵام دیدگای سۆفییەکان بۆخودا، پڕە لەخۆشەویستی‌و بەهرەی زۆر. ئەمانە کەسانی زۆر سادەو بەرێزن بەبەشێك لەتام‌و چێژی ئایینی‌و دونیایی خۆیان رازین. رێز لەهەموو بوونەوەرەکانی خودا دەگرن. زۆرجار شیعرەکانیان باس لەباڵندەکان‌و گیانەوەران دەکەن. ئێستاش کاتێك مارێك لەکونێکی خانوویەك خۆی حەشاردەدات بانگی سۆفییەك دەکەن کەبێت لەرێگای سیحرەکانی مار لەکۆنی دیوار بکێشێتە دەرەوە، زۆربەی ئەم کارانەی سۆفییەکان بەبێ ئەوەی ئازار بەمار بگات کۆتایی بەکێشەکە دێت بەشێوەیەکی زۆر جوان.

زۆرجار بەبێ بۆنە لەناوکۆڵانەکانی تەنگو باریکی شار تێپەڕ دەبووین. زۆرجار بەتێپەڕبوون لەبەرامبەر خانووەکانی سەدەکانی رابردوو سوڵتانەکان لێوان لێو هەمووکاتێك خانووی جیاو جیاوازیان بۆ هاوسەران‌و ئافرەتانی خزمانی خۆیان دروست دەکردن، بۆنی پیازی سورکراوە دەنگی تەباخی گازی هەژارەکان دەهات کەلەناو ئەم خانووە کۆنانە نیشتەجێ دەبوون. من‌و خوشکم لەناو پەنجەرەکانی حەرام سەراکان تەماشای دەرەوەمان دەکرد کەئافرەتانی حەرامسەرا دەیانتوانی تەماشای دەرەوە بکەن بەڵام کەس نەیدەتوانی لەدەرەوە تەماشای ژوورەوە بکات، ورد دادەماین کاتێك دەمانبینی کەسێك تەماشای ئێمە دەکات هەڵدەپەڕین. لەدونیای خەیاڵی هەستمان دەکرد روحێك تەماشای ئێمە دەکات. لەبیری هیچ کەسێك نەدەگونجا کەجارێك ئێمە لەم شوێنانە رابگرن وەك زۆر لەهاو رەگەزەکانی ئێمە کەکەس نەتوانێت بیان بینن. وەك خۆدی دایکم کەدەستی باوکمی دەگرت هەنگاو بەهەنگاو پێکەوە دەڕۆیشتن وێنا بکەیت کەوەك ئەم ژنانەی نەبینراوی حەرام سەرا تەنیا فەرمانەکان جێبەجێ بکەن.

بیرم دەکردەوەو سوپاسی خودام دەکرد کەهەمان سەردەم تێپەڕیکرد. بەڵام زۆر زوو هەستم کرد وانییە.

تەمەنم نزیکەی هەشت ساڵان دەبوو رۆژێکیان سەردانی یەکێك لەهاورێیانی دراوسێی خۆمانکرد دایکی هاورێی خۆم بینی وەك خزمەتکارو دەست لەسەر سینگ خواردنی بۆئامادە دەکات‌و

لەپێشی دادەنێت خۆشی تاکو هاوسەرێ لەخواردن تەواو نەدەبوو نەیدەتوانی پارونانێك بخوات. سەرم سوڕمابوو. ئەم ئافرەتە لەتەنیشت هاوسەری دانەدەنیشت لەپێشەوەی دادەنیشت، هیچ نرخو بەهایەکی بۆخۆی نەبوو. زۆرکەم لەماڵ دەچوو دەرەوە ئەگەر دەرۆیشت بۆپێداویستی خواردنی جێگای ویستی هاوسەری دەڕۆیشت. پیاوەکە کاتێك خواردنی تەواوکرد لەگەڵ هاوڕێیانی رۆیشتە دەرەوە هاوسەری بەردەوام لەماڵەوە دەمایەوە، ئەمەیان چەندینجار دووبارە دەبوو. جارێکیان پیاوێك بۆبینینی هاوسەری هاتبوو تاکو پێکەوە برۆن قاوەیەك بخۆنەوە ئافرەتەکە دوای بەخێرهێنانی بەپەلە رۆیشتە ژوورەوە بۆئەوەی هاوڕێی هاوسەری چاوی پێنەکەوێت. کاتێك رووداوەکەم بۆباوکم گێڕایەوە پێکەنیو گوتی:((ئەمانە خەڵکی کۆنەپەرستن.))

لەماڵی ئێمە بەهیچ شێوەیەك هەواڵی لەم شێوەیە بوونی نەبوو، زۆربەی شەوەکان پوورو مامەکانم، زۆرجار هاوڕێیانی بریتانی دایکم کەهاوسەریان میسریبوون، بۆبینینی دایکم سەردانی ماڵی ئێمەیان دەکرد. هەموومان پێکەوە ژنو پیاو لەژووری پێشوازی دادەنیشتین ئێمەی منداڵەکان جاربەجار بۆگوێی گرتن لەقسەکانیان دادەنیشتین. بۆئێمە کارێکی زۆر سروشتی هەژماردەکرا. بەڵام بۆزۆربەی خێزانەکانی میسری بەم شێوەیە نەبوو بەجیا پێشوازی لەژنو پیاو دەکراو لەژوورەکانی جیاواز. خۆدی ئەنوەر سادات دوای هاوسەرگیریمان، کاتێك من لەگەڵ هاوڕێیانی پیاوی گفتوگۆم دەکردو بەخێرهاتنم دەکرد تاکو هاتنی ئەنوەر چام بۆدەبردنو پرسیاری خێزانەکانی ئەوانم دەکرد سەرسوڕماو دەبوون. رۆژێکیان ئەنوەر بەتووڕەیی پێی گوتم:((جیهان ئەمەی تۆدەکەیت چییە؟ تۆئەمانە ناناسیت.))بەڵام ئێمە جیاواز لەیەکتر پەروەردە کرابووین. وەڵامم دایەوە:((من خاتوونی ئەم ماڵەم میوانی ئافرەتو پیاو بۆمن جیاوازی نییە.)) بەڵام بۆ ئەنوەر جیاوازی هەبوو لەساڵەکانی سەرەتایی ژیانی هاوبەشمان بەردەوام هەوڵی زۆریدا دژی شێوازەکانی نوێخوازانەی من.

لەقاهیرە خێزانی ئێمە نەلەچینی دوڵەمەندەکانبوو نەهەژارەکان ئێمە بەشێك بووین لەچینی ناوەند هەژمار دەکراین. لەهەمان سەردەم چینی ناوەندی زۆر کەمبوون زۆربەیان فەرمانبەری حکومەتبوون. بەپێچەوانەی وڵاتان چینی ناوەند لەسەر بنەمای دەرهاوردەیان دیاری دەکرا. لەمیسر فەرمانبەر خاوەنی چینی تایبەت بەخۆیانبوون. هەموویان وەك باوکم جلوبەرگی ئەورووپییان دەپۆشین، خوێندەوارو بەزمانی عەرەبی قسەیان دەکردن، بەڵام مووچەیان زۆر

نەبوو تەنیا پانزدە لیرەی میسریبوو بۆمانگێك یان نزیك لەم ژمارەیە. ئەوکات دەیکردە پانزدە دۆلاری ئەمەریکی. لەسەردەمی دەسەلاتی مەلیك فارۆق، خەلکانیتر بۆسەر دووچین دابەش دەکران: دەولەمەندەکان ژمارەیان زۆر نەبوو، خاوەنی زەویی و زاری زۆربوون و تەنیا بەزمانی فەرەنسی قسەیان دەکردن، بەلام چینی زۆر هەژاری کەژمارەیان ملیونان کەس بوون نەخوێندەوار بوون. دەرهاوردەی سالانەیان لەوانەیە دەگەیشتە پەنجا دۆلار. زۆربەی هەژارەکان جوتیار بوون، لەسەر زەوی دەرەبەگەکان کاریان دەکرد. جوتیار برپڕەی هەژاری میسربوون. هەندێك لەم جوتیارانە خەلکانی کوچبەری دەرەوەی میسربوون. میسر لەدێرزەمانەوە زیاتر لەسێ سەد هەزار کوچبەری یونانی لەخۆی دەگرت، سەد هەزار ئیتالی، پەنجا هەزار یەهوودی بێ ولات و هەزاران کەسیتر ئەمانە خاوەنی رەگەزنامەی فەرەنسی و بریتانی بوون دوای شەڕی جیهانی یەکەم لەقاهیرەو ئەسکەندەرییە نیشتەجێ بوون. ئەمەیان چواریانێکی نیودەولەتی هەژمار دەکرا. زۆر لەخەلکی قبرس، مالتی، عەرەبەکانی باکووری ئەفریقیا میسریان بەولاتی خۆیان دەزانی. شەڕی جیهانی دووەم هۆکاربوو کوچبەری زیاتر روو لەمیسر بکەن، جگە لەهەزاران سەرباز کەلەژێر سێبەری ئالای بریتانیا خزمەتیان دەکرد وەك بریتانی، هیندی، ئوسترالی، ئەفریقییەکانی کۆلۆنییەکانی بریتانیا لەناو قاهیرە ناوەندی سەربازیان هەبوو بەدیوارەکانی بەرز لەهەمان کات تێلبەند کرابوو. لەمەیدانی تەحریر، تاکو شوێنی ئێستای هوتیل هیلتۆن نیل درێژ دەبوو. قاهیرەی سەردەمی مندالیم دوو شاری جیاوازبوون، ناوەندەکەی مۆدێرن و رۆژئاوایی و دەوروبەری کۆن و نەریتخوازی میسریبوو.

لەتەماشاکردنی ئەفسەرانی ئینگلیز راهاتبووین سواری کالیسکە دەبوون کەئەسپەکان بەدوای خۆیاندا رادەکێشا ئەرکیان وەك تاکسی ئێستای ناوشار بوون بۆدیداری دۆستەکانی خۆیان دەرۆیشت لەناو خانووەکانی جوان و بەرز، یان لەناو باخچەی خانووەکان دادەنیشتن یان سەردانی هوتێلەکانی نیودەولەتی وەك شیپیردز، ریتس، سیسیل یان زۆربەی چێشتخانەکانی بەناوبانگیان لەناوەندی شار دەکرد.

ئەفسەرانی بریتانیا شەوانە سەردانی ئۆپرای قاهیرەیان دەکرد، بەبۆنەی کردنەوەی نۆکەندی سوئێز دروستکرابوو یەکەمین بەرنامەی هەمان ئۆپرا ((ئایدا)) بەرهەمێکی وێردیبوو. هەمووکاتێك وەك دیار روالەتی ئەم ئەفسەرانە سەرسوڕهێنەرو غەریب دەهاتە بەرچاو، روخساریان وەك کولاوی کەلەقەندی هاوڕەنگبوون لەگەل خەلکی میسر لەسەریان دادەنا

سووربوو؟ زۆر بەختەوەر دەهاتنە بەرچاو. میسر هەمووکاتێك هەتاوییبوو. کرێکاری هەرزان لەخزمەتیان دابوون قاهیرە هەموو دەرفەتەکانی پاریسی هەبوو بەنرخی یەك لەسەر سێ کەپێشکەشیان دەکرا.

لەدەیەکانی چل، ژیان بۆئێمەش وەك ئەوان خۆشبوو. شەڕ هۆکارێکبوو کەهەزاران جوتیاری گوندنشین بۆکارکردن لەگەڵ بریتانییەکان بەرەو شارەکان بەلێشاو دەهاتن لەلایەنی هێزەو هیچ سنورداربوونێك بوونی نەبوو. ئێمە لەماڵەکەی خۆمان لەدورگەی روزە خاوەنی شەش خزمەتکار بووین - چیشت لێنەرێکی سودانی، عوسمان کەساڵانی دواتر لەگەڵ مندابوو لەکۆشکی سەرۆککۆماری، باخەوانێك، شوفێرێك لەگەڵ سێ ئافرەت بۆخاوێنکردنەوەی ماڵ. ئەمەیان ناسروشتی نەبوو. هەموو خێزانەکانی چینی ناوەند خاوەنی خزمەتکار بوون، چونکە ئەوکات کرێکاری زۆر هەرزانبوو. مانگانە دوو یان سێ لیرەبوو. دەرهاوردەی خێزانی ئێمە تەنیا موچەی فەرمانبەری نەبوو ئێمە خاوەن موڵك بووین. موڵکی باوکم‌و مام‌و پوورەکانم کەلەباوکیان بۆبەجێمابوو زیاتر لەپەنجا هێکتاربوو لە(بوحەیری) جوتیاران کاریان لەسەر دەکرد. سوودی زەوییەکانی کشتوکاڵی ئێمەی دەبرد بۆچینی سەرەوە. زۆرجار باوکم ئێمەی بۆ ئۆتۆمبێل سواری دەبردە دەرەوەی شار، بۆناو ئەهرامەکانی سێیانە دەخوڵك لەشارەوە دووربوو لەناو بیابان دروستکرابوو، بەشداریمان دەکرد لەزۆر جەژنەکانی ئایینی‌و نامەزهەبی.

لەمنداڵی مانگی رەمەزان، رێزگرتن لەمانگی کەقورئان بۆ پێغمبەری ئێمە محەمەد (د.خ) نازڵ دەبێت، بۆمن لەخۆشەویسترین جەژنەکانی ئایینیی بوو. سی رۆژی تەواو لەبەیانییەوە تاکو رۆژئاوا، رۆژوومان دەگرتن، قورئان لەم مانگەدا پارونانێك‌و قومێك ئاوی قەدەخەکردبوو. لەرۆژانی مانگی رەمەزان، بەدرێژایی رۆژ نابێت جگارەو نێرگلێ بکێشن. پەیوەندی ژن‌و پیاو لەم مانگەدا حەرامکراوە نابێت جنیودان‌و شەڕکردن بوونی هەبێت هەمووکێشەکانی سەرزەوی بگۆڕین بۆکاروباری مەعنەویی. دەیانگوت: درۆیەك یان نەزەرکردنێك رۆژوو بەتاڵ دەکات.

بنەمای رۆژمێری موسڵمانان مانگی ئاسمانییە نەك مانگی زایینی رۆژئاوایی. دەستپێکی مانگی رەمەزان ساڵانە دەگۆڕێت یانزدە یان دوانزدە رۆژ دەچێتە پێشەوە. ساڵەکانی کەرەمەزان دەکەوێتە مانگەکانی گەرمی هاوین زۆردژوار دەبن. بەڵام پەیامی مەعنەوی وەك خۆی دەبێت. موسڵمان بۆفێربوونی خۆراگرتن‌و نزیکی لەگەڵ چێژو خۆشی دونیایی خۆی بێبەش بکات.

خۆئامادەکردن بۆئەم مانگەی رەمەزان چەند رۆژێك پێشتر ئامادەکاری بۆدەکرێت، چونکە زۆر ئاشکرا نییە کەشێخەکان چ کاتێك مانگ لەمانگی نۆیەمی ساڵ دەبینن. رادیو دەیگوت:((مانگی رەمەزان لەوانەیە سبەینێ دەست پێبکات ئەمرۆ مانگ نەبینرا.)) دووبارە رادیو لەشەودا بینینی مانگی رادەگەیاند رۆژووگرتن لەبەرەبەیانی رۆژی دواتر دەستی پێدەکرد، لەیەکەم ساتی دەرکەوتنی مانگ بەباریکی لەئاسمانەوە. هەرچند ئێمەی منداڵ بەپێی فەرمودەکانی قورئان لەسەر ئێمە نەبوو تاکو گەیشتن بەتەمەنی پێویست رۆژوو بگرین. خێزانەکانی ئێمە وەك خێزانەکانیتر لەیانزدە بۆدوانزدە ساڵی ئێمەیان هاندەدا کەچەند رۆژوویەك بگرین. من لەتەمەنی یانزدە ساڵی هەوڵی خۆمدا کەهەموو مانگی رەمەزان بەرۆژوویم. بەڵام تاکو تەمەنی سیانزدە ساڵی نەمتوانی.

لەمانگی رەمەزان لەگەڵ رۆژەکانیتر جیاوازیان زۆرنەبوو، زۆربەی شوێنو فەرمانگەکان کراوەبوون، بەڵام بەیانیان زوو نەدەکرانەوە تاکو ئەوکەسانەی کەتاکو بەیانی بەهوشیاری دەمێننەوە بتوانن کەمێك زیاتر لەخەودا بمێننەوە. بەڵام رۆژئاوا، نزیك بانگی ئێوارە هەلومەرجو کەشو هەوای شار بەتەواوی دەگۆرا. شەقامەکانی روزەو قاهیرە لەناکاو چۆڵ دەبوون. دووکانێك بەکراویی نەبوو، ئۆتۆمبێلو پاسێك لەسەر شەقامەکان نەدەمایەوە، هەموویان پێکەوە شوفێرەکانی پاس بەپەلە خۆیان دەگەیاندە ماڵەوە تاکو خۆیان بۆساتەکانی کۆتایی رێگادان بەخواردنو خواردنەوە ئامادە بکەن. هەموومان بەتامەزرۆیی چاوەڕەوانی تەقاندنی تۆپەکان بووین لەهووگەرەکان جێگیر دەکرانو لەساتەکانی کۆتایی رۆژئاوا دەیان دەقاندن. گلۆپەکانی ڕەنگاوڕەنگی منارەی مزگەوتەکان دادەگیرسان کەبەشێوەی زنجیر بەدوای یەکتردابوون شەقامو کۆڵانەکانیان رووناك دەکردەوە. خێزانی من لەگەڵ ملیونان خێزانیتر، رۆژووگرتنی خۆیان بۆشکاندنی تێنوویەتی بەشەربەتێکی تایبەت بەناوی (قمرالدین)دەکردەوە، ئەم شەربەتە بەئاوی مژمژ دروست دەکرا. دواتر، لەسەرتاسەری میسر، موسڵمان دەستیان بەسەردانی شەوانەی رەمەزان دەکرد.

رەمەزان بەهەموو سنووردارەبوونەکانی خۆشترینو پڕدیدارترین مانگی ساڵبوو ـ تاکو ئێستاش هەروایە. ئەندامانی خێزانی من هیچ کاتێك بۆخواردنی ئێواران تەنیا نەدەبوون بەردەوام نزیکەی بیست کەس لەخزمان شەوان لەماڵی یەکتر کۆدەبوونەوە. هیچ کاتێك خواردن ئەوەندە خۆش تامو جوانو بۆنخۆش خۆی نیشان نەدەدا. منداڵەکان پێش رۆژئاوابوون لەسەر مێزێك لەیەکتر

کۆدەبووینەوە تەماشای کێکی دوای خواردنی سەرەکیمان دەکرد کەتایبەتبوو بەمانگی ڕەمەزان: شیرینییەکی پڕ لەفستەق، باوی، مێوژ، نقرۆی لیموو شەکر، کۆنوف کێکێکی سادەتربوو کەمێوژو چەرەزەو خامەیان بەسەردا دەکرد، خۆشاف بەمژمژو هەنجیرو مێوژو هەڵوچە بەبیستنی دەنگی تۆپ یەکسەر دامان دەقورتاند، دواتر چەندین کاتژمێر دادەنیشتین و چیرۆك و نوکتەی خۆشمان بۆیەکتر دەگێڕایەوە.

عاشقی هەموو ساتەکانی مانگی ڕەمەزانبووم، شتەکانی ئاسایی دەبوون بەنائاسایی. شەو دەبوو بەڕۆژ کات زۆردرێژ دەبوو. ئێمەی منداڵان ماڵ بەماڵ دەگەڕاین، لەدەرگای ماڵەکانمان دەکوتاو داوای شیرینیمان دەکرد. شەقامەکانی قاهیرە تاکو کاتژمێر دووی نیوەشەو جمەیان لەخەڵك دەهات، چونکە دوای لەیەکتر کۆبوونەوە. سەردانی خزم و دۆستان دەستی پێدەکرد. هەموویان بەپیرۆزبایی لەیەکتر دەکرد ((ڕەمەزانی کەریم)) واتە:((ڕەمەزان لەگەڵ ئێمەدا میهربانە)). ئێمەی منداڵەکان بۆڕووناك کردنەوەی ڕێگای گەورەکان فانۆس بەدەست لەپێشەوەیان دەڕۆیشتین، فانۆسێکی تایبەت هاوشێوەی مزگەوتبوو. جگە لەم فانۆسانە فانۆسەکانی گەورەتر لەشەقامەکان هەڵدەواسران. لەمەیدانی (راس الحسین) لەمەیدانی هەموو گوندەکان لەسەرتاسەری میسر، شێخەکان بەدرێژایی شەو لەژێر خێمەکانی ڕەنگاوڕەنگی خۆیان قورئانیان دەخوێند. لەزۆر لەشوێنەکانی قاهیرە هاوکات لەگەڵ قورئان خوێندنەوە هەندێك لەهونەرمەندانی خۆجێی هونەری خۆیان پێشکەش دەکرد.

لەمانگی ڕەمەزان من تاکو درەنگانی شەو بەئاگا دەبووم، بەیانیان زوو لەخەو هەڵدەستام. زۆرجار من و خوشکم هەستمان دەکرد کەهیچ نەخەوتووین چونکە دواتر بەدەنێکی زۆرخۆش و بەدهۆڵکۆتان موسڵمانیان لەخەو هوشیار دەکردنەوە بەراستی دەنگیان زۆرخۆشبوو. لەبەردەرگای هەموماڵێك ڕادەوەستان و بۆمنداڵەکانی خەوتوو بەناو بانگیان دەکردن و شێعرێکیان بەناویان دەخوێندەوە:((جیهان لەخەو هەستە، داڵیا لەخەوهەستە، نادیا لەخەو هەستە، تهانی لەخەو هەستە، ڕۆژووگرتن باشتر دەبێت لەخەوتن، هەستەوە خودای هەمیشەیی بپەرستە.)) لەڕۆژی یەکەمی جەژن دوای کۆتایی هاتنی مانگی ڕەمەزان دهۆڵکوتەکان بۆ وەرگرتنی جەژنانەی خۆیان دەهاتن. زۆرجار بۆسوپاسکردن لەدەنگ و ئاوازیان چەند دراوێکمان لەناو کاغەزێك دەپێچانەوەو ئاگرما لەکاغە بەردەداو لەپنجەرەی ماڵەوە فڕەمان دەدانە دەرەوە بۆئەوەی ئایا ئەوان دەزانن دراوەکان لەچ شوێنێك دەکەونە خوارەوە. لەهەڵسانەوەی

بەرەبەیان بێزاربووم. کاتێك دایکم بۆپارشێو بانگی دەکردم دەمگوت:((من پارشێو ناخۆم، ڕێگام بدە زیاتر بخەوم.)) بەلآم زۆربەی جارەکان بەزۆر هەڵیدەستاندمو دواتر کە گەورە بووم ئەمەیانم بەمنداڵەکانی خۆم دەکرد چونکە یەکجار نانخواردنیان لەتەمەنی گەشەکردن وەك پێویست نەبوو.

لەمانگی رەمەزان ئەرك نییە بەسەرهەموو موسلمانەکان کەرۆژوو بگرن. جگە لەمندالآن، قۆرئان کەسانێك کەلەسەفەرن یان لەشەڕێکی پیرۆزدان بەخشراون. موسڵمانەکانی کەکێشەی گورچیلەو نەخۆشی شەکریان هەیە کەدەبێت بەردەوام ئاو بیخۆنەوە یان شتێك بیخۆن لەرۆژوو گرتن بەخشراون، هەرلەجیاتی رۆژووگرتن دەبێت زکی هەژارێك تێر بکەن. ژنانی دووگیانو شیردەر، ژنانی لەسووری مانگانەی خۆیاندان لەرۆژوو گرتن بەخشراون، ئافرەتێك ئەگەر جەستەی خاوێن نەبێت، ڕێگاپێدراو نییە رۆژوو بگرێتو پاڕانەوەی رۆژانەی وەك نوێژکردن بکات.

لەکۆتایی مانگی رەمەزان، پشوودانێکیتری ئایینی هەبوو جەژنی کۆتایی رەمەزان. سێ رۆژی بەدوایەکتردا جەژنبوو ئەمەیان پێچەوانەی مانگی رەمەزانبوو، هەروەك خودا خواردنو خواردنەوەی لەمانگی ڕەمەزان حەرام دەکات لەرۆژانی جەژن نەخواردن حەرام هەژمار دەکرێت ئەم بڕیارە هەموو کەسێك دەگرێتەوە. هەموو گەڕەكو شوێنو فەرمانگەکانو قوتابخانە، کارگەکان دەکەن بەپشوو. سەدەقە دەدرێتە هەژارو نەدارو دەرۆزەکەران. بەرپرسانی کاروبارەکان جلوبەرگی نوێی پێشکەش بەفەرمانبەرو کرێکارانی خۆیان دەکەن. منداڵەکان لەم جەژنەدا بێبەش ناکرێن لەکڕینی جلوبەرگو پێلاو. لەکۆتایی مانگی رەمەزان نابێت کەس بێبەش بمێنێتەوە. دواتر ژیان دەگەڕێتەوە بۆ شێوازی ئاسایی پێشووتری خۆیی.

لەمنداڵیدا بوونەیەکیتری خۆشەویستی نیشتیمانی هەبوو بەناوی (شم النسیم) بۆنی خۆشی سروە یان هەمان شنەبا. لەیەکەمین رۆژی بەهار، هەمووکاتێك هاوکاتە لەگەڵ یەکەم دوو شەممەی دوای جەژنی پاك مەسیحیانی قبتی بوو، تەواوی خەڵکی قاهیرە ئەگەر دەیانتوانی دەچوونە دەرەوەی شار. چونکە بەپێی سونەتو نەریت باوەڕیان سروەی بەیانیان ئەم رۆژە کاریگەریی باشی خۆیی هەیە. جەژنی (شم النسیم) وەك زۆر لەدابو نەریتەکانیتری ئێمە یادگاری سەردەمی فیرعەونەکانە. زۆر لەجەژنەکانی شم النسیم یان هەمان شنەبای بەرەبەیان وەك خۆی ماوە. هەرچەند خێزانی ئێمە هەمووی وەك خۆی جێبەجێ نەدەکرد، بەلآم

خزمەتکارەکانی ئێمە جێبەجێیان دەکردن، بۆنموونە شەوانە پیازیان لەژێر سەرینی خۆیان دادەنێن رۆژی دواتر بۆنی دەکەن. دەیانگوت بەم شێوەیە کەپووی ئێمە زیاتر دەتوانێت هەست بەشنەبای بەیانیان بکات کەبڕیارە بەیانی هەمان رۆژ دەست پێبکات. بەهەرشێوەیەك بێت جەژنی سروەی بەیانیان بۆئێمە رۆژێکی خۆشی بەهارییبوو هاوڕا لەگەڵ هاوڕێیانمان لەهاوین هەوارەکانمان تێپەڕدەکرد.

خۆرێکخستن بۆئەم رۆژە خۆی لەخۆیدا سەیرانێکی گەورەبوو. منو خوشکم هێلەی کولاومان بەرەنگی سوورو زەردو شین رەنگ دەکردن. ئەگەر بەخت یاوەرمان دەبوو، دایكو باوکم ئێمەیان دەبردە قاوەخانەو شیرینی فرۆشی بەناوبانگی گرووپی لەناوەندی شار تاکو سەوێنێکی پڕ لەشیرینەکانی هاوشێوەی کەرویشكو هێلکە بکڕین. رۆژی دواتر لەبەیانییەوە بەرێدەکەوتین بۆماڵی پووری بەتە، ماڵی زاڵبوو بەسەر یەکێك لەلقەکانی رووباری نیلو ئەهرامەکانو باخەکانی نیشتیمانی زۆرجوان لەناوبەندی نیل، یان جیزە. باخچەی ئاژەلان هەمووکاتێك قەلەبالغبوو. شەقامەکان وەك قەراغ رووباری نیلێ قەلەبالغبوون، بەلام هیچ کەسێك گرنکی بەم لایەنە نەدەدا. هەموومنداڵەکان جلوبەرگیی نوێیو رەنگاوڕەنگیان دەبەردابوون هەمووشوێنێك جمەی لەخێزانەکان دەهات کەبەدەوری سفرەی خۆیان کۆبببوونەوە. گوڵفرۆشەکان لەسەرتاسەری پارك دەسوڕانەوە گوڵفرۆشیان دەکرد. باوکم زۆرجار بەلەمێکی بچوکی بەکرێ وەردەگرت، تەنیا بەلەمێکی سەردەمی فیرعەونەکان کاری دەکرد ئێمە سەرەرایی بوونی هێزی ئاوی نیل بەرەو پێشەوە دەڕۆیشتینو دواتر دەگەڕاینەوە هەوای تازەمان هەڵدەمژی.

زۆرجار باوکم بۆخواردنی نانی بەیانیان دەبردە میناهۆز. هوتێلێکی جوانو کۆن لەنزیك ئەهرام کەلەسەردەمی ئیسماعیل پاشا دروستکرابوو تاکو ببێتە کۆشکی نێچیروانی پاشایەتیو دواتر لەساڵی ١٨٦٩، لەکاتی بەرێوەچوونی جەژنەکانی کرانەوەی نۆکەندی سوئێز، کرایە میوانخانە. لەئەیوانی کەدەروانییە مەلەوانگە دادەنیشتین شەربەتی فێنك کەرەوەمان دەخواردنەوە دواتر خواردنەکانی بەهاری کۆنمان دەخواردن وەك هێلکەی کولاو، پیازی نوێ، خاس، ماسی دوکەڵگرتووی سوێر کەلەژێر خاك ئەم کردارەی تێپەڕ دەکرد . بۆنێکی زۆر نەخۆشی لێدەهات، بەلام زۆر بەتامو خۆشبوو. جێگای سەرسوڕمان نەبوو دایکم ئامادە نەبوو لەدەمی نزیك بکاتەوە بۆخۆی هێلکەو پەنیری داوادەکرد.

دایکم زۆر هۆگری میناهۆزبوو. زۆر لەخەڵکی قاهیرە بەردەوام بۆخواردنەوەی چا لەئەیوان‌و لەژێر سێبەری هەرەمی‌و خۆخ دادەنیشتن، دواتر من‌و هاوسەرم و منداڵەکان لەرۆژی جەژنی سروەی بەیانیان بۆخواردنی بەیانیان کەشوێنی خواردنی نیوەڕۆشی دەگرت دەڕۆیشتین بۆمیناهۆز. لەم میناهۆزەبوو کە ئەنوەرو سەرۆك جیمی کارتەر بۆ ئاشتی لەگەڵ ئیسرائیل رێککەوتن.

بەهەمان رادە کەسروەی بەیانیان جەژنی خۆشەویستم بوو لەبەهاردا، هەستانی ئاستی رووباری نیل لەکۆتایی هاوین بوو. ساڵی یەکجار لەیەکێك لەرۆژەکانی مانگی ئاب، ئاوبەندی باشووری نیل هەڵدەگیراو ئاوی رووباری نیل هەڵدەستاو قوڕو لیتەی قورسی لەسەرچاوەی خۆی ئۆگانداو ئەتیوپیی دەهێناو لافاوی دوومانگە دەستی پێدەکرد.

باشترین خۆشترین بەشی ئەم جەژنەی هەستانی ئاوی نیل لەدورگەی رۆزە رێکدەخرا. چەند رۆژ پێش هەڵسانی ئاوی نیل، بانگدەرانی نیل لەگەرەکی ئێمە بەرێ دەکەوتن‌و هەواڵی هەستانی لافاویان لەرووباری نیلی گەورە دەگەیاندە خەڵك بەهەمان پێوانەی سەدەی هەشت لەکۆتایی باشووری داوێنی دورگەی ئێمە دروستکرابوو، رایان دەگەیاند بەباوەڕی گشتی خەڵك چێنکەی حەزەرتی موسا (د.خ) لەتەمەنی شیرخۆری لەناویان دانابوو لەهەمان شوێن‌و خاڵ لەئاویان دەرهێناوە. ئەم بانگدەرانە هەموو رۆژێك لەگەرەکی ئێمە دەسوڕانەوەو پێوانەیی ئاویان بەهەمان پێوانەیی کۆنی نیل دەگەیاندە خەڵك، واتە هاتنە سەرەوەی ئاستی ئاو بۆنزیکەی شەش مەتر لەئاستی ئاسایی خۆیی.

لەهەمان رۆژەکانی کەئاستی ئاوی نیل دەگەیشتە رادەی بەرزبوونەوەی خۆی کەلافاو هەڵدەستا جەژنی زۆرخۆش‌و تێرو تەسەڵ بەرێوەدەچوون. دەمانزانی کاتی ئەوەیە کەبانگدەرەکان لەگەڵ منداڵەکان ببینین بەئاڵاکانی بچوکی رەنگاورەنگ دهۆڵکوتانی خۆیان دەست پێدەکرد. بانگدەر هاواری دەکرد:((رووباری گەیشتە ئاستی خۆیی.)) کوڕەکان وەڵامیان دەدایەوە:((ئەم لافاوە خودا داویەتی!)) لەپێش دەرگای ماڵەکان رادەوەستان‌و هاواریان دەکرد تاکو جەژنانە وەرنگرن ناڕۆن. دواتر جەژن‌و شادی دەستی پێدەکرد.

بەلەمی فلوکە، شێوە خانوویەکی بچوکی لەسەر دروست دەکرا هەموویان بەفانۆس‌و چراکان رووناك دەکردەوە، لەگەڵ ئاڵاکانی بچوکی سێ گۆشە، لەناو رووبار دروست لەقەراخ دوورگەی رۆزە کۆدەبوونەوە. لەقەراخ نیل وەك بەلەمەکان بەچراکانی رەنگاورەنگ دەرازایەوە، لەسەر

هەندێك لەبەلەمەكان دەستەی مۆزیك مۆزیكی خۆیان دەژەنی، ئێمە لەقەراخ رووبار گوێبیستی ئاهەنگی جۆراوجۆر دەبووین كەلەناو رووباری نیل دەگەیشتە لامان. بەلەمەكانی كەتۆپیان لەسەر دانابوون دوای پانزدە خولەك تۆپێكیان دەتەقاند بۆئەوەی خەڵك زیاتر لەقەراخ رووباری نیل كۆبكەنەوە.

دیمەنێكی زۆرجوانبوو - بەچاوی من زۆر شاعێرانەبوو. لەكۆتایی دورگەی ئێمە بەلەمێك بەرەنگەكانی جۆراوجۆر لەكەناراوەكان دەبەسترایەوە بەمۆدێلی گەورەی بەدارو وەك كچەكان دەرازاندرایەوە كەبەبووكی نیل ناوبانگی دەركردبوو. بەدەستپێكی هەستانی ئاوی نیل((بووك)) لەكاتی ئاوابوونی خۆر دەخرایە ناو نیل تاكو بگاتە(زاوا)) ئەمەیان بۆ ئەوەبوو كەئەم ساڵ ساڵێكی پڕخێرو بەرەكەت دەبێت. ئێمە لەقەراخ رووباری نیل رادەوەستاینو چەپڵەمان لێدەدا هەراو هورای خۆمان دەكردو لیتەی ناو رووبارمان دەردەهێنا. ئاسمان لەتەقاندنی فشفشەكان سوور هەڵدەگەڕا. شەیدای شاعێرانەی پەیوەندی هەردووكیان بووم واتە رووباری نیلو بووكی دارین. لەهەمان كات سوپاسی خودا دەكەم كەئێستا هەمان بووك لەدار دروست دەكرێ كچێكی گەنج نییە كەبەپێی ئەفسانەكانی میسر هەموو ساڵێك كچێك دەكرایە قوربانی ئەم جەژنە. ڕەوانەی ناو رووباری نیل دەكرا.

لەساڵی ١٩٦٤ كاتێك كەبەنداوی گەورەی ئەسوان دروستكرا مەراسیمی هەستانی ئاوی رووباری نیل كۆتایی هات. كاتێك نەماندەتوانی هەستانی لافاوی نیل بكەین بەجەژن زۆر خەمبار دەبووین. بۆ ماوەیەك ئەم دابو نەریتانە گۆڕانیان بەسەردا هاتبوو، بۆنموونە بەرزبوونەوەی ئاستی رووباری نیل لەرێگای رادیوی قاهیرە بلاّو دەكرایەوە شوێنی بانگدەرەكانی دەگرتەوە. بەلاّم زۆر لەئەفسانەكانی رووباری نیل وەك خۆیان ماون، بۆنموونە شلێرەی ئاوی، واتە گوڵەجوانەكانی كەلەناو ئاوەكانی وەستاو پەنگ خواردوو دەپشكوتن، ئێستاش بە((بووكی نیل)) ناودەبەین.

لەمنداڵی خۆمدا پێش دروستكردنی بەنداوی ئەسوان لەكاتی هەستانی ئاوی نیل زۆرجار بەخێراو مەترسیدار رێگای خۆی لەباكوور بەرەو دەریایی سپی ناوەراست دەڕۆیشت. بەیانیان كاتێك دەرۆیشتینە قوتابخانە دەبێت لەقەراخ رووباری نیل تێپەڕمان كردبا رووبار نزیكەی دوو مەتر هەڵدەكشا، دایكو باوكمان ئامۆژگاریان دەكردین كە لەرووبار نزیك نەبینەوە، بەلاّم ئێمەی منداڵان ئامۆژگاری ئەوانمان بەهەند وەرنەدەگرت.

کاتێك من تەمەنم هەشت ساڵو خوشکم شەش سالبوو، رۆژێکیان لەنزیك پێڵێکانێك لەقەراخ رووبار چاوم بەپشیلەیەکی ڕەش کەوت کەلەناو بەلەمێك گیرۆدە ببوو، ئاو بەلەمەکەی نزمو بەرزدەکردەوە. بەخوشکم گوت:((دەبێت ئەم پشیلەیە رزگار بکەین! زۆری نەماوە نقوم دەبێت.)) بەلام زۆری نەمابوو خوشکم لەجیاتی ئەم پشیلەیە نقوم ببێت. لەبەرامبەر چاوەکانی ترس لێدراوم پێی خوشکم لەپلێکانی کۆتایی دەتەسێتو دەکەوێتە ناو رووبار لەناکاو گەڕاو نقومی ژێر ئاوی کرد. بەلام توندی ئاو بۆناوحۆی راکێشا. بەپەلە بۆلای براکانم رۆیشتم کەبەدوای ئێمەدا دەهاتن هاوارم کرد:((یارمەتی، یارمەتی!)) هەردووکیان خۆیان فڕەدایە ناو ئاوی رووبار برام عەلی خۆشی لەناو گەڕاو سەرگەردانبوو.

من بەهاوارکردن تەماشای برام مجدی دەکرد کەهەولی خۆیدەدا خوشکو براکەم رزگار بکات. مجدی بەسەرسوڕمان توانی خوشکو برام رزگار بکاتو دواتر لەبەر ماندووبوونی بێهۆش کەوت. خەڵك لەئێمە کۆبوونەوە توانیان هەناسەی خوشکم بۆی بگەڕێننەوە. لەترسان دەمردم زکی خۆشکم لەئاو وەك هەنبانەی لێهاتبوو، رووخساری سوور هەڵگەڕابوو. لەسەر زکی درێژکراو پێپیەکانی بۆسەرەوە بەرزکرانەوەو دەستیان بەتوندی لەپشتیدا. لەتەواوی ژیانمدا ئەوەندە هەستم بەگوناح نەکردبوو. لەجیاتی ئەوەی چاودێری خوشکم بکەم، خەمی پشیلەی ناو بەلەمەکەبووم. دوای ماوەیەك دالیا دەستی بەکوخەو هەناسەکێشان کرد. کاتێك دایكو باوکم هەواڵیان پێدەگات دەستبەجێ گەیشتنو هەموومان پێکەوە گەڕاینەوە بۆماڵەوە. بۆیەکەمجارو کۆتایی لەژیاندا سزادرام. دایكو باوکم لەسەر بێبەرپرسیارەتی من لەسەرسەرم هاواریان کرد. دواتر باوکم منی لەژوورەکەمدا زیندانیکردو گیرۆدەی لێدانێکی باشبووم. هیچ گلەیم نەبوو، دەمزانی شایستەی ئەم سزادانم.

لەناوخێزانی ئێمەدا بەردەوام بەرپرسیارەتی منداڵەکان لەسەر شانم بوو. بۆیەکەی بەدروستی نازانم، چونکە براکانم زۆر لەمن گەورەتربوون. لەوانەیە لەبەر ئەم هەستە بێت کەبۆخۆم هەبوو، لەوانەیە پێشتر دەمزانی کەژیانم تایبەت دەبێت. زۆرجار خەونم دەبینین کەخەڵك رێزیان لێدەگرتمو بۆدایكو باوکمو پوورەکەم زوزو دەگێڕایەوە. ئەمانەش دەیانگوت:((بڕیاروایە کاتێك کەگەورەبووی کارەکانی گرنگ بکەیت.)) ئەم پێشبینیانە پوورە زوزویان دەترساند.

لەزۆربێژی من توورە دەبوو لەترسی ئەوەی کەئەم قسەیانە بۆمن هیچ بەختیان نەبێت دەیگوت:((ئەم جۆرە قسەیانە نەکەیت.))

بۆناسودە بوونی خەیاڵی دەمگوت:((ئەمەیان هیچ ترسێکی نییە.)) چیرۆکی حەزەرتی یوسف لەناو قورئان بەبیرم دەهێنایەوە کەدوای گەیشتن بەدەسەلأت براکانی کەوەك کۆیلە دەفرۆشن لێیان خۆشدەبێت. دەمگوت:((کاتێك کەهەمان رۆژبێت، من وەك حەزرەتی یوسف خۆشەویستیم بۆهەمووتان دەبێت.))

پوورم پێدەکەنی، بەلأم بەردەوام پێداگری دەکرد کەئەم جۆرە خەونانە بۆ کەسێکیتر باس نەکرێن.

نازانم بۆچی گیرۆدەی ئەمجۆرە خەونانە دەبووم، ئێمەی منالأنی دورگەی رۆزە لەژیاندا گیرۆدەی کێشە نەدەبووینەوە زۆربەباشی پشتیوانی دەکراین. ئەوکات بیرم دەکردەوە هەمووخێزانەکان وەك ئێمە بەئارامیو خۆشی ژیان بەسەردەبەن. هەژاری کەبەرۆکی زۆربەی میسرییەکانی گرتبوو نەمان دەبینین، تاکو تەمەنی سیانزدە ساڵی لەگەڵ باوکم سەردانی موڵکی خێزانیمان کرد. تاکو هەمان کات هیچ گوندێکم لەنزیك نەدیبوو، بەلأم دەبێت کێشەکانی دونیای گەورە لەشوێنێك خۆیان خزاندبا ناو ژیانم، فێربوونی من بەبینینی پیرەژنێك دەستی پێکرد کەلەناو کەلێنی دارێك ژیانی خۆی بەسەر دەبرد.

رۆژێکیان یەکێك لەهاوپۆلەکانم باسی ئەم ژنەپیرەی بۆکردم، دوای پشووی کۆتایی هەفتە سەردانی ئەم شوێنەم کرد. راستی دەکرد. ژنی پیر بۆی باسکردم هیچ منالو کەسووکاری نییە، هیچ کەسێك چاودێری ناکات. دڵم بۆی سووتاو بڕیارمدا لەتەمەنی دەساڵی خۆم چاودێری دەکەم. هەموو رۆژێك دوای گەڕانەوەم لەقوتابخانە سەردانم دەکرد، تەواوی پارەی ناوگیرفانمو خواردنی خۆم پێشکەش دەکرد، بەلأم بۆهیچ کەسێكو دایکم باس نەدەکرد. ئەمەیان نهێنیو دۆستم بوو.

رۆژێکیان بۆم باسکرد ئەگەر دایکم قبووڵ بکاتو توورە نەبێت:((دەتوانی بیت لەماڵی ئێمە بەردەوامی بەژیان بدەیت؟))

پیرەژن لەناو کوڵری دار جێگای خۆی خۆشکردبوو گوتی:((ئەم شوێنەم خۆشدەوێت تەنیا جاربەجار سەرێکم پێی هەڵێنە.))

نیگەرانی چاوەکانیبووم چۆنکە بەردەوام دەمبینی چاوەکانی خۆی پاك دەکردنەوە. پێداویستی بۆپاکردنەوەی چاوەکانی لەجانتای خۆمدەنانو دڵۆپێکم لەناو چاوی دەکردو دواتر بۆم خاوێن دەکردەوە هیچ کاتێك رێگری لەم کارەی من نەدەکرد.

دوای هەفتەیەك کەوەك جاران نەدەگەڕامەوە ماڵەوە، دایکم پرسیار بارانی کردم. نەمتوانی بەرگری بکەم نهێنی خۆم بۆدایکم ئاشکرا کرد. هەستایە سەرپێی‌و دەستەبجێ پزیشکی بۆهەمان پیرەژن رەوانەکردوو دوای بینینی چاوەکانی زانیم کە بینایی چاوەکانی نەماوە لەبەرهەندێك نەخۆشی باوی هەمان سەردەم بینایی چاوەکانی لەدەستدابوو. چونکە نهێنیم ئاشکرابوو ویستم هاوڕا لەگەڵ هەندێك لەهاوڕێیانم سەردانی ژنەپیرەکە بکەین. گوتم:((هیچ مندالێکت نییە ئەمانە هاوڕێی منن هەموومان مندالّی تۆین.)) چەندین مانگ سەردانم دەکرد، خواردن‌و جلوبەرگم بۆ دەبردن، رۆژێکیان بینیم شوێنەکەی خاڵیبوو.

پیاوێك لەسەر شەقام شیرینی دەفرۆشت پرسیارم لێکرد:((بۆچ شوێنێك رۆیشتووە؟))

گوتی:((ئەمرۆ بەیانی گیانی سپاردبوو، پاسەوانێك هات جەستەی ژنەپیرەکەی لەگەڵ خۆیدا برد.))

دڵم شکابوو، چونگە هەستم دەکرد بەچاودێری من بەزیندوویی دەمێنێتەوە. هیچ کاتێك لەیادم نەکرد.

هاوین لەمانگەکانی تەمووزو ئاب، کەش‌و هەوا لەقاهیرە زۆر گەرم دەبوو پلەی گەرمی تاکو چل بەرز دەبوویەوە. ئێمەش وەك زۆر لەخێزانەکان لەم رۆژانەدا دەرۆیشتینە قەراخ دەریایی سپی ناوەراست. چەندین ساڵ دەبوو کەخێزانی من لەپۆرت سەعید نزیکەی سەدو هەشتا کیلۆمەتر لەقاهیرە دوور لەنزیك دەرگای نۆکەندی سوئێز، ژوورێکی گشتوگوزاریمان بەکرێ وەردەگرت. باوکم ئێواران بۆماسیگرتن دەرۆیشتە سەر پردێك لەنزیك نۆکەند لەکاتی گەڕانەوەی ئەگەر ماسی هاوپێوانەیی لەگەڵ خۆیدا دەهێنانەوە دەمانزانی کەهیچ ماسییەکی نەگرتووەو ئەمانەی لەکەسانیتر کڕیوون.

شاری پۆرت سەعید ژینگەیەکی ئەورووپی دەهاتە بەرچاو تاکو میسری، بەرێزبەندەی خانووەکانی کەرپووچی‌و سەرەوەیان بەرەنگی سپی داپۆشراو، پێشەوەیان بەگوڵی جوان دەڕازایەوە. ژوورەکانی کەبەدار دروست دەکران پوورە زوزوو پوورە بەتەو باوکم بەکرێ وەریان دەگرتن دروست لەقەراخ دەریا، خانووە دارینەکانی کەلەسەر ئەستوونەکان لەناو ئاودروست دەکران‌و ئاو بەژێریاندا دادەرۆیشت. فێنکترین شوێن ژێرەوەی ئەم خانووە دارینانەبوو. لەگەڵ مندالآنی پوورم‌و هاوڕێیانیترم لەم شوێنانە کۆدەبووینەوە بۆیاریکردن. شەوانە بۆخواردن هەموومان لەخانوویەکدا کۆدەبووینەوە. ئەم شوێنانە کارەبای نەبوو چرای

نەفتیمان دادەگیرساندن. زۆر حەزم لەم رووناکییە دەکرد. کاتێك کەتەمەنم گەیشتە چواردە ساڵانو گەڕاینەوە بۆ پۆرت سەعید کارەبا گەیشتبوو ئەم شوێنە زۆر خۆزەگەم بەچراکانی نەفتی دەخواست.

لەهەمان سەردەم لەوەرزی هاوین زۆربەی چینەکانی سەرەوە لەدەرەوەی ولات بەسەریان دەبرد. بەڵام من هیچ کاتێك ئیرەیم بەم کەسانە نەدەبرد. لەمنداڵی عاشقی شاری پۆرت سەعید بووم، لەبەیانییەوە تاکو ئێواران سەرقاڵی یاریکردنو مەلەوانی دەبووین. دواتر یاری خۆشاردنەوەمان دەکردو گەورەکان لەیەکتر کۆدەبوونەوە. لەتاریکایی شەو لەقەراغ دەریا دەماینەوە سەرقالی یارییەکانی جۆراوجۆری خۆمان دەبووین، تاکو کاتژمێر نۆی شەو کاتی خوارد.

ئەسکەندەرییە، لە١٦٠ کیلۆمەتری بەرەو رۆژئاوا، شارێکی نیودەوڵەتی قەڵەباڵغو لەلایەنی فەرهەنگی نوێخوازبوو. پۆرت سەعید زیاتر شوێنی پشوودانی خەڵکی میسربوو، خێزانەکانی کەهەمووساڵێك پشووی هاوینەی خۆیان لەهەمان شوێن تێپەڕ دەکرد. زۆر لەشەوەکان سەردانی سینەمای سەرکراوەی گەورەی هاوینانمان دەکرد، لەسەر کورسییەکانی دارین دادەنیشتین بەردەوام تووی شفتیمان دەتروکاندنو شیرینی زۆربەتامی هەنگوینیمان دەخواردن کەتەنیا لەپۆرت سەعیدو بەندەری دیمیات دروست دەکران. لەهەمان سەردەم فیلمی زۆرجوان لەمیسر دروست دەکران. ئەوکات میسر دووەم وڵاتی بەرهەمهێنانی فیلم بوو لەجیهاندا. خۆشەویستیمان بۆفیلمەکانی ئەمەریکاو ئەورووپا هەبوو تەنیا خودا دەزانێت چەندینجار تەماشای فیلمی بابردوو یان خۆفڕەدانی ئیسترو ویلیام لەسەر تەختەداری ناو ئاوم دەکرد. کەشو هەوا، شیرینییەکانی هەنگوینی ئەوەندە بەتامو خۆشبوون دڵم دەیوویست هەمووکاتێك هاوین بێت.

لەیەکەم پێنج شەممەی هەرمانگێك، ئێمەش وەك ملیونان میسرو زۆربەی خەڵکی دونیای عەرەب لەپۆرت سەعید یان لەقاهیرەو لەهەر شوێنەك دەبووین بەدەوری رادیو کۆدەبووینەوە تاکو گوێبیستی کۆنسێرتی مانگانەی ئوم کلسوم بین کەراستەوخۆ بڵاو دەکرایەوە.

تاکو دەگاتە ئەمڕۆ لەجیهانی عەرەب، پێش یان دوایی هیچ هونەرمەندێك وەك ئوم کلسوم خۆشەویست نەبوو. ئوم کلسوم ئەوەندە بەهەستو خۆشەویستی گۆرانی دەگوتن زۆر لەخەڵکانی کەبەشداریان لەکۆنسێرتی دەکرد یان لەرێگای رادیو گوێبیستی دەبوون دەگریان.

دەنگی سێحراویی و توانای لەرادەبەدەری کەدەیتوانی نۆتێك خولەکێك و نیو درێژبکات. لەهەموو کۆنسێرەتەکان تەنیا سێ گۆرانی دەگوتن. دووانی سەرەتایی نزیکەی دووکاتژمێر درێژەی دەکێشاو سێیەم کاتژمێرێکبوو. هەڵبەستەکانی دووبارە دەکردنەوە بەلاّم بەردەوام برێك ئاوازی دەگۆڕی.

بەباوەڕەیی ئەوروپییەکان ئاوازەکانی دووبارە بوون، بەلاّم ئێمە ئەم بیرکردنەوەمان نەبوو. بەچاوی بیانییەکان تەپۆڵکەکانی بیابان هەمووی وەك یەکن، بەلاّم بەچاوی ئێمە هەموویان لەیەکتر جیاوازن. هەموو کۆنسێرتەکانی ئوم کلسوم لەپێنج شەممەکان خەڵکی لەچوارگۆشەی جیهانی عەرەبی رادەکێشا بۆقاهیرە. بازرگانانی لوبنانی شێخانی کویت و سعودی هەموو مانگێك بەفرۆکە بۆبیستنی دەنگی دەگەیشتنە قاهیرە.

کاتێك لەساڵی ١٩٥٣، لەبەرجۆرێك نەخۆشی کەلەقورگی دەرکەوت دەنگی ئوم کلسوم گیرا، ئەم هەواڵە بەجۆرێك قورسبوو رۆژنامەکان لەناو چوارچێوەی ڕەش بلاّویان کردەوە. دکتۆرەکانی عەرەب لەترسی ئەوەی کەدەنگی سێحراوی زیان نەبینێت ئامادە نەبوون نەشتەرگەری بۆبکەن، لەکۆتایدا ناوەندی پزیشکی هێزەکانی دەریایی ئەمەریکا، لەبێتێسدای مریلەند، ئامادەی دەربڕی کەدەتوانن نەشتەرگەری قورگی بۆبکەن و سەرکەوتووانە کۆتایی هات و توانی دووبارە دەست بەگۆڕانی گوتن بکاتەوە. هەندێك کەس دەڵێن ئەمەی ئەمەریکا لەبەرامبەر هونەرمەندێکی میسری لەسەردەمی سەرۆکایەتی جەمال عەبدولناسر کردی بۆپاراستنی پەیوەندی نێوانیان بوو.

دواتر، من و ئوم کلسوم لەنزیکەوە یەکترمان ناسی و زۆریش هاوڕێی بووین، بەشداری لەئاهەنگی دەزگیرانی کچە گەورەی مندا کردو گۆڕانی گوتن. لەسەردەمی نەخۆشی نەیدەتوانی لەگۆڕانی گوتن بەردەوام بێت، سەردانم دەکردو ماوەیەك پێکەوە دەرۆیشتین. بەلاّم رۆژبەرۆژ لاوازتر دەبوو، تاکو لەئەنجامدا نەیدەتوانێت هەستێتەوە. لەساڵی ١٩٧٥، جاری کۆتایی کەبەدیداری شادبووم، بەناوی(سوما) بانگم کرد هەمان ناوی خۆیانەی بەناوبانگ کەبەم ناوە بانگیان دەکرد. گوتم:((سۆما، بۆچەند هەفتەیەك سەردانی ئەمەریکا دەکەم. دەمەوێ کاتێك دەگەڕێمەوە تەندروستیت ئەوەندە باش بێت کەپێکەوە پیادەڕەویی بکەین.)) بەدەنگی زۆر لاواز گوتی:((باشە خاتوو سادات بەڵێن دەدەم.)) کاتێك گەڕامەوە ئیتر لەم دونیایە کۆچی کردبوو. رادیوی قاهیرە بۆڕێزگرتن لەیادی دوای بلاّوکردنەوەی هەواڵەکانی شەوانە. ئایەتێکی

لەقورئانی پیرۆز بلاودەکردەوە، جولانەوەیەکی تایبەتبوو لەرادیوی قاهیرە بۆسەرانی حکومەتو کەسانی بەناوبانگ. تاکوئێستا میسرییەکان یەکێك لەرادیوکان بەرادیوی ئوم کلسوم ناودەبەن، لەدەستپێكو کۆتایی بەرنامەکانی گۆرانییەکی ئوم کلسوم بلاودەکاتەوە.

لەتەمەنی یانزدە ساڵیو بەردەوام بوون لەخوێندن دەبێت رۆژانە لەجیزە بۆئەوبەری پرد رۆیشتبام، وەك سەردەمی سەرەتایی بۆقوتابخانەکانی جۆراوجۆر نەدەرۆیشتم. قوتابی قوتابخانەی ناوەندی کچانی حکومی بووم باوکم مانگانە سێ لیرەی بابەتی خوێندنم پێشکەشی قوتابخانە دەکرد. ئەمەیان جۆرێك لەزیادەرۆیی نەبوو کەسانێك بتوانن بخوێنن کەبتوانن مانگانەی خۆیان بدەن، قوتابخانەی ئێمە لەباشترینەکانبوو.

هەمان سەردەمی دەسەلاتی بریتانیا لەمیسر، خوێندنو قسەکردن لەقوتابخانەکانی ناوەندی بەزمانی ئینگلیزیبوو، لەگەڵ فێربوونی زمانی کلاسیکی عەرەبی، گفتوگۆکان تەنیا بەعەرەبی بوو. لەقوتابخانە جگە لەفێربوونی بیرکاریو زانست، لەسەرفێربوونی لێکدانەوەکانی کلاسیکی عەرەبی لەگەڵ ئێمەدا خۆیان ماندوو دەکرد. دواتر دەمتوانی قورئان بخوێنمەوە کەلەجوانترین نموونەکانی زمانی عەرەبیبوو، لەوتاری بەرپرسانی حکومەت تێگەیشتنم هەبێت، زۆربەیان بەزمانی کلاسیکی عەرەبی پێشکەش دەکران.

لەقوتابخانە لەنێوان دوو بەشی خوێندن دەبێت یەکێك هەڵبژێرم. بەشێك کەمن بۆ زانکۆ ئامادە دەکات لەگەڵ وانەکانی سەرەکی وەك بیرکاری، زمانی فەرەنسی، ئەدەبیاتو زانست. ئەویتر کۆنتربوو لەگەڵ وانەی سەرەکی بۆکچەکان لەوانە هونەرو مۆزیك، نیگارکێشی، مێژوو، دیزاینی جلوبەرگ، بەرگدرو، چێشت لێنان بۆئامادەکردنی کچێك کەهاوسەرگیری بکات. نازانم لەبەر تەنبەڵی یان لەبەر ئەوەی هاورێیانم دووەم هەڵدەبژێرن من وەك ئەوانم کرد.

لەتەواوی تەمەنم داخباربووم بەبریاری خۆم، هیچ کاتێك رێگا بەکچەکانم نادەم بەم شێوەیە دەرگاکانی ئایندە بەسەرخۆیاندا دابخەن. بەلام لەدەیەکانی چل هەلومەرج بەشێوەیەکیتربوو.

پرسیارم لەدایکم کرد:((چ بەشێك لەخوێندن هەڵبژێرم؟))

دایکم کەسێکی بەرزەفڕ نەبوو رازیبوو کەدایكو هاوسەرێکی باش بم. گوتی:((ئەگەر من هەڵبژێرم خۆت فێری بەرگدروویيو چێشت لێنان بکەیت باشتر دەبێت، کاتێك هاوسەرگیری دەکەیت هاوکارت دەبێت.))

پرسیارم لەباوکم کرد گوتی:((تۆ زۆرجوانی لەوانەیە زۆر لەلامان نەمێنیتەوە. لەم بەشە فێردەبیت کەهاوسەرێکی زۆرباش بیت.))

هیچ کەسێكو خۆم بیری نەدەکردەوە جگە لەهاوسەرگیری دەتوانم کارێکیتر بکەم.

لەتەمەنی سیانزدە سالّیدام کە کارەسات هێقەی خێزانی ئێمەی گرت. کچی گەورەی پوورە بەتە، لەئەنجامی نەخۆشی سیلو چەندین هەفتە مانەوەی لەنەخوشخانەو ناوەندی پاراستنی ئەم نەخۆشییە لەبیابانی حیلوان کوچی دوایی کرد. لەبەر دووجار بەدوای یەك پەیدابوونی مندالّ پێداگری دەکرد دەبێت بگەڕێتەوە بۆهەمان کێشی رابردووی خۆی، خۆپاراستن لەهەموو جۆرە خواردنێك گەیاندی بەم رۆژە نەخۆشە. من هەمووکاتێك خۆشەویستیم بۆکچی پوورەم هەبوو کچێکی جوانو باریك دلّم تێکشکا زۆر لەمەرگی گەنجایەتی ترسام. ئەمەیان یەکەم ئەزموونی خێزانی من بوو لەمەرگ.

کارەساتی دووەم دوای ماوەیەکیتر سەری هەلّدا. لەنێوان سالێکدا، مام مستەفا کۆچی دوایی کرد، بەتاوی ریخۆلّە. جارێکیتر خەم دایگرتین. مام مستەفا زۆر گەنجبوو، تەنیا سیو نۆ سالاّنبوو ئەوەندە لەلایەنی خاوێنی دوو دلّبوو شەوانە پارەی وردی ناوگیرفانی خاوێن دەکردەوە. مام مستەفا تازە بەتازە تامو چێژی لەژیان دەبرد. لەکاتی ناشتنی کچی پوورم کچێکی ناسیاو دەبینێتو هاوسەرگیری لەگەلّدا دەکات. ئەمەیان یەکەم هاوسەرگیربوو کەمن لەنێوانیدا کارم کردبوو.

دوای بەخاکسپاردنی کچی پوورم، کاتێك هەموو ئەندامانی خێزانی گەورە لەیەکتر کۆبوونەوە گوتم:((مام مستەفا تۆ تەنیایی دەبێت لەگەلّ نی نی هاوسەرگیری بکەیت. لەخزمو کەسانی ئێمەن بۆئێوە زۆرلەبارو باش دەبێت، ئێوە پێویستیتان بەکەسێکە کەهاوکاریت بکاتو مندالّ دروست بکات.))

مام مستەفا لەزۆر قسەکردنی من پێدەکەنی، دواتر وەك سەرکۆنەکردن گوتی:((خۆت تێکەلاّوی ئەم کارانە نەکەیت بڕۆکاروبارەکانی خۆت جێبەجێ بکە.))

بەلاّم من بەردەوامبووم بۆپوورە زوزوم باسکرد:((مام مستەفا زۆر تەنیایە. دەبێت هاوسەرگیری لەگەلّ نی نی بکات.))

پوورە زوزو لەگەڵمدا هاوڕابوو، هەرچەند بەم مانایەبوو کەژنێکیتر دەهاتە ناو ماڵەکەی چونکە پوورم لەگەڵ برام دەژیا. گوتی:((نی نی خزمی ئێمەیە هەڵبژاردنێکی باشە، لەگەڵ دایکی قسە دەکەم.))

دایکی نی نی دەستبەجێ ڕازیبوو ڕایگەیاند ئەم پەیوەندییە جێگای سەربەرزی خزمایەتی ئێمەیە. ساڵێك دواتر کچی لەچوارمانگی دووگیانیدا دەبێتە بێوەژن. وردبووم. رووم لەخواکرد.

هەستم دەکرد کەدەبێت ئەم مەرگانە قبووڵ بکەم بەدوای وەڵامیان لەقورئان دەگەڕام پێشتریش تامو چێژم لەم کتێبەی پیرۆز دەبینی کەبەدەنگی بەرزی خواپەرستێك دەخوێندرایەوە. گوێم لەرادیو دەگرت کاتێك چەند ئایەتێك دەخوێندرانەوە. زمانی جوانی کتێبی پیرۆزمان وەك زۆر لەموسلمانان کاریگەری لەسەر من دادەنا. تاکو شوێنێك کەدەمتوانی هەستەکانی خۆم لەناو چوارچێوەیەکی شیعری باس بکەمو پەسنی شاعێرەکان بکەم ئێستا بۆ ئارامی خۆم رووم لەئاینو مەزهەبم کردبوو.

خاڵەت نیعمەت، خاڵەتی هاوڕێم رجا، بۆیەکەمجار منی لەگەڵ کۆمەڵگەی خواپەرستان ئاشناکرد. یەکەم کەسبوو فێری نوێژی کردم. ژنێکی نەریتخوازبوو. هەمووکاتێك جلوبەرگی درێژبوون بۆئەوەی هیچ شوێنێکی دەرنەکەوێت. هەموو مووەکانی سەری دادەپۆشین. هەمووکاتێك بەم هەڵوێستو راپێچانەی منی وردبین دەکرد، چونکە لەناو خێزانی ئێمە هیچ کەسێك نەبوو تاکو ئەم رادەیە نەریتخوازبێت. رۆژێکیان رجا داوایکرد بڕۆین چایەك لەگەڵ خاڵەتی بیخوینەوە. قبووڵم کرد. ئەمەیان دەستپێکی چەندین کۆبوونەوەی بەدوای یەکی ئێوارنبوو. لەهەمان کۆبوونەوەی ئێواران توانیم ناسنامەی خۆم وەك موسڵمانو کەسێکی باوەڕدا بیدۆزمەوە. ئەمەیان بەتەواوی گۆڕانی بەسەردا هێنام.

زۆر لەپەروەرەدەو ئامۆژگارییەکانی خاڵەت نیعمەت لەسەر قورئان پێشتر دەمزانین بەلاّم ئەوەندە گەورە نەبووم کەبەتەواوی قبووڵیان بکەم. بۆنموونە دەمزانی قورئان قسەی خودایە لەرێگای جبرائیل لەساڵی ٦١٠ زایینی بۆحەزرەتی محەممەد (د.خ) وەك وەحی رەوانەکراوە، دەمزانی کتێبی پیرۆزی ئێمە لەگەڵ کتێبی پیرۆزی مەسیحیو یەهوودی جیاوازی هەیە. پێنج بنەمای ئایینی خۆم دەزانین یاساکانی شەرعی ئیسلام:((تاکپەرستی، بەمانای ئیمان هێنان بەخودای تەنیا، نوێژ، زکات، رۆژوو، حەج سەردانی مەککە کەسانێك کەتوانای داراییان هەبێت. خودا بەخشایشە کەسانێك هەژارو نەدارو لایەنی دارایی باشیان نەبێت بەخشراون.

لەسەردەمی منداڵی تاکو شوێنێك کەلەتوانام دابێت زۆر لەم ئەرکانەی ئایینیم جێبەجی دەکردن. پارەی خەرجی ڕۆژانەی قوتابخانەم پێشکەش بەهەمان پیرەژنی نابینا دەکرد کەلەناو کلۆری دارێك ژیانی کۆڵەمەرگی خۆی بەسەر دەبرد. لەمانگی رەمەزان لەگەڵ خێزانم ڕۆژووم دەگرتن، شتێك کەدەبێت لەخاڵەت نیعمەت فێریم شێوەی وەستانی نوێژکردن‌و بەجێگەیاندنی ئەرکی نوێژ گرنگترین لایەنە لەئیسلامدا. ئەوەندە گرنگە ((بەکلیلی بەهەشت)) ناودەبەن. هیچ موسڵمانێك ناتوانێت خۆی لەئەرکی نوێژ بەدوور بگرێت. ئەگەر بڕوادارێك لەلایەنی جەستەیی ناتەواوبێت نەتوانی هەڵسان‌و دانیشتن بکات دەبێت بەدانیشتن جێبەجیٚ بکات. ئەگەر خواپەرستێك بەتەواوی جەستەی پەك کەوتبێت دەبێت بەهەڵسوڕاندنی چاوەکانی نوێژ بکات. ئەگەر باوەڕدارێك لەسەفەربێت نەتوانێت نوێژەکانی وەك پێویست بکات دەبێت لەکاتی شەودا قەربۆیان بکاتەوە بەڵام بۆهەموو موسڵمانان نوێژکردن ئەرکی سەرکییە. کاتێك کەوەستان‌و هەستانەوەی نوێژم بەتەواوی لەماڵی خاڵەت نیعمەت فێربووم، دینداری بۆمن مانایەکی نوێتری هەبوو، بەشێوەیەکی مەعنەویی جۆرێك پەیوەندی هەست لەناکاو پەیدا دەبوون.

بۆنوێژکردن سەردانی مزگەوتمان نەدەکرد. نەناچار دەکراین‌و نەسوننەتبوو. هەرچەند پێغەمبەر نوێژکردنی ئافرەتی لەناو مزگەوت‌و پێش چاوی خەڵك قەدەخە نەکردبوو، بەڵام ئامۆژگاری دەکردن کەنوێژ لەشوێنێکی تەنیا لەماڵەوە بکەن. ژنەکانی کەسەردانی مزگەوتیان دەکرد بۆنوێژکردن لەڕیزی پشتەوەی پیاوەکان رادەوەستان. هەرچەند جلوبەرگەکانیا زۆر لەباربوون کەبتوانن لەپێش چاوی خەڵك نوێژ بکەن بەڵام من دەموویست لەماڵەوە نوێژ بکەم. یان لەگەڵ ئەندامانی خێزانی خۆم. ئیمانم بەخودا بابەتێکی تاکەکەسیبوو. نوێژ لەهەر شوێنێك بکرێت یەکسانە.

یەکەمین وانەی کەلەماڵی خاڵەت نیعمەت فێرببووم وانەی پاك‌و خاوێنیبوو، چونکە نوێژی کەسانی چڵکن لەلای خودا قبوولٚ نییە. لەناو مزگەوتەکان ئاوی زۆر هەیە پیاوەکان پێش نوێژکردن خۆیان خاوێن دەکەنەوە. لەزۆربەی ماڵەکان شوێنی تایبەتی نوێژکردن هەیە. ئەرکەکانی مەزهەبی جۆری خۆخاوێنکردنەوەیە بۆنوێژکردن. کەپێی دەگوتریٚ دەستنوێژ. گەر ئاو دەست نەکەوێت، باوەڕدا دەتوانێت لەجیاتی ئاو خاك‌و خۆل بەکاربێنێت.

لەدوورگەی ڕۆژە، ئاوی پێویست هەبوو بۆهەڵگرتنی دەستنوێژ، من‌و رجا قوتابی چالاکبووین لەم لایەنەوە هەرچی خاڵەت نیعمەت دەیکرد ئێمە دووبارەمان دەکردەوە. لەشوشتنی دەست‌و

پێی‌و نیوچاوان‌و هەمووشوێنەکانی پێویست بۆخۆئامادەکردنی نوێژ. هەموو ئەم خۆئامادە کردنە بۆخاڵەت هاجەر دوو خولەك ماوەی دەویست بەلأم بۆمان پێویستی بەکاتێکی زیاتر هەبوو. بختەوەرانە ئێمە ناچار نەبووین لەرۆژدا پێنجار ئەمەیان دووبارە بکەینەوە ئەگەر کارێك یان دەستمان لەشتێکی پیس نەدەدا ئامادە دەبووین بۆنوێژی دواتر.

دوای ئەم پرۆسەیە خاڵەت نیعمەت ئێمەی دەبردە ژوورەکەی خۆیی لەهەمان شوێن بەپێی پەتی رووماں لەمەککە دەکرد بەچەند هەنگاوێك لەپشتەوەی خاڵەت نیعمەت، دەستمان بەنوێژی خۆمان دەکرد. تەمەن‌و شارەزایی خاڵەت ئەمەیانی بەپێویست دەزانی کەپێش نوێژ بۆئێمە بکات. جوڵانەوەی جەستەو دەست بەرزکردنەوە دەبێت هاوکات کرابا لەگەڵ پێش نوێژ. ئێمەش دوو قوتابی قوتابخانە دەستەکانمان بەرز دەکردنەوەو دەمانگوت:((الله اکبر)) بۆنوێژکردن نیەتمان دەکرد. نوێژی دواتر دوای رۆژئاوا بوون‌و ئەویتریان لەتاریکای شەوداو ئەویتریان پێش خۆرهەلأتبوو. هیچ نوێژێك دوای خۆرهەلأت نەدەکرا تاکو دوای نیوەرۆ، چونکە لەکۆنەوە بۆت پەرستەکان دوای دەرکەوتنی خۆرخۆریان دەپەرستی. هەندێك لەموسڵمانەکان جیاواز لەنوێژکانی خۆیان دوو نوێژیتر دەکەن. بەلأم من‌و رجا تازە دەستمان بەدەستوورەکانی ئایینی کردبوو.

بەناوی خودای بەخشندەو میهرەبان

پەسنی خودای کەپەروەردەکاری جیهانیانە

بەخشەندەو میهرەبانە

پاشای رۆژی سزایە

خودایە تەنیا تۆ دەپەرستین‌و داوای هاوکاری لەتۆ دەکەین

ئێمە بۆرێگای راست رێنوێنی بکە

رێگای ئەوکەسانەی کەپاداشتت کردوون،

نەرێگای ئەوکەسانەی کەنەفرەتت کردوون‌و نەئەوانەی رێگایان ونکردووە.

دەستی چەپی دەخینە ژێر دەستی راست نوێژ بەسورەتی فاتیحە دەست پێدەکەین. یەکەمین سورەی قورئان‌و گرنگترین سورە لەلایەنی بنەمای بیروباوەڕیی ئایینی. بڕواناکەم هیچ موسڵمانێك لەجیهاندا هەبێت کەسورەتی فاتیحەی بەعەرەبی لەبەر نەبێت، ئەگەر زمانی دایکی ئەندونزیایی بێت یان ئەفریقی بێت، خوێندەوار بێت یان نەخوێندەوار. منداڵانی میسری پێش

هەمووشتێك فێری سورەی فاتیحه دەبوون چونکه خوێندنەوه هەموو نوێژێك بەسورەتەی قورئان دەستپێدەکات، بەدرێژایی ساڵ لەسەر گڵکۆی ئازیزان دەخوێندرێت. بەتایبەتی(بەناوی خودای بەخشندەو میهرەبان) پێش هەمووشتێك بەتایبەتی وتارەکانو ئامۆژگاری موسڵمانان دەخوێندرێتەوە. باوەڕدارەکان لەسەر وتاری خویان دەنووسن. خوێندنەوەی ئەم سورەیەیی قورئان بەدەنگ ئەوەندە ئاهەنگی هاوکاته لەگەڵ یەکتردا منو رجا زۆر بەوریایی دەمانویست وەك پێش نوێژی خۆمان دەنگەکان بەرزونزم بکەینو هەندێکیان درێژو هەندێکیان کورت بکەینەوەو لەکۆتایی هەندێك ئایەت بەوەستانێکی کورت هەناسەمان نوێی بکەینەوە.

(ئیسلام)بەزمانی عەرەبی خۆبەدەستەوەدانه، موسڵمان کەسێکه کەخۆی بەدەستەوە دابێت. ئەم لێکدانەوەیه دوای ئەوەی که لەگەڵ خاڵەت نیعمەت فێری چەند سورەتی قورئان بووم دەرکەوتنو مانای نوێی پێی بەخشیم. هەندێك لەهێزی نوێژ لەرێکوپێکی سەرچاوه دەگرێ لەئەرکیدایه. رێکوپێکی لەهێزی ئیمانیدایه. روو لەمەککەو کڕنۆش بردن ئەمەیان پێداگری بەخۆبەدەستەوەدانه. ئەرکەکانی خۆخاوێنکردنەوەی پێش نوێژکردن، نیشانەی پێویستی ئێمەیه بەخاوێن بوون پێش ئەوەی ئەرکەکانی خودا جێبەجێ بکەین، دووبارەبوونەوەی نوێژ ئێمه پشتراست دەکاتەوه کەرێگا نادەین ئێمان لەبیری ئێمه دەربچێتو بەدووبارکردنەوەی دوای دوو سێ کاتژمێر جارێکیتر بەخوێندنەوەی وشەکانی پشتراست دەبینەوه کەلەخودا جیانەبووینەوە. خاڵەت نیعمەت رۆیشتن بۆکڕنۆش بردنو هەستانەوەو سلاّوکردن بۆلای راستو چەپ هەموو ئەمانه فێربووین.

تەواوی ئێوارەکان کەسەردانی خاڵەت نیعمەتمان دەکرد زۆر بەقووڵی دەرۆیشتینه ناو شارەزاییو فێربوونو ئەزموونەکانی مەزهەبی. دەستم بەخوێندنی ژیانی پێغەمبەر محەممەد(د.خ)و قورئانم لەبەردەکرد. شەوانو بەیانیان قورئانم دەخوێند. زۆرجار کاتژمێرم دادەنایەوه کەکاتژمێر پێنجی بەیانی بتوانم قورئان بخوێنم تاکو نزیکەی خۆرهەلاّت دەمخوێندەوە. هەمووکاتێك قورئانم بەدەنگی بەرز دەخوێندەوە. راهێنانم لەسەر سورەتی دژوار دەکرد کەنزیکەی چواردە سەدە پێشتر نووسرابوو.

لەتەمەنی سیانزده ساڵی کاتێك گەگویم لەقورئان دەگرت شتێکی زۆر بەرزو بەراستی خودایم دەبیست. حەزرەتی محەممەد(د.خ) وەك زور لەپەیرەوانی نەخوێندەواربوو، بۆیه خودا لەبەر ئەمەیان هەندێك وشەی زۆر سادەی بەکارهێنابوون جگه لەهەژاندنی گوێگر، رێنیشاندەر بوون.

جوانی زمانی قورئان ناکرێ وەسفی بکەین. خوێندنەوەی بەبێ هەڵەو هاوئاهەنگی بۆخەڵک، پاشبەندو دەنگەکانی لای عەرەب هونەرێکی گەورە هەژمار دەکرێ. باشترین خوێندەوارانی قورئان، دەگەن بەئاوازی بەرز وەك مۆزیك دانەرانی کلاسیکی رۆژئاویی. زمانی عەرەبی کەبۆقورئان بەکارهاتووە ئەوەندە تاساوە ئەوانەی دەبنە موسڵمان‌و ئەوانەی لەدەرەوەی رۆژهەلاتی ناوەڕاست ژیان بەسەر دەبەن دەبێت خوێندنەوەی بەدەنگی بەرزفێربن.

هەست‌و ویستم بۆخوێندنەوەی مەزهەبی ئێمە، هەستێکی لەڕادەبەدەرم هەبوو ئەمەیان بۆهەستی گەنجایەتیم دەگەڕایەوە. لەتەمەنی چواردەساڵی خوێندنەوەی کورتە دوعام لەگەڵ پێنجار نوێژکردن زیادکردبوون. لەرۆژێکدا دووجار قورئانم دەخوێندەوە. حەدەیس‌و هەندێك لەفەرموودەی پێغەمبەرم دەخوێندنەوە کەدوای قورئان دووەم کتێبی گرنگی موسڵمانەکان بەهەژماردێت. کارم بەفەرموودەکان دەکرد. لەجیاتی ئەوەی کەتەنیا لەمانگی رەمەزان رۆژوو بگرم لەهەفتەیەکدا دووجار رۆژووم دەگرتن. هەرچەند لەقورئاندا باسی جلوبەرگ نەکراوە. شێوازی جلوبەرگی خۆم گۆڕی، داوام لەدایکم کرد کەجلوبەرگی هاوشێوەی خاڵەت نیعەت بۆم بکڕێت کە هەمووشوێنێکم دابپۆشم. تاکو ئێستا باوەڕناکەم، لەکاتی پارە کۆکردنەوەم بۆئیخوان موسلمین سەردانی زۆر کەسم دەکرد ـ دۆست، هاوڕێی، خزم.

ئیخوان موسلمین لەسەرتاسەری گەرەکی ئێمە لەدورگەی رۆزە، هەموو شوێنەکانی قاهیرە ئامادەیان هەبوو، گەنجەکانیان فێری مێژووی موسلمانەکان دەکرد، هاوکاریان دەکرد تاکو بڕیارەکانی خودا بەهەمان شێوە لێکدانەوەی بۆبکەن کەلەقورئاندا هاتووە خواپەرستەکانیان هاندەدان کەلەسەر رێگای راست بڕۆن. بەبیری کچێکی گەنج بیرم دەکردەوە ئەم گروپی بناژۆخواز بەنەرخترین ئارمانی ئەخلاقی مەعنەویان هەیەو دیدگایان بۆدونیا شتێکی خەیاڵی نییەو دەکرێت دەستەبەری بکەن. لەگەرەکەکانی هەژارنشینی قاهیرە دەرماخانەکانی ئیخوان موسلمین بۆخزمەتەکانی پزیشکی‌و خۆپاراستن‌و ددان بەبێ بەرامبەر پێشکەش بەخەڵك دەکران، دەرمانخانەکانی ئیخوان موسلمین دەرمانیان بەنرخێکی زۆرهەرزان پێشکەشی خەڵك دەکردن، کەسانێك کەنەخۆشبوون‌و تواناى هەڵسوڕاندنی ژیانی خۆیان نەبوو ئەمانەیان بیمەی دڵنیاییان دەکردن. من هەموو رۆژێك لەناو حەوشەی قوتابخانەکەمان دیاربوون کەخزمەتی ئەم بزوتنەوەیان دەکرد، پێشنیاریان دەدایە کوڕەکان کەفێری وانەی ئایینی‌و مێژوویی ئیسلام

بکەن. زۆر تێکەڵی کچەکان نەدەبوون و دەیانویست ئەم کچانە لەماڵەوە فێری ئایینی ئیسلام بکرێن، هەرچەند هەندێك ئەندامی رێکخراوی نهێنی خوشکانی موسڵمانبوون.

بۆمن زۆرگرنگ نەبوو کەبرام بانگێشت دەکەن بۆکۆبوونەوەکانی ئیخوان موسلمین و من بانگێشت ناکەن. تێکەڵبوون لەگەڵ کوڕەکان و هەڵسوکەوتی جیاواز بۆکچەکان بۆمن شتێکی ئاسایی بوو. زۆرم پێی باشبوو کەجۆرە رێکخستنێکی لەم شێوەیە بۆکوڕەکان هەیەو کوڕەکانی زۆر بەشداری راهێنانەکانی ئیخوان موسلمین دەکەن، خوێندنەوەی قورئان و مێژوویی ئیسلام لەجیاتی تۆپیی پێی و سوڕانەوە لەناو حەوشەی قوتابخانە. لەجیاتی کاروباری مندالأنە کاری باشتریان دەکرد، زۆر ستایشی ئەم کاروبارانم دەکرد.

ئیخوان موسلمین ئابوونەی لەهەمووکەسێك وەردەگرت، بەبێ لەبەرچاوگرتنی رەگەزی بەسوپاسەوە وەریان دەگرت. هەفتەی جارێك تەواوی ئەوەی کەکۆم دەکردەوە بەبێ ئەوەی بۆکەسێك باس بکەم، بەنهێنی لەدەرگای ماڵی کەسێکم دەدا کەدووەم کەس لەرێبەری پێکهاتەیی ئیخوان موسلمین بوو ـ حەسەن حودەیبی . حەسەن حودەیبی وەك کەسانێتر پەیڕەویی حەسەن بەنابوو، ((رێبەری گشتی))و دامەزرێنەری ئیخوان موسلمین، کەلەساڵی ١٩٢٨دەستی بەدروستکردنی کادری گەنج کردو بۆئەوەی خەڵك فێری بنەماکانی ئیسلام بکەن. کاتێك تەمەنم چواردە ساڵنبوو، کادری سەرەکی گەنجانی کۆکراوە لەلایەن حەسەن بەنا ببوون بەلەشکرێکی گەنجانی راهاتوو کەلەتەواوی گەڕەکەکان و چینەکانی مامناوەندی شارو شاروچکەکانی میسر بەربڵاو بوون.

لەهەمان سەردەم وەك ئێستا ئەندامبوون لەناو ئیخوان موسلمین بەشێوەی نهێنی بوو. بەڵام بەنهێنی مانەوە لەناو گەڕەکەکانی قاهیرە هیچ مانایەکی چەندانی نەبوو. هەموو کەسێك دەیزانی فلان کەس شوێنی ژیانی، کاروباری، هەڵسوکەوتی، هەموو ئەمانە چین و لەچ شوێنێکن. من بەبێ پرسیارکردن دەمزانی ماڵی حەسەن حودەیبی شەقامێك لەخوارتری ئێمەبوو، یەکێك لەکەسانی گرنگ و سەرەکی پێکهاتەی ئیخوان موسلمینە. زۆر بەئاسانی پارەی کۆکراوەم دەدایە دەستی پیاوێك کەدەرگای دەکردەوە. بەهەمان هەست کەمن نهێنی پارێزم، زۆربەنەرمی دەمگوت:((دارایی ئیخوان موسلمین))ە. لەم نهێنی پاراستنە تام و چێژم دەبرد. پیاوەکە لەوەڵام دەیگوت:((سوپاس خوشکم. دەکرێ پرسیار بکەم لەلایەن کێیەوە.)) هەمووجارێك سەرم دەهەژاندو زۆر بەنەرمی و لەسەرخۆ دەمگوت: ((لەلایەن هاوڕێیەك.))

ماوەیەکی زۆرنەبوو کەهەستم بەرازیبوونێکی زۆر لەئاین دەکرد کەخۆشەویستییەکیتر کەوتە ناو سەرم: سیاسەت. دوانزدە ساڵانبووم کەشەپۆلی نەتەوەخوازی سەرتاسەری میسری لەخۆگرتبوو. منی گرتەوە. شەڕی جیهانی دووەم لەساڵی ١٩٤٥، بەکۆتایی هاتو بریتانیا تێیدا سەرکەوت. بۆچی بریتانییەکان بۆماڵو وڵاتی خۆیان ناگەڕێنەوەو ڕێگا نادەن میسرییەکان خۆیان بەڕێوەبەرایەتی وڵاتی خۆیان بکەن؟

زۆر ئاشکرابوو کەبریتانیا بچوکترین گرنگی بەخەڵکی میسر نەدەدا. بۆمەبەستی سەربازی فرۆکەخانەی دروستکرد لەقاهیرە بۆپۆرت سەعیدو سوئیز ڕێگای ئۆتۆمبێلی دورستکرد میسرییەکان سوودیان وەرگرت، بەڵام بەدرێژایی ساڵەکان پشتیوانی لەئێمەکرد، بەڵام بۆزۆربەی میسرییەکان هیچ نەکرابوو. لەگوندەکانی میسر ٥٠٪ منداڵەکان پێش تەمەنی پێنج ساڵی دەمردن‌و ژمارەی نابیناکان لەهەموو وڵاتانی دونیا زیاتربوو٧٠٪ گەورەکان لەبەرخواردنەوەی ئاوی ڕووباری نیل گیرۆدەی نەخۆشی خۆرکە بوون، بریتانییەکان نەخوشخانەیەکیان دروست نەکرد، هەڵکەندنیان بۆبیرێك نەکرد کەجوتیاران سوودمەندبن لەخواردنەوەی ئاوی خاوێن. ژمارەی گوندنشینەکانی نەخوێندەوار لەمیسر لەملیونان تێپەڕیکرد، بەڵام بریتانییەکان قوتابخانەیەکیان بۆ ئەم خەڵکە دروست نەکرد. ملیونان خەڵك نەیاندەتوانی کرێی خانوو بدەن، بەڵام بریتانیا هەنگاوێك بۆدروستکردنی خانووی هەرزان بۆخەڵك هەڵنەگرت. بۆمن شیاوی تێگەیشتن نەبوو، لەبەر ئەم هۆکارانە بەباوەشی کراوە ڕۆیشتم بۆناو شەپۆلی نەتەوەخوازەکان کەهەموو خەڵکی میسری لەخۆگرتبوو، لەگەنجایەتی سەرقاڵی بیرم ڕزگاری میسربوو لەدەستی داگیرکارانی بێگانە.

هەستەکانی دژی مەلیك فارۆق لەمیسر زیاتر دەبوون. تاکو بریتانییەکان ڕێگایان دەدا تاج‌و تەختی پاشایەتی بپارێزێت تەنیا قسەی ئینگلیزەکانی وەردەگرت. لەجیاتی ئەوەی هاوکاری چینی ژێردەست بکات بەپێی فەرمانی کتێبی پیرۆز، تەنیا بیری لەخۆی دەکردەوە، هەمووکاتی تەرخان دەکرد بۆکۆکردنەوەی دارایی‌و هەستەکانی منداڵانەی. لەتەواوی ژوورەکانی کۆشکی تەلەفۆن بەڕەنگی سەوز بوونیان هەبوو بەپێی یاسایەك بۆ هەمووکەسێك قەدەخەبوو سوود لەم ڕەنگەی تەلەفۆن وەربگیرێت. خاوەنی دوو کەشتی گشتوگوزاریی‌و سیانزدە فرۆکەو زیاتر لەدووسەد ئۆتۆمبێل بوو نزیکەی نیوەیان (ڕولزرویس)و (کادیلاك) بوون. خۆی شوفێری دەکردو لەجادەو کۆڵانەکان بەخێرایی دەڕۆیشت بەبێ ئەوەی ئاگاداری دەوروبەری خۆی بێت.

جارێکیان ئۆتۆمبێلێك لەئۆتۆمبێلی تێپەڕ دەبێت فارۆق تەقەلە تایەکانی دەکات. بۆئاسوودەی خۆی کەپۆلیس هیچ کاتێك ڕێگا لەرۆیشتن و شێوازی نەگرێت نیوەی ئۆتۆمبێلەکانی دەگاتە رەنگی سوورو ئەم رەنگە بۆخەڵکانیتر قەدەخە دەکات.

بەرپرسانی کەدیاری دەکران کەسانێکبوون کەسەرەتا کۆمەلێك گەندەڵبوون و دەگوترا زۆربەیان دەستیان لەبازرگانی زەوییوزاردا هەبوو، بۆدانی پۆستێك بەکەسێك زەویان لەبەرامبەر وەردەگرتن. کەسانی نزیك لەشا. سەرتاشخانەکان، باخەوانەکان، هەموویان رۆژبەرۆژ دەبوون بەخاوەن دارایی زیاتر، بەلام جوتیاران کەئابووری میسر گرێدرابوو بەرهەمەکانیان، رۆژ لەدوای رۆژ هەژارترو بێچارەتر لەجارانبوون. ئەمانە وردە وردە زمانیان دەکرایەوەو دەیانگوت:((ئێمە وەك دەرزیمان لێهاتووە، بۆخەڵکیتر جلوبەرگ دروست دەکەین، بەلام خۆمان رووت ماینەتەوە!))

زۆر پێی باش دەبوو شانازی بەشای ولاتی خۆمانەوە بکەم، بەلام بەپێچەوانە، لەبوونی شای لەم شێوە شەرم دایدەگرتم. فارۆق کەسێکی میسری نەبوو، خەڵکی ئالبانبابوو، منالی چوارەمی پشتی محەممەد عەلی بوو کەلەدەیەکانی ١٨٤٠ دەبێتە فەرمانڕەوای میسر. جارێکیان ئێمەیان لەقوتابخانە برد بۆتەماشاکردنی تێپەڕبوونی شا، نەمتوانی وەك هاوپۆلەکانم خۆم رازیی بکەم رێز لەشا بگرم. لەقوتابخانە بەردەوام بۆ هاوڕێیانم دەگوت:((میسر بۆخەڵکی میسر دەبێت.)) بەشێوەیەك تەماشایان دەکردم وایاندەزانی ئەقڵی خۆم لەدەستداوە. بۆتەمەنێکی وەك من ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە ئاسایی نەبوو. بەلام رۆژانە ئەم هەستەم بەهێزتر دەبوو. هیوام بەرۆژێك دەخواست کەبریتانییەکان و فارۆق لەم ولاتە بڕۆنە دەرەوە.

خێزانەکەم لەبیری سیاسیی من سەرسوڕماو بوون. باوکم هیچ پەیوەندی بەسیاسەتەوە نەبوو، بەلام من نەمدەتوانی باسی ئازادی میسر نەکەم. باوکم دەیگوت:((ئەم جۆرە بیرۆکانە لەچ شوێنێك دەکەونە ناو بیرت؟)) بەسەرسوڕمانەوە سەری خۆی دەهەژاند. زۆرکەم رۆژنامەی دەخوێندنەوە، بەلام رۆژنامە خوێندنەوەم کۆتایی نەبوو، بەتایبەتی دوای دەستپێکی شەڕی فەلەستین.

بریتانیا لەهەردوو شەڕی جیهانی بەلێنیان بەعەرەب دابوو ئەگەر لەبەرامبەر ئەڵمانیا پشتیوانیان بکەن، دان بەسەربەخۆیی فەلەستین دەنێن. بەلام لەمانگی پێنجی سالی ١٩٤٨، پشتی لەبەلێنەکان کردو لەناکاو تەواوی هێزی خۆی لەناوچەکە کێشایەوەو رێگای بەنەتەوە

یەکگرتووەکاندا حکومەتی نوێی ئیسرائیل دروست بکەن. حکومەتی بریتانیا بێزێزی گەورەی کرد! پشتیوانی فەلەستین چۆن توانیو رێگایدا ئیسرائیل لەسەرخاکی عەرەبی دروست بکرێ؟

ئەوکات زۆر بەسادەیی پرسیارم لەخۆم دەکرد بۆچی ئیسرائیل لەئوسترالیا دروست ناکرێت.

میسر، دوای کۆتایی هاتنی هێزەکانی بریتانیا لەفەلەستین، دەچێتە بەرەی سووریاو ئۆردن دژی ئیسرائیلو دەست بەشەڕ دەکەن کەلەسەر خاکی عەرەب دروستکرابوو. لەقاهیرە کاریگەری زۆری شەڕ بەدەر نەدەکەوت، بەلام دڵم لەگەڵ سەربازەکاندابوو کەبۆپاراستنی کەرامەتی ولاتی خۆیانو فەلەستین شەڕیان دەکرد. کاتێك لەقاهیرە دەرۆیشتیت بۆبینینی رێورەسمی سەربازی گروپەکانی تایبەتی خۆبەخشو چەکداری پەروەردەکراوی ئیخوان موسلمین، هەموو جەستەمان دەبوو سەربەرزی. ئەم فیدایانە، مانای ناویان ئەوەبوو کەبۆگەیشتن بەئامانجیان ئامادەن گیانی خۆیان فیدا بکەن، پێك دەهاتن لەقوتابیانی زانکۆو کەسانیتر تاکو ئەوکات جلوبەرگی خاکی فێرگەکانی خۆیان دەبەردابوون. ئیخوان موسلمین دوای تێکشکانی میسرو ولاتانیتری عەرەب لەگەڵ ئیسرائیل دوای دوومانگ شەڕکردن دەستیان لەتێکۆشان دژی ئیسرائیل هەڵنەگرت بەردەوام هێزی خۆبەخشی بۆشەڕ لەبیابانی سینا رەوانە دەکرد. دروشمەکانی کەلەناو رێورەسمی سەربازی بەرزدەکرانەوە دروست هەستەکانی منیان باسدەکرد:((فەلەستین موڵکی فەلەستینە! بریتانیا، دەست لەخیانەت هەڵگرە!))

ئەوەی جێگای سەرنج بوو دایکی بریتانیم هەستەکانی گەشاوەتر دەکردن بۆ گرێدراویم بەمیسر. ئێواران لەگەڵ خێزانم بۆخواردنەوەی چا بەدەوری یەکتر کۆدەبووینەوە، یان لەکاتی نانخواردن، چەندینجار چیرۆکی فیداکاری فرۆکەوانەکانو سەربازانی دلێری بریتانی بۆپاراستنی ولاتی خۆیان لەشەڕی جیهانی دووەم باس دەکرد. قارەمانەکانی دیاری کەبەردەوام باسی دەکرد، وینستۆن چرچیل سەرۆك وەزیری بریتانیابوو. دایکم لەڕادەبەدەر شانازی بەشارستانییەتو چەند قاپێك کەلەولاتی خۆی هێنابوون دەکرد. بۆنموونە قاپێك یان شوشەی شیردانی بچوك دەیسوڕاندەوەو دەیگوت:((جین، تەماشا بکە لەسەری نووسراوە ئەسپاد. دروستکراوی بریتانیایی گەورە.))

خۆشەویستییەکی عاشقانم بۆدایکم هەبوو دەموویست سەرمەشقی کارەکانم بێت. ئەگەر دایکم دەیتوانی ئەوەندە بەهەستێکی دلگەرم شەیدای ولاتی خۆی بێت بۆچی من نەتوانم ئەم هەستەم بۆولاتی خۆم هەبێت. بەباوەڕی من بەدوژمن هەژمارکردنی بریتانیا لەمیسر جیاوازی لەگەڵ ئەم

هەستە هەبێت. بابەتی سەرەکی وەفاداریی‌و گیان قوربانیکردن‌و ئەرکی مرۆیی لەبەرامبەر ولأتبوو.

لەهەمان کات وێرای هەستەکانی ولأت پەرستانەی ئینگلیزی دایکم‌و خۆشەویستی من بۆمیسری زیاتر دەکرد، پووره زوزو لەگەڵ هاوڕێیانی جۆرێك رەوت‌و شانازی ژنانەیان پێدەبەخشیم. لەتەمەنی تازە پێگەیشتنم وەك زۆر لەهاوڕێیانم، چیرۆکی زۆرمان لەسەر ئافرەتانی گەورەی میسر دەخوێندەوه ـ شاژنەکان، شاعیرەکان، پیرو وەلییەکان‌و موجاهیدەکان. چەندینجار چیرۆکی بەناوبانگی (خەنسا) شاعێری عەرەب لەسەردەمی حەزرەتی محەممەد(د.خ)، دەمخوێندەوه کەلەناو گردبوونەوەی سالأنەی گەورانی مەککە، دەبێتە یەکەم. ئیسلام بۆشاعێرانی ئافرەت رێزێکی گەورەی هەبوو. ئەمانە لەناو ئیسلام گرنگی خۆیان هەبوو، دەوری مێژوو نووسان‌و رەخنەگرانی کۆمەلأیەتی‌و بەندبێژانی شەڕیان دەبینی. دەلێن کاتێك خەنسا برای خۆی لەشەڕ لەدەستدا، روحی یەکسەر دەکەوێتە ژێرکاریگەری ئیلهام‌و روحەکانی ئاسمانی کەتەنیا لەگەل شاعێرانی گەورە هاودەردی دەکەن. خەمباری دەبێتەهۆکارو گەشانەوەی ویستی بۆ هۆنینەوەی شیعرەکان کەبەشێك بوون لەرەنج‌و ئازاری خەڵکی خۆی لەشەڕێکی بەردەوام بۆمانەوە بوو، شێعرەکانی کەبۆمن لەنووسینی شێعرەکانم ئیلهام هێنەربوون.

چیرۆکی خەدیجە، یەکەم هاوسەری پێغەمبەر، هەستێکی تایبەتی پێی دەبەخشیم، تاکو رادەیەك پەیوەندی مەعنەوی بوو. خەدیجە، بێوەژنێکی دەوڵەمەندو بازرگان لە قەبیلەی قوریش. یەکەم کەس کەئایینی ئیسلامی وەرگرت. کاتێك کەحەزرەتی محەممەد(د.خ) بۆی باسدەکات جبرائیل لەناو ئەشکەوتێك لەچیای حەرا خۆی نیشان دەدات‌و بۆی باسدەکات کەتۆ پێغەمبەری خودای، خەدیجە دەستبەجێ پشتیوانی لێدەکات‌و ئارامی دەکاتەوەو دەلێت:((شادو رازیبە، ئەی کوڕمامی خۆم، زۆر زۆر شادو رەزامەندبە. بەفەرمانی ئەوکەسەی کەگیانی خەدیجەی لەدەستی خۆیدایە تۆدەبیتە پێغەمبەری ئەم خەڵکە. خودا ئێوە شەرمەزار ناکات چونکە ئاگاداری پاکی‌و راستی‌و دروستی تۆیە.)) ئازایەتی ئەم ئافرەتە هێزی کەلەناو خۆشەویستی دابوو، تاکو کۆتایی ژیانی، پێغەمبەر وەفاداریبوو، تاکو وەفاتی خەدیجە هاوسەری لەگەڵ هیچ ئافرەتێك نەکرد.

چیرۆکی عایشە، کچی ئەبوبەکر، لەکاتی کەهاوسەرگیری لەگەڵ پێغەمبەردا کرد تەمەنی نۆ ساڵانبوو، لەچیرۆکەکانی جێگای ویستم بوو. ژنێکی گەنجو ئازاو ئەقڵانی یەکێك لەهاوسەرانی خۆشەویستی پێغەمبەربوو. زۆربەی حەدیسەکانی کەکاریگەری زۆریان لەتێگەیشتن لەئیسلام بۆموسڵمانەکان هەیە لەعایشە بەجێماون. بۆئیمانی بەردەوام لەشەڕدابوو، چەند ساڵ پێش وەفاتی پێغەمبەر بەسواری حوشتر بەشداری لەشەڕەکان دەکرد.

چیرۆکی قارەمانی ژنانی موسڵمان کۆتاییان نەبوو، زۆریان لەراستگۆی وەك زەینەب بوون، دایکی منداڵێکی نەخۆشبوو، یان رابیعە عەدەوییە، کۆیڵەیی هەتیو کەبەرەنجو پاراستنی داوێن خاوێنی خۆیو گیان فیدای لەرێگای خودا، دەگاتە پلەی راستی مرۆڤەکانی خودا. لەناو شەریعەتی ئیسلام باس لەقوناخەکانی گەیشتن بەپلەکانی بەرزی خواپەرەستی نەکراوەو رێزبەند ناکرێن، زۆرکەس لەهەردوو رەگەز، دەگەن بەپلەی پیرۆزی. خەڵکی میسر بۆداواکارییو بەخشایشو رەحمەتی خوداو داوکاریو کەرامەت، سەردانی مزگەوتو گۆڕەکانی پیروزیان دەکردن. لەنوێژی رۆژانی هەینی خەڵك ئەوەندە دەرۆیشتن بۆمزگەوتی مرۆڤەکانی خودایيو مزگەوتی ژنانی پایەبەرز کەشوێنی نوێژکردنی نەدەمایەوە بۆیە هەندێك کەس بۆئەوەی بتوانن نوێژی خۆیان لەم شوێنە پیرۆزانە بکەن چەندین کاتژمێر پێشتر لەشوێنەکان ئامادە دەبوون.

چیرۆکی ژنانی گەورەی رۆژئاوایی لەوانە مادام کوری زۆرم دەخوێندەوە، ژنێك بۆلێکۆلینەوە بۆدۆزینەوەی (رادیوم) لەزۆرشت تێپەڕیکرد. (رادیوم توخمێکی نایابە مادام بواری بەهاوکاری هاوسەری لەساڵی ١٨٩٨ لەناو کانگەی ئۆرانیومیان دۆزییەوە لەتاریکایی شەو دەدرەوشێتەوە گەرما لەخۆی دەردەکاتو لەرووی نرخەوە هەزار بەرامبەری زێر دەکات. و.ك) فلۆرانس نایتینگڵ سەلامەتیو گیانی خۆی تەرخانکرد بۆ سەرپەرستیکردنی نەخۆشەکان. لەچیرۆکەکانیتری جێگای ویستی زۆرم، هڵن کلر، بەنابینایيو کەرپوونی، ئەوندە بەردەوامی بەتێکۆشانی خۆیدا تاکو بۆخۆی دەبێتە کەسێك. بەڵام ئەوانەی کەپوورە زوزو باسدەکات لەژنانی میسری زۆر جێگای ویستی منن.

ئێوارەیەك، لەکاتی خواردنەوەی چا لەماڵی پوورە زوزو سەرنجی بۆ گێرانەوەی ژیانی هۆدی شەعەراوی راکێشام. یەکێك لەئافرەتانی وەڵاتی ئێمە دژی بریتانیا بۆوەرگرتنی مافی ئافرەت تێکۆشانی کردبوو. دەیانگوت ئەگەر هۆدی شەعەراوی نەبوو زۆر لەئافرەتانی میسر بەنەخوێندەواری دەمانەوە بەتێکۆشانی توانی لەساڵی ١٩١٠ یەکەم قوتابخانەی کچان بکاتەوە، ئەم هەواڵە لەمیسر دەنگو کێشەی زۆری دروست کرد. لەگەڵ هاوڕێیەکی خۆی بەناوی سیزە نەبرەوی یەکەمین رێکخراوی ئافرەتانو یەکەم گۆڤاری ژنانیان لەساڵی

١٩٢٠دەرکرد بەناوی ژنی میسری، پوورە زوزو یەکێك لەخوێنەرانیبوو. هۆدی شەعەراوی لەساڵی ١٩٢٣ دوای گەڕانەوەی لەکۆنفرانسی نیودەوڵەتی ئافرەتان لەرۆم. یەکەم ژنی میسریبوو کەلەپێش چاوی خەڵك لاچکەی سەری فڕەدەدات کەبەسیمبوڵو دەسەڵاتی پیاوان‌و نەریتی عوسمانییەکانی بێگانە دەزانێت بۆناو میسر، تاوانباریان دەکات.

هۆدی شەعەراویم زۆر ستایش دەکرد، ژنێك بۆپێشکەوتنی ژنانی میسری زۆر لایەنی ژیانی خۆی لەسەر دانان وەك هاوسەرگیری. هاوسەری کوڕی مامی خۆیبوو سی ساڵ لەخۆی گەورەتربوو، هۆدی تەڵاقدا، چونکە ئامادەنەبوو نەریتی خۆداپۆشین بپارێزێت. ئەم ئافرەتە دەستی لەتێکۆشان هەڵنەگرت‌و بۆپێشەوە دەڕۆیشت لەساڵی١٩٢٤ توانی یەکێك لەداخوازیی چاکسازی خۆی بەدەست بێنێت: پەسەندکردنی یاسایەك تەمەنی هاوسەرگیری کچان لەدوانزدە ساڵی کەخۆی لەم تەمەنە هاوسەرگیری کردبوو بکاتە شانزدە ساڵ. یەکێکیتر لەچاکسازییەکانی کەلەدەیەکانی بیست تێکۆشانی بۆکرد خوێندنی باڵا بۆکچان، کۆتایی هێنان بەچەند هاوسەریی‌و هاوسەرگیری ناچاری، قەدەغەکردنی خۆفرۆشی‌و خەتەنەکردنی ئافرەتان. لەهەموویان نەیتوانی سەرکەوێت. تێکۆشەرێکی رێگای مافی ئافرەتانبوو ئەم هۆیانە نەرخ‌و بەهای ئەم ئافرەتەی لەبەرچاوم زیاتر دەکرد. بەڵام کاریگەری دەگەڕێتەوە بۆبەرامبەر بوونەوەی لەگەڵ بریتانییەکان.

داوام لەپوورە زوزو دەکرد:((جارێکیتر رووداوی خۆپیشاندانی هۆدی شەعەراوی دژی ئینگلیزەکان باس بکات.)) لەشۆڕشی نیشتمانی دوای شەڕی جیهانی یەکەم لەپێشێلکردنی بەڵێننامەی بریتانیاو جێهێشتنی میسر، هۆدی شەعەراوی لەپێشەوەی ٣٥٠ ئافرەت بۆئازادی میسر دەڕۆتە بەردەرگای ناوەندی کۆمیسارییایی بەرزی بریتانیا. وەڵامیان نادرێتەوە. دوای مانگێك هۆدی شەعەراوی بەشداری لەرێوڕەسمی چەند کوژراوێکی ژن‌و پیاو دەکات کەلەناو خۆپیشاندانێك بەدەستی ئینگلیزەکان کوژرابوون. دووبارە ئینگلیزەکان تەقە لەخەڵك دەکەن خەڵکانێکی زیاتری میسری دەکوژرێن. لەم نێوەدا هۆدی شەعەراوی دەچێتە بەرامبەر فەرماندەی هێزەکانی بریتانیاو دەڵێت:((فەرموون من لەبەرامبەر ئێوە وەستاوم)) پوورە زوزو وشەکانی هۆدی شەعەراوی کەبەزمانی ئینگلیزی بوون بەجوانی دووبارە دەکاتەوە:((بۆچی من وەك ئافرەتانیتری میسری ناکوژی؟ ئێمە داوای ئازادی وڵاتی خۆمان دەکەین. ئێمە دەسەڵات‌و بێزێزی کەلەدەسەڵاتی ئێوە سەرچاوە دەگرێت قبووڵ ناکەین.)) ئەفسەری ئینگلیز، مات‌و

حەیرانو حەپەساو لەئازایەتی فەرمان بەهێزەکانی خۆی دەکات هیچ کەسێك تەقە لەخەڵك نەکەن. ئەم چیرۆکە بەردەوام شەیدای دەکردم. ئایا دەکرێت رۆژێکیان من بتوانم بەم ئازایەتییە بکەم؟

نزیکەی پانزدەیەمین ساڵرۆژی لەدایکبوونم دایکم گوتی:((جین، پوورە زوزو ئێوەی بانگێشت کردووە کەمانگی رەمەزان لەسوئیز لەگەڵیان تێپەڕ بکەیت. دەتەوێت برۆیت؟))

بێگومان دەمویست بۆپشوودان سەردانی دەرەوەی قاهیرە بکەم دەمویست کچی پوورم ئایدا ببینم چونکە هاوسەری حەسەن عەزەت هەموو تایبەتمەندی قارەمانێکی لەدیدگای من هەبوو. ئینگلیزەکان لەشەری جیهانی دووەم بەتۆمەتی هاوکاریکردنی ئەڵمانیا، دەگرن. حەسەن یەکێك لەبەرپرسانی ناو سوپای میسربوو، پەندێك هەیە دەڵێت:((دوژمنی دوژمنم دۆستی ئێمەیە.)) ئەمانە بەجۆرێك بیریان دەکردەوە ئەگەر ئەڵمانیا لەشەڕدا سەرکەوتن بەدەست بێنێت کۆتایی بەدەسەلاتی بریتانیا لەمیسر دێتو بۆخۆدی میسرییەکان دەگەڕێتەوە.

لەهاوینی ساڵی ١٩٤٨ کاتێك لەماڵەوە بەرەو سوئیز دەرۆیشتم. کەشوهەوا گەرمبوو. کاتێك هاوڕا لەگەڵ پوورە زوزو سەدوچل کیلۆمەتر رێگامان دەبڕی لەرۆهەلاتی قاهیرە تاکو دەریای سوور بەهەستێکی سووكو هەڵفڕیوم هەبوو. مەلەوانیکردن لەئاوەکانی زولاڵ خۆشی خۆی هەبوو، قەراخ دەریای جوانو لەپشت کێوەکانی ئاتاکا رەنگی بۆ وەنەوەشە دەگۆڕا. هێزەکانی بریتانیا حەسەنیان لەهێزی ئاسمانیان دەرکردبوو قەبەڵکاری دەکرد، چیرۆك بێژێکی باشبوو چاوەڕێی رووداوەکانی لەتێکۆشانی دژی داگیرکارانی وڵاتی ئێمەبووم. کچێکی قوتابی بەهەست بووم، بەهێزێکی خەیاڵاوی کەهیچ سنووری نەبوو. هەنگاوم دەنایە ساڵی پانزدە. لەسوئیز لەگەڵ چارەنووسم نزیكو روبەروو دەبوومەوە



## بەشی سێیەم

## پیاوی شۆڕشگێڕو کچە قوتابی

یەکەمجار کەبینیم، نەمدەناسی. لەوانەیە لەبەر ئەوەبێت کاتژمێر دووی بەرەبەیانبوو کاتێك لەسوئیز سەرقاڵی ئامادەکردنو هاوکاریکردنی پوورم بووم بۆپاشیو. لەوانەیە لەبەر ئەوەبێت کەبیرم لەبینینی نەدەکردەوە. چۆن ئەم پیاوە، قارمانی نیشتمانی، لەماڵی پوورم دانیشتبێت؟ باوەڕم نەدەکرد.

حەسەن عەزەت، تازە لەقاهیرە گەیشتبوو، هاتەژووری چێشت لێنانو گوتی: ((میوانێکم لەگەڵدایە، زۆر رەنجو ئازاری کێشاوە دەبێت بەشێوەیەکی باش خزمەتی بکەین.))

من تەنیا بیرم دەکردەوە لەوانەیە کەسێکی وەك هاوسەری کچی پوورم بێت کەبۆمیسر زۆر رەنجی کێشابێت، بەوردبینییەوە گوتم:((میوان کێیە؟)) بەڵام

کاتێك حەسەن وەڵامی دایەوە لەشوێنی خۆم وشکبووم. بەشێوەی باوەڕ نەکراو تەماشای حەسەن دەکەمو ئەوەی لەدەستم بوو کەوتەخوارەوە.

((ئەنوەر سادات.))

کاتێك کەسەرقاڵی کۆکردنەوەی بەهاراتی پڕاو بووم، دەمگوت بێگومان حەسەن گاڵتەم پێدەکات. سێ هەفتە کەلەسوئیز مامەوە تاکو رادەیەك جگە لەئەنوەر ساداتو کێشەکانیو تاوانبارانیتر باسی هیچ شتێکیتر نەدەکرا. هەشت مانگ ئەم گروپە بەتۆمەتی کوشتنی وەزیری

دارایی، ئەمین عوسمانی وڵاتفرۆش، دووساڵ پێش روویدابوو دادگایی دەکران. ئێستا دادگایکردنیان لەکۆتایی نزیك دەبوو رۆژنامەکان رۆژانە وێنەیەك لەرێبەری تاوانباران، ئەفسەر محەممەد ئەنوەر سادات، راپۆرتێك لەسەر کارەکانی خۆتێهەڵقورتاندنی بلاودەکرایەوە. هەموو ئەمانەم پێشتر وشە بەوشە خوێندبوونەوە.

بۆمن زۆرگرنگ نەبوو کەئایا ئەنوەر سادات دەستی لەتیرۆرکردنی عوسمان هەبوو، چونکە سزای ئەمین عوسمان تەنیا مەرگبوو، عوسمان لایەنگری بەرناسی پەیوەندی حکومەتو بریتانیابوو. ئەمین عوسمان پێشتر بڕیاری مەرگی خۆی واژۆکردبوو. کاتێك لەوتارێکی سووكو ناجەماوەری پەیوەندی میسرو بریتانیا بەهاوسەرگیری کاتۆلیکەکان هاوشێوە دەکات کەپەیوەندییەکی لەیەکتر جیانەکراوەیە. هاتنەدەرەوەی ئەم وشەیە لەدەمی بەرپرسێکی حکومەتو کەسێکی میسری، بەخیانەت هەژمار دەکرا. لەکانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٦، ئەمین عوسمان کوژرا. دواتر زانیم ئەنوەر ئەوانەی دەستیان لەتیرۆردا هەبوو دەباتە بیابانەکانو راهێنانی چەکیان پێدەکات.

بەخوێندنەوەی راپۆرتەکانی بەدوای یەکتر لەسەر ئەنوەر ساداتو یاوەڕانی ئازای زیاتر ستایشم دەکردنو هەموو رۆژێك چاوەڕێی کچی پوورم دەکرد کەلەبازار بگەڕێتەوەو رۆژنامە لەگەڵ خۆی بێنێت. ئەم چاوەڕوانییە بۆچاوەڕوانی شکاندنی رۆژوو لەئێوارانداا دژوارتربوو. راستەوخۆ تێکەڵاوی دادگایکردنی ئەم قارەمانانە بووم.

شەوان لەکاتژمێرەکانی درێژ دوای شکاندنی رۆژوو داوام لەهاوسەری کچی پوورم دەکرد:((حەسەن، زیاتر باسی ئەنوەر سادات بکە.))

حەسەن لەسەردەمی فرۆکەوانیو دواتر لەناو گرتووخانە ئەنوەر ساداتی دەناسی، رووداوێکیتری بۆباس دەکردم.

لەبیستنی یەکەم رووداوی کەئەنوەر سادات گێڕا سەرنجی راکێشم. رووداوەکە بەم شێوەیە دەست پێدەکات بەرپرسانی ئەمنی بریتانیا پشکنین بۆماڵی ئەنوەر دەکەنو بێتەلێکی ئەڵمانی دەدۆزنەوە کەهەوڵیدابوو لەرێگای مارشال رۆمڵ لەبیابانی رۆژهەلاتی ئەسکەندەرییە رێکەوتنێك بکەن. ئەنوەر دەیویست پێشنیار بداتە رۆمڵ لەبەرامبەر سەربخۆیی میسر، سوپای میسر پشتیوانی دەکات. لەبەر ئەم هۆیە بریتانییەکان دووساڵ زیندانی دەکەن، ١٩٤٢تاکو ١٩٤٤.

داوام لەحەسەن دەکرد بابەتی خۆشاردنەوەی ئەنوەر لەبریتانییەکان باس بکات. هاوسەری کچی پوورم رووداوی زیاتری لەسەر ئەنوەر سادات دەگێڕایەوە. گوتی سادات دووجار لەزیندان رایکردو لەکۆتاییدا لەتشرینی یەکەمی ١٩٤٤ تاکو ئەیلوولی ١٩٤٥ هەڵاتوو هەژمار دەکرا. کاتێك کەلەزیندانی بریتانیا هەڵاتبوو ئازاری زۆری کێشابوو. بۆگۆڕینی رووخساری ڕدێنی بەردەداتو بەناوی حاجی محەممەد وەك شوفێری بارهەڵگرەکان بۆحەسەن عەزەت کار دەکات. حەسەن بەپێکەنین دەیگوت: ((بۆخۆدی ئینگلیزەکان باری سەوزەو میوەی دەبردە بارەگای سەربازی (تل کەبیر) لەناوچەی سوئیز. هەمووکاتێك لەئەمانە زیرەکتربوو.

حەسەن دەگێڕێتەوە ئەنوەر کارەکانی زۆر لەئەمەیان خراپتری دەکرد. لەشوێنێکی نزیك قاهیرە بەردەی وردی بۆبەلەمەکان باردەکردن کە لەرێگای رووباری نیل بۆدروستکردنی جادەی ناوچەی نیوان قاهیرەو ئەسوانیان دەبردن‌و لەشەو رۆژێکدا تەنیا دەیتوانی جارێك زکی بەقاپێکی نیسك تێربکات. شەوان لەناو گەراجێك دەیکردە بەیانی. دواتر لەشاروچکەی ئەبو کەبیر لەپارێزگای شەرقییە، جۆگەیەك دروست دەکاتو کاتێك ئەمەیان کۆتاییهات بەردی مەڕمەڕ لەکانێك لەشاری بیابانی سنورس بۆناوچەیەك لەنزیك ئەهرام لەجیزە دەبات. ئەنوەر، وەك کوێلەکانی کە٢٥٠٠ ساڵ پێش زایین کەئەهرامیان دروست دەکرد، دەبێت تەختەکانی بەردی مەڕمەڕی بەپشتی خۆی بارکردبان. پرسیم:((چ کارێك بەبەردی مەڕمەڕ دەکرا؟)) حەسەن بەپێکەنین دەلێت:((شوێنێك بۆپشوودانی مەلیك فارۆق دروست دەکرا.))

لەساڵی ١٩٤٥، بەکۆتایی هاتنی شەڕ، یاساکانی سەردەمی شەڕ نەمان‌و ئەنوەر توانی جارێکیتر بەناسنامەی راستەقینەی خۆی بگەڕێتە ماڵەوە. بەلام ئینگلیزەکان رێگایان نەدا بگەڕێتەوە ناوسوپا، بەلام دەیتوانی کارێکیتر بکات. دەیتوانی سەرقاڵی کشتوکاڵ بێت یان کارێك لەقاهیرە بۆخۆی دەستەبەر بکات. بەلام میسر لەژێردەستی بریتانیا دابوو ئەنوەر هەستی دەکرد کاری بەکۆتایی نەهاتووە. مانگێگ تێپەڕی نەکردبوو دەستی بەدروستکردنی گروپێکی نهێنی کرد، ئەمجارەیان بۆلەناوبردنی میسرییەکانی هاودەستی بریتانیاو ئەوانیتر کەدەست لەهاوکاری ئینگلیز هەڵگرن. دوای چوارمانگ دەگیرێتەوە، ئەمجارەیان بەتۆمەتی تیرۆرکردنی عوسمان. دووساڵ‌و نیو دوای جاری یەکەم دەگیرێتەوە، لەچاوەڕوانی دادگایکردن کەرۆژانە لەرۆژنامەکان بلاودەکرایەوە. ئەگەر بڕیار لەتاوانبارکردنی دەردەچوو هەڵواسین یان تاکو کۆتایی تەمەنی زیندانبوو.

بەدرێژایی پشوودانم لەسوئێز، تەنیا بیرم لەشتێك دەكردەوە. ئەم پیاوە هەمان تایبەتمەندی لەخۆگرتبوون كەمن ستایشم دەكردن‌و هیوام دەخواست خۆم خاوەنی ئەم تایبەتمەندیانەبم. ئەمەیان قارەمانێكبوو، ئامانجی زۆر بەرزی هەبوون. شانەی خۆی پاراستبوو. بەئۆقرەگرتن لەبەرامبەر سزاكانی ئینگلیزەكان بەبێ ئەوەی ئازایەتی‌و ئیمانی لەدەست بدات لەرێگای میسر فیداریكردبوون. رۆژێكیان وێنەیەكی لەرۆژنامە چاپكرا لەناو هۆلی دادگا لەناو قەفەسێك كرابوو بۆئەوەی نەتوانێت هەڵبێت. لەراپۆرتەكەدا هاتبوو هاواری كردووە:((دەتوانن من بەمەرگ تاوانبار بكەن، بەڵام رێگا نەدەن دادوەر ستایشی ئیمپریالیزمی بریتانیا بكات.)) بڕیاربوو دادگا لەدەستپێكی مانگی ئاب بڕیاری كۆتایی بدات.

بەنزیكبوونەوەی وادەی دادگا، شەوان خەوبەچاوەماندا نەدەهات، شەوان میوەو شیرینی كەرۆژووی رۆژەكانی گەرمی هاوینی خۆمان پێدەشكاند بۆمن هیچ تامێكی نەبوو. چارەنووسی ئەم پیاوە بیرومێشكی منی بەخۆیەوە سەرقاڵكردبوو، دروست كاتێك كەكچانی هاوتەمەنی من بەهەستو سۆز سەرقاڵیان ئەستێرەكانی سینەماو گۆرانی بێژانی رۆمانتێكبوو، دونیایی من هەمووی سەرقاڵی ئەنوەر ساداتو دوعاكانم بۆرزگاری گیانی بوون. رۆژی كەبڕیاربوو دادگا بڕیاری خۆی بدات گوتم:((خوایە خێرێك دەكەم‌و مانگی دووەم دوای رەمەزان رۆژوو دەگرم.)) بۆكچێكی پانزدە ساڵی پڕخۆری وەك من كارێكی بچووك نەبوو.

هەمان رۆژ نەمدەتوانی چاوەڕێی كچی مامی خۆم بكەم تاكو رۆژنامە بێنێتەوە، بەڵام وەك كچێكی گەنج رێگا پێدراو نەبووم بەتەنیا لەماڵ دەرچم. داوام لەخزمەتكاری پوورم كردو گوتم:((سنایە، وەرە. رووداوێك روویداوە من دەبێت دەستبەجێ برۆمە سوئێز.)) گومانم نەبوو كەگومان لەقسەكانی من دەكات. چونكە بۆكچێكی تەندروست دەبێت چی روویدابێت؟ فەرمانی جێبەجێكردم‌و بەدوامدا هات، بەهەمان خێرایی كەمن دەرۆیشتم لەدوای من دەمایەوە.

نێوانی پێنج كیلۆمەتری بۆسوئێز بەپێی پیادە گەرمای هاوین بەڕاكردن تێپەڕمكرد. جادە چەوڕێژو لەدوای خۆم تۆزو خۆڵم دەكرد. زۆر لەخەڵك بەوردبینی تەماشایان دەكردم: مناڵەكانی كەباری كوێدرێژەكانیان دەیان ویست راست بێت‌و ئافرەتانی كە هەوڵیاندەدا هاوسەنگی كۆزەی پڕلەئاوی سەرسەریان‌و مناڵی شیرخۆری بەستراو لەپشتیان رابگرن من بەهەناسەبڕین‌و تینوویەتی زۆر رۆژووگرتنم بێچارەی دەكردم، لەیەكەم دوكانۆكە رۆژنامەم هەڵگرت سەرەوە نووسرابوو:((ئەنوەر سادات بێگوناحە.))

نازانم چ کاتێکیتر لەژیانم ئەوەندە ئاسوودەو خوشحاڵبووم. لەوانەیە سی ساڵی دواتر، لەساڵی ١٩٧٧ ئەنوەر سادات بەسەلامی لەسەفەری (قودس) گەڕایەوە. یەکەم جار کەئیسرائیل لەساڵی ١٩٧٩ هێزەکانی خۆی لەبیابانی سینا کێشایەوەو من سێ مانگ بۆشکوکرانە ڕۆژووم گرتن. بەڵام لەهەمان سات لەسوئێز، بەهەستێکی سەرکێشانەی گەنجایەتی، هەستم دەکرد کەشکەلانی ئاسمان تێردەکەم. بەفرمێسك باران ئایەتی قورئانم خوێندەوە:((خوداباشترین پاسەوان‌و دڵۆڤانترینی دڵۆڤانەکانە.))

قووتوویەکی شیرینیم کڕی تاکو لەم ڕۆژەی تایبەت بەکاتی شکاندنی ڕۆژوو بکەین بەجەژن، خۆم‌و سنایە کەهاوکاری کردبووم بۆگەڕانەوە سواری تەکسی بووین. ئەوکات نەمدەزانی کەئەم ڕۆژە تاکو چ ڕادەیەك تایبەت دەبێت.

ئەنوەر سادات، لەهەمان شەو، وەك لالەکان، لەناو چێشتخانە تەماشای حەسەنم دەکرد. دواتر گوتم:((من دەتوانم ئەنوەر ببینم.))

حەسەن، بەرازیبوونێکی زۆر کەگێڕۆدەی سەرسوڕمانی کردبووم، وەڵامی دایەوە:((بەڵێ دەتوانی، کچی نەزان. ماوەیەك لەلای ئێمە دەمێنێتەوە تاکو دواتر بڕیار بۆ ئایندەی خۆی بدات.)) بەبێربڵاوی دەستێکم بەرووخساری خۆمدا هێنایەخوارەوە. تەماشای جلوبەرگەکانی تۆزاویی خۆم کرد مووەکانی سەرم ئاڵۆزو تێکەڵاوبوون ڕوم لەحەسەن کردو گوتم:((دەڕۆم جلوبەرگەکانم دەگۆڕم.))

بەپەلە لەچیشتخانە ڕۆیشتمە دەرەوە تاکو بڕۆمە ژووری خۆم. کاتێك کار لەکار ترازابوو، بینیم کەسێك بەبێدەنگی لەوسەری ماڵەوە دانیشتووە. جارێکیتر لەشوێنی خۆم وەستامەوە. هێزی جوڵانەوەم نەبوو، زمانم گیرابوو بۆچی لەهۆڵەکە دانیشتووە؟ بۆچی لەمیوانخانە نییە؟))

بەئارامی رووی لەمن کرد. دەمزانی دەبێت تەماشای ژێرپێیەکانی خۆم بکەم، دەمزانی نابێت لەشوێنی خۆم بمێنمەوەو تەماشای ئەم پیاوە بکەم، هەموو پیاوێکیتر. بەڵام لەهەمان کاتدا توانی خۆم لەدەستی خۆمدا نەبوو. بڕێك تاریکابیوو، بەڵام ڕەنگ‌و روخساری لەبەر وێنەکانی زۆری بۆمن ئاشنابوو، کاتێك کەتەماشای دەکردم خەمبار دەهاتە بەرچاو. نەمدەزانی رووی خۆم وەرگێڕم. بەباوەڕی من لەروخساری، ڕەنگی ڕەشتر لەوێنەکانبوو. خەمی دونیا خۆی تێدا حەشاردابوو. کاتێك بەهەمان شێوە وەستابووم هەستم بەماندوویی دەکرد.

لەهەمان هەڵومەرجی وشکبوونی خۆم نەریتی ڕێزگرتنم بەبیرهاتەوە دەستی داخراوم بۆی درێژکرد، ئارام دەستی یەکترمان گرت، هیچ وشەیەکمان نەکرد. لەهەمان هەلومەرج هەمان فندوقم هاتەوە بیر کەهەفتەیەك پێش شکاندم ناوەویی دەبێتە دوو پارچە لەلایەك ناوی اللەو لایتری ناوی ئەنوەری لەسەر بەدیار دەکەوت ئەمەیانم بەباش دەزانی کەبڕیاری دادگا لەبەرژەوەندی ئەنوەر دەبێتو بەلأم لەهەمان کات هەستم دەکرد بۆمن باشتربوو.

لەکاتی خواردنی بەرەبەیان نەمدەتوانی چاوەکانم لەسەر هەڵگرم. دوای خواردنەکانی خرابی گرتووخانە بێگومان برسییەتی کێشاوە، بەلأم خواردنی زۆر کەمبوو. خێزانی ئێمە بەردەوام بابەتی جۆراوجۆریان دەگێڕایەوە، بەلأم ئەنوەر هیچ قسەیەکی نەکرد. من بەردەوام، هەرچەند بۆمن کارێکی نەکراوبوو بەلأم من بەدوای پرسیاری زۆر دەگەڕام کەباسکردنیان تاکو ئەوکات لەبار نەبوون. بۆچی ئەم کابرایە لێرانە لەگەڵ ئێمەدایە؟ بۆچی ئەوەندە بێدەنگە؟

دوو ڕۆژ هیچ قسەیەکی نەکرد. بەیانی ڕۆژی دواتر دوای شەوێکی بێخەو، هۆکاری ئەوەبوو کەباوەڕم نەدەکرد ئێمە پێکەوە لەناو خانوویەك دابین، حەسەن بڕیاریدا کەپوورم ببات بۆلای پزیشکی ددان لەسوئێز. منو پوورم لەپشتەوەی ئۆتۆمبێڵ دانیشتینو حەسەنو ئەنوەر لەپێشەوە. بەلأم تاکو هەمان کات لەلام تاکام هیچ قسەیەکی نەکرد.

لەئەنجامدا ئاوی دڵم شکاندو گوتم:((کاك حەسەن زۆرباسی ئازایەتیو وڵات پەرستی ئێوەی بۆباسکردووم.))

سەری خۆی بەمانای سوپاسکردن هەژاندوو نرمەیەکی کردو گەڕایەوە بۆناو بێدەنگی. ئێستا دەمزانی بیر لەچی دەکاتەوە، بیری دەکردەوە کەدەبێت لەئاییندە چ بکاتو چ بڕیارێك بدات. بەدرێژایی ژیانی هاوبەشمان، بەردەوام بەم شێوەیە بیری دەکردەوە. چەندین کاتژمێر بەتەنیایی لەئەیوان لەسەر کورسییەك دادەنیشتو تەماشای ڕووباری نیلی دەکردو سەبیلی خۆی دادەگیرساندو جاربەجار دوکێڵی هەڵدەکێشا. گوێی لەپێشنیارەکانی کابینەی حکومەتی دەگرت هەموو ڕاپۆرتو ئامارو پێشبینییەکانی دەخوێندنەوە. بەلأم خۆی بڕیاری کۆتایی دەردەکرد. هەمووکاتێك بەم شێوەیە بەتەنیا بڕیاری خۆیدەدا. من لەکورسییەکانی پشتەوەی ئۆتۆمبێڵ لەڕێگای سوئێز، لەگەڵ خۆم بیرم دەکردەوە ئەم بێدەنگییە زیاتر بەرازو نهێنی دەکرد.

رۆژی دواتر بەتەلەفۆن قسەم لەگەڵ باوکم کرد:((باوکە ڕێگام دەدەی زیاتر لای پوورە زوزو بمێنمەوە ؟ کەش‌و هەوای شار زۆر گەرمە لێرانە دەتوانم مەلەوانی بکەم.)) لەچاوەڕوانی وەڵامی هەناسەم لەسینگمدا رادەگرت. بوێری ئەوەم نەبوو هۆکاری سەرەکی بۆباس کەم، چونکە بێگومان بڕیاری گەڕانەوەی بۆدەردەکردم، بەختەوەرانە بەبێ ئەوەی پرسیارێك بکات ڕێگای پێدام زیاتر بمێنمەوە.

لەبەرهۆکاری ئەوەی کەزۆر بەباوکی خۆمەوە گرێدراو بووم‌و ڕێزی زۆرم لێدەگرت نەمدەتوانی درۆی لەگەڵدا بکەم. بەڵام نەمدەتوانی هۆکاری سەرەکی بۆباس بکەم. دەستبەجێ گومانی لەهەستەکانم دەکرد بەرامبەر ئەنوەر. هەرچەند تازە تەمەنم دەگەیشتە پانزدە ساڵان، بەڵام هاوسەرگیری کچانی شانزدە ساڵ‌و زیاتری چینی مام ناوەند لەمیسر ناباو نەبوو لەناو خێزانم باس لەهاوسەرگیری من کرابوو. عەلی برای حەسەن عەزەت، سەردانەکانی کەلەقاهیرە لەگەڵ خێزانی ئێمەیدا هەبوو نییەتی خۆی ئاشکرا دەکرد. بەڵام من لەدڵی خۆمدا ئەم هاوسەرگیرییەم قبووڵ نەدەکرد. عەلی گەنجێکی باشبوو، دەرهاوردەیەکی باش‌و خاوەن ئۆتۆمبێلی خۆیبوو. بەڵام مرۆڤی ماندوو دەکردو هیچ نێوانێکی لەگەڵ گەپ‌و گاڵتە نەبوو. زۆر باوەڕیم بەئازایەتی نەبوو.

عەلی بۆی باسکردم لەشەڕی جیهانی دووەم، کاتێك لەئەسکەندەرییە دەنگی ئاگادارکردنەوەی هێرشی فرۆکەکانی بۆمب هاوێژی وڵاتی دراوسێ دەهات. ئامادەیی هەبوو. ئەسکەندەرییە نێوانی لەگەڵ بەرەی شەڕ لەبیاباندا زۆرنەبوو، واتە سەد کیلۆمەتەر، دەنگی ئاگادارکردنەوە زوو دەهات، عەلی لەبیستنی زۆر دەترسا خۆی درێژی سەرزەوی دەکرد. بۆی باسکردم:((ئەوەندە دەترسام کەنەمدەتوانی هیچ جوڵەیەك بکەم، هەستم دەکرد دەمرم.)) هەرچەند ئەم کاردانەوە کاردانەوەیەکی مرۆیی هەژمار دەکرێ، بەڵام دەبوو هۆکار کەوەك هاوسەری ئایندە کەمتر گرنگی پێی بدەم. من پیاوێکم دەویست نەلەدەنگی ئاگادارکردنەوەی مەترسی فرۆکەکان‌و نەلەمردن بترسێت، ئەمانەی لەترسان خۆیان لەسەرزەوی درێژ دەکەن بەهیچ شێوەیەك ستایشیان ناکەم.

کوڕی پوورم بەتتە کەسێکی لەباربوو. ئەحمەد ئەبو زید، ئەفسەری سوپا، گەنجێکی بەڕێزو خاوەن دارایی باشبوو. ئەمەیان یەکێك لەپاسەوانەکانی ئەنوەرو تاوانبارەکانی دادگای قاهیرە بوو لەکاتی گواستنەوە لەزیندان بۆدادگا لەناو قەفەسێك دەکران. من ئەم بابەتەم بەلاوازی

ئەحمەد نەدەزانی، چونکە ئەحمەد ئەرکی سەربازی خۆی جێبەجیّ دەکرد. ئەحمەدی کوڕی پوورم خۆشدەویست بەلاّم وەك هاوسەر هیچ ویستێکم بۆنەبوو.

کوڕی یەکێك لەدراوسێکانمان داوای دەکردم، قبوولّم نەکرد. هەرچەند هاوسەرگیریی کردن لەگەلّ ئەم کوڕە دراوسێیە زۆرلایەنی باشم دەستدەکەوت، بەلاّم پیاوی خەیالّەکانم نەبوو. کوڕێکی دەولّەمەندو جوانبوو، تەنیا پێنج سالّ لەمن گەورەتربوو، زۆرباشم دەناسی. بەپێچەوانەی ولاّتانی رۆژئاوا رێگا بەکوڕو کچەکان دەدرێت یەکتر بناسن پێش هاوسەرگیری، لەمیسر سەردەمی منداڵی من ئەم نەریتەبوونی نەبوو. لەدەستپێکی گەنجایەتی ئامۆژگاری کوڕو کچەکان دەکرا بەدوای هەستەکانی خۆیان نەکەون بەتەنیا لەگەلّ یەکتردا نەمێننەوە. رێگای لەیەکتر نزیکبوون نەبوو.

هیچ کاتێك خۆمو خێزانم بیرمان لەم لایەنە نەدەکردەوە کەلەوانەیە من هاوسەرگیری نەکەم. بەلاّم ئێمە چینی ناوەندو خاوەن زەویی‌و زاربووین شتێك کەخێزانم بۆمنیان دەویست، هەموو میسرییەکان هیوایەتیان بۆکچەکانی خۆیان هەبوو، هاوسەرگیرییەکی باش‌و بەختەوەرانە بوو. هەرچەند لایەنی دارایی هاوسەری ئایندە باش دەبوو، هەلومەرجی ژیانی من باشتر دەبوو. پلەو پایەیی هاوسەر پلەو پایەیی بۆخۆدی من هەژمار دەکرا. لەهەموو لایەنەکەوە ناسنامەی ناسنامەی من دەبوو.

لەقسەکانی حەسەن تێدەگەیشتم کەخێزانی ئەنوەر وەك خۆی هەژارن. باوکی محەممەد، فەرمانبەری نەخوشخانەیەکی سوپابوو لەقوببە. دایکی سەییدە برین، کچی جوتیارێکی سودانبوو. ژیان بۆئەنوەر بەردەوام مەیدانی تێکۆشانبوو، تێکۆشانی ئەنوەر لەمنداڵی دەست پێدەکات.

ئەنوەر لە٢٥ کانوونی دووەمی سالّی ١٩٢٨ لەگوندێکی کشتوکالّی لەدلّتای نیل لەدایك دەبێت‌و سێیەم کوڕ لەهاوسەری دووەمی باوکی. دایکی محەممەدی باوکی ئەنوەر دوعا نووس‌و حەکیمی گوندی خۆیبوو، بەدروستکردنی دەرمانی گیایی نەخۆشی چارەسەر دەکردن‌و بەدوعاکانی کێشەکانی سۆزداری چارەسەر دەکردن. خێزانی ئەنوەر، وەك زۆر لەخێزانەکانیتری گوندنشین، دارایی ئەوەندەیان نەبوو کەکێشەی منداڵەکانی خۆیان چارەسەر بکەن. مزگەوت ئەنوەرو کەسانیتر فێری قورئان دەکران کەدەبێت ١١٤ سورەی قورئان لەبەر کرابان، خواردنی تەنیا پارچە نانێکی وشك‌و پەنیر دەبێت کەلەناو گیرفانیان دەنا.

دوای خوێندنی قورئان، کاتیتری ئەنوەر تەرخان دەکرا بۆ بردنی گامێش بۆناو گۆمی گوند بۆخواردنەوەی ئاو، هەڵسوڕاندنی گامێشەکانی نێر لەناو جۆخینەکانی گەنم بۆوردکردن، هاوکاریکردن لەکۆکردنەوەی بەرهەمەکانی وەك خورماو لۆکە. دواتر بۆی باسکردم شەوان لەدەوری تەنور خۆی درێژ دەکردو پیازێکی دەخوارد کەلەبەیانییەوە لەناو تەنوری دادەنا، گوێی لەچیرۆکەکانی دایكو داپیری دەگرت کەگەورەکانی میسر چۆن دژی بریتانییەکان وەستاون، بیرەوەرییەکانی ئەوکات بۆ ئەنوەر ئەوەندە گەرمو خۆشەویست بوون، کاتێك کەتوانیمان بۆخۆمان خانوویەك لەمیت ئەبوئەلکوم لەقاهیرە دروست بکەین بەبوونی هەموو پێداویستییەکان پێداگری دەکرد دەبێت تەنورێك لەسەر شێوازی کۆنی منداڵی تێیدا دروست بکرێت.

ئەنوەر لەتەمەنی حەوت ساڵیدا لەگوندی خۆشەویستی میت ئەبوئەلکوم دەچێتە قاهیرە، لەقاهیرە لەگەڵ داپیرو براکانی تەلعەتو عیسمەتو خوشکی، نەفیسە، دایكو باوکی لەخانوویەکی چوار ژووری ژیان بەسەر دەبەن. باوکی هاوسەرگیری لەگەڵ ژنێکیتری گوندی خۆی دەکات بەناوی ئامینە، نۆ منداڵیتر بۆئەم خێزانە زیاد دەکات لەناو هەمان خانوو.

دەرهاوردی مانگانەی باوکی ئەنوەر وەك فەرمانبەر نەیدەتوانی وەك پێویست زکی شانزدە کەس تێربکات، دراوی ناوگیرفانی ئەنوەر تەنیا بەشی کڕینی گلاسێك شیرو چای دەکرد. ئەنوەر لەسەر رێگای قوتابخانە لەبەر دەرگای یەکێك لەکۆشکەکانی مەلیك فوئاد، کۆشکی قوببە، تێپەڕ دەبێت، باخی ئەم کۆشکە لەبەهاردا نقرۆی بەرهەمی پێگەیشتوویی مژمژە دەبێت، بەڵام ئەنوەر بوێری لێکردنەوەی دانەیەکی نابێت. تاوانی دەستبردن بۆ موڵكوماڵی شا تاوانێکبوو کە دەکرا مەرگی بەدوایدا بێت.

ئەگەر رێکەوتنامەی نێوان بریتانیاو میسر لەساڵی ١٩٣٦نەدەکرا کەرێگای بەمیسر دەدا سوپای خۆی زیاتر بکات، ئەنوەر تەواوی تەمەنی تاوانبار دەبوو کەژیانێکی هەژارانەو کۆڵەمەرگیو نەناسراوی خۆی بەرێوەببات. گرنگتر، ئەم رێکەوتنە رێگای بەچینی هەژاردا کەدەتوانن ببن بەئەفسەری سوپا، پێشتر تەنیا رێگا بۆچینی سەرەوە هەبوو ببن بەئەفسەر لەناو سوپا. دوای شۆڕشی ساڵی ١٨٨٢ دژی پاشا تۆفیق کە قوتابیانی زانکۆی سەربازی بەشداریانکرد تەنیا گەنجانی چینی سەرەوەی خاوەن موڵك دەیانتوانی ببن بەئەفسەر.

بەدەستەوەگرتنی سوپا لەلایەن کەسانی دەوڵەمەندو خاوەن موڵك تاجو تەختی شایان دەپاراست، بەلأم جیاوازییەك هەبوو نەدەکرا بەردەوامی هەبێت.

دوای شەڕی جیهانی یەکەمو هەستانی شەپۆلی نەتەوەخوازان، مەلیك فوئاد هەوڵیدا کە چینی خوارەوە بتوانن لەزانکۆی سەربازی بخوێننو ببن بەئەفسەری سوپا، بۆئەوەی بتوانێت رێگری لەشۆڕش بکەن. ئەم یاسایی سادە توانی کوڕی فارۆق لەتاجو تەخت بێنێتەخوارەوە. ئەنوەر لەکەسانی سەرەتایی چینی خوارەوەی کۆمەڵگەی میسربوو توانی لەساڵی ١٩٣٨ لەزانکۆی ئەفسەری پاشایەتی، بەپلەی ئەفسەری دووەم دەربچێت. یەکێکیتر کەلەگەڵ ئەنوەر دەبێت جەماڵ عەبدولناسربوو کەچواردە ساڵ دواتر رێبەرایەتی کودەتایەکی لەئەستۆگرت کەفارۆقی لەتاجو تەخت هێنایەخوارەوە، هەموو ئەفسەرانی گەنج رێبەرایەتی شورشیان دەکرد.

ئایندەی ئەنوەر لەناو سوپای شا، بەرزبوونەوەی ئاستی کۆمەلأیەتی دوای وەرگرتنی پلەی ئەفسەری، بەتەواوی دەستەبەربوو، بەلأم ئەنوەر بڕیاردەدات هەمووشتێك قوربانی ئازادی میسر بکات. دوای یەکەمین گیرانەکانی ناوسوپا ئەنوەر دەردەکرێت. حەسەن ئیبراهیم روون دەکاتەوە دۆسییەیی ئەستووری لەدژی حکومەتی ئینگلیزەکان لەمیسر بەهیوای ئەوەی دووبارە رێگای پێبدرێت بگەڕێتەوە ناوسوپا زۆر لاوازە. ئەگەر بڕیاری دەدا وەك چالأکوانێکی سیاسی بمێنێتەوە، ئەگەری دووبارە گیرانەوەی زۆر زیاد دەکرد.

بەلأم روونکردنەوەکانی حەسەن بێدەنگی ئەنوەرو مانەوەی لەسوئیز باشتربوو. حەسەن دەیگوت ئەنوەر لەبەر هۆکاری جیابوونەوەی لەهاوسەری لەجیاتی ئەوەی بگەڕێتەوە بۆناو خێزانی هاتووە بۆماڵی ئێمە. هاوسەرو کچەکانی بچوکی لەقاهیرە لەماڵی باوکی هاوسەری ئەنوەربوون. ئەنوەر خاوەنی هیچ خانوویەك نەبوو، دوای مانەوەی نزیکەی سێ ساڵ لەگرتووخانە، خاوەنی هیچ داراییەك نەبوو. لەئایندە هەرچی دەستی دەکەوت دەبێت بۆخەرجی منداڵەکانی رەوانە کردبا. ئەمەیان نەك تەنیا یاسابوو بەلکو ئەرکبوو. ئێستا ناچاربوو تۆقرەی ئەشکەنجەی بڕیاردان بۆ ئایندەی خۆی قبووڵ بکات.

ئەقڵ دەیخواست ئەوەی کەحەسەن باسی ئەنوەر ساداتی دەکرد من هەستەکانی زۆری عاشقانەی خۆم سەبارەت بەئەنوەر دابەزێنم. بەلأم چ کچێکی پانزدە ساڵان ئەقڵی بەتەواوی کار دەکات؟ بەپێچەوانە تەماشای ڕەنگی روخسارم دەکرد زۆر لەڕەنگی روخسارم ڕەشتربوو، زۆر لەخەڵکی میسر ئەم ڕەنگەیان بەلأوە پەسەند نەبوو، بەلأم بەچاوەکانم سەرنج ڕاکێشبوو.

تەنیا تەماشای جلوبەرگەكانی بەچرۆك هاتووی ئەنوەرم دەكرد، بەباوەڕی من هیچ كێشەیەكیان نەبوو. تەماشای تەمەنی ئەنوەر دەكەم، پانزدە ساڵ لەمن گەورەتربوو، گەنجایەتیم لەروخسای دەبینی. گوێم لەبێدەنگی دەگرت دەنگی كەسێكی بەهێزی هەبوو. ئەنوەر لەبیرمدا قارەمانی خەیاڵەكانم بوو. نەمدەزانی چۆن بیر لەمن دەكاتەوە.

لەلقێكی كورتی داری هەنجیری ناوحەوشكە هەنجیرێك لێدەكەمەوەو دەڵێم:((هەنجیرم بۆهێناوی.))

بۆیەكەمجار تەماشای كردمو زەردەخەنەیەكی كردو پرسیاریكرد:((لەدایكبوونت ئەم رۆژانەبوو، وایە؟))

گوتم:((بەڵێ)) بەهیوای رازی بێتو لەگەڵ ئێمە بێتە ئیسماعیلییە كەناراوەكان، هەناسەم لەناو سینگمدا حەپەسابوو.

بەلێبۆردنەوە گوتی:((ناتوانم هیچ دیارییەك بۆتان بكڕم.))

بۆمن گرنگ نەبوو. پرسیارم كرد:((لەگەڵ ئێمە دیت بۆ كەناراوەكان؟))

بەبێدەنگییەكی درێژ. ترسام نابێت تەواوی رۆژ بەتەنیایی لەناو حەوشەكە بمێنێتەوە. گوتی:((دێم.))

هەمان رۆژ لەسەرەتاوە رۆژێكی سیحراوییبوو. لەناو ئۆتۆمبێل لەرێگاتاكو گەیشتین ئیسماعیلییە گۆرانیم دەگوتن، رێگایەكی درێژ لەلایەك بیابان‌و لەلایەك دەریایی سوور. تاكو نزیك نۆكەندی سوئیز. ئۆتۆمبێل سواری منی هاندا بۆگۆرانی گوتن. نەریتێك كەدواتر شوفێرەكانم ئاشنایەتی باشیان لەگەڵدا هەبوو. هەمووكاتێك رادیۆ دەكرایەوە بەدوای گۆرانییەكانی ئوم كلسوم دەگەڕان بۆئەوەی بتوانم لەگەڵیدا گۆرانی بڵێمەوە. بەڵام هەمان رۆژ تەنیا گۆرانی گوتنی من نەبوو لەبەرچاو نائاسایی دەهاتە بەرچاو، سەیر لەوەدابوو دوای ماوەیەكی درێژ ئەنوەر دەستی بەقسەكردن كردبوو.

لەناو ئۆتۆمبێل پیی گوتم:((ناتوانم هیچ دیارییەك پێشكەش بەتۆ بكەم بەڵام، دەتوانم گۆرانیت پێشكەش بكەم.)) كاتێك بەدەنگێكی نەرم‌و خۆش‌و زۆرجوان دەستی بەگۆرانییەكی عاشقانەی فەرید ئەترەش كرد، گۆرانێك كەدەبینرا كەباوەڕكردنی دژواربوو. روخساری لەشێوازی بیركردنەوە دەهاتە دەرەوە، گیانی بەبەردا دەهات‌و زیندوو دەبوو. لەجیاتی ئەوەی وەك جاران تەماشای دوورەوە بكات هیچ نەبینێت. رووی لەلای من كرد زۆر خۆشحاڵبووم،

خۆشحاڵییەك تاکو شوێنی مەبەست لەقەراخ رووباری سوور شوێنی نانخواردن بەردەوامی هەبوو.
تەواوی پرسیارەکانی کەلەماوەی بێدەنگی رێزم گرتبوو بەیەکجاری بەسەرمدا باراندن، بەهەستێکی زۆرگەرم وەڵامی هەموو پرسیارەکانی منی دایەوە. پرسیم:((لەناو زیندان چۆن کاتتان بەسەر دەبرد؟)) باسی دژواری ناو گرتووخانەکانی کرد کەلەسەرەتای ساڵی١٩٤٢گرتووخانەی بێگانەکان ئەوەندە خراپ نەبوو. گوتی تەخت، پێخەو کورسییەك‌و مێزێکی بچوك زۆرجار جگارە هەبوون، بەلأم هەڵگرتنی شەمچە رێگەپێدراو نەبوو، دەبێت پاسەوان جگارەی بۆئێمە داگیرساندبایە. رێگا بەخوێندنەوەی کتێب‌و رۆژنامە دەدرا بەسوود وەرگرتن لەکتێبەکانی ئینگلیزی زۆربەی کاتی تەرخان کردبوو بۆفێربوونی زمان‌و رۆژانە دووجار بۆماوەی پانزدە خولەك رێگا بەهاتنەدەرەوە بۆناوحەوشەکە دەدرا.
دواتر بۆ گرتووخانەیتر دەگوازنەوە. بۆجاری یەکەم نزیکەی ساڵێك لەگرتووخانەی سیاسییەکان لەکۆشکێکی خۆش لەمیسر تێپەڕ دەکات‌و لەهەمان شوێن دەتوانێت بەزمانی ئەڵمانی خۆی فێری خوێندنەوەی چیرۆکی ئەدگار والاس بکات. ساڵی دواتر دەگوازرێتەوە بۆ گرتووخانەی زەیتون لەنزیك قاهیرە. لەهەمان گرتووخانە لەگەڵ هاوڕێیان بۆ بەسەربردنی کات دەست بەخێوکردنی کەروێشك دەکەن. دواتر دەردەکەوێ کەسێکی گیراوی خەڵکی باڵکان شارەزایی لەکوڵاندنی کەروێشك هەیە، خواردنی زۆرباش دەخۆن تاکو کاتێك کەهەموو کەروێشکەکان لەبەر نەخۆشی دەمرن. بەڵام ئەنوەر دەست هەڵناگرێ. تێکشکانی ئەڵمانیا لەشەڕدا نزیکبوو بریتانیا بەهێز لەشوێنی خۆی لەمیسر وەستابوو. ئەنوەر بەدوای رێگای خۆرزگارکردن دەگەڕا، جارێك، دووجار و چەند جارێك.
دوای خواردنی نیوەڕۆ کاتێك لەناراوەکانی دەریا لەئیسماعیلییە پیاسەمان دەکرد پرسیارم کرد:((چۆن هەڵاتی؟))
بەبیرهاتنەوەی هەمان رۆژ پێدەکەنی:((یەکەمجار شەش کەس بووین، حەسەن عزەت لەگەڵ ئێمەبوو. سەرەوەی خانوومان کونکرد بەقادرمە رۆیشتینە سەرەوەو دواتر خۆمان گەیاندە سەر شەقام. تاکو رۆژی دواتر هیچ کەسێك نەیدەزانی کەئێمە لەهەمان شوێن رۆیشتینە دەرەوە.)) پێڵاوەکەم لەکەناراوەکان دادەکەنم‌و دەڵێم پرسیارم کرد: ((بۆچی دووبارە گەڕانەوە؟))

دیسان پێکەنیو گوتی:((دەموویست حکومەت سووكو ریسوا بکەم، کردم. راستەوخۆ رۆیشتین بۆکۆشکی عابدینو ناوی خۆمان لەپرسگەی شاهانە نووسی. زۆرکەس ئەمەی دەکرد وەك رێزگرتن لەدەسەلاتی شا بۆرێگاپێدان، دواتر بەسکرتێرم گوت ئێمە بەکاتی لەگرتووخانەی زەیتون رامانکردووە کەپەیامێك بەشا بدەین کەخۆی رادەستی ویستو خواستی ئینگلیزەکان نەکات.))

چاوەکانی من دەبێت وەك چاوەکانی سکرتێری کۆشکی عابدین، لەسەرسوڕمانی ئەم هەنگاوەی ئازایانە خڕدەبوون.

پرسیم:((دواتر چیتان کرد؟))

گوتی:((بەتەکسی گەڕاینەوە بۆ گرتووخانەی زەیتونو خۆمان ڕادەستکرد.))

نۆمانگیتر لەگرتووخانەی زەیتوون دەمێنێتەوە، هەرچەند هاوپەیمانەکان لەتشرینی یەکەمی *سالی ١٩٤٤ بەپشتراست بوون لەسەرکەوتن زۆر زیندانی سیاسیان ئازاد کردن، تەنیا بەپێی* بڕیاری ئینگلیزەکان تەنیا ئەنوەرو داورودەستەی لەگرتووخانە مانەوە. ئەوکات ماندوو دەبێت بەتەواوی بیر لەهەلاتن دەکاتەوە.

بەهەمان شێوە کەلە کەناراوەکان هەنگاومان هەڵدەگرتن پێلاوی لەپێی دەکاتو شەڵواری تاکو چۆکەکانی هەڵدەداتەوەو دەلێت:((دەستمان لەخواردن هەلگرت، ناچاربوون بەپێی یاسا من ڕەوانەی نەخوشخانە بکەن. لەکاتژمێری قەڵەبالغی کاتی نانخواردنی نەخوشخانە هەلاتم بەخێرایی خۆم گەیاندە حەسەن کەبەئۆتۆمبێلی ئامادە لەدەرگای نەخوشخانە چاوەڕیی دەکردم. تەواوی سالی دواتر کەسێکی هەلاتوو هەژمار دەکرام.

بۆماوەی کاتژمێرێك دەبوو کەپێکەوە هەنگاومان هەلگرتبوون کات بەخێرایی تێپەڕ دەبوو. دەمزانی دەبێت بەخێرایی بگەڕینەوە بۆهەمان شوێنی کەکچی پوورمو هاوسەری حەسەن عیزەت دانیشتبوون، بەلام ئەوەندە نقرۆی ناو بەسەرهاتوو ڕووداوەکانی ئەنوەر بووم کەرێگام بەخۆمداو شەرمم نەکرد. جۆرێك لەهەلومەرجی هاودلی لەنیوانماندا دروستبوو، لێك گەیشتنێك، نەپێشترو نەهەمان کات بوونی نەبوو. دوای کاتژمێرێك گەڕاینەوە بۆلای کچی پوورم ئەنوەر چەند جارێك پرسیاری تەمەنی کردبووم، باوەڕی نەدەکرد کەمن تەمەنم پانزدە سالانە. هەمان ڕۆژ بۆئێمە ئەوەندە تایبەتبوو کەلەسالانی دواتر چەندین جار باسی هەمان ڕۆژمان دەکرد، جارێی کۆتایی ڕۆژی پێش مەرگیبوو.

بەهەمان شێوە کەمن پرسیارەکانم لەمێشکمدا کۆکردبوونەوە، ئەنوەر هەستەکانی خۆی بەشاراوەیی رادەگرتن. بەهەمان شێوە کەمن تامەزرۆیی بیستن بووم، ئەنوەر لەبەردەوامی قسەکردنی هەستی بەسووکبوون دەکرد، هەرچەند لەتەواوی ماوەی کەپێکەوەبووین دەبینی کەبیروباوەڕەکانی بۆکچێکی قوتابخانە دەگێڕێتەوە، بەجۆرێك سەرشێواوی تەماشای دەکردم، بەلأم دیسان، لەیەکەم ئێوارەی ئیسماعیلییەو ئێوارەکانیتری هاوین لەناو باخەکانی سوئێز هەنگاومان هەڵدەگرتن، هیچ شتێکی نەگوتراو لەنێوانمان نەمابوو. لەرێزو ستایشم سەبارەت بەئەنوەر تۆزقاڵێك نەگۆڕا، بەلأم هەستی هەڵخروشێنم‌و ویستی گەنجانەم زۆر بەخێرایی گۆڕا بۆخۆشەویستییەکی ئارام.

بەلأم نیگەرانییەکانی ئەنوەر رۆژ بەرۆژ زیاتردەبوون ئەمەش لەبەر جیاوازی زۆری تەمەن نەبوو، لەبەر پابەندبوونی بەسیاسەت‌و ئەرکی سەرانی بۆخێزانەکەی، هیچ داراییەك بۆی نەدەمایەوە. بەباوەڕی هاوسەرگیری دووەم لەم هەلومەرجەدا، کارێکی کراو نییە. لەساڵەکانی گیرانی نەیتوانیبوو خەرجی منداڵانی هاوسەری یەکەمی بدات، باوکی تاکو دەیتوانی هاوکاری دەکرد بەلأم وەك پێویست نەبوو.

پرسیارم کرد:((خێزانەکەتان چۆن توانی بەردەوامی بەژیان بدەن؟))

گوتی:((تەنیا بەهاوکارییەکانی ئیخوان موسلمین، مانگانە دەلیرە بۆخێزان‌و منداڵەکانم ڕەوانەدەکران. هەمووکاتێك بەسوپاسگوزاریان دەمێنمەوە.))

بەپێکەنین گوتم:((بەباوەڕم من بەشداریم کردووە.)) بۆم باسکرد کاتێك کە بچوکبووم بۆئیخوان موسلمین پارەم کۆدەکردەوە.

ئەنوەر نیگەرانی هاوسەری یەکەمی، ئەقبال مەدی‌و کچەکانیبوو، خۆی بەپێی داب‌و نەریتەکانی گوند، لەتەمەنی بیست‌و دووساڵی کاتێك دەبێتە ئەفسەر هاوسەرگیری دەکات. هاوسەری خەڵکی گوندی خۆیانبوو. لەهەمان سەردەم هاوسەرگیری خزمایەتی زۆرباوبوو، ئێستاش لەناوچەکانی گوندنشین ماوە، بەشێوەیە پشتی خێزان‌و زەوی خێزانی بەهێزتر دەبێت. ئەقبال مەدی بۆئەنوەر لەهەمان سەردەم، کەگەنجێکی گوندی خۆیبوو، دوو کەسی شیاوی یەکتر هەژمار دەکران. ئاهەنگی هاوسەرگیریان لەگوندی میت ئەبوئەلکوم بەرێوە دەچێت کەباوکی ئەقباڵ مەدی موختاری گوند دەبێت. کچەکە حەوت ساڵ لەئەنوەر گەورەترو شایستەبوو، بەلأم لەهەمان کات ژنێکی گوندنشین بوو، خوێندەوار نەبوو تاکو ئەوکات سەردانی قاهیرەی

نەکردبوو. کاتی کە هەنگاومان لەقەراخ دەریا لەئیسماعیلییە هەڵدەگرتن ئەنوەر دەڵێت:((دڵم دەیویست بتوانم باسی ژیانی خەیاڵەکانم بۆهاوسەرم بکەم، بەڵام هەزمی نەدەکردو لەم لایەنەوە تاوانبار نەبوو.))

لەسەردەمی دووجار گیرانی لەسەر کوشتنی ئەمین عوسمان لەساڵی ١٩٤٦ ئەنوەر هەست بەبوون‌و نەبوونی خۆشەویستی لەژیانی دەکات، ئەمجارەیان بەپێچەوانەی جاری یەکەم کەهەلومەرجی گرتووخانە تاکو ڕادەیەك باشتر دەبێت.، سەردەمی تێپەڕکردنی گیرانی لەگرتووخانەی ناوەندی قاهیرە، مانەوەی کارێکی هەستم دەبێت سێ مانگ لەژووری تاکەکەسی دەمێنێتەوە. ژوورێك نەتەختی خەوتن نەمێزو کورسی‌و چرا. هەموو ئەمانە لەبەرامبەر گوێگرتن لەرادیوو خوێندنەوە هیچ نەبوون. زستان ئاو لەدیوارەکان دەهاتەخوارەوەو هاوینان پڕلەمارمیلکە شوێنم بەرگی دارخۆرمای وشکبوون کەپێخەوێکی چڵکن بەسەرمدا دادەکێشا.

لەیەکێك لەپیاسەکانی ئێوارن ئەنوەر بۆی باسکردم:((تەنیا شتێك کەجێگای شوکربێت سەردەمی بەئازاری منداڵی خۆمبوو لەگوندەکەمان هاوکاری بیری دەکردم کەبەسەر کیشەکانی خۆمدا زاڵبم.)) کێشەکانی ئازارهێنەر بۆ موسلمانەکان کێشەی دەستنوێژ هەڵگرتنبوو لەناو ژوورەکانی گرتووخانە دووسەتڵ بوون یەکێك بۆ خواردنەوەی ئاو ئەویتریان بۆهاجەتی ڕۆژانە. شتێکی زۆر سروشتی دەبێت لەنێوان سێ هەزار گیراو لایەنی تەندروستی ڕاچاو نەکرێت‌و نەخۆشی بەربلاو سەرهەڵبدەن. ڕۆژانە پارونانێك لەکونی دەرگایەوە فڕەدەدرایە ژوورەوە کەپێکدەهات لەپارونانێك کەبەدەوری چەند پاقلەیەك پێچرابوو.ئەنوەر زۆرکەم دەیتوانی بیخوات. وەك دیار ویستی بۆخواردن لەتەواوی ژیانیدا نەمابوو، ڕۆژانەی خواردنی بەگلاسێك ئاوی سوور دەستی پێدەکردو خواردنی هیچ کاتێك باش نەبوو. لەکۆتایەکانی تەمەنی تەنیا شۆرپای دەخوارد.

دونیایی ئەنوەر ژووری تاکەکەسی پەنجاو چواربوو کەتەنیا گوێگری خۆیبوو. تەنیایی هەمان سەردەم دەبێت کەبیری سەرقاڵی ژیانی بێمانای هاوبەش دەبێت. هەزاران جار پرسیار لەخۆی دەکات چۆن دەکرێت هاوسەری بەتەڵاقدان سزا بدات لەکاتێکدا بەدرێژایی ساڵەکان لەچاوەڕوانی دەمێنێتەوە تاوانی نییە؟ کاتێك باسی دەکرد هەستی بەرامبەر ئەرکی هاوسەرایەتی چییە چەند ئازاری دەکێشا، بێسنوور ستایشم دەکرد. لەنیوان پیاوانی میسری کەسانی زۆرکەم دەبینی کەلەبەرامبەر هاوسەری هەست بەئەرکی بکات‌و بیر لەبەرچاوگرتنی

هەستەکانی بکات، بێگومان بیری لەهاوسەری دووەمی دەکردەوە، بەلأم بەبوونی سێ منداڵ ئەم ئەگەرەی لاواز دەکرد.

یەکساڵ‌و نیوی تەواو، شەوان خۆی لەسەر جێگای درێژ دەکردو نیوچاوانی دەکوتا، لەهەلومەرجی تێکەلأوی ژیانی هاوبەشی ئازاری دەکێشاو بەیانیان بەهەمان هەلومەرج تێپەڕی دەکرد. ئایینی ئێمە ئامۆژگاریمان دەکات کەلەتەلأق خۆمان بەدوور بگرین. بەلأم ئەنوەر هیچ چارەیەکیتری نەبوو. لەکۆتایدا لەناو گرتووخانە پەیامێك بۆهاوسەری ڕەوانە دەکات کەچیتر بۆبینینی سەردانی گرتووخانە نەکات. کاتێك ئازاد دەکرێت بەهاوسەری دەڵێت ئیتر ناتوانین پێکەوەبین. لەژووری تاکەکەسی پەنجاو چوار گەیشت بەئەنجامێك کەویست‌و خۆشەویستی خۆی بۆمیسرو مرۆڤایەتی‌و خودا تەرخان بکات.

لەپانزدە ساڵیدا، پێویستیم بەکەس نەبوو کەباس لەهێزی خۆشەویستی بۆمن بکەن. هەستێك زیاترو ئاسانتر خۆی دەگەێنێتە ئافرەتان، دەتوانێت هەندێکجار بەخۆشی‌و هەندێکجار بەدەردو ئازار مرۆڤ لەهەمووشتێك دادەبڕێنێت. سەرتاسەری ژیانم لەژێر هەستی خۆشەویستی بۆهاوسەرو منداڵەکان‌و وڵاتم بوو، خۆشەویستییەکی تەواو بێ مەرج. بەلأم هەموو ئەم لایەنانە، ئەنوەر لەبەرگیرۆدە بوونی فیکری لەناو ژووری تاکەکەسی پەنجاوچوارو بابەتی خۆشەویستی بەدرێژایی ژیانی هاوبەشمان، بۆیەکجار وشەی (خۆشەویست) سەبارەت بەهەستەکانی بەرامبەر من بەکاری نەهێنا. بەردەوام گیرۆدەی ئەم بابەتەم دەکرد، بەدوای پشت ڕاستبوونێك دەگەڕام کەهەموو ئافرەتێك بەدوایدا دەگەڕێت. هەوڵی خۆمدا کەناچاری بکەم وشەی خۆشەویستی بەرامبەر من بەکاربێنێت. هەرچەند دەمزانی خۆشەویستی زۆری بۆمن هەیە، نەیدەتوانی، یان نەیدەویست بێنێتە سەرزاری. سەرکۆنەی دەکردم:((خۆت بەقسەی منداڵانە خەریك نەکەیت جیهان، هەمان ڕێزی لەئێوە دەگرم دەزانی چ هەستێکم بۆتۆ هەیە. هەرچییەك من هەبێت بۆتۆیە.)) بەلأم من پێداگریم لەقسەی خۆم دەکردو دەمویست لەدەمی گوێبیستی ئەم وشەیەبم. ئازارمدا دەمگوت:((گەربۆم باس نەکەیت ئێرەیی بەهەموو ژنێك دەبەم کەتەماشای تۆدەکەن.)) بەلأم هیچ کاتێك قبووڵی نەکرد. لەوانەیە شەرمی دەکرد.

کاتێك لەسوئێز بووین نەماندەتوانی ئەوەندی پێویست بێت پێکەوەبین‌و قسە بکەین. پوورم‌و کچی پێش ئەوەی کەخۆم ئاگاداربم، هەستیان کردبوو شتێك لەنێوان ئێمەدا هەیە، گیرۆدەی هەلومەرجێکی دژواربیبوون. بۆکچێکی گەنج‌و جوان نەدەبوو ئەوەندە لەگەڵ پیاوێکدا بەتەنیابن.

حەسەن وەك گەورەی خێزان نابێت ئەوەندە ڕێگای پێدابام لەگەڵ ئەنوەر پێکەوەبین. بەتایبەتی برای خوازبینی من بوو هەلومەرج زیاتر بۆ حەسەن مەترسیداربوو. ئێستا پشتیوانی لەچ کەسێك دەکرد؟ سروشتی دەبوو لەجیاتی غەریبەیەك پشتیوانی لەخزمانی خۆی دەکرد، بەلأم ئەنوەر غەریبە نەبوو، قارەمانێکی نیشتمانبوو.

من بیرم لەمەترسی نەدەکردەوە. تەنیا دەمویست لەگەڵ ئەنور بمێنمەوەو گوێی لەقسەکانی بگرم لەژیانی رابردووو تێکۆشانیو کتێبەکانی کەدەخوێندنەوە بەتایبەتی لەرابردوو لەناو گرتووخانە. ژیانی من بەشێوەیەکی ئاسایی بەرێوەدەچوو هیچ کێشەیەکمان وەك خەڵکانیتر لەماڵەوە نەبوو. شتێك نەبوو بۆی باس بکەم. بەلأم قسەکردنی بەدەنگی بەرز راهاتبووم، تێر نەدەبووم. ئەنوەر خاوەنی دوو جۆرە دەنگبوو یەکێك بێدەنگیو ئەویتر دەنگی زۆر بەرز. دواتر کەخەڵك گوێیان لەوتارەکانی دەگرت دەیانگوت:((ئەنوەر بۆچی ئەوندە تووڕەیە؟))من پێدەکەنیم بۆم باسدەکردن: ((تووڕە نییە دەنگی بەم شێوەیە.))

تەنیا لەسوئێز دەمتوانی قسەی لەگەڵدا بکەم، کاتەکانی کەباسی کتێبەکانی دەکرد کەپێشتر دەیخوێندنەوە. شەش مانگی کۆتایی مانەوەی لەژووری تاکەکەسی پەنجاو چواری گرتووخانە رێگایان پێدابوو چەند پێداویستییەك بەکرێ وەربگرن وەك مێزو کورسییو گرنگتر لەهەموویان کتێب خوێندنەوە. هەموو کتێبەکانی جەك لەندەن بەتایبەتی ئاوازی گیانەوەر تامو چێژی لەگێڕانەوەی دەبردو خۆی لەشوێنی گورگێك دادەنا کەدەستەمۆ نەدەکرا. کەوتبوو ژێر کاریگەری بەرهەمی لۆید دۆگلاس سەبارەت بەئەنجیل، چێژی لەماسی گری گەورەو بالأپۆش دەبرد. بەلأم خوێندنەوەی وتاری دەروونناسێکی ئەمەریکی لەگۆڤاری ریدرز دایجست ژیانی دەگۆڕێت.

بۆی باسکردم:((بەیانیان زوو بەتایبەتی کاتەکانی کە کەشوهەوا سارد دەبوو، زیاتر لەهەموکاتێك کەبیرم لەگرتنم دەکردەوە. ترسم لەخەوتن هەبوو، کاتژمێر سێو چواری بەیانی بەلەرزان پشتراست دەبووم کەدیسان بۆگرتنم هاتوون لەخەو ڕادەچەڵەکام. تاکو ئەوکات مانای ترسم نەدەزانی. لەژووری تاکەکەسی پەنجاو چوار کار گەیشتە شوێنێك کەپرسیارم لەخۆم دەکرد ئایا ئەم ئازارەی کەبۆمیسر دەکێشم هیچ نەرخێکی هەیە؟ گۆڕانێك دروست دەبێت؟ یان تەنیا ژیانی خۆم وەك مرۆڤێك لەناو دەبەم؟))

وەڵامی هەستی تێکشکاوی ناسنامەی لەگۆڤاری ریدرز دایجست دەدۆزێتەوە. دەروونناس دەنووسێت خودا قەیرانەکانی جۆراوجۆر بۆمرۆڤ دروست دەکات، تاکو فێری خۆراگری‌و تێکۆشان بکات لەگەڵ کاردانەوەکانی. خاڵێك کەبەهیچ شێوەیەك نابێت ئەمەیان بەتووڕە بوونی خودا هەژمار بکرێ، ئەمەیان جوڵانەوەیە کە لەخۆشەویستی بۆنیشاندانی گێڕانی نەخشەی خۆیان کەبەهەموو بەندەکانی دەسپێرێ. بەئیمان‌و خۆشەویستی بۆخودای بەخشندەو دادپەروەر دڵۆڤان هەموو دەرگەکان دەکرێنەوەو تەواوی نائارامییەکان لەدوای خۆتان لەبیری دەکەن. ئەنوەر بۆی باسکردم لەهەمان کات بەدواوە ئارامی وتێگەیشتن لەناسنامەی خۆم دۆزییەوە. ئیتر هیچ کاتێك لەرووداوەکان نەلەرزام.

کاتێك لەگەڵ کچی پوورم لەتراس هوتیل بوریواژ دانیشتین پرسیارم لێکرد:((بەباوەڕی تۆ دەبێت چی بکەم؟)) من‌و حەسەن‌و کچی پوورم‌و ئەنوەر بۆتێپەڕ کردنی سێ ڕۆژی جەژنی رەمەزان ڕۆیشتبووین بۆ ئەسکەندەرییە:((عاشقی ئەم پیاوە دەبم.))

کچی پوورم ئامۆژگاری دەکردم:((ئاگاداربە، بەیانیان بەتەنیا لەگەڵ ئەم پیاوە نەڕۆ بۆگەڕان.)) بەڵام ئەم گەڕانانەی بەیانیانی کەناراوەکان زۆر ئازیزبوون، لەیەکێك لەبەیانیەکان هەندێك هاوڕێی قاهیرەی دایکو باوکی خۆم بینین. زۆر ترسام. لەکاتی تێپەڕبوونمان لەتەنیشتیان سەرم وەك رێزگرتن جوڵاند، نەمدەویست جوڵانەوەیەك بکەم کەهەست بکەن خۆم دەشارمەوە، بەڵام لەهەمان کات نەمدەویست سەرنجی بکەوێتە سەرم. لەدڵەوە زۆر دەترسام کەگەڕانەوە بۆقاهیرە بۆدایکو باوکم باس بکەن کەلەگەڵ کەسێك بینیوویانە بەڵام هیچیان باس نەکردبوو.

هەلومەرج ڕۆژبەڕۆژ بۆمن مەترسیدارتر دەبوو، کچی پوورم، بەرێگا پێدانی هاوسەر حەسەن، بەڵێنی بەئێمەدا:((من لەگەڵ ئێوە دادەنیشم تاکوبتوانن قسەی خۆتان لەگەڵ یەکتر بکەن.)) ئەمەیکرد، لەکاتی نانخواردنی نیوەڕۆ لەبوریواژ، نانی ئێواراە لەسان ئەستفانۆ، لەجادەی کەناراوەکانی بیابان، خۆر روخساری ئەنوەری ڕەشتر دەکردو بەقسەی ئەنوەر روخساری سوورتر دەکرد. ئێمە کارێکمان دەکرد لەمیسر تاکو ئەوکات کەس بیری لێنەدەکردەوە. پەیوەندی هەست، پەیوەندی عاشقانەمان رێکدەخستن.

ئیتر هەمووشتێك لەدەستمان دەرچوو. هەستێکی کۆنترۆڵ نەکراو بەراستی ئێمەی کۆنترۆڵ دەکرد. بەهەرنەرخێك بێت دەبێت لەگەڵ یەکتر دەماینەوە. دەبێت پێکەوە ژیابایەن.

بۆی باسکردم:((تۆزۆر بچوکی، کاتێك من پیردەبم ئەوکات دەستپێکی ژیانت دەست پێدەکات..))

بۆم باسکرد:((بیر لەساڵەکان بکەرەوە کەپێکەوە دەبین. ئەگەر جیاوازی تەمەن لەنێوانمان هەبێت بۆمن گرنگ نییە. تۆخۆشەویستی منی.))

گوتی:((من پێشتر هاوسەرگیرم کردووەو دەبێت خەرجی منداڵەکانی خۆم بدەم. ئەمەیان لەبەرامبەر تۆ ڕەوا نییە.))

سەرم دەهەژاند:((قبوولکردنی ئەم هەلومەرجە پەیوەندی بەئێمەوە نییە.))

ئایا ئەنوەر بەهێنانەوەی ئەم بیانوویانە دەیوویست من هانبدات کەلەبیری بکەم تاقی دەکردمەوە؟ نەمدەزانی، گەیشتین بەئەنجامێك کەئەنوەر لەجیاتی ئەوەی رومانتیك بێت هەلومەرجەکان بەراستی دەبینێت.

گوتی:((ئێستا هیچ بەرنامەیەکم بۆ ئایندەو کارکردن نییە. تۆ لەگەڵ ژیانی هەژارانە ڕانەهاتووی .))

بەڵام من تەمەنم پانزدە ساڵانبوو پشت راستبووم تەنیا دەتوانم بەخۆشەویستی ژیانی خۆم تێپەڕ بکەم گوتم:((ئێمە دەبین بەیەك ئەمەیان گرنگ نییە.))

دەبێت دایكو باوکی خۆم لەم بابەتە ئاگادار دەکردن‌و بەلێنی ئەوانم بۆ هاوسەرگیری وەردەگرت. بەڵام چۆن؟ ئەم ئەرکە لەلایەن حەسەن عەزەت‌و خزمانی من‌و نوێنەری ئەنوەر جێبەجێ دەکرا کە لەلایەن ئەنوەر منی لەدایك‌و باوکم خوازبێنی دەکرد. دوور نۆرینێکی بەهیوا نەبوو.

حەسەن عەزەت لەکۆبوونەوەی بڕیاردان لەسەر چۆنیەتی خوازبێنی من دەڵێت:((چۆن دەبێت ئەگەر درۆیێك بۆباوکت بکەین. دەلێن ئەنوەر کەسێکی دەوڵەمەندو خاوەن موڵك‌و ماڵ‌و منداڵ‌و باخەکانی میوەیەو دەرهاوردەیەکی زۆر لەموڵکی خۆی بەدەست دێنێت. ئەمانە قسەی من باوەڕ دەکەن. چۆنکە ئەوەی لەسەر ئەنوەر دەزانن لەرێگای رۆژنامەکان هەمووی بابەتی سیاسین هیچ شتێك لەسەر ژیانی تایبەتی ئەنوەر نازانن.))

بەڵام ئەنوەر قبووڵی نەکرد:((بەهیچ شێوەیەك نابێت، رێگای فێڵبازانە نابێت.))

لەم گێرۆدەبوونە، ئەگەر بۆجارێك بێت، من بەرچاو روونتربووم لەکەسانیتر. دەمزانی باوکم رێگا بەم هاوسەرگیرییە نادات لەگەڵ کەسێکی گیرفان بەتاڵ ژیانی هاوبەش دروست بکەم. درۆیەکی

بچووك ئەوەندە دەرفەتی بەباوکم دەدا کەئەنوەر بناسێتو وەك من ڕێزی بگرێتو خۆشەویستی بۆهەبێت، هەلومەرجی دژواری هاوسەرگیری ئێمە قبوولّ بکات. بەلاّم پێش باوکم دەبێت ئەنوەر رازی دەبوو. بەخۆشەویستی پێم گوت: ((تۆمن فریوناد‌ەیت لەبیرت بێت، منم کەدەبێت ببم بەهاوسەرت. پێش هاوسەرگیری هەمووشتێك بۆباوکم باس دەکەم، چونکە هیچ کاتێك درۆم لەگەلّ باوکم نەکردووە، بەلاّم لەهەلومەرجی ئێستا رازی نابێت تەنیا هیوای هاوسەرگیریمان هەبێت.)) ئەنوەر بێدەنگ دەبێت ئێمەش ئەم بێدەنگییە دەکەین بەبڕیاری رازیبوونی.

یەکەمین دیداری حەسەن لەگەلّ دایكو باوکم دوای گەڕانەوەمان لەقاهیرە، بەهەمان درۆی کەئەنوەر خاوەنی دەرهاوردەیەکی سەربەخۆیە، بەهەمان شێوە کەچاوەڕوان دەکرا توفانێك هەلّدەستا. دایکم پێداگری دەکرد کەمن مندالّمو ئەنوەر لەخێزانێکی زۆر خوارەوەی چینی ئێمەیە، تاکو ئێستا لەناوخێزانی ئێمەدا کەسێك هاوسەرگیری لەگەلّ پیاوێکی ژن تەلاّقدراو نەکردبوو، جگە لەم لایەنە روخساری ڕەش هەلّگەڕاوە، راستی کەنەدەکرا لەخۆمان بەدوور بگرین وێنەی زۆری ئەنوەر لەرۆژنامەکان بلاّو دەکرانەوە.

حەسەن هیچی دەست نەکەوت. نۆرەی خۆمبوو کەبۆبەختەوەری خۆم دەست بەپاڕانەوە بکەم. چونکە بەبێ ڕێگا پێدانی دایكو باوك نەمدەتوانی لەگەلّ ئەنوەرو هیچ کەسێکیتر هاوسەرگیری بکەم. وەك هەموو مندالّەکانی میسری، لەبەر ڕێزگرتنی دایكو باوكو بنەماکانی مەزهەبی پێویستیمان بەرازیبوونی دایكو باوك هەبوو. لەناو کتێبی پیرۆزدا هاتووە دوای جێبەجێکردنی فەرمانەکانی خودا دەبێت فەرمانی دایكو باوك جێبەجێ بکرێت. من هیچ کاتێك بیرم لەسەرپێچی بڕیاری دایكو باوکی خۆم نەدەکردەوە بەتایبەتی بابەتی هاوسەرگیری. لەهەموو هەلومەرجێك ڕەزامەندی دایكو باوك پێویستە.

بەلاّم دایکم لەسەر پێداگری خۆی مایەوە. بەشێوازی ئەنوەر گوتی:((پانزدە سالّ جیاوازی تەمەن زۆرە. دواتر پەشێمان دەبیتەوە.)) هیچ شتێك لەئەمەیان باشتر بۆ پەشیمان کردنەوەی من نەدەرۆیشتە ناوبیری. دواتر دەلّێت:((ئەم کابرایە پێشتر هاوسەری هەبووەو خاوەن مندالّە، ئەمەیان ژیانت وێران دەکات.))

پرسیم:((بۆچی دایە؟))

گوتی:((لەبەر ئەوەی دەبێت چاودێریان بکاتو ئەوکات ئێرەیی دەکەیت. تەواوی دەرهاوردەکانی خەرجی منداڵەکانی دەکات ئەمەیان ژیانت وێران دەکات.))

ناڕەزایەتی خۆم دەربڕی:((من خۆشەویستیم بۆ هەیە.)) بەلاّم هیچ سوودێکی نەبوو.

دایکم دەنگی بەرزکردەوەو گوتی:((بیردەکەیتەوە خۆشەویستی هەمووشتێکە؟ نا، کاتێك پێی هەزاران کێشە بێتە پێشەوە، خۆشەویستی زۆر بەخێرایی تەواو دەبێت.))

پێداگریم کرد:((من بەهاوکاری خۆشەویستی هەمووشتێك دروست دەکەم.)) بەلاّم دایکم وەك وینستۆن چرچیل پێداگری لەقسەی خۆی دەکرد.

پاڕامەوە کەتەنیا ئامادەبێت چاوی بەئەنوەر بکەوێت بەلاّم قبووڵ نەکراو گوتی: ((نا.))

باوکم لەدایکم دڵۆڤانتر، بەلاّم نەك لەرزانتر. لەسەردەمی قوتابی لەزانکۆی ئەسیوت بەتاوانی بەشداریکردن دژی بریتانیا دەگیرێ، دایكو باوکی بۆماوەی سێ ڕۆژ لەشوێنی بێی هەواڵ دەبن، کاتێك دۆزیانەوە سەردەمی مانەوەی لەگرتووخانە کاریگەری زۆرخراب لەسەر دەکات. لەسیاسەت دوور دەکەوێتەوە. نەیدەویست من خۆم تێکەڵاوی‌و گیرۆدەی سیاسەت بکەم.

کاتێك بەخەمباری لەبەرامبەری راوەستابووم، گوتی:((پێشتر ئەنوەر گیراوەو لە ئۆردوگای کاری ناچاری کاریکردووە. هیچ گرنتییەك نییە ئەگەر لەناوسیاسەت بمێنێتەوە لەئایندە دیسان نەگیرێتەوە؟))

نەمدەتوانی بەرگری لەم لایەنەی ئەنوەر بکەم، ئەمەیان بەچاوی من لایەنێکی باشبوو. بەپلەی یەکەم سەرنج راکێشترین لایەنی تایبەتی ئەنوەر بەباوەڕی من وڵات پارێزیبوو. هیوایەتم هاوسەرێکی وڵات پەرستبوو بۆئامانجەکانی هاوبەشمان لەتەنیشت یەکتر بمێنینەوە. بەلاّم ئەمەیان هەمان لایەنبوو کەباوکم لێی دەترسا.

نەمدەتوانی خواردن بخۆم، خەوبەچاوەکانمدا نەدەهات. ئێستا لەماڵەکەی خۆمدابووم نەمدەتوانی ئەنوەر ببینم، ژوورێکی لەناوەندی شار بەکرێ وەرگرتبوو، تەنیا لەرێگای تەلەفۆن دەمتوانی پێوەندی بکەم. باوکم نیگەرانم بوو، من لەناوخێزانی خۆمدا یەکەم کەسبووم کەگۆرانیم دەگوتن‌و گاڵتەم دەکرد، بەلاّم ئێستا ڕەنگ گۆڕاوو بێدەنگ بووم.

جارێکیتر حەسەن سەردانی ماڵی ئێمەی کرد تاکو لەگەڵ باوکم لەم لایەنەوە گفتوگۆ بکەن. وەك دیار هەستم دەکرد باوکم لەبەرامبەر هەستەکانی راستەقینەی من‌و هەست کردن

بەهەلومەرج نەرمتربوو. خۆی دژی خواستەکانی ماڵەوەی راوەستابوو پێداگری لەخۆشەویستی خۆی دەکرد.

باوکم زۆر بەوریایی گوتی:((ئەگەر بەشێوەیەکی باش چاودێری کچەکەم بکات من رازی دەبم. نامەوێت کچم لەژیانیدا لەگەل کەسێك بژیت بەمافو دەرهاوردەیەکی کەم لەئازار دابێت. بەم شێوازە رانەهاتووە.))

حەسەن زۆر بەپێداگری گوتی:((بەپێچەوانە، ئەنوەر کەسێکی دەوڵەمەندە.)) بۆ جاری دووەم باسی لەموڵكو ماڵو باخەکانی ئەنوەر بۆ باوکم کرد.

کاتێك لەتەنیشتیان دانیشتبووم‌و گوێم لەقسەکانیان دەگرت. لەدەروونەوە هەستم بە لەیەکتر هەڵوەشانەوە دەکرد. چونکە باوکی عەزیزی خۆم کەسی ژیان فریودەدا. ئایا نابێت هەمان کات حەقیقەتم بۆباسکردبا؟ بەلام دەنگی درونم دەیگوت: جیهان، رێگا بەحەقیقەت بدە چاوەڕێی بکات. تۆ تەنیا لەم رێگایەوە دەتوانی هاوسەرگیری لەگەلّ ئەنوەر بکەیت. شەڕی دەرونم تاکو ئەوکاتەی کەحەسەن لەماڵی ئێمە رۆیشتە دەرەوە بەردەوامی هەبوو، دواتر دەستم بەگریانکردو لەکاتی فرمێسك هاتنەخوارەوە گوتم: ((باوکە هیچ یەك لەقسەکانی حەسەن راست نین، ئەنوەر هیچ شتێکی نییە، بەلام تەنیا بۆرازیکردنی تۆ باس لەدەوڵەمەندی ئەنوەرکرا.))

باوکم سەرسوڕماو نەبوو، دەیزانی حەسەن لەوپیاوانەیە هەشتا لەسەد قسەکانی راست نین‌و ئەمەیانی دەزانی‌و دەبوو بەهۆکارێك کەهەلومەرجم خراپتر ببێت.

دەستم بەگریانکردو گوتم:((باوکە من خۆشەویستی زۆرم بۆ ئەنوەر هەیە دەوڵەمەندی بۆمن گرنگ نییە. من خزمەتکارم ناوێت، خۆم چێشتەکان ئامادە دەکەم، خۆم کاری پاكو خاوێنی دەکەم، هەمووکارێك دەکەم، مووچەی چەندبێت گرنگ نییە دەپارێمەوە پێویستیم بەرازیبوونی ئێوەیە.))

لەکۆتایدا گوتی:((جین، ئەگەر بەراستی ئەمەتان دەوێت، زۆرباشە، من رازی دەبم.)) کەوتمە سەرلەنۆێ بۆسوپاسکردن دەستم ماچکرد. باوەڕم نەدەکرد بەرازیبوونی، بەلام بۆسەرکەوتن رێگری دایکم وەك خۆیبوو. لەبەر باوکم پارامەوە کەبۆدایکم باس نەکات کەئەنوەر هیچ لایەنێکی دارایی نییە، ئەگەر بزانێت بەهیچ شێوەیەك رێگا بەم هاوسەرگیرییە نادەت.

سەری خۆی بەنیشانەی رازیبوون دەجولاند، دەستی خۆی بەسەرمدا هێناو گوتی: ((مافی خۆتە جیهان ئەم نهێنییە لەنێوانمان دەمێنێتەوە. ئەگەر ئەمەیان نەکەین دەلێت"بۆچی ئەم

پیاوەت قبوولْکردووە؟ بۆ؟")) پرسیارمکرد هاوکاریم دەکەیت بۆ ئەوەی دایکم قبوولْ بکات؟)) بەپێکەنین گوتی:((جیهان هەولْی خۆم دەدەم بەلاْم ئافرەتانی بریتانی خاوەن قسەی خۆیانن.))

دوو هەفتەی تەواو ئەوەی لەتوانمدابوو بۆ رازیکردنی دایکم، گۆڕانی بیروباوەڕی باوکم هیچ کاریگەری لەدایکم نەکردبوو.

بەلێنم بەدایکمدا:((دایەگیان رێگام بدە بۆماوەی سێ مانگ لەگەلْ یەکتردا وەك دەزگیران بمێنینەوە ئەگەر بەڕادەی ئێستا خۆشەویستیم بۆ نەبوو نیشانەی ئەوەیە کەهەلْبژاردم هەلْەبوو تۆراست دەکەیت ئەوکات ئەم دەزگیرانبوونە هەلْوەشێنەوە.))

بەلاْم قبوولْی نەکرد. شەو رۆژ بێزارم دەکرد، رۆژێکیان لەبەرامبەری کەوتمە سەر ئەژنۆ دەستو پێی دایکم ماچکرد. بەگریان دایکم گرتبوو گوتم:((دایە لەبەرت دەپاڕێمەوە. تەنیا جارێکیان ببینە، ئەوکات ئەگەر بەباوەڕت باش نەبوو، بڕیاری خۆت بدە.))

بەهیوای ئەوەی کەهەستم دەکرد نەرم دەبێت زیاتر پاڕامەوە:((دایەگیان خۆتان دەزانن من لەکچەکانی سووك نیم کەبەردەوام سەرقالْی خەیالْەکانی خۆشەویستین.)) بێگومانبووم.((من بەراستی خۆشەویستیم بۆ ئەم پیاوە هەیەو ناتوانم بەبێ ئەم پیاوە بژیم.))

هەولێدا من لەباوەشی خۆی دووركاتەوە:((زۆرباشە زۆرباشە ئەم کابرایە دەبینم.)) لەهەفتەی داهاتوو بڕیاری یەکتر بینین رێکخرا. بەراستی ترس گیانی داگیرکردبوو لەلایەك دایکی بریتانیم کەعاشقی ولاْتی خۆیبوو هیچ سنوورێك بۆئەم خۆشەویستییە بوونی نەبوو، لایەنی بەرامبەر ئەنوەر، ڕەقترینو نەتەوەخوازترین میسری دژی بریتانی. لەلایەك دایکم رێزی لەقارەمانی سوپای بریتانیا دەگرت لەشەڕی جیهانی دووەمو وینستۆن چرچیلی بەگەورەترین پیاو دەزانی لەهەموو دونیا. لایەنی بەرامبەر ئەنوەر لەهەمان شەڕ دژی بریتانیا چالاْکی دەکرد زیاتر لەهەموو کەسێك لەچرچیل بیزاربوو.

چرچیل بەپێی خواستی پەرلەمانی ئێمە لەسالْی ١٩٤١، فەرمانی بۆهێزەکانی میسری دەرکرد کەلەمرسی متروح لەبیابانی رۆژئاوا بۆدواوە بگەڕێنەوە، دواتر بەبڕیارێکی شەرمەزارانە بەچەکەکانیان سزادران. ئەنوەر ئەوکات ئەفسەری هەوالْگەری تۆپخانەی مرسی دەبێت، ئەم بڕیارە جێبەجێ ناکاتو نافەرمانی دەکات ئامادەنەبوو چەکی خۆی رادەست بکاتەوە. چرچیل جارێکیتر لەسالْی ١٩٤٢، بەشێوەیەکی دیارتر دەچێتە ناوژیانی ئەنوەر، کاتێك سەرۆك وەزیری

بریتانیا بۆبردنە سەرەوەی تین‌و تاوی هێزەکانی لەشکری هەشتەمی بریتانیا، کەمێك پێشتر لەبەرامبەر هێزەکانی ئەڵمانی بەفەرماندەی مارشاڵ رۆمل تێکشکابوون، سەفەرێکی نهێنی بۆ ئەلعلەمین کرد. بڕیاری ئەوکاتی چرچیل بۆگۆڕینی فەرماندەیی‌و بەرزکردنەوەی پلەی مونتگمری بەفەرماندەی گشتی سوپای بریتانیا رەوتی شەڕی گۆڕی، بەڵام لەهەمان سەفەر، چرچیل رەوتی ژیانی ئەنوەر دەگۆڕێت. ئەنوەر لەبەر پەیوەندی هەبوونی بەجاسوسەکانی ئەڵمانی تاوانبار دەکرێت بەجاسوس، چرچیل بەلێنی بەجاسوسەکانی ئەڵمانیادا ئەگەر دان بەهەمووشتێك دابنێن گیانیان پارێزراو دەبێت. ئەم دانپێدانانە دەبێتە هۆکار ئەنوەر بۆماوەی دووساڵ لەگرتووخانە بمێنێتەوە.

ئێستا لەدیداری نیوان دایك‌و باوکم‌و ئەنوەر چ پێشهاتێك دێتە پێشەوە؟ کاتێك بیرم لەم لایەنانە دەکردەوە ترس گیانمی داگیر دەکرد. رۆژێك بڕیاربوو من‌و ئەنوەرو دایك‌و باوکم پێکەوە چایەك بیخوینەوە دەستم بەپاڕانەوەکرد کەئەمەیان دیداری کۆتایی نەبێت، بەنزیکبوونەوەی دیدارمان زیاتر دەستم بەدوعاو پاڕانەوە کرد. دەمزانی ئەگەر قسەکردنی نیوان باوکم‌و ئەنوەر درێژە بکێشێت زیاتر خۆشەویستی لەنێوانیان دروست دەبێت. بەڵام دایکم چی؟ زۆر پشتراست بووم کەلەگەڵ یەکتر شەڕ دەکەن‌و دایکم قبووڵی ناکات. دەمتوانی دەنگی ببیستم کەدەیگوت:((نەجین ئەم هاوسەرگیرییە لەبار نییە.))

ئایا دەکرا بۆجارێك ئەنوەر دەست لەبنەمای بیروباوەڕەکانی هەڵگرێت لەجیانی بیروباوەڕی، زیاتر باس لەهەندێك لایەن بکات کەدایکم ئامادەبێت گوێی لێی بگرێت؟

راوەستان لەبەرامبەر دەسەڵاتی بریتانیاو تاوانبارکردنیان لەبەرامبەر دادوەران جێگای ستایش کردنبوو، بەڵام ئەمجارەیان دایکم لەمەیدانبوو، چارەنووسی من لەئارا دابوو. چی دەکرد؟ دایکم چی دەکات؟

لەدانیشتنە لەنێوان ئەنوەرو دایکم دانیشتم، بوێری ئەوەم نەبوو تەماشای هەردووکیان بکەم، چاوم بڕیبوونە نەخشەی مافووری ژێر پێمان کەتاکو ئێستاش لەبیرمدا ماوە. دیداری دەستپێك، لەجیاتی گفتوگۆیەکی رێزگیراو زیاتر وەك کۆبوونەوەی ئەزموونی دیاربوو. من وشەیەکم باس نەکرد، تەنیا گوێگری بارانی پرسیارەکانی دایکم بووم لەئەنوەر:

((جەنابی سادات، ئێمە لەرۆژنامەکان زۆر لایەن لەسەر جەنابت دەخوێنینەوە. ئایا ئێستاش دژی داگیرکاری بریتانیان؟)) بۆچەندینجار دڵم دەوەستا.

وەلامی دەدایەوە:((بەلێ من دژی داگیرکاریم، وەك کەسێکی میسری نامەوێت هیچ ولاتێکیتر ڕێگا بۆئێمە دەست نیشان بکات، هەروەك ئێوە ئەمەتان بۆبریتانیا دەوێ.))

لەگەلّ خۆم بیردەکردەوە وەلامێکی باشبوو، دایکم تێگەیشتنی بۆئەم پرسیارە هەبوو.

دایکم جارێکیتر ئەنوەری خستەژێر پالەپەستۆ:((دەتەوێت هەموو بریتانییەکان لەمیسر بڕۆنەدەرەوە؟)) دیسان دلّم کاری نەدەکرد.

بەلام ئەنوەر زۆرجوان وەلامی دایەوە:((بێگومان نا. من دژی خەلّکی بریتانیانیم. هەرچییەك بێت هەموومان مرۆڤین، هەموومان خاوەن هیواو ئاواتی یەکسانین. من دژی حکومەتی بریتانیام، حکومەتێك کەولاتی منی داگیرکردووە.))

لەنێوان پرسیارەکانی دایکمو وەلامەکانی ئەنوەر دەموویست بەنهێنی تەماشایان بکەم لەرووخساریان هەندێك لایەنیتر بخوێنمەوە، بەلام هیچم دەست نەکەوت. رووم لەباوکم کرد بەلام دیسان هیچم نەدەخوێندەوە. هیچ قسەیەکی نەدەکرد، دەیزانی ئەم ئەزموونە پەیوەندی بەدایکی منو ئەنوەر هەیە خۆی بێلایەنە.

دواتر نۆرەی پرسیارێك دەهات کەزیاتر لەهەموویان مەترسیداربوو. دایکم پرسی: ((بیروباوەڕت لەسەر وینستۆن چرچیل چییە؟))

بیرم دەکردەوە کۆتایی کاری ئێمەیە. نەمدەزانی لەهۆشخۆم دەچم، یان لەلێدانی دلّم گیرۆدەی وەستانی دلّ دەبم. بەدوای نیگای ئەنوەر دەگەڕام تاکو بەتەماشاکردن ئاگاداری بکەمەوە برێك بەزەیی هەبێت.، بەلام زۆر روونو ئاشکرا تەماشای دایکی کردمو بەبێ لەرزین گوتی:((وینستۆن چرچیل کەسێکی دزە، میسر لەسالّی ١٩٢٣ مافی سەربەخۆیی وەرگرتووە، بەلام تاکو ئێستا سەرقالّی دزینی غرورو سەربەخۆیی وەلاتی ئێمەیە. سیاسەتی، خراپترینی سیاسەتەکانە، چونکە بۆسەربەرزی ولاتی خۆی لەسووککردنی ولاتی من بەدوایدا دەگەڕێت. لەوانەیە بۆبریتانیا رێبەرێکی گەورە بێت، بەلام بۆمن لەبەرچاو کەوتووترین دوژمن هەژمار دەکرێت، خاتوون، لەبەرامبەر هەموو رێزگرتن بۆئێوە، بۆوینستۆن چرچیلی ئێوە جگە لەبێزاری هیچ هەستێکیترم نییە.))

دایکم لەسەرەوەی فنجانی چای بریتانی بەبێدەنگی تەماشای دەکرد. لەرێزبەندی وشەکانی سادات گومانم دەکرد ئێستا کاتی خۆیەتی دەکەومە خوارەوە.

لەئەنجام باوکم بێدەنگی شکاندو گوتی:((جەنابی سادات، دەبێت دیسان سەردانمان بکەیت. دیدارێکی زۆرباشبوو.)) تاکو دەرگای دەرەوە لەگەڵیدا ڕۆیشت.

وەك کەم ئەندامانم لێهاتبوو، لەتەنیشت دایکم مامەوە. ئەوەی کەباسیکرد چارەنووسی ئێمەی دیاری دەکرد، چارەنووسێك چاوەڕێی ئێمەی دەکرد؟

لەئەنجامدا دایکم گوتی:((لەگەڵ هیچ یەکێك لەقسەکانی سادات نیم سەبارەت بەبریتانیاو وینستۆن چرچیل.)) دڵم رووخا.((بەڵام لەبەر ئەوەی راستیو راستگۆیی خێرایی رێزی لێدەگرم.)) بەردەوام دەبێت:((ئەیویست بۆبەخێرهێنانی من شتێك باس بکات، ئەمەیان جێگای رێزگرتنە.)) دڵم لەخۆشیان لەسینگمدا نەدەگونجاو پرسیم: ((ئێستا دەتوانین ببین بەدەزگیرانی یەکتر؟))

گوتی:((تاکو ئێستا پشتراست نیم ئێستاش بیردەکەمەوە تەمەنی تۆ بۆهاوسەرگیری لەبارو ئامادە نییە دەبێت جارێکیتر ئەم کابرایە ببینمو لەگەڵ باوکت پێکەوە دادەنیشینو ئەوکات بڕیاری خۆمان دەدەین.

لەهەفتەکانی دواتر بەردەوام دڵم بەرزیو نزمی دەکرد. پوورمو دایکم بەتتە چەندینجار پەیوەندی تەلەفۆنیان هەبوو، چونکە هاوسەرگیرم لەگەڵ کوڕی بەهیچ شوێنەك نەگەیشتبوو بەدژایەتی خۆی دایکمی زیاتر دژی ئەنوەر هەڵدەخرۆشاند. جین کچێکی جوانو تەمەن بچوكو ئەیندەی ئەنوەر نادیارە. بۆچی دایکم بەم خێرایە رێگای هاوسەرگیری بەمن دەدات لەگەڵ کەسێکی بێئایندە ژیانی هاوبەش دروست بکەم، لەکاتێکدا کوڕی ئەحمەد کەسێکی زۆرگونجاو لەبارە بۆمن؟ پوورم بەردەوام دایکم ئاگادار دەکرد:((دۆزەخی خۆیان باشترە لەبەهەشتی بێگانە، هەمووکاتێك هاوسەری خزم زۆرباشتر دەبێت لەکەسانیتر.))

دایکم رازیبوو پێشنیاریکرد:((جین دووساڵیتر راوەستە؟ ئەگەر عاشقی تۆ راستەقینە بێت وەك خۆی دەمێنێتەوە.)) دووساڵ؟ ئەمەیان تەمەنێکبوو.

کوڕی دراوسێمان کەیەکێك لەخوازبێنییەکانم بوو، کارەکانی زۆر خرابترکرد. بۆباوکم دەگێڕێتەوە:((ئەنوەر سادات هیچ ئایندەیەکی نییە. چۆن دەتوانێت لەناوگرتووخانەی سیاسی ژیانی جیهان هەڵسوڕێنێت؟))

نیشانەکانی دوودڵیو گومان لەباوکم سەریان هەڵدەدا. بێچارە دەبووم.

تەماشام دەکرد ئایندەی من لەبەرامبەر دژایەتی هەموو لایەنەکان لەگەل ئەنوەر لەناو دەچێت.
بەپاڕانەوە داوام لەدایکم کرد:((جارێکیتر ڕێگا بەئەنوەر بدات سەردانمان بکات.)) چونکە هەموو بۆچوونەکانی کەخەڵك باسیان دەکرد دروستبوون، بەلاَم ئەگەر دایكو باوکم بەتایبەتی دایکم کەسایەتی ئەنوەری بەدروستی دەناسی، لەوانەبوو بیرو باوەڕی بگۆڕێت. بەتەلەفۆن بەئەنوەرم راگەیاند بابەتی کتێبەکان لەگەڵ دایکم باس بکات. گوتم دایکم عاشقی کتێب خوێندنەوەیە.
بۆجاری دووەم لەکاتی چاخواردنەوە ئەنوەر سادات بەدایکمی گوت:((چارلز دیکنز لەنووسەرانی زۆر خۆشەویستی منە.
دایکم سەری سوڕمابوو بۆیەکەمجار دەستی بەزمانی ئینگلیزی کرد لەگەڵ ئەنوەر، پرسی:((ئێوە کتێبەکانی دیکنز دەخوێننەوە؟))
ئەنوەر وەلاَمی دایەوە:((بەڵێ)) بەزمانی ئینگلیزی دەستپێکرد سەبارەت بەکتێبی هیواکانی گەورەو ئەلیور تویست دیکنز چونکە ئەنوەر خۆشەویستی زۆری بۆئەم کتێبانە هەبوو، چونکە چیرۆکی ئەم کتێبە زیاتر باسی ژیانی هەتیوو فیداکاری قارەمانەکان دەکرد. بابەتی هەتیوەکان بۆموسڵمانان بابەتێکی سەرنج راکێش دەبێت هەرمنداڵێك ئەگەر یەکێك لەدایكو باوکی لەدەست بدات هەتیو هەژمار دەکرێت. خۆدی پێغەمبەر لەتەمەنی شەش ساڵی دەبێتە هەتیو، کتێبی پیرۆزمان ئامۆژگاریمان دەکات بەبەزەییو دلۆڤانی هەڵسوکەوت لەگەڵ هەتیوەکان بکەن.
بەهیوایەکی زۆرەوە گوێگری قسەکانیانبووم، چونکە دیکنز نووسەری سەرنج راکێشو خۆشەویستم بوو. لەسەردەمی خوێندنم لەقوتابخانەی ئامادەیی ئەلیور تویستم دەخوێندەوە لەسەر چیرۆکی دووشار تاقیکردنەوەیان پێکردم. کاتێك کەئەنوەرو دایکم باسی سیاسەتیان نەدەکرد، لەروخساریان دیاربوو بەدۆزینەوەی بابەتی هاوبەشو جێگای ویستیان هەردوو لایەن کەمتر دەرفەتیان بەکیتر دەداو لەگفتوگۆی نێوانی خۆیان رازیبوون. روخساری دایکم دەبینی لەهەلومەرجی قسەکردن بەزمانی دایکی لەسەر یەکێك لەخۆشەویسترینی نووسەرانی بریتانیا لەگەڵ گەنجێکی میسری خوێندەوار لەوانەیە شێوازی قسەکردنی تووڕێك توندو بەرزبێت بەلاَم بازنەی قسەکانی پڕو وردبوون، سەرسوڕماو دەبوو.
کاتێك کەئەنوەر رۆیشت، گوتی:((زۆرباشە، جین، زۆرباشە، ئێستا دەتوانم هەست بەهەستی تۆ بکەم لەبەرامبەر ئەم پیاوەدا. زۆربەهۆشو زیرەکە، خاوەن کەسایەتی خۆیەتی. باش چاودێری

تۆدەکات.)) دواتر باسی خالەکیتری کرد کەبۆژنێکی میسری ئەستەمە بیری لێبکاتەوە:((لەگەڵ ئەم پیاوە هیچ کاتێك بێزار نابیت.))

ئەوەندە دایکم لەباوەشگرت دەستەکانم ئازاریان هەبوو. بڕیاری جەژنی نیشانی ئێمە بۆهەفتەی داهاتوو رێکخرا. بەهەستێکی خۆش لەهەمان کات نیگەران. تاکو ئەوکات هیچ کاتێك خێزانی ئەنوەرم نەبینیبوو دەمزانی جیاوازیان لەگەڵ خێزانی مندا هەیە. گومانی تێدا نەبوو جیاوازی بوونی هەیە.

تەلەعەت هات. نەفیسەو سەکینەو زینو زەینەب هاتن. باوکی ئەنوەر، محەممەد، لەگەڵ سەیدە برین دایکی ئەنوەرو هاوسەری دووەمی ئامینە هاتن. برای ئەنوەر عیسمەت خاوەنی دوو هاوسەربوو لەگەڵ هاوسەری یەکەمی، زەینەب هاتن. خزمانی ئەنوەر بەدوای یەکتر بۆبەشداریکردن لەجەژنی نیشانی ئێمە لەماڵی ئێمە ئامادەبوون. لەژمارەی خزمانی ئەنوەر سەرم سوڕمابوو، بەلام جێگای ترس نیگەرانی نەبوو، کەسانی خۆمانەو ئارام، هەمان زاراوەی ناشاری میسریان هەبوو دواتر لەناو هەموو خێزانەکانی لادێی بەرچاو دەکەوتو گوێبیستی دەبووم. خوشكو برایانی ئەنوەر بەقسەکانی شیرینی دەستیان لەسەرم هەڵنەدەگرت:((ئەم برای ئێمە بەختەوەر ئەم کچەی سپی لەچ شوێنەك دۆزییەوە؟)) باوکی ئەنوەر پێی گوتم زۆر سەربەرزم کەتۆ دەبیتە یەکێك لەئەندامانی ماڵی ئێمە. دایکی ئەنوەر ئەوەندە خوشحاڵبوو نەیدەتوانی هیچ قسەیەك بکات، تەنیا جاربەجار داهاتو منی لەباوەش دەگرتو ماچی دەکردم. ئەوەندە خۆشەویستیان بۆمن نیشاندا دوای ماوەیەکی کورت هەستمکرد کەمنیان لەباوەشی گەرمی خۆیان وەرگرتووە. تەنیا هیواداربووم ناوی هەموویان یەك بەیەك لەیادمدا بمێننەوە.

دواتر ئەنوەر من دەباتە دیداری خزمانی خۆی، ئەوکات ئاگاداربووم بەبیرهێناوەی هەموو ئەم ناوانە کارێکی ئاسان نییە. تەواوی ئەندامانی خێزانی ئەنوەر سادات برازاو خوارزا، نەوەکان، براوخوشکەکان هەموویان شەوانە پێکەوە لەیەکتر کۆدەبوونەوەو نانی ئێوارەیان دەخوارد. کاتێك کەهەموویان لەیەکتر کۆدەبوونەوە واتە سێ جیل پێکەوە لەدەوری یەکتر دادەنیشتن بۆنانخواردن، بیرم دەکردەوە ئەمانە زیاتر بەقەبیلەیەك دەچن نەك خێزان. لەجۆراوجۆری خواردنەکانی کەخێزانی ئەنوەر ئامادەیان دەکردن، سەرم سوڕدەما، بۆمن، وەك دایکم لایەنی خواردن گرنگی زۆری نەبوو، هەمووکاتێك دەموویست پارەی کۆکراوەی خۆم لەجلوبەرگ خەرج بکەم نەك خواردن. بەڵام دایكو باوکی ئەنوەر لەجیلێکی تربوون. زیاتر گرنگیان بەخواردن دەدا

بەدەستکراوەی خواردنی جۆراوجۆریان ڕادەکێشا. کاتێك دەمگوت سوپاس ئیتر ناتوانم چیتر بیخۆم، دایکی ئەنوەر بەپێکەنین دەیگوت:((هیچت نەخواردووە جیهان.))

بەڵام ئەمەیان ئەنوەربوو شەوان تەنیا برێك شوڕباو گوشتی دەخوارد، خواردنی کەمتر لەهەموو کەسێکبوو. لەهەموو خێزانی خۆی ئامانجدارتربوو هەمووکاتێك کەخێزانی سەرقاڵی گفتوگۆو گاڵتەکردن دەبوون دەڕۆیشت کتێبێکی دەخوێندەوە.

ئەنوەر جیاوازی لەگەڵ تەواوی خێزانی خۆیی‌و خێزانی من هەبوو. ئەنوەر خاوەنی پەیامێکبوو. لەڕۆژی نیشانی ئێمە لەگەڵ زۆر لایەنی مەترسیداری ژیانی ئاشنابووم، چونکە لەوانەبوو ئەم پەیامەی دەروونی کاریگەری لەسەر ژیانی هاوبەشی ئێمەش بکات. ئەنوەر جلوبەرگی سەربازی خۆی پوشیبوون، بەڵام زۆرباش دەیزانی دوای دەرکردنی لەناوسوپا بەبڕیاری ئینگلیزەکان ئەمەیان پێچەوانەی یاسابوو. کوڕی دراوسێمان کەپێشتر خەیاڵی هاوسەرگیری لەگەڵ مندا هەبوو یەکێك لەئەفسەرانی سوپابوو، ئەنوەری لەکاتی هاتنی بۆماڵی ئێمە بەجلوبەرگی سەربازی بینیبوو لەڕووی ئیرەیی بردن سەردانی پۆلیس دەکات‌و ئەم هەواڵەی پێدەگەێنێت. بەڵام کچی خزمەتکاری ماڵی سەرەوە هەواڵی پێگەیاندم، بەڵام بەختەوەرانە پۆلیس بۆگرتنی نەهاتن بۆماڵی ئێمە.

ئەم ساتەی دەستپێکی مەترسیدار بیری باوکمی بۆئایندەی من نیگەران کردن. بانگی ئەنوەر دەکات‌و بۆی باسدەکات:((ئەنوەر من تۆم وەك کوڕی خۆم خۆشدەوێت‌و ڕێزت دەگرمن بەڵام تاکو بەڵێن نەدەیت خۆت گیرۆدەی سیاسەت ناکەیت، ڕێگا بەم هاوسەرگیرییە نادەم. ئەمەیان ژیانێکی مەترسیدارە، ڕێگا نادەم کچی من بچێتەناو ئەمجۆرە ژیانەوە، ئەمەیان دەگەڕێتەوە بۆخۆت.))

بۆئەنوەر پێشنیاری باوکم دژوارترین پێشنیاری سەردەمی هەژمار دەکرا. ئەگەر بەڵێنی بەباوکم دەدا، دەبێت چاوی لەهەموو چالاکی‌و فیداکارییەکانی کەتاکو ئەوکات ئەنجامی دابوون بپۆشێت. لەلایەکیتر، بەردەوامی ئەم ژیانەی مەترسیدار ڕێگای نەدەدا ئارامی من‌و خێزانی یەکەمی، کەگرنگی زۆری بۆهەبوو، بپارێزێت. چەندینجار بەناڵی باسیکرد:((بەڵێن دەدەم.)) بەهەمان نابەدڵی پێشنیاری حەسەن عەزەتی پەسەندکرد کەببێتە هاوبەشی لەکارەکانی دروستکردنی خانووبەرو کارەکانیتری هاوشێوە.

تامو خۆشیم لەژیان دەبرد. بەتەواوی بوونی خۆم چاوم دەبڕینە ئاینده. لە٢٩ مانگی پێنجی ١٩٤٩، دەبووم بەجیهان سادات. نەمدەزانی لەهەشت مانگی سەردەمی دەزگیرانیم توندوتیژترینو بەئاژاوەترین سەردەمانی مێژووی میسر دەبێت.

لەهەمان سەردەم کەشوهەوای فەرمانڕەوای میسر زۆر توندبوو. تێکشکان لەشەڕی فەلەستین ئێمەی زۆر سووك کردبوو پاڵەپەستۆی زیاتری خستبوو سەر ئابووری لاوزازی ئێمە. نەرخی خواردەمەنیو جلوبەرگو خانووبەرە رۆژ لەدوای رۆژ هەڵدەکشا سەرەوە، بێکاریو دەرهاوردەی تاکی دابەزاند. تەنیا چینی فەرمانڕەوا نەبێت. هەموو کەس هەستی بەقورسی ژیان دەکرد: فەرمانبەرانی حکومەت، کەسانێك کەزانکۆیان تەواوکردبوو بێکاربوون، سەربازانی پلە ناوەند، دابەشکردنی سەردەمی شەڕ زۆر لایەنیتری بنەڕەتی لەخۆگرتن وەك شەکرو ئاردو نەفت، زۆر لەخێزانەکانی گوندنشینی میسر پشتیان پێی دەبەست. بۆهەموو خێزانەکانو تاکەکان جۆرە کارتێك دابەشکرا بۆوەرگرتنی پێویستییەکان (کۆپۆن). بەلام دیسان پێویستی رۆژانە وەك پێویست لەبازار دەست نەدەکەوتن. پارچەی سپی کەزۆربەی خەڵك سوودی لێ وەردەگرت دەستکەوتنی ئاسان نەبوو.

بەلام حکومەت خۆی لەم کێشانە بەخاوەن نەدەزانی. زۆربەی نوێنەرانی پەرلەمان چینی دەوڵەمەندبوونو چەندینجار پرۆژەکانی زیادکردنی باج لەسەر دەوڵەمەندەکان ڕەتدەکرایەوە. بەباوەڕی ئەمانە هیچ نایەکسانی نەبوو کە ٦٥٪ سامانی میسر تەنیا لەژێردەستی ٥٪ خەڵکی میسربێت. خۆیان لە دەستەی ٥٪ بوون. بەشێوەیەکی تەواو بەباوەڕیان ئەمەیان هیچ کێشەو ناعەدالەتی تێدانەبوو کەدەستەیەکی بچوك لەکەسانی دەستبژێر، واتە دوو لەسەدی خەڵکی میسر، خاوەنی نیوەی موڵکی کشتوکاڵی ولاتی ئێمەبن. بۆچی دەبێت بەم شێوەیە بێت؟ زۆربەی بەرپرسانی بالای ولات خەڵکانی خاوەن موڵکبوون. رۆژانە دەوڵەمەند دەبوون. بەلام جوتیارانی کەلەسەر زەوییەکانی ئەمانە کاری رۆژانەیان دەکرد زیاتر هەژار دەبوون. خۆنیشاندای خەڵکی هەژارو بێکار بۆناڕەزایی دەربڕین لەبەرامبەر بێ عەدالەتی رۆژ لەدوای رۆژ زیاتردەبوو، بەلام وەلامی حکومەت تەنیا گرتنی خەڵکانی ناڕازیبوو، بەتوندترین شێوە. رۆژنامەکان لەهەمان سەردەم خاوەن ئازادییەکی رێژەیی بوون، بەبلاوکردنەوەی هەواڵەکان لەلاپەڕەی یەکەمی خۆیان سەرنجی چینایەتی زیاتر دەورووژاندو ئاگری ناکۆکییەکانی کەبوونیان هەبوو خۆشتر دەکرد.

لەهەموو شوێنێك هەست بەئاڵۆزییەكان دەكرا. دروستكردنی زەوی كشتوكاڵی زیاتر لەبیابان، بەدروستكردنی بەنداوی زیاتر لەسەر رووباری نیلو ئاوڕۆكانی زیاترو نوێ لەمیسر لەگەڵ زیادبوونی خەڵك یەكتریان نەدەگرتەوەو كێشەكان چارەسەر نەدەبوون.
ژمارەی دانیشتوانی میسر لەساڵی ١٩٣٠ نزیكەی شانزدە ملیون بەلام لەساڵی ١٩٤٨ گەیشتبوو بیستو دوو ملیون. زۆری خەڵك ژیانی لەقاهیرە زۆر دژوار كردبوو، بۆنموونە دەهەزار كەس لەناو كولانێكدا، پاسەكانو شەمەندەفەڕی نیوشار توانای گواستنەوەی ئەم هەموو خەڵكەیان نەبوو. پێشتر ئاماری تاوانەكان لەقاهیرە بەدەگمەن روویان دابوو بەلام بەردەوام لەزیادبوونی خۆی بەردەوامبوو. هەزاران جوتیار كەلەسەردەمی شەڕی جیهانی دووەم روویان لەقاهیرە كردبوو بێكاربوون. بەفەرمانی مەلیك فارۆق كۆچكردنی لادێی بۆشار قەدەخەكرابوو بەلام رۆژانە هەزاران كەس دەگەیشتنە ناو قاهیرەی پایتەخت.
بەزیادبوونی هیوابڕانی زیاتر، بزوتنەوەی ئیخوان موسلمین رۆژ لەدوای رۆژ دەسەلاتی زیاتردەبوو لەناو خەڵكدا. لەكۆتایی ساڵی ١٩٤٨، زیاتر لەدووسەد هەزار كەس لەمیسر چۆنە ریزی ئەم پێكهاتەیەو بوون بەموریدی پەروەردەییەكانی رێبەری گشتی خۆیان حەسەن بەنا. فیدایانی ئەم پێكهاتەیە بۆچارەنووسی برایانی موسڵمانی فەلەستینی خۆیان بەردەوام لەبیابانی سینا بەردەوامیان بەشەڕداو پێگەی خۆیان لەم شوێنانە سنووردار نەكرد. هەلومەرجێك لەشارەكانی میسر دروست دەبوو گەندەڵی حكومەتو داگیركاری پەستی بریتانیاو گلەیی خەڵك، برایانی موسڵمان شەڕی ئایینیو تایفی خۆیان هێنایە سەر شەقامەكان.
توندوتیژی ئاراستەی حكومەت، بریتانییەكان، زۆربەی خەڵكی بیانی كرا كەتاكو ئەوكات بەئاشتی پێكەوە دەژیان. كاتێك كەسەربازەكانمان لەشەڕێكی ناسەركەوتوو لەفەلەستین بەردەوامبوون، لەشوێنی كاری یەهوودیو بیانییەكانیتر لەقاهیرە، ماركێتەكانی جوانی وەك دیوید ئازەر، منو دایكمو خوشكم كەلوپەلی شوشەمان دەكڕی، ماركێتەكانی گەورەی وەك سیكورلو بنزیونو گاتی نینیو بەبۆمب دەیان تەقاندنەوە، هەموو دامەزراوەكانی نامیسری دەكرانە ئامانجی هێرشەكانی خۆیان. سینەمای مترۆگلدین مایر، نووسینگەی كاروباری كۆمپانیاكانی فەڕەنسیو بریتانی لەناوەندی شار. هەرچەند زۆربەی یەهوودییەكانی میسر لەسەردەمی شەڕی جیهانی دووەمو پێشڕەویی هێزەكانی ئەڵمانیا بەرەو ئەسكەندەرییە بەرەو ئەورووپا ڕایانكرد، ژمارەیەكی زۆركەمیان لەقاهیرە ژیانی خۆیان بەسەر دەبرد. لەهاوینی ساڵی

١٩٤٨، کاتێك من لەگەڵ ئەنوەر لەسوئیز بووم، بۆمبێك لە(هرات اليهود)، گەرەکی یەهوودییەکان تەقییەوەو زیاتر لەبیست کەسی ئەم گەڕەکە کوژران و ژمارەیەکی زیاتر برینداری لێکەوتەوە.

دواتر میسرییەکانی لایەنگری حکومەت و هاودەنگیان دەکرانە ئامانجی هێرشەکان. لەکانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٨، سێ مانگ دوای نیشانی دەزگیرانی من و ئەنوەر، سەرۆکی پۆلیسی قاهیرە، قوتابییەکی زانکۆ بۆمبێکی دەستی فڕەدەداتە سەر سەری ئۆتۆمبێلی و دەکوژرێ. سەرۆك وەزیر نەقراشی، بەگومان هەبوون لەئیخوان موسلمین، بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی ئەم بزوتنەوەی ئایینی دەرکردو دەستبەسەر موڵك و ماڵیاندا گیرا.

پۆلیس زۆر لایەنی مەترسیداری ئاشکرا کردن، تەقەمەنی چەك، چەکی ئۆتۆماتیکی. دەستەی براکان و گروپی جیهادییەکانی نهێنیان پێکهێنابوون، بەپێی گوتەی پۆلیس، یەکێك لەئامانجەکانیان رووخاندنی حکومەتبوو. قووڵترین لایەنەکان بەهێزبوونی گروپی براکانبوو، ئاشکرابوونی شوێنی نهێنی راهێنانی سەربازەکان لەسەرتاسەری میسر، رۆژانە خۆبەخشی زیاتری لەخۆدەگرتن.

ئەنوەر وەك من، لەئاشکرابوونی ئەم هەموو لایەنانە سەری سوڕمابوو. تەماشاکردنی وێنەی چەکەکانی دەست بەسەرداگیراو لەرۆژنامەکان و گۆڤارەکان کاریگەری سامناکی خۆیان هەبوو. هەرچەند ئەنوەر زۆرجار ستایشی حەسەن بەنای سەرۆکی ئیخوان موسلمینی دەکردو چەندینجار سەردانی کردبوو، بەباوەڕی پێکهێنانی جیهادی نهێنی وەڵامدەرەوەی کێشەکانی میسر نابێت و باوەڕی نەدەکرد حکومەت بەنایاسی کردنی ئەم بزوتنەوەیە دەتوانێت ئەم کێشانە چارەسەر بکات. لەسەردەمی ئاڵۆزییەکان بەردەوام بۆی باسدەکردم:((کەدەبێت کەسێك بۆکۆتایی هێنان بەم شێتاتییە بکات. توندوتیژی تەنیا توندوتیژی زیاتر دەکات، هەموو جوڵانەوەیەك بۆچاکسازی و هەژاری میسر دەبێت رێکخراوبێت، لەلایەن سوپا.))

من، وەك زۆر لەکەسانی هاوتەمەنی خۆم، سەبارەت بەئیخوان موسلمین هەستێکی دوو لایەنەم هەبوو. خۆراگری، پاراستنی بنەماو پشت بەستن بەئاینمان ستایشم دەکردن. من لەگەڵیاندا هاوبیر بووم کەفارۆق و بریتانیا لەوڵاتی ئێمە بڕۆنە دەرەوە، بەڵام نەمدەویست شێوەی سەرکوتکردنی براکان شوێنی ئەمانە بگرێتەوە. سیاسەتی کوشتنی براکان و تەقاندنەوەی بۆمب لەنیوان خەڵکی بێتاوان دەبوو جێگای ناڕەزایەتی زۆرینەی میسرییەکان جەگە لەخۆیان

نەبێت. بەڵام سەردەمی کۆتایی ئازادیمان تاقی کردبوویەوە. کۆمەڵگەی فەرنگی ئێمە لەپێشکەوتنی خۆی بەردەوامبوو. ئۆپرای لائەسکالا لەناو تالاری ئۆپرای قاهیرە پێشکەش دەکرا، شانۆنامەی کۆمێدی فرانسز خەڵکانێکی زۆری بۆبینینی راکێشابوو. زۆر لەمیسرییەکان باوەڕیان دەکرد کە گروپی براکان زۆر لەڕادەی خۆیان کاروبارەکان توندوتیژو پێداگرن، هەمووشتێك ئەگەر لەبەرچاوی ئیسلام باش نەبێت تاوانباری دەکەن. ئەگەر ئەم گروپەی براکانی سەر بەبزوتنەوەی ئیخوان دەسەڵات بەدەسەتەوە بگرن، حکومەتی ئێمە لەجیاتی ئەوەی بەرەو دیموکراسیو ئازادی کەئومێدی زۆر لەخەڵکی میسربوو، بەرەو رژێمێکی پاوانخواز دەڕۆیشت.

بەم لێکدانەوەیە، کاتێك کەحکومەت بزوتنەوەی ئیخوان موسلمینی هەڵوەشاندەوە، نیگەرانبووم. لەدەڵەوە دەمزانی کەحکومەت توانای چارەسەری کێشەکانی نییە کەمیسری بێتاقەت کردبوو، دەمزانی کەبراکانی موسڵمان دەست لەتێکۆشانی خۆیان هەڵناگرن. ئەوەی زۆر لێی دەترسام بەکردەوە روویدا. گروپی براکانی سەر بەئیخوان موسلمین دەستیان بەچالاکی نهێنی کردو توندوتیژی بەردەوامی هەبوو.

لە٢٨ کانوونی دووەم، سێ هەفتە دوای بڕیار هەڵوەشانەوەی ئیخوان موسلمین، سەرۆك وەزیر نەقراشی لەرێگای رۆیشتنی بۆنووسینگەی خۆی بەدەستی یەکێك لەبرایانی موسڵمان کە بەجلوبەرگی پۆلیس وەستابوو دەکوژرێت. دوومانگ دوای ئەم رووداوە، پۆلیسی نهێنی مەلیك فارۆق کەمین لەحەسەن بەنا سەرۆکی دامەزرێنەی ئیخوام موسلمین دادەنێتەوەو دەکوژێت. دەنگوباسی لەم شێوەیە بلاو دەکرایەوە کەپیاوانی مەلیك فارۆق بریندار دەکەنو دواتر بەهەمان شێوە لەسەر شەقام بەجێدێڵن تاکو بەڕژانی خوێنی گیانی بسپێرێت. سەرم سوڕمابوو. هەموویان سەریان سوڕمابوو. حەسەن بەنا کاریگەرترینو بەهێزترین کەسی میسربوو. لەبەر ویستی بۆنایینو بیروهزری بەهێزی کاریگەری زۆری لەخەڵك دەکرد، وتارەکانی چەند کاتژمێری، ناوبانگی زۆری لەتەواوی وڵات دەرکردبوو. ئێستا خۆی قوربانی تیرۆرەکانی زەنجیرەی بوو کەموریدانی دەسپێشخەر بوون. سەرۆك وەزیر نەقراشیو حەسەن بەنا کوژرابوون. بەڵام توندوتیژیی بەرفراوانی لەنیوان کەسانی مەزهەبی توندڕەویی میسرو حکومەت هیچ شتێك چارەسەر نەکرابوو. هەموو تۆڵەکردنەوەیتری بەدوای خۆیدا دەهێناو بەردەوامبوو.

لەناو دڵی ئیخوان موسلمین گروپەکانی نوێی سەربازی دەردەچوون. سی ساڵ دواتر، ئەم جۆرە پێکدادان لەنیوان توندڕەوانی ئیسلامیو حکومەت گەیشتە ئێمەو هاوسەری منیان کوشت.

لەرۆژی جەژنی هاوسەرگیریم، بۆتامو چێژ وەرگرتن لەساتەکانی ئارام لەم رۆژانەدا لەبەری بەیان لەخەو هەستامو ڕەنگی مژی سەر نیل ڕەنگی خۆی دەگۆڕیو تەماشام دەکرد ئایەتێکی کتێبی پیرۆزم دەخوێندەوە:((چەند پاکو خاوێنە خودای کە هەموو بوونەوەرەکانی بەجووت خەڵق کردوون لەمرۆڤو هەموو بوونەوەرەکانو ئەوانی ئێوە ئاگاداری نین.)) بەبیرم نەدەهاتەوە کەتاکو ئەم ڕادەیە هەستم بەبەختەوەری کردبێت. چەند بەختەوەر بووم کەهاوسەرگیریم لەگەڵ کەسێك کردبوو کەدەمزانی خۆشەویستیم بۆهەیە، لەکاتێکدا زۆر هاوپۆڵەکانم ئەم بەختەیان نەبوو. کاتێك هەواڵی هاوسەرگیری خۆم گەیاندە هاوپۆڵەکانمو وێنەی ئەنوەرم نیشاندان، هەموویان سەریان سوڕمابوو پرسیاریانکرد:((کەسێکی دەوڵەمەندە؟)) سەرم دەهەژاند بەمانای نا.((لەخێزانێکی بەناوبانگە؟)) دیسان هەمان وەڵامە پێشوو. ئەمجارە تورەیانبوو گوتیان:((بۆچی هاوسەرگیریت لەگەڵ ئەم پیاوەکرد؟ پیرو ناشیرین!))

دەستم بەرزکردەوە تاکو ئەنگوستیلەکانی زێری کەئەنوەر بۆنیشانی ئێمەی هێنابوون نیشانبدەم. یەکێك بەشێوەی پەپولەبوو هەردووکیان بەهاوکاری باوکم کڕدرابوون. وەك نەریت لەمیسر کەسێك کەخوازبێنی کچ دەکات ئەنگوستیلەو پارچەیەکیتری زێڕ بۆهاوسەری ئایندەی دەکڕێت بەڵام ئەنوەر سادات توانی هیچ یەك لەئەمانەی نەبوو.

پرسیارم لەباوکم کرد:((ئێستا چی بکەین؟)) دەمزانی کەئەنوەر سادات شەرم لەخۆی دەکاتەوە کەنەیتوانیوە ئەم نەریتەی میسر بپارێزێتو دەمزانی دایكو پووڕەکانم چاوەڕێی دەکەن بزانن چۆن لەناویاندا وەردەگیرێم.

باوکم گوتی:((ڕێگا بدە منو ئەنوەر پێکەوە بڕۆین بۆکڕینی.))ئەنوەر پێداگری دەکرد: ((ناکرێت چاوەڕێی بکەین تاکو کاتێك کەخۆم بتوانم دەستەبەریان بکەم؟)) ئەوکات بۆ (دارالحلال) کاری دەکرد، هەمان ناوەندی کەکتێبی بیرەوەرییەکانی زیندانی بۆچاپ کردبوو. بەڵام دیسان بەڕەوانەکردنی بەشێك لەم دەرهاوردەی بۆماڵی یەکەمی خۆی ڕەوانە دەکرد بەشێکی بچوك لەگیرفان دەمایەوە. بەهەرشێوەیەك بێت، کڕینی ئەم دیاریانە، بۆمن، خۆنیشاندانی خۆشەویستی ئەنوەربوو بۆخۆم، زۆر پێویست بوو. دایکم ڕێژەی هەژاری ئەنوەری نەدەزانی.

زۆر داوام لەئەنوەر کرد کەلەگەڵ باوکم بڕۆت شتێکی هەرزان بکڕن‌و دواتر پارەی باوکم بۆی بگەڕێنەوە.

پێکەوە رۆیشتن بۆزێرینگری بایوکی ئەم دوو ئەنگوستیلەیان هەڵبژاردن.

لەمیسر باوبوو کچ کەلوپەلی ناوماڵی لەگەڵ خۆی دەبرد بەلاّم کتێبی پیرۆز داوا دەکات زاوا شتێك پێشکەشی بووك بکات. لەسورەی نسادا هاتووە ئەوەی ژن داوا دەکات بەدڵی بۆی جێبەجێ بکەن. لەسەر مارەبڕین باوك لەگەڵ زاوا رێکدەکەوێت. ئەمەیان پێش خوێندنەوەو راگەیاندنیان بەهاوسەری یەکتر رێکدەخرێت. دوو لەسەر سێ پێشکەش دەکرێت‌و یەك لەسەر سێ دەمێنێتەوە تاکو کاتێك ئەگەر گەیشتە ئەنجامی تەلاّق ئەم یەك لەسەر سێیە پێشکەش دەکرێ. ئەمەش لەسەر بنەمای هەلومەرجی دارایی رێکدەخرێت. ئەوەی کەکەسێکی بێپارە دەتوانێت بیدات دەکاتە بیست‌و پێنج لیرە هەمووی گرێدراوە بەماڵی زاوا زۆرجار دەگاتە هەزاران لیرە.

بەلاّم ئەنوەر توانای دانی هیچ یەك لەم داب‌و نەریتانەی هاوسەرگیری ئێمەی نەبوو. مارەبڕینی من لەسەر سەدوپەنجا لیرەی میسری بوو، ئەمەشی هیچ کاتێك نەدا. بەدرێژایی ژیانی هاوبەشمان زۆرجار بەگاڵتە بۆم باس دەکرد منت بەبەلاّش دەستکەوت من کچێکی نەزانبووم. باوکم لەسەر هەمان لایەنی دانی پارەی ئەنگوستیلەکان هیچ کاتێك، وشەیەکی بۆ دایکم باس نەکرد، بەپێچەوانە بەروویەکی کراوەو هەمووشتێکی بەجەژنی ماربڕینی ئێمە ئامادە کرد، پێشنیاری فرۆشتنی بەشێك لەموڵکی خۆی پێشکەش کردبوو تاکو رۆژی هاوسەرگیری ئێمە هیچ کێشەیەك نێتە پێشەوە خۆی هات‌و کەلوپەلەکانی کەمن‌و دایکم داوامانکردبوو بباتەوە بۆماڵەوە، هەموو پێداویستییەکان پێشتر نەخشەم بۆداڕێشتبوو جلوبەرگ گەلوپەلی نانخواردن‌و نووستن پێویستییەکانی رۆژ جگە لەمانە دەستەیەکی تەواوی گلاّسەکانی کریستاڵ.

دواتر دەستمانکرد بەدۆزینەوەی خانوویەك لەدەوروبەری دوورگەی رۆزە. لەگوندەکان دەبێت زاوا بووك بباتە ماڵی باوکی. بەلاّم لەقاهیرەو شارەکانیتری گەورە، هاوسەرانی گەنج بۆخۆیان خانوویەك دەستەبەر دەکردو ژیانێکی سەربەخۆیان هەبوو.

بەلاّم لەشوێنێك کەزۆر لەخزم‌و کەسانی دوور نەبێت. لەیەکێك لەشوقەکانی نوێ بەنێوانی چەند خولەکێك لەنزیك ماڵی باوك‌و دایکم دۆزیمانەوە. زۆرخوشحاڵبووم، شوێنێکی زۆرجوانبوو، دوو ژووری خەوتن، هۆڵێك‌و شوێنی نانخواردن‌و ژووری چێشت لێنانی هەبوو لەگەڵ سێ ئەیوان.

لەیەکێك لەئەیوانانە دەمتوانی هەردوو بەشی رووباری نیل لەتەنیشت دورگەی ئێمە ببینم. لەناو رووباری نیل بەردەوام رووداوێك بۆ تەماشاکردن هەبوو، رێزبەندی بەلەمەکانی خاوەن بزوێنەرو بەلەمەکانی کەبەهێزی باکاریان دەکرد لەرۆیشتنی خۆیان بۆهەموو لایەك بەردەوامبوون. کەشتییەکانی گەورەی هەڵمی کەبەردەوام کەلوپەلی خواردن‌و کەلوپەلی نیومالیان دەگواستەوەو بەشێری نیشەکەر دەگەرانەوە.

لەئەیوانیتر دەمتوانی دیمەنی بیابان سێ ئەهرامی (خئوپس)و (خفرون)و (مەنکورەع) ببینم. زۆرجار لەدەرکەوتنی خۆری بەرەبەیان کەئەهرامەکانی سوور دەکردن‌و لەخۆرئاوا تەماشای پشتی ئەوانمان دەکرد. لەهەمان سەردەم لەنێوان دوورگەی رۆزەو بیابان جگە لەباخەکانی دڵگراوی سەوز هیچ شتێك نەبوو. لەنێوان کۆتایی سەوزایی‌و بیابان هێلێکی بەرچاو هەبوو لەجۆری بینین هەستمان دەکرد بەچاقویەك لەیەکتر جیاکراونەتەوە. هەریەك لەئەمانە سەرسوڕهێنەری خۆی هەبوو. باخەکانی سەوز ژیانی خۆیان هەبوو، بیابانەکانی ئەهرام نهێنی خۆیان باسدەکرد.

زۆر لەمیسرییەکان خۆشەویستییان بۆبیابان نەبوو، لەشەکەتی بیابان دەترسان، بەلأم من هەمان هەستی بێکۆتایی بەرگریکردنی لەمرۆڤ دروست دەکرد خۆشەویستی تەواوم بۆهەبوو. زۆجار دەمتوانی رێزبەندی کاروانی وشترەکان ببینم کەلەسودانەوە بۆقاهیرە لەرێگای بیابان دەهاتن، بەردەوام هەندێك ئەسپ سواریان لەگەڵدا دەبوون. ئەنوەر کاتێکی زۆر لەم ئەیوانانە دادەنیشت، نەك تەنیا بۆخۆشی بردن لەدیمەنی بەرچاو، لەبەر سەردمانی کەلەگرتووخانە بەسەری دەبردو تاقەت براو دەبوو زۆرجار ترسی لەژوورەکان هەبوو. لەگەرمای توندی هاوین ئەنوەر بەردەوام لەدەرەوە دادەنیشت.

لەسەر هەستی باوکم سەبارەت بەئەنوەر دروست بیرم لەم لایەنە کردبوو. لەشەش مانگی سەردەمی دەزگیرانی ئێمە تەنیا مانەوەمان پێکەوە جوان نەبوو، ئەنوەر زۆربەی شەوان سەردانی مالی ئێمەی دەکردو مالی ئێمە نەخشەی ئەفسەریان بۆئێمە یاری دەکرد. باوکم‌و ئەنوەر زۆربەی کاتەکان دوای خواردنی ئێواران تاوڵەیان دەکردو وردە وردە یەکتریان دەناسی‌و زیاتر رێزیان لەیەکتر دەگرت. دواتر ئەنوەر ویستی تەواوی پارەی ئەنگوستیل‌و کەلوپەلی ناومالّ خەرج کرابوو بگەرێنێتەوە، بۆباوکم. ئامادە نەبوو لیرەیەك وەربگرێتەوە. بۆئەنوەر باسدەکات:((من کچی خۆم نافرۆشم، ئێستا بووم بەخاوەنی کورێك.))

ئەنوەر دەستکراوەی باوکمی هیچ کاتێك لەیاد نەکرد. دواتر کەباوکم خانەنشین کرا. ئەنوەر سەرۆکی پەرلەمانبوو، پێداگریکرد کەدایكو باوکم کەخانوویان شەقامێك لەئێمە لەشەقامی ئەهرام دووربوو بۆژووریکی زیادە لەناو خانووی ئێمە کەلوپەلی خۆیان بگوازنەوە. دوای قسەکردن لەگەڵ باوکم بۆ ئەنوەرم باسکرد:((هەست دەکات دەبێتە دەردەسەری بۆئێمە.))

بەلام ئەنوەر پێداگری دەکرد رێنوێنی دەکردم:((برۆ کەلوپەلەکانیان کۆبکەرەوەو بێنە ماڵی ئێمە. من زۆر قەرزداری چاکەکانی باوکی تۆم لەدەستپێکی ژیانی هاوبەشمان ئێستا دەمەوێت بەوپەری سەربەرزی قەرەبۆیان بکەمەوە، ئێستا رۆژانی خانەنشینی خۆی بەسەر دەبات نامەوێت بەتەنیا دانیشێت، دەمەوێت بەیانیان کەچاوەکانی دەکاتەوە نوەکانی خۆی لەسەر تەختی خەوتنی ببینێت، بەیانیان‌و نیوەڕۆو ئێواران پێکەوە دەخوێن.

کاتێك لەگەڵ باربەرەکان رۆیشتم بۆماڵیان فرمێسك لەچاوەکانی باوکم هاتنەخوارەوە، زۆر دەیویست لەگەڵ ئێمەو نەوەکانی دابێت، بەلام لەبەر پێگەی ئەنوەر سادات خۆی بەبچوك هەست پێدەکرد. دوای سالێك باوکم کۆچی دوایی کرد. بەلام دایکم چواردە ساڵی دواتر لەگەڵ ئێمە مایەوە. دواتر ئەنوەر دەبێتە سەرۆککۆمار، لەگەڵ ئێمە هات بۆشوێنی مانەوەمان لەجیزە. لەنەخۆشی کۆتایی ژیانی تاکو وەفاتی دروست پێش سەفەرم بۆ ئیسرائیل، خۆم چاودێریم دەکرد. لەشەش مانگی کۆتایی ژیانی وشەیەکی عەرەبی نەهێنایە سەرزاری تەنیا بەئینگلیزی قسەی دەکردن.

لەرۆژی یەکەمی هاوسەرگیرم دایکم لەخوارەوە بانگی کردم:((جین وەرە، بادەست پێی بکەین.)) چونکە بووکێکی ناڕازی نەبووم، بەهاتنی خاڵم، شامیە، بەخوشحاڵییەوە پێشوازیمان کرد. هاتبوو تاکو یەکەم رێورەسمی هاوسەرگیری دەست پێی بکات. لەمیسرو سەرتاسەری رۆژهەلاتی ناوەڕاست، چەندین سەدەیە ژنانی دەست‌و پێیەکانی خۆیان لەمووی زیادە پاك دەکەنەوە وەك ئەوەی لەرۆژئاوا هەیە. شامیە زۆر بەوریایی شەکری لەسەر ئاگردانێکی کزداناو بەئاوی لیمو دەیتاواندەوە بەشێوەی هەویری شیرینی بەخۆیەوە گرت‌و لەدەست‌و پێیەکانمی دەماڵی دواتر راوەستا تاکو رەق دەبوو هەڵی دەگرت. کاتێك جلوبەرگم دەبەردەکردن‌و چاوەڕێی ئەنوەر بووم کەبێت پێکەوە برۆین بۆ پۆشینی جلوبەرگی بووکێنی سەردانی بەرگدوور بکەین، هەست بەخاوێنی‌و بۆنی خۆش بکات.

خاتوونی بەرگدوور کاتێك منی لەناو جلوبەرگی بەرزو جوانو تۆڕی سەر بینی کە دیزاینم کردبوو گوتی:((زۆر منداڵانە دیتەبەرچاو، بۆچی برێك جوانکاری روخسارت نەکەین؟)) من تاکو هەمان رۆژ هیچ کاتێك جوانکاری روخسارم نەکردبوو بەترسو هەستەوە دانیشتم تاکو روخسارم جوانکاری بۆبکرێ.

کاتێك لەگەڵ ئەنوەر بۆوێنەگرتنی رۆژی بووکێنیم دەڕۆیشتم بۆ وێنەگر، نیگەرانبووم، نیگەرانی وێنەکان نەبووم، چونکە ئەنوەر جارێکیتر بەسەر بەرزانە جلوبەرگی سەربازی خۆی پۆشیبوون بەڵام یاسا رێگای پێنەدەدا. تەنیا گاڵتەکانی وێنەگربوو بەردەوام ئەم بابەتەی لەبیرم دەبردەوە.

کاتێك وێنەی فەرمی هاوسەرگیری خۆمان دەگرتو وەك پێویست رادەوەستاین، پیاوی وێنەگر رووی لەئەنوەر کردو گوتی:((چەند زاوایەکی بەختەوەری، یەکێك لەجوانترین بووکەکانە کەتاکو ئێستا بینیم بێت.)) من دەمزانی ئەم کابرایە ئەم قسەیە بۆهەموو بووكو زاواکان دووبارە دەکاتەوە، بەڵام زۆر سروشتیبوو لەناو دڵم جێگای خۆیان دەگرت.

گاڵتەم لەگەڵ ئەنوەر دەکرد زۆر بەباوەڕەوە راوەستابوو:((پیاوی بەختەوەر، بیستت کەدەیگوت یەکێك لەجوانترین بووکەکانم کەتاکو ئێستا بینیبێت؟))

ئەنوەر بێدەنگبوو دەیوویست گاڵتەکانم بەهەند وەرنەگرێت. ساڵانی دواتر، کاتێك بەشداری فەرمی ریوڕەسمو نانخواردنەکانمان دەکرد رادەوەستاینو خەڵك رێزی دەگرت تاکو لەنزیکەوە سڵاومان لێ بکەن ئەم قسەیانم دووبارە دەکردنەوە. کاتێك میوانەکان یەك لەدوای یەك دەهاتن بۆئەوەی ئەوەندە فەرمیو وشك نێتە بەرچاو دەیگوت:((بۆچی نوکتەیەك ناگێڕیتەوە.)) زۆرجار لەقسەکانی کەبەردەوام لەم شوێنانەم بەنەرمیو نزمی بۆدەکردن تووڕە دەبوو، بەنەرمی دەیگوت:((بێدەنگ، هەموویان دەتوانن بێدەنگبن تەنیا تۆناتوانی.))

بەڵام لەرۆژی بووکێنی نەمدەتوانی بێدەنگی خۆم بپارێزم. رۆژێك، جگە لەرۆژی منداڵبوون گرنگترین رۆژی ژیانی هەموو کچەکانی میسر هەژمار دەکرا. میوانانی ئامادە تەنیا خزمانی نزیکبوون هاتبوون بۆماڵی ئێمە تاکو دواتر پێکەوە برۆین بۆشوێنی ئاهەنگ کەلەناو باخی نوێی پووره زوزو لەنزیك ئەهرام بەرێوەدەچوو. خوشحاڵو پشت ئەستوور کەتوڕی سەر روخسارم سافو جلوبەرگەکانی سپی هیچ چروکێکیان نەبوو لەگەڵ چەپکە گوڵێك کەلەسێ رەنگی گوڵ پێکهاتبوو زۆر توند لەدەستم گرتبوو، لەسەر کورسییەك لەتەنیشت ئەندامانی خێزانم دانیشتم.

لەم ڕۆژەی تایبەت بووك نەیدەتوانی لەگەڵ زاوا لەبەرامبەر شێخ دابنیشێت تاكو مارەبڕین دەست پێی بكات چونكە تاكو ئەوكات تەمەنم نەگەیشتبوو تەمەنی یاسایی، باوكم بەنوێنەرایەتی من لەكاتی خوێندنەوەی مارەبڕین دەستی خۆی لەسەردەستی ئەنوەر دادەنا.

دیسان جێگای سوپاسبوو كەمن لەگەڵ ئەمانە پێكەوە لەژوورێك دابووین. لەزۆر لەمارەبڕینەكانی میسر، كاتێك كچێك لەژێر تەمەنی بیستساڵی دابێتو بەپێی یاسا ناتوانێت واژۆ لەسەر مارەبڕین بكات لەگەڵ ئافرەتانیتری لەژوورێكیتر دەمێنێتەوەو پیاوانی خێزان واژۆ لەسەر مارەبڕین دەكەن، كچ ناتوانێت ساتەكانی مارەبڕینی خۆی بزانێت، دواتر كەسێك یان خزمەتكارێك شەربەت بۆپیاوەكان دەگێڕێت، هلهلەیەك دەكاتو دواتر بووك ژنو كچانی ئامادە ئەم هلهلەیە دووبارە دەكەنەوە ئەمەیان ئەم واتایە دەگەیێنێت كەئیتر بەفەرمی بوون بەهاوسەری یەكترو قۆناخی كچێنی خۆی تێپەڕكرد. لەماربڕینی خۆم بەرزترین دەنگی ئەم هلهلەیە لەدەمی من دەهاتە دەرەوە. كاتێك شێخ پرسیاری لەباوكم كرد ئایا كچەكە ڕەزامەندی نیشانداوە كەهاوسەرگیری لەگەڵ ئەنوەر بكات، زۆر بەزەحمەت توانیم ڕێگا لەخۆم بگرم. چونكە لەئایینی ئێمەدا ئەم مافە بەئافرەت دەدرێت كەئەگەر پێچەوانەی خواستی بێت قبووڵ نەكات. بەلاّم زیاتر لەناو فیلمەكانی سینەمای كچێك لەكاتی مارەبڕین بەبوێریی هاوسەرگیری قبووڵ ناكات. ئەم ساتانە هەلومەرجێكی گوشاراوی دروست دەكەن. كاتێك شێخ پرسیاری لەباوكم كرد ئایا كچی تۆ بەهاوسەرگیری ڕازی دەبێت. باوكم تەماشایەكی بەماناداری لەمن كرد. گوتی:((بەڵێ)) ئەوەندە توند سەری خۆم بەمانای ڕازیبوون هەژاند زۆر نەمابوو تۆڕی سەر سەرم بكەوێتەخوارەوە.

باوكم خەیاڵی شێخی ئارام كردو گوتی:((بەڵێ ڕێگا دەدات.)) ئەنوەرو باوكم لەبەرامبەر یەكتر دانیشتبوونو دەستی ڕاستی یەكتریان گرتبوو ئەنگوستی گەورەی خۆیان پێكەوەنابوو. شێخ دەسماڵێكی سپی لەسەر دەستی هەردووكیان داناو دەست پێكرا.

باوكم شێوەی سوننەتی مارەبڕینی لەبەرامبەر ئەنوەر خوێندەوە:((كچم، جیهان دەكەم بەهاوسەری تۆ لەسەر بنەمای ماڕەبڕینی سەدو چەنجا لیرە.)) ئەنوەر سێجار ئەمەی دووبارە كردەوە:((من نیكاحی قبووڵ دەكەمو چاودێری دەكەمو بەئەرك بۆخۆم دەزانم چاودێری بكەم. كەسانی ئامادە ئێوەش هەمووتان شاهیدبن لەسەر قسەكانم.))

شێخ دواتر بەخوێندنەوەی ئایەتێکی قورئان داوای بەختەوەری ئێمەی لەخودای گەورە دەکرد، لەکۆتایدا دەنگی هلهلەکان گەیشتە سەر شەقام.

دواتر ئاهەنگی گەورە دەستی پێکرد لەماڵی پوورم! لەکاتی گەیشتنی ئێمە، سێ ئەسپی سەماکار تەنیا بەدەنگی نێیەك جولآنەوە جوانەکانی خۆیان دەست پێدەکردو لەدەوری باخی پوورم دەسوڕانەوە، سەرو روخساریان بەگوڵی جۆراوجۆر داپۆشیبوو. دوای گەیشتنی هەموو میوانەکان منو ئەنوەر هەنگاومان نایە ناو میوانەکانو ئاهەنگی نەریتانەی هاوسەرگیری ئێمە دەستی پێکرد بەهونەری هونەرمەندان لەتەواوی شەودا: ((گۆرانی بێژەکان گۆرانیان دەگوت، سەماکارەکان سەمای خۆیان دەکرد، میوزیك ژەنەکان بەعودو نێیو دەفەکانی خۆیان بەردەوام ئاهەنگیان خۆشتر دەکرد، کەسێکی کۆمێدی بەجولآنەوەکانی سەرنج راکێشو قسە خۆشەکانی میوانەکانی سەرقاڵکردبوو.

جارێکیتر دەنگی هلهلەی هاوڕێیانو دراوسێیەکانو خەڵکانی ئاسایی لەسەر شەقام لەم ئاهەنگەی نەریتانە ئێمەیان بەرەو ژیانێکی نوێ هاوڕێیەتی دەکرد. دواتر دۆستانو خزمان بەنییەتی بەختەوەری سکەیان بەسەر سەری ئێمەدا دەباراندن. بۆئێستا ئەمەیان ئاهەنگێکی ئاسایی هەژمار دەکرێت! ئێستا ئەم جۆرە ئاهەنگە لەناو هوتێلەکانی گەورەی قاهیرە بەرێوەدەچن، شاباشەکان سەرتاسەری هوتێل دەگرێتەوە خزمو کەسان سکە لەسەر سەری بووكو زاوا دادەکەنو دەنگی هلهلەکان گوێچکەکان کڕ دەکەن. خەرجی ئەم جۆرە ئاهەنگێڕانە لەوانەیە بگاتە دە تاکو بیست هەزار لیرەی میسری. بەڵآم خوشحاڵیو شادی کەسانێك کەدارایی کەمتریان هەیە، بەهەمان ڕادەیە. ئاهەنگی ئێمە تاکو نزیکی بەرەبەیان درێژەی کێشا لەتەواوی ئەم ماوەیە منو ئەنوەر لەسەر کورسییەکی گەورە دانیشتبووین کەبەگوڵ رازاندنەوەی بۆکرابوو، خواردنەکانی جۆراوجۆر زەڵآتو شەربەتەکانی جۆراوجۆری تایبەتی ئاهەنگی بووکێنی. تەواوی شەو سەماکاران سەمای خۆیان کرد، مۆزیك ژەنەکان بەردەوامبوون، گۆڕانی بێژەکان گۆرانی عاشقانەی خۆیان پێشکەش کردینو کەسی کۆمێدێن ئەوەندە قسەی خۆشی بۆکردین. کۆمێدێن چاوێکی لێ نقواندمو گوتی:((تاکو بەیانی لێرەتان رادەگرین.))

بەپێکەنین گوتم:((هەرچی دەتەوێ بکە.)) دەمزانی بڕیار نەبوو لەهەمان شەو لەگەڵ ئەنوەر پێکەوە بڕۆین بۆماڵی خۆمان. چونکە خانووی ئێمە وەك پێویست ئامادە نەبوو من دەگەڕامەوە بۆماڵی باوکمو ئەنوەر بۆ ژووری خۆی کەلەناوەندی قاهیرە بەکرێی گرتبوو.

بەڵام شەوەکە بەخۆشیو خێرایی گەیشتە کۆتایی خۆی، میوانەکان لەکاتی ڕۆیشتن خواحافیزیان لەگەڵ ئێمە دەکردو هیوای بەختەوەریان بۆ دەخواستین:((خودا پشتو پەناتان بێت.)).

وەڵامی هەموویانم دەدایەوە:((بەخودای گەورەتان دەسپێرم، ئێمەتان سەربەرزکرد.))

لەئەنجامدا منو ئەنوەر بەتەنیا ماینەوە. پێی گوتم:((وەرە)) دەستی گرتمو سواری ئۆتۆمبێل بووین بەرەو ئەهرامەکان ڕۆیشتین مەودای زۆر نەبوو.

دوای شادی جەژن، بێدەنگی بیابان بەرەوە ئەهرامی خنۆپس ڕۆیشتین تەماشای قوچکی سەرەوەمان دەکر کەنزیکەی سەدو پەنجا مەتر بەرزبوو. نزیکەی پێنج هەزار ساڵ دەبوو کەئەهرامی گەورە لەم شوێنە جێگای خۆی گرتبوو. پارچە بەردەکانی ئەوەندە بەرێکوپێکی لەسەر یەکتر دانرابوون هەستت دەکرد موویەك بەنێوانیاندا ناڕۆت. ئەهرامو پیکەری (ابوالهول) نێوانیان زۆر نەبوو چەندینجار ئەم شوێنانەم بینیبوون، بەڵام ئەمجارەیان لەتەنیشت هاوسەرم بەئارامی وەستابوومو یەکەمین تیشکەکانی خۆرم دەبینین کەبەبیابان دەکەوتن هەمووشتێك بەشێوەیەکیتر دەهاتە بەرچاو.

ئایا ئێمەش دەمانتوانی وەك (ابوالهول) کەگەورەییو زیندوویی تەماشای میسری دەکرد بەختەوەربین؟ سەربازانی ناپلێۆن، بۆراهێنانی نیشانە شکێنی روخساری ئەم پیکەرەی گەورەی مێژوویان دەکردە ئامانج، ئایا ئێمەش دەمانتوانی بەهەمان هێز لەبەرامبەر هێرشی نەیاران گیانی خۆمان بپارێزین؟ ئایا خۆشەویستی ئێمە وەك ئەهرامی گەورە دەمێنێت؟ هیچ کاتێك ئەوەندە هیوادار نەبووم، هیواداری بۆهاوسەرم، بۆوڵاتم. بۆتەواوی سەرمایەو سەرسوڕهێنەری میسر لەرابردوو، بۆهیواکانی خۆشی پێشەڕۆژی.

خۆربەتەواوی دەهاتە سەرەوەو ئەنوەر منی بۆماڵی باوکم گەڕاندەوەو خۆی بەتەنیا گەڕایەوە بۆهەمان ژووری کەبەکرێی گرتبوو.

لەهەمان بەرەبەیان لەبیابان بیرمان کردەوە. گومانی تێدا نییە ئیرادەی خودا ئێمەی بۆهەمان شوێن راکێشابوو. لەهەمان دەستپێکی هاوسەرگیری، خۆشەویستیمان بۆیەکتر لەگەڵ چارەنووسی وڵاتمان تێکەڵاو بکات. دوای هەمان ساتەکانی بیابان، میسر ئەگەر بەشێك لەهەرکێشەیەك دەبوو کەبەدرێژایی ژیانی خۆمان لەگەڵیدا روبەروو دەبووینەوە، گرفتێك کەبەبێ چارەسەر دەهاتە بەرچاو، هەموو فیداکاریمان دەکرد. دەبێت خۆشەویستی بەبێ چاو

بەدوادابوون قوربانی یەکترو وڵاتی خۆمان دەکرد جگە لەم لایەنە نەماندەتوانی هیچ شتێکیتر بکەن.

ئەم ڕێگایە خودا بۆئێمەی دەست نیشانکرد. هەررووداوێك کەدەهاتە پێشەوە بەباش‌و خەراپ هەموویان خواستی خودابوون. ڕێگاو چارەنووس. نەماندەزانی چ پێشهاتێکی بۆئێمە داناوە، تەنیا دەمانزانی هەمان چارەنووسی ئێمەیە. لەهەمان دەسپێکی خۆرهەڵاتی بیابانی ئەهرام، من‌و هاوسەرم سەفەرێکمان دەستپێکرد کەزۆر بەوریایی بۆئێمە ڕێکخرابوو. پێشتر ڕێگامان جیاوازبوو، بەڵام ئامانج هەمووکاتێك یەکبوو: خۆشەویستی، گەورەیی، سەربەرزی‌و ئاشتی.



# بەشی چوارەم

## ئازادکردنی میسر

((ئەمڕۆ هاوسەرم ئەوەندە رەوشتی خرابە کەئامادە نییە خواردنی نیوەڕۆم بۆ ئامادە بکات، باوەڕ دەکەن؟ خواردنی نیوەڕۆی دروست نەکردووە؟ ئەگەر جارێکیتر ئەمەیان بکات، تەڵاقی دەدەم.))

((هەلومەرجی ماڵی ئێمە لەئەمەشیان خرابترە. هەمووکاتێك هەموویان پێکەوە شەڕو کێشە دەکەن. هاوسەرم بڕیاری هاوسەرگیری کوڕم لەگەڵ خوارزای خۆیدانابوو، بەڵام کوڕم دەیویست هاوسەرگیری لەگەڵ کچی دراوسێمان بکات. دایكو کوڕ لەبەیانییەوە تاکو داهاتنی شەو بەسەر یەکیتردا هەڵدەفڕن. نامەوێت بگەڕێمە ماڵەوە، چونکە ماڵم هیچ ئارامییەکی نییە.))

((باسی من بکە لەناو کاروبارەکانی خۆمدا گیرۆدەم. لەماڵی کوڕی مامی خۆم کچێکی جوانم بینی دەمەوێت هاوسەرگیری لەگەڵ هەمان کچ بکەم. بەڵام ئێستا خەرجی ژنی یەکەمی خۆم دەدەمو ژنی دووەم دووگیانە. ئەگەر ئێستا تەڵاقی بدەمو دواتر کوڕێکی هەبێت دەبێت لەهێنانی ژنی نوێ پەشیمان ببم.لەکاتی تێپەڕکردنی مانگی هەنگوینی خۆمان لەزقازیق، شوێنی کارکردنی ئەنوەر لەهەمان ناوچەبوو. ڕۆژانە لەئەیوانی ژوورکەمان لەهوتێل دادەنیشتینو گویمان لەقسەی خەڵکی ناو قاوەخانەی سەردانە پۆشراوی خوارەوەمان دەگرت. ئەمانەش وەك زۆربەی پیاوانی میسری بەدەنگی بەرزو هەستێکی گەرم قسەی خۆیان دەکرد، جگە لەخواردنەوەی قاوەی خەستو چای پوونگیو کێشانی نەرگیلەو یاری تەوڵە، لەپشت

سەری یەکتر غەیبەتیان دەکرد. من لەدەنگی بەرزی قسەکردنیان راهاتبووم، بەلام نەك قسەکردن سەبارەت هاوسەرەکانی خۆیان. هیچ کاتێك دەنگی بەشەرهاتنی دایكو باوکی خۆم نەبیستبوو، هیچ کاتێك گوێبیستی دەنگی بەرزی باوکم نەبووم کەقسە لەگەڵ دایکم بکات. پێکەوە باسی کێشەکانی سیاسیان نەدەکردن، ئەمەیان لایەنێکبوو کەبەردەوام میسرییەکان سەرقاڵی گفتوگۆبوون لەم لایەنانەوە. بەلام پیاوەکانی ئەم قاوەخانەیە رۆژانە لەدەوری یەکتر کۆدەبوونەوە بەئاشکرایی باسی کێشەکانی ناوخێزانی خۆیان دەکرد وەك دەردە دڵ.

بەراستی لەزقازیق زۆر لایەن فێربووین، شاروچکەی دڵتایی لەنێوان قاهیرەو ئەسکەندەرییە، حەسەن عەزەت ئەنوەری بۆچاودێریکردنی راکێشانی ئاوی خواردنەوە بۆپەنجاو دوو گوند رەوانەی ئەم شوێنەکردبوو بۆماوەی مانگێك لەم شوێنەماینەوە جگە لەشانزدە کاتژمێر کارکردنی ئەنوەر هیچ کارێکمان نەبوو، بۆیەکەمجار لەژیانمدا هەستم بەتەنیایی کرد، تەنیا کچێکی شانزدە ساڵانی میسرییبووم کەهیچ کەسێکی خۆی لەنزیك نەبوو. دوو سێ رۆژ جارێك لەرێکەی تەلەفۆن پەیوەندیم بەدایكو باوكو خوشکم دەکرد، بەلام هێڵی تەلەفۆن بۆقاهیرە کێشەی هەبوو ئەمەیان هۆکارێکبوو کەزیاتر هەست بەتەنیایی بکەم. دەرفەتی هاوڕێی دۆزینەوە لەزقازیق بۆمن نەدەهاتە پێشەوە، کچانی هاوتەمەنی من سەرقاڵی خوێندنبوون لەقوتابخانەکانو ئەوانەی کەخاوەن هاوسەربوون سەرقاڵی منداڵو کاروبارەکانی ماڵەوەی خۆیانبوون. زۆر لەوەی بیرم دەکردەوە شەرمین بووم کەبتوانم لەگەڵ کەسانی نەناس قسەی خۆکم بکەمو ببین بەهاوڕێ.

هەموو دونیای ئێمە هوتێلو ئەیوانی ژوورەکەمانبوو. تەكو تەنیا چوونە دەرەوە لەهوتێل جوان نەبوو، ئەگەر دەرۆیشتم هیچ شوێنێك جگە لەبازار بوونی نەبوو. تەنیا رۆیشتن بۆسینەما کارێکی باش نەبوو، قاوەخانە تەنیا شوێنی پیاوانی هەبوو. لەبەیانی تاکو ئێوارەو گەڕانەوەی ئەنوەر کەپێکەوە دەرۆیشتین بۆگەڕانو سوڕانەوە بەکالیسکەو نانخواردن لەچێشتخانەکان، لەگەڵ خۆمدا بەتەنیابووم. بەیانیان کتێبم دەخوێندنەوە. ئێواران تەماشای پیاوەکانی ناو قاوەخانەی خوارەوەم دەکرد. من لەئەیوانی ژووری خۆمان تەنیا بینەری شاراوەو وردی هەلومەرجیانبووم.

((ئەمڕۆ نیوەڕۆی لەکاتی خۆیدا ئامادە نەکردو تامو چێژی نەبوو. ئیتر بەسیەتی. دەبێت تەلاقی بدەم.))

((هەمان كچی كەلەماڵی كوڕی مامی خۆم بینیبوو داواكاری منی قبووڵكرد، بڕیارمداوە لەم كاتو ساتەدا ژنی خۆم تەڵاق نەدەم، لەوانەیە دووگیانی كوڕبێت. ئەمشەو بۆی باسدەكەم كەژنی نوێم كەلوپەلەكانی بۆماڵی ئێمە دەگوازێتەوە.))

شەوان، كاتێك هەمان شانۆی پیاوەكانی قاوەخانەی خوارەوەم بۆ ئەنوەر دەگێڕایەوە، دەیگوت:((جیهان، ئەمانە كەسانی خاوەن فەرهەنگو خوێندەوارنین كەتۆ لەقاهیرە دەناسی. ئەمانە قسەكردنیان زۆرتوندە بەڵام لەناویاندا كەسانی زۆرباش بوونیان هەیە. گوێی لەقسەی كەسانێك بگرە كەنێوانیان لەگەڵ هاوسەرو منداڵەكانیان باش بێت.)) ئامۆژگاری ئەنوەر بەلای منەوە پەسەندبوو. تەنیا رۆژێك پیاوێكم بینی كەئامادە نەبوو یاری تەوڵە بكاتو گوتی پارەم بۆ خەرجی ماڵەوە پێویستە.

لەدەرونەوە لەبەر هەڵسوكەوتی توندی ئەم پیاوانە لەبەرامبەر ژنەكانی خۆیان دەسووتام. بەباوەڕیی من كارێكی زۆرخراببوو كەبیریان دەكردەوە تەڵاقدانی ژنێك وەك ئاوخواردنەوە ئاسانە. ئەم پیاوانە بەجۆرێك باسی پەیوەندی نێوان خۆیانو ژنەكانیان دەكرد كەگوایە سەیرانگەی رابواردنی رۆژانی پشوودانی خۆیانە. وەك ئەوەبوو كەلەخۆیان پرسیار بكەن: ئایا ئەم شوێنە خۆشە، ئەگەر خۆش بێت ماوەیەك دەمێننەوە، ئەگەر ماندوو بووم دەڕۆم بۆشوێنێكیتر. دڵم بۆژنەكانیان دەسووتا كەئارامیان لەدەستی ئەم جۆرە پیاوانەی هەوەسی دابوو. بەهیچ شێوەیە یەكسانی تێدا نەبوو. گفتوگۆی ئەم پیاوانە لە زقازیق بۆتەواوی تەمەنم لەمێشكمدا مانەوە.

كاتێك گەڕامەوە بۆقاهیرە ئەنوەر گوتی:((جیهان لەناوكاری خۆمدا ماوم نازانم چی بكەم. ئێستا من دەزانم ناتوانم كاری بازرگانی بكەمو تەنیا بۆدەرهێنانی كۆكردنەوەی سەرمایە كاربكەم. ئەمانە هەموویان پێچەوانەی تەواوی بنەماكانن كەمن ژیانی خۆم لەسەر دروستكردووە، بەراستی بەداخەوەم.

ئەنوەر بیری دەكردەوە لەوانەیە من لەم جۆرە بیركردنەوەیەیی توورەبم، بەڵام بەپێچەوانە، لەبیستی گەشامەوە. لەكارو بەرنامەی رۆژانەی ئەنوەر كەچەندین كاتژمێری دەكێشا لەدووری ماڵ، بێزاربووم. لەبەرنامەی كاری خێزانمو زۆر لەخەڵكی میسر راهاتبووم، كاتژمێر دووی دوای نیوەڕۆ كۆتایی كاركردنبوو، كاركردنی زۆری لەزقازیق لەم لایەنە خراپتربوو. حەسەن هاوسەری منی بۆكارێكیترو چاودێریكردنی راكێشانی ئاو ڕەوانەكرد، ئەمجارەیان لەپارێزگای مینا،

لەمیسری سەرەوە ڕەوانە دەكرد كەهەمان چاودێری ڕاكێشانی ئاوبوو، دووكاتژمێرو نیو لەگەڵ قاهیرە نێوانی هەبوو. یەكەمجار حەسەن پێی گوت باجیهان لەقاهیرە بمێنێتەوە بەڵام دواتر بیروباوەڕی گۆڕا گوتی جیهان لەگەڵ خۆت بێنە.

لەئازاردابووین كاتێك دەمان بینی وەك بووكە شوشە یاری بەئێمە دەكات، هەستی دەكرد تەنیا خۆی دەتوانێ بۆهەرشوێنێك بێنێتو بباتو ژیانمان هەڵسوڕێنێت. ئێستا دەمانزانی بۆچی ئەوەند دەیویست هاوسەرگیری ئێمە سەربگرێت.كاتێك ئەنوەر كاری بۆكۆمپانیای حەسەن دەكرد سوودی دەڕۆیشتە سەرەوە. هەرچەند كاروباری زۆرباش بەڕێوەدەچوو بەڵام ئامادە نەبوو قەرزی ئەنوەر بداتەوە، لەوانەیە تەنیا بۆ ئەوەبێت كەپاڵەپەستۆ بخاتە سەر ئەنوەر كەبچێت بۆمیسری سەرەوە. حەسەن زۆر زیرەكو بەتوانابوو. بەباشی دەیزانی من لەڕووی وەفاداریم بەخزمانم سازش دەكەم. هاوسەری ئایدا، كچی پوورم بوو وەك خوشكی خۆم خۆشەویستی تەواوم بۆهەبوو. كێشە دروستكردن لەگەڵ حەسەن تەمەنێك دۆستایەتی ئێمە بەكۆتایی دەهات. چونكە ژن دەبێت پشتی هاوسەری بگرێتو پاڵپشتی بكات. لەبەر ئەم قەیدوبەندانەی خێزانی نەمدەتوانی بۆ وەرگرتنی قەرزی ئەنوەر لەگەل حەسەن كێشە دروست بكەم.

ئەنوەر گوتی:((من بەخراپە باسی ناكەم، ئایدا كچی پووری تۆیە، بەڵام ئەمجارەیان هەركاتێك ویستت سەردانی بكەیت بەتەنیابڕۆ.)) ئەنوەر دەستی لەقەرزەكانی خۆی هەڵگرتو دوای مانگێك هاوسەرگیری دەستی لەكاری كۆمپانیایی حەسەن هەڵگرت.

لەیەكەم ڕۆژی هاوسەرگیریمان دەرهاوردی خۆی رادەستی من دەكردو هەڵسوڕاندنی ماڵەوە لەئەستۆی مندابوو. ئەنوەر توانای هەژماركردنی ژمارەكانی نەبوو. چەندینجار كەدەڕۆیشتینە دەرەوە هیچ پارەی لەگەڵ خۆیدا هەڵنەدەگرت، كاتێك دەچووین بۆ سینەماو ساردەمەنی كەشەربەتێكی شیرین بخوینەوە لەكاتی پارەدان بەدزییەوە پارەم دەدا ئەنوەر كەبداتە خاوەنی.

بەڵام زۆری لەبێكاری ئەنوەر تێپەڕی نەكردبوو كەهەستمكرد تاكو دەستەبەركردنی كارێك بۆژیانمان، ڕۆیشتن بۆ سینەماو كافتریاكان كۆتایی هاتبوو.

زۆر دەستكراوە نەبووین. لەحەوت مانگی داهاتوو دوازدە لیرە بۆكرێی خانوومان دوولیرە بۆكارەباو ئاو دەلیرە بۆخێزانی یەكەمی ئەنوەر دەبێت زۆر بەوردی ئەوەی دەمایەوە خەرج

بکەین نەبۆ خواردنی چێشتخانەکانو نەبۆ کڕینی میوە، بۆیەکەمجار لەژیاندا تامی برسییەتیم دەچێشت، شەوان بۆکات بەسەربردن دەڕۆیشتین بۆکەناراوەکانی رووباری نیل. دەموویست خزمەتی خۆمان بکەم بەلآم تەنیا دەمانتوانی نانێکی بچوکی بەکونجی بە پیاستەرێك بکڕینو بیکەین بەدوو بەش.

هاوڕێیانم لەقوتابخانە دەیانخوێندو من لەماڵەوە بەتانیم شوشتنو ماڵ خاوێن کردنەوە. جلوبەرگی هاوسەرم بەدەست دەشوشتنو ئوتووم دەکردن. کاروبارەکان لەماڵەوە کەم نەبوون بای بەردەوام تۆزو خۆڵی لەبیابانەوە دەهێناو ماڵی ئێمەی پێس دەکرد. خاوێنکردنەوە تەواو نەدەبوو دووبارە وەك خۆی لێدەهاتەوە. کێشەکان زۆربوون ئێمە لەنهۆمی نۆیەم بووین ئاسانبەری تەواو نەکرابوو رۆژانە دەبێت ئەوەی کەبۆخواردن پێویستە هەڵم دەگرتو نۆ نهۆم دەڕۆیشتمە سەرەوە.

دەموویست دووبارە بگەڕێمەوە بۆقوتابخانەو لەگەڵ هاوڕێیانی خۆمدابم، بەلآم ئەوکات قوتابخانەکانی ئامادەیی ژنانی خاوەن هاوسەریان وەرنەدەگرتن لەجیاتی ئەمەیان ویستم لەماڵەوە بخوێنم، بەلآم هەلومەرجی خرابی ژیانمان زۆر ئاسان نەبوو. ئەنوەر نەیدەویست من هیچ هاوکارییەك لەماڵی باوکم وەربگرم، من وەرم نەدەگرت.

باوکم رۆژانە دوای گەڕانەوەی لەکار سەردانی دەکردم دەیگوت:((کچم تۆباشی؟ شتێکت پێویست نییە؟))

وەلآمم دەدایەوە:((هەمووشتێکمان هەیە.)) هەمووجارێك چاوم لەپاکەتەکانی میوەو گوشتبوو کەبەشێوەیەکی ئاسایی بۆئێمە لەگەڵ خۆی دەهێنان. هەردووکمان دەمانزانی کەنیگەرانی لەجێی خۆیدابوون بەلآم لەبەر رێزگرتن لەئەنوەر هیچی نەدەگوت. ئەگەر بڕیاربێت ئەم خۆشەویستییە پێویستی بەفیداکاریو دژواری هەیە باهەبێت.

بەیانیان بۆئەنوەرم باسدەکرد:((تۆخواردن بخۆ دواتر من دەخۆم.)) قاپی پاقلەو هێلکەم لەپێشی دادەناو زۆرجار دانە چایەکم بۆخۆم تێدەکرد. لەتەنیشتی دادەنیشتم تاکو دەڕۆیشت بۆناوەندی گشتی سوپا، هەوڵی خۆیدەدا کەبگەڕێتەوە بۆخزمەتی سەربازی، یان سەردانی نووسینگەی رۆژنامە بکات کەداوای کارکردنی کردبوو. هەرچەند بۆم باسدەکرد دوای رۆیشتنت من نانی بیانی دەخۆم بەلآم تاکو گەڕانەوەی هیچم نەدەخوارد تواناو ویستی خواردنم نەمابوو.

بۆهیچ کەسێك باسم نەدەکرد، هاوڕێیانم، خێزانم کەمن گیرۆدەی چ تەنگانەو رووخانو داماوی هاتووم. دەمزانی زۆر لەئافرەتان دڵی خۆیان دەکەنەوە هەموو نهێنییەکانی ژیانی خۆیان زۆر بەئاسانی بۆخەڵکانیتر باس دەکەن، بەڵام من هیچ کاتێك ئەمەیانم نەکرد. کێشەی خۆمانبوو دەبێت ئێمە بەتەنیایی چارەسەری بکەین. لەبەرامبەر خەڵکانیتر خۆم بەجۆرێك نیشاندەدا کەهیچ کێشەیەك نییە. بەراستی زۆر لایەنی باش هەبوو.

رۆژێکیان هاوڕێیانی قوتابخانەم سەردانیان کردم پرسیاریان لەمن کرد:

((هاوسەرت نامەکانت دەخوێنێتەوە؟))

وەڵامم دایەوە:((هیچ کاتێك)).

دەپرسن:((پرسیار لەئێوە دەکات ئەمڕۆ چ کارێکت کردووە؟))

پێکەنیم:((نا، من بۆی باسدەکەم.))

بەنیگەرانی تەماشای یەکتریان کرد:((کاتێك تووڕە دەبێت، دەست بۆلێدانت دەبات؟))

سەرم سوڕمابوو. بەتوندی گوتم:((هیچ کاتێك.))

ئەوکات نیگەرانی روخساریان زیاتر دەردەکەوت، سەرسوڕماوبوون:((تۆ چۆن دەزانی کەئاگاداری تۆیە؟))

بەهەرشێوەیەك بێت لەمانگی کانوونی دووەم دەستمان بەتەواوی خاڵیبوو. رۆژی دواتر کاتی دانی کرێی خانوومانو کەلوپەلەکانی کەبەقەرز لەدووکانمان هێنابوون. هەردووکمان زۆرنیگەڕان بووین. هەرچەند ئەنوەر داوای کردبوو بگەرێتەوە بۆناو سوپا، بەڵام زۆر بەدووری دەزانی وەربگیرێتەوە. رابردووی ئەنوەر لەناو سوپا وەك کەسێکی ولآت پارێز هیچ کێشەیەکی نەبوو، بەڵام ئینگلیزەکان بەچاوێکی خراب تەماشایان دەکرد. دەبێت چی بکەین؟ پرسیارێکبوو کەئێوارەی هەمان رۆژ لەگەڕانو سوڕانەوەی ئاسایی رۆژانە لەسەر پردی عەباس کەلەنێوان جیزەو روزە بەسەر رووباری نیل کێشرابوو، بەبێدەنگیماینەوە.

لەکۆتایی پردەکە کەسێك فاڵی دەگرتەوە لەناوگیرفان بەدوای پیاستەرەکانی کۆتایی دەگەڕام. ئەگەر ئەم فاڵگەرە هەواڵێکی خۆشی بۆباس دەکردین باش دەبوو ئەنوەر برێك دەگەشایەوە، ئەگەر هەواڵکە نەرێنی دەبوو، زۆرگرنگ نەبوو؟ هەلومەرج لەوەی کەهەبوو خەراپتر نەدەبوو.

فالگەر دەستی منی لەناو دەستی خۆیداناو زۆر بەوردی تەماشای کرد، دواتر چاوی دەبڕینە چاوەکانم:((تۆدەبیتەخاتوونی یەکەمی میسر.))

((خاتوونی یەکەمی میسر؟)) لەولاتی ئێمەدا شتێك بەم ناوە نەبوو. پرسیارمکرد: ((ئەمەیان مانای چییە؟))لەبنەڕەتەوە من کەسێك نەبووم کەباوەڕم بەفالگەری هەبێت. بەپێچەوانەی زۆر لەژنانی میسری، لەوانە خوشکمو پوورەکانم، باوەڕی زۆریان بەفالگرتنەوە هەبوو زۆرجار سەردانی فالگەرەکانیان دەکرد تاکو ئایندەی خۆیان لەناوفنجانی قاوەیەکدا ببینن. من کەسێکبووم باوەڕم بەکاروکردار هەبوو. ئەگەر ئەمانەی کەفالگەری دەکەن ئاگاداری دونیای نادیار دەبوون بۆچی خۆیان نەدەبوون بەبەڕێوەبەری دونیا؟ جگە لەخودا هیچ کەسێك ئاگاداری دونیای نادیار نییەو ناتوانێت پێش بینی بکات.

فالگەر دەیگوت:((تۆدەبێت بە شاژنی میسر.))

زۆر پێکەنیم شاژنی میسر؟ تەنیا شتێك کەدەمویست کرێی خانوو بوو. بەلام فالگەر قسەی خۆی تەواو نەکردبوو.

گوتی:((ئێوە دەبن بەخاوەنی چوار منداڵ، بەلام تەنیا دانەیەکیان کوڕ دەبێت. بەدەوری دونیا دەسوڕێنەوە.))

ئیتر گوێم لەقسەکانیتری نەگرت، ئەوکات بەخت تاکو ڕادەیەك بۆمن وەك پەرچۆبوو. دوای چەندین ڕۆژ ئەنوەر پێکەنینی دەهات.

ڕێگای نەدا فالگەر دەستی بخوێنێتەوە. بەدڵسۆزی گوتی:((دەستی هاوسەری منت خوێندەوە چارەنووسی هەردووکمانبوو.))

بەیانی ڕۆژی دواتر. یوسف ڕەشاد هاوڕێی دێرینی ئەنوەرو هەمان کات پزێشکی کۆشکی مەلیك بوو پەیوەندی تەلەفۆنی کرد. باوەڕمان نەدەکرد بەخت بەلای ئێمەدا دەگەڕایەوە یوسف هەولێدابوو کەئەنوەر بگەڕێتەوە بۆناو سوپا.

سیحربوو؟ یان خواستی خودابوو؟ ژیانمان ئێمەی بەرەو شوێنەك ڕێنوێنی دەکرد کەباوەڕەو دیدگای ئێمەی تەواو دەکرد. ئەگەر لەبەر سۆزو خۆشەویستی سادەی ئەنوەر نەدەبوو، هەشت ساڵ پێش لەبیابان، کەبۆ یوسف ڕەشادی کردبوو هیچ کاتێك نەدەگەڕایەوە ناو سوپا. ئەنوەر لەکاتی خزمەتکردن لەسوپا لەیەکێك لەناوەندەکانی سەربازی، لەنێوان ئەسکەندەرییەو سنووری لیبیا. دۆستایەتی لەگەڵ پزیشك پەیدا دەکات. یوسف ڕەشاد نیگەڕانی سەلامەتی کوڕی بچوکی دەبێت کە نەخۆشی هەناسە سواربوونی هەبوو، دەیویست پەیوەندی لەگەڵ خێزانی هەبێت. ئەوکات ئەفسەری هەوالگەری دەبێت هەموو تەلەفۆنەکان لەژێر خێمەی ئەنوەر

دەبن، ئەنوەر شوێنی حەوانەی خۆی دەدا ئەم پزیشکەو یوسف شەوانە دەیتوانی پەیوەندی بەماڵەوە بکات. یوسف رەشاد هیچ کاتێك ئەم چاکەی ئەنوەری لەیاد نەکرد.

زۆر درێژەی نەکێشا، دوای شەڕ، مەلیك فارۆق رۆژێکیان لەکاتی ئۆتۆمبێل سواری بەیەکێك لەئۆتۆمبێلەکانی پێشکەوتووی خۆی بەخێرایەکی زۆر لەجادەی (راس التین) لەبیابان لەگەڵ بارهەڵگرێکی بریتانی خۆیان پێکدا دەکێشن. شا دەگوازرێتەوە بۆنزیکترین نەخوشخانە، نەخوشخانەیەك کەپزیشکی ئیشکری هەمان یوسف رەشاد دەبێت، چاودێریکردنی یوسف لەفارۆق کاریگەری لێدەکات دەکاتە پزیشکی تایبەتی خۆیی‌و یەکێك لەنزیکانی. بەشێکیتر لەشوێنی خۆی دەمایەوە. یوسف رەشاد ئێستا کەسێکی زۆر کاریگەربوو لەکوشکی مەلیك فارۆق. خۆی بەقەرزداری ئەنوەر دەزانی کە دەبێت ئەم قەرزەی پێشکەش بەئەنوەر دەکردەوە.

یوسف رەشاد لەدەیەمی کانوونی دووەم ساڵی ١٩٥٠ بۆئەنوەر باسدەکات:((برۆ فەریق محەممەد حەیدر پاشا ببینە، چاوەڕێت دەکات.))

ئەنوەر بۆبینینی فەرماندەی گشتی هێزەکانی چەکدار رۆیشت. حەیدەر پاشا بڕیار بۆ سکرتێری خۆی دەردەکات:((ئەم پیاوە دەبێت هەرئێستا بگەڕێتەوە بۆناو سوپا.)) لەپانزدەی کانوونی دووەم ساڵی ١٩٥٠ جارێکیتر بەپلەی بەرز دەگەڕێتەوە بۆناو سوپا. مووچەی ئەنوەر لەسەرەتا زۆرنەبوو تەنیا مانگانە سی‌و چوار لیرەی وەردەگرت دەبێت وردە وردە خۆراگریمان کردبا. بەڵام هیچ نەبێت ئیتر ژیانی منو ئەنوەر لەدەستی خۆماندابوو لەدەستی هیچ کەسێکی غەریبی وەك حەسەن نەبوو. جگە لەم لایەنە لایەنیی باشی گەڕانەوەی ئەنوەر بۆناو سوپا، سوپای میسر ئۆتۆمبێلێك‌و شوفێرێك‌و پاسەوانێکی لەخزمەت ئەنوەر دادەنێت. ئەمەیان بۆهەموو ئەفسەرانی سوپا دەکرا.

سوپای میسر وەك گەورەترین ناوەند بۆ دەرچووی زانکۆی ئەفسەری مووچەیەکی زۆری بۆئەفسەرانی خەرج دەکرد کەدەرچووانیتر بەخەیاڵیش چاوەڕیان نەدەکرد.

سوپای میسر جگە لەوەی گەورەترین سوپابوو لەناو وڵاتانی عەرەبی، رێزگرتووترین سوپاش هەژمار دەکرا. گەیشتن بەپلەی ئەفسەری لەناو سوپا گەورەترین هیوای زۆربەی گەنجانی میسربوو.، بۆ؟ لەبەر ئەوەی گەیشتن بەم پلەیە کەرامەتێکی زۆر گەورەی بۆدروست دەبوو کەبەدەستهێنانی لەهیچ بوارێکیتر بوونی نەبوو. ئەفسەرانی سوپای ئەوەند جێگای رێزی

كۆمەڵگەی میسربوون، بەبینیی جلوبەرگی ئەفسەری نیگای هەموو كەسێكی لەسەرشەقام‌و كافتریاو دوكانەكان بۆخۆی رادەكێشا. هەموو كەسێك رێزی ئەفەسەرانی سوپای دەگرت.

ئەنوەر باوەڕی نەدەكرد كەبەخت رووی تێكردووە. سەربازی لەناو خوێنیدابوو. خۆوێناكردنی، وێناكردنێكی تاكبوو بەرگریكاری میسر، جلوبەرگەكانی سوپای وڵات‌و هیوای گەورەی بۆسەربەخۆی میسر. هیچ قسەیەكیتر رازی نەدەكرد. من شەیدای ئەم بیروباوەڕەی بووم. ئێستا گرنتیمان بۆ ئایندەی خۆمان هەبوو.

عەبدولحەكیم عامر، لەهاوڕیانی دێرینی ئەنوەر لەسەردەمی زانكۆی ئەفسەری، پەیوەندی دەكات‌و دەڵێت:((پیرۆزە))

جەمال عەبدولناسر تەلەفۆن دەكات:((پیرۆزە، ئەنوەر.))

دوای تێپەڕكردنی ماوەیەكی كورت لەئیسماعیلییەو قنتەرە لەدرێژایی نۆكەندی سوئێز، گوازرایەوە بۆ عەریش‌و رەفەح لەسینا، جارێكیتر بەخت رووی لەئێمە كردەوە. مانەوە لەناوچەی سینا، خزمەتكردن لەناوچەیەكی خرابی كەش‌و هەوای هەژمار دەكرا. مووچەی كرایە دوو بەرامبەر. بەئاسودەی خەیاڵ! ئیتر ناچار نەبووین كرێی كارەباو ئاو خانوو بدەین، خەرجی خواردنی نیوەڕۆ ئێوارانمان نەبوو، هەموو ئەم لایەنانە لەلایەن سوپا دابین دەكرا. تاكو ڕادەیەك توانیمان پارە بۆخۆمان پاشكەوت بكەین. دوای دانەوەی قەرزەكان توانیمان ئۆتۆمبێلێكی واكساڵ بۆخۆمان بكڕین‌و نیوەی پارەكەمان بەقیست دەدا.

كاتێك ئەنوەر گوازرایەوە بۆسینا من گەڕامەوە بۆناو خێزانی خۆم، چونكە ئافرەتێكی خاوەن هاوسەر باش نەبوو بەتەنیا لەماڵەوە بمێنێتەوە. بڕیارمدا خوێندنی خۆم تەواو بكەم، چونكە رێگایان نەدەدا بگەڕێمەوە بۆقوتابخانە، مامۆستای تایبەتم لەماڵەوە هەبوو. زۆر بەدژواری دەمخوێند. چونكە سێ ساڵ لەچوارساڵی كۆتایم خوێندبوون بەڵام بەشداری تاقیكردنەوەكانم نەكردبوو. هەمووو تاقیكردنەوەكانی كەپێویست بوون بەردەوام بووم لەسەریان. جگە لەوانەی خێزانداری، هەندەسەو زانست‌و بیركاریم زیاد كردن بۆئەوەی بتوانم لەزانكۆ وەربگیرێم. رۆژانە سەرقاڵی كتێب خوێندنەوە بووم‌و شەوانە بیرم لەئەنوەر دەكردەوە، بۆچەندینجار نامەكانی ئەنوەرم دەخوێندنەوە كەبەردەوام داوایدەكردو هانیدام بەردەوامی بەخوێندن بدەم. مانگێك پێش تاقیكردنەوەكان، بۆیەكەمجار سەردانی ئەنوەرم كرد لەخانووی بچوكمان لەرەفەح كە بۆ ئێمەیان دەستبەر كردبوو.

خانوویەکی جوانو بەتەنیا، ئەنوەر کەسێکی تێکەڵاو نەبوو لەگەڵ خەڵك داوای کردبوو لەدەرەوەی کۆمەڵگەی خانووەکانی ئەفسەرانی سوپا بێت. لەتەمەنی حەفدەساڵاَن دیسان شەرم دایدەگرتمو پێشوازیم لەپێشنیاری ئەنوەر کرد کەلەدووری کەسانیتردا بین، خۆمان پێکەوە بووین. شەوانە گەڕانو سوڕانەوەیەکی درێژمان بەناو بیاباندا دەکردو ڕۆژانی هەینی کەلوپەلی پێویستمان هەڵدەگرتو دەڕۆیشتین بۆ بیابان، بەردەوامو هەمووکاتێك باسی سیاسەتو مێژوومان دەکرد. زۆرجار ئەنوەر نوێژی خۆی لەبیابان دەکرد، لەخاوێنی سروشت خۆی لەخودا نزیکتر هەست پێدەکرد.

زیاتر لەرابردوو لەیەکتر نزیکبووین. هێزی یەکەکمان دەبوو بەهێزی ئەویتر. ئەنوەر بەردەوام دەیویست بیربکاتەوە بەردەوام خۆی لەناو دەریایی بیرکردنەوەکان ئازاد دەکرد. من زیاتر بێخەیاڵبووم، زۆر جار ئەگەر هەلومەرجی باش نەدەبوو بەگاڵتەکردن روخساری ئەنوەرم دەگەشاندەوە. زۆرجاریش نەمدەتوانی. لەرەنگو رووی روخساری دەمزانی دەستم بەگاڵتەو قسەی خۆش دەکرد دوای ماوەیەك ئەوری نیگەرانییەکانی لەسەر رووخساری نەدەمایەوە. روخساری پڕدەبوو لەشادیو پێکەنین. بەڵام زۆرجار بەهەموو هەوڵدانی خۆم نەمدەتوانی کاریگەری لەسەر نائومێدی بکەم. زۆر بەنەرمی دەیگوت:((جیهان دەبێت بیربکەمەوە.)) من دەستبەجێ ڕێزم لەبێدەنگی دەگرتو لەتەنیایی خۆیدا دەمایەوە. لەمانگێکدا هەفتەیەكو تەواوی زستان کاتێك کەشوهەوای بیابان سارد دەبوو دەگەڕامەوە بۆماڵی دایكو باوکم لەقاهیرە. دوای ژیانی سادەمان لەباکووری سینا، قاهیرە شارێکی پڕ لەخۆ دەرخستن دەهاتە بەرچاوم. لەڕۆژانی ڕێگا پێدراوی ئەنوەر بەردەوام دەرۆیشتین بۆسینەماکانی سەرکراوەی ناوەندی شار. تەماشای فیلمەکانمان دەکرد. لەناوچەی سەربازی نیشتەجێبوونی ئێمە لەبیابان هیچ خواردنگەیەکی نەبوو نەماندەتوانی لەدەرەوە خواردن بخوین. لەرەفەح لەبەردەوامی دروستکردنی خواردنەکانی کە نەدەخوران لەکاری چێشتخانە زۆرخراب سەرنەکەوتم.. تاکو ئەنوەر چێشت لێنەرێکی دۆزییەوە بۆدروستکردنی خواردنمانو ئیتر بەبرسییەتی نەمێنینەوە.

ئەنوەر چونکە کەسێکی خۆرا نەبوو هیچ کاتێك لەبوونی من لەناو چێشتخانە تووڕە نەدەبوو.

لەکاتەکانی کەلەگەڵ ئەنوەر لەسینا دەبووم زۆر شتو لایەنی کەدەکەوتە بەرچاوم سەرم سوڕدەما. شەڕ کاریگەری خۆی لەسەر هەمووشتێكو کەسێك دانابوو. بۆ هەرشوێنێك دەڕۆیشتم کەسێکی فەلەستینیم دەبینی کەلەبەر شەڕی ساڵی ١٩٤٨ لەگەڵ ئیسرائیل لەشوێنەکانیان

دەرکرابوون، لەبازارەکانی رەفەح، عریش، باریکەی غەزە، لەتەنیشت جادەکان، لەهەموو شوێنێك دایکانی رەش پۆش لەگەڵ منداڵەکانی خۆیان بەبێدەنگی دەسوڕانەوە. لەناکاو زیاتر لەملیونێك عەرەب دەربەدەربوون بۆ بەردەوامی ژیان پشتیان بەسەندووقی هاوکاریی مرۆڤ دۆستانەی نەتەوەیەکگرتووەکان دەبەست. بینینی ئەمانە بەدیدگای بێ هەستیان‌و رەنج لەسەر روخساریان نەخشەی خۆی بەستبوو. زەمبیل بەدەست چاوەڕوان‌و چاو لەرێگای گەیشتنی خواردن. دڵی دەشکاندم.

غەزە ئەوکات وێنەیەکی پڕلەکێشەبوو. بەهەڵکەوتنی لەتەنیشت دەریایی ناوەڕاست، بەدووری ٢٦٠ کیلومەتری رۆژهەڵاتی نۆکەندی سوئیز، هەمووکاتێك هاوین هەوارێکی دڵگیر بۆکەسانێك کەبەگەرمای وشکی بیابانی باشوور دەورو درابوون دەژیان. خێزانی دەوڵەمەندانی وڵاتانی عەرەبی هەموو ساڵێك بۆفێنك بوونەوە لەناو ئاوەکانی قووڵ‌و خواردنی هەموو جۆرە ماسیی‌و تامکردنی هەموو جۆرە سەوزیجاتێکی نوێ‌و میوەکان‌و تەرە بایف کەزۆر بەئاسانی لەکەناراوەکانی دەریا گەشەی بەردەوامی خۆیان دەکرد سەردانیان دەکرد. تەنیا ئەمەیان. بەڵام من‌و ئەنوەر هەموو هەفتەیەك بەئۆتۆمبێلی جێپی سوپا دەڕۆیشتین بۆبازاری غەزە، هەرچەند جادەی غەزە زۆر خۆشبوو بەڵام رووخسارێکی خەمبار لەئۆردوگای ئاوارەکان بەدرێژایی جادە بوونی هەبوو.

ئۆردوگای ئاوارەکان بەخێمەکانی زۆربچوك‌و تەنگەبەر وەك شارێکی سپی دەهاتە بەرچاو. من زۆر نیگەرانی گیانی ئافرەتانبووم کەلەسەر ئاگر خواردنیان دروست دەکرد. ئەگەر خێمەیەك ئاگری دەگرت، هەموو خێمەکانیتر لەمەترسیدا دەبوون هیچ یەکێك پارێزراو نەدەبوون. قوتابخانەیەکی کاتی لەدەرەوەی خێمەکان ئامادەکرابوو، بەڵام منداڵەکان بەسەرلێشێواوی لەناوەندی خێمەکان دەسوڕانەوە. لەهەموو شوێنێك پیاوەکان دەستە دەستە لەیەکتر کۆدەبوونەوەو بۆتێپەڕکردنی کاتی خۆیان جگارەیان دەکێشان جۆرە یارییەکیان بەجگارەکان دەکرد. لەنێوان ئەم دیمەنانەدا ئافرەتانی رەش پۆش سەرقاڵی هێنانی دارو ئاو بوون کەلەسەر سەری خۆیان دادەنا.

پرسیارم لەچێشت لێنەری خۆمان کرد کەکەسێکی فەلەستینی‌و نیشتەجێی ناو خێمەکانبوو:((هەلومەرجی خێزانەکان باشە؟))

تەماشای سەرزەویی کردو بەئارامی گوتی:((نا، وەك پێشان نییە.))

کاتێك کەنیوچاوانی بەرزو چاوەکانی کراوەی کەزۆربەی ئافرەتانی فەلەستییەکان لەخەڵکانیتر جیادەکرێنەوە تەماشام دەکرد، بەپێداگری داوام لێدەکرد قسە بکات: ((بۆم باس بکە.))

زۆر لەسەرخۆ، بەشێوەیەك کەلەبەیاد هێنانەوەی هیچ مەیلێکی بۆگێڕانەوەی نەبوو، گوتی:((لەئۆردوگای خۆمانەوە دەتوانین لقەکانی سەرەوەی دارەکانی لیموییو پورتەقاڵی باخی پێشوومان ببینم، وڵاتی من سەوزو گەرمو خۆشبوو، بەڵام لێرانە لەبیابان کەشو هەوا زۆر ساردە. شەوان لەکاتی خەوتن بۆگەرمبوون خۆمان لەیەکتر نزیك دەکەینەوە.))

بەیادم دەهاتەوە دەنگی باران بارین بەسەر ئەیوانی ئەلمینیۆمی خانووی ئێمە، زۆرجار خەو بەچاوەکانم نەدەهات، بەیاد هاتنەوەی شەوانی زستان لەبیابان هێزو توانی هەمان سەرمام نەبوو. لەرزین هەمووگیانی دەگرتەوە. دوپشکەکانی بیابانم بەیاد دەهاتنەوە. کاتێك خوشکم سەردانی منو ئەنوەری کرد، دوپشك کاری خۆی لەگەڵدا کردو بۆدەرمانکردنی بردمان بۆنەخوشخانە سوپاو چەند رۆژی دواتر لاقەکانی تەختەکانی نووستنی خۆمان لەناو دەفەری ئاودەنان تاکو دووپشك نەتوانێت بەسەرکەوێت. فەلەستینییەکان هیچ تەختێکی نووستنیان نەبوو، تەنیا خاوەنی چەند بەتانییەك بوون. ئەگەر نەخۆش دەکەوتن هیچ نەخوشخانەیەك نەبوو.

پێداگریم کردگوتم:((باسی هاوسەری خۆت بکە، چ دەکات؟))

دیسان تەماشای خوارەوەی کرد:((لەوەڵاتی خۆمان کاری گشتوکاڵی دەکرد، لەبیابان هیچ کارێك نییە بکات. لەبەیانییەوە تاکو ئێوارە لەگەڵ پیاوانیتر لەبیابان یاری بەجگارە دەکەن.))

بەسەرسوڕمانەوە گوتم:((تەنیا تۆکار دەکەیت؟))

لەژێر لێوەکانی گوتی:((بەڵێ.))

هەمان شەو بەچەند بەتانییەكو چەندین هێلکە، کەلەژنەکانی دەستفرۆش دەستەبەرم دەکردن کەرۆژانە بەرهەمەکانی خۆیان دەهێنا بەردەم رێگای خێزانەکانی سوپا، ڕەوانەی ماڵەوەم کرد. لەناکاو هەمان وانەکانی گوڵدۆزیو چێشت لێنان کەلەقوتابخانە دەمانخوێندن بەباوەڕم هیچ سوودێکیان نەبوو. نەمدەتوانی لەبەرامبەر ئازاری خەڵکانێك کەلەرووی ئاینو زمانو مێژوو لەگەڵ مندا هاوتابوون بێ هەڵویستو کەمتەرخەم بمێنمەوە. چەندین ژنم دەبینن لەهەوڵدان بۆخێزانەکانی خۆیان بێچارە ببوون، لەهەمان کات خۆم دەبینی. تەماشای منداڵەکانی بێچارەم دەکرد کەخۆم هیوایەتم بوو رۆژێك ببم بەخاوەنی منداڵ، تەماشای خەڵکم دەکرد نەیاندەتوانی

هەمان شوێن بەولاتی خۆیان بزانن، ئەمەیانم باش دەزانی، بەبوونی تەواوی کێشەکانی میسر، من هیچ کاتێك تواناو تاقەتی ژیانی بەبێ میسرم نەدەکرد. وەك دەهاتە ناوبیرم لەدەوروبەرم، لەهەمووشوێنێك، پچڕانی تان‌وپۆی دونیایەکم دەبینی کەخۆم بۆخۆم دروستکردبوو.

قوربانیانی شەڕ تەنیا ئاوارەکانی فەلەستینی نەبوون، میسرییەکان زۆر ئازاریان کێشا. کاتێك ئەنوەر لەسەردەمی شەڕی فەلەستین بەداماوی لەژووری تاکەکەسی پەنجاو چوار تێپەڕی دەکرد، داماوی ئەفسەرانی هاوسەردەمی لەبەرەکانی شەڕ لەئەنوەر زیاتربوو. چەکی کەحکومەت پێشکەشی سوپای دەکرد چەکی خرابوون. هیڵی پشتیوانی گواستنەوەی کەلوپەلی پێویست بۆبەرەی شەڕنەبوو، ستراتیجی سەربازیان تێکەلاوبوو. جەمال عەبدولناسر، هاوکاری ئەنوەر دواتر باسی شاری دەور دراوی دەکرد کەخۆی بەرگری لێدەکرد، دەنووسێت:((رووداوەکانی جۆراوجۆر لەتەواوی میسر روویاندەدا، میسر راستەوخۆ لەناو چوارچێوەی کێشەکانی زۆرو لەمەترسی لەناوچوون بوو لەلایەن دوژمن، ولاتی ئێمەیان بەخیانەت کێشایە ناو شەڕ کەبەهیچ شێوەیەك ئامادەی ئەم شەڕە نەبوو. تەماحکارییو پیلانگێڕی یاریان بەولات دەکردو بەبێ چەك ڕەوانەی ناو ئاگری شەڕیانکرد.))

تووڕە بوون لەفارۆق لەناو سوپاو، نیوان جوتیارانو خەڵکانیتر بەخێرایی زیاتر دەبوو.

وەك دیار بۆشا بچوکترین گرنگی نەبوو کەئێمە لەم شەڕەدا دۆڕاوین. لەجیاتی ئەوەی زیاتر لەناو پەرلەمان بێت، بەبێ خەیاڵی کاتی خۆی تەرخان دەکرد بۆمیوانداریيەکان کەلەناو کوشكو شوێنەکانی گەشتیاری پاشەیەتی تێپەڕ دەکرد. زۆر دیارو بەرچاوبوو کێشەکانی میسر هیچ کاریگەریان لەخواردنە خۆشەکانی نەدەکرد. پاشای ئێمە رۆژ لەدوای رۆژ بەشێوەیەکی پێکەنیناوی قەلەو دەبوو، هەموومان چیرۆکی زك گەورە بوونی دەزانین، خواردنی بەیانیان سی هێلکەو نیوەڕۆ حەوت قاپی گوشتو سەوزەوات، رۆژانە سی دانە گلاسی شەربەتی میوەی دەخواردنەوە. کێشی ئەوەندە قورس دەبوو رێڕۆیشتنی بۆکارێك ئەستەم بوو، لەناو کۆشکەکان کورسی تایبەتی بۆدروست دەکران.

ئەم زێدەخۆرییەو نەبوونی خۆراکی دەبوونە هۆکاری شەرمەزاری هەموو خەڵکی میسر، بەلام هەڵسوکەوتی شا لەناو کۆمەڵگە لەئەوەی باسدەکرا شەرمەزارتربوو. بۆسەرتاشین بەفڕۆکە سەرتاشێکیان لەئەوروپا دەهێنایە میسرو هەرکاتێك سەردانی کەناراوەکانی دەکرد دوو کەس لەدوو تەنیشتی دادەنیشتن کەنینۆکەکانی بەجوانی برازێننەوە. قورئان قوماری بۆموسلمانەکان

قەدەخەکردووە، بەلاّم پاشای موسلمانی ئێمە بەردەوام سەردانی گازینۆکانی دەکرد. لەقومارخانەکانی مونت کارلۆ یاری تاسی بەهەزار دۆلار دەکرد، زۆرجار لەشەوێکدا پەنجا هەزار دۆلاری دەدۆڕاند. لەئەسکەندەرییە، گازینۆکانی تایبەتی بیانییەکان، شا کەمتر دەیدۆڕاند، بەلاّم بەردەوام قوماری دەکرد. زستانەکان کاتێك مەلیك فارۆق لەقاهیرە دەمایەوە، ئۆتۆمبێلەکانی پاشایەتی، شەوانە لەبەرامبەر شوێنی گۆرانی گوتن‌و سەماکردن لەجادەی ئەهرام دەبینران. شوێنەکانی سەماکردن کەشا بەئاشکرا پەیوەندی لەگەلّ سەماکاران هەبوو.

بەرزبوونەوەی شەپۆلّی نەتەوەخوازی، فارۆق تاوانبارکرا بەکەسێکی بیانی. لەهیچ کەسێك شاراوە نەبوو فارۆق لەجیاتی زمانی عەرەبی بەردەوام دەیویست بەئینگلیزی یان فەرەنسی قسە بکات، هاوڕێکانی کەسانێك بوون کەلەیانەی وەرزشی دورگەی بیانییەکان، خۆشەویسترینیان فیتەرێکی ئیتالیبوو. فارۆق چونکە کەسێکی میسری نەبوو. زۆر هەولّی خۆیدەدا کە بنەمالّەی خۆی بگەێنێت بەحەزرەتی محەممەد (د.خ) بەلاّم هیچ کاتێك نەیتوانی. کاتێك شاژن فەریدەی خۆشەویستی لەبەر ئەوەی نەیدەتوانی ببێتە خاوەن مندالّی کوڕ، دژایەتی دژی فارۆق زیاتر دەبوون. کەسانی سەربەرزی پێش فارۆق وەك محەممەد عەلی پاشا. یەکەم فەرمانڕەوای میسر یەکەمین سیستەمی پەروەردەی حکومی دامەزراند، وەفدی پەروەردەی رەوانەی دەرەوە کردن، یەکەم کەس دەبێت توانی گۆڕانکاری بنەڕەتی لەکشتوکالّ‌و جوتیاری بکات‌و پیشەسازی نیشتمانی دەست پێکرد، یەکەم کەس دەبێت کەبنەمای سوپایەکی بەهێزی دروستکرد، ئێستا فارۆق بەپێچەوانە کاری دەکرد. میسرییەکان باسیان دەکرد بنەمالّەی پاشایەتی رۆژ لەدوای رۆژ لەرزۆك دەبێت‌و ئێستا کەگەیشتووە بەفارۆق هیچ کەلّکی نەماوە.

هێزەکانی چالاك بۆگۆڕینی رژێم، لەبەرەی راستەکانی توندڕەو بوونیان هەبوو بەلاّم بەرەی چەپەکانی توندڕە زۆر چالاك نەبوو. شا لەسەر کۆنترۆلّکردنی هێز لەگەلّ وەفد، پارتی سیاسی نەتەوەخوازان بەرێبەرایەتی مستەفا نحاس پاشا، لەشەڕدابوو، وەفد بەکۆنترۆلّکردنی پۆستەکانی حکومی لەشەڕدابوون. هەستەکانی دژە بریتانی خەلّك لەزیاد بوون. فەرماندەی گشتی هێزەکانی بریتانیا، لەترسی زیاتربوونی توندوتیژی میسرییەکان، لەسالّی ١٩٥٠، بارەگای فەرماندەی خۆی لەقاهیرە گواستەوە بۆ سوئیز. ناوەندی سەربازی بریتانیا بەشێکی زۆری ناوەندی شاری قاهیرەیان لەژێردەست بوو، هەلّگیرا. کەمتر سەربازەکانی بریتانیا

دەبینران. ئامۆژگاری سەربازەکانی بریتانیا کرابوو بۆپاراستنی گیانی خۆیان لەجیاتی جلوبەرگی سەربازی بەجلوبەرگی ئاسایی بڕۆنە دەرەوە.

نەمدەتوانی باوەڕ بکەم کە ئەنوەر بەجۆرێك دەستی لەبەرفراوانی ئالۆزییەکاندا نەبێت. من راستم دەکرد. لەدەستپێکی ساڵی ١٩٥١ سەرقاڵی تێپەڕکردنی تاقیکردنەوەکان‌و هاتووچۆی نێوان قاهیرەو رەفەح بووم، جەماڵ عەبدولناسر بەنهێنی ئەندامەتی ئەنوەڕ لەناو رێکخراوی ئەفسەرانی ئازادی رێکخست ئەنوەر لەناو رێکخراوەی ئەفسەرانی ئازاد سەرقاڵی رووخاندنی رژێم بوون. ئەنوەر، لەبەر بەلێنی کەبەباوکمدابوو کەنەگەڕێتەوە بۆناسیاست هیچی بۆباس نەکردم.

لەتشرینی دووەمی ساڵی ١٩٥١، ناتەبایی نێوان بریتانییەکان‌و حکومەت گەیشتبوو قۆناخێکی خراپ. سەرۆکوەزیر نحاس، لەوەڵامی پاڵەپەستۆی مللیون، رێکەوتنی ١٩٣٦بریتانیاو میسری هەڵوەشاندەوە، رێکەوتنێك لەقوناخی یەکەم رێگای بەئەنوەرو یاوەرانی شۆڕشگێردا پلەی بەرز لەسوپا وەربگرن، بەبڕوای زۆرکەس هەڵوەشاندنەوەی ئەم رێککەوتنە رێگا لەمانەوەی بارەگای سەربازی بریتانیا لەمیسر دەگرێ. نزیکەی سەدهەزار میسری لەژێر فەرماندەی بریتانیا خزمەتیان دەکرد لەکارکردن لەگەڵ میسرییەکان سەرپێچیان کرد. ئەندازیارانی میسر رێگای شەمەندەفەرەی کەسەربازانی بریتانی لەناودابوون گرت. فەرمانبەرانی گومرگ کەمیسری بوون ئاگادار دەبن کەدەرفەتی هەڵسەنگاندنی کاڵاکانی داواکراوی بریتانییەکانیان نییە کەلەبریتانیا هاوردە دەکران. بازرگان‌و پێشەوەرەکان ژمارەی بانگی بریتانی خۆیان داخست. وردە وردە لەناو شەقامەکانی قاهیرە میسرییەکان دەبینن کاتێك دەگەیشتن بەسەربازێکی بریتانی شانی خۆیان لەشانی دەدا. هێرشکردنە سەر ناوەندەکانی سەربازی بریتانیا لەناوچەی نۆکەندی سوئێز، ئیسماعیلییەو پۆرت سەعید توندتر دەبوو. سوپای میسر بەفەرمی نەیدەتوانی دەستوەردان بکات، بەڵام ئەنوەرو هەندێك ئەفسەری ناو سوپا دەستیان بەچەکدارکردنی فیدایان کرد ئەمانەش ئینگلیزەکانیان تەنەگەتاو دەکردن. دوای سێ مانگ شەڕکردن، بریتانییەکان نۆکەندی سوئێزیان لەگەڵ تەواوی وڵات دابڕاندبوو.

بریتانیا دەستی بەشەڕکرد. لەکانوونی دووەمی ١٩٥٢ بۆتۆڵەکردنەوە لەفیدایان هێرش دەکەنە سەر ئیسماعیلییەو داگیری دەکەن. هێزەکانی بریتانیا داوایان لەپۆلیسەکانی میسری کرد چەکی خۆیان دابنێن‌و لەشار بڕۆنە دەرەوە. تەنیا چەکی پۆلیسی میسری چەند توفەنگێك

بوون، حکومەت بڕیاری بۆدەرکرد لەشوێنی کارکردنی خۆیان نەمێننەوە، ئینگلیزەکان بەزەبیان پێنەدەکرد، پەنجا پۆلیس دەکوژن‌و زۆریش بریندارەدەبن. ڕۆژی دواتر، ٢٦ کانوونی دووەم، قاهیرە لەناو ئاگر دەسووتا.

دیمەنێکی زۆرترسناك. لەبەر پەنجەرەی ژوورەکەم لەماڵی دایك‌و باوکم دەنگی تەقینەوەکانی بەدوای یەك دەهاتن. لەگەڵ دایك‌و باوکم ڕۆیشتین بۆسەر خانوو بڵێسەی ئاگرو دوکێڵ سەرتاسەری شاری دادەپۆشی رووباری نیلی دادەپۆشی. بینینی سووتانی شارەکەمان لەهەلومەرجێکدا نەماندەزانی بۆنێمە زۆرترسناك بوو، لەسەر خانوو بۆهەموو لایەك دەڕۆیشتم بەبوونی دەنگی تەقینەوەو بڵێسەکانی ئاگرو دوکێڵ هەستم دەکرد نەك تەنیا شاری قاهیرە بەڵکو هەموو وڵاتی ئێمە دەسووتا. چی بووە؟ ئایا وڵاتێکی بێگانە هێرش دەکات، یان دیسان لەوانەیە ئیسرائیل؟ یان کودەتایەك ڕوودەدات؟

لەرادیو بیستم خۆپێشاندانی بەشێك لەقوتابیانی زانکۆ دژی حکومەت‌و شا گۆڕاوە بۆشۆڕشی سەرتاسەری. لەتەواوی ڕۆژ تەماشای تەقینەوەکانم دەکرد کەلەناوەندی شار دەتەقینەوەو تاکو درەنگانی هەمان ئێوارە بەردەوامی هەبوو. بۆچی حکومەت ڕێگا لەئاژاوەگێڕی ناگرێت؟ پۆلیس نەیدەتوانی هیچ بکات، چونکە هەمان ڕۆژ، لەبەر ناڕەزایەتی کوژرانی هاوکارانی خۆیان لەئیسماعیلییە، تووڕە بوون لەحکومەت کەبەبێ پشتیوانی خرابوونە دەستی بریتانیا، نەڕۆیشتبوون بۆسەرکاری ڕۆژانەی خۆیان. حکومەت هیچ هەوڵدانێکی نەکرد. دواتر ئاشکرابوو کەفارۆق سەرقاڵی مێوانداریکردنە لە٦٠٠ کەسایەتی بەبۆنەی لەدایکبوونی کوڕی فوئاد کەدەبوو بەجێگرەوەی هیچ نیگەرانی لەهەواڵی سەرهەڵدانی شوڕش نەبوو.

لەهەمان ڕۆژ بەدواوە ناویان لەهەمان ڕۆژ دانا شەممەی ڕەش. لات‌و لوتەکانی میسری هێرش دەکەنە سەر ناوەندی شارو دوکانەکان تاڵان دەکەن‌و خانوو بەرەکان ئاگری تێبەردەدەن. هەرشوێنێك کەپەیوەندی بەکاروباری بیانییەکانەوە هەبوو گڕی دەگرت. سینەمای ریولی میترۆ کەزۆربەی کاتەکان من‌و ئەنوەر بەهەمان ڕێگا هاتووچۆمان دەکرد، سوپەرمارکێتی گەورەی یەهودییەکان، پێشانگەی ئۆتۆمبێلی فۆردو بانك، هەموویان سووتان.

دوکانەکانی خواردن‌و مەی فرۆشی‌و یانەی شەوانە لەناوەندی شار چێشتخانەکانی، سسیل، سنت جیمز، هەرمیتاج، یانەی تۆرف هەموویان تەقاندنەوە، لەسووتانی خواردنەوەکانی کحولی ڕەنگی ئاگر دەگۆڕا بۆڕەنگاوڕەنگی. دوو سێ کەسی بیانی بەخت هەڵگەڕاو لەناو یانەی تۆرف

كوژران. زۆركەس بانگێشەی ئەوەیان دەكرد كەبەچاوی خۆیان دەبینی گەنجەكان سواری ماتۆرەكان دەبوونو بۆهەموو لایەكی شار دەڕۆیشتن تاكو ئاگر لەهەموو شوێنەكان بەردەن، زۆركەس ئۆتۆمبێلی پڕ بۆمبی دەستی دروستكراوی ئاگریان بینیبوو.

شوێنی كۆتایی كەگڕیگرت هوتێلی بەناوبانگی نیودەوڵەتی شپرد بوو، سەردەمانێك كۆشكی یەكێك بەگەكانی توركبوو، منو ئەنوەر هیچ كاتێك سەردانی ئەم شوێنەمان نەكرد، چونكە بۆئێمە زۆر گرانبوو، بەلآم ئەیوانی ئەم هوتێله شوێنی دڵخوازی ئەفسەرانی بریتانیابوو، تالآری لوویی چواردەیەم، شوێنی زۆر لەمیوانداریيەكانبوو، گەڕیدەكانی بیانی بەجلوبەرگی میسری بەشداریان دەكرد. هەندێك كەس باسیان دەكرد كاتێك ئاگركوژێنەوەكان گەیشتنە هوتێل شپرد بۆگەشە نەكردنی ئاگرو كۆنترۆڵكردنی تێكدەرەكان سوندەكانی ئاگر كوژێنەوەكانیان بەقەچو بڕین.

تاكو ئێوارە كوژراوەكان گەیشتنە چل كەسو سەدان بریندار. خەڵك تاكو یەك كیلۆمەتری كاخی عابدین پێشڕەویان كردبوو بەلآم حكومەت بڕیاری حكومەتی سەربازی دەركرد، سەربازان بۆبەرگریكردن لەموڵكو ماڵی خەڵك ڕەوانەی سەر شەقامەكان كران. ئەنوەر بۆ ئاگاداربوون لەسەلآمەتی ئێمە لەرەفەح بەتەلەفۆن پەیوەندیكرد. گوتی:((جیهان داوا دەكەم تاكو شەقامەكان ئارام دەبنەوە نیتەدەرەوە تاكو ئێستا هیچ كەسێك نازانێت هۆكاری شۆڕش چییە؟))

بەیانی رۆژی دواتر ئاگاداربووین كەئەمەیان دەستپێكی كودەتا نەبوو، چونكە هیچ هەوڵدانێك بۆبەدەستەوە گرتنی حكومەت نەكرا. بەم شێوە سووتاندنی قاهیرە رێكخراوتربوو لەكودەتای خوبزوێنیو هاندەری. چ كەسێك خەڵكی هاندا؟ هیچ كەسێك بەتەواوی هیچی نەدەزانی، هەندێك كەس گومانیان لەكۆمۆنیستەكان هەبوو. ناوی كۆمۆنیست میسرییەكان بەشێوەیەكی گشتی بۆهەموو چەپەكان بەكاردەهات بەگشتی ماركیزمی رووسیو دژە رۆژئاوایی. هەندێك كەسیتر گومانیان لەجەماعەتی ئیخوام موسلمین هەبوو. هەندێكیان گومانیان لەخودی مەلیك فارۆق هەبوو. بەلآم كاتێك دوكێڵی كۆتایی لەسەر شاری قاهیرە دوور دەكەوتەوە خەڵك باوەڕی بۆدروست دەبوو كۆتایی سەردەمی مەلێك فارۆق نزیكبووتەوە. خەڵكی میسر ئیتر باسی رووخانی حكومەتیان نەدەكرد. ئێستا تەنیا پرسیاری كەدەكرا مێژوو هەمان پرسیاربوو.

ڕۆژی ئاگرکەوتنەوەی گەورەی قاهیرە لەناو مێشکی میسرییەکان جێگای خۆی گرتبوو ڕێگای مێژوویی دەگۆڕی، ناڕەزایەتی دژی حکومەت بەئاشکرای دەکرا ستوونەکانی تاجو تەخت دەلەرزین. یوسف ڕەشاد، بەبێ ئەوەی بچوکترین گومانی لەئەنوەر هەبێت کەلەگروپی دژبەرانی تاجو تەختی فارۆقە بۆی باسدەکات فارۆق ئەوەندە لەشۆڕش ترساوە خۆی بۆهەلاتن لەمیسر ئامادە دەکات. ئەم هەواڵە دەبێتە هۆکار کەئەفسەرانی ئازادیخواز ڕۆژی شۆڕش لەساڵی ١٩٥٥، بۆتشرینی دووەمی ١٩٥٣ پێش دەخرێت، واتە ساڵی ئاینده.

من نەمدەزانی کەیوسف ڕەشاد یەکێك لەچارەنووس سازترین کەسانی ژیانی ئەنوەر بێت. فارۆق دواتر یوسف ڕەشاد دەکاتە سەرۆکی ناوەندی هەواڵگەریی‌و ئەمنییەتی پاشا، بەم شێوەیە کەنالێکی ڕاستەوخۆی ئەنوەر دەبێت بۆناو کۆشکی پاشایەتی. ئەنوەر پشتراست دەبێت کەڕێگا نادات شۆڕشی ئەفسەرانی ئازاد تێك بشکێت. سوود لەیوسف وەردەگرێت بۆناردنی هەواڵەکانی نادروست بۆشا. هیچ چارەیەکی جگە لەم لایەنە نەبوو دوای ئاگرتێبەردانی قاهیرە، دەنگۆی شۆڕشێکی لەناکاو هەموو شوێنێك بەربلاوبوو. زۆر دەیگوت ئیخوان موسلمین ڕێبەرایەتی کودەتا لەدەستی خۆی دەگرێت هەندێك کەسیتر بانگێشەی ئەوەیان دەکرد سوپا هێز بەدەستەوە دەگرێت. فارۆق لێکۆلینەوەی لەهەموو دەنگۆکان دەکرد، لەئەنجامدا گیانی ئەنوەرو ئەفسەرانی هاوڕێی لەمەترسیدابوو. ئەنوەر دەیزانی لەوانەیە هەرساتێك لەگەڵ یاوەڕانی بەتۆمەتی بەشداریکردن لەشۆڕش بگیرێ، لە ئایارو حوزەیرانی١٩٥٢، دەستی بەسەفەرکردن بۆ ئەسکەندەرییە کرد، شوێنێك کەیوسف ڕەشاد هاوینان لەگەڵ شا تێپەڕیان دەکرد. ئەنوەر بەردەوام بۆیوسفی باسدەکرد پێویست ناکات مەلێك فارۆق هیچ نیگەرانییەکی لەئەفسەرانی سوپا هەبێت، هەموو ئەم دەنگۆیانە بێبنەمان.

لەدەستپێکی مانگی تەموز، لەیەکێك لەچاوپێکەوتنەکانی ئەنوەر لەگەڵ یوسف من لەگەڵیدا لەئەسکەندەرییە بووم. ڕۆژێکی خۆشمان لەکەناراوەکان بەسەر بردبوو. کاتێك ئەنوەر گوتی لەناو ئۆتۆمبێل بمێنەوە تاکو سەردانی یانەی ئۆتۆمبێل سواری بکات، یەکێك لەجوانترین شوێنەکانی ئەسکەندەرییە هەژمار دەکرا یوسف ببینێت، هیچ قسەیەکم نەبوو. کاتێك یوسف زانی من لەدەرەوە لەناو ئۆتۆمبێلم. پێداگری کرد کەدەبێت بۆنانخواردنی ئێوارە میوانی بین. زۆر خوشحاڵبووم. دوای تێپەڕکردنی ڕۆژی خۆمان لەناو کەش‌وهەوای ئازادی بیابان، زۆر

برسیبووم بڕیارمدا کەبابێکی گەورەی مێگوویی بیخۆم کەزیاتر بەدەمی قرژاڵی دەریایی ناوەڕاست دەچوو.
نەمتوانی تامی کەم. کاتێك دانیشتین هەندێك میوانیتر لەمێزی تەنیشت ئێمە دانیشتن. قورسایی نیگاکانیان لەسەر خۆم هەستم پێدەکرد. سەری خۆم بەرزکردەوە چاوم بە مەلیك فارۆق کەوت.
زۆری نەمابوو لەترسان دڵم لەلێدان بکەوێت. ناوبانگی فارۆق لەسەرتاسەری میسر بڵاوبوو کاتێك کەئافرەتێك دەبینێتو لەبەرچاوی جوان بێت، بەدوایدا دەنرێت. خەڵکی میسر باسی کەسێکیان دەکرد کەدوای ئەوەی ژنی بۆفارۆق دەبەن هاوسەری دەکوژن. لایەنێکی ئەم بابەتە زۆر روون نەبوو کەئایا خودی مەلیك فارۆق ئەم کابرایە بەگولە دەکوژێت یان خودی پیاوەکە خۆی کوشتبوو. لەهەمان سات وردەکاری بابەت بۆمن زۆرگرنگ نەبوون. گرنگ ئەوەبوو لەگەڵ شای سووك روبەروو دانیشتبووم. دەمزانی خوێن تاڵ نیم. تەمەنم هەژدە ساڵانبوو، تەمەنی ویستراوی مەلیك فارۆق.
یەکێك لەیاوەرانی فارۆق بەرەو مێزی ئێمە هاتو بەیوسفی گوت:((دکتۆر ڕەشاد،، گەورەمان ئێوە بانگ دەکات بۆسەرمێزی خۆی.))
هەموو جەستەم دەلەرزی. من بیرم دەکردەوە لەوانەیە پرسیاری من لەدکتۆر بکات. دەموویست تەماشای ئەنوەر بکەمو داوبکەم لەم شوێنەبڕۆین. بەلام هێزو توانام نەبوو نەمدەتوانی سەرم هەڵبڕم. چەندینجار ویستم تەماشای ئەنوەر بکەم دەمبینی شا تەماشای من دەکات. دواتر زۆر بەبێچارەیی لەشوێنی خۆم هەستامەوە بەئەنوەرم گوت:((دەرۆم بۆدەست شوشتن.)) کاتێك گەڕامەوە لەسەر کورسی دکتۆر یوسف دانیشتم کەپشتم بکەوێتە شا. یوسف جارێکیتر گەڕایەوە بەخوێن ساردی گوتی:((شا دەیویست بزانێت ئێوە کێن، گوتم هاوڕێیانی منن.))
هەستم دەکرد بێهۆش دەبم تەماشای مێگووکانم دەکرد بەلام هیچ ویستێکم بۆ خواردنیان نەبوو.
جارێکیتر یوسف رەشاد بۆسەرمێزی شا بانگکرا: دکتۆر گەورەمان بانگت دەکات.)) جارێکیتر بەهەمان شێوە مەلیك فارۆق بانگی کرد. چەندجار دکتۆر بانگ دەکرا ئەنوەر هەستیار دەبوو، من هەستم دەکرد لەوانەیە نیگەرانی من بێت، بەلام دواتر ئاشکرابوو کە نیگەرانبوو نەوەك شا

بە بانگێشەکردن بۆ پیلانگێڕی ئەفسەرانی سوپا گرێ بدات. ئەنوەر دەیزانی نەك تەنیا راپۆرت لەسەر ئەفسەرانی ئازاد، بەتایبەتی لەسەرخۆدی ئەنوەر ڕەوانەکراون بۆفارۆق. مەترسیدارترین رووداو لەوانەیە لەگومان‌و سەرنج ڕاکێشانی شا سەر هەڵبدەن. بەلاَم مەترسیدارترین سات لەهەموو ساتەکانیتر ئەوەك شا سەرنجی بۆلای من راکێشابێت. هەردووکمان بەهۆکاری جیاواز ترسابووین.

گوتی:((جیهان خێراکە خواردنی خۆت تەواوکە بابرۆین.))

بەلاَم من نەمدەتوانی هیچ بخۆم، نەمدەتوانی جوڵانەوەیەك بکەم. لێدانی دڵم زیاتری دەبوو. بیرم دەکردەوە لەوانەیە شا سبەینی کەسێك بەدوای مندا ڕەوانە بکات، ئەوکات دەبێت چی بکەم؟ بێگومان نەدەڕۆیشتم. بەلاَم ئەوکات یان منیان دەکوشت یان ئەنوەر. بیرکردنەوەکان زۆر دەڕۆیشتن، هەرچەند خاوەن هاوسەربووم، بەلاَم دیسان بەتەمەن بچوکبووم. بڕیارمدا خۆم ناشیرین بکەم. رووخساری خۆم ڕەش دەکەم. دواتر خۆم سەرکۆنەدەکرد، نەئەمەیان کارێکی گەوجانەیە. لەجیاتی ئەمەیان دەرگا لەسەرخۆم قوفڵ دەکەم‌و ئەگەر کەسێك لەدەرگایدا، دەرگام نەدەکردەوە، هەرکەسێك بێت.

دوای نانخواردن من‌و ئەنوەر بەرەو قاهیرە بەرێکەوتین. لەرێگا، ئەنوەر زۆر پەریشان بوو، دووسێ وشە زیاتر هیچ قسەیەکی نەکرد. من پەریشان بۆحاڵی خۆم بێدەنگبووم. هیچ شتێکم لەسەر نیگەرانی خۆم بۆ ئەنوەر باس نەکرد. نەمدەویست جگە لەهەمان نیگەرانی خۆی زیاتر نیگەرانی بکەم. لەماڵەوە بەردەوام لەبیری هەمان رۆژی بەترس نەخەوتم. ئەوەندە پشت راستبووم کەسێك لەکۆشك بەدوامدا ڕەوانە دەکەن. بڕیارمدا ئەگەر ئەمەیان روویدا خۆم دەکوژم. بەیانی ئەنوەر بۆ ئاگادارکردنی عەبدولناسر رۆیشت دەرگام گاڵەدا گوتم جگە لەخوشکم دەرگا لەهیچ کەسێك ناکەمەوە. بەلاَم هیچ کەسێك نەهات.

هەمان شەو ئەنوەر گەڕایەوە بۆ رەفەح، من بەخەیاڵی ئاسوودە رۆیشتم بۆماڵی دایك‌و باوکم.

لەم لایەنەوە هیچ گومانێکی تێیدا نییە کەفارۆق لەهەمان سەردەم ترس‌و نیگەرانی زۆری هەبوون. حکومەتی لەسەرلێواری رووخان نزیکبوو. لەشەش مانگی دوای شەممەی ڕەش فارۆق کابینەی حکومەتی هەڵوەشاندەوەو دوو کابینەیتری حکومەت پێشتر دەستیان لەکار کێشا بوویەوە. ئێستا، لەبیستی تەموز، کابینەی مەلیك فارۆق پێك دەهات مێردی خوشکی ئەفسەری سوپا ئیسماعیل شیرین بەشداری دەکرد، کەسێك بەبێ تێپەڕکردنی زانکۆی

ئەفسەری جلوبەرگی ئەفسەری دەپۆشین. سوپا بەبەشداریکردنی ئیسماعیل شیرین لەکابینەی نوێی حکومەت هەستیان بەبێ نەرخی دەکرد. زۆر ئاشکرابوو ئەمەیان لەلایەن سوپا قبووڵ نەدەکرا.

ئەنوەر دوو رۆژ دواتر، لەبیستو دووی تەمووز، لەرەفەح پێوەندی بەمنەوەکرد: ((جیهان، بۆچەند رۆژێك پشوودان دەگەڕێمەوە.)) پشوودان؟ چەند رۆژ پێش مۆڵەتی وەرگرتبوو. روونیکردەوە:((دایکم نەخۆشە.))دایکی نەخۆشە؟ من هەمان رۆژ بۆبینینی سەییدە بەرین سەردانی ماڵەکەیانم کردبوو تەندروستی زۆرباشبوو. ئەمجۆرە نهێنی بوون لەکارەکانی بۆچی دەکاتو مانای چییە؟ بۆپێشوازیکردنی رۆیشتم بۆ ویستگەی ئاسنینیی شەمەندەفەڕ. لەهەمان کاتی کەگەیشتەجێ گوتی:((وەرە بابڕۆین گەشتێك بۆ شەقامی ئەهرام بکەین.))

کاتێك لەبیابان شوفێری دەکرد:((جیهان، بەیادت دێتەوە کاتێك بەڵێنم بەباوکتدا ئیتر هیچ کاتێك خۆم تێکەڵاوی سیاسەت نەکەم؟))

بەورد بینی تەماشای هاوسەرم دەکرد کەبەردەوام جگارەی دادەگیرساندن. گوتم: ((بەڵێ))

گوتی:((زۆرباشە بەکردەوە هیچ کاتێك نەگەڕامەوە ناوسیاسەت، بەڵام زۆرجار لەگەڵ هاوڕێیانم دادەنیشمو باسی سیاسەت دەکەمو دواتر هەست بەتاوان دەکەم،)) دواتر زیادیکرد:((ئاگاداری گوتم لەناو سیاسەت نیم، تەنیا باسی بیروباوەڕەکانی خۆم دەکەم.))

بەهیچ شێوەیەك هەواڵێکی کوتووپڕ نەبوو. لەراستیدا، خەیاڵم ئاسوودە بوو. هەرچەند دەمزانی ئەنوەر هەموو حەقیقەتی بابەتەکە باس ناکات، وەڵامی ئەنوەرم دایەوە: ((ئەگەر بیروباوەڕی خۆت بۆهاوڕێیان باس نەکەیت تۆ ئەنوەر نیت کەمن هاوسەرگیریم لەگەڵدا کردبوو. تۆ وڵاتپارێزێکی گیان فیدابووی، چۆن دەتوانی دەست هەڵگری.))

ئەنوەر تەماشای پێشەوەی دەکردو گوتی:((بەڵام من بەڵێنم بەباوکت دابوو بەڵێنەکەم لەژێرپێی داناوە.))

دەستم لەسەر دەستی داناو گوتم:((ئەنوەر باوکم لەبەرخاتری من ئەم بەڵێنەی لەتۆ وەرگرت، تۆ لەبەرمن رازیبووی. لەبەرخاتری من، بەڵام هیچ کەسێك پرسیاری لەمن نەکرد بیروباوەڕی تۆچییە؟

ئەنوەر بەئارامی وەڵامی دایەوە:((چ هەستێکت هەیە؟))

لەوەڵامدانەوە خێرابووم، لەگرنگی وەڵامی خۆم ئاگاداربووم، بەڵێنێك کەلەنیوان دوو خزم دەبەسترێ، واتە لەنێوان ئەنوەرو باوکم، ناکرێ بەئاسانی تێك بشکێت. گوتم: ((زۆربەی ئافرەتان نایانەوێت هاوسەریان گیرۆدەی کێشەی مەترسدار ببنەوە لەناو هەمان بارودۆخ بەردەوامی بەژیانی خۆیان بدەن، نایانەوێت مەترسی گیرانی هاوسەری خۆیان ژیانیان گیرۆدەی کێشە ببێتەوە، بەڵام تۆهاوسەرێکی ئاسایی نیت. من ئەمەیانم دەوێت. ئەنوەری کەهەمان بەڵێنی بەباوکم دابوو هەمان ئەنوەر نەبوو کەمن هاوسەرگیریم لەگەڵدا دەکرد، ئەنوەرێك نییە کەئێستا لەتەنیشتم دانیشتووەو گفتوگۆم لەگەڵدا دەکات. کارێك کەباوکم کردی ئەرکی باوکایەتی خۆی لەبەرامبەر کچەکەی جێبەجێکرد، بەڵام ئێستا من هاوسەری تۆمو بیر لەهەمان بەڵێنی پێشوو ناکەیتەوە.))

ئەنوەر دەستبەجێ ئارامی بۆگەڕایەوە پێشنیاریکرد:((ئەمشەو پێکەوە لەگەڵ دایكو باوکت دەڕۆینە سینەما.)) سەرسوڕهێنەربوو بەچەند وشەیەك لەهەمان باری قورسایی سەرشانەکانی تەواوببوو، بەڵام تاکو هەمان کات نەمدەزانی بۆچی سەردانی قاهیرەی کردووە.

((جیهان، ئایس کرێم دەخویت؟))

((جیهان، چوکلاًت دەخویت؟))

((جیهان، ئایس کریمیتر دەخویت؟))

((وای ئەنوەر ئیتر بەسیەتی، دەتەقم.))

((نا، نا، بیر لەم لایەنە نەکەیتەوە، هەرچی دەتەوێت بیخۆ.))

بەدرێژایی بینینی فیلم خۆشەویستی بۆمن زیاتر دەبووو خۆشەویستی دەردەبڕی، تەواوی هەمان ماوە دەستی لەسەرشانم دانابوو. هۆکاری ئەم هەموو خۆشەویستییەم نەدەزانیو بێگومان رێگریم نەدەکرد. لەکاتی پێشکەشکردنی هەمان فیلم دووجار پرۆژێکتور سووتا بەڵام بەهیچ شێوەیەك تووڕە نەبوو هیچ نیگەرانی لەخۆی نیشان نەدا. شتێك کەلەهەمان کات نەمدەزانی ئەوەبوو کەئەنوەر خواحافیزی لەمن دەکرد.

ئەنوەر لەرەفەح پەیامێکی نهێنی بەناوی (ئەبو مێنکەر) لەعەبدولناسری پێدەگات کەشۆڕش لەبیستو دووی تەمووز بۆپانزدەی مانگی ئایار دەگۆڕێت دەبێت ئەنوەر سەردانی قاهیرە بکات، چونکە مێژووی کودەتا پێش خرابوو، ئەمجارە لەبەر هۆکاری ئەوەی کەدەنگۆیەك بلاًودەکرایەوە کەلەناو کابینەی نوێی مەلیك فارۆق جگە لەئیسماعیل شیرین، حەسەن سیری

عامر بەشداری لەکابینە دەکات پیاوێکبوو حەوت ئەفسەری ئازادیخوازی دەناسین‌و هەڕەشەی دەکرد کەنەخشەی کودەتا بۆمەلیك فارۆق باسدەکات. ناسر بۆئەنوەر باسدەکات:((پێش ئەوەی حەسەن سیری عامر ئێمە بکاتە خواردنی ئێوارەی خۆی ئێمە دەکەین بەخواردنی نیوەڕۆی خۆمان.)) ئەفسەرانی ئازاد لەناکاو کەوتبوونە ناومەترسییەکی کاتەوە. ئەگەر ئاشکرا دەبوون، شۆڕش پێش ئەوەی دەست پێی بکات تێکدەشکاو ئەوانەی دەستیان لەم شۆڕش دەبوو هەموویان بەمەرگ تاوانبار دەکران. ئەگەر کودەتا پێش دەخراو تێك دەشکا دیسان گیانی ئەم ئەفسەرانە لەمەترسیدابوو. کاتێك کەمن هەموو شتێکی ئەنوەرم قبووڵ دەکردو دەمخوارد ئەنوەر زۆر بەباشی دەیزانی لەوانەیە ئەمەیان جاری کۆتایی بێت یەکتر دەبینین. چونکە ئەنوەر زۆرباش ئاگاداری مەترسییەکانی پێشەوە بوو، دەیویست بیرەوەرییەکی تایبەت لەم شەوەی کۆتایی بۆم بەیادەوری بمێنێتەوە. نزیکی نیوە شەو کەبۆماڵی دایك‌و باوکم گەڕاینەوە، خزمەتکار رووی لەمن کردو گوتی:((هاوسەرت لەچ شوێنەکە؟))

گوتم:((ئۆتۆمبێل دەباتە ناو گەراج؟))

یادداشتێکی دایە دەستم‌و گوتی:((پیاوێك دووبارە بەدوایدا دەگەڕا بۆجاری کۆتایی ئەم نامەیەی دایە دەستم.))

کاتێك دەڕۆیشتمە نهۆمی سەرەوە جلوبەرگەکانی خۆم هەڵگرم‌و بگەڕێنەوە بۆماڵی خۆمان، یادداشتەکەم دایە دەستی ئەنوەر، بەبینینی ڕەنگ‌و روخساری گۆڕا.

بەپەلە رۆیشت‌و گوتی:((دەبێت هەرئێستا برۆم.))

بەدوایدا بۆژوورەکەمان رۆیشتم. بەپەلە هەندێك جلوبەرگی هاوینەو سەربازی خۆی دەپۆشین.

پرسیم:((بەم درەنگانەی شەو بۆچ شوێنەك دەڕۆیت؟))

((هەلومەرجی یەکێك لەهاوڕێیانم زۆرخرابە دەبێت بڕۆم.))

((بەجلوبەرگی سەربازی؟))

دەستبەجێ گوتی:((ئەگەر بمانەوێت بگەێنین بەنەخوشخانە یان ناچاربین بەم کاتە دەرمانی بۆ بیدۆزینەوە بەم جلوبەرگانە کارەکان ئاسانتر دەبن.)) ماچیکردم‌و بەپەلە رۆیشت. بەدەنگی بەرز گوتم:((ئەنوەر ئەگەر بکەویتە گرتووخانە سەردانت ناکەم.)) لەجێی خۆی وەستا. بەچاوەکانی ڕەشی تەماشای کردم‌و بەدەنگێکی دوور لەگاڵتە گوتی:((جیهان چیت گوت؟))

پێکەنیم، نەمدەزانی چیم گوت. بەڵام شتێك لەدەروونیدا هەبوو کەپێکەنینی بریم. زۆرباشم دەناسی. زۆرجار دەمتوانی پێکەوە پێبکەنین‌و گاڵتە بکەین، بەڵام هەندێکجار نابێت هیچ قسەو گاڵتەیەکم کردبا، ئەمەیان یەکێك لەهەمان ساتەکانبوو. لەدیدی ئەنوەر هەستم پێدەکرد کەلەهەمان شوێنی وەستابوو تاکو دەرونم کاریگەری خۆی دەکرد. لەبیستنی وشەکان‌و دەنگی گیراوی.

بەنەرمی گوتم:((بەئەمانەتی خودا ئەنوەر.)) رۆیشت.

لەتەواوی شەودا چاوەڕێی هاتنەوەم دەکرد، یان تەلەفۆن بکات، هیچ هەواڵێکی نەبوو. باوکم بۆ ئاگاربوون لەئەنوەر نەخەوتبوو، بەردەوام دەیگوت:((هەموو نەگەڕانەوەیەك بیانووی خۆی هەیە.))

کاتژمێر شەش‌و چل‌و پێنج خولەکی بەیانی دەنگی تەلەفۆن دەهات. چونکە خەیاڵم ئاسوودەبوو دەنگی ئەنوەربوو زۆربەخێرایی خۆم تووڕەکردو گوتم:((لەچ شوێنێکی؟ شەو لەچ شوێنێك بوویت؟))

گوتی:((گوێی لەرادیو بگرە، جیهان خۆت هەمووشتێك دەزانی.)) جارێکیتر شتێکی گەورەتر و گرنگتر لەگومان لەدەنگیدا هەبوو.

پرسیم:((حاڵت باشە؟))

گوتی:((زۆر زۆرباش.))

گوتم:((خودا پشتیوانت بێت لەهەرکارێك کەدەکەیت‌و سەرکەوتوو بیت.))

دەستەبەجێ رادیوم کردەوە، بەڵام بەرنامەکانی ئاسایی نەبوون، شێخێك قورئانی دەخوێندەوە. چ هەواڵێك هەیە؟ دواتر لەناکاو، کاتژمێر حەوت‌و سی خولەکی بەیانی، من‌و تەواوی خەڵکی میسر دەنگی ئەنوەرمان بیست کە راگەیاندنی ئەفسەرانی ئازادی دەخوێندەوە:

((میسر، لەم ساڵانەدا لەبەرگیرۆدە بوونی بەبەرتیل خۆری دژی گەندەڵی، سەردەمێکی دژواری لەمێژووی خۆی تێپەڕ دەکرد. هۆکارەکانی گەندەڵی‌و تێکشکانی ئێمەبوون لەشەڕی فەلەستین. بۆیە ئێمە هەوڵدانی خۆمانکرد بۆخاوێنکردنەوە. ئێستا سوپا لەژێر دەستی کەسانێکدایە دەتوانن بەتوانایی‌و شەرافەت‌و کەرامەت‌و وڵات پەرستی‌و پارێزیان بەتەواوی باوەڕ بکەن.))

نەهیچ قسەیەکی لەکودەتا کرد لەوشەیەك لەسەر مەلیك فارۆق. لەدەستپێکی شۆڕش هیچ قسەیەك لەسەر لادانی مەلیك فارۆق نەدەکرا. هیچ قسەیەك لەسەر گۆڕانکاری وڵات نەبوو.

كاتێك بۆبینینی هاوڕێی منداڵیم ئولا رۆیشتم بۆسەر شەقام، نەمدەزانی تاكو سێ ڕۆژیتر ناتوانم گوێبیستنی دەنگی ئەنوەریم.

دورگەی ڕۆزە، لەبەیانی ڕۆژی بیستو سی تەمووز هیچ نیشانەیەك لەشتێكی جیاواز بەتەواوی ئارامو وەك خۆیبوو، بەڵام كچی مامی ئولا، كەبڕیاربوو بێتەلامان، هەواڵێكی مەترسیداری بەئێمەدا. بەتەلەفۆن پەیوەندیكردو گوتی ناتوانم بیم بۆلاتان، چونكە تانكەكانی سوپاو سەربازەكان هەموو كولانەكانی ناوەندی شارەیان گرتووە، هەموو رێگاكان داخراون. تانك؟ سەربازەكان لەسەر شەقامەكان؟ تاكو هەمان كات هیچ كاتێك شتێكی لەم جۆرەم نەبینیبوو، ترسانم سات بەسات زیاتر دەبوو. ئەنوەر دەبێت لەچ شوێنێك بێت؟ ئایا مەلیك فارۆق ئەنوەری گرتووە؟ ئایا سوپا دەستی بەسەر مەلێك فارۆق داگرتووە؟

بەخێرایی بۆماڵی دایكو باوكم گەڕامەوە، باوكم بینی زووتر لەجاران گەرابۆوە ماڵی خۆی. گوتی لەگەڵ هاوكارانی لەوەزارەتو هیچ شتێك زیاتر لەم خەڵكانە نازانن، تەنیا دەزانن كەچاكسازییەك لەناو سوپا روویداوە.

بەنیگەرانی پرسیم:((واتە مەلیك فارۆق وەك خۆی لەسەر دەسەڵات ماوە؟))

وەڵامی دایەوە:((جیهان نازانم، لەوانەیە. كێی دەزانێت؟))

باوكم هیچ جیاوازییەكی لەگەڵ میسرییەكان نەبوو. ژمارەی كەسانێك كەلەلایەنی روحی ئامادەیی شۆڕشیان هەبێت زۆر كەمبوون. زیاتر لەهەزارو چوارسەد سال تەنیا بێگانەكان فەرمانڕەوایی ئێمەبوون بەهەرناوێكی وەك شاو خەلیفەو خەدیوو سوڵتانو ئیمپراتۆر، میسر كەوتبوو ژێردەستی هیكوسەكان، پارسەكان، یونانیو رۆمییەكان، لەسەدەی حەوتی زایینی عەرەبەكان داگیریان كرد ئایینی ئیسلام میراسی ئەوانبوو. لەسەدەی دوانزدەم تاكو شانزدەم زایینی لەژێر دەسەڵاتی سوپای فاتمییەكانو ئەیوبیو عوسمانییەكانبوو. لەساڵی ١٧٩٨ ناپلئون لەشكری خۆی هێنایە سەرمیسر. لەساڵی ١٨٨٢ لەژێر دەستی بریتانیابوو. جێگای سەرسوڕمان نەبوو كەمانای شۆڕش یان ئۆتۆنۆمی، بۆئێمە شتێكی نوێو ترسێنەربوو. لەدەستپێك، لەبنەڕەتەوە هەزمی شۆڕشكردن بۆمیسرییەكان ئاسان نەبوو.

دواتر زانیم هەزمكردنی ئەم بابەتە بۆخۆدی یازدە رێبەری شۆڕش كەمتر لەخەڵكانیتری ئاسایی نەبووە. شۆڕشگێڕەكان دوای گرتنی فرۆكەخانە، ناوەندی رادیو، شەقامەكانی سەرەكیو پردەكانو شوێنەگرنگەكانی ناوەندی شار لەلایەن هێزی پیادەو تانكەكان بۆدروستكردنی

حکومەتو بڕیاری دروست لەسەر جوانترین شێوەی هەڵسوکەوتن کردن لەگەڵ مەلیك فارۆق، کەلەئەسکەندەرییە بەسەری دەبرد، پێویستیان بەسێ ڕۆژ کاتی زیاتر هەبوو. چەند کەسێك دەیانوویست بکوژن، دوو سێ کەس دەیانگوت دەبێت دووربخرێتەوە، چەند کەسێك پێداگریان دەکرێت کەدەبێت لەقاهیرە بمێنێتەوەو ناچار بکرێت کابینەی نوێی حکومەت دروست بکاتەوە. بەلأم دیسان چەند کەسێك لەوانە ئەنوەر، دەیانوویست ڕێکەوتن بکرێتو هیچ خوێن ڕێژییەك روونەداتو مەلیك بەمەیلو ویستی خۆی دەست لەدەسەلأت هەڵگرێت. ئەنوەر دواتر بۆی باسکردم:((ئەگەر خوێن ڕێشتنی یەکتر دەستی پێدەکرد کۆتایی نەدەهات.))

لەهەمان سێ ڕۆژ کەئێمە لەدوورگەی ڕۆزە لەقاهیرە بووین نەهیچ تانکێکمان بینی نەسەربازێك، گوێبیستی دەبووین کەلەناوەندی شار جێگیرکراون سەردانی هەرشوێنەك دەکرا وەك دوکان، قاوەخانە، ماڵەکان، خەڵك چاوەڕێی دەنگوباسی نوێیان دەکرد لەتەنیشت رادیو دانیشتبوون. خەڵك بۆوەرگرتنی چەند زانیارییەك چەندین کاتژمێر بەتەلەفۆن پەیوەندیان دەکرد. جاران شەقامەکان پڕ لەئۆتۆمبێل بوو بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر چۆڵو بێدەنگبوون وەك دیاربوو لەکەشو هەوای گەرمی هاوین پڕاوپڕە لەکێشمەکێش. هیچ کەسێك، لەوانە من، هیچم نەدەزانی. بەتێپەڕبوونی ڕۆژەکان زیاتر هیوادار دەبووم کەسوپا ولأت لەدەستی مەلیك فارۆق ڕزگار دەکات. بەلأم دیسان زیاتر دەترسام کەئیتر هیچ کاتێك هاوسەری خۆم نەبینم. سەربازانی مەلیك فارۆقو بریتانیا هەمووساتێك چاوەڕێی دەکرا بگیرێتو بکوژرێت.

ئەمەیان ترسێکبوو بەردەوام لەناو مێشكو بیرمدا خۆی دەجولأند. گیانی ئەنوەر لە مەترسیدایە... دەکوژرێت... ئیتر بۆماڵ ناگەڕێتەوە. بەلأم هیچ کاتێك لەسەردەمی خۆدی شۆڕش هەستی راستەقینەی خۆم باس نەدەکرد. ترسانی من تەنیا بۆخۆم بوو. لەتەمەنی هەژدە سالأن، فێربووم کەهەمووشتێك لەدڵی خۆمدا بیپارێزم، نەمدەویست دەوروبەر لەدەردی خۆم ئاگادار بکەم، نەمدەویست دڵ تەنگیان بکەم. کەسانێك بۆ وەرگرتنی زانیاری پەیوەندیان بەمنەوە دەکرد تەنیا دەمگوت:((من هیچ نازانم ئەوەی کەدەزانم ئەوەیە دەزانم لەهەمان ڕۆژ ئەنوەر سەردانی رادیویی قاهیرەی کردو بەتەلەفۆن پەیوەندی کرد گوتی گوێی لەرادیو بگرن. شتێك زیاتر لەئێوە نازانم.))

قسەی زۆر لەناو خەڵك بلأودەبوونەوە، هەندێکیان دروستبوون، بۆرێگەگرتن لەهەلأتنی مەلیك فارۆق هێزی وەفاداری شۆڕش ڕەوانەی کاخەکانی جۆراوجۆر دەکران، هێزەکانی وەفادار

بەشۆڕش کۆشکی (راس التین) لەئەسکەندەرییە لەکاتژمێر شەشی بەیانی رۆژی بیستو پێنجی تەمووز، سێیەم رۆژی شۆڕش. دەوریان دابوو. تەقە لەنێوان هێزی تایبەتی مەلیک فارۆقو هێزەکانی شۆڕش دەستی پێکرد، بەڵام مەلیک فارۆق بڕیار بۆهێزەکانی تایبەتی دەردەکات تەقە نەکەنو دەرگاکانی کاخ قوفڵ بکەن. فارۆق دەترسا بەدەستی هێزی تایبەتی خۆی بکوژرێت، داوای لەبالیوزی ئەمەریکا کرد هاوکاری بکەن. بالیوز دەیزانی نەبوونی خۆشەویستی مەلیک فارۆق لەناو خەڵکدا تاکو چ رادەیەك نەماوەو دەترسا هێزەکانی شۆڕشگێر دژی خۆی هانبدات، تەنیا سکرتێری تایبەتی خۆی رەوانەی لای مەلیک فارۆق کرد. من نەمدەزانی ئەنوەر هاورا لەگەڵ دوو شۆڕشگێریتر جەمال سالمو محەممەد نەجیب لەرۆژی بیستو شەشی تەمووز لە ئەسکەندەرییەن. ئەمانە پەیامیان بۆ فارۆق بردبوو ئەگەر تاکو کاتژمێر شەشی ئێوارە لەولاتی میسر نەچێتە دەرەوە، ئەفسەرانی ئازاد بەرپرسی هیچ رووداوێك نەدەبوون. مەلیك فارۆق لەماوەی پێنج خولەك ئەم دەرفەتەی قبوولکرد. ئەوەندە لەگیانی خۆی دەترسا لەکاتی واژۆکردنی دەست لەکارکێشانەوەو دەسەلات رادەستکردنی بۆکوڕی شیرخۆرو جێگرەوەی، ئەحمەد فوئاد، دەستی دەلەرزینو ناوی خۆی بەهەڵە دەنووسێت. دووبارە کرایەوە. بۆ زۆرکەس هەڵەی فارۆق لەنووسینی ناوی مانایەکی نیشتمانی پەیداکردبوو: فارۆق نەیدەزانی ناوی خۆی بەعەرەبی بنووسێت، ئەمەیان نیشاندەدات فارۆق کەسێکی تەواو بێگانەبوو بەولاتی خۆی.

دواتر جەمال سالمو محەممەد نەجیب رۆیشتن بۆئامادەکردنی کەشتی پاشایەتیو رۆیشتنی مەلیک فارۆق بۆدەرەوەی ولات. ئەنوەر بڕیارێك بۆ هێزی ئاسمانیو هێزی دەریایی دەردەکات کاتێك مەلیک فارۆق لەئاوەکانی میسر دەربازبوو سلاوی فەرمی بۆبکەن. ئەمەیان نیشانەی رێزگرتنو جۆرێك لەپاراستنی مەلیک فارۆق هەژمار دەکرا. چونکە بەشێك لەهێزەکانی دەریایی رایانگەیاند تەقە لەکەشتی مەلیک فارۆق دەکەن. ئەنوەرو شۆڕشگێرەکان نەیاندەویست هیچ خوێن رێشتنێك رووبدات، ئەم نەخشەیە زۆر کاریگەربوو. کاتژمێر شەشی ئێوارە کەشتی رۆیشتو مەلیک فارۆقو شاژنی نوێ، نەریمانو شازادەی شیرخۆری بەرەو دەرەوەی ولات بردن. لەهەمان کات ئەنوەرو جەمال سالم لەسەر کەشتییەکی سەربازی هێزی دەریایی میسر تەماشاو چاودێری رۆیشتنی کەشتی مەلیک فارۆق دەکەن، بیستنی دەنگی بیستو یەك تۆپ بۆرێزگرتنی مەلیک فارۆق کەناراوەکان دەلەرزێنێت. شۆڕش گەیشتبوو کۆتایی قۆناخی خۆی.

ئێمە لەقاهیرەی بچوکترین هەواڵمان لەم رووداوانە نەبوو کەلەئەسکەندرییە روویان دەدا. کاتێك هەواڵی رۆیشتنی مەلیك فارۆق لەرادیو بڵاوکرایەوە، من بیستم. کاتی بڵاوبوونەوەی ئەم هەواڵە من لەرێگا دابووم بۆ لای پزیشکی ددان. ئێوارەی رۆژی ٢٦ تەمووز کاتێك گەیشتمە لای پزیشك، لەئەفسەرانی سوپابوو، بانگی کردمو گوتی: ((خاتوو سادات فەرموون بۆ ژوورەوە.))

تەماشای ئەوانیترم کرد کەپێشتر سەردانیان کردبوو چاوەڕیی نۆرەی خۆیانبوون. بڕێك بەگێژاوی گوتم نابێت چاوەڕێی بکەم تاکو نۆرەم دەگات؟))

گوتی خاتوو سادات نەدبیستووە، سوپا مەلیك فارۆقی لەوڵات دەرکردووە. تەواوبوو. ئێستا هاوسەرت لەرێبەرانی میسر هەژمار دەکرێ.))

سەرم سوڕمابوو، هەموو دەنگۆکانو چەند هەواڵێك کەلەرادیو بڵاو دەکرانەوە بەراستی شۆڕش لەمیسر دەستی پێکردبوو. نەمدەزانی چی بکەم لەنێوان گریانو پێکەنین. مەلیك فارۆق رۆیشتبوو. ئەمەیان بێ وێنەبوو. بەڵام ئینگلیزەکان چیان دەکرد؟ ئایا بەهەمان هێزی گەورەی خۆیان لەمیسر دەوەستانو پاشەکشەیان بەهێزەکان دەکرد؟ بۆ ئەنوەر چی روویدەدا؟ نەمدەتوانی ئەم ساتانە لەلای پزیشکی ددان تێپەڕ بکەم. بەرەو شەقام رۆیشتم بینیم هەلومەرج بەتەواوی گۆڕاوە، شەقامەکانی خاڵی وەك خۆیان قەڵەباڵغی بۆدەگەڕایەوە. پڕبوو لەخەڵك کەسەمایان دەکرد. قاوەخانی خاڵی ئێستا پڕو لەیەکتر کۆبیوونەوە دەنگی رادیویان بەرز دەکردەوە. کەش‌و هەوا پڕ لەدەنگو هەرابوو. خاوەنی یەکێك لەقاوخانەکان هاواری دەکرد:((ئەمڕۆ هەرچییەك دەیخۆنەوە بێبەرامبەر دەتوانە بیخۆنەوە.))

گەڕامەوە بۆماڵەوە لەتەنیشتیان گویمان لەرادیو دەگرت. هەستم تێکەڵاوبوو لەگەڵ ترس، نەك تەنیا لەبەر ئەنوەر، لەبەر نیگەرانی تووڕەبوونی باوکم. داوام لێکرد: ((لەبەر شکاندنی بەڵێنی خۆت تووڕە نەکەیت.)) باوکم زیاتر گوێبیستی هەواڵەکانی رادیو بوو. ئەوکات تەنیا بیرکردنەوەم هاوسەرم بوو. لەچ شوێنێك بوو؟

رۆژی دواتر، کاتێك ئەنوەر ماندوو بەڵام خوشحاڵ گەڕایەوە، نەمتوانی رێگری لەفرمێسکەکانم بکەم. گوتی خێراکە، حەمامێکی گەرم، خواردنێکی گەرمو دەستەیەك جلوبەرگی خزمەت.))

بەخێرایی لەکاتی جێبەجێکردنی فەرمانەکانی پرسیاری زۆرم لێدەکردن وەك باران بەسەرمدا دادەباراند، بەردوام پرسیارم دەکرد:((لەچ شوێنێك بوویت؟ چی بووە؟))

گوتی:((دواتر جیهان دواتر)) لەکاتی نانخواردن تەواوی رووداوەکانی کەروویدابوون بۆ هەموو ئەندامانی ماڵەوەی باسکردن.

ئەنوەر، لەکاتی نانخواردن، پێش ئەوەی برۆتە دەرەوەو بەشداری لەکۆبوونەوەی لەگەڵ ناسر بکات گوتی:((ئێستا میسر وڵاتی هەموو میسرییەکانە، نەك تەنیا کەمینەیەکی دەوڵەمەند. لەئێستا بەدواوە شاکان ناتوانن بەزۆری کرێکاران ناچار بەهەڵکەندنی تۆکەندو کاخەکان بکەن، یان دارایی وڵات خەرجی لایەنێك بکەن کەتەنیا بەرژەوەندی خۆیان تێدابێت. کەسانێك کەبەساڵان لەسەر زەوییەکی کشتوکاڵی کارکردبێت دەبێت هەمان زەوی بەهەمان کرێکار بدرێت. لەکۆتایدا بریتانییەکان ناچار دەبن رێگا بدەن خۆمان بەسەرخۆمانەوە حکومەت بکەین.))

نەمدەتوانی چاوەکانم لەسەر ئەنوەر وەرگێرم، لەقسەکانی تێر نەدەبووم، هیوای بۆمیسر دەبوو بەراستی. هیوای من بۆمیسر دەبوو راستی. دایکم خوشحاڵبوو چونکە تەواوی ئازیزانی دڵی میسریبوون. لەهەمان کات کەبەدەوری مێز دانیشتبووین، وردە وردە هەستم بەتێگەیشتن لەم رووداوەی راستەقین دەکرد کەبۆ یەکەمجار لەداگیرکاری میسر بەدەستی ئێرانییەکان لە ٥٢٢ پێش زایین، میسریان خۆیان فەرمانڕەوایی میسر دەکەن، هاوسەرم ئەنوەر سادات، یەکێك لەوکەسانە دەبوو کەمن وەك ئەرکی هاوسەری دەبێت لەتەنیشتی راوەستم، لەهەموو هەلومەرجێك کەلەوڵاتی ئێمە روویدات. لەپێش بینییەکانی فالگەر سەرم سوڕمابوو، هیوام دەکرد خوزگە ئامادەیی تەواوم دەبوو بۆپەسەندکردنی بەرپرسیارەتی کەلەپێشم دایە. دوو رۆژیتر ساڵرۆژی لەدایکبوونی من بوو. دەبووم بەنۆزدە ساڵان.




## بەشی پێنجەم

## سەردەمی عەبدولناسر

((ئایا تەواوی زەوییەکانی تایبەت خۆماڵی دەکرێن؟))

((ئایا وڵات دەبێتە کۆمۆنیزم؟))

((ئایا راستە دەبێت بیانییەکان بڕۆنەدەرەوە؟))

دوای شۆڕش بۆهەرشوێنێك دەڕۆیشتین، هاوڕێیان، ئەندازیاران، پزیشکان، دادوەران، مامۆستایانی زانکۆ، خاوەن زەوییەکان، بەردەوام ئەم پرسیارە لەئەنوەر دەکراو مانای راستەقینەی یاساکانی نوێ کەئەنجوومەنی فەرماندەی شۆڕش دەریکردبوو لەئەنوەر ئاگاداری دەبوون. هیچ کەسێك نەیدەزانی بڕیارە چ روودەدات. هەموویان سەرلێشێواوبوون.

شەوانە بەدوای یەك لەلایەن هاوڕێیان بۆنانخواردن بانگێشت دەکراین‌و بەردەوام چاوەڕێی ئەوەیان دەکرد بزانن شۆڕش لەگەڵ ئەمانە چ دەکات. ئەنوەر بەردەوام درەنگانی شەو دەگەڕایەوە. بەیانی زوو بۆ بەشداریکردن لەکۆبوونەوەی ئەنجوومەنی باڵای شۆڕش دەڕۆیشت، بەردەوام دەیگوت:((چاوەڕێی من نەمێننەوە، بڕۆ، بۆخواردنی ئێوارە خۆم چارەسەر دەکەم.)) تاکو نیوەشەو چاوەڕێی دەماینەوە بەڵام هیچ هەواڵێك لەئەنوەر نەدەبوو، بەردەوام نیگەران دەبووم. نەمدەزانی چی روودەدات. بەڵام وەك هاوسەری یەکێك لەئەفسەرانی سەرانی شۆڕش نەمدەتوانی خۆم نیگەران نیشانبدەم. بەنەرمی بۆمیوانەکانم باسدەکرد:((لەوانەیە هەرئێستا بگات.)) کاتێك دەگەڕایەوە بوێری ئەوەم نەبوو ئاسوودەی خەیاڵم نیشانبدەم. دەستبەجێ

پرسیارەکان دەستیان پێدەکرد:((ئایا حکومەت کارگەکان دەکاتە نیشتیمانی؟))، ((راستە خوێندن بێبەرامبەر دەبێت؟))

پرسیارەکان هەمووی لەشوێنی خۆیانبوون، چونکە میسر هەنگاوی هەڵدەگرت بۆ قۆناخی گۆڕانکاریی ریشەیی کۆمەڵایەتی. گۆڕانکارییەکانی کەروویاندابوون لەپێکهاتەی ژیانی میسرییەکان لەبیست ساڵ دوای شۆڕش زیاتربوو لەگۆڕانکارییەکانی چواردە سەدە. گۆڕانکارییەکانی کەدواتر دەستیان پێکرد. دوومانگ دوای شۆڕش یاسای چاکسازیی زەوییەکانی کشتوکاڵی پەسەندکراو موڵکی کەسانی خاوەن زەویی زۆر لەسەرتاسەری میسر لەنێوان جوتیاران دابەشکراو خرایە سەرناویان. دوای هەمان بڕیار هیچ کەسێکی خاوەن موڵك نەیدەتوانی بەتەنیایی زیاتر لەسەد هێکتار زەوی خۆی هەبێت بەڵام دوای نۆساڵ کرایە پەنجا هێکتار. پێش شۆڕش، هەشت ملیون جوتیار خاوەنی زەویی خۆیان نەبوون. دواتر دوو هێکتار بۆهەرجوتیارێك تەرخان دەکراو لەبەرامبەردا پسولەیەك دەدرایە خاوەنی پێشووی کەجوتیار وەردە وردە هەندێك لەپارەی داهاتی بۆبگەڕێنێتەوە تاکو ماوەیەك. دەدرایە خاوەنی سەرەکی. سی هەزار هێکتار موڵکی تایبەتی بنەماڵەی دەسەلاتبوو، واتە ١٠٪ هەموو موڵکی کشتوکاڵی هەموو میسر، بەبێ بەرامبەر دابەشکرا.

باوکمو خوشکمو براکانی چوارساڵ پێشتر زەوییەکانی کشتوکاڵی خۆیان فرۆشتبوون، ئەم یاسایە ئەوانی نەدەگرتەوە. یەکەم کەس دەبوون کەئەم یاسایە بگرێتەوە. بەرفراوانی زەوییەکانی کەسانی خاوەن زەویی زۆر بۆ زیاتر رازیبوونی بیری جوتیاران زۆر کەمکرایەوە. بەدرێژایی سی ساڵ حکومەتو پەرلەمان هیچ هەوڵدانێك بەسوودی جوتیار نەکرابوو. دەرهاوردەی زۆر لەجوتیاران تەنیا پێنج لیرەی میسرییبوو، بەڵام دەرهاوردەی خاوەن زەوییەکانی کەئەم جوتیارانە لەسەریان کار دەکرد، بەوەرگرتنی ٨٠٪ بەرهەم بۆخۆی، رۆژ بەرۆژ دەوڵەمەندتر دەبوون. پەسەندکردنی یاسایی نوێی زەوییەکانی کشتوکاڵی سەرتاسەری گەورەترین خواستی دڵو دەرونی جوتیارانو ئەفسەرانی فەرماندەیی شۆڕشبوو. زۆر لەشۆڕشگێڕەکان لەناو دڵی گوندییەکانی جوتیار سەریان هەڵدابوو، بەچاوی خۆیان هەموو نایەکسانیان لەخاوەن موڵکەکان بینیبوو، ئابووری کشتوکاڵ بنەمای ژیانی ئێمەبوو. ئەندامانی ئەنجوومەنی فەرماندەی شۆڕش پێداگریان دەکرد کەخۆیان لەبەندی((بەرپرسانی پێشوو)) کەبەناعەداڵەتی ئەم هەمووساڵانە فەرمانڕەوایی میسریان بەدەست گرتبوو، رزگار بکەن.

من خێزانێکم دەناسی خاوەنی هەزاران هێکتار زەوی کشتوکاڵی بوون لەدڵتای میسر. دوای کۆکردنەوەی بەرهەمی پەموو، بۆگواستنەوەی پارە بۆبانك چەندین پاسەوانیان دابین دەکردن. لەکاتێکدا هەموو ئەم کاروبارانە بەدەستی جوتیارکراوە کێلان، چاندن، ئاودان، کۆکردنەوەی بەرهەم. بەچاوی خۆیان گواستنەوەی کیسەکانی پارەیان بەئۆتۆمبێل دەبینی، بۆچی خاوەن موڵك بەشێکی بچووکی لەم دارایە زۆرەی لەنێوان ئەم جوتیارانەی دابەش نەدەکرد کەبەردەوام لەسەر ئەم زەویانە کاریان کردبوو؟ لەوڵاتێکی زۆرینە هەژار، بەراستی ئەمەیان مافخواردنبوو.

خێزانێکیتری میسری خاوەن هەزاران هێکتار زەویی کشتوکاڵی لەبەر میوانداریيەکانی گەورە لەمیسر ناوبانگێکی تایبەتیان هەبوو، لەجیاتی ئەوەی پاشماوەی خواردنی خۆیان بەکەسانێکی وەك گوندیانی هەژارو خزمەتکارانی خۆیان بدەن ئەم خێزانە بڕیاری دەدا چاڵێکی گەورە هەڵکەنن خواردنەکان لەناوی بکەن‌و دووبارە بەخاك‌و خوڵ سەری داپۆشن. بەبیروباوەڕیان ئەگەر خزمەتکارو جوتیاران تامی ئەم خواردنانە بکەن چێژیان دەگۆڕێت داوای زیاتر دەکەن‌و لەگەڵ ئێمە خراپ دەبن. باشترین ڕێگا ئەوەیە پاشماوەو زیادەی خواردنەکانی میوانداريیەکان بشاردرێتەوە تاکو جوتیاران‌و هەژاران هەمان نانی وشك‌و پەنیرو سەوزایی کەپێی ڕاهاتوون بخۆن. ئەم جۆرە دیدگایە زۆر زاڵمانەبوو دەبێت بەکۆتایی بێت.

جگە لەم چاکسازیە، چاکسازی زۆر خێرا دەخرانە واری جێبەجێکردن. دروستکردنی ناوەندی هەرەوەزی حکومەت بۆدابەشکردنی قەرزی کشتوکاڵ لەناوچەکانی گوندنشین بەجۆرێك کەبتوانن دەرهاوردەیەکی مام ناوەندیان هەبێت دروستکرا. کاتژمێری کاری جوتیاران‌و کرێکارانی کارگەکان کەم کرایەوەو بەکرێ وەرگرتنی زەوی کشتوکاڵی پەسەندکرا. لەگوندەکان نەخۆشخانەی نوێ‌و پزیشکی حکومی کرانەوە. خوێندنی ناچاری بۆهەموو منداڵەکان کوڕو کچ، لەگوندەکان، ژمارەی قوتابخانە کەلەساڵێکدا دروستکران زیاتربوو لەکاری بیست ساڵی ڕابردوو. زانکۆکان سەردەمانێك تەنیا شوێنی چینی دەست بژاردەو دەوڵەمەندبوو بۆ هەموو چینەکانی میسر ئازادکرا. بۆهەرکەسێك کەخوێندنی زانکۆی تەواو دەکرد دەیتوانی ببێتە فەرمانبەری حکومەت. بەروحی نوێی یەکسانخوازیی، نیقابی کۆنی تورکی، لەوانە پاشاو بەگو ئەفەندی هەڵوەشانەوەو شەپۆلی شادی بۆکۆمەڵگە دەگەڕایەوە. دەسەڵاتی پێشتر ئەوەندە چینایەتیبوو، خۆبەڕێوەبردن‌و هەڵگرتنی تاکو ڕادەیەك دەستبەجێ ڕژێمی پێشوو، ئومێدی ڕووداوەکانی ئایندەبوو.

دوای گەڕان بەدوای چوار كۆشكی فارۆق، چاوەڕوانی دەرۆیشتنە سەرەوە، نیشانیدا ڕێژەی دارایی تەنیا مەلیك فارۆق دەگەیشتە نەرخی هەژاربوونی خەڵكی میسر، زیاتر لەژمارەیەك بوو كەگومانت بۆهەبێت. كاتێك كەمەلیك فارۆق لەئەسكەندەرییە رۆیشت سەدان چانتای لەگەڵ خۆیدابردن، بەڵام لەناو چوارسەد ژووری كۆشكی قۆبە كەلوپەلی زۆر بەنەرخی بەجێمابوون شارەزایانی بیانی پێشانگای ساتبی، بەناوبانگترین پێشانگای حەراجكردنی كەلوپەلی بەنەرخ‌و كۆنە لەلەندەن، بەفرۆكە گەیشتنە میسر تاكو پێش حەراجكردن نرخەكانیان دیاری بكەن كولیكسیۆنی سكەو میداڵیاكانی زێڕی زیاتر لەهەشتا پارچە دەبوون. كولیكسیۆن ئەندازەی گیرەی بەردی زۆربەیان وەك زێر دەبینران لەجۆری خۆیان گەورەترین كۆمەڵەبوون لەتەواوی جیهاندا. لەهەموو ژوورەكان شتێكی زێر دروستكرابوو، لەوانە شوێنی شوشەی زێر بۆدانانی شوشەی كوكا كولا كەدروستكراوی فاربرژ، زێنگری بەناوبانگی رووسیابوو.
لەگەنی گەورەی حەمامی مەلیك فارۆق كەلەرۆژئاوی كۆشك بەمەڕمەڕی سەوزی یەكپارچە دروستكرابوو، جلوبەرگەكانی دەگەیشتن بەسەد دەستەی جلوبەرك. لەسەر تایبەتمەندی لایەنی ئەخلاقی دەنگۆی زۆر بڵاودەكرایەوە كەلەشوێنی حەوانەوەی تایبەتی مەلیك فارۆق كلیلی پەنجا خانوو لەناو قاهیرە بەدیوارەوەی هەڵواسیبوون‌و هەریەك لەم كلیلانە ناوی ئافرەتێكی جوانی لەسەربوو. لەهەموو شوێنێك بەڵگەیەك لەكارەكانی نائەخلاقی‌و بەرچاو دەكەوت، ژووری یاری كاغەزییەكان‌و قوماركردن، جۆری پیكەرەكانی مەڕمەڕی، تابلۆكان، كاتژمێرەكان، وێنەی سەر سندووقەكانی مۆزیك.
بۆخەڵكی میسر، كارەكانی نائەخلاقی‌و تەماحكاری مەلیك فارۆق بەراستی خەمباربوو. بەڵام دواتر پارەی كۆكراوە لەحەراجكردنی كەلوپەلەكانی مەلیك فارۆق بۆهەندێك كەسی هەژار خەرجكرا كەزۆر پێویستی دەكرد. لەكۆكردنەوەو دەست بەسەرداگرتنی موڵك‌وماڵی خێزانی مەلیك فارۆق گەیشتە حەفتا ملیون لیرەی میسری. حكومەت توانی بەم هەموو لیرەیە نەخۆشخانەو دەرمان‌و قوتابخانە لەگوندەكان دروست بكات. حكومەتی نوێ بۆدەركردنی بیانییەكان لەمیسر، دیاریكردنی كاتی دەركردنیان لەگەڵ بریتانیا كەوتنە گفتوگۆ، ئەمەیان لایەنێكبوو كەئەنوەر تەواوی تەمەنی كاری بۆكردبوو، ئەم رۆژانە خۆشترین رۆژەكانی ژیانی دەبوون. بەڵام بەپێچەوانە، لەبەر دروستبوونی كێشە لەناو ئەنجوومەنی شۆڕش بۆگەیشتن

بەدەسەلآت دروست دەبوو رۆژانە خەمبارتر دەبوو، بەتایبەتی لەسەرۆکی ئەنجوومەنی شۆڕش، محەممەد نەجیب.

ئەفسەرانی ئەنجوومەنی شۆڕش، لەبەر ئەوەی هەموویان گەنج بوون، بۆبەدەستهێنانی باوەڕی خەڵکو خۆیان محەممەد نەجیب تەمەنی لەهەموویان گەورەتربوو کرایە سەرۆکی ئەنجوومەنی شۆڕشو دواتر یەکەم سەرۆککۆماری نوێی میسر، بەلآم بەچەند هۆکارێك لەسەرەتاوە ئەنوەرو محەممەد نەجیب لەگەڵ یەکتر نەدەگونجان. پەیوەندی نێوان محەممەد نەجیبو جەمال عەبدولناسرو ئەندامانیتری ئەنجوومەنی شۆرش بەشێوەیەکی گشتی رۆژانە خرابتر دەبوو.، بەتایبەتی لەگەڵ ئەنوەر، لەرووی تەماحکارییو گومان لەیەکتر هەبوون خرابوو. گەیشتە شوێنێك کەدەنگۆی ئەوەی بلآودەکردەوە کەئەنوەر دەیەوێت خۆی ببێتە سەرۆککۆماری میسر. ئەنوەر دەیبینی ئەندامانی ئەنجوومەنی فەرماندەی شۆڕش لەجیاتی رێکخستنی سیاسەتی نوێی ئابووری، دیاریکردنی سیاسەتی نیودەوڵەتی میسرو پێشەوەبردنی چاکسازیی کۆمەلآیەتی لەولآتدا، زیاتری کاری خۆیان بۆ شەڕکردن لەگەڵ یەکتر تەرخان دەکەن، سەرەتا گیرۆدەی دڵگرانیو دواتر خەموکی زۆر دەهات. ئەوەی ئەنوەر تەمەنێك شەڕو فیداکاری بۆکردبوو ئەمەیان نەبوو.

لەم گیرۆدەبوونە من راکێشرامە ناو ناکۆکییەکانی نیوان ئەنوەرو محەممەد نەجیب. لەیەکێك لەگرنگترین جەژنەکانی هەمان سالی دژوار،، لەکاتێکدا جەماڵ عەبدولناسرو ئەنوەر رۆیشتبوون ماڵی خودا، دەنگی بەرزی ئاگادارکردنەوە ئۆتۆمبێلەکانی پۆلیس لەسەر شەقامو بەردەرگای ماڵی ئێمە دەهاتو لەلایەن قاهیرەوە دەهاتن. لەنیوانیاندا سەرۆککۆمار محەممەد نەجیب سواری ئۆتۆمبێلی درێژو سەرکراوەبوو. منو خەڵکانیتر لەپەنجەرەو ئەیوان تەماشای سەرۆککۆمارمان دەکرد گەیشتە بەردەرگای ماڵی ئێمەو وەستان، تاکو ئەوکات دەنگی ماتۆرسوارەکان دەهات.

نەجیب لەم شوێنە چ دەکات؟ وەك نەریت لەجەژن دوای نوێژی بەیانی خەڵك سەردانی یەکتریان دەکرد بەتایبەتی خزمو هاوڕێیانو جەژنە پیرۆزی لەیەکتر بکەن. بەلآم نەجیب دەیزانی ئەنوەر رۆیشتووە بۆ مەککە. بەئەنجامێك گەیشتم بەهەرشێوەیەك بێت سەرۆککۆمار بەهیوای خۆدەرخستن لەبەرامبەر هاوڕێیانی کەکێشەکانی نێوانیان ئەوەندە گرنگ نینو هاندانیان دژی ئەنوەر، رۆیشتووە بۆدیداری هاوسەری سادات.

دراوسێیەکان کەوتبوونە ژێر کاریگەری سەردانی سەرۆککۆمارو گرنگیدانی بەمن. بەلأم من بەهیچ شێوەیەك ئامادە نەبووم پێشوازی لەهیچ کەسێك بکەم لەماڵی خۆمدا. چونکە ژیانی بۆئەنوەر ئەوەندە تەنگەبەر کردبوو. بەخزمەتکاری خۆم راگەیاند:((برۆ خوارەوە بۆ سەرۆککۆمار باس بکە هیچ کەس لەماڵەوە نییەو تاکو چەند کاتژمێرێکیتر کەس ناگەڕێتەوە.)) کاتێك کاروانی محەممەد نەجیب گەڕانەوە بەرەو رووباری نیل رۆیشتن من بەئارامی هەناسەم هەڵمژی.

ئەنوەر زیاتر خەمباربوو. هەولێدا کێشەکان بۆماڵی ئێمە نەگوازێتەوە، ماڵی ئێمە دووربێت لەکێشەکانی رۆژانەی بەلأم نەیدەتوانی زۆرجار لەسەر سەرم هاواری دەکرد: ((جیهان دوکمەی ئەم کراسی کەوتەخوارەوە.)) من بەپەلە دەرۆیشتم داو دەرزیٚ بێنم.

((جیهان، شەوی رابردوو تاکو بەیانی خەوبەچاوانمدا نەهاتووە جێگای خەوتنم باش نەبوو ناتوانی باشتریان بکەیت؟))

رۆژێکیان گوتی:((جیهان ئەم ژوورە نزیکەی دوو رۆژ دەبێت خاوێن نەکراوەتەوە.))

((بەم شێوەیە نییە رۆژانە ژوورەکان خاوێن دەکرێنەوە.))

بەلأم بەردەوام بەدوای بیانوویەك دەگەڕا، لەسەر قسەی خۆی دەمایەوە:((دوو رۆژ پێشتر دەسماڵی خۆم لەم قوژبنە دانابوو، لەشوێنی خۆیەتی.))

((لەوانەیە دوای نانخواردن لەهەمان شوێنت دانابێت.))

کاتێك بینی گەیشتە قوناخێك دەستم بەگریانکرد، پەشیمان دەبوو:((راست دەکەیت جیهان، داوای لێبۆردن دەکەم.)) لەهەمان سەردەم قسەکانم زۆر گرنگو کاریگەر وەرنەدەگرتن، دەمزانی نارازیبوونی لەبەرمن نییە، لەناو ئەفسەرانی شۆڕشگێڕەکان سەرچاوەی دەگرت. زۆرجار دەبینرا تەكو تەنیا بەبیٚ ئەوەی کتێبێك بخوێنێتەوە یان چەند رستەیەك بنووسێت لەیەکێك لەئەیوانەکان بەتەنیا چەندین کاتژمێر دادەنیشتو دەرۆیشتە ناوبیرو خەیاڵەکانی. روخساری خەمباری منی زیاتر لەخۆی خەمبار دەکرد. بەبیانووی ئەوەی بتوانێت کێشەکانی بۆکەسێك باس بکات چەندین کاتژمێر لەتەنیشتی دادەنیشتم، لەکۆتایدا دەمگوت:((ئەنوەر چ روویداوە؟)) زۆرجار وەلأمی دەدایەوەو جاربەجار وەك خۆی بێدەنگ دەمایەوە.

زۆرکەم روویداوە کەمن هۆکاری خەمباریی ئەنوەربم. بێگومان ئێمەش وەك هەموو ژنو پیاوەکانیتر شەڕمان دەکرد بەلأم زۆرکەم. لەسەرەتایی هاوسەرگیری ئێمە هەستم دەکرد

هەردوومان مرۆویی شەڕو جنیودان نین. هەمووکاتێك لەیەکتر تێدەگەیشتین. رێزمان لەیەکتر دەگرتن‌و ئەم رێزگرتنەمان دەپاراست. من لەخرابترین هەلومەرجی روحی تێگەیشتنی تەوام هەبوو.

شەوێك بۆی باسکردم:((جیهان، ئێمە لەمیسر دەڕۆین.))

لەمیسر دەڕۆین؟ بەجارێك زمانم لاڵبوو.

((ئیتر ناتوانم رێگری لەم هەموو دەنگۆیانە بکەم کەمحەممەد نەجیب لەسەر من بلاو دەکاتەوە. ئەنجوومەن بۆچەند بالێك دابەشکرا کاری ئێستامان سەرقاڵبوونە بەگیانی یەکترەوە. لەم کەسانە بێزارم‌و دەست لەکارکێشانەوەی خۆم نووسیوە.))

راستەخۆ تەماشامکرد، بیرم لەجێهێشتنی ماڵەکەم، ولاتم، دایك‌و باوکم کەوتە لێدان.

گوتی:((لەگەڵم دیت؟))

زۆر بەزەحمەت زمانم گەڕاو گوتم:((بێگومان بۆهەر شوێنێك بڕۆیت لەگەڵ تۆدەبم.))

ئەنوەر گوتی:((چۆن دەبێت لەلوبنان دەست پێبکەین، ولاتێکی زۆرجوانە، عەرەبی‌و لەبێروت دەتوانین کارێك بیدۆزینەوە.))

بێگومان پێشتر دەیزانی لەگەڵی دەڕۆم، چونکە دەستبەجێ بلیتی فرۆکەو ناسنامەی نوێی بەمۆرکراوی نیشاندام کەدەمانتوانی بڕۆینە دەرەوە. بەختەوەرانە هاوڕێیانی لەئەنجوومەنی فەرماندەیی شۆڕش، عەبدولحەلیم عامرو جەماڵ عەبدولناسر، دەست لەکارکێشانەوەیان قبووڵ نەکردو لەقاهیرە ماینەوە.

ئەنوەر بەهەمان رابردووی لەکاری رۆژنامەگەری‌و دەوامی بەردەوامی حکومی نەکرد، بۆباسکردنی دیدگاکانی رژێمی نوێ رۆژنامەیەك بەناوی کۆمارییەت دەست پێکرد. هیچ کاتێك لەماڵەوە نەدەبوو، بەیانیان دەڕۆیشت شەوان کاتی خەوتن دەگەڕایەوە. هەمووکارەکانی کەبۆولاتی دەکردن رێزم دەگرت، بەلام ئەوەند تەنیابووم نەمدەتوانی هەست بەرازیبوون بکەم. نەمدەتوانی وەك زۆربەی ئافرەتانی میسری، کاتێك پرسیاریان لەهاوسەرانی خۆیان دەکرد بۆچی ئەوەند دواکەوتی. گلەیی بکەم. چونکە دەمزانی لەچ شوێنێك کار دەکات‌و بۆچی کار دەکات.

دوای شۆڕش ئافرەتانی خاوەن هاوسەر دەیانتوانی لەقوتابخانەکان بخوێنن، لەم لایەنەوە من بۆ تێپەڕکردنی تاقیکردنەوەکانی ساڵی کۆتایی لەقوتابخانەی ئامادەیی ناونووس بکەم. بەلام

هیچ سوودێکی نەبوو، ئەنوەر زۆر سەرقاڵبوو، زۆرجار تەنیا بۆگۆڕینی جلوبەرگەکان دەهاتە ماڵەوە یان بەپەلە دەهات خواردنێکی دەخواردو دەرۆیشت، هیچ کاتێك نەمدەزانی بەرنامەی کارکردنی چۆن رێکدەخرێت. خۆشی نەدەزانی. بەڵام بەپێی ئەرکی هاوسەرایەتی دەبێت ئەوکاتەی کەلەماڵەوە دەبوو، من لەماڵەوەبم. ئەنوەر وەك هەموو هاوسەرانی میسری ئەم چاوەڕوانیەیی لەمن دەکرد. من لەم لایەنەوە هیچ کاتێك یەك بەدووم لەگەڵ نەدەکرد. چەندینجار دەهاتە پێشەوە کەدیدارەکانم لەگەڵ ماموستاکانم بگۆڕم، دەمگوت:((ببوورن ئێستا دەبێت خویندنو وانەکان بەلاوە بنێنم.)) کاتێك نیگەران دەبوون بەڵام هیچ کاتێك خۆیان بەجۆرێك نیشان نەدا کەنیگەرانن، چونکە بەرپرسیارەتی منیان وەك هاوسەر دەزانی.

دەمویست لەم هەلومەرجەدا خۆم خۆراگرو کاریگەر نیشانبدەم. هەوڵی خۆمدا تاکو جلوبەرگی کورتو هێقە دادڕاو دەبەر نەکەم. میسرییەکان خەڵکانێکی زۆر کۆنەپارێز بوون بەهیچ شێوەیەك خەیاڵم نەبوو حورمەتیان بشکێنمو ببێتە دەرگایەك بۆئەوەی رەخنە لەهاوسەرم بگرن. جلوبەرگی سادەو ئاسایم دەبەردەکرد، نەمدەویست هیچ نیوانێك لەنێوان منو چینی هەژاری میسر کەزۆربوون هەبێت. یەکێك لەهۆکارەکانی شۆڕش بەپلەی یەکەم جیاوازی نێوان چینی سەرەوەو ملیون خەڵکی هەژاربوو. ئێستا دەسەلاتدارنی میسر هەموویان وەك یەکبوون.

بەبوونی پەیامەکانی ئاشتیخوازانەی شۆڕش، دانیشتوانی گەرەکەکانی ئێمە، پێداگریان دەکرد کەدەبێت هاوشێوەی کەسانی گەورە هەڵسوکەوت لەگەڵ ئێوە بکرێت، من لەم لایەنەوە رازی نەبوومو هیچ کاتێك رێگایان نەدەدا بۆدەستەبەرکردنی بلێتی سینەما نۆرە بگرم یان لەدەرمانخانەکان راوەستم تاکو نۆرە دەگاتە من. گۆشتفرۆشی گەڕەکی ئێمە بەنیگەرانی پرسی:((دیسان گۆشت لەمن دەکڕیت؟)) داروخانە، سەوزەفرۆش، هەموویان نیگەرانیان یەکبوو. خەیاڵی هەموویانم ئاسوودە کرد: ((لەوانەیە هەلومەرجو پێگەی ئێمە گۆڕابێت بەڵام خۆمان نەگۆڕاوین.)) ریکلامەکان بەدەردەکەوتن لەسەر دەرگای دووکان نووسرابوو:((شوێنی کڕینی خاتوو سادات.))

گۆڕانی هەلومەرجی هەمان شوێنی کەجلوبەرگم بۆ ئەنوەر دەستەبەر دەکردن زۆر بەرچاوتربوو لەشوێنەکانیتر. دروست پێش شۆڕش جارێك لەهەمان دوکان بووم یەکێك لەوەزیرەکانی رژێمی رابردوو جگارە بەدەست لەگەڵ تەواوی پاسەوانان هاتە ژوورەوە دەستبەجێ فرۆشیار کەسەرقاڵی رایکردنی کارەکانم بوو، خزمەتکردنی هەمان وەزیر بەراکرتن رۆیشت. من دەمزانی

ئیتر کەسێك نابێت ئەوەی کەمن پێویست بوو پێشکەشم بکات لەدوکان هاتمە دەرەوە. دوای شۆڕش، کاتێك سەردانی هەمان دوکانم کرد، ئەمجارەیان هاوسەرم سەرۆکی پەرلەمانبوو، هەمان کەس کاروباری ئەوانیتری ڕاگرت بۆخزمەتکردنی من هاتە پێشەوە. لەگەڵ خۆم دەگوت خوایە تاکو ئێستا هیچ نەگۆڕاوە. بەفرۆشیارم گوت:((یەکەمجار ئەوانەی لەپێش مندابوون کارەکانیان تەواو بکە، من چاوڕێی دەکەم تاکو دەبێتە نۆرەی من.))

زۆر ئاسایی بوو ئیتر منو ئەنوەر هیچ سنوورێکی تایبەت بەخۆمان لەنێوان خەڵکدا نەمابوو، بۆهەرشوێنێك دەڕۆیشتین خەڵك ئێمەی دەناسیو هەستی خۆیان بۆئێمە دەردەبڕی. کاتێك سەردانی سینەماو چێشتخانەکانمان دەکرد خەڵك دەهاتنەپێشەوەو دەستی خۆیان بۆئەنوەر درێژ دەکرد تاکو سڵاوی لێ بکەن، سەدانجار دەیانگوت: ((خواخێرت بنووسێت، جەنابی سادات.)) زۆرجار حەسرەتی سەردەمی تەنیایی خۆمو ئەنوەرم دەخوارد، هیچ کاتێك نەمبینی کەسێك لەرووی ناچاری تەماشای ئەنوەر بکات. من زۆرخوشحاڵ دەبووم کەوەك هاوسەری بەخێرهاتنم دەکەن. هەرچی پێشکەشی وڵاتی خۆمان دەکرد، خەڵك بەهەستی گەرمی خۆیان پێشکەشیان دەکردینەوە. هاوڕیانم پرسیاریان لەمن دەکرد:((دژوار نییە؟)) لەوەلأم دەمگوت: ((بەهیچ شێوەیەك)) ئەم هەستەم هیچ کاتێك نەگۆڕا.

هاوڕێیانی قوتابخانەم دەیانگوت:((دەتوانین بەجیهان بانگت بکەین؟))

بۆم باس دەکردن:((بێگومان، هیچ شتێك لەنێوانمان گۆڕاوە؟))

دەیانگوت:((ئێستا تۆ زۆرگرنگی.))

بەلأم من هیچ جیاوازیم لەنێوان خۆمان نەدەبینیو هەستم پێنەدەکرد. خەیاڵی هەموویانم ئاسوودە دەکرد:((لەوانەیە لەبەرچاوی کەسانێك من گرنگ هەژمار بکرێم، بەلأم بۆئێوە هەمان کەسم کەپێشتربووم.)) یادی ڕۆژەکانی قوتابخانەمان بەبیریەکتر دەهێنایەوەو پێدەکەنین.

یەکێك لەهاوڕیانم پرسیاریی کرد:((بەبیرت دێتەوە جارێکیان لەناو حەوشەی قوتابخانە دوور لەچاوی چاودێری قوتابخانە بەشەق لەتۆماندا؟))

لەباوەشم گرتو گوتم:((ئاه ، بەڵێ، ئێستا تۆڵەی خۆم دەکەمەوە، دەبینی.))

بەلأم لەزۆر بەرپرسیارەتی نوێی خۆم گێژۆدەی بارودۆخی پێش بینی نەکراو دەبووم. زۆر لەرۆیشتنی فارۆق تێپەر نەبوو روبەرووی سەدان ئافرەت دەبوومەوە کەهەستیان دەکرد دەتوانم کارێکیان بۆبکەم.

ڕۆژێکیان ئافرەتێك لەدەرەوەی ماڵی ئێمە لەسەر شەقام چاوەڕێی منی دەکرد، گوتی: ((خاتوو سادات، داوادەکەم هاوکاریم بکە، هاوسەری من لەکار دەرکراوە، دەکرێت بەرپرسی رازی بکەین هاوسەرم بگەڕێتەوە سەرکاری خۆی؟))

ڕۆژێك لەکاتی کڕیندا ئافرەتێك گوتی:((خاتوون! خاتوون! کوڕم لەزانکۆی پزیشکی دەرنەچووە، دەکرێت لەبەرخاتری من قسەلەگەڵ سەرۆکی زانکۆ بکەیتو بۆی باس بکەیت دەبێت قبووڵ بکەیت؟))

هەموو ڕۆژێك کەدەگەڕامەوە بۆماڵەوە، چوار پێنج ئافرەتی دۆسییە بەدەست چاوەڕێم دەکەن. ڕۆژەکانی هەینی، ڕۆژەکانی پێشوودانی ئایینی، خەڵکانی زیاتر لەپێش دەرگای ماڵی ئێمە کۆدەبوونەوە. سندووقی پۆست بەردەوام پڕلەنامەکانی کەخەڵك بۆن کەبۆمن ڕەوانە دەکرانو دەیانوویست من سوود لەپێگەی خۆم وەربگرم بۆچارەسەری کێشەکانیان، هەموو جۆرە کێشەیەك لەناو نامانەدا هەبوو. ئەوەندە نامە بەسەرمدا دەبارین وەك ئەوەی من شاژنم. هیچ کاتێك پێش بینییەکانی فاڵگەرم لەبیر نەدەکرد، پێش بینییەکانی خۆم لەسەردەمی منداڵی کەڕۆژێك دەتوانی هاوکاری خەڵك بکەیت. ئێستا یەك شەممەیە دروست لەناو هەمان هەلومەرجی پێش بینیکراوی خۆمدابووم. بەراستی ترسێنەربوو. لەتەمەنی نۆزدە ساڵی، تاکو ئەوکات خۆم بەقوتابی قوتابخانە دەزانی.

وەڵامی هەموو نامەکانم دەدایەوە، ئێوارانم تەرخان دەکرد بۆ وەرگرتنی داخوازییەکانی خەڵك کەلەپێش دەرگای ماڵی ئێمە رادەوەستان. لەکاتی بیستنی کێشەکانیان، فێری خۆراگری دەبووم کەبەرزتربوو لەسروشتی خۆم. زۆرجار هەندێك کەس هەبوون چەندینجار داواکاری خۆیان دووبارە دەکردەوە، ناوی منداڵێك لەقوتابخانە بنووسرێت، هاوسەرم لەزیندان ئازاد بکرێت بەڵام هیچ کاتێك پێم نەگوت:((بەسیەتی بۆ ئەوەندە دووبارە دەکەنەوە!)) هەستم دەکرد کارێك بۆهاوکاریکردنی خەڵك بەمن سپێردراوە تاکو هەموو توانام بەکاربێنم بۆباشترکردنی ژیانیان. ئەم دەرفەتە خودا پێدابووم سوود وەرگرتن لەم دەرفەتە پەیوەندی بەمنەوە هەبوو. لەدەستپێکی وەرگرتنی نامەکانو دۆسییەکان تاکو هەمان ڕۆژی کەئەنوەر لەدونیا نەما، هیچ کاتێك ئاسوودە نەبووم، شەو ڕۆژ کارم دەکرد تاکو کارێك بۆ ئەم خەڵکە بکەم ئەم ئەرکەم بەئەرکێکی خودایی دەزانی.

داواکاری هیچ کەسێك رەتکردنەوەی بۆنەبوو بۆداواکاریان هەمووکارێکم دەکرد بەتەلەفۆن پەیوەندیم لەگەڵ خاوەنی بینایەکانی بەرزی نیشتەجێ بوون دەکرد کەدەبێت ئاگاداری لایەنی ئاسایشی خەڵك بن. پەیوەندیم بەخاوەن کارەکان دەکرد تاکو کاربۆخەڵك پەیدا بکەم، تاکو شوێنێك کەلەتوانامدابوو کێشەی خەڵکم چارەسەر دەکرد. رەوتی کارکردن لەمیسر لەئێستاو رابردوو بەم شێوەبوو. ئەوانی بەختیان کەمتربوو دەبێت بەردەوام لەبەرامبەر شێخو بەگو پاشانی بەهێز دەپاڕێنەوە. خزمەتکردنی ئەنوەر لەناو سوپا بۆئەم نەریتو پاڕانەوەیە دەگەڕێتەوە، باوکی بۆئەوەی ئەنوەر لەئەکادیمیایی ئەفسەری وەربگیرێ داوا لەسەر لەشکر ئیبراهیم خیری دەکات. بەڵام شۆڕش ئەم نەریتەی تورکانی کەدەبێت شتێك بەبەرپرسان بدرێت لەبەرامبەر کارێك کەبۆکەسێك دەکەن هەڵوەشاندەوە، بەڵام دیسان کەسانی بێپەنا کەهەستیان دەکرد توانای چارەسەر کێشەکانی خۆیان نییە دەرگای خەڵکیتریان دەکوتا، زیاتر پشتیان بەخەڵکانیتر دەبەست. رەوتێکی بەراستی ناشیرینو زەلیل بوو چینی ژێردەستە پشتیان بەکەسانێك دەبەست هەمان کەسەکان بەهەواو هەوەسی خۆازراوی خۆیان بڕیاریی خۆیان دەدا کەئایا هاوکاری ئەم کەسە بکرێت یان نەکرێت. ئەم رەوتە لەپەروەردکردنی خۆبڕیاردان لەناو خەڵکدا چەندان کاریگەر نەبوو چونکە دژی ئامانجەکانی شۆڕش هەژمار دەکرا. ئەمەیان لەناو کۆمەڵگەی میسریدا ریشەی داکوتابوو. ئەنوەر دوای وەرگرتنی پۆستی سەرۆککۆماری هەوڵیدا تاکو هەلومەرجی ناوەندەکانی حکومی یاسایەکی یەکسان بۆهەمووان پیادە بکرێتو کۆتایی بەم یاسایی سووکو بەندە دروستکردن بێت. کوڕی خۆمان جەماڵ، لەزانکۆی پزیشکی وەرنەگیرا، دواتر لەبەشی ئەندازیاریی وەرگیرا. رۆژانە لەسەردەمی جەماڵ عەبدولناسر داواکاری دەگەیشتن، من هەرچی لەتوانامدا دەمکرد.

بەسەر شەرمێنی خۆمدا سەرکەوتبووم، بۆتێکەڵبوونو قسەکردن لەگەڵ تەواوی ئەم خەڵکەی جۆراوجۆر گەیشتم بەقوناخێك کاتێك نامەی ئافرەتێکم دەخوێندەوە دەکەوتمەژێر کاریگەریو نیگەرانی دەبووم. من ئافرەتانم نەدیبوون، بەڵام دەردی دڵی خۆیان بۆمن لەسەر کاغەز دەنووسی. ئافرەتێك دەنووسێت:((منو منداڵەکانم برسین، هاوسەرم ئێمەی بەجێهێشت. بەڵێنی دابوو کەخەرجی ئێمە بدات بەڵام ئێستا خۆی ونکردووە.)) یەکێکیتر دەنووسێت:((هاوسەرم هاوسەرێکیتری بۆخۆی هێنایەماڵمان من نازانم چی بکەم.)) نامەکانی زۆر تایبەت لەژیانەکانی لەیەکتر هەڵوەشاوە، بەڵام بەهەرشێوەیەك بێت ئەم ئافرەتانە

بەئومێدی ئەوەی من دەتوانم کارێکیان بۆبکەن، پشتیان پێی دەبەستم. کتێبی پیرۆز دەڵێت:((ئەگەر ترسی ئەوەتان هەیە دەزانن شەڕو کێشەی زۆر لەنێوانیان(ژن و پیاو) روودەدات لەلایەن پیاو ئافرەت دادەوەری بۆبکەن، ئەگەر ئیرادەی باشبوونیان هەیە خودا ئەم کەسە سەرکەوتوو دەکات.)) ئێستا ئەمانە منیان بەدادوەر دەزانی.

تەلەفۆنم بۆپیاوێکی پزیشك کرد:((نامەیەك لەهاوسەرتان بەدەستم گەیشت داوا دەکات کەژیانی هاوبەشتان بەردەوام بێت. هیوادارم بەجۆرێك بیر نەکەیتەوە کەدەمەوێت دەستوەردان لەژیانی تایبەتی ئێوەدا بکەم، بەهیچ شێوەیەك مەبەستم نییە، من وەك خوشك پەیوەندیم کرد کەبزانم ئایا دەتوانم کارێکتان بۆبکەم کەلەگەڵ هاوسەرت ئاشتی بکەن، ئەگەر دەتەوێت قسە لەگەڵ یەکتردا بکەین سەردانم بکە، ئەمەیان دەگەڕێتەوە بۆ چۆنیەتی بڕیاردانی خۆت.))

هەمان پیاو سەردانی کردم. بەشێوەی تووڕە بوون لەهۆڵی پێشوازی ماڵی ئێمە راوەستاو گوتی:((خاتوو سادات ئەگەر ئێوە بڕیار بدەن بگەڕێمەوە بۆلای هاوسەرم دەگەڕێمەوە بەڵام ئەگەر دەزانن لەدەستی ئەم هاوسەرم چەند ئازارم کێشاوە ئەوکات لەهەلومەرجی من تێدەگەیشتی.)) هاوسەرم لەهەموو شوێنێك بەدوامدا دەگەڕێت بزانێت چی دەکەم لەناو نورینگەی خۆمدا چۆن قسە لەگەڵ نەخۆشکانم دەکەم و چۆن پشکنینیان بۆدەکەم.

پشتراستم کرد هیچ پیاوێك ناتوانێت بەم جۆرە بەردەوام بێت. گوتم:((هیوادارم بتوانم هاوکاری بکەم، بەڵام وەك دیار ناتوانم.))

بەپێداگری گوتی:((بۆ، دەتوانی، من خەرجی مانگانە رەوانە دەکەم، بەڵام وەرناگرێت. دەکرێت کەسێك لەلایەن ئێوە ئەم خرجی مانگانە بەدەستی بگەێنێت کەبزانی وەریگرتووە؟))

گوتم:((بێگومان.)) هەموو مانگێك چاودێریم دەکرد کەدەگاتە دەستی هاوسەری.

ئێرەیی هاوسەری ئەم پیاوە لەگەڵ گومانەکانی زۆر ئافرەتیتر بەراستی بێزاریان دەکردم. ئەمانە ژیانی خۆیان لەناو ترسێکدا بەسەردەبرد کەلەوانەیە هاوسەرانی خۆیان لەدەست بدەن، لەم رێگایەوە هاوسەرانی خۆیان لەجیاتی ئەوەی نزیکتربن دوور دەکەوتنەوە. ئەم گرێدراویە بەهاوسەر بەهۆکاری پێویستی لایەنی ماددیو سەرپەنایەكو بوونی ناسنامەی هەبوون دەبوون بەهۆکار کەزیاتر لەڕادەی خۆیان لەجیاتی ئەوەی هاوبەشی ژیانبن پێکەوە دەبوونە ئەسیری هاوسەرگیری خۆیان. ئافرەتان بۆ هەبوونی ژیانێکی سەرکەوتوو لەهەمان کات ئازاد دەبێت فێربیان کەپشت بەخۆیان ببەستن.

داوام لەهاوسەری کەسی پزیشك کرد سەردانم بکاتو بۆم باسکرد:((ژیانی هاوبەشی تۆ کۆتایی هاتووە. ئێستا دەبێت خۆت بەتەنیا لەگەڵ ژیانی خۆت بەرامبەر ببیتەوو سەر لەنوێی دەست پێی بکەیت. بۆچی کارێك ناکەیت؟))

هاواریکرد:((کار بکەم؟))

گوتم:((بەڵێ، من هاوکاریت دەکەم کارێك بیدۆزیتەوە.)) ئەمەیانم کرد، ژیانی بەتەواوی گۆڕا. ئێستا دووبارە هاوسەرگیری کردووە، کاردەکاتو زۆر بەختەوەرانە ژیانی خۆی بەسەر دەبات.

چارەسەرکردنی کێشەی خەڵکانیتر ئاسانبوو. لەنێوان چەند هاوسەرێك گفتوگۆم کرد توانیان پێکەوە بەئاشتیانە بەردەوامی بەژیانی خۆیان بدەن. هەندێکیان کێشەی سەرەکی خۆدی ژنەکانبوون. ڕۆژێکیان دوای گوێگرتن لەگلەیەکانی نابەجێی ئافرەتێك گوتم:((دەبێت هەڵسوکەوتی خۆت لەگەڵ هاوسەرت باشتر بکەیت ئەگەر ئەمەیان نەکەیت هاوسەری خۆت لەدەست دەدەیت. لەجیاتی ئەوەی بەردەوام گلەیی بکەیتو داوای پارەی زیاتر بکەیت دەبێت خۆت پارە پەیدا بکەیت.))

شەوانە کێشەکانی کەبەدرێژایی ڕۆژ دەبیستم بۆ ئەنوەرم دەگێڕانەوەو باسم دەکرد کەتوانیم چیان بۆبکەم.

ئەنوەر دەیگوت:((بۆچی خۆتان ئەوەندە تێکەڵاوی کێشەکانی خەڵك دەکەن، ژیانی تایبەتی خەڵك هیچ پەیوەندی بەتۆیەوە نییە.))

دەمگوت:((بۆچی ئەم خەڵکانە بەشێوەیەك سەردانم دەکەن وەك ئەوەی دەتوانم پەرچۆ بکەم؟ ئەگەر تۆ لەشوێنی من دەبوویت بەبێ هۆکارو وەڵام دەتان گەڕاندنەوە شوێنی خۆیان؟)) تاکو شوێنێك کەدەمتوانی بەردەوام بووم.

بێگومان، ڕێبەرانی نوێی میسر نەیاندەتوانی هەموو کەسێك ڕازی بکەن. تەنیا شەش مانگ لەشۆڕش تێپەڕیکردبوو پیلانگێڕی بەشەداری ڕێبەرانی چەندین پارتو هەندێگ ئەفسەری ناوسوپا بۆ لەناوبردنی حکومەتی نوێ ئاشکرابوون. ئەنجوومەنی فەرماندەی شۆڕش دەستبەجێ تەواوی پارتەکانی پێشووی هەڵوەشاندنەوەو بەرپرسانی گرتنو ئەفسەرانی سوپای رادەستی دادگەی سەربازیکردن. سالێك دواتر، لەدوانزدەی تەمووزی ١٩٥٤، ئیخوان موسلمین هەوڵیدا بگاتە دەسەڵات بەدروستکردنی کێشە بۆحکومەتو گروپی براکانی سەر بەئیخوان

موسلمین تاکتیکی کۆنی خۆی بەکارهێنان، لەناو پەرلەمان یادی قوربانیانی شەڕی بریتانیا لەنۆکەندی سوئێز، قوتابیانی زانکۆی قاهیرەی دژی حکومەتو شۆڕش هاندا.

ئەنجوومەنی فەرماندەی شۆڕش بەگرتنی سەرکردەکانی ئیخوان موسلمین‌و هەڵوەشاندنەوەی، دەست بەجێ کاردانەوەیان نیشاندا. بەلاَم جارێکیتر گروپی نەریتخواز دەستیان بەچالاَکی نهێنی کرد. لەمانگی ئازار، ئەندامانی قەدەخەکراوی ئیخوان موسلمین بەدەستەوەگرتنی کراسەکانی بەخوێن سوورکراو بەدروشمی دژی شۆڕش. بەرەو کۆشکی تازە ناونراوی سەرۆککۆماری لەعابدین رۆیشتن. وەك دیار هیچ شتێك ئەمانەی رازی نەدەکرد. بەباوەڕی ئیخوان موسلمین هیچ شتێك رووینەداوە حکومەت هیچی نەکردووە بۆدەرکردنی بێگانەکان‌و دەرکردنی پاشای بێ مەزهەب، ئەمانە هەمووشتێکیان دەویست لەرێگای بەدەستهێنانی هیچ شتێك نەیدەتوانی رێگایان لێ بگرێت.

بەراستی سەردەمێکی پڕلەکێشەو ئاڵۆزیبوو. لەساڵەکانی سەرەتایی شۆڕش زۆرکەم روویدەدا ئەنوەر بتوانێت لەماڵەوە بێت، رۆژانە تاکو درەنگانی شەو لەگەڵ ئەندامانی شۆڕش لەکۆبوونەوە دابوو. من زیاتر بەتەنیابووم. بەلاَم زۆر کەمتر هەستم بەتەنیایی دەکردو من خاوەن پرۆژەی خۆم بووم کەسێکی دووگیانبووم.

دروست پێش شۆڕش جارێکیان منداڵێکم لەبارچوو. گومانم دەکرد هۆکاری هەمان هەواڵی دووگیانم بۆدۆزینەوەی جلوبەرگی دووگیانی بۆخۆم‌و منداڵەکە ئەوەندە گەوجانە بەدوایدا گەڕام تاکو هەمان رووبدا کەنابێت روویدابا. ئەوکات هاوینی ١٩٥٤بەهیچ شێوەیەك نەمدەویست هەمان رووداو دووبارە ببێتەوە، لەسەر تەخت نەدەهاتمە خوارەوە. پزیشکم دەیگوت:((لەتەخت وەرەخوارەو هەندێك هەنگاو هەڵێنە، وەرزش بۆپاراستنی ماسولکەکان پێویستە.)) بەلاَم ئەمۆژگارییەکانم جێبەجێ نەدەکردن. دروست لەتەمەنی بیست ساڵی نەمدەزانی چ کارێکی بێسوود دەکەم. پشتراست بووم بەڕاوەستان کاری کەوتنەخوارەوەی منداڵەکە تەواو دەبێت واتە لەدایك دەبێت. لەترسی لەدەستدانی منداڵ نەمدەتوانی دەوری دایك ببینم. لەسەر تەخت خۆم درێژ دەکردو کتێبم دەخوێندنەوە، خۆم فێری جۆرێك رستن‌و چنینی بەدارەکانی باریك دەکرد. دایك‌و باوك‌و خوشکم سەردانیان دەکردم‌و لەتەنیشتم دادەنیشتن. بەئەمەیان رازیبووم. بۆپێویستی ماڵێك کاری دەستیم کردبوون، لەسەرمێزو گوڵدۆزی جۆراوجۆر.

بەبوونی تەواوی ئەم لایەنانە لەدایکبوون خێراتر روویدا واتە لەحەوت مانگی لەحەوتی ئەیلوولی ١٩٥٤، پزیشکان سات بەسات نیگەرانتر دەهاتنە بەرچاو، ئەنوەر شەو تاکو بەیانی لەنەخۆشخانە لەتەنیشتم مایەوە.

بەردەوام پرسیارم دەکرد:((چی بووە؟ منداڵەکەم سەلامەتە؟))

بەدەستپێکی ژانەکان رووخساری باوکم و دایکم و خوشکم و ئەنوەر زیاتر تاڵم دەبینین. ئەم رووخسارانە بەردەوام پیان دەگوتم:((ئارامی خۆت بپارێزە.)) کاتێك پزیشك بۆ ئەنوەر باسدەکات لەناو زکی دایکی نەسوڕاوەو سەری لەسەرەوەیەو لێدانی دڵی زۆر لاوازە، تەنیا پەنجا لەسەد دەتوانین هیواداربین کەدەمێنێتەوە، من ئاگاداری هیچ نەبووم. ئەنوەر باسی هیچی نەدەکرد.

کاتێك بەهۆش دەهاتمەوە ئەنوەر گوتی:((جیهان، بووین بەخاوەنی کچێکی زۆرجوان. کاتێك بینیم باوەڕم نەدەکرد. زۆرجوانە، رووخساری سپی، چاوەکانی شینن.))

تەنیا شتێك کەدەمویست لەباوەشگرتنی کچم بوو. ئەنگوستەکانی بچوکی لوبنام دەگرتن و جوڵەم بەئەنگوستەکانی پێیەکانی دەکرد. بەڵام شادیم زۆر بەخێرایی گۆڕا بۆگریان کاتێك دەستم لەپێیەکانیدا یەکێك دەجولایەوە بەڵام ئەویتر هیچ جولەیەکی نەبوو.

هەوارم بەسەر سەری پزیشك دەکرد:((کێشەی هەیە!))

پزیشك بۆی باسکردم لەبەر لەدایکبوونێکی دژوار، دەماری پیی راستی لوبنا تاکو رادەیەك دڕاوەو هیچ هەستێکی نییە، هەرچەند پشت راستیکردم ئەمەیان کاتییە. ئێوارەی هەمان رۆژ هەردووقاچی کچی منیان بەستنەوە بۆئەوەی هیچ جولانەوەیەك نەکەن تاکو چاك دەبێتەوە. لەژیانمدا هیچ کاتێك کەسێك نەبووم کەباوەڕم بەهەندێك لایەنی کۆنەوە هەبێت، بەڵام هەمان رۆژ دەستبەجێ مووروی گەوەری شینم لەناو بێشکەی لوبنا دانا تاکو بەقسەی خودا لەسورەی ئەلفلق، لەبەرچاوی کەسانی بەخیل بەدوور بگرن. بەباوەڕی ئێمەی میسرییەکان رەنگی شین ئێمە لەبەرامبەر چاوی بەخیلەکان دەپارێزێت.

حەوت رۆژ دوای لەدایکبوونی کچم، جەژنی سبوح هەمان جەژنی لەدایکبوونمان کرد. لەمیسر بەبۆنەی لەدایکبوونی منداڵ، لەهەرچینێك بێت ئەم جەژنەی بۆدەگێڕن، چونکە خۆشەویستی لەدایکبوونی منداڵ گەورەترین دیاریی ژیان هەژمار دەکرێت.

بەپێی هەمان داب‌و نەریت من خۆم لەسەر تەختی خۆم درێژ دەکەم‌و ئافرەتانی خزم‌و دۆست‌و هاوڕێیان لەدەوری بێشکەی لوبنا کۆدەبنەوە. بۆخۆپاراستن هەندێك مۆریی شینم بەجلەکانی خۆمەوە کردن. وەك باوە زۆر لەئافرەتان دوای تەواوبوونی دووگیانی خۆیان جوانتر دەبن‌و لەهەمان کات دەبنەخاوەنی منداڵ و خەڵك زیاتر بەخیڵیان پێی بکات. ئەم مۆرییە شینانە بۆئەوەی شیرم لەشەوێکدا وشێك نەبێت، وەك هەموو دایکانی گەنج بۆئەوەی تیری نەیاران کاریگەری لەمن نەکات بەجلەکانی خۆم ئاوێزان دەکەم.

گۆزەیەکی قوور لەتەنیشت بێشکەی لوبنا دادەنێن‌و بەچەندین شێوە دەیرازێننەوە دواتر بۆدەستپێکردن کەسێك قوومێك لەئاوی گۆزە دەدات من نازانم بۆلوبنا پوورەکان‌و کچەکانیان‌و هاوڕێیانم کێی یەکەم قومی ئاوی لەگۆزەکە خواردەوە تاکو جەژن دەست پێی بکات. ئەمەیان سیمبولێکی ژیانبوو.

پوورم زۆر بەوشیاری لوبنای لەناو شتێکی گەورە داناو تاکو روحەکانی خراب‌و چاوی بەخیڵەکان کاریگەریان نەبێت. کچی پوورم ئایدا، هاونی کوتانی لەدەست گرتبوو برنجی ورد دەکرد بەشێوازێکی هاوشێوەی دەف دەستی دەجولاند. ئافرەتان لەژووری من کۆبوونەوەو دەستیان بەجۆرێك گۆرانیکرد:((بەقسەی باوکت بکە، بەقسەی دایکت بکە.)) هەموویان مۆمیان داگیرساندو بەدوای یەکتر لەژوورەکە دەسوڕانەوە بەشێوەیە جەژنمان دەگێڕا.

خوشکم داڵیا سەرچۆپی مۆم بەدەستەکانی دەکردو من خوشحاڵ‌و بەختەوەر لەناو جێگای خۆمدابووم‌و گوێم لەدەنگ‌و ئاوازی کەسانی بەشداربوو دەگرت. ئەم ئافرەتانە لەهەموو ژوورەکان گەنك‌و خوێیان بلاو دەکردەوە بەنیشانەی بەرەکەت‌و رێگا گرتن لەبەلاو نسیبەت. هەموویان پێکەوە دەیانگوت:((خوێی بۆچاوی کەسانێك کەسلاو لەروحی پێغەمبەر نەکات، خوێی بۆچاوی هەموو بەخیڵەکان.)) لەهەموو ژوورێکدا داوایان لەلوبنا دەکرد لەقسەی دایك‌و باوکی دەرنەچێت، پەیامێکی نەریتی بۆهەموو منداڵەکان. ئێستاش کاتێك کەسێك سەرپێچی دەکات دەڵێن جەژنی رۆژی حەوتم بۆ ئەم کەسە نەکراوە. من بەردەوام ئاوی گەرمکراو بەچەندین تام دروستکرابوو دەخواردەوە ئەم شێوازە بۆژنانی کەتازە دووگیانیان بەکۆتایی هاتبێت بەسوودە. لەژووری میوانەکان بەهەموو جۆرە شیرینییەك پێشوازی لەمیوانەکان دەکرا.

لەسێ مانگی دواتر رۆژانە لوبنام دەبرد بۆلای پزیشك تاکو شۆکی کارەبایی لەلاقی بدرێت. بەپێی راسپاردەکانی دکتۆر لەماڵەوە بەردەوام لاقی لوبنام دەماڵی تاکو ماسولکەکانی

بەهێزین. بۆساتێك لەخۆم دوور نەدەخستەوە. ڕۆژانی هەینی پێشنیارم بۆئەنوەر دەکرد لەجیاتی ئەوەی بڕۆن بەئۆتۆمبێل لەشوێنەکان بسوڕێنەوە لەماڵەوە لەتەنیشت کچەکەمان دەمێنینەوە. ئەنوەر دوودڵی منی بۆ منداڵەکە دەزانیو لەماڵەوە دەمایەوە.

شەوان بۆئەوەی ئەنوەر بتوانێت خەوێکی باش بکات لەژووری لوبنا دەخەوتم. هیچ کاتێك خۆم لەکچەکەم بەدوور نەدەگرت، دوای لەدایکبوونی کچم خۆم نەدەرازاندەوە، جارێکیان لوبنام لەلای دایكو خوشکم بەجێهێشتو ڕۆیشتم بۆئەوەی خۆم برازێنمەوە بەڵام کاتێك ویستیان موویەکانم شانە بکەن. فرمێسك لەچاوەکانم دەهاتنە خوارەوە، لەوانەیە باش بێت، برسی نەبێت، نەگرێت. بەپەلە گەڕامەوە، دایکم ئارامی کردمەوە:((باشبووە لاقی باشبووە.)) لاقی بەتەواوی کێشەی نەمابوو.

ئەنگوستەکانی خۆی بەتەواوی دەجولاندن. باوەڕم نەدەکرد بەڵام دواتر بەچاوی خۆم بینیم، بەپەلە بردبووم بۆلای پزیشك. هاواریکرد:((ئەنگوستی پێی دەجولێنێت!))

لەخۆشحاڵی پزیشکم لەباوەشگرت. منداڵم سەلامەتو بەهێز گەورە دەبوو. بێگومان هەمان ڕۆژ خۆشترین ڕۆژی ژیانم هەژمار دەکرێت. بەڵام هەمووکاتێك ڕووداوەکانی سیاسی سێبەری خۆیان لەبەختەوەری ئێمە دەکرد. هەلومەرجی لوبنا زۆرباش دەبوو، بەڵام هاوسەرم چۆنبوو؟ تەنیا دوای مانگێك لوبنا ترسانێك کەلەتەواوی ژیانم لەئەنوەر دەترسام بەردەوام گیرۆدەی خۆی دەکردم.

لە٢٦ تشرینی یەکەم هەواڵێك لەرادیو بلاوکرایەوە:((ئەمڕۆ لەئەسکەندەرییە، هێرش کرایە سەر جەماڵ عەبدولناسر هەشت گولەی ئاراستەکراون بەڵام ناسر هیچی بەسەر نەهاتووە.))

لەکاتی بیستنی ئەم هەواڵە لەگەڵ لوبنا لەماڵەوە دانیشتبووم. هەوڵدان بۆکوشتنی جەماڵ عەبدولناسر؟ بۆچی؟ ئێستا کاتی جەژن گێڕانە نەك توندوتیژی. هەفتەیەك پێشتر ڕێکەتنێك لەنیوان میسرو هێزەکانی بریتانیا واژۆکرابوو بۆچوونە دەرەوەیان لەخاکی میسرو کۆتایی هاتن بە٧٥ ساڵ داگیرکاری بەدەستی بریتانیا کۆتایی دەهات. ناسر، سەرۆکی وەفدی دانووستن دەبێت بۆگفتوگۆ لەگەڵ بریتانیا، بۆبەشداریکردن لەجەژنی ڕێکەوتن بەشداری لەگردبوونەوەیەك لەئەسکەندەرییە دەکات. لەهەمان شوێن گەنجێکی بۆریچی دەمانجەیەك دەردێنێتو حەوت گولە ئاراستەی جەماڵ عەبدولناسر دەکات. زۆر نەمابوو جەماڵ عەبدولناسر بکوژرێ. گومان دەکرا ئەم گەنجە ئیخوان موسلمین بێت. بەدوای ئەم ڕووداوە کاردانەوەکان دەستیان پێکرد.

کاتێك لێکۆلینەوەی پۆلیس ئاشکرای کرد کەئیخوان موسلمین پیلانێکی گەورەی بۆرووخاندنی حکومەت بەدەستەوەیە. لێپرسینەوە لەهەزاران کەس دەکرا وەك دەهاتە بەرچاو پیلانگێڕەکان ئێمەیان لەناو قاهیرە دەور دابوو. دوو کەس لەنزیکترین کەسانی ژمارەی دووی من، لەترسی گرتنیان بەبیانووی ئەندامبوون لەناو ئیخوان موسلمین، میسریان جێهێشت. عەبدولمنعم رەئوف، دۆستو هاوسەنگەری ئەنوەر لەراپۆرتەکاندا هاتبوو یەکێك لەسەرکردەکانی ئیخوان موسلمین هەژمار دەکرێتو لەناو سوپادا کاردەکات. دواتر ئاشکرا دەبێت خۆدی ژنەراڵ نەجیب گرێدراوە بەئیخوان موسلمین. لەسەرۆکایەتی دورخرایەوەو لەماڵەوە خرایە ژێر چاودێری.

لەتشرینی دووەمی سالی ١٩٥٤، دادگەی گەل بۆ لێپرسینەوە لەهەموو خائینەکانی رژێمی نوێ دروستکرا. ئەنوەر پێش لەدایکبوونی کچم کرابوو وەزیری ناوخۆ، لەلایەن ناسر وەك یەکێك لەسێ قازی دادگەی گەل دیاریکرا ، دادگەی گەلو دادگەی سەربازی پێکەوە لێپرسینەوەی لەگەڵ هەزاران کەسکرد کەبەتاوانی خیانەت دژی ولآت تاوانبار کرابوون، شەش ئەندامی ئیخوان موسلمین تاوانبارکران بەمەرگ. تەلەفۆنەکان دەستیان پێکرد.

((ماڵی سادات؟))

((بەڵێ، ببوورە، ئێوە کێن؟))

((لەماڵەوەیە؟))

((ئێستا لەماڵەوە نییە.))

((ئێوە کێن؟))

((هاوسەری))

((باش گوێی بگرە. ئێمە هاوسەری تۆ دەکوژین.))

((ئێوە کێن؟))

((گرنگ نییە. تەنیا بزانە ئێمە سادات لەبەر ئەوەی کەبەسەری ئیخوان موسلمین هێناوە دەکوژین.)) تەلەفۆن دەبڕا.

زۆرجار ئەم جۆری هەڕەشانە لەرێگای نامە دەکرانو زۆر هەڕەشەیتر لەرێگای دەزگای ئەمنی ئاگادار دەکراینەوە. تەکو تەنیا لەگەڵ منداڵی خۆم لەدەنگی تەلەفۆن دەترسان، چەند جارێك دەنگی تەلەفۆن دەهات لێدانی دڵم خێراتر دەبوو. ئەنوەر بەردەوام دەیگوت:((وەلآم

نەدانەوەیان باشتر دەبێت.)) بەڵام نەمدەتوانی ئەمەیان بکەم. هەمووکاتێك زۆر بەوردی گوێم دەگرت، تاکو ڕێگایان بۆپاراستنی بیدۆزمەوە.
زۆر وشیاریی بووم ئەنوەر نەزانت من دەترسێم. چونکە دەبێت بەبێ کێشە کارەکانی لەدادگە تەواو بکات. بەڵام شەوانە زۆرجار کەوەڵامی تەلەفۆنەکانم دەدایەوە دەستم بەگریان دەکرد. چۆن دەکرێت ئیخوان موسلمین بیر لەکوشتنی هاوسەرم بکاتەوە، کەسێکی شۆڕشگێڕ پێش شۆڕش کەسێکی نزیك لەئیخوانەکانبوو. ئایا لەتەمەنی بیستو یەك سالّی دەبم بەبێوەژن؟ ئایا منداڵمان لوبنا، بەبێ باوك گەورە دەبێت؟
ئەنوەر هەوڵی خۆیدا کەدڵگەرمی من بداتەوە:((خۆت نیگەران نەکەیت، بەراستی کەسانێك کەدەیانەوێت کەسێك بکوژن پێشتر هەواڵی بۆ ڕەوانە ناکەن کەدەبێت بتان کوژم. ئەم هەڕەشانەی بەتەلەفۆن دەکرێن تەنیا تۆئازار دەدەن، دەیانەوێت نیگەرانت بکەن.))
پشتم بەقسەکانی دەبەستو هەوڵی خۆم دەدا باوەڕ بکەم، بەڵام دیسان تەلەفۆنەکان بەردەوام بوون.
چەندین پاسەوان بۆئێمە لەبەرچاو گیرابوون لەسەر شەقامو ناو ڕێڕۆیەکانو چەندین شوێنیتر. بەم شێوەیە خوشحاڵبووم بەڵام لەلایەکیتر ئەمەیان پەیامێك بوو کەگیانی ئەنوەر لەمەترسیدایە. پشتراستبووم دەیان کوشت. بۆرزگاری گیانی دەمتوانی چی بکەم؟ کەمتر بیرم لەشتێك دەکردەوە. هەستم بەمەترسی گیانی خۆم نەدەکرد. دواتر لەسەردەمی سەرۆککۆماری ئەنوەر، کاتێك بۆجێبەجێکردنی پرۆژەکانم بۆسەرتاسەری وڵات سەفەرم دەکرد، زۆرجار مەترسیم لەسەربوو. بەڵام ئەمەیان تەنیا ئەنوەربوو مەترسی زۆری لەسەربوو.
دەنگی تەقەکردن، دەنگی تەقەکردن، لەنهۆمی تۆیەمی سەرەوە سەرم دەکێشم بزانم جەستەی لەچ شوێنێك کەوتووە. دەزانم، لەکۆتایدا روویدا. گولەهاوسەرمی پێکاوە. بەڵام هەرچەند تەماشا دەکەم هیچ نابینم. بەخێرایی جلوبەرگەکانم دەپۆشم، بەپەلە دەڕۆمەخوارەوە بزانم جەستەی لەچ شوێنێك کەوتووەو کەبەخێرایی بۆنەخۆشانەی بیگوازینەوە. بەڵام ڕێگا لەخۆم دەگرم. پاسەوانەکانم، کەدەوری خانووی ئێمەیان گرتبوو چۆن بیردەکەنەوە؟ دەڵێن خاتوو سادات ترساوە؟ لەگەڵ خۆمدا بیردەکەمە نەڕۆم باشتر دەبێت. دەبێت ئارامی خۆم بپارێزمو ڕێزلەخۆم بگرم. دەنگێکیتر لەدەرونم دەڵێت:((ئارام برۆخوارەوە بەئارامی پرسیار بکەن چ روویداوە؟ جیهان گوێی لەم دەنگە نەگریت هاوسەرێکی بەرێزو لەماڵەوە بمێنەوەو پشوودرێژی

خۆت بپارێزە. کاتێك لەنێوان ماڵو ئەیوان رادەکەم تاکو گوێی لەگولەکانی زیاتر بگرم، هەردوو دەنگەکان پێکەوە لەناو سەرمدا دێنەدەرەوە.
پانزدە خولك دواتر کلیل لەناو کلیۆنی دەرگا دەسوڕێت لەناکاو ئەنوەر بەپێکەنین راوەستاوە.
کاتێك بەپێکەنین خۆم لەباوەشی دەبینمەوە، پرسیار دەکات:((چی بووە جیهان؟))
دەڵێم:((بیرم دەکردەوە تۆ کوژراوی.)) دەنگی تەقەم دەبیست.
پێکەدەکەنێت، لەهەمان پێکەنینە جوانەکانی خۆی، روخساری خۆی لەبەرامبەر روخسارم دەهێنایە سەرەوە کەپشتراست بێت گوێی لەقسەکانی دەگرم، دەڵێت: ((جیهان زۆر بەوردی گوێی لەمن بگرە. کاتێك کاتی مەرگ گەیشت، نەتۆ، نەمن، نەهیچ کەسێکیتر ناتوانێت رێگای لێی بکرێت. قورئان دەڵێت" لەهەرشیونێك بیت مەرگ دەگاتە لات ئەگەر لەناو شوێنێکی پتەوی پارێزاروبیت." ئەگەر کاتی مەرگم گەیشت تۆ لەهەمان شوێن ئامادەبیت کەبەخێرا بگوازرێمەوە بۆنەخوشخانە یان نەبیت، هیچ جیاوازیی نییە.ئێستاش ئارامی خۆت بپارێزە. هەرچی دەکەیت ناتوانیت رۆژێك، ساتێك لەتەمەنم زیاد بکەیت.))
بێگومان دەمزانی راست دەکات. هیچ کەسێك ناتوانێت ئیرادەی خودا لەسەر مەرگ لەم جیهانەدا بگۆڕێت. تاکو لەدونیادا بمێنم قسەی هەمان شەوی ئەنوەر لەیاد ناکەم، هەرچی دەکەم ناتوانم ساتێك لەتەمەنی زیاتر بکەم، راست دەکات. رۆژێك کەئەنوەر لەم جیهانە رۆیشت. نەمتوانی هیچ کارێك بۆ ئەنوەر بکەم. دروست ئەنوەر چۆن باسیکرد نەمتوانی هیچ بکەم.
بەڵام بەبوونی ئەم هەموو کێشانەی کەلەناو ژیانی هاوبەشی منو ئەنوەر دەهاتنە پێشەوەو قورسایی خۆیان لەسەر من دەکرد دەبێت من گیانی ئەنوەر بپارێزم، رێگری لەرۆیشتنی بکەم، هەرهیچ نەبێت ماوەیەك دوابخرێت. هیچ کاتێك نەمتوانی لەکانگای دڵەوە بێتوانایی خۆم لەپاراستنی قبووڵ بکەم. کەسێك پرسیار لەپێغەمبەر (د.خ) دەکات لەکاتی نوێژکردن حوشتری خۆم ببەستمەوە یان بەئەمانەتی خودا بمێنێتەوە. لەوەڵامیدا فەرمووی:((بیبەستەوەو پشت بەخودا ببەستە.)) من نەمدەتوانی ئەنوەر ببەستمەوە. بەڵام لەوانەیە بەشێوەیەك لەشێوەکان دەمتوانی هاوکاریم. بەردەوام لەم لایەنەوە کێشەم لەگەڵ خۆمدا هەبوو. ئایا دەتوانم ساتەکانی گەیشتنی چارەنووسو رزگاری گیانی بزانم؟ ئایا پاراستنی لەبنەڕەتەوە لەدەرەوەی دەسەڵاتی مندابوو؟

گیرۆدەی کێشەی زۆری دەرونی دەبووم تاکو ساتەکانی کۆتایی ژیانی، لەراستیدا تاکو ئێستاش بەردەوامی هەیە. نیشانەکانی لەدەستپێکی هەڕەشەکانی ئیخوان موسلمین تاکو ئێستا وەك یەکبوو. ژان لەپشتەوەی سەرم دەستی پێدەکردو هەموو سەری دەگرتەوە، تاکو شوێنێك کەهەستی پێدەکەم مێشکم دەیەوێت بتەقێتەوە. خواردن لەناو گەدەم نامێنێتەوە. چاوەکانی تاریك دەبن‌و رووناکییەك کەبەچاوم بکەوێت وەك چاقوتیژن. لەمیسرو سەفەرەکانی دەرەوەم، هیچ پزیشکێك نەیتوانی دەرمانێکم بۆبنووسێت کەبۆ چاوەکانم باش بێت. هەموو پزیشکێك دوای ئەوەی هیچ هۆکارێکیان نەدەدۆزییەوە دەیانگوت:((سەرئێشەتان پەیوەندی بەدەمارەکانی سەرەوە هەیە.)) من خۆم ئەمەیانم دەزانی، شتێك کەدکتۆرەکان نەیان دەدۆزییەوە هەمان پاڵەپەستۆی بەردەوام کەلەژیانمدا گیرۆدەی دەبووم.

لەپاریس پزیشکێك پرسیاریکرد:((چۆن ئوقرەی ئەم ئازارە دەگریت؟ تاکو ئێستا هیچ کاتێك هاوار دەکەیت؟))

بۆم باسکرد:((بەهیچ شێوەیەك))

پرسیاریکرد:((چ دەکەیت؟))

گوتم:((زۆرجار داوای لێبۆرد لەدەوروبەری خۆم دەکەم‌و لەشوێنێکی بەتەنیا دەست بەگریان دەکەم‌و دواتر روخسارم خاوێن دەکەمەوە تاکو هیچ کەسێك نەزانێت.))

تەواوی تەمەنم ئەمەیانم دەکرد، دەردی خۆم لەناو دڵم دەشاردەوەو خۆم بەجۆرێك نیشاندەدا کەدەوروبەرم قبووڵ بکەن کەمن هەست بەئارامی دەکەم. پاراستنی ئەم ئارامییە لەبەرامبەر وڵات‌و هاوسەری خۆم دەپارێزم. سەرئێشەی بەردەوامی من نەرخی خۆشەویستی نیوانمانبوو.

رۆژێکی هەینی کەتەنیا هەمان رۆژ من‌و ئەنوەر پێکەوە دەبووین، پێم گوت:((ئەنوەر من فێری شوفێری بکە.)) زۆربەی ئافرەتانی گەنج کەدەمناسین دەیانوویست خۆیان فێری شوفێری بکەن تاکو بتوانن خۆیان بۆکڕینی کەلوپەلەکانی خۆیان بڕۆن‌و منداڵەکانیان لەدەرەوەی قاهیرە بسوڕێننەوە. بەلام من بیرۆکەیەکیترم هەبوو. ئەگەر ئێمە پێکەوە بەتەنیا دەبووین‌و یەکێك لەتوندڕەوەکان هێرشی دەکردە سەر هاوسەرم، دەبێت لەهەمان هەلومەرج چی بکەم؟ بەناچاری لەشوێنی خۆم دەبووم. لەخوێن رۆیشتنی زۆری دەمرد؟ نەخێر، ئەگەر من شوفێریم دەزانی دەمتوانی لەپشتەوەی ئوتۆمبێل درێژ بکەم‌و بەزووترین کات دەمتوانی بگەێنم بەنەخوشخانە. فێری شوفێری بووم.

((ئەنوەر من فێری تەقەکردن بکە.))

تەماشایەکی پڕ لەپرسیاریی لێکردم، بەڵام هیچ شتێکی نەپرسی‌و گوتی:((زۆرباشە.)) هەینی دواتر ڕۆیشتین بۆ بیابانی ئەهرام، دەمانچەیەکی بچوکی لەناو دەستم داناو چۆنیەتی نیشانەگرتنی فێرکردم. قووتویەکی بۆدانام وەك نیشانەو گوتی:((رازینیم چەك هەڵبگریت.))

گوتم:((دەزانم، بەڵام کاتێك پێکەوەین، زیاتر هەست بەئارامی دەکەم.))

گوتی:((دەزانم بەڵام هیوادارم هیچ کاتێك سوودی لێوەر نەگریت.))

پێکەنیم‌و گوتم:((بیردەکەیتەوە دەڕۆم دزی لەبانك دەکەم؟))

گوتی:((هەمان قووتی بکە بەئامانجی گولەکانت.))

چەندینجار نیشانەم گرت بەڵام بێسوود بوو. ئەوکات وەك ئێستا نزیك بین بووم، بەردەوام گولەکان قووتوویان نەدەپێکا، نەمدەتوانی جەستەی خۆم کۆنترۆڵ بکەم. گوتم:((ئەنوەر ببوورە دەبێت بۆرزگاری گیانی تۆ هاوار بکەم‌و داوای هاوکاری بکەم زۆر ئاسانتر دەبێت لەفێربوونی تەقەکردن.))

ئەنوەرو ناسر زۆر پێکەوە دەبووین یان ئەنوەر بۆنانخواردن دەڕۆیشتەماڵیان یان ناسر دەهاتە ماڵی ئێمە. زۆرجار من‌و ئەنوەر بۆبینینی هاوسەری (تەحیە)، دەڕۆیشتین. بەباوەڕی من پەیوەندی ئەم دوو ژن‌و پیاوە زیاتر لەڕادەی خۆی فەرمی‌و نەریتخوازانە دەهاتە بەرچاو. تەحیە هیچ کاتێك هاوسەری بەناو بانگ نەدەکرد، لەپێش ئێمە، بەسەرۆك بانگی دەکرد. پێنج منداڵیان بەهەمان شێوە. تەحیە ژنێکی شەرمین‌و جێگیربوو، کاتێك پێکەوە سەرقاڵی نانخواردن دەبووین زۆرکەم قسەی دەکردن. هەستی دەکرد لەتەنیشت پیاوەکان دانیشتن ئاسوودە نییە. هیچ کاتێك خۆی تێکەڵاوی بابەتەکانی سیاسی نەدەکرد، کەگفتوگۆی بەردەوامی سەرمێزی نانخواردنی ئێواران بوو.

ئەنوەر خۆشەویستی زۆری بۆناسر هەبوو، لەهەمان کات زۆر ڕێزی لێدەگرت، من بەهەمان شێوە ڕێزم لێدەگرت، بەڵام زۆرجار ناسر پیاوێکی دەمدەمی‌و سەرەڕۆ نەگونجاوبوو. پیاوێکبوو بەردەوام گومانی هەبوون، ڕەوشتێکی هاوبەش لەنێوان میسریانی سەروو، کەزۆربەیان توندڕەو بەخیلن. زۆرجار دڵم بۆی دەسووتا. دەمزانی لەدوو دڵی‌و گومانکردن لەوەفاداری دەوروبەری تاکو چ ڕادەیەك لەئازاردابوو. بەڵام دەمتوانی ئەم هەستەی هەزم بکەم.

سەرکەوتن لەشۆڕش دەبوو هۆکاری بەهێزکردنی گومانەکانی سروستی. دەساڵ بەنهێنی تەرخانکرابوون بۆ پێکهێنانی پێکهاتەی ئەفسەرانی ئازاد، لەولاتێك کەدواتر ئەم نهێنییە ئاشکرابوو سەرکەوتنێکی گەورەبوو کەناسر رۆژ بەرۆژ هەستی دەکرد پیلانگێڕییەکی هاوشێوەی دژی خۆی هەست پێدەکات. گومانەکانی کەیاوەڕانی رۆژانە بۆیان زیاتر دەکردن. پیلانگێڕییەکانی کەرۆژانە پەردەی لەسەر هەڵدەدرایەوە کە موسلمانانی توندڕەوو هەموو لایەنەکانی سیاسی رێکیان دەخستن.

ناسر زیاتر لەهەموو کەسێك باوەڕی بەئەنوەر هەبوو، دەیزانی بۆئەنوەر پاراستنی شۆڕش زۆر گەورەترە لەپلەو پۆست، بەلام زۆر باوەڕی بەباوەفاداری کەسانیتر نەبوو. دەوروبەری بەزانینیی ئەم خاڵە هەوڵی خۆیان دەدا دەروبەر لەهەموو ڕکابەرانی پاك بکەنەوە ئەمەش جۆرێك لەپاوانکاری دەسەلاتی دروست دەکرد. کەسانی گومان لێکراو رۆژ لەدوای رۆژ رەوانەی گرتووخانەکان دەکران. هیچ کەسێك لەخۆی پشتراست نەبوو لەبەرامبەر قسەکردنیان دەگیرێت یان گیرۆدەی لێکۆڵینەوە دەبێت. لەم سەردەمە نوکتەیەك لەسەر زارەکان دەگەڕا کەپیاوێك بۆپیاوێکیتر باس دەکات:((کەش‌و هەوا زۆر گەرمە،)) هاوڕێی لەوەلامدا دەلێت:((بڕیار نەبوو باسی بابەتی سیاسی پێکەوە نەکەین؟))

هەلومەرجی شێواوی میسر ئەنوەری زۆر ئازاردا. بۆئەنوەرم باسکرد:((ئەمەیان لەناو خوێنی جەمال عەبدولناسردایە ناتوانی هیچ کارێك لەم لایەنەوە بکەیت.))

وەك دیار زۆربەی خەڵکی میسر هاوڕایی ناسربوون، چونکە تاکو ئەوکات جەماڵ عەبدەلناسر لەناو خەڵکدا خۆشەویستی زۆری هەبوو. ناسر پێچەوانەی دەسەلاتدارانی پێشووی وەك مەلیك فارۆق گفتوگۆی لەگەڵ خەڵکدا بەزمانی پاراوەی عەرەبی دەکرد. زمانی فەرمی بەکارنەدەبرد هەمان زاراوەو وشەی بەکار دەهێنان کەلەبازارو کولانەکان قسەی پێدەکرا. جەماڵ عەبدولناسر کوڕی کەسێکی پۆستچی بوو خەڵك لەخۆیان دەزانی، پیاوێك وەك میسرییەکان بەیانیان پاقلەی دەخواردو رۆژانی هەینی بۆنوێژکردن سەردانی مزگەوتی دەکرد. رۆژانی پێنج شەممە وەك هەموو میسرییەکان کاروباری خۆی رادەگرت‌و گوێی لەکۆنسێرتی ئوم کلسوم دەگرت کەلەرادیویی قاهیرە بلاودەکرایەوە. بەتەواوی مانا میسرییەکی تەواوبوو.

جەماڵ عەبدولناسر غرورێکی نوێی دایە خەڵکی میسر، هەرچەند خەڵکانێکی زۆر هەژاربوون، بەلام خۆمان سەروەری ولاتی خۆمان بووین. هەواو بایەکی نوێ‌و روحێکی نوێی یەکسانخوازی

نوێبوو. خەڵك لەچینەکانی سەرەوە ئیتر بەزمانی فەرەنسی قسەیان نەدەکرد، زمانی عەرەبی لەسەرەوەی زمانەکانیتربوو. وەزارەتەکانی میسر لەلایەن بریتانیا بەڕێوە نەدەچوون هەموویان میسریبوون. هەزاران ساڵ لەژێردەستی بێگانەکان ئەمجارەیان میراسی خۆمان دووبارە دەدۆزییەوە.

لەسەردەمی حکومەتی ناسر، پەیوەندی لەگەڵ ئەورووپادا کەمتر دەکرایەوەو لەگەڵ وڵاتانی عەرەبیو موسڵمان زیاتر دەکرا. لەساڵی ١٩٥٥ناسر، ئەنوەری هەڵبژارد بۆسەرۆکی گشتی کۆنگرەی ئیسلامی کەتازە دامەزرابوو. دوای دووساڵی دواتر، ئەنوەر سەردانی زۆر کەسیکرد وەك مەلیك حوسێن لەئۆردن، سەرۆککۆمار شمعون لەلوبنانو مەلیك محەممەدی پێنجەم لەمەراکێش. چەندینجار سەردانی ماڵیزیا، ئەندونزیا، پاکستان، زۆربەی وڵاتانی موسلمان، خانەدانەکانی کەنداو، سەردانی سعودیا پەیوەندی زۆر نزیکی دروستکردن.

بەم شێوەیە ڕێگاکانی پێش ناسر ئەوەندە لەبار نەبوون. میسر لەناوخۆو دەرەوە، مەترسی زۆری لەسەر هەبوو. لەکانوونی دووەمی ١٩٥٥ ئانتۆنی ئایدن، سەرۆك وەزیری بریتانیا پاڵەپەستۆی خستە سەر ناسر تاکو لەگەڵ وڵاتانی تورکیا، عێراقو پاکستان لەپەیمانی بەغدا بەشداری بکات کەرێکەوتنێکی دوو لایەنەی بەرگریبوو لەژێر کۆنترۆڵی بریتانیا. ناسر ماوەیەك پێشتر بەرێکەوتن توانیبوو ئامادەیی بریتانیا لەمیسر سەرکەوتنی باش بەدەست بێنێت، رەتیکردەوە. دەستبەجێ وەك تۆڵەکردنەوە، ئیسرائیل بەپشتیوانی بریتانیاو ئەمەریکا هێرشی کردە سەر غەزەو قەنتیلاو سەبحەو ئۆردوگاکانی سەربازی ئێمە لەبیابانی سینا کەشوێنی سەربازی نەبوون. ئەم هێرشانە لەکۆتایی رۆژەکانی شوباتی ١٩٥٥، میسری خاوەن شۆڕشو ناسرو هەموو رۆژهەلاتی ناوەراستی گۆڕیی.

چەك، گەورەترین کێشەی ناسرو ئەنوەرو هەموو شۆڕشگێڕەکان هەژمار دەکرا، تاکو هەمان سات حکومەت چاوەڕێی شەڕکردنی لەگەڵ ئیسرائیل نەبوو. ناسر بەردەوام باسی کێشەکانو چاکسازیی کۆمەڵایەتی دەکرد هەموو هێزو تواناو بودجەی حکومەتی بۆریشەکێشکردنی سێ بەڵای گیانی نەریتخوازی میسر: واتە هەژارییو نەخوێندەوارییو نەخۆشی تەرخان دەکرد، بەڵام ئێستا کڕینی چەك قسەی یەکەمبوو. چەکی سوپای ئێمە هەمان چەکی کۆنو لەکارکەوتووی سەردەمی مەلیك فارۆق بوو. هەمان چەکی کەمیسری لەشەڕی فەلەستین زۆر خراب تێکشکاند، تێکشکانێك کە کەرامەتی میسری شکاند. ناسر بۆکڕینی چەك رووی لەبریتانیاو ئەمەریکا کرد.

ئەنجامی ئەم گفتوگۆیانە پێشنیارێکی نابەجێی هەلومەرجی نوێبوو.. وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا، جان فاستەر دالسو سەرۆك وەزیری بریتانیا، ئایدن لەسەرەتا دژی چەك فرۆشتن بەمیسربوو، تەنیا بەمەرجێك حکومەتی نوێ بۆروونترکردنی کێشەی تۆکەندی سوئێز رێگای ئاوی بەدەرهاوردەی زۆر بگەن بەرێکەوتن. ئایدن دواتر داواکارییەکانی خۆی زیاتر دەکاتو رایگەیاند تاکو ئەوکاتەی کەمیسر رێکەوتنی نوێی بەرگری لەگەڵ بریتانیا واژۆ نەکات، بریتانیا چەك بەمیسر نافرۆشێت. بێگومان ناسر رەتی دەکاتەوە.

پێشنیاری دالّس بۆئەوەی چەکی ئەمەریکا بداتە میسر زۆر لەبریتانیا خراپتربوو. دەڵێت ئێمە کاتێك چەك بەمیسر دەدەین کەلەژێر چاودێری راوێژکارانی ئێمە دابێت. ناسر پێشنیاری دالس رەتدەکاتەوە، ئامادە نەبوو ئازادیو سەربەخۆیی نوێی میسر بکاتە قوربانیو خۆی بکاتە بووکەشووشەی ئەمەریکا.

هەردوو ولاّتی رۆژئاوا لەقبوولّ نەکردنی مەرجەکانیان لەلایەن ناسر تووڕەدەبن. بەلاّم ناسر پێداگربوو کەنەکەوێتەژێردەستیانو سەربەخۆیی خۆی بپارێزێت. لەدێرزەمانەوە میسر نەریتی بێ لایەنی خۆی پاراستبوو، نەریتێك کەچەندینجار لەحکومەتی وەفد، لەسەردەمی پاشایەتی فارۆقو سەرۆککۆماری ژنەراڵ نەجیب، نیشانیدابوو. لەنیسانی ١٩٥٥، ناسر بێ لایەنی میسری بەفەرمی راگەیاند. دوای بەشداریکردنی لەیەکەم کۆنفرانسی ئاسیا ـ ئەفریقیاو ولاّتانی نابڕیاردەر لەباندونگی ئەندونزیا، ناسر رایگەیاند میسر دەچێتە ناوگرووپی ولاّتانی نابڕیاردەری جیهانی سێیەم. ئەم بڕیارە هەموو جۆرە رێکەوتنێکی بۆکڕینی چەك، لەنیوان میسرو بریتانیا، بۆهەمیشە کۆتایی هات، ناسر ناچاربوو بۆکڕینی چەك روو لەرۆژهەلاّت بکات. لەئەیلوولی ١٩٥٥، ناسر بۆکڕینی چەك رێکەوتن نامەیەکی لەگەڵ چیکوسلواکیو یەکێتیی سوڤیەت واژۆکرد.

لەساڵی ١٩٥٦، شۆڕشی میسر هەنگاوی دەنایە قوناخی دووەمی خۆی. یاسای نوێ کاری پێدەکراو بەپێی ئەم یاسایە ولاّت دەبوو خاوەن سیستەمی حکومەتی نوێی خۆیو سەرۆککۆمار هەڵدەبژێردرا. لەکاتی هەڵبژاردنی سەرۆککۆمار لەمانگی حوزەیران کاتێك ناسر بەزۆرینەی دەنگ سەرکەوت، هیچ کەسێك سەری سۆڕنەمابوو لەسەرکەوتن من خۆم بەهەستێکی زۆرەوە دەنگم پێدا، نەك لەبەر ئەوەی کەمن دەمزانی رێبەرێکی گەورەیە، چونکە بویەکەمجار مافی دەنگدانی بەئافرەتاندا. وەك دیار ئایندەیەکی روون لەپێشمانبوو. ماوەیەکی کورت دوای

هەڵبژاردن، کاتێك کۆتا سەربازانی بریتانیا لەمیسر دەڕۆیشتنە دەرەوەو ناسر بەدەستی خۆی ئاڵای وڵاتی ئێمەی لەسەر بارەگای پێشووی بریتانیا لەنۆکەندی سوئێز بەرزکردەوە، خەڵکی میسر بەخۆشحاڵی لەسەر شەقامەکان هەڵدەپەڕین.

ئەمەریکاو بریتانیا دوای مانگێك لەتێپەڕبوونی هەڵبژاردنو سەرکەوتنی جەمال عەبدولناسرو کڕینی چەك لەبلوکی ڕۆژهەڵات بۆسزادانی ئێمە دەستیان لەپەیمانو بەڵێنی خۆیان هەڵگرتن لەدروستکردنی بەنداوی ئەسوان کەبۆ میسر زۆر پێویستبوو، هیوای میسر بەنداوی ئەسوانبوو پێویستی سەرەکی خەڵکی میسربوو.

میسر ئیتر نەیدەتوانی پشت بەکشتوکاڵی دواکەوتوویی خۆی ببەستێت. بەنداوی ئەسوان هەزاران کیلو وات کارەبای بەرهەم دەهێنا کەبۆ پێشکەوتنی پیشەسازیی کردنی وڵات زۆر پێویستبوو. بەنداوی گەورە چەندین هەزار هێکتار زەوی بێکەڵکی لەبیابان کەبتوانێت سێ جار لەساڵێکدا بەرهەم بدات ئاودێری دەکرد، زکی خەڵکی برسی تێردەکرد کەبەخێرایی زیادی دەکرد. بەنداوی ئەسوان کارەبای بۆهەزاران گوندی بەرهەم دەهێنا کەچەندین سەدەبوو تەنیا سوودیان لەچرای نەفتی دەبینی. پرۆژەیەکی بێسوود نەبوو. بەنداوی گەورە لەناو دڵی شۆڕشگێڕەکانی میسر جێگای خۆی هەبوو. هیوایەك کەبریتانیاو ئەمەریکا لەناویانبرد.

جارێکیتر ناسر ڕووی لەرۆژهەڵاتکردەوە، یەکێتی سۆڤیەت دەستبەجێ پێشنیاری بودجەی بۆ بەنداوی گەورەو دەستپێکردنیدا. ئەم پرۆژەیە ڕزگاربوو. بەڵام تاکو پێشکەشکردنی وتاری ناسر لە٢٦ تەمووزی ١٩٥٦ لەئەسکەندەرییە، بەبۆنەی چوارەم ساڵی ڕۆیشتنی مەلیك فارۆق لەمیسر، هیچ کەس نەیدەزانی کەناسر چەند لەخیانەتی ڕۆژئاوا رەنجاوە. داوا لەئەنوەر دەکات سەردانی ئەسکەندەرییە بکات، بەڵام لەساتەکانی کۆتایی ئەنوەر بەهۆی هەوکردنی کۆئەندامی هەرسەك نەیتوانی سەردانی بکات.

ناسر بۆی باسدەکات:((بەداخەوەم کەلەتەنیشتم نابیت.)) دواتر داوایەك لەئەنوەر دەکات کەبۆی جێگای سەرسوڕمانبوو. گوتی:((داوا دەکەم لەرێگای رادیو گوێی لەوتارم بگریت.))

کاتێك ئەنوەر لەقاهیرە گوێبیستی وتاری ناسربوو، من لەگەڵ خێزانم لەپۆرت سەعید بووم، لەهەمان شوێن گوێبیستی وتاربیووم، هەموو خەڵکی میسر گوێیان لەوتاری ناسر دەگرت، کەسێك باوەڕی نەدەکرد کەبەدروستی گوێبیستی دەبێت. ئەوەی کەگوێبیستی دەبووم ئەوپەڕی دوورتری خەیاڵەکانم بوو.

ناسر دەیگوت:((ئێمە هیچ کاتێك رابردوو دووبارە ناکەینەو، خاوێنو دەکەینەوە، مافی خۆمان لەنۆکەندی سوئێز دەگەڕێنینەوە... ئەم نۆکەندە موڵکی حکومەتی میسرە.)) منو دایكو باوکم لەپۆرت سەعید بەسەرسوڕماوی تەماشای یەکترمان دەکرد. ناسر باسی چی دەکرد؟ بەردەوام دەبێتو دەڵێت:((ئێستا کەمن قسەتان بۆدەکەم بەشێك لەبرایانی میسریتان بەرێوەبردنی کۆمپانی نۆکەند بەدەستەوە دەگرن، ئێستا سەرقاڵی بەدەستەوەگرتنی نۆکەندن، کۆمپانیایی میسر بۆ نۆکەند نەك کۆمپانیایی بیانی بۆنۆکەند! لەئێستا بەدواوە ئایندەی خۆمان بەرێزو پایەبەرزی دروست دەکەین!))

لەسەرتاسەری میسر دەست بەخۆپیشاندان کرا، لەپۆرت سەعید پیاوەکان دەستی یەکتریان گرتبوو پێکەوە هەڵدەپەڕین، ئافرەتان بەخۆشیو شادی هلهلەی خۆیان بەسەرخەڵکدا بلاو دەکردەوە. هەندێك کەسیتر بەشکاندنی پیکەری بۆرۆنزی فردیناند دۆلیسپس، کەسێکی فەرەنسیبوو کەنۆکەندی سوئێزی دروستکردبوو، کردیان بە جەژن. من هەوڵی خۆمدا زۆر بەم بابەتە هەستیار نەبم چونکە دووگیانی من دوومانگی خۆی تێپەڕ دەکرد. بەلاّم وتاری ناسرو هەوڵەکانی ئازایانەی هەموومانی گۆڕیبوو.

لەکۆتایدا ئازایانە لەبەرامبەر هێزەکانی گەورە راوەستاو کەماوەیەکی درێژ بەسەر میسر فەرمانڕەوایی خۆیان کردبوو، سەربەرزی میسری گەڕاندەوە. ناسر بەوشەیەك، بەنرخترین لایەن بۆرۆژئاوا - نۆکەندی سوئێزی - خۆماڵیکردو دەبێتە قارەمانی ئۆستوورەیی میسر. رایگەیاند لەئێستا بەدواوە ٣٥ ملیون دۆلار داهاتی ساڵانە ناچێتە گیرفانی کۆمپانیاکانی بریتانیو فەرەنسیو ئیتر ناتوانن کۆنترۆڵی بکەن، بۆخاوەنی راستەقینەی دەگەڕێتەوە، واتە میسر. ئەم داهاتە بۆخۆمان دەبێت ئەگەر ویستمان بەنداوی ئەسوان تەواو بکەین. بەم شێوەیە رێز لەسەدو بیست هەزار کرێکاری میسری دەگرین کەلەکاتی دروستکردنی نۆکەند گیانی خۆیان بەختکرد.

بەرەو تەلەفۆن رۆیشتم پەیوەندیم بەئەنوەر لەقاهیرە کرد. هاوارم کرد:((ئەنوەر گوێبیستی رادیو بووی؟ گوێبیستی ناسربووی دەڵێت نۆکەندی سوئێز بۆخۆمان دەگەڕێتەوە؟)) دەنگی ئەنوەرم نەدەبیست هاواری خەڵکم دەبیست کەلەماڵی ئێمە کۆبوونەوە، دەنگی ئەنوەرم باش نەدەبیست وەك ئەوەبوو کەئاوێکی ساردیان بەسەرمدا کردبێت گوتی:((من هاوبەشی ئەم خوشحاڵییەم، بەلاّم نیگەرانی دەرئەنجامو کاردانەوەکانم. رۆژئاوا ئۆقرەی لەدەستدانی نۆکەندی سوئێزی نابێت. ئێمە تاکو ئێستا ئامادەی شەڕکردنمان نییە.))

ئایا مەترسیدارتر لەدەنگی ئاگادارکردنەوەی هاتنی هێرشی ئاسمانی هەیە؟ جگە لەتەقەکردن ترسناکتر بوونی نییە. لە٢٩تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٥٦، بۆیەکەمجار دەنگێکم بیست کەلەتەواوی تەمەنم ئەوەندە منی نەلەرزاندبوو.

ناسر دوای ئەوەی وڵاتانی وەك بریتانیاو فەرەنساو ئەمەریکا، بەباوەڕی خۆیان میسریان سزا دەدا لەبەرامبەر نۆکەند هەموو دارایی میسریان لەرۆژئاوا بلوك کرا، بەڵام دیسان ناسر خۆراگریکرد. ئێستا ئیسرائیل بەشێوەی باوەڕ نەکراو هاوکات لەگەڵ هێرشی ئاسمانی فرۆکەکانی بریتانیو فەرەنسی بۆ سەرقاهیرە. بیابانەکانی سینای داگیرکردن، ئەمەیان لایەنێکبوو کە بەداگیرکاری سێ لایەنە ناوی دەرکردبوو، بەڵام رۆژئاوا ئەمەی بەشەڕی سوئیز ناودەبرد.

هەمووما سەرمان شێوابوو چۆن دووهێزی گەورەی جیهان بۆهێرشکردنە سەر وڵاتێکی بێچارەی وەك میسر، پشتیوانی لەهێزەکانی ئیسرائیل بکەن؟ خۆدی ناسر لەسەر یەکێك لەخانووەکانی قاهیرە تاکو نیشانەی بریتانیاو فەرەنسای لەسەر باڵی فرۆکەکان نەبینی باوەڕی نەدەکرد، بەڵام دیسان نائومێد نەبوو. بریتانیاو فەرەنسا لەرۆژی یەکەمی هێرشکردنە سەر قاهیرە موڵەتی دوانزدە کاتژمێریان دایە ناسر تاکو هێزەکانی میسر بۆدوانزدە کیلومەتری نۆکەندی سوئیز بگەڕێنێتەوە بۆدواوە، دەیانوویست جگە لەنۆکەندی سوئیز، پشت لەتەواوی ناوچەی سینا بکەین، ناسر ئەم مۆڵەتدانەی رەتکردەوە، خۆی رادەستی تاکتیکەکانی ترساندنی گەورە هێزەکان نەکرد.

کچی بچوکم لوبنا لەترسی ئاگادارکردنەوە خۆی لەباوەشم دەشاردەوە، بەئێمەیان راگەیاندبوو لەکاتی ئاگادارکردنەوە خۆیان لەناو ژێر زەمینەکان حەشاربدەن بەڵام من چۆن دەمتوانی منداڵێك لەباوەشو یەکیتریان بەرێگایەوە بتوانم نۆنهۆم برۆمەخوارەوە لەشوێنی خۆمان دەماینەوە، فرۆکەکان ئاسمانی قاهیرەیان رووناك دەکردەوە بۆئەوەی بۆمب هاوێژەکانی بریتانیو فەرەنسی بتوانن ئامانجەکانی خۆیان دەست نیشان بکەن. بەڵام بەپێی بڕیاری حکومەت هەموو شوێنێك تاریك دەکرا. لوبنا سەری خۆی لەسەر شانم دادەناو داوای دەکرد چرایەك ژوورەکە رووناك بکات، ترسی لەکاتی تەقینەوەی بۆمبەکان زیاتر دەبوو، هاواری دەکرد رێگا لەم دەنگە ترسناکانە بگرم. بێگومان نەمدەتوانی.

شەوێکیان لوبنام برد کەتەماشای ئاسمان بکات بۆئەوەی ترسی کەمتر ببێت لەهەمان کات فرۆکەکان ئاسمانی قاهیرەیان رووناك کردبوو، بۆم باسدەکرد ئاسمان چەند جوانو رووناکە، بۆئەوەی لوبنا ترسی نەمێنێت ترسی خۆم دەشاردەوە. بۆم باسدەکرد:((دەبینی ئاسمان وەك تەمووز بەیاری ئاگرینەکان رووناك کراوە.)) بەلآم لەتەمەنی دووسالّی ئەمەیانی دەزانی.

بۆماوەی یەك هەفتە رادیوی ئیسرائیل پرۆپاگەندەی دەکردن ئەمشەوفرۆکەکانی ئێمە کارگەیەکیان بۆمباران کرد، شەوی رابردوو رادیوی قاهیرەکرایە ئامانجو نووسینگەی سێ رۆژنامە وێرانکران، ئەم شەرەی دەرروونی هەموو کەسێکی دەترساند. ئەنوەر دەیویست بۆ فەرمانبەرانی رۆژنامەی کۆماری ببێتە نموونەی ئازایەتی شەوانە لەناو نووسینگەی رۆژنامەی کۆماری دەمایەوە. من لەماڵەوە لەتەنیشت تەختی لوبنا دەمامەوەو لەتاریکای شەودا گۆرانیم بۆدەگوتنو چیرۆکم بۆدەگێرِانەوە تاکو لەماندوو بوون خەوی بەچاوکاندا دەهات. بەلآم کاتێك بەئاگا دەهاتەوە دەستی لەگەردنم دەکرد بەئەڵقە. بینینی ئازاری کچم بۆئێمە ئازارێکی زۆرتربوو، بەهەمان شێوە بۆمنداڵی ناوزکم بەهەمان شێوەبوو.

منو لوبنا تەنیا جارێك رۆیشتنینەخوارەوە بۆخۆحەشاردان چونکە بۆمبارانی هەمان شەو زۆر ترسناکبوو، چونکە ئیسرائیل رایگەیاندبوو پردەکانی ناو قاهیرە دەروخێنێت. ماڵی ئێمە زۆر لەپردی عەباس نزیکبوو.

دوای بەرزبوونەوەی دەنگی ئاگادار کردنەوە هەموویان هاواریان دەکرد. منو لوبنا لەنزیك کەسێك بووین کەبەردەوام هاواری دەکرد. بەرزتر لەدەنگی ئاگادارکردنەوە هاوارم کرد:((تۆبۆچی ئەوەندە هاوار دەکەیت؟ هەمووئەمانە دەترسێنیت.))

بەچاوەکانی پرِ لەترس گوتی:((خاتوو سادات ئاگات لەدەنگی ئاگادارکردنەوەی مەترسی نییە؟))

گوتم:((بەڵێ دەبیستم زۆریش ترسناکە، بەلآم هاوارەکانت رێگایان لێ ناگرێت. خوزگە دەیانگرت. بەلآم ناگرێت.))

تەماشای کردم. لوبنام بەتوندی لەباوەش گرتبوو ئەم بەرەو ئەوبەرم پێدەکرد، لەترسان دەلەرزیی‌و گوێچکەکانی خۆی بەتوندی گرتبوون.

گوتم:((ئەگەر بریاربێت بکوژرین بابەرێزەو بکوژرین، ناتوانین هیچ کارێك بکەین، دەبێت ئارامی خۆمان بپارێزین.))

گوتی:((نازانم باسی چی دەکەیت، خاتوو سادات.)) بەڵام ئیتر هاواری نەکردو هێرشی ئاسمانی فڕۆکەکان کۆتایی هاتبوو.

ئیتر هیچ کاتێك بۆخۆشاردنەوە نەڕۆیشتینە خوارەوە. ڕۆژی دواتر ئەنوەر گوتی: ((خۆت‌و لوبنا بڕۆن بۆماڵی خۆشکت لەهاوین هەوار.))

سەری خۆم هەژاندو گوتم:((لوبنا ڕەوانە دەکەم بەڵام من ناڕۆم لەگەڵ تۆدا بمێنمەوە. هەرهیچ نەبێت پێکەوە لەناو مەترسیداین.))

بەڵام ئەنوەر پێداگری لەسەر قسەی خۆیکرد. وەك بڕیار گوتی:((تۆ دەبێت لەگەڵ لوبنا بڕۆیت نامەوێت تەواوی ئەم ماوەیە لەنیگەرانی ئێوە لەئازاردابم، من تاکو کۆتایی هێرشەکان دەبێت شەوانە لەناو نووسینگەی ڕۆژنامە بمێنمەوە.))

دواتر من‌و دایك‌و باوکم‌و لوبنا ڕۆیشتین بۆناو موڵکی خێزانی هاوسەری خوشکم لەشاری (بوحەیرە) دووکاتژمێر لەقاهیرە دووربوو.

شەو ڕۆژ گویمان لەرادیو دەگرت‌و گوێبیستی هەواڵەکانی شەڕ دەبووین. تاکو ئەوکات نەماندەتوانی هەمان ڕووداوی کەبەسەر ئێمە هاتبوو باوەڕ بکەین. هەموو هەواڵەکان لایەنی خرابیان هەبوو. فڕۆکەکانی نوێ کەیەکێتیی سۆڤیەت بەئێمەی دابوون‌و فڕۆکەوانەکان بتوانن بەباشی ڕاهێنانیان بکەن لەلایەن دوژمن دەکەوتنەخوارەوە. بەندەری پەرت سەعید بەهۆی هێرشی فڕۆکەکان ویرانکرابوو، شارەکانی نزیك تۆکەندی سوئێز، ئیسماعیلییە شوێنێك هاوینان لەسەردەمی منداڵی بەسەرمان دەبردو بۆیەکەمجار ئەنوەرم لەهەمان شوێن بینی. ئێمە بەرگریمان نەبوو، بەڵام هێرشبەرەکان بەردەوام هێرشیان دەکرد. ناسر زۆربەی هێزەکانی بەمەبەستی بەرگریکردن لەخاکی سەرەکی میسر لەبیابانی سیناجێگیر کردبوون، ئیسرائیل لەماوەی دوو ڕۆژ بیابانی سینایان تێپەڕکردو گەیشتنە تۆکەندی سوئێز.

فیدایانی جێگیرکراو لەتۆکەندی سوئێز، جارێکیتر بەئازایەتی تەواوی خۆیان بەتاك تەنیا شەڕی خۆیان لەگەڵ داگیرکاران دەستپێکردەوە. ئافرەتان، بەبردنی خواردن بۆخزمانی خۆیان، چەکیان لەناو خواردنەکان دەشاردەوە بەقاچاخی دەیان گەیاندە بەندەری دووریپێچکراوی پەرت سەعید، پیاوەکان بەسوود وەرگرتن لەهەمان چەك‌و فیشەك هێرشی سەر هێزەکانی بریتانیاو فەڕەنسییان کرد. بەبۆمبەکانی بەدەست دروستکراو ئاگریان گرت. کچانی گەنج سەربازەکانیان دەکێشانە ناو کۆڵانەکان‌و پیاوەکان قورگی ئەم سەربازانەیان دەبڕی. هیچ

ڕێگایەك نەبوو کەئەم هاوڵاتیانە بتوانن ڕێگا لەم داگیرکارانە بگرن. بەڵام ئەم هێرشەی نایەکسان شەپۆلێکی نوێی نەتەوەخوازییو هەستی ئازایەتی دروستکرد. یەکێك لەهاوڕێانی سەردەمی منداڵیم لەپەرت سەعید لەکاتی هەوڵدانی بۆتەقاندنەوەی شەمەندەفەرێکی سەربازانی بریتانیا کوژرا.

سێ ڕۆژ دوای هێرشی ئاسمانی نەتەوە یەکگرتووەکان هەردوو لایەنی بۆگفتوگۆ بانگێشت کردن، میسر دەستبەجێ قبووڵی کرد، بەڵام بریتانیاو فەڕەنسا ئەمەیان ڤیتۆ کرد. پێنج ڕۆژی دواتر، لەهەشتی تشرینی دووەم، جارێکیتر پێشنیاری ئاگربەست کرایەوە، ئەمجارەیان هەموو وڵاتانی ناو شەڕ قبووڵیان کرد. بەڵام شەڕ لەناوچەی نۆکەند بەردەوامی هەبوو. قاهیرە زیانی زۆری بەرنەکەوتبوو، ئامانجی سەرەکی هێرشەکانی سەر قاهیرە فڕۆکەخانەو دەوروبەری دەگرتەوە. بەڵام لەلایەنی شەڕی دەروونی زیانی زۆریان بەرکەوتبوو، لەوانە من.

لەبوحەیرە زۆرنەمابوو لەنیگەرانی گیرۆدەی شێتبوونبم. هەواڵی ناو قاهیرە چییە؟ لەوانەیە هاوسەرم‌و سەرانی حکومەت کوژرابن؟ هەرچەند دەوروبەر بەچاوی هاوسەری یەکێك لەشۆڕشگێرەکانی تەماشای منیان دەکرد نەمدەتوانی ترسی خۆم نیشانی دەوروبەر بدەم. ڕۆژانە بۆوەرگرتنی هەواڵ‌و بەدواداچۆنی هەواڵەکانی رادیو. بەردەوام گاڵتەم لەگەڵ هاوسەری خوشکم، مەحموود ئەبو وافیە دەکرد. بەڵام لەکانگای دڵەوە دەترسام، وتاری ناسر لەرەخنەگرتن لەدوژمنان‌و نەرخاندنی ئازایەتی میسرییەکان. بەباوەڕی تەواو لەهەمان کات بەهێز وتاری خۆی پێشکەش دەکرد، من وەك زۆربەی میسرییەکان گویم هەموو وشەکانی دەگرت. بەڵام شەوانە زۆرجار ئەم بیروباوەڕی خۆم لەدەست دەدا، چونکە تاکو ئەوکات لوبنا ترسی زۆری لەفڕۆکەکان هەبوو بەتەنیایی خەو بەچاوەکانیدا نەدەهات، تەماشام دەکردو بیرم دەکردەوە ئایا دەتوانی جارێکیتر باوکت ببینی؟ یان دەبیت بەکچێکی هەتیو؟

لەدوانزدەی تشرینی دووەم، دوو هەفتە دوای هێرشی ئاسمانی بۆسەر قاهیرە، دەردی دووگیانی من دەستی پێکرد.هاوارم دەکرد:((ئێستای کاتی نییە.)) چونکە تەنیا شەش مانگ‌و نیو تێپەڕی کردبوو، هەستم دەکرد منداڵەکەم دەمرێت. بەڵام پاڵەپەستۆی شەڕ لەسەرهەمووومان زیادی کردبوو لەهەمان ژانەکانی دووگیانیم زیادی دەکرد.

بەیانی خوشکم گوتی:((دەبێت پەیوەندی بەئەنوەر بکەین.))

گوتم:((نابێت دەردێکیتر لەسەر دەردەکانی زیاتر بکەم. من وەك هەموو ژنەکانی لادێی کاری خۆمان دەکەین.))

ئێوارەی هەمان رۆژ خوشکم تەلەفۆنی بۆپزیشکێکی خۆجێی کرد. پێم گوت:((تاکو ئێستا دەستان لەکاروباری مندالّ لەدایکبوون هەبووە؟))

بەدوودڵی گوتی:((بەڵێ)) دواتر گوتی من پزیشکی گشتیمو هیچ تایبەتمەندی نەخۆشییەکی دیاریکراوم نییە.

بەگەیشتنی شەو زۆر نەمابوو نیگەرانیم لەناوم ببات. بەبێ چاودێری پزیشك منداڵم لەبەر جۆری لەدایکبوونی لەناوم دەبرد. نەمدەتوانی سەردانی نەخوشخانە بکەم لەهەمان ناوچە هیچ نەخۆشخانەیەکی تایبەت نەبوو نەخوشخانەکانی حکومەتی پڕاوپڕبوون لەبریندارانی شەڕ، دەبێت خۆدی نەخوشخانە یاسای تاریکی رەچاو کردبا. دەبێت دانم بەخۆمدا گرتبا بەلاّم ئایا دەمتوانی؟ لەتوندی دەردو ژان شێت دەبووم. بۆدەرگای خودا دوعام دەکردن، رێگام پێی بدە ئەم منداڵە زیاتر لەناو زکم بمێنێتەوە. بەلاّم دەردم توندو خێراتر دەبوو. هاوسەری خوشکم لەقاهیرە بۆچاك‌و چۆنی تەلەفۆن دەکات. خوشکم بۆی باسکرد جیهان گیرۆدەی ژانی منداڵبوونەو رووی لەمن کرد کەئایا بۆئەنوەر باس بکات بەسەر  تێم گەیاند ئاگاداری بکەن، نەمدەتوانی بەتەنیایی بەرگە بگرم.

لەکاتژمێر سێی بەرەبەیان رۆژی سیانزدەی تشرینی دووەم بەهەستم هەستم دەکرد پزیشك هاتووە. دواتر زانیم کەئەنوەر ئۆتۆمبیلێك ڕەوانە دەکات بۆهێنانی دکتۆر مەحموود مەجدی ئیبراهیم، هەمان پزیشکی کەلەکاتی لەدایکبوونی کوڕی فارۆق ئامادەبوو. مەحموود مەجدی ئیبراهیم پێداویستی نەشتەرگەرییو پەرستیارێکی شارەزای لەگەڵ خۆی دێنێت بەخێرایی خۆیان دەگەێنن. بەلاّم ئەم سەفەرە دوو کاتژمێر درێژەی دەکێشا بەلاّم بۆ ئەمانە دەبێتە چوار کاتژمێر، چونکە رێنەمایی قەدەخەبوون بۆ هەمووکەسێك وەك یەکبوو، ئەمانە ناچاربوون لەهەموو بازگەکان لێپرسینەوە لەم دوو کەسە بکەن‌و بزانن بۆچ شوێنەك‌و مەبەستێك دەڕۆن، دەبێت لەتاریکای شەو رۆیشتبان چونکە رووناکی ئۆتۆمبێلەکان وەك ماڵەکان قەدەخەکراوبوو بەلاّم من هیچ هەواڵێکم لەئەمانە نەبوو.

کاتێك چاوم بەرووخساری پزیشك کەوت ناسیم‌و گوتم:((ئێستا دەتوانم منداڵەکەم لەدایك ببێت.)) هەموو دەردی دووهەفتەی پێشم خستنە دەرەوە.

بەردەوام بۆپزیشکم باسدەکرد:((خودا ولآتی ئێمە بپارێزێت. خودا جەمالْ عەبدولْناسر بپارێزێت!)) لەکاتی لەدایکبوونی منداڵ ولآت پارێزی من دەگەشایەوە. هاوارم دەکرد: ((بۆچی بریتانیا ولآتی ئێمە وێران دەکات؟ زیندوو بێت میسر! زیندوو بێت سەرۆککۆمار.))

کاتێك بەهۆش هاتمەوە بینیم کوڕێکی بچووکم لەتەنیشتە کێشی تەنیا کیلویەك‌و چوار سەد گەرم بوو.

ژانی ولآت پارێزیم لەبەرچاو گیرابوو. پزیشك هەمووکاتێك بەپێکەنین دەیگوت: ((ئەمەیان یەکەم لەدایکبوونی سیاسی بوو.))

کوڕم زۆربچوکبوو بۆیە ناچاربوون بردیان بۆنەخۆشخانەی مەحموود مەجدی ئیبراهیم لەقاهیرە، هەناسەیان پێدەدا بەلآم دەنگی خیس خیسکردنی ناسروشتی لەدەمی دەهاتە دەرەوە ئەم دەنگە زیاتر بەجوجەلۆکە دەچوو تاکو منداڵ، دەمزانی کێشەیەکی هەیە. چەندین جار لەبازگەکان راگیراین‌و پرسیاریان دەکرد:((ئێوە کێن؟)) هەلومەرجی من زۆرباش نەبوو کەهیچ قسەیەك بکەم دوای ئەوە سەربازەکان رووناکیان دەخستە سەرچاوەکانم رێگایان بەئێمە دەدا.

لەناو ئۆتۆمبێلدا کاریگەری دەرمانی بێهۆشی کاریگەری خۆی هەبوو. پشتراستبووم کە لەناو فیلمی بابردووم کەلەناویدا ئەسکارلت منداڵی ملانی لەناوشەڕی ناوخۆیی ئەمەریکا بەبێ هەبوونی هیچ پێداویستییەکی پزیشکی دێنێتە دونیاوە. کاتێك گەیشتینە نەخۆشخانەو نەمتوانی بەهەنگاوەکانی خۆم برۆم منیان گەیاندە ناو نەخۆشخانە. بەردەوام هەناسەیان بەمنداڵم دەدا سیپەلآکی ئەوەندە گەشەی نەکردبوو کەبتوانێت هەناسەی خۆی هەڵمژێت.

لەیەکێك لەژوورەکانی نەخۆشخانە لەهەلومەرجی بێهۆشی خۆم دەردەهاتم، سەرم دەسوڕا باوکی ئەنوەرم بینی هاتەژوورەوە، بەبێ ئەوەی قسەیەك بکات، وەك کڕنۆش بردن خۆی خستەخوارەوەو دەستی بەدوعاو پارانەوە لەخودا کردو بەردەوام دەیگوت:((خوایە زۆرسوپاس کەکوڕی منت کرد بەخاوەن کوڕ.)) دایکی ئەنوەر سەییدە برین بەجلوبەرگی ڕەش هاتەژوورەوە، بەنیگاکانی لێل دەمبینی کەوەك شێت‌و سەماکاران بەدەوری ژوورەکە دەسوڕایەوە تەنیا کاتێك دەیویست ماچم بکات بەتەماوی دایك‌و باوك‌و براکان‌و خوشکم دەبینی کەلەژوورەکەدا دانیشتبوون، سەییدە برینم دەبینی کەدەچێتە سەرەوەو خوارەوە بەردەوام کڕنۆشی دەبردو سوپاسی خودای دەکرد. پێش ئەوەی چاوەکانم بەتەواوی لەسەر یەکتر دابنێم بیرم دەکردەوە لەوانەیە سەرخۆشی لایەنێکی لەم جۆرە بێت.

بەیانی رۆژی دواتر کاتێك ئەنوەر سەردانی نەخوشخانەی کرد، گوتی:((نەرۆ بۆبینینی منداڵەکەمان هاوشێوەی مەیموونە کچی ئێمە زۆرجوانترە.))

ئەوکات نەمدەزانی پزیشکان پێیان راگەیاندبوو لەوانەیە بمێنێت بەڵام تەنیا ٥٠٪ کەمتر ئومێدمان بەمانەوەی هەیە. ئەوەی لەهەمان کات دەمزانی دڵم بۆئەنوەر دەسووتا، چونکە دەمزانی دەیویست باسی چی بکات:((منی بۆ هەواڵی مردنی کورەم ئامادە دەکرد هەرچی رووبدات ئەم بچکۆلانە زۆر گرنگ نییەو نیگەرانی من نەبێت. من بەبوونی تۆ لەگەڵ لوبنا رازیم.

بەڵام باوەرم بەقسەکانی نەبوو.

پێشتر بەرنامەی ئێمە ئەوەبوو کەناوی باوکم سەفوەت لەسەر کورم دابنێین. بەڵام لەبەر هێرشکردنە سەر میسرو بوێری جەماڵ عەبدولناسر، بریارماندا، بۆرێزگرتن لەسەرۆککۆمار ناوی بکەین بەجەماڵ. جەماڵی بچکۆڵە دەبێت بۆبەزیندوومانەوەی خۆراگری کردبا. زۆرجار بەلاواندنەوە بۆم بەنەرمی باسدەکرد:((تۆدەبێت بمێنێتەوە تۆسەربازی، وەك هەمان جەماڵ عەبدولناسر کەتۆهەڵگری هەمان ناوی.))

لەسەرەتا جەماڵ توانای خواردنی شیرو قودانی نەبوو، هەوڵی خۆمدا بەلۆکە شیری پێی بدەم، بەڵام زۆربێچارەتر لەم هەولانەی من بوو کەبتوانم چەند دڵۆپی شیری لەناو دەمی بکەم.

بەڵام پریستارێك توانی بەمەمەی پلاستیکی کارێك بکات.

بەڵام پاڵەپەستۆی شەر لەدایکبوونی جەماڵی شیری منی وشك کردبوو. پرستیارەکانی سەردانی دایکەکانی ناونەخۆشخانەیان دەکرد کەبتوانین شیر کۆبکەنەوە بۆجەماڵ بەشێوەیەك خواردنی پێی بگەێنن. دواتر یەکێك لەدایکەکانی کەکچێکی هەبوو بۆپێکەنین گوتی:((حەیف ئیتر منداڵەکانمان ناتوانن پێکەوە هاوسەرگیری بکەن چۆنکە ئێستا بوون بەخوشكو برا.)) چونکە لەکتێبی پیرۆزدا هاتووە ئەوانی شیری دایکێك دەخۆن ناتوانن پێکەوە هاوسەرگیری بکەن چونکە پەروەردەی یەك شیرو خوشکوبرای هاوشیرین.

لەیەك مانگی دواتر، جەماڵ لەنەخوشخانە لەژێر چاودێریدابوو من تەنیشتی دادەنیشتم. زۆرجار ئەنوەر دەیگوت:((جیهان تۆزۆر ماندوویی، رێگا بدە چەند رۆژێك کەسێکیتر چاودێری بکات.))

بەڵام من قبوولم نەدەکرد. دەمویست منداڵەکەم بەزیندوویی بمێنێتەوە.

لەدایکبوونی یەکەم کوری ئەنوەر دوای لوبنای کچمو سێ کچی لەهاوسەری یەکەمی بێگومان خوشحاڵی شادی زۆری دەبوو، بەڵام من خوشحالییەکی تایبەتیم هەست پێنەدەکرد. ئەنوەر

ئەوەندی دەیتوانی سەردانی نەخوشخانەی دەکرد، بەلاّم زۆر کەم. جارێکیان منی بۆگەڕان‌و سوڕان بردە دەرەوە تاکو بتوانم لەوهەستەی دەرووم کەم بێتەوە. لەهەموو شتێك بیزاربووم، لەوەی کەلوبنا نەیدەتوانی لەگەلّم لەنەخوشخانە بمێنێتەوەو خوشکم دەیبرد بۆماڵەوەیان، ئەنوەر نەیدەتوانی وەك هاوسەری ئاسایی لەتەنیشتم بمێنێتەوە، ولاّتم داگیرکرابوو، کوری بچوکم بۆمانەوەی لەشەڕێکی بەردەوام دابوو. هەستم دەکرد لەنیوانیاندا، دایکم گیرۆدەبووە.
دایکم لەهەمان کات بریتانیبوو، ئەمانە بریتانیابوو هێرشی دەکردە سەر ولاّتی ئێمە، بەتەواوی ئەم لایەنانە خۆشەویستی زۆرم بۆدایکم هەبوو. بەردەوام هەستێکی جیاوازم هەبوو. لەنەخوشخانە بەردەوام بۆدایکم باس دەکرد:((دایە بۆچی ولاّتی تۆهێرش دەکاتە سەرولاّتی من؟ بۆچی؟ ئێمە هیچ کێشەیەکمان لەگەلّدا نەبوو؟
بۆئارام کردنەوەی من دەیگوت:((جیهان خۆمن هێرشم نەکردووە؟))
بەردەوام دەبووم:((ئەمەیان دەزانم، دایە، بۆچی بریتانیا لەگەلّ ئێمە شەڕ دەکات؟ خۆماڵیکردنی نۆکەندی سوئیز مافی ئێمەبوو.))
دەستی خۆی بەسەرمدا دەهێناو دەیگوت:((جیهان، خۆمن هێرشم نەکردووە، ئازیزم، من هێرشم نەکردووە.))
جەمالّ وردە وردە خۆی دەگرت‌و دەیتوانی مەمەی پلاستیکی بەدەمی بگرێت‌و مژەی لیّ بدات. کاتێك برِیك بەهیزکەوت لەنەخوشخانە رۆیشتمە دەرەوە، خۆم وەك پرستیارێك چاودێری منداڵی خۆمکرد کەپێش وادەی دیاریکراوی خۆی سەری هەلّدابوو. دواتر کاتێك سەردانی ولاّتانم دەکرد زۆر بەوریایی تەماشای هەمان پێداویستییەکانی لەدایکبوونی منداڵەکانم دەکرد کەبتوانین بۆمیسر بێنین.
ئەنوەر دواتر بۆی باسکردم:((لەدایکبوونی جەمالّ وەك بینینی خەونێکی جوانبوو لەنیوان ترسدا.)) بەلاّم لەخۆشترین ساتەکانی ژیانمان، وەك دیار هەمووکاتێك لایەنێك خۆی پێیەوە دەگرتین کەتام‌و چێژ لەم خۆشییە نەبینین. بەهۆی شەڕ، جەمالّ نەجەژنی لەدایکبوونی هەبوو نەخواردنەوەیەکی باش. هەموو خەلّك سەرقالّبوون. نەکات نەپێویستی رۆیشتن بۆمیوانداریی‌یەکان نەبەشداریکردن لەهیچ جەژنێك.
جەمالّ عەبدولّناسر، رێگای شوکری ئەلقوتلّی، سەرۆککۆماری سووریا، داوای لەیەکێتیی سۆڤیەت کرد کەهاوکاری بکەن لەبەرامبەر هێرشی‌و داگیرکاری بریتانیاو فەرەنسا، بەلاّم

خرۆشچفو بۆلگانین قبووڵیان نەکرد. ناسر دواتر رووی لەئەمەریکا کرد. سەرۆك ئایزنهاور، بەپێچەوانەی رێبەرانی یەکێتیی سۆڤیەت قبووڵیکرد، ئایزنهاویر لەفەرەنساو بریتانیا تووڕەبوو چونکه بەبێ ئاگادارکردنەوەی ئەمەریکا هێرشیان دەکردە سەر میسر. پاڵەپەستۆی زۆرتوندی خستە سەر فەرەنساو بریتانیاو ئیسرائیل کەپاشەکشە بەهێزەکانی خۆیان بکەن. فەرەنساو بریتانیا دوای مانگێك هێرشکردن، لەئادار١٩٥٧ لەبەکارهێنانی خاکی سووتاو، واتە وێرانکردنی هەموو جادەکان، رێگای شەمەندەفەر، شوێنە سەربازییەکان لەکاتی گەڕانەوەیان. دواتر نەتەوەیەکگرتووەکان هێزەکانی ئاشتی پارێزیان ڕەوانەی سیناکردن، ئەم هێزانە تاکو ساڵی ١٩٦٧ لەم شوێنە مانەوە.

شەڕ وێرانی زۆری بەدوای خۆیدا هێنابوو. هەستی دژی جولەکە دوای شەڕی فەلەستین لەساڵی ١٩٤٨ دەستی پێکرد، لەسەرتاسەری میسر گەیشتە بەرزترین ڕادەی خۆی. هەزاران جولەکەی میسری کەپێکەوە بەئاشتیو خۆشی دەژیان، ئێستا یان دەردەکران یان خۆیان هەڵدەهاتن.

لەلایەنی مرۆیی، کۆچی ئەمانە زیانی زۆری لەوڵاتی ئێمەدا. جولەکەکانی میسر بەشێکی گەورەبوون لەفەرهەنگی میسر لەناوکۆمەڵگەی ئێمەدا بەتەواوی قبووڵکرابوون لەوانە باشترینو خۆشەویسترین ئەکتەر، نووسەر، دادوەر، خاوەن بانك، خاوەن پیشەسازیی. لەشەڕی جیهانی دووەم کاتێك نازییەکان گەیشتنە سەد کیلومەتری ئەسکەندەرییە خێزانەکانی موسلمانو مەسیحی لەهەمان شار جولەکەکانیان لەناو ماڵەکانی خۆیان دەشاردنەوە. لەشارێکی وەك قاهیرە چەندین جیل پێکەوە بەئارامی ژیانی خۆیان دەبردەسەر. زۆر لەموسلمانان رۆژانی شەممە، دەڕیشتن بۆماڵی جولەکەکان چراکانیان بۆداگیرسێنن هەندێك وردەکاروباریان بۆبکەن کەبۆ جولەکەکان لەم رۆژی ئاسودن قەدەخەکراو حەرام هەژمار دەکرا. بەڵام دروستکردنی ئیسرائیلو شەڕی نۆکەندی سوئیز تەواوی لایەنەکانی پێکەوە ژیانی ئاشتیانەی لەناوبردن. جولەکەکانی میسر دەستە دەستە لەمیسر دەرۆیشتنە دەرەوە، کۆچکردن بەرەو ئەمەریکاو ئەوروپاو ئەمەریگای لاتین، نەك ئیسرائیل، بەلێنی کۆتایی خۆیان بۆوڵاتی خۆیان نیشاندا. ئەمانە تەنیا ناوی خۆیان بەجێهێشت ـ سیکورل، دیوید ئازەر، بن زیون، شالونو گابریل ـ ئەمانە سوپەر مارکێتیی سەردەمی منداڵی من بوون لەناو قاهیرەدا.

خەڵك بەچاوێکی خراب تەماشای بیانییەکانی ناو قاهیرەی دەکرد کەچەندین ساڵبوو لەمیسر نیشتەجێ ببوون. دایکی خۆم بۆماوەی دوو هەفتەی تەواو لەماڵەوە نەیتوانی بێتەدەرەوە،

دەترساین بڕۆتە دەرەوە. ناسر لەبەرامبەر شەڕی تۆکەندی سوئیز بەمیسریکردنی بانك‌و کۆمپانیاکانی گەورەو بیمەی دڵنیایی ئینگلیزەکان‌و فەڕەنسییەکان دەستی پێکرد. تاکو کۆتایی ساڵی ١٩٥٦،دەستی بەسەر زیاتر لەپانزدە هەزاری ئەمانەدا گرت، یونانی‌و تورکەکان‌و ئەرمەنەکان کەتەواوی تەمەنی خۆیان لەمیسر دەژیان لەترسی ئەوەی نەوەك ڕۆژێك دەست بۆئەمانەش ببات، لەمیسر ڕۆیشتنە دەرەوە. بەرەو ولاتێك دەڕیشتن کەتاکو ئەوکات بەهیچ شێوەیەك نەیان بینیبوو بەرەو ئەمەریکاو ئوستراڵیاو ئەوروپا سەفەری خۆیان دەست پێکرد. لەسەرتاسەری جیهان زۆرجار کەسەفەرم بۆ زۆر لەولاتان دەکرد کەسانێکم دەبینی بەناوی ئەوروپی بەلام دەیانتوانی بەشێوەی عەرەبی میسری گفتوگۆ بکەن. تێنوی هەواڵەکانی قاهیرە بوون.

ناسر لەساڵی ١٩٦١، بەتێپەڕکردنی پرۆژە یاسایەك تەواوی پیشەسازیی‌و بانك‌و کومپانیاکانی بازرگانی‌و بیمەو دەست بەسەرداگرتنی زەوییەکانی کەخاوەنیان بیانی بێت لەپەرلەمان تێپەڕکرد. بەم شێوەیە ڕەوتی خۆماڵیکردن بەتەواوی جێبەجێکرا.

ئەم جۆرە سیاسەتە ناسریان زیاتر لەبریتانیاو ئەمەریکا دوور دەخستەوە، بەلام دەبوو دەستپێکی نوێ لەنێوان میسرو ولاتانی بلوکی ڕۆژهەلات. ڕاوێژکارانی چیکوسلوواکی لەگەڵ خۆیان جگە پێویستییەکانی سەربازی، پێویستییەکانی پیشەسازیی نوێیان لەگەڵ خۆیان دەهێنان بۆمیسر. ئالمانیایی ڕۆژهەلات ڕەزامەندی نیشاندا کەپردێکی نوێ لەنیوان روزەو جیزە لەسەر ڕووباری نیل دروست بکات، یەکێتیی سۆڤیەت بۆ جاری یەکەم بڕیاری یەکەم تاقیکردنەوەی ناوکی لەگەڵ زانایانی ئێمە دەستی بەهاوکاریکرد. لەقاهیرە گۆرانی بێژانی ئەوروپای ڕۆژهەلات‌و سەماکارو یاری سیرکیان دەستپێکردو هونەری خۆیان نیشانی ئێمەدا. کتێبەکانی ڕۆمانیاو بلگاریاو هەنگاریا لەناو کتێبفرۆشان سەریان هەلدا، لەناو ناوەندی شار کالاکانی یەکێتیی سۆڤیەت بەرچاو دەکەوتن. لێشاوی خەلکی ئەوروپای ڕۆژهەلات بۆ نیشتەجێ بوون لەمیسر دەستی پێکرد، لەهەندێك لەسینەماکان فیلمەکانی یەکێتیی سۆڤیەت نیشانی بینەری میسری خۆیان دەدا.

لەکانوونی دووەمی ساڵی ١٩٥٦ لەگەڵ جەماڵ گەڕامەوە ماڵی خۆمان لەرۆزە، ماڵی ئێمە گەورەتربوو کەبتوانین لەناو هەمان خانوو بمێنینەوە. دەبێت شوێنێکیترمان دەستەبەر دەکرد. من شەیدای خانووی خۆم بووم ڕوانینێکی زۆرجوانی هەبوو لەبەرامبەر ڕووباری نیل، بەلام

بەباوەڕی من كارێكی باش نەدەبوو منداڵەكان لەخانوویەكدا گەورە بكەم كەهیچ حەوشێكی نەبێت بۆیاریكردن. ڕۆژێكیان كەرێگام لەلوبناگرت بۆیاریكردن دەڕۆیشتە سەرپەنجەرە لەنهۆمی نۆیەم زۆرترسام.

ئێستا جەماڵ لەناو ئێمەدا زیادببوو. بەیانییەك ئەنوەر گوتی:((خانوویەك بۆبەكرێ گرتن لەشەقامی ئەهرام هەیە پێكەوە دەڕۆین دەبینین.))

یەكەمجار كەخانووم بینی گریام، چونكە زۆربەی خانووەكانی شەقامی ئەهرام زۆرجوانبوون بەڵام ئەمەیان نا. ئەم خانوویە مەلیك ئیسماعیل بۆمیوانانی بیانی دروستكردبوو كەبەمەبەستی بەشداریكردن لەكردنەوەی نۆكەندی سوئیز دەهاتن بۆقاهیرە. خانوویەكی گەورەو دڵگیر لەبەر ئەوەی زۆركەس تێیدا ژیابوون تاكو ڕادەیەك خرابی پێوەدیاربوو، حەوشەیان بەئەمانەتی خودا جێهێشتبوو.

كاتێك لەبەرامبەر دەرگاكانی تێكشكاوی راوەستام هاوارم كرد:((ناتوانم لەناو ئەم خانووە بژیم.))

بەڵام سەرنجی ئەنوەری راكێشابوو پێداگری دەكرد:((بەم شێوەیە تەماشای نەكەیت، بەنوێكردنەوە بێنە بەرچاوت.))

بێگومان راستی دەكرد، دواتر هەستم بەرامبەر هەمان خانوو گۆڕاو بۆماوەی پانزدە ساڵ لەناویدا ژیام. توانیم بەكەلوپەلی دەستەدوو لەبیانییەكانی كەدوای شەڕ میسریان بەجێهێشتو كەلوپەلی خۆیان دەفرۆشت لەقاهیرەو ئەسكەندەرییە، كەلوپەلی زۆرجوان بەنرخێكی زۆر هەرزان ١٪١٠ لەنەرخی سەركی خۆیان. كەلوپەلی لەم شێوە زۆربوو بەنەرخێكی كەم دەمانتوانی لەبازرا بیدۆزینەوە.

من شەیدای سروشتو دارو گوڵو گیام بەچاندنیان حەوشەكەمان گۆڕی، دەمتوانی لەئەیوانی نهۆمی سەرەوە دەستم بگاتە ترێو خورما بیخۆم. زۆر بەخێرایی دایكو باوكم ماڵی خۆیان گواستەوە بۆ بەهەمان گەرەك. خوشكمو هاوسەری مەحموودو چوار منداڵیان هاتنە ناوخانووی تەنیشت ئێمە. لەنێوان هەردوو خانوودا دەرگایەكمان كردەوە بۆئەوەی بەردەوام منداڵەكان لەژێرچاودێری كەسێكدابن.

لەكانوونی دووەمی ساڵی ١٩٥٨، ناسر بەدروستكردنی یەكێتیی لەگەڵ سووریا، ناوی میسری گۆڕی بۆ كۆماری عەرەبی یەكگرتوو، من ئەم مێژوویە باش دەناسم، چونكە كچی دووەمی من

له١٩٥٨ لەدایکبوو. لەسەر ناو لەسەردانی شەڕێکی توند لەنێوان منو ئەنوەر روویدا. لەکاتی لەدایکبوونی، ئەنوەر لەناوفرۆکە لەسووریا دەگەڕایەوە. لەناو فرۆکە بۆی باسدەکەن:((پیرۆزە، بوی بەخاوەنی کچێك.)) کاتێك لەفرۆکە دێتەخوارەوە راستەوخۆ سەردانی نەخوشخانە دەکاتو بۆی باسکردم کەناوی ئەم کچەم دەکەم بەزنوبیا.

بەسەر سوڕمانەوە گوتم:((زنوبیا؟))

گوتی:((زنوبیا ناوی یەکێك لەشاژنەکانی شاری کۆنی پالمیرایە لەسووریا کەیەکێتیی نیوان میسرو سووریای دروستکردبوو. کچی ئێمە کاتێك لەدایکبوو کەمن لەپێکهێنانی هەمان یەکێتیی نیوان میسرو سووریا دەگەڕێمەوە، بۆیە ناوێکی زۆر لەبارو لەجێگای خۆیدایە.))

پێم گوت:((ئێمە ناوی ناکەین بەزنوبیا.))

بەهەمان وەڵامدانەو گوتی:((بێگومان دەکەین بەزنوبیا.)) بۆئەوەی راپۆرتی سەفەری خۆی پێشکەش بەناسر بکاتە رۆیشت.

لەتووڕەبوون لەخۆم دەسوڕامەوە. لەهەمان کات خاتوو ناسر دوای رۆیشتنی ئەنوەر بۆبینینی من سەردانی نەخۆشخانەی کرد، بۆم باسکرد هاوسەرم چ ناوێکی بۆکچەم هەڵبژاردووە. بۆخاتوو تەحیە باسمکرد:((لەئێستاوە دەتوانم بێنمە بەرچاوی خۆم کاتێك لەقوتابخانە مامۆستا بەم ناوە بانگی دەکات منداڵەکان چۆن بەناوی پێدەکەنن. ئەنوەر دەیگوت دەتوانین بەناوی بچوکراوی زیزت بانگ بکەین، بەڵام من دەزانم ماموستا ئەمەیان ناکات، هیچ کەسێك دڵوڤانی بەکچی ئێمە ناکات.))

کاتێك خاتوو تەحیە دەگەڕێتەوە بۆماڵی خۆی، ئەنوەر لەماڵیان لەتەنیشت ناسر دانیشتبوو نارەزایەتی من لەم ناوە بەهەردووکیان دەگەێنێت.

جەماڵ عەبدوڵناسر سەرکۆنەی ئەنوەر دەکات:((ئەنوەر نهێنییەك لەناو ئەم ناوە سەرسوڕهێنەردا هەیە کەلەسەر کچی خۆت دادەنیت؟ چ کەسێك ئەم منداڵەی نۆمانگ لەناو زکیدا گەورە کردووە؟ چ کەسێك هەمان دەردو ژانی لەکاتی لەدایکبوون کێشاوە؟

ئەنوەر ناچاربوو گوتی:((بێگومان جیهان.))

ناسر بۆی باسدەکات:((دەبێت رێگا بەجیهان بدرێ کەناوێك بۆئەم کچە دیاری بکات.))

ناوم لەسەر کچی خۆمدانا (نۆهیە)، رۆژنامەکان دواتر لێکدانەوەیان بۆم ئەم ناوەکردو گوتیان ئەمەیان مانای یەکێتییە. بەڵام بەم شێوەیە نەبوو نۆهیە واتە کەسێکی بەبیروهۆش، واتە

هه‌مان ئه‌وه‌ی كه‌به‌راستی له‌كۆتایدا ده‌رچوو. ئێستاش زۆر به‌بیرو هۆشه. بۆدانانی منداڵی كۆتایمان كه‌له‌ساڵی ١٩٦١ له‌دایكبوو هیچ كێشه‌یه‌كمان نه‌كرد. به‌فه‌رمی بوو به‌هه‌ڵگری ناوی خۆم جیهان، به‌ڵام هه‌مووكه‌سێك به‌ناوی خۆمانی نانا ده‌ناسن.

هیچ كاتێك چاودێرم بۆمنداڵه‌كانم نه‌بوون، زۆربه‌ی ماڵانی به‌رپرسانی حكومه‌ت خاوه‌ن چاودێرو په‌رستاربوون. له‌ته‌مه‌نی منداڵی هه‌مووكاتی خۆم بۆمنداڵه‌كانم ته‌رخان ده‌كرد، كتێبم بۆده‌خوێندنه‌وه خواردنیان به‌ده‌ستی من ده‌خوارد، یاریم له‌گه‌ڵیاندا ده‌كردن‌و پێكه‌وه‌م ده‌بردن بۆحه‌مام، چاودێریم ده‌كردن ڤیتامینه‌كانی خۆیان بخۆن‌و بۆبه‌هێزی ئیسك شیرم بۆئاماده ده‌كرد. بۆباشتربوونی چاوه‌كانیان شه‌ربه‌تی گێزه‌رم بۆئاماده ده‌كرد. كاتێك له‌حه‌وشه‌ی ماڵه‌وه یاریان ده‌كرد له‌ئه‌یوان چاودێریم ده‌كردن یان خۆم له‌گه‌ڵیاندا ده‌بووم. پاش نیوه‌ڕۆیان بۆماوه‌یه‌كی كورت خه‌و به‌چاوه‌كانمدا ده‌هات له‌ژووری خۆم كۆده‌كردنه‌وه‌و ده‌رگام قوفل ده‌كرد بۆئه‌وه‌ی هیچیان به‌سه‌ر نێت‌و سه‌لامه‌تبن.

وه‌ك سروشت هه‌ڵسوكه‌وتم له‌گه‌ڵ منداڵه‌كانم ده‌كرد. كاتێك ئه‌گه‌ر وه‌ك پێویست چاودێری و ئاوی پێویست به‌داره‌كان نه‌گه‌ێنیت به‌رهه‌می میوه‌یه‌كی باش نابێت. تاكو ته‌مه‌نی پێنج ساڵان زۆر نازی هه‌موویانم هه‌ڵده‌كێشا به‌ڵام دواتر فێری بنه‌مای به‌هاكانم ده‌كردن، وه‌ك رێزگرتن له‌به‌رامبه‌ر، بۆنموونه ده‌یانزانی نابێت له‌به‌رامبه‌ر كه‌سانی گه‌وره‌تر له‌خۆیان پێیه‌كانی خۆیان به‌ته‌واوی درێژ بكه‌ن، چونكه ئه‌مه‌یان بێرێزی هه‌ژمار ده‌كرێ.

باوكیان به به‌رێزو كاكه بانگ بكه‌ن‌و من به‌خاتوون. كاتێك یه‌كێك له‌ئێمه ده‌هاته ژووره‌وه له‌شوێنی خۆیان هه‌ڵده‌ستانه‌وه‌و شوێنی خۆیان به‌ئێمه ده‌دا. ئه‌گه‌ر بێرێزیان ده‌كرد سزام ده‌دان‌و كاتێك وه‌ڵامیان ده‌دایه‌وه به تاك نه‌عالیی نه‌رم وه‌ڵامی خۆیان وه‌رده‌گرت. ئه‌م فه‌رمووده‌ی قورئانم بۆباس ده‌كرد:((دایك‌و باوكی خۆتان به‌ناوی گه‌وره بانگ بكه‌ن‌و به‌رێزگرتن قسه‌یان له‌گه‌ڵدا بكه‌ن.))

زۆربه‌ی كاته‌كان نوێژی خۆمان پێكه‌وه ده‌كردو ئه‌نوه‌ر پێش نوێژی بۆئێمه ده‌كرد. جه‌ماڵ له‌ته‌مه‌نی پێنج ساڵی ده‌ستی به‌نوێژكردن، له‌پشت باوكی راده‌وه‌ستاو من‌و كچه‌كان له‌پشتی ئه‌مانه راده‌وه‌ستاین. به‌باوه‌ڕی ئێمه كارێكی باش‌و راسته‌قینه هه‌ژمار ده‌كرا. ئافره‌تان له‌كاتی نوێژكردن له‌ماڵ‌و مزگه‌وت به‌پێی سوننه‌ت ده‌بێت له پشت پیاوه‌كان جێگای خۆیان بگرن.

رۆژانی هەینی، کاتێك ئەنوەر جەماڵی لەگەڵ خۆیدا دەبرد بۆنوێژی هەینی، من لەماڵەوە دەوری پێش نوێژم بۆ کچەکانم دەبینی‌و ڕێنوێنیم دەکردن بۆجێبەجێکردنی ئەم ئەرکە.

منو ئەنوەر پێکەوە دەمانوویست منداڵەکانی ئێمە هەمان هەستو تێگەیشتن‌و ئارامیان هەبێت کەمن‌و ئەنوەر لەئایینی خۆمان پێگەیشتبووین. ئاشنایەتی لەگەڵ قورئان، نوێژکردن‌و ڕۆژوو گرتن، لەتەمەنی خوارەوە فێری منداڵەکانی خۆمان دەکردن زۆربچووکتربوون کەتەواوی مانگی ڕەمەزان بتوانن ڕۆژوو بگرن، سەرەتا ڕێگامان بۆخۆش دەکرد دەمان گوت تەنیا ڕۆژوویەك بگرن تاکو بێزار نەبن، بۆمان باسدەکرد ئەگەر بتوانن ڕۆژوویەك بگرن بیست لیرە بۆئێوە لەبانك دادەنێن. کچی گەورەم لەتەمەنی دەساڵیدا توانی ئەمەیان بکات، بەلأم جەماڵ لەتەمەنی هەشت ساڵی توانای تێکشکاو هاواری کرد:((نەپارەم دەوێت، نەکەلوپەلی یاریکردن، تەنیا باڵۆرێك خواردنم دەوێت!)) لەتەمەنی یانزدە دوانزدە ساڵی توانیان مانگی ڕەمەزان بەتەواوی ڕۆژوو بگرن.

بیروباوەڕی ئێمەی موسلمانەکان لەسەر مەرگم بۆباس دەکردن، گوتم کاتێك کە جەستەی مرۆڤ زیندوو نەبێت بەلأم ڕوحی بەزیندوویی دەمێنێتەوەز ساڵأنە دووجار لەبوونەکانی ئایینی لەساڵرۆژی لەدایکبوونی خزمانی کەلەدونیادا نەمابوون، هەموو خێزانی ئێمە پێکەوە سەردانی گۆرستانی مردووەکانمان دەکرد. گۆرستانێکی گەورە لەرۆژهەلأتی قاهیرە هەڵکەوتبوو، جادەی گۆڕستان لەبەر زۆری خەڵك کەسەردانی گۆرستانیان دەکرد بەئۆتۆمبێڵ‌و کالیسکەو گوڵ‌و خواردنیان لەگەڵ خۆیان دەبردن، گوڵیان لەسەر گۆڕەکان دادەنان‌و خواردنیان پێشکەش بەکەسانی پێویستو هەژار دەکرد. ئەمەیان بۆئارامی ڕوحی مردووەکان دەکرا کەئیتر لەم دونیایەدا نەمابوون. چەند ئایەتێك لەقورئانمان دەخوێندنەوە تاکو نور بکەێتە ناو گۆڕیان.

بەداخەوە دوای ساڵێك ڕۆیشتنمان بۆخانووی شەقامی ئەهرام، ئەوەی کەبەبەردەوامی سەردانی گۆڕمان دەکرد باوکم بوو. شەوێك لەشەوەکانی مانگی ڕەمەزان بۆشکاندنی ڕۆژوو سەردانی ماڵی فەوزی عەبدلحافزمان کرد کەسکرتێری ئەنوەربوو، چێشت لێنەرو هاوڕێی وەفادارم، عوسمان، پەیوەندی کردو گوتی هەلومەرجی باوکت باش نییە. دەستبەجی گەڕامەوە بۆماڵەوە کەبینیم عوسمان دانیشتبوو دەگریا، زانیم خراپترین ڕوودراو ڕوویداوە. عوسمان سەرەتا پەیوەندی بەپزیشك دەکاتو دواتر بۆباوکم باسدەکات شادە بێنە، باوم دەستبەجێ بڕیاری عوسمان جێبەجێ دەکات پیاوێك کەپێش لەدایکبوونی من خزمەتی ماڵی ئێمەی دەکرد.

لەژێر لێوەکانی دەلێت:((خودایەك نییە جگە لەم خودایە، محەممەد پێغەمبەری.)) دوای چەند ساتێك لەبەر وەستانی دڵی کۆچی دوایی دەکات.

رۆژی دواتر باوکی منیان بەخاك سپاردو پیاوەکان سەردانی خێمەیەکیان دەکرد کەلەناوەندی شار لەبەر دەرگای مزگەوتێك بەکرێمان گرتبوو، ئەنوەرو دوو لەبراکانمو هاوسەری خوشکم، مەحموود ئەبو وافییە لەپێش دەرگای خێمەکە رادەوەستان بۆبەخێرهێنانی میوانەکان. منو دایكو خوشکم لەماڵەوە پێشوازیمان لەمیوانەکان دەکرد. زۆربەیان هاوسەرانی هاورێیانی باوکم بوون بەنەرمی دەیانگوت:((هەموو خاکی گۆری باوکت ببێتە تەمەنت.)) مانگی رەمەزان نەماندەتوانی قاوەی تاڵو جگارە پێشکەش بەمیوانەکان بکەین کەبۆرێزگرتن لەباوکم سەردانی ئێمەیان دەکرد. مەرگی باوکم کاریگەری زۆری لێکردم، گیرۆدەی دۆخێکی دەرونی بووم. بۆدڵنەوای دڵم هەفتانەو زۆرجار رۆژانە سەردانی گۆری باوکم دەکردو گوڵم لەسەر گۆری دادەنانو کتێبی زۆرم لەسەر روحو گەرانەوەی بۆئاسمانم دەخوێندنەوە.

کاتێك کەمنداڵەکانم گەورەبوونو لەگۆرستان نەدەترسان، زۆربەی کاتەکان لەگەڵ خۆمدا دەبردن بۆسەر گۆری باوکم کەلەنزیك گۆری پوورم بەتتەو زوزو و مام مستەفا. بۆم باسدەکردن پێشەوەی ئاشنایەتی لەگەڵ ژیانی سەرەتایی دەبێت فێری ژیانی مردن بکرین. بەردەوام بۆم باسدەکردن:((ئێمە لەخاك هاتووینو بۆخاك دەگەرێینەوە. موڵكو ماڵی دونیا هیچ نییە بەدەستی خاڵی بۆخاك دەگەرێینەوە.))

منداڵەکانم من بەکەسێکی توند لەجێبەجێکردنی بریارو راسپاردەکان دەزانن، لەوانەیە راست بێت. لەکاتی گەرانەوە لەقوتابخانە بۆخوێندنەوەی وانەکانی رۆژانە لەتەنیشتیان دادەنیشتمو بەتەواوی چاودێریم دەکرد کەچۆن دەخوێنن، پرسیارم دەکرد:((ئەمرۆ چ وشەیەکی نوێ فێربوون؟)) دەمویست بۆمن دووبارەی بخوێننەوە، ئەگەر باشو بەدڵم نەدەبوو خۆم دەکرد بەماموستاو دەمگوت دووبارە بخوێنەوە. دواتر چاودێریم دەکردن بزانم وەك پێویست خەوتوون یان نا. کاتێك سەردانی ژوورەکانم دەکرد، بەگاڵتە دەیانگوت:((هوشیاربن شێرەکە هات.))

ئاگاداریانبوو یاری لەگەڵ هەندێك لەمنداڵەکان نەکەن کەخێزانەکانیان بۆمن نەناسبن. ئەنوەر زۆر زیاتر لەمن لەگەڵ منداڵەکان نەرمبوو، دەیگوت:((جیهان بۆچی رێگایان پینادەی ئەمشەو برۆن بۆبەشداری لەجەژنی لەدایکبوون؟ زیاتر لەرادە توندی.))

دەمگوت:((تۆ ئەم خێزانە دەناسی، بێگومان نا.))

سەری دەهەژاندو دەیگوت:((دەبێت ڕێگایان پێی بدەیت تێکەڵاوی دۆستو هاوڕێیانی خۆیانبن.))

ئەمجارەیان من سەرم دەهەژاندو دەمگوت:((ئەنوەر، داوادەکەم، ئەمانە منداڵی منن ڕێگام بدە ئەرکی خۆم جێبەجی بکەم.))

زۆرجار پشتی منداڵەکانی دەگرتو هەرچی دەیانوویست دەیان کرد، لەم لایەنەوە زۆر تووڕە دەبووم، بەڵام هیچ کاتێك لەبەرامبەر منداڵەکان کێشەمان دروست نەدەکرد.

شەوانە ئەنوەر چیرۆکی بۆباس دەکردنو دەگێڕانەوە، منداڵەکانی عاشقی چیرۆکبوون. دەیانگوت چیرۆکەکانی باوکمان هەمووکاتێك نوێنو تاوانباردەکرام کەچیرۆکەکانی من دووبارەن. زۆر لەشەوەکان دوای نانخواردن ئەنوەرم دەبینی لەئەیوان دادەنیشتو نقرۆی ناوبیرو بیرکردنەوە خەیاڵبوو هەستم دەکرد بیر لەچیرۆکێکی نوێ بۆمنداڵەکان دەکاتەوەو یان دروستی دەکات. هەمووکاتێك چەمکی ئەخلاقی خۆی هەبوو. ئێوارانی هەینی لەگەڵ منداڵەکان یاری تۆپیی پێی دەکردو هەندێك جۆرە یاری خۆلەیەکتر شاردنەوە. چەندین کاتژمێر پێکەوە پێدەکەنینو ئەم سەر ئەو سەریان دەکرد.

ئاهم هەڵدەکێشاو دەمگوت:((ئەنوەر تۆ زۆر لەمن گەنجتری.)) بەراستی ئەم هەستەم هەبوو. تەماشای ڕوخسارم دەکردو پرسیارم دەکرد:((بۆچی تۆ رووخسارت چرچو لۆچ نابێت؟ تۆ پانزدە ساڵ لەمن گەورەتریو من ڕوخسارم پڕلەچرچو لۆچە.)) لەوەڵامدا دەیگوت:((لەبەر ئەوەی زۆر پووتر لەڕوخساری خۆت دەدەیت.)) بەڵام من دەمزانی ئەمە هۆکار نییە. ڕوحی ئەنوەر هەمووکاتێك گەنجانەو پاکبوو، ئەمەیان لەڕوخساری دەردەکەوت.

لەساڵی ١٩٥٩، دووکچی ئەنوەر لەهاوسەری یەکەمی هاتن بۆماڵی ئێمە، ئەوکات راوییە سیانزدە ساڵانو کاملییە دوانزدە ساڵانبوون. خوشکی گەورەتریان ڕەقییە، هاوسەرگیری کردبوو لەگەڵ هاوسەری پێکەوە دەژیان. کچەکانی زۆرباشبوونو من زۆرخوشحاڵبووم لەکۆتایدا بڕیاردرا کەلەگەڵ ئێمەدا بژین. چەندین ساڵبوو ئەنوەرم تەنگەتاو دەکرد کەدەبێت کچەکان بێن لەگەڵ ئێمە ژیان بەسەربەرن، بەڵام ئەنوەر دژایەتی دەکرد. لەدەستپێکی هاوسەرگیریمان ڕێگای نەدەدا ببینم. دەیگوت:((تۆزۆر گەنجی، دەرفەتی زۆرت لەبەردەم ماوە.))

کاتێك لەنەخوشخانە نەشتەرگەری هەڵماسیاوی بۆ راوییە دەکرا من لەگەڵی ڕۆیشتم بۆنەخوشخانە. یەکەمجاربوو منداڵێکی ئەنوەرم لەهاوسەری یەکەمی دەبینیو ئەقباڵ

هاوسەری یەكەمی ئەنوەر لەنەخوشخانەبوو. هیچ كەسێك بۆی باس نەكردم بەڵام كاتێك بینیم زانیم ئەمەیان هاوسەری یەكەمی ئەنوەرە. راوییەو كاملییە دووساڵ لەگەڵ ئێمە لەشەقامی ئەهرامەكان ژیان، منداڵەكانم زۆرخوشحاڵبوون كەخاوەنی خوشكی لەخۆیان گەورەترن‌و بەچاوی خوشكەكانی گەورەترو عەقلآنیتر تەماشایان دەكرد. كاتێك لەتشرینی یەكەمی ساڵی ١٩٦١، راوییەو كاملییە هاوسەرگیرییان كرد لەماڵی ئێمە رۆیشتن. كاریگەری خۆیان لەدڵی منداڵەكان‌و ماڵی ئێمە كرد چونكە پێكەوە گرێدرابوون. هیچ منداڵێك تەواو نییە، منداڵەكانی من بەهەمان شێوە، بەڵام ئەم دووكچە زۆرجار بەراستی ناجێگیربوون. جارێكیان بینیم‌و گرتم كەپاشماوەی جگارەكانیان دەكێشا، بەڵام كاتێك ویستی حاشا بكات، گوتم:((وەرن بوونی دەمتان بكەم.)) هەردووكیانم بەشەقە زەڵەیەك سزادان. جارێكیان لوبنا ناچاریكردم‌و سەرپێچی لەفەرمانەكانم كرد بەهەمان شێوە سزامدا، دڵم بۆلوبنا دەسووتا چونكە وەك كچی گەروە تاوانی سەرمەشق بوونی ئەوانیتری دەخوارد.

زۆرجار منداڵەكان دژی من یەكتریان دەگرت. رۆژێكیان لەئەسكەندەرییە، كاتێك جەماڵ تەمەنی دوانزدە سیانزدە ساڵآنبوو مووی سەری زۆربوون. داوام لێكرد سەردانی سەرتاشخانەیەك بكات، چەند رۆژ چاوەڕێم كرد نەرۆیشت‌و هەفتەیەك دواتر لەسەر كورسییەكم داناو بەدەستی خۆم مووەكانی سەرم بەمەقەس شێواندن، دواتر پێم گوت:((لەوانەیە ئێستا پێویست بكات سەردانی سەرتاشخانە بكەیت.)) لەكاتی برینی مووەكانی بەردەوام دەگریا، زۆر تووڕە بوو. دواتر ئاشكرابوو كەخوشكی بچوكی نانا لەم كردەوەی من زۆر ناڕازیبوو.

لەهەمان سەردەم مەیموونێكی بچوك لەماڵی ئێمەبوو، ناوی بانی بوو، منداڵەكان دەیانزانی من خۆشم دەوێت، زۆرجار میوەو كولآم دەدایە. نانا بۆبرای باسدەكات: ((جەماڵ وەرە پێكەوە موەكانی ئەم مەیموونە كورت بكەین‌و بزانین دایكمان چ هەستێكی بەرامبەر دەبێت.)) كاتێك مەیموونم بینی باوەڕم نەدەكرد. زۆر ناشیرین دەهاتە بەرچاو، زۆر خراپتر لەسەری جەماڵ. دەستبەجێ زانیم كەئەمەیان بیرۆكەی نانابووە، چونكە كچێكی زۆر زیرەك‌و بەبیرو هۆشبوو. بەڵام نەمدەزانی ئەم هەڵسوكەوتەی نانا بۆدڵخۆشكردنی برایبوو. بەم شێوەیە هیچ یەكێكیانم سزا نەدا.

بەبوونی هەموو خۆشەویستیم خانووی ئێمە لەشەقامی ئەهرامەكان، بەڵام خانوویەكبوو دوور لەقوتابخانەی منداڵەكانم. زۆر لەبیانییەكان لەمیسر رۆیشتبوون بەڵام قوتابخانە وەك خۆی

کراوەبوون، جۆری خوێندنو پەروەردەیان زۆر لەقوتابخانەکانی حکومی باشتربوو. کاتێك شەقامەکان قەڵەباڵغ نەدەبوون رۆیشتنی لوبنا بۆقوتابخانەی ئەڵمانیو رۆیشتنی جەماڵ بۆقوتابخانەی بریتانی بیست خولەکبوو، بەڵام لەکاتژمێرەکانی کەخەڵك زیاتر لەدەرەوە دەبوون کاتژمێرێك درێژەی دەکێشا. کاتێك ناوی هەموو منداڵەکانم لەقوتابخانەی پۆرت سەعید، کەقوتابخانەیەکی تایبەتبوو لەزقاریق نووسی، رێگایان زۆر ئاسانتربوو، بەڵام لەهەمان سەردەم ئێواران خوێندنی موزیکیان هەبوو.

بەبوونی نزیکی خانووەکانی شەقامی ئەهرام لەیەکێك لەلقەکانی رووباری نیل لەبەر مێشوولکەکان زۆر لەئازار دابووین، هەمووکاتێك شوێنەکانی سوور لەسەر روخسارو دەستەکانی ئێمەبوو. شەوانە هەموومان لەناو تۆرێکی نازووك دەخەوتین. شەوانە هەستم دەکرد لەناو گرتووخانەیەکی تۆرێکی نازووکم. کاتێك منداڵەکان گەورەتر دەبوون بیرم لەخانوویەکیتر دەکردەوە کەنزیك بێت لەقوتابخانە. نزیکترینیان خانووی بازرگانێك بوو لەجیزە کەیەکێك لەکچەکانی ناسر لەناویدابوو بەڵام ئەنوەر هیچ کاتێك دەرفەتی نەبوو پێکەوە برۆین ببینین.

لەساڵی ١٩٦٠ ناسر داوا لەئەنوەر دەکات ببێتە بەرپرسی پەرلەمان، لەلایەن ئەنوەر پەسەندکراو ئەنوەر کرایە سەرۆکی پەرلەمان. بەزۆربوونی کاری زیاتر سەفەرەکانی زیاتر ئەنوەر لەشەوێکدا هەموو ژیانی ئێمەی گۆڕی. منو منداڵەکان زۆر کەمتر دەمانتوانی ببینین. بەردەوام کۆبوونەوەی پەرلەمانو کۆبوونەوەی لەگەڵ ناسر لەقاهیرەو ئەسکەندەرییە، لەهاوینان سەرۆککۆمارو هەموو بەرپرسانی حکومەت لەئەسکەندەرییە دەمانەوە.

زۆر گریدراوی ڤێلای خۆمانبووم لەمەعموره لەدەرەوەی ئەسکەندەرییە کەحکومەت بۆئێمەی دیاریکردبوو. دوور لەخانوویەکانیتر هەڵکەوتبوو رووی لەدەریاو لەبەرامبەریدا دوورگەیەکی تایبەتیو حەمامێکی لەناودابوو. لەبەرتایبەت بوونی منو کچەکانم دەمانتوانی مەلەوانی بکەینو تامو چێژ لەم ساتەخۆشانە وەربگرین. منداڵەکانم عاشقی نۆقڤانیو کۆکردنەوەی گوێچکەی ماسی بوون. حەوشەی ئەم ڤێلایە بەراستی جوانبوو یاریگەیەکی تێنیسی هەبوو. منداڵەکان لەم شوێنە زۆر خوشحاڵبوونو من بەهەمان شێوە. لەئەسکەندەرییە هەلومەرج زۆر ئارامبوو، خێزانی ناسر لەتەنیشت ئێمەبوونو زۆرجار سەردانیان دەکردین. کاتێك سەرۆککۆمارو ئەنوەر سەرقاڵی تەوڵە دەبوون، منو تەحییە بۆماوەیەکی درێژ بەدەوری باخ دەسوڕاینەوە.

رووبەری ئەسکەندەرییە زۆر لەپۆرت سەعید گەورەتربوو، درێژایی کەناراوەکانی نزیکەی بیستو پێنج کیلومەتربوو، سەرسوڕمابووم لەناو شارو مێژوویدا گیرۆدەبووم. جێگای سەرسوڕمانبوو ئەم بابەتە بۆمن زۆر ئاسان نەبوو کەشاری ئەسکەندەرییە بەندەرێکی مێژوویی‌و یەکەمجار لەلایەن ئەسکەندەری گەورە لە٣٣٢ ساڵ پێش زایین دوای گرتنی میسر، دروستیکرد. ئەسکەندەرییە چەندین سەدە پایتەختی زنجیرەیەك بەتالسەکان‌و شوێنی یەکێك لەحەوت سەیرو سەمەرەکان (منارەالبحر) یان هەمان فانۆسی دەریایی، بەبەرزی ٦٠ مەتر لادورگەی فاروسی ئەسکەندەرییەبوو. مەلیکە کلئۆپاترای بتلمیوسی ئەم شوێنەی لەرۆژئاوای ئەسکەندەرییە بۆدروستکردنی چەند کۆشکێکی جوان‌و سەرنج ڕاکێش هەڵبژارد کەلەگەڵ ژولیوس سزار پێکەوەبن. لەناو ئەفسانەکاندا هاتووە کەکلئۆپاترا دوو تونێڵی بەبەردی مەرمەڕ لێدان تاکو ئاوی نوێ بۆشوێنی مەڵەوانی بگوازیتەوە، تاکو ئەمڕۆ ئەم شوێنە بەناوی حەمامی کلئۆپاترا باس دەکرێت. منداڵەکانم بۆبینینی ئەم حەمامەی گەورەی کلئۆپاترا بردن‌و دواتر بۆبینینی ئامفی شانۆی رۆمییەکان لەئەسکەندەرییە، وەك باسدەکرێت کلئۆپاترا پێش ئەوەی کیسر بەدەستی رۆمییەکان داگیر بکرێت لەساڵی سی پێش زایین، لەهەمان شوێن لەگەڵ خۆشەویستی ئانتۆنی یەکتریان دەبینی.

لەسەردەمی فەرمانڕەوایی رۆمییەکان، ئەسکەندەرییە کۆنترین زانکۆو دوو کتێبخانەی پاشایەتی هەبوو کەناوبانگی جیهانیان هەبوو. لەوحەی روزتا کەکلیلی کردنەوەی هێڵی هیروکلیف، هێڵی وێنەیی کۆنمانبوو یەکێك لەسەربازەکانی ناپلئۆن لەساڵی ١٧٩٩، لەپەنجاو شەش کیلومەتری رۆژئاوای ئەسکەندەرییەیی دۆزییەوە. کاتێك تەمەنم دەساڵانبوو، شەڕی چارەنووس سازی (ئەلعەلەمین) لەشەری جیهانی دووەم رویدا لەسەدوچوار کیلومەتری رۆژئاوای ئەسکەندەرییە، روویدا. لەهەمان سەردەم هۆزەکانی کۆچەر لەبیابانەکان بوونیان هەبوو بەلام لەبەر بۆمبەکانی چێنراو لەلایەن هێزەکانی ئەڵمانیاو بریتانیا زۆر لەم کۆچەرانە مەروماڵاتی خۆیان لەدەستداو زیاتر خۆیان دەپاراست. زۆرجار سەردانی ئەم ژنانەی بەدەوی لەبیابان دەرۆیشتین‌و جلوبەرگەکانی ڕەنگاوڕەنگ‌و جوان‌و گوڵدۆزیکراو گەردەنبەندی بەنەرخ‌و خرخاڵەکانیان سەرنجی ئێمەیان ڕادەکێشا.

دوای شەڕی ١٩٥٦ زۆربەی یونانی‌و ئیتالی‌و جولەکە لەئەسکەندەرییە رۆیشتبوون، بەلام کەش‌وهەوای ئەم شارە زیاتر رۆژئاواییبوو نەك رۆژهەلاتی، لەکۆتایی کەناراوەکانی

چێشتخانەکانی سەرکراوە ماسیو کۆتری برژاویان پێشکەش بەمیوانەکان دەکرد. لە شوێنەکانی جیاجیا دۆندرمەیان دەفرۆشت. لەکەناراوەکان یانەی وەرزشی جۆراوجۆرو خواردنگەکانی جۆراوجۆر بوونیان هەبوو. منو ئەنوەر دۆستی زۆرمان لەناو یانەکاندا هەبوون بەتایبەتی یانەی ئۆتۆمبێلەکان کەپێشتر موڵکی فارۆق هەژمار دەکرا. بەڵام چونکە دەبێت بەردەوام بەشدارییمان لەمیوانداریيەکانی حکومەتدا کردبا کاتی زۆرمان نەبوو لەگەڵ ئەم هاوڕێیانە تێپەڕ بکەین.

لەئەسکەندەرییە وەك قاهیرە دەبێت پێشوازیمان لەوەفدی زۆری ئەورووپیو عەرەبی بکردبا، کەهاوسەرەکانیان هاوڕێیەتیان دەکردو ئێمەش بۆپێشوازیان دەڕۆیشتین. بەردەوام لەمیوانداریيەکان بەشدار دەبووین، بەردەوام دادەنیشتینو باسی مۆدێلی جلوبەرگو منداڵەکانی خۆمان دەکرد. من لەکاتەکانی تەنیا زیاتر کتێبی مێژوویيو سیاسیو کەسایەتییەکانی ئافرەتم دەخوێندنەوە کەسەرنجی منیان ڕادەکێشاو کاریگەربوون. ئەم سەردەمانە جگە لەکات تێپەڕکردن هیچ سوودێکی نەبوو، تاکو ئەوکات نەمتوانیبوو وانەکانی خوێندنی ئامادەیی خۆم تەواو بکەم بەڵام وەك زانیاریی وەرگرتن لەکتێبو خوێندنەوەی بەردەوام ڕازیبووم. بەڵام بەرهەمی میوانداریيەکان خواردنی جۆراوجۆر ئێمەی ئەوەندە سەرقاڵ دەکرد بەخواردنەوە لەکۆتاییدا زۆر قەڵەوە دەرچووین.

لەیەکێك لەمیوانداریيەکان، لەبەرامبەر زۆر لەژنانی کەسانی بەرپرس لەناو حکومەت، پێشنیارم کرد:((لەجیاتی ئەوەی کاتی زۆر لەدانیشتنی بێئەنجام خەرج دەکرێت سوودێکی زیاتر لەیەکتر وەربگرینو لەجیاتی ئەم هەموو خواردنانە تەنیا جۆرێك لەخواردن بیخۆینو کاتیتر تەرخان بکرێت کەسێك بێت لەسەر بابەتێك قسە بکات. دەتوانین بانگێشتی سەلاح عەبدولسەبور بکەین بۆئێمە باسی شێعر بکات، داوا لەژنانی بەرپرسانی سعودیاو کویت بکەین بۆئێمە باسی هەلومەرجی سیاسیو ئابووری وڵاتی خۆیان بکەن. ئایا ئێمە لەهەلومەرجی گشتی ئەم وڵاتانە چ دەزانین، ئابووریان، هەلومەرجی سیاسیان، شوێنی ئافرەت لەناو کۆمەڵگەی ئەم وڵاتانە؟ خاتوونەکان سەریان سوڕمابوو. گوتم:((میوانداری داهاتوو لەماڵی ئێمە دەبێت کەسێك وتارێکمان پێشکەش دەکات.

بیرۆکەی من کاریگەری خۆی هەبوو لەساڵەکانی دواتر زانیاریی ئێمە زۆر زیاتربوون. لەیەکێك لەم میوانداریانە، ئامینە سەعید، یەکەم ئافرەتی نووسەر لەمیسرو یەکەم ژنی ڕۆژنامەنووس،

بۆئێمەی باسی دەستپێکی کاری خۆیکرد وەك بەردەستی بەناوبانگترین ژنی لایەنگری مافی ئافرەت لەمیسر، هۆدی شەعەراوی کرد. ئامینە سەعید یەکەمجار ناچاردەبێت نووسینەکانی خۆی بەناوی پیاوان بلاّوبکاتەوە، چونکە هیچ رۆژنامەیەك ئامادە نەبوو نووسین بەناوی ئافرەت بلاّو بکاتەوە. لەمیوانداری دووەم، سەمییە، هاوسەری بالیوزی فەلەستین لەکۆماری یەکگرتوویی عەرەبی، فیلمێکی لەسەر خاکی داگیرکراوی فەلەستین لەلایەن ئیسرائیل نیشانی ئێمەداو باسی کێشەی پەنابەرانی کرد کەهیچ بەڵگەی خۆناساندنیان نییە نەناسنامە نەوڵات نەشوێنێك بۆرۆیشتن. دوای هەمان میوانداری بڕیارماندا پارەی کەلەم میوانداریانە خەرج دەکرێت کەم بکرێتەوەو زیادەکەی بدرێتە پەنابەرانی فەلەستینیو پارەمان لەکەسانیتر وەردەگرت.

بۆیەکەمجار ویستمان لەسەر خواردنو باسکردنی بابەتەکانی مۆدێلەکان گۆڕا بۆبابەتی باشتر. هاوسەرانمان سەرقاڵی بابەتی ناوخۆییو دەرەوەن ئایا نابێت ئێمەش زانیاری خۆمان زیاتر کردبان؟ کاتێك باسی ئەمجۆرە میوانداریم بۆ ئەنوەر کرد سەرسوڕمابوو، چونکە ئەنوەر هەستی دەکرد ئێمە لەجیاتی بابەتی سیاسی زیاتر باس لەکاروباری ماڵەوە دەکەین. راستە، لەوانەیە هەندێك کەس بەم شێوەیەبن بەلاّم من نەمدەویست کاتێك میوانەکانی بیانی سەردانی ئێمەیان دەکرد بەبێدەنگی لەتەنیشت هاوسەری خۆم دانیشم. دەمویست بەشداری لەگفتوگۆکان بکەم. بابەتەکان زۆربوون کاتێك لەمیوانداریی بەشداریم دەکرد یەکەمجار دەمگوت:((بڕیارە چ کەسێك وتارێکمان پێشەکەش بکات؟)) ئەگەر خاوەن ماڵ داوای دەکرد لەم لایەنەوە هاوکاری بکەم بێگومان دەمکرد. ئایندە نیشانیدا ئەم میوانداریی‌و لەیەکتر کۆبوونەوە لەسەر بابەتێك قسەکردن جگە لەسوود گەیاندن بۆهەموومان کاریگەری زۆری لەسەر داهاتووی من هەبوو.

بۆیەکەمجار لەبەرامبەر هەندێك خەڵك رادەوەستامو قسەم بۆدەکردن:((هاوڕێیانی خۆشەویست، ئەمڕۆ دەمەوێت سوودی زیاتر لەکاتی خۆمان وەربگرین. بڕیارە دکتۆر فلانی لەسەر بابەتی پێگەی ژن پێش‌و دوای ئیسلام بکات.))

لەسەرەتا زۆر دەشێوام. من وەك زۆربەی ژنانی میسری تەنیا قۆناخی قوتابخانەم تێپەڕکردبوو بۆقسەکردن لەبەرامبەرو لەناو خەڵکدا هیچ فێرنەکرابووم. حەقیقەت ئەمەبوو کەژنانی سەردەمی ئێمەو هاوتەمەنمان ئێمەیان هاندەدا کەلەناو خەڵك بەبێدەنگ بمێنینەوە. بەتایبەتی لەبەرامبەر

پیاوەکان. بەختەوەرانە لەمیوانداریییەکانی یەکەم هیچ پیاوێك بەشدار نەبوو. تەنیا دەبێت بەسەر دڵەڕاوکێی خۆمدا سەردەکەوتم، نەك نەریتەکان.

بەڵام ئەم میوانداریانە ڕۆژبە ڕۆژ زیاتریان تەنگەبەر دەکردم، ئەم دانیشتنانە شتێکیان لەمندا هەڵدەخرۆشاند کەلەبوونی لەناوخۆمدا هەستم پێنەدەکرد. خاتوونەکانی کە وتاریان بۆئێمە پێشکەش دەکردن کەسانی بەبیروهۆش‌و زیرەك‌و خوێندەوار بوون. خاتوونەکانی گوێگر بەنووسینەوەو پرسیارکردن، بەتاسەو تامەزرۆ کاردانەوەیان نیشان دەدا. بۆچی ئافرەتان نابێت هەمووکاتێك وەك ئێستا، زانیارییەکانی خۆیان ئالوگۆڕ ناکەن‌و لەسەر ئەم بابەتانەی جۆراوجۆر گفتوگۆیان هەبێت؟ ئێمەش خاوەن بیروباوەڕی خۆمان بین. بۆچی داب‌و نەریتی ئێمە ڕێگای نەدەدا بینینە سەر زارمان؟

ڕۆژێکیان ئەنوەر بۆی باسکردم:((جیهان، فەیلەسوفی هیندی، نارایان، ئەمشەو بۆنانی ئێوارە میوانی ئێمەیە.))

لەوەڵامدا گوتم:((لەپێشوازیکردنی زۆر بەختەوەرم.))

کاتێك پێکەوە دانیشتین‌و بابەت ئێمەی کێشایە سەر ئیسرائیل. نارایان توندوتیژی نێوان ئێمەو ئیسرائیلی نەدەزانی، دەیویست میسر کۆتایی بەکێشەکانی لەگەڵ ئیسرائیل بێنێت. گوتی:((تەواوی خاکی ئەم جیهانە لەدەستپێك‌و لەکۆتایی موڵکی خودایە، نەك بەندەی خودا، چ پێویست دەکات دوو وڵات لەسەر شتێك شەڕ بکەن کە لەبنەڕەتەوە هیچ یەکیان خاوەنی نییە؟))

لەم بیرکردنەوەیە کەتاکو ئێستا ئیسرائیل چ زیانێکی بەئێمە گەیاندبوو لەسەر کورسی خۆم وشکبووم. ئەنوەر بەچاوێکی نیگەران تەماشای کردم، بەڵام ئیتر نەمدەویست بەبێدەنگی بمێنمەوە، گوتم:((ئیسرائیل دەیوویست خاکی سینا بگرێت کەئێمە خاوەنی سیناین‌و موڵکی ئەوان نییە، ئەگەر دەیانوویست خاکی ئێوە لەهیندستان دەستی بەسەردا بگرن، ئایا هەمان رستەی خۆت دووبارە دەکردەوە کەهەموو خاکێك موڵکی خودایە؟ ئایا ئەمەتان دەگوت؟))

پیاوەکە بێدەنگبوو. بەردەوامبووم:((ئێمە هیچ کاتێك لەئیسرائیل بیزارنین، بەڵام ئەمەیان خاکی ئێمەیەو دەمانەوێتەوە.))

پیاوەکە تاکو ئەوکات بێدەنگبوو، بەچاو دەمبینی ئەنوەر لەشێوەی قسەکردنم برێك تووڕەیە لەهەمان کات خۆبایی. قسەکانم نەگونجاو نەبوون. بەڵام ئەم پیاوم گیرۆدەی رووبەروو بوونەوە کردبوو. هیچ وەلامێکی نەبوو.

ئەنوەر دواتر بۆی باسکردم:((جیهان گیرۆدەی کێشەم دەکەیتەوە، بێگومان راستت دەکرد، بەلأم بۆخەڵکیتر ئاسان نییە لەسەر شێوەو شێوازی تایبەتی تۆ رابێن.))

گوتم:((ئەنوەر داوای لێبۆردن دەکەم، بەلأم کاتێك ئەم بیرکردنەوە لەناو بیرم دابێت نامەوێت بەبێدەنگی دانیشم باسی کەشو هەوا بکەم.))

زۆرتێپەڕی نەکرد بینینم ئەنوەر بیرکردنەوەی زۆری لەناو مێشکیدا دەجولێن لەبەهاری ١٩٦٠ نزیکەی بیستو چوار کاتژمێر کاری دەکرد. یەکێتیی نیوان میسر سووریا وەك پێویست نەبوو. ناکۆکی لەنیوان ئەندامانی کۆنی ئەنجوومەنی فەرماندەیی شۆڕش زیاتر دەبوون. زۆرجار باس لەزێدەخوازی سیاسی ئەنوەر کەوتبوو سەرزاری خەڵك، ئەمەش هۆکاریکبوو کەناسر لەهاوڕێی دێرینی خۆی گومان بکات، گومانکردن لەناو سروشتی ناسر بەردەوام هەبوو، لەهەموو کەسێك. ئەنوەر دەبێت لەئاياری ١٩٦٠ بۆسەرۆکایەتی کۆبوونەوە سەردانی کوناکری لەئەفریقای رۆژئاوا بکات، هەناسەیەکی ئاسودەم هەڵکێشا، بەلأم کەشو هەوای ئەفریقای رۆژئاوا زۆرگەرم بوو. ئەم جۆرە کەشو هەوایە بۆئەنوەر سازگارنەبوو.

لەپانزدەی ئایار. دوو سێ رۆژ دوای گەڕانەوەی بۆقاهیرە وەك دیار هەلومەرجی زۆرباش نەدەهاتە بەرچاو، ئەنوەر توانای شاردنەوەی کێشانی هەبوو کەرۆژانە لەگەڵ سیاسیو دەرفەتخوازەکان روویدەدا لەرووخساری بشارێتەوە لەهەمان کات نیگەرانی سەلامەتی ناسربوو، ئەم دوایانە ناسر گیرۆدەی نەخۆشی شەکربوو. پاڵەپەستۆی رێبەری میسر لەتێپەڕبوون لەهێڵی شۆڕش وردە وردە داوای خەرجی خۆی دەکرد.

شەوی پێشتر بۆئامادەکردنی وتارێك تاکو نزیك بەرەبەیان نەخەوتبوو، دواتر سەردانی نووسینگەی خۆیکردو بۆنیوەڕۆ گەڕایەوە. کاتێك لەسەر مێزی نانخواردن لەیەکتر کۆبووینەوە، رەنگی بەجۆرێکی ناسروشتی گۆڕابوو، دوای نانخواردن گوتی:((باشتر دەبێت ئەگەر پشوویەك بدەمو خۆم درێژ بکەم.))

خۆم بەجۆرێك نیشان نەدا کە لەهەلومەرجی گۆڕاوی نیگەرانم. گوتم:((بیرکردنەوەیەکی باش دەبێت من داوا لەمنداڵەکان دەکەم بێدەنگبن.))

بەڵام ئەنوەر لەجیاتی پشوودان دەستی بەڕشانەوەیەکی بەردەوام کردو زیاتر دەبوو. دوای ماوەیەك ژان کەوتە سینگی. پەیوەندیم بەپزیشك کردو دەستبەجێ گەیشت. دوای ئەوەی بەوردی پشکنینی بۆکردو بۆی باسکردم:((دەبێت بۆماوەی سێ هەفتە بێجولانەوە پشوو بدات، نابێت کەس ببینێتو وەڵامی تەلەفۆنەکان بداتەوە، نابێت بچێتە شوێنی دەست شوشتن.))

دڵم بەخێرایی لێدا گوتم:((جەنابی پزیشك چی روویداوە؟)) بۆ ئەوەی ئەنوەر ئاگادار نەبێت دەنگی کزکردو گوتی:((گیرۆدەی جەڵتەی دڵبووە.)) جەڵتە؟ ئەنوەر تەنیا چلو دووساڵبوو، پرسیارم لەپزیشك کرد:((مەترسی مردنی هەیە؟))

بەدڵسۆزی تەماشای کردمو گوتی:((ئەگەر بەباشی چاودێری بکەیت نەخێر.))

پرسیم:((ئەنوەر دەزانێت جەڵتە لێداوە؟))

سەری خۆی هەژاندو گوتی:((نا تەنیا نیگەرانتری دەکات.))

سێ هەفتەی دواتر چاودێری ئەنوەرم کرد، زۆرجار بەزەحمەت. پزیشك قەرەوێڵەیەکی لەنەخوشخانە ڕەوانەکرد کەبتوانم بەئاسانی جوڵەی پێی بکەم بەردەوام چاودێریم دەکرد. کتێبم بۆدەخوێندنەوەو باسی منداڵەکانم بۆدەکرد تاکو ئارام ببێتەوە، بەئامۆژگاری پزیشك ڕێگام نەدەدا هیچ جگارەیەك داگیرسێنێت. ڕێگام نەدا هیچ کەسێك سەردانی ژوورەکەی بکات، خۆشکی بەم بڕیارو پێداگری من زۆر تووڕەبوو.

بۆم باسکرد:((ئەگەر برات بۆتۆ ئەوەندە گرنگە، نابێت داوای بینینی بکەیت، ئەگەر تۆ بچیتەژوورەوە براو منداڵەکانی بەهەمان شێوە داوا دەکەن. نامەوێت بەوەڵامدانەوە خۆی ماندوو بکات.))

وردە وردە ترسەکانم سەریان هەڵدا. لەخەودا ئەنوەرم دەبینی بەڵام ئەنوەر نەیدەبینیم. بانگم دەکردو دەموویست دەستم بگاتە دەستی، بەڵام نەدەنگی دەبیستم و نەهەستی بەبوونم دەکرد. منداڵەکان دەهاتنە ناوخەونم. چ بەسەری ئەم منداڵە بچوکانە دەهات؟ وێنەی بێوەژنبوون وێنەیەکی زۆر ترسناکبوو، چونکە من عاشقانە خۆشەویستیم بۆئەنوەر هەبوو. ڕۆژانی کەچاودێری ئەنوەرم دەکرد دیسان ترس ڕوویی تێدەکردم. زۆرجار بەشوێنی دەست شوشتن دەڕۆیشتم بەدەستم بەگریان دەکرد، دواتر ڕوخساری خۆم خاوێن دەکردەوە بەزەردەخەنە دەگەڕامەوە.

نەخۆشییەکی بەکێشەبوو، ئامادە نەبوو هەندێك لەمەرجەکانی پزیشك جێبەجێ بکات. بەناچاری بەپزیشکم راگەیاند. پزیشك گوتی:((ناچارین باسی نەخۆشی بۆبکەین کەتۆ گیرۆدەی نەخۆشی دڵ بوویتەوە.))

دوای ئەوەی ئەنوەر ئاگاداری هەمووشتێکبوو بەناچاری بڕیارەکانی پزیشکی جێبەجێ دەکردن.

نەخۆشی جەڵتەی دڵ لەم تەمەنەی گەنجایەتی، ژیانی بەتەواوی گۆڕیو پەیڕەوەیی لەهەندێك ڕێنەمایی کرد تاکو کۆتایی لەسەری بەردەوامبوو. دواتر بۆماوەی دوو هەفتە بەمەبەستی تێپەڕکردنی نەخۆشی سەردانی ئەڵمانیامان کردو پزیشك پێی راگەیاند ئەگەر نەکێشانی جگارە تووڕەی دەکات، کێشانەکەی باشتر دەبێت، بەڵام هیچ کاتێك جگارەی نەکێشایەوەو جاربەجار قەلوونی دەکێشا. دوای سێ هەفتە بەپێی ڕێنەمایی پزیشك ئەنوەر دەستی بەپیادەڕۆیی کردو تاکو کۆتایی تەمەنی ڕۆژانە کاتژمێرێکی تەرخان دەکرد بۆوەرزش. زۆرجار لەگەڵ منو جاربەجار بەتەنیا، زۆرجار لەگەڵ جەماڵ یان هاوڕێیانی عوسمان ئەحمەد عوسمان، باوکی هاوسەری کچەکەمان جیهان. کاتێك نەیدەتوانی بەردەوام بێت لەماڵەوە بەپایسکلی جێگیر وەرزشی خۆی دەکرد.

بۆئارامی جەستەی خۆی ڕۆژانە لەنێواران خۆی لەناوەندی ماڵەوە درێژ دەکردو پارچەیەکی سپی بەسەر چاوەکانیدا دەهینایەخوارەوە. منداڵەکان عاشقی راهێنانی ئارامی ئەنوەر بوون، بەقسەی منداڵانەی خۆیان بەئەسپ یان شەمەندەفەر ناویان دەبردو خۆیان بەسەردا بازدەدا. من دەمووویست ڕێگا لەم یارییەیی منداڵانەی منداڵەکان بگرم بەڵام ئەنوەر پێداگری دەکرد دەبێت ڕێگایان پێی بدرێت یاری خۆیان بکەن. بەبوونی ئەم نەخوشییە زیاتر لەڕادەی خۆی کاری دەکرد. لەساڵی ١٩٦١، کاتێك ناسر بۆچارەسەری نەخۆشی سەردانی یەکێتیی سۆڤیەتی کرد ئەنوەر ئەرکی سەرۆککۆماری لەئەستۆگرت، گیرۆدەی هێرشی دووەمی جەڵتەی دڵبوو، ئەمجارەیان وەك پێشوو بەهێز نەبوو، ئەمجار لەنزیکی نیوەڕۆ گیرۆدەی بوو بەبێ ڕشانەوە بەڵام بەژانێکی زۆر. پزیشك رایگەیاند ئەم هێرشە جۆرێك لەئاگادارکردنەوەی تۆیە، ئاگادار کردنەوەیەك کە پاڵەپەستۆی زیاتری لەسەرەو دەبێت زیاتر ئاگاداربێت، ئەمەیکرد.

لەهەمان کات بەدواوە لەسەردەمی سەرۆکایەتی خۆی کەمتر کاری دەکرد. ئەمەیان فێربوو لەهەمان کات باوەڕی دەکرد ڕۆژانە هەژدە کاتژمێر کارکردن زۆر لەڕادەی خۆی زیاترە بەڵام

هەشت کاتژمێر کاری دەکردو کاتەکانیتر بەپشوودان بەسەری دەبرد. بەئەنجامێك گەیشت کەباشترین کات بۆبیرو بیرکردنەوەو بڕیاردانی دروست کەپێویستی بەبیرێکی روون بێگەرد هەیە شەشی دوای نیوەڕۆیە. جگە لەکێشەکانو قەیرانەکانی کەبۆولاّت دەهاتنە پێشەوە، شەوان کاری نەدەکرد. ئەگەر هەواڵێکی گرنگ روویدەدا دەخوێندەو دواتر بەتەلەفۆن پەیوەندی بەوەزیرەکانەوە دەکردو وەلاّمی تەلەفۆنی دەدایەوە. زۆربەی شەوان لەژووری گەورەی ژێرەوەی ماڵەکەمان دادەنیشتو تەماشای فیلمەکانی وسترنی دەکرد، کاتژمێرەکانی پشوودانی بەتەواوی لەبەرچاو دەگرتن. زۆرجار من کاتژمێر شەشی بەیانی لەخەو هەڵدەستام بەلاّم ئەنوەر تاکو هەشت دەمایەوە.

بۆئەنوەر دوای دوو هێرشی جەڵتەی دڵ پێویستی دەکرد زیاتر پشوو بداتو چاودێری نەخۆشی خۆی بکات. ئەوکات من زیاتر ئاسودە دەبووم. زۆربەی کاتی خۆی لە میت ئەبولکۆم گوندی سەردەمی منداڵی تێپەڕ دەکرد. لەهەمان شوێن دەیتوانی بەتەواوی بگاتە ئارامی راستەقینەی خۆی، لەسادەیی ژیانی گوند، لەشوێنێك هەموویان پێکەوە کاریان دەکردو لەخەمو شادی یەکتر هاوبەش دەبوون. رەگو ریشەی لەهەمان شوێن بوون، دڵی لەهەمان شوێنبوو. من بەجۆرێکی بەهێز هەمان هەستم هەبوو.



## بەشی شەشەم

## ژیانی لادێ

((ئوم جەمال، هەلومەرجی کوڕەکەتان باشە؟))

((ئوم جەمالٚ دڵمان بۆتان دەسووتێ، منداڵەکانت کەمن.))

بۆژنانی گوندی ئەنوەر، میت ئەبوئەلکوم گرنگ نەبوو کەمن جگە لەکوڕێك، خاوەنی سێ کچی جوانم. لەناو گوند منیان تەنیا بەناوی ئوم جەمالٚ، واتە دایکی جەمالٚ دەناسی، هیچ کەسێك گوێی لەگلەیی بەردەوامی من نەدەگرت. لەم گوندە نەکچەکانی منو نەکچەکانی کەسێکیتر، هەژمار نەدەکران. دوای لەدایکبوونی بچوکترین کچم جیهان، لەساڵی ١٩٦١، ئەم ئافرەتانە سەرکۆنەیان دەکردم.((تۆ تەنیا خاوەنی منداڵێکی.))

لەوەڵامدا دەمگوت:((من خاوەنی چوار منداڵم.))

((بەڵام تۆ تەنیا کوڕێکت هەیە، دەبێت دیسان کۆڕبێنیت تاکو ئەمەیان تەنیا نەبێت.))

وەڵامی ئەمانم دەدایەوە:((تەنیا نییە، خاوەنی سێ خوشکی خۆییو سێ زڕخوشکە.))

بەڵام ژنەکان تەماشای یەکتریان دەکردو سەری خۆیان بادەداو بەتوندی گلەیی ئەوەیان دەکرد:((دەبێت منداڵی زیاترت هەبێت، ئەگەر ئەمەیان نەکەیت هاوسەری تۆ دەڕۆت.))

شەیدای سەفەرەکان بووم لەگەڵ ئەنوەر بۆ گوندی میت ئەبوئەلکوم لەدڵتای نیل. دووکاتژمێر لەقاهیری دووربوو، لەهەمان کات ڕێگایەکی جوانو سەرنج ڕاکێشبوو لەهەردوو لایەنی جادەکە

دارەکانی جۆراوجۆری وەك ئۆکالیپتۆس سەری خۆیان بەرز کردبوویەوەو دواتر چەندین کیلومەتەر لەناو کێڵگەی لۆکە تێپەڕ دەبووین‌و کەزستان خۆی بەرەنگی سەوزی رووناك دەگۆڕیی‌و هاوینان وەك مافورێك لەگوڵ لەبیابان دەدروشایەوە. کاتێك دەگەیشتینە گوندی میت ئەبونەلکوم ئەنوەر بەتەواوی دەگۆڕا، جلوبەرگی ئیداری خۆی دەگۆڕین‌و جلی سپی شێوازی هەموو پیاوەکانی لادێی دەپۆشین. دواتر منداڵەکانی بۆگەڕان‌و سوڕانەوە دەبردن، کاتێك وەك کوچکی گەماڵەکان لەناو دارو درپییەکانی بەدرك تێپەڕ دەبوون، هەموومان پێکەوە پێدەکەنین. ئەنوەر بەدەنگی بەرزی خۆی گۆرانی بەسۆزو غەمگینی دەگوتن کەپیاوانی گوند لەکاتی کاری دژوار پێکەوە دەڵێنەوە، من چاوەڕێی گلەیی دراوسێیەکانبووم، بەلام هیچ کاتێك کەسێك گلەیی نەکرد. لەماڵەوە جۆرێك نان دروستکردن‌و خواردنی جێگای ویستی خۆی نیشانی منداڵەکان دەدا، هێلکەیان لەناو هەندێك هەویر دەکردو دواتر لەناو تەنوریان دادەنا تاکو بەتەواوی دەکولا، منداڵەکان چەندینجار ئەم شێوازەیان دووبارە دەکردەوە تاکو فێردەبوون.

جاری یەکەم کەمن‌و ئەنوەر پێکەوە رۆیشتین بۆگوند، برێك شلەژابوو، بۆی باسکردم: بەدرێژایی رۆژ نابێت لەماڵەوە بیتەدەرەوە تاکو شەو.)) لەمەبەستی تێنەگەیشتم.

پرسیم:((بۆچی؟))

گوتی:((چونکە خەڵکی گوندی من ناتوانن هەلومەرجی تۆیان پێی هەزم ناکرێت.))

دووبارە پرسیم: ((ئەنوەر، بابەتەکە چییە؟))

نیگەران دەهاتە بەرچاو گوتی:((تۆژنێکی شارنشینی، خەڵکی ئێمە زۆر نەریتخوازن. ئەگەر تۆ بەجلوبەرگی شارنشینی ببینن، هیچ رێزێك لەتۆ ناگرن. ئەم جۆرە جلوبەرگە لەناو خەڵکی ئێمەدا دوورە لەنەریتخوازی.))

((بۆچی شەوان دەتوانم بێمە دەرەوە؟))

گوتی:((ئەوکات کاتی هاتنەدەرێ کەسانی خاوەن موڵك‌و فەرمانبەرانی حکومەتە کەسەردانی گوند دەکەن. خەڵکی گوند بۆبینینی جلوبەرگەکانیان دێنەدەرەوە، بەم کاتە راهاتوون‌و بۆیان کێشە نییە.))

رۆژی دواتر سەردانی تەنتام کرد بۆکڕینی هەمان پارچەی کەخەڵکی گوند سوودیان لێوەردەگرت، سەرپۆش‌و نیوچاوانگیرێکی گوڵدار بۆلەسەر بەستنەوە بەشێوازی خۆجێی، بۆجاری دووەم توانیم هەرکاتێك دەموویست برۆمە دەرەوە.

لەسەرەتا خەڵکی گوندی میت ئەبوئەلکوم بۆمن ئەوەندە بێگانەبوون کەنەك تەنیا ئەمانە خەڵکی وڵاتی ئێمەنین بەلکو چەند سەدەیە بۆدواوە دەگەڕێمەوە. کولانەکانی تۆزو خۆل هەرکەسێك تێپەڕ دەبوو لەناو تۆزو خۆڵی خۆی وندەبوو. خانووەکان هەمووی بەقوڕ دروستکرابوون، تەنیا یەك دوو پەنجەرەیان زیاتر نەبوو. کونێك لەناوەندی خانوو دەکرایەوە بۆچوونەدەرەوەی دوکێڵ. سەرەوەی خانووەکان بە بەرگی دارخورما داپۆشرابوون. لەسەر زۆربەی خانووەکان تەپاڵەی تێکەلاو بەکا دروستکرابوون بۆئەوەی وشك ببن و دواتر لەزستان بۆسووتان بەکار بێنن. کەسانێك هەبوون کەباوەڕیان بەجنۆکەو چاو پیسی هەبوو رەنگی شینیان لەخانووی خۆیان دەدا بەلام بەبەخیلو چاو پیسەکان پەنجەی خۆیان شین دەکردو لەدیوار دەدا ئەمەیان جۆرێك لە گرێدراویی هەبوو بەحەزرەتی فاتیمە (د.خ) کچی پێغەمبەر. ئەم ڕەنگەی شینەیان لەهەمووشتێك دەدا بێشەکەی منداڵان نیوچاوانی ئەسپەکان و هەندێکجار ناڵی ئەسپەکانیان بەخانوو شوێنەکانی جۆراوجۆر هەڵدەواسی کەلەچاوی بەخیلو چاو چنۆکان پارێزرابوون.

گوندییەکانی کەبەئەنگوستەکانی دەست هەژمار دەکران سەردانی ماڵی خودایان لە مەککە کردبوو کەسانێك کەلەڕێگای دەریایی سوور ئەم سەفەرەیان کردبوو وێنەیەکی کەشتییان لەماڵەوە هەڵواسیبوو، کەسانێك بەفرۆکە رۆیشتبوون وێنەی فرۆکەیان هەڵدەواسی و کەسانێك کەبەپاس رۆیشتبوون وێنەی پاسیان هەڵدەواسی، لەگەڵ وێنەیەکی کەعبە هەمان بینای ڕەشی چوارگۆشە لەناومزگەوتی گەورەی مەککە پیرۆزترین شوێنی موسڵمانان.

خانووە قوڕەکانیان بەتەواوی مەترسیان لەسەر نەبوو، چونکە باران زۆرکەم دەباری، بەلام پێکهاتەیەکی زۆر سەرەتایی هەبوو. تاکو پێش دروستکردنی بەنداوی ئەسوان لەساڵی ١٩٦٨ بەرهەمهێنانی کارەبا لەم بەنداوە ئەم گوندەی میت ئەبوئەلکوّم نەکارەباو نەراکێشانی ئاوی هەبوو. گوندییەکان لەبەرەبەیان هەڵدەستانەوە لەکاتی داهاتنی تاریکایی دەخەوتن. زۆربەی خانووەکان تەنیا دوو ژووریان هەبوو، یەکێك بۆدروستکردنی خواردن و نووستن و نوێژکردن سوودی لێوەردەگیراو ژووری دووەم بۆ گامێش و گوێی درێژو مانگا، زۆرجار حوشتر جگە لەقازو مریشك و جوجەلۆکەکانیان. لەنیوان ئەم دوو ژوورەدا تەنیا حەسیلێك هەبوو کەژنان بۆ داچۆڕاندنی ئاوی پەنیرو ماست و سوودیان وەردەگرت.

لەناوەندی گوند بۆرجێکی بەرز هەبوو کۆترەکان لانەی خۆی لەسەر دروستکردبوو دەنگی باڵەکانیان تاکو ئەم سەرو ئەوسەر دەڕۆیشت. ئەم کوترە جوان‌و سپی ڕەنگانە خواردنی سەرکی جوتیارەکانبوون‌و بەرهەمێك هەژمار دەکرا بۆفرۆشتن لەبازارەکان. تەنیا بینای بەرزتر لەبۆرجی کوترەکان منارەی مزگەوتی گوندبوو، ماوەیەك دوای شۆرش دروستکرابوو. ئەنوەر یەکەمین مووچەی لەرۆژنامەی کۆمارییەت، خەرجی مزگەوتی نوێکرا کەپێشتر مزگەوتێکی بچوك هەبوو بەلآم شوێنی خۆیدا بەمزگەتێکی گەورە کەبە کەرپووچی سوور دروستکرابوو لەگەڵ منارەیەکی بەرز.

سەرەتا بەبینینی روخساری ژنانی گوند زۆر دڵگران دەبووم چونکە ئەوانەی تەمەنیان لەسەرەوەی چل ساڵبوو هەموو جلوبەرگیان ڕەشبوون، لەهەموو تەمەنێك زیاتر لەپیاوەکان کاری خۆیان دەکرد. لەبەرەبەیان هەڵدەستان‌و خواردنی بەیانیان ئامادە دەکرد نان‌و پەنیرو چایەکی ڕەش‌و شیرین، دواتر خاوێنکردنەوەی ماڵ، دانی خواردنی ئاژەڵ‌و پەلەوەرەکان، دروستکردنی نان‌و هێنان‌و دەرهێنانی ئاو بەهێزی بازو لەبیری ناوەندی گوند، لەکاتی گەڕانەوە لەسەر سەری خۆیان دادەنا. دواتر بەپەلە خواردنی نیوەڕۆیان بۆهاوسەرانی خۆیان ئامادە دەکردو لەکاتی خۆیدا دەیان گەیاندە کێڵگەو دواتر تاکو ئێوارە هاوکاری هاوسەری خۆیان دەکرد. کێڵان، کۆکردنەوەی بەرهەمی لۆکە، گەنمەشامی، دری، گەنم بەم شێوەیە تاکو ئێوارە. دیمەنی میت ئەبونەلکۆم تەنیا بەم شێوەبوو، لەرووناکی بەرەبەیان دیمەنی ریزبەندی پیاوەکان بەجلی سپی نیشانیدەدا کەبەرەوە کێلگەکانی کشتوکاڵی دەڕۆیشتن‌و بەدوایاندا منداڵەکان گامێش‌و مانگایان دەبردن بۆلەوەرگەو ئاودان. دەستە بەدەستە بەم شێوەیە دەڕۆیشتن. ئێواران لەکاتی گەڕانەوە، بەشێوازی جیاواز. سێبەری گەڕانەوەی ئاژەڵان‌و منداڵەکان بەهەمان شێوە پیاوەکان بەجلی سپی‌و درێژی خۆیان بەدەردەکەوتن دواتر ئافرەتان بەدوای ئەمانەدا دەهاتن، زۆربەیان بەبارێگی قورس لەگیاو لق‌و پۆپی وشکی دارەکان دەگەڕانەوە.

هەرچەند دیمەنێکی جوانبوو لەکارکردنی هەرەوەرزی، بەلآم کاتێك بۆجاری یەکەم بینیم جەستەم لەرزی. بەباوەڕی من ئەم ئافرەتانە تەنیا ئاژەلێکی باربەربوون، کەمتر لە ئەمەیانبوون. چونکە بۆپیاوەکان گامێش لەئافرەت بەنەرختربوو. گامێش یان مانگا بۆپیاو سەرچاوەی داهاتبوو، شیر، پەنیرو نیوشکی بەرهەم دەهێنا، بۆخواردن‌و بۆفرۆشتن. ئەگەر ژنی دەمرد، بێگومان خەمبار دەبوو، بەلآم ئەگەر مانگایەکی دەمرد، دڵی دەشکا. چونکە پشتیوانی

دارایی ژیان‌و سەرچاوەی ڕۆژانەو ئایندەیی لەدەست دەڕۆیشت. بۆپیاو هێنانی ژنێکیتر وەك هاوسەر نەرخی زۆر هەرزانتربوو لەمانگایەك‌و ئیتر تەواو.

لەرۆژی زەماوەند هەمووکاتێك پیاوەکان بووکیان لەشوێنی دیاریکراو دادەنا. ئەمەیان بەهەمان مانابوو کەدەبێت لەدەستپێکی ژیانی هاوبەش لەژێر فەرمانی پیاو دابێت. لەرۆژی یەکەم ئامۆژگاری یەکتریان دەکرد لەرۆژی یەکەم دەبێت پیاو هێزو تواناو بالآدەستی نیشانی هاوسەری بدات. ئەمەیان فەرمانڕەوایی تاکلایەنی پیاوەکانبوو. میسرییەکان شەیدای منداڵەکانن، بۆ لەدایکبوونی کچ خوشحاڵ دەبن، بەلآم بۆکوڕ زۆرتر خوشحاڵ‌و خۆیان بەبەختەوەر دەزانن. لەناو لادێیەکان پەندێك لەسەر زاران دەگەڕاو دەیانگوت:((کچ بەختەوەری نایێنێت.)) زۆرکەم روویدەدا پیاوێك ژنی خۆی بەناو بانگ بکات، هەموکاتێك دەیانگوت:((ئاهای ژن!)). هیچ ئافرەتێك نەیدەتوانی لەکاتی قسەکردنی پیاوی قسەی ببڕێت، کاتێك پێکەوە دەڕۆیشتن بۆبازار، پیاو لەپێشەوەو ژن بەدوایدا دەڕۆیشت. لەگەڵ خۆم دەمگوت ئەمانە تاکو ڕادەیەك بەخت هەڵگەڕاون. بەلآم هەڵەم دەکرد.

هەموو ئافرەتان پێش نیوەڕۆ پێش ئەوەی خواردن بۆهاوسەرانی خۆیان ئامادە بکەن‌و بڕۆن بۆناو کێڵگەی کشتوکاڵی لەسەر بیری ئاو کۆدەبوونەوەو قسەی زۆریان پێکەوە دەکردو غەیبەتی خۆیان دەکرد، جارێکیان ژنێك پرسیارێکی لەژنێکیتر دەکرد:((چی بووە ئامینە؟ ئەمڕۆ زۆرخوشحاڵی.))

ئەمینە لەوەلآمدا دەیگوت:((دوێنی سێ جوجەلۆك‌و چواردە هێلکەم لەبازار فرۆشتن. ئێستا دەتوانم چاو شەکری زستان دەستبەر بکەم.))

ژنێکیتر بەزەردەخەنە:((شیری مانگای ئێمە ئەوەندە زۆربوو توانیم دەکیلو پەنیر بیفرۆشم. بووکێنی کچم خۆشترین شای دەبێت لەم گوندە.))

من ڕۆژانە سەردانی بیری ئاو هەڵکێشانم دەکرد بۆئەوەی زیاتر گوێی لەگفتوگۆیان بگرم. زۆرجار بۆدەرهێنانی ئاو سوودیان ئاژەلێکی بارهەڵگر وەردەگرت. بیرو باوەڕم لەسەر ئەم ئافرەتانەی لادێی دەگۆڕا، زۆربەی ئەم ئافرەتانە نەخوێندەواربوون، بەهەڵسەنگاندنی ئەمڕۆیی ئافرەتی بێبەش هەژمار دەکرێن، بەلآم بەبەراوردکردن لەگەڵ ژنانی چینی ناوەندی میسر لەدەیەکانی پەنجاو بۆسەرەوە، خاوەن ئازادیی‌و سەربەخۆیی زیاتربوون.

ژنانی چینی ناوەندی میسر، جگە لەوانەی کەلەشارەکانی وەك قاهیرەو ئەسکەندەرییە دەژیان، مافی هەڵبژاردنیان بۆخۆیان هەبوو؟ لەشارەکانی بچوکتر ژنان خوێندەواری زۆریان نەبوو، بێگومان ئەوەندە خوێندەوار نەبوون کەبتوانن کارێك بۆخۆیان دەستەبەر بکەن. هاوسەرانیان هاوچینی خۆیانبوون‌و بەخۆبەستنەوەیان بەنەریتەکانی کۆن، هاوڕێیان لەهاوسەرانی خۆیان دەکرد لەماڵ بمێننەوە، تەنیا خزمەتی منداڵو هاوسەری خۆیان بکەن. ئەم ژنانەی چینی ناوەند لەدوورو دەرەوەی کۆمەڵگە ژیانی خۆیان بەسەر دەبرد، لەهیچ شتێکی هاوسەریان هاوبەش نەبوون‌و ئەم پیاوانە لەدەرەوەی ماڵ خاوەن پێگەی کۆمەلأیەتی خۆیانبوون.

لەناوچەکانی گوندنشین ژن‌و پیاو پێکەوە شان بەشانی پیاو کاریان دەکرد لەتەواوی لایەنەکانی ژیانی رۆژانە لەگەڵ یەکتردا هاوبەشبوون. پێکەوە کێڵگەی خۆیان ئاودێری دەکردو چاودێریی‌و دروێنەیان دەکرد. لەکاتی مانگایەك دەیویست بیچوویەك بێنێت وەك بەردەست هاوشانی پیاوی رادەوەستا. لەدایکبوونی بیچووی مانگایەك دەبوو خێرو بەرکەتی خێزان، لەلایەنی شیر سەربەخۆ لەهەمان کات دەیانتوانی وەك ماستو پەنیر لەبازار بفرۆشن‌و پێداویستی پێویست بۆماڵەوە دەستەبەر بکەن‌و ژیانیان تاکو ڕادەیەك بگۆڕێت. ژن خاوەن کاروباری تایبەت خۆیبوو. خاوەنی مریشك‌و قازو کەڵەشێرو بوون هێلکەیان کۆدەکردنەوە، پەنیریان دروست دەکردو دواتر لەبازاری رۆژ دەیان فرۆشتن. ئەمانە ئازادی زۆربچووك بوون، بەلأم ئازادییەکانی بچوك ئازادی گشتی دروست دەکەن. جۆرێك بەخێلیم پێدەبردن. بیگومان بەشی ئەم ئافرەتانە لەکارو چالأکی رۆژانە لەدەرەوەی ماڵەوە زیاتربوو لەسەردەمی منداڵی منداڵەکانم. شەیدای شێوازی ئەم ئافرەتانەبووم. زۆر شادو سەر زیندیی‌و خوشحاڵبوون، وەك هاوڕێم (هانم) کەکۆڕی لەناو نەخوشخانەی تازە دروستکراو کاری دەکرد. هانم خوێندەواری نەبوو، بەردەوام گوێی لەرادیو دەگرت لەزۆر لەژنانی شارنشینی هاوتەمەنی ئاگادارتربوو. زۆرجار من‌و هانم یەکترمان دەبینی ئاگاداری لەهەواڵەکانی نوێی دەرەوەی میسر هەبوو زیاتر هەستم دەکرد گوێی لەشرۆڤەکارێکی بابەتی رۆژ دەگرم نەك ئافرەتێکی نەخوێندەواری لادێی.

بیگومان پیاوەکان حاشایان نەدەکرد کەزۆربەی بڕیارەکانی گرنگی خێزانی کەلەگوند دەگیران ئافرەتانبوون، بڕیاری کەدەبێت چ کاتێك ژوورێکیتر بۆماڵەکەیان زیاد بکەن، مانگایەکیتر زیاد بکەن بۆگەورەکردن‌و فرۆشتن. پەندێك لەناوگوندا زۆر باوبوو:((پیاو رووبارەو ژن بەنداو.)) ژنانی گوندی میت ئەبونەلکۆم خاوەنی سەندووقێکی قەرزی بێ سوو بوون، پارەی کۆکراوی

مانگێك دەدرایە یەکێك لەوانەی بەشداربوون، بەم شێوەیە هەژارترین کەس دەیتوانی پێویستییەکانی خۆی دەستەبەر بکات کەپێشتر نەیدەتوانی بەتەنیا ئەمەیان بکات. لەکاروبارەکانی وەك نەختی بووکو کڕینی جلوبەرگ سوود وەردەگیرا. کاتێك یەکێك جلوبەرگێکی نوێی دەکڕی دەبێت لەگەڵ خۆیدا ببات بۆسەر بیری ئاو تاکو ئەوانیتریش تەماشا بکەن.

ئەم ئافرەتانە لەزۆر رێگایەوە هاوکاری یەکتریان دەکرد، لەکاتی کارکردنی ژنانی گەنج منداڵەکانی خۆیان لەماڵی یەکێك لەژنانی بەتەمەن دادەنا تاکو گەڕانەوەی لەسەر کار چاودێر بکات. ئەگەر ئافرەتێك دووگیان دەبوو یان منداڵی دەبوو ژنانیتر خواردنیان بۆدەبردو ماڵیان بۆخاوێن دەکردەوە. ئەگەر پیاوێك یان منداڵێك دەمرد، ئافرەتان بەنوڕە بۆبێوەژنی داخ لەدڵ خواردنیان دەبرد، دەیانزانی لەوانەیە لەلایەنی دارایی هیچی نەبێتو توانای دروستکردنی خواردنی نەماوە.

کاتێك دایکی محەممەد کوڕی خۆی لەرووداوێکی سەربازی لەدەستدا، ماوەیەك دەبوو من سەردانی لادێم نەکردبوو. کاتێك رۆیشتم بۆبەشداربوون لەهاودەردی دایکی محەممەد رۆیشتم بۆدۆزینەوەی ماڵی بچووکی هیچ کێشەیەك نەبوو. بەدوای دەنگی گریاندا رۆیشتم. کاتێك گەیشتمە ماڵی دایکی محەممەد، زیاتر لەپەنجا ژنی ڕەشپۆشم بینین بەدەوری دایکی داخبار دانیشتبوون ئەوەندە فرمێسکیان دەباراندن وەك ئەوەبوو کەمنداڵی خۆیان لەدەست دابێت.

کاتێك گەیشتمە ناو ماڵیان ژنێك شێوەنی بۆدەگێڕا لەناو شێوەنیدا دەیگوت:((منداڵی محەممەدم بەبیر دێتەوە. ئێستا بەجلوبەرگی سەربازی وەك شازادەکان بەجێب دەگاتە جێ.)) هەموو ژنەکان پێکەوە دەستیان بەگریان کرد. زۆربەیان لەسینگی خۆیان دەداو هێقەی خۆیان دادەدڕاند.

کاتێك گریانی ژنان کەمتر دەبوو، ژنێکیتر هاواری دەکرد:((بیرم لەزاوایەتی پێنج ساڵی رابردوویی دێتەوە بەهەمان جلوبەرگی سپیو شاڵی ئەوریشەمی، هیچ کاتێك وەك ئەوکات جوان نەبوو، وەك مەلایکەکان دەهاتە بەرچاو.)) دووبارە دەنگی گریانی ئافرەتان بەرزدەبوویەوە. کەشو هەوای ماتەم گێڕانو لەدەستدانی ئازیزێك بەتەواوی هەستم پێدەکرد. من خۆم، هەستم بەدەردو ژانو هاوبەشی هەمان دایکم دەزانی، دەستم بەگریان کرد. ژنێکیتر دەستی لەسەر شانی دایکی محەممەد داناو گوتی:((ئیتر هیچ کاتێك محەممەد نابینینەوە، کوڕێکی وەك

گوڵبوو. بەیادم دێتەوە کاتێك یەکەم مووچەی خۆی وەرگرتو بۆتۆی هێنایەوە گوتی:"دایەگیان یەکەم مووچەم وەرگرت بەڵام ئەمەیانە بەشی تۆیە، تۆبۆمن ئازاری زۆرت کێشاوە، فیداکاری زۆرتکرد. پاساکانت زۆرتوندبوون تاکو من بتوانم ببم بەئەفسەر. ئێستا سوپاسی تۆدەکەمو تۆ بۆمن جێگای سەربەرزی.")

ئەم ئافرەتانە سێ ڕۆژی تەواو، لەبەیانی تاکو ئێوارە، دەرۆیشتنە ماڵی دایکی محەممەد هەمووکارەکانی ماڵی خۆشیان جێبەجێ دەکرد، لەگەڵ ئومی محەممەد شینیان دەگێڕا. ژنانی لادێی تەنیا خوشکی جەرگ سووتاویان خولەکێك بەتەنیا نەبوو. هەموو خەڵکی لادێی خواردنیان ئامادە دەکردو دەهێنایە ماڵی دایکی محەممەد، بەنوڕە ئەمەیان دەکرد. خواردنەکانی ئاسایی بوونو لەگەڵ چاو قاوە، خواردنی شیرینیان بۆدایکی محەممەد (ئومی محەممەد) دروست دەکرد بەڵام هیچی تام نەدەکرد.

بەڵام ژنان پێداگریان دەکرد:((بڕێك گوشتی کوتر بخۆ، تەنیا قومێك شەربەت.)) بەڵام بەردەوام هاواری دەکرد:((ڕێگام بدەن بمرم، بەبێ کوڕم ئیتر بۆمن هیچ خۆشییەك بوونی نییە، چونکە هیچ کاتێك ناتوانم دووبارە ببینم.)) دووبارە هەموو ئافرەتان پێکەوە دەستیان بەگریان دەکرد. ڕۆژانە نەوەکانی دایکی محەممەد لەماڵەوە نەدەبوون بۆئەوەی ئەم شێوەنە نەبینن بەڵام کاتێك ئێواران دەگەڕانەوە، شێوەنی دایکی محەممەدو کەسانی ئامادە شێوازی نوێی بەخۆیەوە دەگرت. هەموویان پێکەوە دەگریانو دەیان گوتەوە:((ببینن چەند بچوکن، لەمنداڵی بوون بەهەتیو.))

لەکۆتایی ڕۆژی سێیەم، هەموویان پێکەوە، لەوانە دایکی محەممەد، لەبەر ماندووبوون توانایان نەدەما، هەموو ئافرەتان هاوکاری دایکی محەممەدیان دەکرد کەئەم خەمە گەورەیە تاکو ڕادەیەك لەیاد بکات یان کەمتر بکرێت بۆساتێك بەتەنیا نەدەبوو، تاکو ڕۆژی چلەی، شەوانی هەینی هەموو ئافرەتان دووبارە روویان لەماڵی دایکی محەممەد دەکرد ئەمجارەیان بەشێوازێکی سووکتر کەخەمی کەمتر بکەن. هەڵسوکەوتی ئێمە لەقاهیرە بۆمەرگی کەسێك زۆر تایبەتربوو، خەمی ئێمە تەنیا بۆئێمە دەمایەوە، بەڵام لەلادێی هەموویان پێکەوە هاوبەشی خەمی یەکتربوون.

لەلادێی کاری هەمووکەسێك دیاربوو، بەتایبەتی منداڵان، لەبەیانی تاکو ئێوارە لەکۆکردنەوەی بەرهەم هاوکاری دایكو باوکی خۆیان دەکرد. گۆرانییەکانی کاتی کۆکردنەوەی بەرهەم لەبەیانیان

دەنگی دەدایەوە:((ئەی ئەوکەسەی کەپرتەقاڵی چاند، چاندنو هەبوون، ئێستا کۆتکردەوە.))
پێش شۆڕش دەبێت منداڵانی بچوکی تەمەن پێنج ساڵان لەگەرمای هاوین چەندین کاتژمێر سەرقاڵی کارکردنبوون، بەڵام خاوەن موڵکەکان بەدار بەدەست لەناویاندا دەگەڕان ئەگەر کەسێکیان دەبینی کاری باشو خێرا نییە بەهەمان داری دەستی خۆیان سزایان دەدا. بەتایبەتی ئەم منداڵانە بۆکۆکردنەوەی کرمەکان لەناو لۆکە تەرخان دەکران. من زۆر لەم کرما دەترسامو تاکو ئێستاش هۆکاری نازانم. هیچ کاتێك میوەیەك ناخۆم بزانم کرمێکی تێدایە، بۆم باشتر دەبوو لەگەڵ شێرێکی دارستان بەرامبەریم نەك کرمێك.
ئێستا منداڵەکان لەلادێی دەڕۆن بۆقوتابخانە، بەڵام ئەرکی رۆژانەی خۆیان جێبەجێ دەکەن، لەکارەکانی ماڵەوە هاوکار دەبوون، گامێشەکان بۆلەوەرگەو فێنکبوونەوە دەبەن بۆناو رووباری نیل. منداڵانم زۆر بەتاسەوە باسی کارەکانی رۆژانەی خۆیان لەلادێی دەکرد:((دایەگیان من گامێشی خۆمان برد بۆئەوەی بتوانێت لەناو ئاو خۆی فێنك بکاتەوە.)) ئەنوەر بەردەوام پێداگری لەفێربوونی ئەم جۆرەکارانە بۆمنداڵەکانی دەکردەوە.
ئەنوەر دەیگوت:((ئەگەر دەکرا هەموو میسر وەك لادێی بێت، ئەوکات دەمانتوانی زۆر کاری باشتر بکەین.))
هەموو ساڵێك ئەندامانی خێزان لەپشووەکانی قوتابخانە لەوەرزی بەهار، نزیکەی دوو هەفتەو لەهاوینان پێش ئەوەی بڕۆین بۆئەسکەندەرییەو لەساڵرۆژی لەدایکبوونی ئەنوەر لەبیستو پێنجی کانوونی دووەم، سەردانی لادێی دەکەین. کاتێك منداڵەکان تەمەنیان گەورەتر دەبوو زیاتر دەیانوویست سەردانی ئەسکەندەرییە بکەن، ئەنوەر پێداگری دەکرد:((منداڵەکان دەبێت شارەزایی لەتەواوی ڕیشەی خۆی هەبێت. لادێی بەدڵی میسر هەژمار دەکرێ.))
بۆ ئەنوەر، میت ئەبوئەلکۆم دوور لەهەژاری، سەرچاوەی هەموو باشییەکانو بنەمای بەهێزی ژیانبوو. هەموو هەوڵی خۆیدا بەدەرهاوردی کتێبەکانو لەگەڵ هەمان بەشی خۆی لەوەرگرتنی خەڵاتی نوبڵی ئاشتی  دوای واژۆکردنی پەیمانی ئاشتی کەمپ دیوید لەساڵی ١٩٧٨ لەگەڵ مناخیم بگین خەرجی هەژارەکانی میت ئەبو ئەلکۆم بکات برێك لەهەژاریان کەم بکاتەوە. لەبەر ئەم پەیوەندییە بەهێزەی هاوسەرم لەگەڵ خەڵکی لادێی خۆی منو منداڵەکان هەموو ساڵێك لەرۆژی لەدایکبوونی بۆرێزگرتن لەگیانی سەردانی ئەم گوندە دەکەین.

یەکەمجار کەمن‌و ئەنوەر سەردانی لادێمانکرد، لەماڵی باوکی ئەنوەر دەماینەوە، خانوویەکی بچوك کەبەقوڕ دروستکرابوو وەك هەموو خانووەکانیتر. دواتر ئەنوەر پارچە زەوییێکی کڕی خانوویەکی بچوکمان بەخشتەکانی سوور لەسەر دروستکرد، دواتر وردە وردە گەورەمان دەکرد، لەسەرەتا زۆر سادە دەستمان پێکرد بۆگەرم کردنی حەمام هیچمان نەبوو ئاومان لەسەر ئاگری دارەکان گەرم دەکردو لەناو تەشتێکمان دەکردو سوودمان لێ وەردەگرت، بۆرووناکی شەو سوودمان لەچرای نەفتی وەردەگرت. لەزستان بۆخۆ گەرمکردنەوە، بەدەوری مەنقەلێك کۆدەبووینەوە. تەنورمان بەوشکەدارەکان گەرم دەکرد، دواتر توانیمان هەندێك پێویستی بۆخۆمان دەستەبەر بکەین، بەلام ئەنوەر پێداگری دەکرد دەبێت تەنور بەشێوەی سەردەمی منداڵی جارانی بمێنێتەوەو بەهەمان شێوە سوودی لێوەربگیرێت.

لەناو باخچەی ماڵەکەمان هەموو جۆرە میوەیەکمان چاندن: پرتەقاڵ، نارنگی، خۆخ‌و زۆر جۆریتری میوە. خاکی ئەم شوێنە ئەوەندە بەپیت‌و بەرەکەتبوو بۆچاندنی دارخورما تەنیا پێویستی دەکرد لقێك لەناو خاکی دابنیت. پێویستییەکانیتری وەك خەیار، خەز، کودی، تەماتە لەگەڵ هەموو جۆرە سەوزەیەك هەمانبوو، لەگەڵ چەند سەرە ئاژەڵێك گیودرێژێك بۆسواربوونی منداڵەکان‌و مانگایەك بۆشیر. بۆچاودێریکردنی ماڵەکەمان کەسێك لەگوند بەناوی شەرعەبی چاودێری دەکرد ئێستاش بەتێپەڕبوونی بیست‌و پێنج ساڵ بەردەوامی بەکاری خۆی دەدات.

شەیدای خواردنەکانی بەتام‌و سادەی لادێی بووم. کاتێك لەقاهیری دەڕۆیشتین بۆلادێی منداڵەکانم بەدوای کۆکردنەوەی دارەکانی وشك ڕەوانە دەکردن تاکوشیر برنج دروست بکەم. فێربووم لەشیری مانگای خۆمان پەنیر دروست بکەم‌و نیوشکی سەرەوەی پاشکەوت بکەم، بەلام هیچ کاتێك لەدۆشینی مانگا سەرکەوتوو نەبووم. من باوەڕ دەکەم کەدەبێت لەنێوان مانگاو کەسی شیردۆش پەیوەندییەکی تایبەت هەبێت تاکو مانگا ڕێگای هاتنەخوارەوەی شیر بدات، هیچ کاتێك سەرکەوتوو نەبووم. بەلام فێری جۆرو ڕەنگی دروستکردنی پەنیربووم بەتامەکانی جیاوازو جۆری هەڵگیرانی.

ئەنوەر باوەڕی نەدەکرد من بتوانم بەم خێرایە شێوەو شێوازی ژیان لەلادێی فێربم‌و ژنانی لادێی لەناوخۆیاندا من قبووڵ بکەن. بەلام ڕێزی زۆر لەمیوان دەگرن کاتێك غەریبەیەك دەهاتە ناوگوندی میت ئەبوئەلکۆم دەنگی خەڵك بەرز دەبوویەوە کە بەخێرهاتنیان دەکردو بۆخواردنەوەی چا بانگێشتی ماڵەکانی خۆیان دەکردن. خەڵکی لادێی ئەگەر هەژاربن بەلام

خەڵك بۆخواردن بانگێشتی ماڵی خۆیان دەکەن. نەك تەنیا لەبەر ئامۆژگارییەکانی قورئان وەك نەریتێکی کۆنی بیابان نشینی هەموو وڵاتانی عەرەبی دەبێت لەخواردنو حەواندنەوەی میوان بابەتێکە لەنیوان مەرگو ژیان. بۆنموونە لەعێراق هەندێك میوانسەرای هۆزنشین بۆمیوانەکان دروست دەکەن سێ رۆژ بەبێ پرسیار خواردنیان بۆئامادە دەکەن. میت ئەبونەلکۆم، شوێنێکی بچوکی هاوشێوە بوو.

شەوێك کاتێك کاتژمێر هەشتی شەو گەڕامەوە بۆماڵەکەم ئەنوەر پرسیاریکرد:((لەچ شوێنێك بوویت؟))

گوتم:((بۆخواردنی ئیوارە میوانی یەکێك لەهاوڕێیانی خۆم بووم.))

بەنیگەرانی گوتی:((چیت خواردووە؟))

((خواردنی بەتامی کودی زك پڕ بەبرنج، لەگەڵ دوو ئافرەتیتر کەبەبێ هەواڵ هاتبوون رێگای نەدا بڕۆن تاکو بەشداری لەخواردن بکەن.))

پرسی:((هەلومەرجت باشە؟))

لەوەڵام گوتم:((زۆر زۆرباشم.))

گەشایەوەو گوتی:((لەئێستا بەدواوە نابێت نیگەرانی تۆبم، لەبەرامبەر خواردنەکان بەهێزی خۆت نیشانداوە.))

ئەگەر ترسی لەنەخوشییەکانی باوی هەمان سەردەمو پێشتر هەبوو، بەتایبەتی نەخۆشی چاو من بەردەوام تەماشای چاوەکانی منداڵەکانم دەکرد کەلەگەڵ منداڵەکانی من یاریان دەکرد کەگیرۆدەی نەخۆشی چاو نەبن، چەندین سەدە ئەم نەخۆشییە لەتەواوی میسر بەربڵاوی زۆری هەبوو زۆر لەخەڵك نابینا دەبوونو یەکێك لەکێشەکانی سەرەکی تەندروستی میسر هەژمار دەکرا. دوای کردنەوەی نەخوشخانە لەگوندی میت ئەبونەلکۆم چاودێری ئەم نەخۆشییە دەکرا بەپوودری کل، پوودری کل پوودرێکی ڕەشبوو کەژنانی میسری لەسەردەمی کلئۆپاترا بۆجوانکاری چاو سوود وەردەگیرا. لەوانەیە کل کاریگەری خۆی هەبێت، بەڵام تاکو ئێستا لەسەرتاسەری میسر، لەبەر خولباریینی بەردەوام مێشولەکانی جۆراوجۆر، نەخۆشی چاو بەردەوامی خۆی هەیە وەك پەتا. لەلادێی نەخۆشی مەلاریا هەبوو نەخۆشییەك لەرێگای مێشووەکان بۆ مرۆڤ دەگوازرایەوە، لەناوچەکانی زلکاوەکان گەشەیان دەکرد. دواتر قوتابیانی زانکۆ لەبەشی پزیشکیم راسپاردن شوێنی گەشەکردنی ئەم مێشوولانە بەخاك پڕبکرێتەوە.

چەندجارێك گیرۆدەی نەخۆشی وەبا بووین، وەك هیندوستان بەربلاو نەبوو. زۆربەی ئەم نەخۆشییە لەلایەن کەسانێك سەری هەڵدەدا کەلەسەفەری مەککە دەگەڕانەوە، لەهەمان شوێنە تێکەلاوی هیندییەکانو خەڵکانی ئاسایی دەبوون. حکومەت بەتەواوی ئاگاداری مەترسی نەخۆشی وەبابوو دەستبەجێ شوێنی سەرهەڵدانی گەمارۆ دەداو خەڵکی چارەسەر دەکرد لەرێگاکانی جۆراوجۆر بەتایبەتی کوتان. ئێمە لەبەرامبەر نەخۆشییەکانی ئیفلیج بوونی منداڵان، سورێژەو زۆر نەخۆشی چڵکی گوازراو لەگەرماو هەلومەرجی تەندروستی ناتەواوی ئێمە گەشەی دەکرد،بەرگەمان نەدەگرت.

خراپترین نەخۆشی لەمیت ئەبوئەلکۆمو گوندەکانیتری کشتوکاڵی بوونەوەرێك لەناو ئاو دەژیا لەرێگای قەپۆشکە دەگوازرایەوە کەلەناو ئاوەکانی وەستاو جۆگەکانی ئاودێری دەژیان کەئاوی رووباری نیلی دەگەیاندە کێڵگەکان. پێش ئەوەی شۆڕش نەخوشخانە بگەێنێت بەگوندەکان ٧٠٪ گوندنشینەکان گیرۆدەی ئەم نەخۆشییە دەبوون بەناوی (بیلارزیا). چونکە هیچ چارەیەك نەبوو رۆژانە پەیوەندییان بەئاو بۆئاودێریکردن هەبوو. ژنان بۆشوشتنی جلوبەرگ سوودیان لەهەمان ئاو وەردەگرت، منداڵەکان بۆخۆفێنك کردنەوەو شوشتنی گامێش لەگەرمای زۆری میسر بەردەوام لەناو ئەم زڵکاوانە دابوون. پیاوەکان بۆداماڵی ئەم جۆگە ئاوانە بەردەوام لەناویدا دەرۆیشتن کەبتوانن باشتر کشتوکاڵی خۆیان ئاودێری بکەن.

هیچ رێگایە بۆخۆدورخستنەوە لەم بوونەوەری ناو ئاو بوونی نەبوو، بەهەزاران لەم بوونەوەرانە لەناو ئاودا بوونیان هەبوو ئەوەندە وردیلۆکەبوون تەنیا بەمیکرۆسکوپ دەکرا ببینین، لەرێگای پیست دەچنە ناوخوێنو لەناو سیپەڵکو فاتەڕەش جێگای خۆیان دەگرن لەکۆتایدا دەبوونە هۆکاری سەرهەڵدانی نەخۆشی شیرپەنجە. نیشانەکانی ئەم نەخۆشییە لەسەرەتاوە خەڵکی گوندنشین گرنگیان پێی نەدەدا ئازاری لەجومگەو، تای بچوك هەستکردن بەماندوو بوونێکی توند دەستی پێدەکرد. زۆرکەس تاکو خوێنی لەناو پیسایی خۆی دەبینی ئاگاداری گیرۆدەبوونی خۆی نەدەبوو بەم نەخۆشییە، ئەوکات هیچ دەرفەتێکی بۆنەدەمایەوە.

ئێستا نەخۆشی بیلارزیا بەخێرایی دەستنیشان دەکرێت، بەدەرزییەك چارەسەر دەکرێت. دەرمانی ئەم نەخۆشییە لەکاتی خۆیدا گەیشت. جیگای سەرسوڕمانبوو کە بەنداوی گەورەی ئەسوان، بەسوودی زۆری بۆجوتیاران، لەوانەیە ئەم نەخوشییەیی زیاتر کردبێت، چونکە بەبوونی بەنداو، نیل لافاوی دروست نەکردو بەشێوەیەکی سروشتی پاڵاوتنی بۆناکرێت.

جوتیاران بەکارکردنی بەردەوام لەبەردەم مەترسی ئەم نەخۆشییەو ئەم کرمەی نادیار دەمێننەوە.

هەرچەند شۆڕش نەخوشخانەی نوێی دروست دەکردن لەناوچەکانی گوندنشین، بەلاّم زۆر لەجوتیاران باوەڕیان زیاتر بەدوعاکردنو زووتر چاکبوونەوە هەبوو لەزانستی پزیشکی. هەموو گوندییەکان خاوەنی شێخی خۆیانبوون، زۆرجار پیاوێك یان ژنێك بۆ دەرکردنی جنۆکە لەگیانی خەڵكو بینینی چارەنووسیان دەوری حەکیمو دوعا نووسی خۆجێی دەبینی. لەمیت ئەبوئەلکۆم، شێخ حەسەن ئەم ئەرکەی لەسەر شانبوو، یەکێك لەکەسانی خوێندەواری گوندبوو، کەسێکبوو کەخەڵکی گوند باوەڕیان پێدەکرد.

بۆچارەسەری کێشەکان دوعایەکی تایبەتی لەقورئان لەسەر پارچە کاغەزێك دەنووسی دەیدا دەستیان. ژنەکانی بەخیلّ دەیانوویست هاوسەری ژنی دووەمی لەبەرچاو بکەوێت، ژنێك کەخاوەنی چەند کچێکبوو دوعای دەویست کەببێتە خاوەنی کوڕێك، مەبەستی ئەمانە هەرچییەك بێت شێخ دوعایەکی بۆدەنووسی. دواتر بۆئەوەی دوعا کاریگەری خۆی بکات دەبێت لەشوێنێکی تایبەتی بۆدیاریکرابا. لەناو کیسەیەك بەبزمارێك هەڵبواسرێت، بەگەردنی خۆیەوە بکات، لەژێر سەرینی خۆی دابنێت. هەمووئەمانە تایبەتمەندی خۆیان هەبوو.

شێخ بۆکاریگەر بوونی دوعاکانی پێشنیاری دەکرد بۆدووگیان نەبوونی ئافرەت دەبێت سەری مراوییەکی ڕەش ببڕێت، بۆتا، تەنیا خواردنی گوشتی سپی مریشك، یان بەرگی سەوز دەبێت لەکاتی خۆرئابوون بخورێت. من باوەڕێکم بەدوعاو جۆری خواردنەکان نەبوو. بەلاّم ئەنوەر لەگەنجایەتی خۆی باوەڕی دەکردن. لەمنداڵی خاڵێکی سپی کەوتبوو سەر باسکی چونکە ڕەنگی ڕەشبوو بەباشی دەردەکەوت. ئەوکات باوکی لەنەخوشخانەی سوپا کاردەکات دەیتوانی بگاتە باشترین پزیشك، هەموو دەرمانەکان کەبەکار دەهاتن کاریگەریان نابێت. لەکۆتایدا باوکی دەباتە لای ئافرەتێك لەیەکێك لەگوندەکانی دراوسێیان کەکاری دروستکردنی خاڵبوو لەسەر روخسارو دەستی کەسانیتر بەدەوری خاڵی سپی سەرباسکی ئەنوەر دەرزی دەکاتو بۆباوکی باسدەکات جاری یەکەم سەوز دەبێتو دواتر بەخێرایی چاك دەبێتە. بەهەمان شێوە چاك دەبێتەوە کەهەمان ئافرەت پێشبینی کردبوو.

باوەڕم بەسێحرو جنۆکە بزاندنو دەرکردن نییە بەلاّم باوەڕی زۆرم بەدەرمانی سروشتی هەیە کەزۆر لەمیسرییەکان لەرابردوو سوودیان وەردەگرتو کاریگەربوو، بەتایبەتی لەشوێنەکانی

گوندنشین، سوود وەردەگیرێ. هەرکاتێك منداڵەکانم نەخوش دەکەوتن بەخێرایی دەڕۆیشتم بۆنەخوشخانەکانی نوێ بۆچارەسەری ئەوەی پزیشك پێشنیاری دەکرد هەمان دەبوو بەڵام لەدەرمانەکانی سروشتی خۆم بێبەش نەدەکرد. بۆدەردی دڵ ئاوی کوڵاوی گوڵی بەیبوونم و گوڵی سپیم دەدایە. بۆقەبزی عەزوای سەوزو گەڵای تاڵی سیوم پێدەدان. ئەگەر بێ هێز دەبوون ئاوی گوڵێکیترم پێدەدان کەخوێنی بەهێزدەکرد. ئەم درمانانەی سروشتی جیل بۆجیل دەگوازرانەوە تاکو ئێستا کارایی خۆیان زیاترە لەدەرمانەکانیتری کیمیاویی هەبوو. ئێستاش کاتێك پیستی جەستەم لەبەرخۆر دەسووتێت قسەی پوورم زوزو بەبیردێتەوە کاتێك چەند کاتژمێرێك لەکەناراوەکان بووین بۆ دایکم باس دەکات:((بەمەلحەم نابێت ماست باشتر کاری خۆی دەکات.)) پوورم راستی دەکرد. ماست دەستبەجێ چارەسەری سووتانی بەرتیشکی خۆری دەکرد.

هەندێك لایەن لەناو گوندا بوونیان هەبوو نەمدەتوانی قبووڵیان بکەم و خۆم لەگەڵیاندا بگونجێنم. لەبەرخاتری نەخۆشی بیلارزیا. لەمیت ئەبوئەلکۆم رێگام نەدا بەمنداڵەکان خۆیان نزیکی ئاو بکەن و خۆم نزیکی نەدەبووم. بێگومان دەمزانی کرمی زۆری لەناو ئاودا بوونیان هەیە کەئێمە ناتوانین بەچاو بیان بینین. یەکێك لەسەرقاڵبوونەکانی خۆشەویستی منداڵەکانی میسری کڕینی کرمی ئاوریشم بوو راگرتنیان لەناو قۆتوویەك لەگەڵ چەند گەڵای سەوزی داری توو ئەگەر بەخت یاوەریان دەبوو دەیانتوانی ببینن چۆن پەپوانە لەناویدا دیتەدەرەوە. بەڵام من هیچ کاتێك رێگام بەمنداڵەکانی خۆم نەدا یەك دانە بۆماڵ بێنن.، دەبێت بۆبینینی سەردانی ماڵی یەکێك لەهاوڕێیانی خۆیان بکردبا، من لەبوونەوەرەکانی خوشۆك بێزاربووم وەك کرمی خاوەن دوشاخی بچووك، زۆر تووڕە دەبووم، مارمووڵکەیەکی گەورە بوونی هەبوو میسریان لەسەردەمی کۆن بەپیرۆزیان دەزانی لەناو پەرستگەکان رادەگیران بەچاوی من تەنیا بوونەوەرێکی گەورەبوون، زۆرجۆری یاری بەگیانەوەرانی بچوك دەکران بەڵام من رێگام بەمنداڵەکانی خۆم نەدا بەشداری لەم جۆرە یارییە بکەن، ئەم خشووکە بۆرزگاربوونی خۆی هەوڵی زۆری خۆی بەکار دەهێناو دەڕۆیشت و خرخاڵەکانی بەدوای خۆیدا ڕادەکێشان

وەك گوێدرێژو گامێش کەلەئاشەکان بەکاریان دەهێنان و لەخۆیان دەسوڕانەوە.

فێڵبازی دۆزینەوەی هاوسەرێکی باش بۆکچەکانی خۆیان بەشێکبوو لەژیانی لادێی، ئەمەیان لەژنانی سەر بیری ئاوی ناوەندی گوند فێربووم. ژنێك کچی بچوکترو جوانی نیشانی خزمەکانی

دەدات بەلاّم لەكاتی مارەبڕین كچی گەورەترو ناشیرینتر لەشوێنی دادەنێت. فێڵبازییەكیتر كچی گەورەتریان كەتەمەنی شانزدە ساڵانبوو دەبرد بۆلای پزیشك كەرێگای پێی بدات، دواتر ماربڕین بۆكچی چواردە ساڵان دەكرا. تاكو ئێستاش زۆركەم روویداوە كەكچێكی لادێی لەهاوسەرگیری دوودڵ بێت. لەلادێی پێچەوانەی نەریتی رۆژئاوایی ددانی شیری لەژێر باڵینی سەری دادەنێن بەمەبەستی هیواخواستن بۆددانێكی جوانتر، بەلاّم كچانی لادێی لەمنداڵییەوە تەنیا خاوەنی هیوایەكبوون، ددانی خۆیان بۆئاسمان بەرز دەكردەوەو گۆرانیان دەگوتن:((ددانی گامێش لەمن وەربگرن‌و لەجیاتی ئەمەیان من ددانی بووكم دەوێت!))

هاوسەرگیری، هاوسەرگیری، هاوسەرگیری. لەسەر بیری ئاوهەڵكێشان وەك دیار ناوەڕۆكی سەرەكی ژیانی تەواوی ئافرەتانی لادێی هاوسەرگیرییبوو. لەدیدگای دایك كوڕ، هاوسەرگیری منداڵ بەمانای پشوودانبوو تاكو كۆتایی تەمەن، چونكە جگە لەم لایەنە كەدەبێت بووكی خۆیان لەگەڵ خۆیان پێكەوە بەردەوامیان بەژیانی خۆیان دابا هەموو ئەركەكانی ماڵەوە دەخران سەرشانی بووك. بەلاّم بۆدایكی كچ، بەمانای نەمانی خەرجی كچ‌و هاوسەرگیریی كردنی جۆرێك لەسەركەوتن هەژمار دەكرا، ئەمەیان تەنیا هیوای دایكبوو. كچانی لادێی هیچ هەڵبژاردنی نەبوو. ئەگەر لەماڵ بەبێ هاوسەر دەمانەوە ئەمەیان دەبوو شۆڕیی بۆماڵی باوك‌و دایكی، هاوسەرگیری، بەهەر نەرخێك بێت، باشتربوو.

شەوێكیان كاتێك ئاومان لەبیر هەڵدەكێشا، ژنێك دەینالاّند:((دەبینن دوێنی هاوسەرم چی بەسەر هێناوم.)) وەك دیار بەنیشاندانی كوڵمی ئاوساوی بۆئەوەی سەرنج‌و دڵسۆزی بۆخۆی رابكێشێت، بەلاّم گرنگی خۆی بەلێدانێك لەلایەن هاوسەری دەبینێت. دواتر باسی لایەنەكیتر دەكرا كەچ پیاوێك لەهەموویان پیاوتربوو. ژنانی لادێی لەسەر پەیوەندی تایبەتی خۆیان لەگەڵ هاوسەرانیان زۆر بێترس لەژنانی كۆمەڵگەی شارنشین قسەی خۆیان دەكرد. لەناو كۆمەڵگەیەك كەزیاترین پەشۆكاویان جیابوونەوە بوو ئەم جۆرە شانازیی‌و رەوتی نازین دەبێت دروست شیاوی تێگەیشتن بێت. بەلاّم بەردەوام روخسارم سوور هەڵدەگەڕاو دەسووتا لەشەرمان. من هیچ كاتێك لەگەڵ هیچ كەسێك بابەتی تایبەتی نیوان خۆم‌و هاوسەرم بۆهیچ كەسێك باس نەكرد، بۆدایكم كەزۆر لەیەكتر نزیكبووین. لەلادێی هاوسەرگیری رووداوێكی گرێدراو بەهەموو كەسێك‌و ئاهەنگی هاوسەرگیری خۆشترین بەشی ئەم رووداوەیە.

لەمیت ئەبوئەلکۆم بەشداریم لەسەد ئاهەنگی هاوسەرگیریکرد. هەموویان وەك یەکبوون من وەك تەواوی ژنانی لادێی ڕۆژی دواتر بۆ پیرۆزبایی سەردانی ماڵی زاوام دەکرد، هەموو بووکەکان لەهەمان ڕۆژ زۆرجوانتر لەرۆژانیتر دەهاتنە بەرچاو، چونکە شەوێك پێشتر هاورێکانیان دەیانبرد بۆحەمام جلوبەرگی بووکێنیان بۆئامادە دەکردو خەنەیان لەدەستو پێی بووك دەنا. مێژووی خەنە وەك پێویستی خۆرازاندنەوە بۆ میسریانی کۆن دەگەڕێتەوە، رەنگی لەهەمان سەردەمان، نەك تەنیا جوانبوو نیشانەی پاکیو خاوێنی بەهەژمار دەهات. لەوڵاتانیتری عەرەبی ژنان هەفتانە دەستو پێی خۆیان بەخەنە ڕەنگین دەکەن، بەڵام من، بۆسەلامەتی مووەکانی خۆم وەك زۆر کەسیتر سوودم وەردەگرت.

پێش دەستپێکردنی ئاهەنگی مارەبڕین، تەنیا ئافرەتان دەڕۆیشتن بۆبینینی بووك، بەڵام پیاوانی لادێی، لەدەوڵەمەند تاکو هەژارترین کەس، پێش ڕۆژئاوا لەیەکتر کۆدەبوونەوە تاکو هێنانی بووك بۆماڵی زاوا بکەن بەجەژن. پەندێکی کۆنی لادێی بەم شێوەیە باس دەکرێ:((ئافرەت دووجار لەماڵ دەڕۆتە دەرەوە جاری یەکەم لەماڵی باوك بۆماڵی هاوسەری جاری دووەم لەماڵی هاوسەری بۆگۆرستان.)) لەکاتی تێپەڕبوونی بووك لەکولانە تەنگەبەرەکانی میت ئەبوئەلکۆم هەستی شادی دەگەیشتە ئەوپەڕی بەرزی خۆی.

یەکەمجار بەلێدانی دەف، تەواوی کچانی گەنج لەوانە کچانی خۆم بەچەپڵەرێزان وەڵامیان دەدایەوەو گۆرانی پیرۆزبێت پێکەوەیان بەدەنگی بەرز دەگوت. دواتر بارگەی بووك لەسەر بارهەڵگرێك یان لەسەر کالێسکەیەك نیشانی خەڵك دەدرا، دەفرەکانی مسیو سەندووقێکی داری ڕەنکراو، پێویستییەکانی ژووری خەوتن ـ تەخت، دۆشەکی نوێ، دۆلابی جلوبەرگ، کاتێك کالێسکە لەرێگاوە دەگەیشت هەموویان پێکەوە دەیانگوت پیرۆزبێت. هاوارکردن کاتێك زیاتردەبوو ئامادەکردنی خواردن کەپێکدەهات لەبرنجو گوشتی قازو سەوزەواتو فاسۆڵیا، نانو شیرینی جەژن کەبۆ میوانەکان دەگوازرایەوە. بەڵام بەرزترین هاوارکردن لەکاتێکدابوو کەبووکو زاوا لەکۆلانەکان تێپەڕیان دەکرد.

بووك لەگەڵ هەندێك لەژنانی خزم سواری ئۆتۆمبێلی سەرکراوە بەگوڵرازاوە دەبوون یان هەمان کالێسکە کە بەهەمان شێوە دەیان رازاندەوە، لەپێشەوەیان سوارێك دەڕۆیشت، زۆرجار بەتێپەڕبوونی سواری پێشەوە پیاوەکان گوڵەیان بەئاسمانەوە دەنان. من لەگەڵ ژنانیتر هلهلەمان لێدەداو بۆ کورە کردنی چاوی بەخیلەکان خوێمان فڕەدەدایە ئاسمان. زاوا لەماڵی

خۆشەویسترین هاوڕێی دەهاتە دەرەوە بۆهێنانی بووك دەڕۆیشت. وەك بووك هاوڕێیانی دەیانبرد بۆحەمامو دەستیان لەناو خەنە دەناو جلوبەرگی جوانیا بۆئامادە دەکردنو شمشێرێکیان لەناودەستی دەنا. دواتر گەنجانی هاوڕێی، مۆمو مەشخەڵ بەدەست لەدەوری دەسوڕانەوەو تاکو دەگەیشت بەماڵی بووك کەچاوەڕێی زاوای دەکرد دەڕۆیشتن. کاتێك شێخ مارەبڕینی لەنێوان باوکی کچو زاوا کۆتایی پێدەهێنا، بووك هاوڕێیانی مەراسیمی کۆتاییان ئەنجام دەدا.

قورئانێك لەسەر چۆکەکانی دادەنا تاکو لەپەنای خودابن، لەنێوان دۆستانی لەسەر کورسییەك دادەنیشت، بۆگرنتی بەختەوەری لەئایندە پێیەکانی بووك لەناو تەشتێکی ئاویان دەنا، ئەم ئاوە لەهاوینان ساردو لەزستان گەرم دەکرا، هاوڕێیانی سەری بووکیان بەگەڵاکانی سەوز دادەپۆشیو دەیان ڕازاندەوە، دواتر گەلای زیاتریان لەناو تەشتی ئاوی ژێر پێیەکانی دەکرد. دواتر بۆئەوەی ژیانی داهاتووی بەشیرینی دەست پێی بکات، شەکریان لەدەمی بووك دەکرد، دوای واژۆکردنی هاوسەرگیری، خەڵکی لادێی تاکو نزیك بەرەبەیان، بووكو زاوایان بەرەو ژیانێکی پڕ لەبەرپرسیارەتی هاوسەرگیری دەکرد بەجەژن.

لەدایکبوونی منداڵ بەم ڕادەیە دەبوو هۆکاری شادیو خۆشی. زۆربەی کەسانی کەبۆیەکەمجار منداڵیان دەبوو، موژدەی لەدایکبوونی منداڵی خۆیان بەرووناك کردنەوەی ماڵەکانی خۆیان بەچراکانی جۆراوجۆر دەڕازاندەوە. دوای حەوت ڕۆژ لەدایکبوونی منداڵ، زۆربەی خەڵکی لادێی دیاریان بۆدەبردن، مراوێك، قازێك، زۆرجار مەڕێك، چەند نانێك، یان نانەشیر کەبەهەنگوین دەخورا. هەندێك پارەیان بۆدەبرد، هەموو ئەمانە وەك قەرز هەژمار دەکران، کاتێك بەپێچەوانە لایەنی بەرامبەر دەبوو بەخاوەنی منداڵێك، دەبێت دیاری هاوشێوەی کەپێشکەش بکاتو بۆی بۆبگەڕێتەوە.

بەڵام چونکە خۆشەویستی منداڵی یەکەم دەبێتە خۆشەویستی ژیان، دایكو باوکیان زۆر لەچاوی بەخیلەکان دەترسن، بۆنموونە بۆمنداڵی یەکەم منو ئەنوەر پێکەوە بۆ دووربوونی منداڵمان دەستی چاو پیسو چنۆکەکان گەردەنبەندێك لەشێوەی حەزەرتی فاتیمە(د.خ) کچی پێغەمبەرمان هەڵبژارد. زۆرجار دەستبەندێکی زێڕ هەڵدەبژێردرا کەسورەتی لەسەر بێت، هەندێك کەس بۆئەوەی منداڵی یەکەمی خۆیان لەچاوی خەڵك بیپارێزن زەنگیانەیان بەنیوچاوانییەوە دەکرد بۆئەوەی لایەنی بەرامبەر یەکەمجار چاوی پێی بکەوێتو ڕەنگی شین

ببینێت. کاتێك نەوەی ئێمە لەدایکبوو هاوکاتبوو لەگەڵ سەفەری ئەنوەر بۆقودس، گوڵدا مایەر، سەرۆك وەزیری پێشووی ئیسرائیل دەستەیەك بازنەی زێرو جووتێك گوارەی بەردی شینی ئاسمانی بۆرەوانە کردن وەك دیاری لەدایکبوون.

لەلادێی کەمتر کەس بوونیان هەبوو بۆرۆژی لەدایکبوونی منداڵی خۆیان زۆر گرنگ نەبوو هیچ ئامادەکاری نەدەکرا تاکو رۆژی لەدایکبوونی منداڵ، بێشکەو جلوبەرگیان ئامادە نەدەکردن. زۆرکەس باوەڕیان دەکرد ئەگەر جلوبەرگی نوێ لەبەر منداڵیان بکەن زیاتر دەکەوێتە بەرچاوی خەڵكو هەستی خەڵك زیاتر هاندەدرێت، بۆیە خۆیان لەم لایەنەوە دەپاراست. ئەم جۆرە کەسانە بۆبەختەوەری منداڵی خۆیان جلوبەرگی کۆنیان بەقەرز لەخەڵك وەردەگرت.

کاتێك رێژەی مردنی منداڵەکان لەمیسر گەیشتە ٥٠٪ ئەمجۆرە بیرکردنەوەیە بەهێزتر دەبوو، بەلام دوای شۆڕش کەلایەنی پزیشکی زیاترکرا، هەندێك لەم نەریتانە وەك خۆیان مانەوە. هەندێك دایكو باوك بۆئەوەی منداڵی خۆیان لەبەرچاوی خەڵك بپارێزن تاکو تەمەنی چوارساڵان جلوبەرگی نوێیان بۆمنداڵەکانی خۆیان دەستبەر نەدەکردو سەلامەتی منداڵی خۆیان بۆخەڵك پشتراست نەدەکردەوە. چونکە رێزو خۆشەویستی کوڕان لەکچان جیاوازبوو زیاتر مەترسیان لەسەربوو، زۆرکەس لەساڵی یەکەمی کوڕی خۆیان جلوبەرکی کچانەیان بۆدەستەبەر دەکردن بۆئەوەی کەس نەزانێتو لەبەرچاوی خەڵك پارێزراوبێت.

ئێستاش لەلادێی نابێت بەدایکی منداڵی تازە لەدایکبوو بلێت:((منداڵێکی چەند جوانت هەیە!دەبێت بەپێچەوانە بۆی باس بکەیت چەند ناشیرینە!)) تاکو لەبەڵاکانی دونیا بەدووربێت. لەسەر ئەم بیروباوەڕە، زۆرجار ناوێکی نەخۆش لەسەر منداڵی خۆیان دادەنێن. لەسەر دەمی منداڵی من کەسێك بۆماڵی ئێمە کاری دەکرد ناوی شەحەد بوو واتە(دەرۆزەکەر). جارێك پرسیارم لێکرد:((بۆچی دایكو باوکت ئەم ناوە نەخۆشەیان لەسەرتۆ داناوە؟)) شەحەد لەوەڵامدا گوتی:((چونکە هیچ منداڵێك بۆدایکم نەدەمایەوە پێش لەدایکبوونم بڕیاردەدەن ناوی منداڵی داهاتوویان بکەن بە شەحەد تاکو هیچ کەسێك بەخێڵی بەمن نەکاتو بەزیندوویی بمێنمەوە، ئێستا من ماوم. بێگومان کاریگەری خۆی هەبوو.))

ئەمجۆرە بیرکردنەوەیە تەنیا گرێدراو نەبوو بەمنداڵو هاوسەرگیری، تاکو ڕادەیەك هەمووشتێك دابو نەریتی خۆی هەبوو، گەڕاندنەوەی شیر بۆهەمان مانگای کەشیری وشك دەبوو تاکو گرێنتی دروست بکرێت کەمنداڵی داهاتوو کوڕبێت. ئافرەتانی کەدووگیان نەدەبوون دەرۆیشتن

پەنجەیەك قوڕو لیتەی ڕووباری نیلیان دەخوارد تاکو منداڵیان هەبێت. زۆرجار ژنانی کەمنداڵیان بەمردوویی لەدایك دەبوو منداڵی مردووی خۆیان لەپێش دەرگای ماڵ یان لەناو دیواری ماڵەوە دەشاردەوە بەباوەڕیان ئەمجۆرە کردەوانە دەبن بەهۆکار کەمنداڵی داهاتوویان بەزیندوویی لەدایك دەبێت.

یەکێك لەدابو نەریتەکانی جێگای ویستی من لەڕۆژانی هەینی ڕوویدەدا، لەدوای نوێژی هەینی بۆنێکی خۆش لەناو هەموو ماڵەکان بلاّودەکرایەوە بۆئەوەی ماڵی خۆیان نەکەوێتە بەرچاوی کەسانی بەخیلو چاوچنۆك، زۆر لەجوتیاران بۆپاکردنەوەی ماڵی خۆیان سوودیان لەسوتاندنی جەوگی کاج وەردەگرت ئەم نەریتە لەدێرزەمانەوە لەسەرتاسەری دونیا بەربلاّوبوو بۆنێکی خۆشی بلاّودەکردەوە. ئێستا ئەم لایەنە پێشکەوتنی زیاتری بەخۆیەوە گرتووە. ئەم بۆنەخۆشە ئێستا لەداری قەزوان دروست دەکرێ. زۆرجار من خۆم ئەم نەریتە جێبەجێ دەکەم. بۆپیرۆزی ماڵ. لەناو قاپێك دەسووتێنمو لەهەموو ژوورەکانی ماڵی خۆم دەسوڕێمەوە بۆئەوەی بوونی خۆشی هەموو شوێنێك بگرێتەوە، لەلادێی ئەم نەریتە لایەنیتری بۆزیاد کراوە وەك حەوتجار لەناو دوکێڵی سووتانی گوڵەکان خۆی دەرباز دەکەنو هیوایەك دەخوازن.

زۆرکەس باوەڕیان دەکرد کەدەبێت خۆیان لەروحەکانی نەبینراوی پیس بپارێزن چونکە ئەم روحانە دەتوانن ژیانیان ویران بکەن، نەینوکو مووەکانی سەری خۆیان کاتێك کەمەقەس دەکرا لەناو خانووی خۆیان دەشارنەوە چونکە باوەڕیان دەکرد ئەگەر بەپێی ئەم نەریتە هەڵسوکەوت نەکەن روحەکانی پیس بۆسوود وەرگرتن لەکاری خراب سوود وەربگرنو بچێتە ناوچاویان. خرابترینیان زۆربەوریایی دەبێت شەوانە جلوبەرگ بەجوانی لەسەر یەکتر دابندرێن نەوەك هێقەی سەرەوەیان ڕووی لەسەرەوە بێت چونکە ئەوەکات روحەکان زۆر ئاسانتر دەتوانن برۆنە ناو جلوبەرگەکان. زۆر باوەڕیان بەجلوبەرگی درێژی ژنانەو پیاوانە هەبوو کەبەسەر زەویدا بخزێت ڕێگا لەروحەکان دەگرن، چونکە روحەکان بەدوای شوێن پێی مرۆڤەکان دەڕۆنو دەتوانن چاچۆڵەی بکەن. هەندێك لەم بیرکردنەوەکانی بێمانای هاوشێوە زۆریان بێزار دەکردم چونکە ژنی لەهەندێك ژیانی ڕۆژانەو سەردەمیانە بەدوور دەگرت. ڕۆژێکیان بەهەڵکەوت لەڕێگای میت ئەبوئەلکۆم بۆئەسکەندەرییە ژنێکی گەنجم بینی، هیچ کاتێك لەیادی ناکەم دوو تای ئۆتۆمبێلی ئێمە پێکەوە تەقین شوفێر منی بەجێهێشتو رویشت تایی نوێ بێنێتو من سەرقاڵی خوێندنەوە بووم تاکو شوفێرم بگەڕێتەوە، خاوەنی زەوی کشتوکاڵی کەجادە بەناوەندی

تێدەپەڕی، کاتێك ئۆتۆمبێلی ئێمەی بینی، هاتە پێشەوە بزانێت دەتوانێت هیچ هاوکارییەك بکات.

کاتێك من دەناسێت زۆر بەرێزەوە گوتی:((دەتوانیت بیتەماڵی ئێمە لەلای هاوسەرم چاوەڕێی بمێنیتەوە؟))

گوتم:((نە، سوپاس کەش‌و هەوا زۆرباشە، لێرانە چاوەڕێی گەڕانەوەی دەکەم.))

بەڵام بەردەوام پێداگری کرد، دواتر گوتی:((بۆئەوەی بەتەنیا نەمێنیتەوە کەسێك دەنێرم لەگەڵ تۆ بمێنێتەوە.))

ژنێکی ڕەوانەکرد زۆر لاوازبوو لەدوور دەهات‌و مووەکانی سەری لەژێر لاچکەی سەری دەشاردنەوە، لەروخساری پەریشانی شڵژام. کاتێك گەیشتە لامو دەستمان بەقسەکرد، لەروخساری زانیم زۆر نەخۆشە. هەرچەند نەخوشبوو بەڵام هیچ شەرمی نەدەکرد. وەك زۆربەی ژنانی لادێی پرسیاری دەکرد ناوت چییە خاوەن هاوسەرو چەند منداڵی. بۆم باسکرد ناوم جیهان، بەڵام دوای ئەوەی کەناوی کوڕمی بیست، ئیتر بەناوی ئوم جەمال (دایکی جەماڵ) ناوی دەبرم.

زۆربەخەمباری گوتی:((ئوم جەماڵ خودا تۆی خۆشدەوێ چونکە کوڕی بەئێوە داوە. من هیچ منداڵێکم نییە، هاوسەرم ژنێکیتری هێناوە کەزۆر گەنج‌و زۆر سەلامەتە.)) دەبوو ئەمەیان هۆکارێك بێت کەئەوەندە لاوازی کردبێت، چونکە جێگای سەرسوڕمان نییە کەژنێك ترسی لەهەویی‌و دواتر تەڵاقدانی هەبێت هەموویان ببن بەهۆکاری نەخوشی‌و لاوازبوونی، بەڵام ئەم ژنە گەنجە نزیکبوو لەمەرگ.

زۆربەنەرمی پرسیارم لێکرد:((چ دەرمانێك بۆچارەسەری دەخویت؟ پزیشك چی پێشنیارکرد.))

سەری هەژاندو گوتی:((پزیشك، پزیشك ناتوانێت چارەسەری من بکات، ئوم جەماڵ چونکە روحێکی پیس جەستەی منی داگیرکردووە رێگانادەت سەلامەتی خۆم بەدەست بێنم‌و هیچ کوڕێکم هەبێت.)) دواتر لەسەر داگیرکردنی جەستەی لەلایەن روح‌و جنۆکەکانی پیس دەلێت رۆژێکیان دووباڵندەی ڕەشی گەورە لەپێشمدا هەڵدەفرین لەناکاو گەڕانەوە تەماشای چاوەکانی منیانکردو لەهەمان کات کە تەماشایان کرد هەستمکرد جنۆکەکان لەناوگیاکان هەڵکشان بۆناو جەستەم. لەهەمان شوێن زانیم کەبەڵایەك بەسەرم هاتووە، هەمان شەو سەردانی کەسێکم کرد کەجنۆکە دەگرێت. بەڵام دوعاکانی کەبۆی نووسیم هیچ کاریگەریان نەبوو ئێستا هیچ پارەیەکم

نییه لەبەرامبەر دوعاکانی بۆ ڕەوانە بکەم. زۆری نەماوە کەزیاتر لاواز دەبم و هاوسەرم من تەلاق دەدات.

بەخەمباری تەماشامکرد. لەچیرۆك و بەسەرهاتی دڵم دەسووتا. دەمزانی پێویست بەم هەموو ئازارکێشانە ناکات. پێشتر نیشانەکانی ئەم نەخۆشییەم بینیبوون هۆکاری کەم خوێنیبوو، شتێك کەبەباشی چارەسەر دەکرا.

داوام لێکرد:((داوادەکەم هەرئێستا لەگەڵم بێت بۆلای پزیشك.))

قبووڵی نەکردو پێداگری دەکرد کەنەخۆشی هۆکاری جەستەیی، هۆکاری تەنیا جنۆکەکانن. بینیم شوفێرم دەگەڕایەوەو دەمزانی دەرفەتی زۆرم لەبەردەست نەماوە تاکو باوەڕی پێی بکەم تاکو سەردانی پزیشك بکات، هەستم تاکو جارێکیتر من لەم جادەیە تێپەڕ دەبم لەدەست ڕۆیشتووە.

دەستبەجێ گوتم:((زۆرباشە ئەگەر ئامادە نیت بێت بۆلای پزیشك من کەسێکم هەیە دەتوانێت جنۆکەکان بگرێت و لەناو قاهیرە زۆر بەناوبانگەو دوعاکانی زۆربچوکن و لەناو حەبەکانی بچوك دەکات پێویست ناکەت وەك ملوانە لەگەردنی خۆت بکەیت، کاتێك قورتیان دەدەیت دەچن بۆهەمان شوێنی جەستە کەجنۆکەکان خۆیان تێدا حەشارداوە هیچ جنۆکەیەك لەنزیکی دوعاکان ناتوانێت بمێنێتەوە، هەموویان ڕادەکەن.

ئەم پێشنیارەی زۆر پێی باشبوو. من بۆئەوەی ئومێدی زیاتری بۆدروست بکەم گوتم ئەم پیاوەی کەدوعا دەنووسێت زۆر دەوڵەمەندو جلوبەرگی سپی دەپۆشێت. ژوورەکانی کارکردنی زۆرگەورەن، ئەوکات دەبینی خەڵك بۆبینینی چۆن ڕیزیان بەستووە، کاری خۆی بۆچەند کەسێك باسکردوە کەبتوانن هاوکاری بکەن ئەمانەش هەموو جلوبەرگیان سپی لەگەڵ هەمان کەسی شارەزایی جنۆکەکان دێنەژوورەوە.))

بەجۆرێك تەماشای دەکردم گوایە من شارەزایم لەجنۆکە دەرپەڕاندن هەیە. گوتی: ((من دێم بۆلای جنۆکە دەرپەڕێنی ئێوە.))

هەفتەی دواتر لەسەر ڕێگای قاهیرە لەگەڵ خۆمدا برد بۆلای پزیشکی خۆم. پێشتر ئەم بابەتەم بۆپزێشك باسکرد، هەمان ئافرەت دەستی بەقورتدانی دوعاکان کرد کەپزیشك بۆی نووسیبوون، دواتر بۆماوەی چەند هەفتەیەك کەبەدوایدا دەڕۆیشتم تاکو لەگەڵ من بێت بۆقاهیرە ڕەنگو ڕوخساری باشتر دەبوو. جاری کۆتایی کە گەڕایەوە بۆماڵی خۆی گوتی جنۆکەگر گوتی حاڵت

زۆرباشبووە. ئیتر هیچ کاتێك نەمبینی، زۆرجار کەلەهەمان شوێن تێپەڕ دەبووم هەستم دەکرد لەماڵەوە دانیشتووە چاودێری کوڕی خۆی دەکات.

هەژاری کەبەرۆکی زۆربەی خەڵکی لادێی گرتبوو لەهەستی بێتوانی ژنانەی خۆیان لەبەرامبەر هەندێك لایەن بێزار دەبووم. چەند جار کەسەردانی میت ئەبونەلکۆمو دەوروبەرم دەکرد دەنگی پاڕانەوەی ژنان بۆهاوکاریکردن لەگوێمدا دەزرینگایەوە.

((خاتوون هیچ پارەت نییە بەمن بدەیت؟ سێ مانگە هاوسەرم نەخۆشە ئێستا لەناو جێگا کەوتووە ناتوانێت کاربکات.))

((خاتوون، خودابتان پارێزێت، تەنیا دەلیرە، خاوەنی سێ کچم، هیچ کوڕێکم نییە، هاوسەرم منی بەجێهێشتووە بۆکەسێکیتر.))

((خاتوون چی بکەم؟ هاوسەرم هەموو دارایی ئێمەی لەقۆمار دۆڕاند، بەردەوام هێرشم دەکاتە سەر، ئێستا دەمەوێت لەگەڵ منداڵەکانم ڕابکەم، بەڵام هەفتەی پێشوو ماکینەی دروومانی منی فرۆشتووە ئێستا هیچ ڕێگایەکم بۆ بەدەست هێنانی لایەنی دارایی بۆمنداڵەکان نەماوە. دەتوانی هاوکاریم بکەیت؟))

لەهەمان ئافرەتم پرسیارکرد کەماکینەی دروومانی فرۆشرابوو ناوت چییە تەماشای ژێر پێیەکانی کردو گوتی:((نەواڵ))

دەلیرەم پێشکەشکردن وەك هەموو ژنەکانیتر کەبەردەوام داوایان دەکرد، بەڵام نەمدەتوانی بەم شێوە بەردەوامبم. هاوسەرم سەرۆکی پەرلەمانبوو نەك پاشایەکی دەوڵەمەند. داواکاری ژنان بۆهاوکاری ئەنجامێکی پێچەوانەی هەبوو. بەخشینی دەو بیست لیرە دەردی ئەمانەی چارەسەر دەکرد؟ لەناوچەکانی لادێی لەوانەیە دوو هەفتە کاروبارەکانیان ڕێکدەخست بەڵام ئەوکات دەبێت دووبارە دەست بەدەرۆزە بکەن.

دەبێت ڕێگایەك بۆئەم ئافرەتانە دەدۆزرایەوە کەبتوانن لەدەوری یەکتر کۆببنەوەو لەلایەنی ماڵی خەرجی خێزانی خۆیان بەبێ گرێدراوی بەکەسێك یان هاوسەرانی زاڵمی خۆیان دەربێنن. بیرم لەکاروچالاکی بەکۆمەڵکرد لەکاتی دانیشتن لەدەوری بیری ئاو هەڵێنجان لەمیت ئەبونەلکۆم زۆرشت لەئەمانە فێردەبووم. ئەگەر ژنان دەیانتوانی لەکاتی دووگیانیو منداڵ پەیدابوون هاوکاری یەکتر بکەن، بۆچی ناتوانن لەبواری کارو دەرهێنانی دەرهاوردەیەك بۆخێزانی خۆیان هاوکاری یەکتر بکەن؟ میسر توانیبوو بەسەرکەوتن بەسەر داگیرکارانی بێگانە سەربەخۆیی

خۆی بەدەست بێنێت، بەڵام ژنانی لادێی لەمیسر نەیانتوانی بوو، ئایا کاتی نەهاتبوو ئەمانە شۆڕشی خۆیان دەست پێبکەن؟ بەڵام چۆن؟
داواو پاڕانەوەی ئافرەتان بۆوەرگرتنی چەند لیرەیەك بەردەوام لەمێشکمدا دەسووڕان و دووبارە دەبوونەوە، شەوانە خەو بەچاوەکانمدا نەدەهات. کاتێك کەئەنوەر کرایە سەرۆکی پەرلەمان ئیتر من وەك هاوسەری تاکو ڕادەیەك دەمتوانی کارێك بکەم و یان بەرپرسانی بەرزی حکومەت ببینم، بەڵام دەمتوانی چ کاریك بکەم؟ چیرۆکی نەوال لەدەستدانی ماکینەی دروومانی بەهۆی قوماری هاوسەری زۆر ئازاریدام. ئەمەیان لایەنێکبوو. خاوەنی ماکینەیەکی درومانبوو دەیتوانی دەرهاوردەیەك بۆخۆی دەستبەر بکات. ماکینەی دروومان، ماکینەی دروومان!
((ببوورن، کاکە، هاتووم پارێزگا ببینم.))
((بەڵێ، خاتوو سادات، لەدیداری ئێوە بەختەوەرم، دەتوانم چۆن هاوکاریت بکەم؟))
((خانوویەکم دەوێت.))
((خانوویەك؟))
((بەڵێ، دەمەوێت پرۆژەیەکی فێرکردن بۆژنان دەست پێی بکەم. چەند دانە ماکینەی دروومانم لەگەڵ خانوویەکە دەوێن.))
((ماکینەی دروومان؟))
(بەڵێ، دەمەوێت بەشداری هەرەوەرزی بۆفێربوونی ئافرەتان دروست بکەم لەبواری دروومان کەهەموو ژنانی پارێزگەی ئێوە بتوانن خەرجی خۆیان دەستبەر بکەن.))
گوندی میت ئەبوئەلکۆم دەکەوتە ناو پارێزگەی منوفیە پاریزگار بەسەرسوڕماوی تەماشای دەکردم:((خاتوون، خۆتان دەزانن، ژمارەی دانیشتوانی دڵتا زۆرە. خانووی ئەربابەکانی کۆن بەسەر ئیدارەکانی حکومەت دابەشکراون.))
چاوەڕێی ئەم قسەیەم دەکرد. پێداگریم کرد:((بێگومان خانوویتر پەیدا دەبن، ئێمە داوای هیچ کاخێك ناکەین، تەنیا شوێنێك کەچوار دیواری هەبێت لەمیشوولەو خاك و خوڵ پارێزراوبن.))
پارێزگار ماوەیەك بیریکردەوە دواتر گوتی:((بارەگای کۆنی پۆلیس لەنزیك گوندی تلا هەیە. دیوارەکانی زیانیان پێگەیشتووە، زۆری نەماوە بروخێت، بەڵام لەوانەیە ئێوە بتوانن سوودی لێوەربگرن.))
گوتم:((زۆرباشە، ماکینەکانی دروومان چی؟))

بابەتەکە بۆپارێزگار زۆر سەرنج راکێشتر دەبوو، گوتی:((لەوانەیە چەند دانەیەك لەناو ئەنباری پارێزگەدا بوونیان هەبێت. پرۆژەیەك کەهیچ کاتێك نەکەوتە سەرکار.)) پارێزگار راستی دەکرد بارەگانی پۆلیس وێرانەبوو، گوندی تلا تاکو رادەیەك لەگوندی میت ئەبوئەلکۆم گەورەتربوو، ئەمەشیان باشبوو. ئێستا دەموویست ژنانی کەچەندین سەدە بیریان دەکرد دەبێت داوای پارە لەخەڵکانیتر بکەن ئامادەن بۆبەدەستهێنانی هەوڵی خۆیان بدەن. تەنیا رێگایەك هەبوو. (سەماعەیەکم) لەسەر ئۆتۆمبیلی خۆم بەستو بەناو کۆلانەکانی گوندی تلا کەوتمو هاوارم دەکرد:((ئافرەتانی کەدەتانەوێت کاربکەن! خاوەن هاوسەر، یان بەبێ هاوسەر، بێوەژن یان تەلاقدراوبێت سبەی شەو سەردانی بارەگای کۆنی پۆلیس بکەن، ئەگەر شارەزایتان لەکارێك هەیە یان دەتانەوێت فێربن، هەمووتان وەرن. بەلام ئەگەر کەسانی تەمبەڵن بمێننەوە. تەنیائەگەر ئامادەن کاربکەنو خەرجی خێزانی خۆتان دەربێنن. شەوی داهاتوو لەکاتی دیاریکراو لەناو بارەگای کۆنی پۆلیس ئامادەبن.))

لەتەواوی هەمان رۆژ دڵم لەلێدانی خێرایی خۆی بەردەوامبوو. داوام لەئەنوەر کرد بیروڕای چییە لەسەر ئەم پرۆژەیە، بەلام نەهانیدامو نەرێگریکرد. باوەڕی نەدەکرد تاکو کۆتایی رێگابڕۆم، کۆبوونەوەی بارەگای کۆنی پۆلیس نزیکبوو، من خۆم زۆر پشتراست نەبووم. لەوانەیە چەند کەسێك بۆشوێنی دیاریکراوبێن؟ ئایا کەسێك دێت؟ زووتر لەکاتی دیاریکراو رۆیشتم، کاتێك بینیم ژمارەیەك چاوەڕێی کۆبوونەوەن، خەیاڵم ئاسوودەبوو. ئافرەتان لەلایەکو پیاوەکان لەلایەکیتر دانیشتن تاکو بزانن ئافرەتان چۆن دەتوانن دەرهاوردەیان هەبێتو چاوەڕێی هەمان ئافرەتبوون کەلەناو کۆلانەکان بەئۆتۆمبێل هاواری دەکرد. هەموویان بەتامەزرۆ دانیشتبوون، بەلام بەدەنگی جۆراوجۆر پرسیارەکان دەستیان پێکرد.

((پارەی کڕینی ماکینەی دروومان لەچ شوێنێك بێنین.))

وەلامی من بەم شێوەبوو:((حکومەت هەموو پێداویستییەکان دەستەبەر دەکات. دواتر ئێمە لەسوودی بەدەستهاتوو پارەیان بۆدەگەڕێنینەوە.))

((کاتێك کاردەکەن چ کەسێك چاودێری منداڵەکانی ئێمە دەکات؟))

گوتم:((خۆمان چاودێری دەکەین ژوورێك تەرخان دەکەین بۆچاودێری منداڵەکاو کاتی کارکردن زۆرکەم دەبێت کەبتوانن کارەکانی ماڵەوەی خۆتان جێبەجێ بکەن.))

((کێی جلوبەرگەکان لەئێمە دەکڕێت؟ لەناو گوندا هیچ کەسێك پارەی کڕینی نییە.))

گوتم:((دەبەین بۆقاهیرەو دەفرۆشین.))

هەموویان بۆیەکتریان باسدەکرد قاهیرە چونکە ئەوانەی سەردانی قاهیرەیان کردبوو بەئەنگوستەکانی دەست هەژمار دەکران.

بۆم باسکردن:((جلوبەرگەکان دەبێت بەشێوەی شارنشین بن من زۆر لەدوکانەکان لەقاهیرە دەناسم جلوبەرگان لەئێمە دەکڕن.))

((ئەگەر جلوبەرگەکان وەك پێویست نەبوون چی دەکەین؟))

گوتم:((ئەوکات ترشیو مرەبا دروست دەکەین، هەرشتێك کەبتوانین پارە کۆبکەینەوە، کاری خۆمان لەهەفتەی داهاتوو دەست پێدەکەین، ئەگەر دەتانەوێت ژیانێکی نوێ دەست پێی بکەن، وەرن. ئەگەر دەتانەوێت ڕێز لەخۆتانو هاوسەرانی ئێوە ڕێز لەئێوە بگرن وەرن پێکەوە ئەوانەی کەبردەکەنەوە ژنەکانیان ناتوانن پارە دەربێنن سەریان سوڕبمێنێتەوە.

هەفتەی داهاتوو نەوالْ لەکەسانی ڕیزی یەکەمبوو کەلەناو بارەگای کۆنی پۆلیس ئامادەبوو، هاوڕا لەگەلْ بیستو پێنج ئافرەتیتر کەشارەزاییان لەهەلْبڕینی پارچەو دروومان هەبوو. یەکەمجار دەستمان بەدروومانی پێشبەندی سادەکرد کەسانی شارەزاتر لەکاری نەخشەدروستکردن لەسەر لاچکەی سەر بەکارهێنان، کاتێك کەهەموو ئافرەتان بەباشی ڕاهێنانی خۆیان تێپەڕکرد، بەرهەمهێنانی دەستی پێکرد، جلوبەرگی پیاوانو منداڵان، جلی خەوتن بەشێوازی نەخشە بۆئافرەتان دەستی پێکرد. ڕۆژانە دووکاتژمێرم تەرخان دەکردن بۆسەرپەرشتیکردنو فێربوونی ژنانی گوندی تلا، دوو کاتژمێر بۆگەڕانەوەش.

ئەم شوێنەت باش نییە، بۆچی خوارەوەی دروست نییە، ئەمەیان باشتر بکەن، دەبێت باشتر بێت. لەکۆتایدا هەموو جلوبەرگەکان هیچ کێشەیان نەبوو. ئافرەتان بەنیگەرانی پرسیاریان دەکرد:((چی بووە خاتوو جیهان؟ بێدەنگی، ئیتر لەئێمە بێزاری؟))

دوای ماوەیەك یەکێك لەهاوڕیانم لەقاهیرە خاوەنی کارگەی جلوبەرگبوو بۆی باسکردم کەچۆن ڕێکەوتن لەگەلْ سوپا دەکات بۆئامادەکردنی جلوبەرگەکانیان. داوای لێکردم: ((بڕۆم لەوانەیە بتوانی ڕێکەوتنێك بۆئەم گوندە دەستبەر بکەیت لەمنوفیە؟ من کەسێکم هەیە کاری دیزاینو هەلْبڕین دەکات دەتوانم بەقەرز بۆماوەیەك لەگەلْ تۆ ڕەوانە بکەم. زۆرشارەزایە دەتوانێت لەسەر هەموو جلوبەرگەکان کاربکاتو هەلْبڕینیان بۆبکاتو ژنانی گوندی تلا دەتوانن لەسەر ئەم جلوبەرگانە کاری خۆیان بکەن.))

سوپاسمکردو لەم بیرۆکەیەیی زۆرخوشحاڵبووم چونکە کارگەی گوندی تلا پێویستی بە دەرهاوردەیەك هەبوو کەسەربەخۆیانە کاری خۆی بکات. بۆچی لەئێستاوە دەست پێنەکات؟ جاری پێشتر پێش ئەوەی سەردانی گوندی تلا بکەم سەردانی کارگەیەکی خۆجێی جلوبەرگەکانم کردو پێشنیارم بۆکرد:((ئێمە دەتوانین زۆربەخێراو نرخێکی هەرزان باشترین جلوبەرگ بۆ کرێکارەکانت ئامادە بکەین. ئەگەر ئەم ژنانەی گوندی تلا بتوانن پێویستی ئێوە ئامادە بکەن بۆچی ئێوە بۆبەدەستهێنانی داوا لەکەسانی دەرەوەی منوفیە دەکەن.))

خاوەنی کارگە بەتەلەفۆن پەیوەندی بەسەرپەرشتیاری کرێکاران کرد:((پێویستیمان بەجلوبەرگی کارکردن هەیە؟)) سەرپەرشتیا لەوەڵامدا گوتی:((بەڵێ))

داواکاریم وەرگرت.

لەخوشحاڵی لەخومدا نەدەگونجام. هاورێم لەقاهیرە هەمان کەسی شارەزای خۆی بۆبرینی جلوبەرگەکان رەوانەکرد، سەردانی کارگەی کردو پێوانەی بۆهەموو کرێکاران کرد، دواتر بۆبرینی پارچەکان سەردانی کارگەی گوندی تلای کرد، ژنانی کارگە زۆر بەخێرا هەموو جلوبەرگەکانی کرێکارانیان تەواوکردن. نزیکەی پێنج هەزار کراس‌و شلوار بەسەربەرزیی سەردانی خاوەن کارگەم کرد. لەنووسینگەی تایبەتی دانیشتم بەهەستێکی خۆشەوە گوتم:((کاری ژنانی کارگەی گوندی تلا بەبێ کێشە کۆتایی هاتووە. لەجۆری کارکردنیان بێگومان خوشحاڵ‌و سەرسوڕماو دەبیت.)) لەدەرگا دراو سەرپەرشتیاری کرێکارەکان پرسی:((دەتەوێت جلوبەرگی نوێی کرێکاران ببینی؟)) بەوشەی بەڵێ هەندێك لەکرێکاران بەهەمان جلوبەرگی نوێ هاتنە ژوورەوە ئەوەی بەژنی کورتبوو جلوبەرگەکانی درێژبوون، ئەوەی باڵابەرزبوو جلەکانی بچوکبوون‌و شلواری وەك نیوشلوارەکانبوو. هەستم بەسووری کوڵمەکانم دەکرد دەموویست خاکی ژێر پێم شەق بێت‌و بڕۆمەخوارەوە. بەهەرشێوەیەك بێت رووم لەخاوەنی کارەگە کردو گوتم:((کێشە لەئێمەدایە. تەنیا هەفتەیەك موڵەت بەئێمە بدەن ئەوکات هەموو جلوبەرگەکان بەتەواوی بۆتان رەوانە دەکەین.))

تووڕەیی خۆم لەسەر هەمان کابرای شارەزا لەبرینی جلوبەرگ خاڵیکرد. دەموویست بیکوژم، گوتم:((تەواوی رەنجی ئێمەتان بەبادا. بەردەوام باستان دەکرد کەمن توانای زۆرم لەکارەی خۆمدا هەیە، دەتانگوت چاودێری کاری ژنەکان دەکەم کەهیچ هەڵەیەك نەکەن. ئەگەر جلوبەرگەکان ئامادە نەبوون بۆچی لەگەڵ مندا هیچ گفتوگۆتان نەکرد؟)) زۆربەئارامی دەهاتە

بەرچاوم، خەیاڵی ئارام کردم:((خاتوون خۆت نیگەران نەکەیت تەنیا لەماوەی دەرۆژدا هەموو کێشەکان چارەسەر دەکەم. ئەوکات دەزانی کەچەند لەکاری خۆمدا شارەزایم هەیە.)) بەتووڕەیی‌و ماندوویون گەڕامەوە بۆقاهیرە. ئەگەر بڕیاربێت ئەنجامی کار ئەمەبێت ئەم هەمووکارکردنە بۆژنانی گوندی تلا چ سوودێکی دەبێت؟ کاتی خۆم‌و خێزانی خۆم لەسەر دانابوو. لەوانەیە ئەگەر لەماڵەوە دەبووم چاودێری منداڵەکانم دەکرد باشترو سوودی زیاتر دەبوو. ئەوەندە گیرۆدەی بیرکردنەوەی جۆراوجۆر بووم خەو بەچاوەکانم نەدەهات، لەگەڵ خۆم‌و بیرو باوەڕەکانم‌و دەروونم لەشەڕدابووم بەردەوام خۆم بۆهەموو لایەك وەردەگێڕا. بۆچی بیرم دەکردەوە دەتوانم خزمەتێك بەم ئافرەتانە بکەم. جگە لەشەرمەزاریی‌و بچوك کردنەوەیان هیچ شتێکم بۆئەمانە نەبوو. پیاوی شارەزا لەبڕین زۆر باوەڕی بەخۆی هەبوو، چۆن دەمتوانی دیسان باوەڕی پێی بکەم؟ دوای دەرۆژ گەڕامەوە بۆکارگە لەمنوفیە. پرسیارم لەهەمان شارەزای خۆمان کرد:((جلوبەرگەکان ئامادەن؟))

خەیاڵی ئاسوودە کردم: ((بەڵێ، خاتوون. خۆتان دەبینن.))

ئەمجارەیان کەلەتەنیشت خاوەنی کارەگەی جلوبەرگەکان دانیشتبووم هیچ باوەڕو خوشحاڵی لەروخسارم بەدیار نەدەکەوت‌و کاریگەری نەبوو. کاتێك دەنگی لێدانی دەرگا دەهات دڵم زیاتر رووخا.

خاوەنی کارەگە گوتی:((دەتانەوێت جلوبەرگەکان ببینن؟))

سەری خۆم هەژاند، نەمدەزانی ئایا دیسان ئۆقرەی ئەم هەموو شەرمەزارییە دەگرم. کرێکاران بەدوای یەکتر هاتنەژوورەوە، ئەمجارەیان جلوبەرگەکان هەموویان رێکوپێك بەدروومانێکی زۆرجوان هەموویان بەپێی جەستەی کرێکاران ئامادە کرابوون. باوەڕم نەدەکرد چی دەبینم ئایا ئەمەیان نمایشی جلوبەرگبوو؟ جلوبەرگەکان بچوکترین کێشەیان نەبوو. خاوەنی کارگە گوتی:((زۆرباشن کێشەیان نییە.))

دواتر لەکەسی شارەزای برینم پرسی چۆن توانیت ئەمەیان بکەیت؟ ئەم جلوبەرگە نوێیانە هیچ کێشەیان نەبوو.))

گوتی ئەم جلوبەرگانە نوێی نین‌و من هیچ کارێکم نەکردووە.))

سەرم بەتەواوی لەقسەکانی شێوابوو. پێداگریم کرد:((بێگومان ئەمانە نوێن، جاری پێشوو هەموو ئەم جلوبەرگانە کێشەی گەورەیی‌و بچوکیان هەبوو.))

دواتر زیاتر روونیکردەوە:((جاریتر لەیادمکرد دیارییەك پێشکەشی سەرپەرشتیاری کرێکاران بکەم، سەپەرشتیار بەئەنقەست ئەمەیکردبوو جڵی گەورەی دەبەر کرێکارێکی جەستە بچووك کردبوون بەپێچەوانە بۆئەوەی رێگا لەفرۆشتنی کاری ئێمە بگرێت.))

هەستم دەکرد هەناسەسوار دەبم. ئەم پیاوە باسی چی دەکرد؟ هیچ کاتێك بیرم لەم لایەنە نەدەکردەوە کەدەبێت پێشتر سەرپەرشتیار رازی بکرێت.

چەندین هەفتە لەسەر ئەم بابەتە لەگەڵ خۆمدا لەشەرێکی دەروونیدابووم چەند سادەم لەم دونیایە بێ هەواڵبووم، ژنێك لەماڵەوە هەموو هەوڵدانم بۆهاوکاری ژنانی لادێی تەرخانکردبوو. بەڵام ئەمەیان بەتەنیا وەك پێویست نەبوو. ئەگەر دەموویست بەردەوامی بەکاری خۆم بدەم، دەبێت شارەزایی تەواوم لەپیشەیە دەدۆزییەوە، لەشتێك پشتراست بووم، هەموویان وەك ئەم سەرپەرشتیاری کرێکاران داوای باجیان نەدەکرد. بەڵام دەبێت چۆن بزانم؟ دەبێت ئامادەیی تەواوم هەبێت. بێگومان کاتێك پێشنیاری برینی سەدان مەتر تۆر بۆداوێنی خوارەوەی جلوبەرگی خەوتن پێشکەشکرد دیسان هەمان رووداو هاتە پێشەوە. تۆرەکان بەردەوام کێشەیان هەبوو، لەئەنجامدا سەردانی هەمان ئافرەتم کرد کەتۆرەکانی دەبرین. لەگەڵ خۆمدا شوشەیەك بۆنی خۆش‌و بەستەیەك قاوەی یەمەنی زۆرباشم بەدیاری بۆبردن. لەهەمان سات بەدواوە هیچ کێشەیەك بۆتۆرەکان دروست نەدەبوو. بەم سادەیە، زۆرباشە ئەگەر بریاربێت کارەکان بەم شێوەیە برۆنە پێشەوە، باشە ئەمەیان دەکەین. ژنانی گوندی تلا پێویستیان بەلایەنی دارایی‌و پاراستنی کەرامەتی کاری خۆیان هەبوو.

من وەك ئەوان شادو سەربەرز بووم. لەئەنجام ئەم ئافرەتانە توانیان کارێك بۆخۆیان‌و هەڵسوڕاندنی ژیانی خۆیان بەدەست بێنن. من شتێکی بەرچاوم پێی بەخشیبوون کەئیتر بەکەسانیترەوە گرێدراو نەبن‌و هەست بەکەمبوونی خۆیان نەکەن. گفتوگۆی سەر بیری ئاو هەڵکێشانی ناوەندی گوندی میت ئەبوئەلکۆم گۆڕابوو. لەبەرەبەیانی رۆژێکیان فاتمە دەستی بەگریان کرد:((نازانم چیمان بەسەردێ، هاوسەرم رۆیشتووە ئێمە بەتەنیاین. چۆن زکی ئەم شەش منداڵە تێردەکەم؟))

ژنانیتر هەوڵی خۆیاندا ئارامی بکەنەوە:((سەبرتان هەبێت دەگەڕێتەوە.))

بەڵام فاتیمە ئارام نەدەبوو:((هاوسەرم دەیگوت منداڵەکان بێ رەوشتن، لەگەڵ یەکتر شەڕ دەکەن، بەڵام خۆی دەیویست منداڵی زیاتری هەبێت.))

بۆفاتیمە باسمکرد:((گریان چارەسەر نییە ئەمەیان چارەنووسە بۆچی لەجیاتی ئەوەی دەست بەگریان بکەیت لەکارگەی تلا دەست بەدروومان ناکەیت؟))

گریانی زیاتربوو گوتی:((دروومان نازانم.))

گوتم:((فێرت دەکەین.))

ڕۆژی دواتر لەگەڵ خۆم برد بۆکارگەی دروومانی تلا. لەجیاتی ئەوەی چاوەڕێی هاوسەری بکات توانی دوای فێربوون کاروبارو ژیانی خۆیی‌و منداڵەکانی هەڵسوڕێنێت، چونکە هیچ کاتێك هاوسەری نەگەڕایەوە.

کاتێك کاری ئافرەتان پێشکەوتنی بەخۆیەوە دەبینی، شێوازی جۆراوجۆری هەڵبڕین‌و دروومان فێردەبوون، سالێك دوای ڕووداوی جلوبەرگی کرێکاران، شارەزایی زۆریان بەدەست هێنابوو پێشانگای جلوبەرگیان کرایەوە. من لەگەڵ بیست‌و پێنج ئافرەت، ٣٠٠ کارتۆن لەجلوبەرگ‌و کاری دەستی کارگەی گوندی تلا سواری مینی پاسێکمان کردن بۆئەوەی ئێمە بگەێنێت بەقاهیرەو بەشداری لەپێشانگەی مۆدێلی جلوبەرگەکان بکەین. خۆبەخشانی پێشانگای مۆد لەسەرتاسەری هوتێل شیراتۆن هاوکاری ئێمەیان کرد. ژنانی گوندی تلا زۆربەیان قاهیرەیان نەبینیبوو، بەبینینی بیناکانی بەرزو گەورە باوەڕیان نەدەکرد چی دەبینن. یەکێکیان بەنیگەرانی پرسیاری لەمن دەکرد ئەمانە ناکەون؟ بەدەنگی هۆرنەلێدانی ئۆتۆمبێلەکان ژنەکان لەشوێنی خۆیان لەترسان هەڵدەپەڕین‌و هاواریان دەکرد. لەبەر دەرگای هوتێل یەکتریان دەگرت تاکو ئەوکات ئەوەندە خەڵکیان نەبینیبوو. بەلام ڕووداوی کەلەناو هوتێل ڕوویدا زمانی ئەم ژنانەی لالکرد. بڕیاربوو جگە لەپێشانگای جلوبەرگی کارگەی گوندی تلا، پێشانگەیەکی جلوبەرگەکانی خاوەن مارکە بەڕێوە بچێت. کاتێك دەیان بینی مایکەنەکانی جوان بەنیشاندانی جلوبەرگ لەبەرامبەر ئێمە تێپەڕ دەبوون‌و یەکێکیان بەجلوبەرگی ئاوریشەمی خەوتن لەپێش ئێمە تێپەڕیبوو چوار پێنجیان چاوەکانی خۆیان گرتبوون من بیستم یەکیان هاواری کرد:((پیاوێك لێرەیە.)) بێگومان پیاوی سەرپەرشتیار لەژووری گۆڕینی جلوبەرگەکانبوو، بۆمایکەنەکان جێگای سەرسوڕمان نەبوو بەلام بۆژنانی لادێی شتێکی نەبینراو نەبیسراوبوو. هەمووشتێك بۆیان چاوەڕوان نەکراوبوو، کارێك کەدەمتوانی بکەم دەبێت جلوبەرگەکانی کارگەی گوندی تلامان ڕێك دەخستن‌و بۆفرۆشتن ئامادە بکەین.

بەهەمان ڕادە شەیدای سەرکەوتنی خۆیانبوون، هەمان شەو کەبەپاس دەگەڕانەوە بۆگوندی خۆیان، هەموو جلوبەرگەکان فرۆشرابوون، نیوەی سوود بۆئەم ئافرەتانە دەگەڕایەوە نیوەیتر بۆپەرپێدانی کارگەیان. شەیدای ورە بەرزی ژنانی لادێی بووم. کاتێك ئەنوەر سەفەری دەکرد، بەتەنیا نەبووم، بۆهەرشوێنێك دەرۆیشتم ژنانیتر منیان بەناو دەناسیو بەپەلەبۆم دەهاتنو منیان لەباوەش دەگرتو ماچیان دەکردم. لەگوندەکان هەستەکان زۆر خێرا دەردەکەوتن، جوتیاران خۆشیو ناخۆشی خۆیان بەئاشکرا دەردەخستن. تاکو رادەیەك سەبارەت بەتەواوی ڕووداوەکانی گوند لەبەرچاو بوون. بەهۆکاری ئەم هەستیارییە، ڕۆژێك لەساڵی١٩٦٥بەسواری ئۆتۆمبیلێ لەناوەندی گوند تێپەڕ دەبووم وەڵامی سلاوی بەرزی خەڵکم نەدایەوە، دەیانزانی کەڕووداوێکی نەخۆش بۆمن ڕوویداوە.

کاتێك لەگوندی تلا بۆنانخواردن دەگەڕامەوە، کچم لوبنا بەگریان گوتی:((دایکە چاوی جەماڵ بریندارببوەوە، باوکم بردی بۆنەخوشخانە.))

جەماڵ؟جەماڵ! زۆری نەمابوو دڵم لەلێدان بکەوێت. تەنیا شتێك کەدەهاتە بەرچاوم جەماڵ بەچاوی گرێدراوبوو.

لوبنا بەردەوامبوو:((کاتێك بەدوای مراوییەکان دەرۆیشت کەلەدەست گەماڵەکان رزگار بکات بەسەر ئاسنی پەرژیندا کەوتەخوارەوە هەموو جەستەی خوێنیبوو باوکم بردی بۆنەخوشخانە.))

دەبێت بەزووترین کات بڕۆم بەڵام کام نەخوشخانە ئێمە لەگوند هێڵی تەلەفۆنمان نەبوو بەلام پارێزگای منوفیە تەلەفۆنی هەبوو، بۆئەوەی کەمتر کات بەفیرۆ بدەم دەبێت یەکەمجار سەردانی پارێزگای منوفیە بکەم زۆربەخێرایی لەبەرامبەر هەندێك لەئافرەتان تێپەڕمانکرد کەلەکارگەی خۆیان دەگەڕانەوەو ئۆتۆمبێلی ئەنوەر لەبەرامبەر ئێمە دەهات. بەبینینی بەستنی چاوی کوڕم لەپەنجەرەی ئۆتۆمبێلێ هاوارم دەکرد: ((جەماڵ! جەماڵ!))

ئەنوەر دەستبەجێ خەیاڵی ئاسوودە کردم:((هەلومەرجی زۆرباشە، ژێرچاوی بریندارە نەك چاوی بەلام خوێنی زۆری لێ رۆیشتبوو هەستم کرد چاوی بریندارببوو، پزیشك چارەسەری کردووە، بەخێرایی چاك دەبێتەوە.))

گوتم:((خودایە شوکر.)) کوڕی ئۆساڵەمان بردە ماڵەوەو هەوڵماندا بخەوێت بۆئەوەی کاریگەری دەرمانی بێهۆشی نەمێنێت.

((سەلامەت بیت، جەماڵ. سەلامەت. جەماڵ بەسەلامەتی گەڕایەوە بۆماڵکەی...)) ئەمەیان چ ئاوازێکبوو؟ لەپەنجەرە تەماشامکرد بینیم دوو پیکەب پڕ لەئافرەت، ئافرەتانی کارگەی خۆمان زۆربەی ژنانی گوندی تلا لەبەردەرگای ماڵی ئێمە وەستاون. هەموویان بەسەماکردنو گۆرانی گوتن لەبەردەرگای ژووری جەماڵ کۆبوونەوە بەچەپلە لێدانو گۆرانی گوتن بەگروپی کۆنی خۆجێی کەبۆسەربازەکانی گەڕاوە لەشەڕ دەگوترا پێشکەشی جەماڵی کوڕم دەکرا.

ئەمانە چۆن دەیانزانی جەماڵ ئازاری پێی گەیشتووە؟ چۆن دەیانزانی هەلومەرجی باشتربووە؟ وەك ئەوەی لەرێگای هێڵێکی تەلەفۆنی نادیار پەیوەندیان کردبێت کەهەموویان پێکەوە کۆبکاتەوە، ئەم ئافرەتانە هەمووشتێك رووداوەکەیان دەزانی. لەئاسوودەی خەیاڵم بۆجەماڵ خۆشەویستیم بۆئەم ئافرەتانە، فرمێسکم دەباراندن. نیوکاتژمێر لەژووری جەماڵ دەستیان بەسەماو گۆرانی گوتنو جەژن کرد بۆسەلامەتی جەماڵ، دواتر بەهەمان خێرایی کەهاتبوون گەڕانەوە. لەهەمان رووداو تەنیا هێڵێکی باریك لەژێر چاوی جەماڵ بەجێمابوو، بەهەمان شێوەی باوکی کەپێشتر هەیبوو، یادەوری کەوتنەخوارەوەی هەمان تەمەنی منداڵی. بەلام گەرمیو خۆشەویستی کەژنەکانی کارگە لەدوای خۆیاندا بەجێهێشت زۆر گەورەبوو. ئامادەبووم هەمووکارێك بۆئەمانە بکەم.

دوای سەرکەوتنی کارگەی جلوبەرگەکانی ئێمە لەفرۆشتنی هەموو جلوبەرگەکانی لەقاهیرە، چالاکییەکانی خۆم زیاتر کردن، ژنانی زیاتر هاتن کەبەشداری بکەنو بەناوی گەشەی کۆمەلایەتی ناوی خۆی دەرکرد. ماکینەی دروومان لەبیستو پێنج گەیشتن بە سەدو بیستو پێنج. وەزیری کارو گەشەی کۆمەلایەتی، پێش ئەوەی خانووی کۆنی ئێمە بکەوێتەخوارەوە بینایەکی نوێی بۆئێمە دروستکردو کارگەیەکی نەجاری بۆپیاوان دروستکرد. بەکرانەوەی دووکارگەیتر لەمنوفیەو یەکێك لەبەنی سویفو ئەویتریان لەئەسکەندەرییە، بەرهەمی ئێمە لەرۆژانە شەست دەستە جلوبەرگ گەیشتە چوار هەزار دەستە.

نەواڵ تاکو ئێستاش لەم کارگەیە کاردەکات. جاری کۆتایی کەبینیم، وەك ژنانیتر، توانیبوو لێکۆڵینەوە لەسەر مۆدێلی نوێی جلوبەرگ لەقاهیرە بکات. ئێستا خۆی جۆرێك جلوبەرگی پۆشیبوون لەسەرەوە تەنگو بۆخوارەوە وەك گوڵ دەکرایەوە، لەهەردوو دەستەکانی ئەنگوستیلی زێڕ بەرچاو دەکەوتن. بوونی پڕبوو لەهەستو سۆزو خۆشەویستی. بەخۆشحاڵی ـ گوتی:((ئیتر هاوسەرم قومار ناکاتو دەست بەسەرمدا بەرز ناکاتەوە. رێز لەمن دەگرێت.))

ڕۆژێکیان کاتێك بەشی کارگەی ئێمە لەمیت ئەبونەلکۆم دەکرایەوە، پرسیارم لەئەنوەر کرد:((چۆن هەڵسەنگاندنی بۆدەکەیت؟))

گوتی:((زۆرباش هیچ کاتێك باوەڕم نەدەکرد ئەمەیان دەکرێ. بەڵام ئاگاداری ئەم لایەنەبن هەموو پیاوەکان پێیان خۆش نییە ژنەکانیان لەماڵ بڕۆنە دەرەوەو کار بکەن. ئەمانە دەبێت ئەرکی هاوسەری خۆیان جێبەجێ بکەن، خۆت بەهەمان شێوە.))

پێکەنیمو بەگاڵتە گوتم:((ئەنوەر تۆهەمووکاتێك بەکەسێکی لادێی دەمێنیتەوە، بەڵام تۆ تەنیا بۆپیاوەکان دەستان بەشۆڕش نەکرد؟ بەشێکی دەبێت بۆئافرەتان تەرخان بکرێت.))

بەپێکەنین گوتی:((ژنانی میسر بەتۆ دەسپێرم خۆم هەموو کاروبارەکانی وڵات دەکەم)).

گوتم:((ئەم بڕیارە قبووڵ دەکەم، دەبینی چۆن شانازی بەمن دەکەیت.))

بەڵام هیچ یەکێك لەئێمە بەگۆڕانکارییەکانی نوێیو خرابو شەڕانگێزی شۆڕش کە لەپێش خۆی گرتبوون شانازیمان نەدەکرد.



## بەشی حەوتەم

## کارەساتی میسر

لەهاوینی ساڵی ١٩٦٦، ڕۆژێکیان یەکێك لەموختارەکانی گوندەکانی دەوروبەری میت ئەبوئەلکۆم زۆر بەهیواشی گوتی:((خاتوون، هەمان ڕووداوی کەلەگوندی کەمشیش ڕوویدا کارێکی نامرۆڤانەبوو. دوێنە ئەفسەرانی هێزی دەرەوەی شار باوکی خێزانی ئەلفەقی لەماڵ دێنەدەرەوە پەتێك لەئەستۆی دەکەنو بەسەریدا هاوار دەکەن کەدەبێت:"ئێستا وەك گوێدرێژەکان لەسەردەستو پێیەکانت بڕۆیت." دواتر ناچاری دەکەن بەهەمان شێوە لەکۆڵانەکانی گوند بسوڕێتەوە، بڕیار بۆجوتیارەکان دەر دەکەن وەك نیشانەی دەرەبگو ژێردەستەکانی توفی پێدا بکەن.))

موختار بەترس تەماشای دەوروبەری دەکرد. دەیزانی نابێت لەلای هاوسەری سەرۆکی پەرلەمانو یەکێك لەشۆڕشگێڕەکان باسی حکومەت بەخراپە بکات، بەڵام لەوەی کەبەچاوی خۆی بینیبوو دڵی ژانی دەکرد. بەخەمباری بەردەوامبوو:((خاتوو سادات، ئێمە خۆشەویستیمان بۆ ئێوەو هاوسەرتانو شۆڕش هەیە، بەڵام خەڵك بەبینینی ئەم دیمەنە لەشۆڕش بێزارن، من هیچ کاتێك خۆشەویستیم بۆئەم بنەماڵە دەوڵەمەندە نەبوو، بەڵام کاتێك خەڵك دەبینن هەڵسوکەوتیان لەگەڵ مرۆڤێك زۆرخراپترە لەئاژەڵ هاودەردیم بۆئەم خێزانە زیاتر دەبێت نەك شۆڕش. بەراستی ئەمەیان سووکردنە.))

ترس، سرکوتکردن، خیانەت، سووکایەتی، تاڵترین میراسی دووساڵ حکومەتی ترسو تۆقاندن کاری ناوەندی خاوێنکردنەوەی دوژمنانی شۆڕش لەناوەندی دەیەکانی ١٩٦٠، بوو. لەوەرگرتنی هەواڵێك لەسەر پیلانێك دژی شۆڕش دووبارە لەلایەن ئیخوان موسلمین دژی حکومەت هەیە، لە١٩٦٥ بڕیارێك بۆوەزیری بەرگری عەبدولحەکیم عامری دەرچوو دەتوانێت هێزەکانی ژێرفەرمانی خۆی تەواوی کەسانی توندوتیژی نەریتخوازی ئایینی بگرێتو لەریشەوە هەڵیان کێشێت. دواتر سەرۆککۆمار ناسر، بۆهەڵگرتنی بەربەستێکیتری گەورە لەسەر رێگای ئامانجی شۆڕش، واتە خاوەن موڵکەکانی سەرناس خۆی دەستبەکار بێت. ماوەیەکبوو پروپاگەندەی ئەمەیان دەکرا چەند سەد خێزانێك دەرەبەگ ماون بەشێوەیەکی نایاسایی خاکێکی زۆریان لەژێر دەستدایەو سەرقاڵی کشتوکاڵن. لەبەهاری ١٩٦٦، ناسر ویستی دەستی ئەم دەرەبەگانەی خاوەن موڵك کورت بکات. بۆئەم مەبەستە کۆمیتە دروستکرا بەناوی ((خاوێنکردنەوەی خاوەن موڵکەکان)) ئەم کۆمیتەیە کێشەی زیاتری دروستکردن بۆکەسانێك کەبوێری ئەوەیان هەبوو یاسای چاکسازیی زەویی پێشیلْ بکەنو موڵکیان دەستی بەسەردا بگیرێت. بۆزیاتر پێشەوەبردنی ئامانجەکانی سوسیالیستی حکومەت، ئەمجارەیان وەك جارەکانیتر هێرشکرایە سەر ئیخوان موسلمین، سەرۆکی ئەم ئەرکە عەبدوئەلحەکیم عامر، وەزیری بەرگریبوو، حکومەتی ترس دەستی پێکرد.

نییەتی ناسر هەڵە نەبوو، جێبەجێکردنی لەلایەن کۆمیتەی چل کەسی عامر زۆر هەڵە بوو. کۆنترۆڵکردنی زۆربەی کەسانی ناوکۆمیتە لەدەستی عامردا نەمابوو ئەمان بەسوود وەرگرتن لەدەسەلآتو پلەو پۆستی نوێی هێرشیان بۆهەرکەسێك دەبرد کەبە مەیلیان خۆشەویست نەبێتو وردیان دەرکرد هەرکەسێك دەنگی دژی حکومەت بەرز دەکردەوە بێدەنگیان دەکرد. هیچ کەسێك لەبەرامبەر شەپۆڵەکانی گومان لەسەر هەبوونو گرتن رزگار نەدەبوو. گومانیان لەهەرکەسێك دەکرد تاوانبار دەکرا بەئەندامبوون لەناو رێکخراوی ئیخوان موسلمین یان کەسێکی ئیخوان دەناسێت دەگیرا بەردەوام ئەشکەنجەدران. موڵكو ماڵی بەرپرسانی حکومەتی پێشوویان بەناوی حکومەت دەست بەسەر دەکرا. بەرپرسیارەتی هەموو خزمەتگوزارییەکانی گشتی سوپا بەرێوەی دەبردن ئەگەر کەسێك گلەیی لەنەبوونی خانووبەرو، زیادبوونی خەڵكو دروستبوونی قەڵەباڵغیو شێوازی گواستنەوەیانو نائەمنی تەلەفۆن دەکرد دەگیرا. جگە لەم

لایەنە هەزاران کەسی بێتاوان گیران کەهیچ هەڵەیەکیان نەکردبوو، تەنیا لەماوەی بیستو چوار کاتژمێر زیاتر لەهەژدە کەس بەتۆمەتی ئیخوانبوون گیرانو گوازرانەوە بۆبەندیخانە.

بەرپرسانی سەربازی بۆپشکنینی ماڵەکانی کەسانێك کەگومانی لەسەربوو بەخیانەت تاکو درەنگانی شەو خۆیان دەگرت دواتر بەناوێکی ترسێنەری (زووارالفجر) یان هەمان(دیداری بەیەك گەیشتنی بەرەبەیان) ناویان دەبردن. هیچ کەسێك هەواڵی لەهێرشی داهاتوو نەبوو بۆسەر دوژمنەکانی حکومەت، هەمووکەسێك هەستیان بەنەبوونی ئاسایشی خۆیان دەکرد. بیریان دەکردەوە ئایا ئەمشەو هێرش دەکرێتە سەر چ کەسێك ئایا ئێمە دەبینو پیاوەکان لەگەڵ خۆیاندا دەبەن. کاتێك هێرش دەکرا بۆهیچ کەسێك باس نەدەکرا ئەم پیاوانە بۆچ شوێنێك دەبەن، یان بۆچی دەبەن. زۆربەی پیاوەکان هۆکاریان نەدەزانی.

رۆژێکیان یەکێك لەهاورێیانی من لەگەڵ دوو خوشکی هاوسەری لەگوندی کیرداسە لەنزیك خانووی ئێمە لەجادەی ئەهرامەکان بەگریان گوتی:((خاتوو جیهان دەبێت داوا لەهاوسەرت بکەیت هاوکاری ئێمە بکات شەوی رابردوو (زووار الفجر) هێرشیان کردە سەرماڵمان، بەدوای دوو ئەندامی ئیخوان موسلمین دەگەڕان کەلەگرتووخانە هەڵاتبوونو گومانیان دەکرد لەگوندی ئێمە خۆیان حەشار دابێت. هاوسەرانی ئێمە هیچ هەواڵکیان لەم کەسانە نەبوو بەڵام لەگەڵ چەندین کەسیتر گیرانو لەگەڵ خۆیاندا بردن بۆگرتووخانە.))

سەرم سوڕمابوو، کاملیاو هاوسەری لەدۆستانی زۆر نزیکی ئێمەبوونو خێزانێکی زۆر بەرێزو خۆشەویست بوون. من پشتراست بووم ئەمانە هیچ کاتێك دژی شۆڕش نەبوونو دژی حکومەت هیچیان نەدەکرد. ئەفسەرانی سوپا بیروهۆشی خۆیان لەدەستدابوو. ماوەیەك پێشتر بەناوی گەڕان بەدوای کەسانی ئیخوان موسلمین تەواوی کەسانی ناو پاسێك دادەبەزێننو دواتر بەلێدان ئەم کەسانەی بێتاوان ناچار دەکەن کەتاوانبارن. ئێستا پیاوەکانی عەبدولحەکیم عامری سەربەخۆ کەسانیتر دەگرن، لەوانە هاورێیانی ئێمە.

بۆکاملیام باسکرد:((ئەنوەر لەگەڵ عەبدولناسر رۆیشتوون بۆزیارەتی مەککە تاکو چەند رۆژێتر ناگەڕێنەوە.))

کاملیا گوتی:((ئێمە لێرە لەماڵی ئێوە دەمێنینەوە تاکو دەگەڕێنەوە، تاکو هاوسەرانی ئێمە دەگەڕێنەوە ناتوانین ئارام دابنیشین.))

کاتێك ئەنوەر گەڕایەوە هاوشێوەی من سەری سوڕمابوو بەتەلەفۆن پەیوەندی بەوەزیر عەبدولحکیم کرد:((دوو کەس لەگوندی کیرداسە گیراون ئەمانە هاوڕێی ئێمەن بۆچی گیراون؟ ئەمانە هیچ تاوانێکیان نییە.)) عەبدولحەکیم عامر گوتی من ئاگادارنیم دەستبەجی پەیوەندی بەگرتووخانە کراو ئەم دوو کەسە ئازادکران. بەلام دوای ئەم دوو پیاوە ئازادکرانو هاتن بۆماڵی ئێمە، بەچاوی خۆم بێویژدانیو شکاندنی خەڵکم دەبینی.

پشتی ئەم پیاوانە بەشەلاق لەسەرەوە بۆخوارەوە هەموویان خەڵتانی خوێن کرابوون. بۆئێمەیان باسدەکرد هەموو کاتژمێرێك جارێك ئێمەیان دەکێشایە دەرەوە بەشەلاقدان دەکەوتنە سەرگیانی ئێمە تاکو لەهۆش خۆمان دەڕۆیشتین. سەربازەکان بەردەوام لەکاتی شەلاقدانی ئێمە هاواریان دەکرد ئەم دوو ئەندامی ئیخوان لەچ شوێنێکن؟ هاوڕێیانی ئێمە گیرۆدەی ئازارو ئەشکەنجەو شکاندنی کەسایەتی کرابوون. ئەم دوو هاوڕێیەیی ئێمە موسلمانو خۆیان زۆر رێکوپێك دەکرد بەلام سەربازان بۆشکاندنیانو سەپاندنی تاوانی خیانەت بەسەریاندا برۆێكو تەنیشتێك لەسمبێڵیان داتراشیبوون. ئەمەیان یەکێك لەهەزاران رووداوبوون کەبەردەوام روویاندابوون.

میسرییەکان کەسانی سازگارو لەخۆباین، دەتوان ئۆقرەی هەمووشتێك بگرن برسییەتی، هەژاری، نەخۆشی، تاکو دەگاتە مەرگ بەلام پێشلکردنی سەربەرزیان قبوول ناکەن، پاراستنی کەرامەتیان بۆمیسرییەکان زۆرگرنگە، کەسانی خاوەن سەرمایە ئامادەن هەموو دارایی خۆیان لەپێناو پاراستنی کەرامەتی خۆیان و خێزانیان چاوپۆشی بکەن، سەرەڕۆترین منداڵەکان نافەرمانی لەدایكو باوکی خۆیان ناکەن. بەلام لەهەلومەرجەدا کەرامەتی زۆر لەمیسرییەکان تێکشکابوو.

عەبدولحەکیم عامر هاوسەنگەرو هاوڕێی دێرینی ئەنوەر، نەمدەویست ئەوەی دەبینمو دەبیستم باوەڕ بکەم. ئێمە تێکەلاویی سەردانی بەردەوامی خێزانیمان هەبوو، بەتایبەتی هاوینان لەئەسکەندەرییە، زۆر لەگەڵ یەکتر نزیكو خۆشەویستی زۆرمان بۆیەکتر هەبوو. منداڵانی من تاکو ڕادەیەك عەبدولحەکیم عامریان بەئەندامی خێزانو (مامی) خۆیان بانگ دەکرد، هەموکاتێك کەسەردانی ئێمەی دەکرد گیرفانەکانی خۆی پڕی شوولات دەکردو منداڵەکانی ئێمە بەبینینی بەپیریەوە دەرۆیشتن. بەباوەڕی من باوەڕم نەدەکرد عامر کەسێکی سەرەکی شۆڕش، ئێستا بەرپرسی رووداوەکان بێت کەلەمیسر روویاندەدا.

هەمان ڕووداوی کەموختاری میت ئەبونەلکۆم بۆی باسکردم، هەمان هەڵسوکەوتی خراب لەگەڵ یەکێك لەئەندامانی خێزانی ئەلفەقی بۆیان باسکردم،، لەگەڕانەوەم بۆقاهیرە. کاتێك بینینم سەرۆکی کۆمیتە لەهۆلی پێشوازی لەگەڵ ئەنوەر دانیشتووە، خوشحاڵبووم. کاتێك هەمان ڕووداوم بۆئەنوەرو عامر دەگێڕایەوە، دەلەرزیمو فرمێسك لەچاوەکانم دەهاتنەخوارەوە.

بۆعامرم باسدەکرد:((ئەگەر ئەم پیاوە تاوانێکی دژی شۆڕش کردبێت بۆچی دادگایی ناکرێت؟ ئەگەر دادگا بڕیاری لەسیدارەدانی بۆدەربکات، بۆئەم کەسانە بەکەرامەتر دەبێت کەبەم شێوەیە کەرامەتی بشکێننو سووكو ریسوای بکەن.))

وەك لەبەرچاو دیار بەبیستنی ئەم ڕووداوە خەمباربوو گوتی:((هیچ کەسێك بڕیاری بۆسەربازەکان دەرنەکردووە هەڵسوکەوتی هاوشێوەی ئاژەڵ لەگەڵ کەسانی دەوڵەمەند بکات، لەوانەیە تۆڵەکردنەوەیەکی کەسی لەنیوانیان هەبێت.))

پرسیارم لەعامرکرد:((بۆچی ڕێگا لەئەمانە ناگیرێت؟ خەڵك لەشۆڕش بێزار دەبێت. ئیتر هیچ کەسێك دڵسۆزی بۆئامانجەکانی ئێوە نییە، بەپێچەوانە خەڵك دڵی بۆکەسانێك دەسووتێت کەبەم شێوەیە دڕندانەیە هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دەکرێت.))

دروست وەك بابەتێتر داوای کرد هیچ کەسێك نابێت هەڵسوکەوتی خراب لەگەڵ خێزانی ئەلفەقی بکات. کەسانی زۆرکەم دەیانتوانی نیوەندگیری بکەنو ڕووداوی ڕاستەقینە باس بکەن. هەڵسوکەوتی خراب لەگەڵ خەڵکدا بەردەوامیان هەبوو. خۆدی ناسر، بەبوونی دۆستایەتی زۆرنزیکی لەگەڵ عامر پشت گوێی دەخستن کەلەسەرتاسەری وڵات لەسەر پیاوەکانی عامر بڵاودەکرانەوە. ناسرو عامر پێکەوە بەشداریان لەشەڕی فەلەستین کردبوو، پێکەوە پێکهاتەی ئەفسەرانی ئازادیان ڕێکخستبوو میسریان پێکەوە بۆشۆڕش ڕێبەرایەتی کردبوو. ناوی یەکتریان لەسەر منداڵەکانی خۆیان دانابوو عامر بەتەواوی هێزەوە پشتیوانی لەسەرۆككۆمار دەکرد. ناسر دەیزانی هەرکەسێك سەرۆکایەتی سوپا بکات واتە سەرۆکایەتی میسر دەکات، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ گومانی لەهاوڕێی دێرینی خۆی دەکرد.

ئیتر ئەندامانی کۆمیتەی خاوێنکردنەوەی خاوەن موڵکەکان بەناوەندی هێز بەناوبانگ دەبوو، ڕۆژانە هێزو دەسەلآتی زیاتر دەبوو. ئەمانە کەسانی ڕکابەری خۆیان لەناو حکومەتو لەدادگای لێپێچینەوە ورد دەکردن. دەنگۆیەك هەبوو هەریەك لەئەمانە لیستێکی ڕەشی لەڕکابەرانو

کەسانێك کەبێزاری خۆیان لێدەکرد خۆیان لەگیرفاندابوو. هەرکەسێك ناوی لەلیستی ڕەش هەبوو خۆیو موڵكو ماڵی دەستی بەسەردا دەگیرا.

لەئاداری١٩٦٧، کۆمیتە جگە لەدەست بەسەرداگرتنی موڵكو ماڵی خەڵکی خاوەن سەرمایە بەشێوەیەکی توند بەردەوامی هەبوو. ڕێوشوێنەکانی زووار ئەلفەجر لەپێشتر زۆر بێ ڕەحمانەتر بوون. زۆرجار ئەفسەرانی گەنج نەیاندەزانی بەدوای چیدا دەگەڕین. کاتێك روویان لەماڵێك دەکرد داوایان لێدەکرد دارایی خۆتان نیشانبدەن. ژووری خەوتنیان دەپشکنیو گوارەو ئەنگوستیلەی خەڵکیان بەتاڵان دەبرد، زێرو پارەی کەدەستیان دەکەوت لەگیرفانی خۆیان دەنا. هەندێك لەخێزانەکان بۆچەندین جیل لەناو خانوویەك ژیابوون وەك داپیرو باپیرو نوەکانی بچووك هەموویان ڕادەکێشا سەرکۆلانو هیچ کەسێك بوێری نەبوو دەنگ یان گلەیی لەم هەڵسوکەوتەیان بکات، هەموو ئەمانەیان ڕەوانەی ناو کولان دەکردنو خۆیان بەناو کەلوپەلەکانی ماڵەکەیان دەکەوتن. هیچ هەواڵێك لەم لایەنە لەرۆژنامەکان بەرچاو نەدەکەوت ئەگەر لەسەری دەنووسرا دەرگای رۆژنامە دادەخرا.

ئێستا خەڵکانێکی زۆر نامە لەدەست لەبەردەرگای ئێمە ڕێزیان دەگرت بەپێچەوانەی جاران کەهەموویان هەژاربوون ئەمجارەیان هەموویان دەوڵەمەندبوون. هەندێك لەئەمانە داوایان دەکرد موڵكو ماڵیان بۆبگەڕێتەوەو من هاوکاریان بکەم. هەندێك کەس داوای پارەیان دەکردو هەندێك زیادکردنی مووچە کەحکومەت بۆی دیاریکردبوون. ئایینی ئێمە بڕیار بەهەمووممان دەکات هاوکاری یەکتر بکەن. من تەواوی نامەکانم وەردەگرتو پێشکەشی ئەنوەرم دەکردن، بەلام نەمدەتوانی کارێکی زیاتر لەئەمەیان بکەم. زۆر خراب گیرۆدە دەبووم. لەلایەك باوەڕم بەکۆمیتەی خاوێنکردنەوەی کەسانی خاوەن موڵكو ماڵ کەزەوییەکانیان لەنێوان خەڵکی هەژار دابەش بکرێت هەبوو، بەلام لەلایەکیتر، دڵم بۆدەردو ڕەنجی ئافرەتانی دەوڵەمەند دەسووتا. لەگەڵ ئامانجەکانی سوسیالیستی حکومەت هاوڕابووم، بەلام لەگەڵ شێوازی بەدەستهێنانی هەمان ئامانج نەبووم.

وەك دیار سەربازەکان زۆربەیان لەخێزانەکانی هەژاربوون، تۆڵەیان لەخێزانەکانی گەورەو بەڕێزی میسر دەکردەوە کەناوێکی دیاربوون لەتەواوی وڵات، هەندێك لەئەمانە هاوڕێی خۆم بوون، وەك نەفیسە عەبدولجەعفەر، بەفرمێسك باراندن سەردانی کردم.

داوام لێکردو گوتم:((ئەفیسە داوات لێدەکەم تۆ وەك خوشکی منی دەبێت یارمەتی لەمن وەربگریت.))

قبوولّی نەکردو گوتی:((من سەدەقەم ناوێت.))

داوامکرد وەك قەرز وەربگرێت هەرکاتێك توانی بۆم بگەڕێنێتەوە بەلاّم دیسان ئامادە نەبوو قبوولّ بکات.

پرسیم:((چۆن ژیان بەسەر دەبەیت.))

گوتی:((بەزێرەکانی کەلەترسی بەرپرسانی زووار ئەلفەجر حەشارم دابوون ئێستا دەیان فرۆشم.))

دواتر گوێبیستی زۆر چیرۆکیتر بووم. چیرۆکی گلادیس سورسك، ئەندامی خێزانێکی خاوەن موڵکێکی گەورە، دوای هەلاّتنی بۆولاّتی فەرەنسا لەهەمان سەردەمی تاریك دەگەڕێتەوە بۆمیسر، باسی هەمان رۆژەکانی دژوارو تاریك دەکاو دەڵێت:((نیوە شەو هێزەکانی زووارئەلفەجر لەدەرگای ئێمەیاندا لەدوورگەی زقاریق، پێنووس بەدەست هاتنە ژوورەوە تاکو هەمووشتێك لەقابی چینیو زیڕو تاکو کۆتایی بنووسن. بۆیان باسکردم تۆمافی ئەوەت نییە دەست لەهیچ شتێك بدەیت یان بیفرۆشی چونکە ئێستا ئەمانە هەموویان موڵکی حکومەت هەژمار دەکرێن نەك تۆ."بۆیان باسکردم سەردانی بانك کردن هیچ سوودێکی نییە چونکە حکومەت دەستی بەسەر هەموو هەژمارەکانی بانکیدا گرتووە.

سەربازەکان گوتیان:" سێ رۆژ دەرفەتتان هەیە لەم خانوویە بچیتە دەرەوە." چی بکەم هاوسەرم بۆکارکرد لەئەورووپابوو من نەپارەو نەجێگایەکم هەبوو بۆرۆیشتن. بۆیان باسکردم برۆ دادگە. رۆژی دواتر سەردانی دادگامکردو بڕیاریاندا مانگانە بڕیك مووچەم پێشکەش دەکەن، بەلاّم بەهەمان مووچەی دیاریکراو نەماندەتوانی ژیانی خۆمان هەڵسوڕێنین. دوای گەڕانەوەم هەموو دەرگای سندووقەکان مۆری سووری لەسەر درابوو بۆئەوەی من نەتوانم دەستیان لێدەم. مافی ئەوەت نییە هیچ شتێك بیبەیتە دەرەوە."پەیوەندیم بەهاوسەرمکرد لەفەرەنساو گوتم:" نەگەڕیتەوە دەگیریت پرسیاری لەمن کرد:"بۆچی؟" گوتم: "چونکە خاوەن سەرمایەیی.")) 

کاتێك چیرۆکی گلادیس بەکۆتایی هات فرمێسك لەچاوی هەردووکمان دەهاتنەخوارەوە گلاّدیس لەهاوڕێیانی ئازیزم بوو. ئێستا لەپاریس دەژیانو خۆییو هاوسەری ناچار دەبوون سەرلەنوێی ژیانی خۆیان دەست پێی بکەن.

هاوڕێیەکیترم، ئیعتیمات ترابلۆسی، خێزانی خاوەنی هەزاران دۆنم زەویی کشتوکاڵی بوون لەشاری شەرقییە. کاتێك دەست بەسەر موڵكو ماڵی ئەم خێزانەدا گیرا، تەنیا ڕێگایان پێدا لەناو ماڵی خۆی لەئەلدۆقی بمێنێتەوە، سەربازانی زووار ئەلفەجر وەك ئەسیرەکان هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا دەکرد. ئەم ئافرەتە زۆر بوێرە بۆی باسکردم ئەم سەربازانە هەفتانە چەند جارێك سەردانم دەکەن تاکو بزانم دەستم لەهیچ شتێکداوە. ئیعتیماد وەك زۆر لەژنانی چینی سەرمایەدار، بۆپڕکردنەوەی کاتی خۆی بەشداری لەچەندین خولی دروومانو نیگارکێشی کردبوو، ئێستا دەیزانی ڕۆیشتن بۆئەم خولانە ئەوەندە بێسوود نەبوونو ئەم ڕۆژانەی دژوار دەتوانێت سوودیان لێوەربگیرێت. گوتی: ((مووچەی کەدادگا بۆی دیاریکردم بەشی کڕینی پێداویستی خواردنی بەیانی یان دەرمانی دایکم ناکات. لەگەڵ خوشکم قەرزمان لەبانك وەرگرتووە ماکینەی دروومانو رستنمان بۆخۆمان دەستەبەر کردوون ئێستا ژیانی خۆمان بەدروستکردنی جلوبەرگو رستنی ئاوریشم تێپەڕ دەکەین. یەکێك کەجلوبەرگی لەمن دەکڕین گوتی:((باوەڕ ناکەم ئێوە خاوەنی ئەم هەموو سامانەبوون ئێستا لەسەر چۆکەکانی خۆت دادەنیشیو ئەم کارە دەکەیت.)) بۆم باسکرد شانازی بەکاری خۆم دەکەم لەجیاتی ئەوەی دانیشم بۆنەبوونی خۆم دەست بەگریان بکەم لەسەر پێی خۆم رادەوەستم. دواتر هەمان ئافرەت بۆ هێنانەخوارەوەی نەرخ چەقەچەقی دەکرد، کاتێك ڕۆیشت، دەرگام قوفڵکردو دەستم بەگریان کرد.))

ئەندامانی خێزانی من لەم ڕووداوانە رزگاریان نەبوو. باوکی هاوسەری خوشکم، ئەبو وافیە،کیسەیەکی بچوکی دایە دەستمو گوتی:((جیهان دەکرێ ئەمەیان بۆمن لەشوێنێك دابنیت؟)) ئەم پیاوە لەسەردەمی شەڕی ١٩٥٧، خزمەتێکی زۆری ئێمەی کردبوو، لەناو موڵكو ماڵی ئەم کابرایە جەماڵ، لەدایکبوو. لەبەر خزمەتکەکانی ئامادەبووم هەمووکارێکی بۆبکەم. گوتم:((لەناو ئەم کیسەیە چییە؟))

گوتی:((چەند پارەچە زێڕێکی خێزانم.))

لەکاتی بۆگەڕاندنەوەیان بزانم چەندنو کەمو کورتیان نەبێت، پرسیارم کرد:((چەند پارچە زێڕی لەناودایە؟))

گوتی:((پێویست ناکات بزانی، باوەڕم بەم ماڵە هەیە تۆدەبێت هاوکاریم بکەیت.))

بەبێ ئەوەی ئاگاداری ئەنوەر بکەم ئەم کیسەیەم لەژووری خەوتنم داناو ئەوەندە نیگەرانی زێڕەکانی بووم چەند ڕۆژێك بوێری ئەوەم نەبوو لەماڵی خۆم بڕۆمە دەرەوە. دەمزانی ئەگەر پارچە زێڕێك لەم کیسەیە کەم بێت ئەبو وافیە هیچ کاتێك بۆم باس ناکات، هەستێکی زۆرخراب توانای هەڵگرتنم نەبوو. نیگەرانیم تاکو ڕادەیەکبوو ڕۆژێکیان رویشتمە ژوورو دەرگام لەسەرخۆم قوفڵکرد شەش مانگ بەسەرهێنانی ئەم کیسەیە بۆماڵی ئێمە تێپەڕی تاکو توانیم بۆی بگەڕێنمەوە.

هەلومەرجم زۆرخرابوو، ئامانجی شۆڕش دەرکردنی چینی دەوڵەمەند لەوڵات نەبوو. بڕیاربوو سەربازەکان تەنیا سەرژمێری بۆموڵكو ماڵی ئەمانە بکەن نەك بۆخۆیان دەستی بەسەردا بگرن. زوڵمو ستەمی ترسناکی زووار ئەلفەجر بۆکەسانێك کەگومان دەکرا دژی دەسەڵاتی نوێبن، پێچەوانەی بیروباوەڕم بوون. ئەگەر کەسێك کارێکی کردبێت یان گومانی لەسەربێت، بەڵام هیچ کاتێك ئەوەندە تاوانبار نەبوو کە بەم شێوەیە ئەشکەنجە بکرێن. ئەگەر کەسێك تاوانی کوشتنی لەسەر ئاشکرا دەبوو بێگومان دەبێت سزای خۆی بەمەرگ وەرگرتبا. من دژی ئەم جۆرە سزایانە نەبووم. بەڵام ئەشکەنجەکردنی خەڵك بەبێ بەڵگە خۆی تاوانبوو. دەنگۆیەك هەبوو کەسانی موسڵمان بۆئەوەی تاوانبار نەکرێن بەئیخوان موسلمین قورئانەکانی خۆیان لەشوێنێکی نادیار لەبەر سەربازەکان دەشاردەوە. زۆرجار دەم بیست هەندێك ئافرەت لەگەڵ هاوسەرانی خۆیان دەگیرانو بۆئەوەی پیاوەکان دان بەتاونی خۆیاندا بنێن لەبەرامبەر پیاوەکان ئەم ئافرەتانە شەلاَق دەدران. چیرۆکەکانی جۆراوجۆرو ئەنجامێکی زۆر خرابو خەمبار.

چینی ناوەندە وردە وردە لەحکومەت هەڵدەگەڕانەوە، زۆر لەعامر بێزاربوون. بێزار لەتەواوی سەرانی شۆڕش تاکو دەگەیشتە هاوسەری من. جوتیاران خۆشەویستی جارانیان بۆ رزگاربوون لەدەستی دەرەبەگەکان نەمابوو. هەمان بەرگری کەمن لەشۆڕشم دەکرد وەردە وردە مانای خۆی نەمابوو. بەردەوام بۆهاوڕێیانی خۆم باس دەکرد:((بۆرزگاربوون لەسەرمایەداریو گەیشتن بەسوسیالیزم دەبێت هەندێك بکرێنە قوربانی، ناکرێ هەمووتاکی کۆمەڵگە لەیاساکان رازیبن. بەرژەوەندی زۆرینە دەبێت لەسەروەوەی بەرژەوەندی کەمینە بێت.))

لەهەمان ماوەی کورت چەند کەسێکی دەرەبەگ گیران سەربازەکان دەستیان بەسەر نزیکەی پەنجاو هەشت هەزار هێکتار زەوی کشتوکاڵیدا گرت. دەستبەسەرداگرتن لەهەندێك شوێن ئەوەندە خێراو سەربەخۆیانە دەکرا کەدواتر بۆیان گەڕایەوە، سەرەتا لەلایەن دادگەی وڵاتو

دواتر لەلایەن هاوسەرم دوای گەڕانەوەی ئارامیو حکومەتی یاسا لەمیسر. چ سەردەمێکی شەرماویی بوو بۆوڵاتی ئێمە. بۆکۆتایی بەکاروبارەکانی نەشیاوی کۆمیتەی خاوێنکردنەوەی خەڵکانی خاوەن موڵکو ماڵ، دەبێت هاندانێکیتر لەلایەن ئیسرائیل ڕوویدەدا حکومەت لەجیاتی ئەوەی سەرقاڵی دوژمنانی ناوخۆیی بێت دەبێت لەبەرامبەر دوژمنی دەرکی ئێمە لەسنووری ڕۆژهەلآت بێت.

شەڕ لەمانی پێنجی ١٩٦٧، پێکدادانی لەگەڵ ئیسرائیل لەناکاوبوو. زیاتر لەشەش مانگ دەبوو کێشەکان زیاتر دەبوون. لەمانگی تشرینی دووەم، ئیسرائیل بەهێرشی هەموولایەنە نزیکەی چلو هەشت کیلۆمەتر دەچێتە ناوخاکی ئۆردنو تاکو گوندی ئیلسامۆ ڕۆیشت، سەدوبیستو چوار خانوو، نەخوشخانە، قوتابخانە، مزگەوت هەمووی ویرانکردن. ئیسرائیل بەگومانی ئەوەی ناوەندێکی سەربازی بزوتنەوەی ئازادی فەلەستین لەم گوندە هەیە هێرشی خۆی دەست پێکردووە بەتانکو زرێپۆشی خێرا حەوت کەس کوژرانو پەنجاو چوار کەس برینداربوونو پەنجا هەزار کەس ئاوارە دەبن.

سەرۆککۆماری سووریا، نوردین ئەتاسی، لەمانگی شوبات رایگەیاند:((ئێستا ئەرکی هەموو عەرەبەکانە لەهەلومەرجی بەرگری لەخۆکردن بگۆڕێت بۆهێرشکردنە سەر دوژمنو رزگارکردنی خاکی داگیرکراو. هەموکەسێك دەبێت بەشداری بکەنو تاکو کۆتایی بەردەوامی بەشەڕی خۆمان بدەین.))

لەحەوتی نیسان، فرۆکەکانی ئیسرائیلو سووریا لەئاسمانی دیمەشق بەشەڕهاتن ئیسرائیل شەش فرۆکەی لەسووریا خستنەخوارەوە. سەرۆك وەزیری ئیسرائیل لیوی ئەشکول لەدوانزدەی مانگی ئایار پەیامێکی لەرادیو بلآوکردەوە گوتی:((ئیسرائیل دەبێت وانەیەکی دژوارتر لەحەوتی نیسان نیشانی سووریا بدات. بۆئێمە زۆر روونو ئاشکرایە سووریا ناوەندی تیرۆریستەکانە، هەڵبژاردنی کاتو شوێنو شێوەو جۆری بەرنگاربوونەوە لەدەستی ئێمە دایە.))

حکومەتی میسر، بەبوونی پەیمانی سەربازی لەگەڵ سووریا، قسەکانی سەرۆك وەزیری ئیسرائیل بۆ میسر زۆر روونو ئاشکرابوون. لەمانگی نیسان ئەنوەر سەردانی مۆسکۆی کردو لەرێگای سەرۆك وەزیری ئەلکسی گاسکین ئاگاداربوو کەئیسرائیل هێزەکانی خۆی لەنزیك سنووری سووریا کۆدەکاتەوەو لەناوەندی مانگی ئایار هێرش دەکاتە سەر سووریا. لەپانزدەی

مانگی ئایار عەبدولناسر فەرمان بەوەزیری بەرگری، عەبدولحەکیم دەکات سەربازانی میسر لەرێگای بیابانی سینا لەسنووری ئیسرائیل نزیك بکاتەوە.

برایانی عەرەبی ئێمە، بەتایبەتی ئەتاسی، سەرۆککۆماری سووریاو مەلیك حوسێن پاشای ئۆردن، رازینەبوون کەناسر جوڵە بەهێزەکانی بکاتو هەستیان دەکرد ناسر بەئەنقەست ئەمەیان دەکاتو بەشەداری شەڕ ناکات. رادیوی ئۆردن رایگەیاند تەنیا کارێك کەجەمال عەبدولناسر بکات ئەوەیە کەخۆی لەپشت هێزەکانی ئاشتی پارێز لەبیابانی سینا نەشارێتەوە.

شەرم شێخ شارێکی میسری لەبیابانی سینا دەروانێتە سەر گەلی تیران لەدەستپێکی کەنداوی عەقەبە، کەتەنیا رێگایە بۆدەست گەیشتنی ئیسرائیل بەدەریایی سوور، بۆئەوەی هێزەکانی ئیسرائیلی بەئازادی لەم ناوچەیەك تێپەڕ بکات لەژێر کۆنترۆڵی هێزەکانی ئاشتی پارێزی نەتەوەیەکگرتووەکان دابوو. رێبەرانی عەرەب پاڵەپەستۆی زۆریان خستە سەر جەمال عەبدولناسر کەکاتی ئەوەیە جوڵانەوەیەك لەخۆی نیشانبدات.

لەم نیوەدا، دەزگای راگەیاندنی ئیسرائیل، بۆرازیکردنی جیهان رایگەیاندن ئیسرائیل ولاتێکی بچوکی دوو ملیون کەسی، لەژێر هەڕەشەو هێرشی سەد ملیون عەرەبی دوژمن بەردەوام کاری لەسەر ئەم لایەنە دەکرد. سەرانی ئیسرائیل بەراستی زیرەکبوون، دونیایان رازیکرد، کەئیسرائیل قوربانییەکی بێتاوانە، لەکاتێکدا ئیسرائیلبوو هێزەکانی خۆی لەسنووری سووریا جێگیرکردن، رۆژانە بابەتێکیتر لەرۆژنامەو رادیوو تەلەفزیۆنی ئیسرائیل بلاودەکرایەوە. سەرانی ئیسرائیل قسەکانی ئەحمەد شوقێریان گەورە دەکردن، ئەحمەد دوای دروستکردنی بزوتنەوەی ئازادی بەخشی فەلەستین لە١٩٦٤دروستکرا دەلێت تاکو عەرەبەکان ئیسرائیل لەناو دەریا نەکەن بەئاسوودەیی دانانیشن.

ئەم وشەیەیی ئەحمەد شوقێری توانی پشتیوانی رۆژئاوا بەدەست بێنێت، بۆئێمە بەنەرخی ملیونها ملیون دۆلار تەواوبوو. ئیسرائیل بەتێپەڕکردنی ساڵەکان بۆئەوەی بۆ رۆژئاوا نیشانبدات عەرەبەکان هەمان نەخشەی هولۆکاستیان لەبەردەستە، بەردەوام سوودیان وەردەگرت. بۆئێمە لەمیسر، بینینی هاودەردیو پشتیوانی رۆژئاوا لەئیسرائیل، لەسەر بنەمای راگەیاندنێکی بێ بنەما مێشکی دەتەقاندین. ئێمە چۆن دەمانتوانی ئیسرائیل لەناو دەریا بکەین؟ ئیسرائیل بەپشتیوانی ئەمەریکا بەهێزتربوو لەهەموو سوپای عەرەب.

لەبەهاری ساڵی ١٩٦٧، ئیسرائیل جارێکیتر عەرەبەکانی راستەخۆ کردە ئامانجی پروپاگەندەکانی خۆی، بانگێشەی ئەوەیان دەکرد کەئێمەی عەرەب زۆربەمان هەژارو نەخوێندەوارو پیسو چڵکنن. گوڵدا مایەر، وەزیری دەرەوەی ئیسرائیل، پێداگری دەکرد:ئەگەر تەواوی عەرەبەکان دابیژین تاکو رادەیەك هەموویان دەخزێنەخوارەوە. مەبەستی ئەوەبوو عەرەبەکان لەروی ژمارە زۆرن، بەلآم لەلایەنی باشی هیچ نین. دواتر دەلێت ژنانی عەرەب زۆر سادەن لەجیاتی خەرجکردنی پارە بۆپەروەردە بۆپاراستنی شوێنو پێگەی کۆمەلآیەتی خۆیان خەرجی پێویستی خۆرازاندنەوە دەکەن، بەلێ راستی دەکرد هەندێك لەعەرەبەکان بە بەراوردکردن لەگەڵ ئیسرائیلییەکان شێوەی ژیانیان زۆر جیاوازبوو، بەلآم من لەزۆربێژی مایەر لەسەر عەرەب کەلەجیاتی هەڵبژاردنی ژیانی مۆدێرنو خۆشتری وەك ئیسرائیل شێوەی دواکەوتوو هەڵدەبژێرن، ئازارم پێگەیشت، چونکە زۆربەی خەڵك عەرەب زۆر بەزەحمەت دەیانتوانی زکی ژنو منداڵەکانی خۆیان تێربکەن.

لەناوەندی مانگی پێنج رۆژ بەرۆژ لەشەڕ نزیك دەبووینەوە، لەچواردەو پانزدەی مانگ، سووریاو میسرو ئیسرائیل سەربازنیان بۆخزمەت بانگێشت دەکردنەوە لەهەژدەی مانگی پێنج، ناسر، لەکاردانەوەی بەرامبەر پاڵەپەستۆی سەرانی عەرەب، داوای لەنەتەوەیەکگرتوەکان کرد هێزەکانی ئاشتی پارێزی خۆی لەمیسر بکشێنێتەوە. ئوتانت سەرۆکی نەتەوەیەکگرتووەکان هەوڵیدا هێزەکانی ئاشتی پارێز لەناوچەکە بمێننەوەو بەپێی رێکەوتنی دوای شەڕی ١٩٥٦ دەبێت ئەم هێزانە لەسەر سنووری نێوان ئیسرائیلو میسر بمێننەوە. داوا لەئیسرائیل کرا کەهێزەکانی ئاشتی پارێز لەناو خاکی ئیسرائیل بمێننەوە. بەلآم ئیسرائیل وەك کۆتایی شەڕی نۆکەندی سوئیز قبووڵی نەکرد. ئوتانت ناچاربوو هەموو هێزەکانی ئاشتی پارێز لەناوچەکان بکێشێتەوە.

ناسر لەشەوێکدا بوو بەقارەمانێکی گەورەتر لەجاران لەناو جیهانی عەرەبیدا. جارێکیتر هێزەکانی بیانی خاکی میسریان جێهێشت. جەماڵ عەبدولناسر بەبێ ئەوەی گولەیەك بتەقێنێت، هەمان شەرمەزاریو سەرشۆڕی کەمیسر لەشەڕی ١٩٥٦ گیرۆدەی ببوو، قەرەبۆیکردەوە، هەمووماﻥ لەمیسر دەمانزانی کشانەوەی هێزەکانی ئاشتی پارێز دەستپێکردنی شەڕێکیترە، چونکە هێزەکانی ئاشتی پارێز لەنێوان ئێمە دابوون. ناسر لەبیستو یەکی مانگی ئایار فەرمانێکی بۆهێزەکانی سەربازی میسر دەرکرد شوێنی هێزەکانی

ئاشتی پارێز لەشەرم شیخ پرپکرێتەوە، بۆیەکەمجار دوای یانزدە ساڵ، کۆنترۆڵی تەنگەی تیران بەدەستیانەوە گرت، دەستپێکی شەڕ نزیکتر دەبوو. ناسر ڕێگای تیرانی گرت، بۆئەوەی ئیسرائیل بێتە سەرمێزی گفتوگۆ، بەلأم ئیسرائیل ئامادە نەبوو گفتوگۆ بکاتو مەترسی شەڕ نزیکتر دەبوو.

لەهەمان ڕۆژ ناسر لەکۆبوونەوەی فەرماندەکانی سەربازی پرسیارێك ئاراستەی ژنەراڵ عەبدولحەکیم عامر دەکات:((ئایا هێزەکانی ئێمە ئامادەن بۆشەڕکردن؟))

وەزیری بەرگری لەوەلأمدا دەلێت:((هەمووشتێك بۆمن بەجێ بێڵن، هەمووشتێك بۆشەڕکردن ئامادەیە.))

ئیسرائیل هیچ ویستێکی بۆئاشتی نیشان نەدا لەبیستو دووی مانگی ئایار، ناسر تەنگەی تیرانی بەتەواوی داخست، کەرامەتی ئیسرائیل کەوتە ژێر پرسیارەوە. ئەم وڵاتە دەبێت کاردانەوەیەك لەخۆی نیشانبدات کەنیشانی دونیا بدات کەناچێتە ژێرباری عەرەبەکان. لەبیستو شەشی مانگی ئایار، راپۆرتێك لەڕۆژنامەی ئەهرام چاپکرا: ((ئیسرائیل ناتوانێت ئەم ڕووداوانە قبووڵ بکاتو هیچ کاردانەوەیەك نەکات. ڕێگابدەن ئیسرائیل دەست پێبکات. ئێوە تەنیا ئامادەبن تاکو گورزی دووەم بێتەخوارەوە! ئەمەیان دەبێتە گورزی کۆتایی.))

دوو ڕۆژ دواتر، ناسر لەگەڵ ڕۆژنامەکانی بیانی رایگەیاند ئێمە نامانەوێت شەڕ بکەین بەلأم ئەگەر ئیسرائیل هێرش بکات، ئێمە بۆپاراستنی کەرامەتی عەرەب شەڕی خۆمان دەکەین. هیچ کەسێك نەبوو لایەنگری عەرەب بکات لەم شەڕەدا. ناسر دەلێت: ((ئەمەریکا لەم لایەنە دەمارگیرانە لایەنی ئیسرائیل دەگرێت.)) تەواوی هێزەکانی ڕۆژئاوا تەنیا باس لەمافی ئیسرائیل دەکەنو بەرگری لێدەکەن. ناسر پرسیارێکی ئاراستەی پەیامنێرەکانی نیویۆرك تایمز، تایمز لەندەن، لۆمۆندو ڕۆژنامەکانیتر کرد: ((مافی عەرەب چی بەسەردێت؟ تەنیا کەسێك وشەیەك باسی مافی عەرەب یان مافی خەڵکی فەلەستینو خاکی فەلەستین ناکەن.))

بەبیستنی وتەکانی ناسر، یەکەم ڕێبەری عەرەب لەبەرامبەر هێزەکانی ڕۆژئاوا بەرگری لەمافی هەموو عەرەب دەکرد، میسرو سەرتاسەری ڕۆژهەلأتی ناوەڕاستی پڕبوو لەسەر بەرزی. ئێمە لەقاهیرە لەلایەنی ڕوحی ئامادەیی تەواومان هەبوو بۆبەرامبەر بوونەوە لەگەڵ ئیسرائیل. لەقاوەخانەو ماڵەوە بەردەوام چاوەڕێی یەکەم هێرش بووین لەرادیو. هەمووومان لەدەوری یەکتر کۆدەبووینەوە، باوەڕمان بەخۆمان هەبوو، پەیامی ئێمە زۆر ڕوونبوو. ئوم کلسوم لەگۆرانییەکی

تایبەتی شەڕی چاوەڕوان کراو ئامادە کردبوو بەردەوام بەدەنگی سیحراوی خۆی دووبارە دەکردەوە: ((لەگەڵ هێزەکانی سەربازی خۆمان دەگەڕێینەوە وەك رووناکی رۆژ دوای تاریکایی شەو دەگەڕێینەوە. ئەی لەشکری عەرەب، خواتان لەگەڵ بێت. کارەساتی فەلەستین ئێوەی بەرەو سنوورەکان کێشاوە. لەئاگری ئەم شەڕدا هەموومان لەگەڵ ئێوەداین.))

ئوم کلسوم بۆکۆکردنەوەی خەرجی شەڕ لەهەموو جیهانی عەرەب ئاهەنگی گۆرانی گوتنی رێکدەخستو پارەی کۆکراوەی پێشکەشی حکومەتی میسر دەکرد، زۆربەی میسرییەکان بەرێگاکانی جۆراوجۆری وەك رێکخستنەکان پارەیان بۆحکومەتی میسر کۆدەکردەوە، زۆر لەرێکخراوەکان تەنیا لەبواری پارە کۆکردنەوە بۆسوپا کاریان دەکرد. من وەك زۆربەی ئافرەتانیتر بەشێك لەزێرەکانی خۆم پێشکەشی کچەکانی خۆم کردنو ئەویترم بەخشییە سوپای میسر.

ئەنوەر لەبەیانییەوە تاکو نیوەی شەو لەگەڵ سەرانی حکومەت بەردەوام لەکۆبوونەوە دابوون، من تەنیا لەماڵەوە چاودێری منداڵەکانی خۆم دەکرد. هەرکاتێك چاوم پێدەکەوت دەمگوت:((بیردەکەیتەوە ئیسرائیل هێرش بکاتە سەر ئێمە؟))

جلوبەرگی سەربازی خۆی دەگۆڕین بەپەلە دەڕۆیشتەدەرەوەو دەیگوت:((جیهان لەوانەیە هەموو رووداوێك روبدەن.))

بەلآم من پشتراست بووم ئێمە لەلێواری شەڕداین. بڕیارمدا لەجیاتی ئەوەی دانیشمو بیربکەمەوە چی روودەدات. هێزی خۆم بۆئەم لایەنە تەرخان بکەم. نەمدەزانی ئەم بڕیاری ژیانی من بەتەواوی دەگۆڕێت.

پەیوەندیم بەتەواوی ئەم ئافرەتانەوەکرد کەهاوڕێی بووین، هەندێکیان هاوسەری بەرپرسو باڵیۆزەکانی حکومەتبوون جاران پێکەوە دادەنیشتینو لەناوەندەکانی کۆمەڵایەتی کاریان دەکرد داوام لێکردن:((باپێکەوە سەردانی نەخۆشخانەی حکومی کۆشکی ئەلعین بکەینو خوێن پێشکەش بکەین، بەم شێوەیە بەهێنانەوەی بریندارانی شەڕ خوێنی ئامادەمان دەبێت.)) داوام لەرۆژنامەکان کرد:((ئەگەر وێنەی ژنی بەرپرسانی حکومەت لەرۆژنامەکان چاپ بکرێت کەخوێن دەبەخشن دەبێتە هاندەرێك کەسانیتر چاو لەئێمە بکەن.)) ئەوەی چاوەڕێمان دەکرد روویدا.

دواتر سەردانی ناوەندی مانگی سوورم کردو پێم راگەیاندن من دەمەوێت ببم بەئەندام لەرێکخراوی ئێوە بۆئەوەی هەرکاتێك شەڕ دەستی پێکرد هاوکاری ئێوە بکەم. لەشەڕی رابردوو چونکە دووگیانبووم نەمتوانی ببم بەئەندام لەمانگی سوور. بەلأم ئێستا ئامادەم.

پرسیاریان لەمن دەکرد:((خاتوو سادات، داوامان لێدەکەیت چی بکەین؟)) ئەمجارەیان نۆرەی من بوو سەرم سوڕبێت ، هەرچۆنێك بێت شارەزاییان لەمن زیاتربوو.

پێشنیارم کرد:((پێکەوە راستگۆبین، لەجیاتی ئەوەی دانیشین‌و دەست لەدەست دابنێین‌و چاوەڕێی بکەین شەڕ چ کاتێك روودەدات‌و کاتی خۆمان بەدوای دەرمان‌و لۆکەو پارچە بۆئامادەکردنی جلوبەرگی نەخوشخانە بەهەدەر بدەین لەئێستاوە ئامادەکاری بکەین‌و بۆئەوکات ئامادەیی تەواومان هەبێت.)) دڵەڕاوکێ تەواوی بوونی داگیر کردم. هەموو ژنانی بەشدار لەیەکەم کۆبوونەوەی مانگی سوور گوتم:((پەیوەندی بەهەموو دۆست‌و هاوڕێیانی خۆتانەوە بکەن‌و بۆیان باس بکەن قارەمانانی ولأت ئێستا پێویستیان بەئێوە هەیە.))

بەم شێوەیە بۆماوەیەکی کورت لەشکرێکی ئافرەتانی خۆبەخش لەناو ناوەندی مانگی سوور ئامادەیی خۆیان دەربڕی، سەرەتا بەهەمان پارچە کەبوونی هەبوو لەناو ناوەندی مانگی سوور بۆبریندارەکان ئامادەکرا، کاتێك ئەم پارچەیە تەواوبوو رۆیشتین‌و پارچەمان لەبازار دەکڕی، بۆهەر قەرەوێڵەیەك دەستەیەك جلوبەرگی ئامادە بوونیان هەبوو، دەستمان بەپێویستییەکانیتر کرد، سابوون پێویستی حەمام، کتێبی قورئان بۆسەربازانی موسڵمان کتێبی پیرۆز بۆسەربازانی قبتی، بەردەوام لەناو نەخوشخانەکانمان دابەش دەکردن تاکو بەتەواوی ئامادەیی خۆیان نیشان بدەن.

داوام لەبەرێوەبەری نەخوشخانەکان دەکرد چیتان پێویستە تاکو بۆتان ئامادە بکەین؟

هەندێك داوای پێخەویان دەکرد، هەندێك لەپێویستییەکانی جۆراوجۆریان دەکرد. هەرکاتێك پێویستییەك کەلەماڵەکانی ئێمە زیادەبوو بۆنەخوشخانەکانمان رەوانە دەکرد، بۆکڕین پارەمان کۆدەکردەوە. زۆرجار بۆئەم پرۆژەیە بیرم دەکردەوە بۆچی داوای دەرفەتم لەئەنوەر نەکردووە. بەلأم هیچ دەرفەتێك لەبەردەستدا نەبوو ژنانی کەبۆ یەکەمجار لەدەرەوەی ماڵی خۆیان کاریان دەکرد ئەوەندە بەباوەڕەوە کاریان دەکرد کەچاوەڕوانی زیاتریان لێدەکرا.

کاتێك دەمان بینی نەخوشخانەکان چۆن بەگەرمی پێشوازی لەکاری ئێمە دەکەن زیاتر دڵم خۆش دەبوو. کاتێك بۆیەکەمجار دەیان بینی ژنانی خاوەن هاوسەری چینی ناوەند بەسۆزو

خۆشەویستی ئامادەن كاربكەن‌و خزمەت بەولاَتی خۆیان بكەن، رووبەروو دەبوونەوە، رێزێكی زیاتر بۆژنان دروست دەبوو من شانازیم بە هەلومەرجی هاوكاریی‌و هاوبیری دەكرد. ئەگەر شەڕ روویدەدا، ژنانی میسر، روحێكی شۆڕشگێڕی ئامادەبوون لەتەنیشت پیاوانی هاو نیشتیمانی خۆیان‌و ئامادەی هاوكاری بوون.

لەم گیرۆدە بوونە، سیاسییەكانی تەواوی جیهان بۆچارەسەركردنی ئەم كێشەیە بەرێگای ئاشتی رۆژهەلاَتی ناوەڕاست لەهەولَدانی بەردەوامی خۆیان دابوون. هەرچەند زیاتر لەولاَتی هێرشبەری ئیسرائیل پالَپەستۆ دەخرایە سەر جەمالَ عەبدولَناسر. یەكێتیی سۆڤیەت ناسریان ئاگادار دەكرد نابێت تەنیا پێداگری لەسەر شەڕ بكات بۆئەوەی نەتوانن میسر گیرۆدەی شەڕی سەربازی بكەن. چونكە وەزیری دەرەوەی ئەمەریكا بەردەوام پالَپەستۆی دەخستە سەر میسرو ولاَتانی عەرەبی. نیوەندگیری تەنیا لایەنێكبوو كەناسر بەردەوام بەدوایدا دەگەڕا، زۆر ئاسایی بوو كاتێك یەكێك لەبەرپرسانی وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریكا ناسر پشتراست دەكاتەوە كەئیسرائیل بەدوای چارسەرێكی سیاسی دەگەڕێت، خەیالَی زیاتر ئاسوودە دەبێت. لەهەمان رۆژ مۆشەدایان، وەزیری بەرگری ئیسرائیل، لەكۆنفرانسێكی رۆژنامەوانی لەقودس پەیامێكی درۆزنانەی هیوابەخشی دایە رۆژنامەكان. كاتێك پرسیاری كۆبوونەوەی سیاسی لێدەكریَ مۆشەدایان لەوەلاَمدا گوتی:((بەختی ئێمە بۆناو مەیدانی شەڕ، كاردانەوەی سەربازی درەنگ كەوتووە... بەلاَم بۆئەنجام وەرگرتن لەسەر چارەسەری سیاسی لەرێگای دیپلۆماسی، كاتی زۆرماوە.))

دایان درۆی دەكرد. دوو رۆژی دواتر. بەیانی رۆژی پێنجی حوزەیرانی ١٩٦٧، دروست دوای ئەوەی مندالَەكانی خۆم رەوانەی قوتابخانە كردن، ئاسمان تەقییەوە. هێرشی ئاسمانی فرۆكەكانی ئیسرائیل بۆسەر قاهیرە دەستی پێكرد. خەلَكانێك كەلەناو ترافیك گیریان خواردبوو سەرسوڕماوبوون، لەجادەی ئەهرام دەنگی فرۆكەكان گوێچكەی خەلَكیان كەڕ دەكرد، مالَەكانی ئێمە لەبەر بۆمبای فرۆكەكان دەلەرزی، دەرگاو پەنجەرەكان هەریەكەو بۆخۆی ئاوازێكی دەگوت‌و لەهاتنەخوارەوە نزیك دەبوون. من هەستم دەكرد هێزەكانی ئێمە سەرقالَی دوورخستنەوەی هێزەكانی داگیركارانن. بەرەو ئەنوەر رۆیشتم كەلەسەر تەختی نووستن سەرقالَی خوێندنەوەی رۆژنامەكانبوو.

گوتم:((خۆیەتی، ئەنوەر شەڕ دەستی پێكرد! وایە؟))

بەزەردەخەنە سەرقاڵی پۆشینی جلوبەرگەکانی سەربازی خۆیبوو، گوتی:((وا دێتە بەرچاو.)) بەباوەڕێکی تەواو گوتی:((ئەمجارەیان وانەیەك بەئیسرائیل دەدەین کەهیچ کاتێك لەیادی نەکەن.))

دەبێت سەردانی قوتابخانەم کردبا بۆگەڕاندنەوەی منداڵەکان. ئەنوەر گوتی: ((نیگەرانی منداڵەکان نەبیت شوێنیان ئەمنو پارێزراوە.)) بەلآم من دەموویست کاتێك کەسەردانی ناوەندی مانگی سوور دەکەم منداڵەکان لەماڵەکەی خۆیاندابن لەژێر چاودێری دایكو خوشکم. من دەمزانی ئەگەر لەمنداڵەکانی خۆم پشتراست نەبم ناتوانن بەخەیاڵێکی ئاسوودەتر کار بکەم. دەبێت بەپەلە رۆیشتم بەرەوەو ئۆتۆمبێلّ پرسیارم لەخزمەتکار دەکرد:((دەزانی شوفێرم لەچ شوێنێکە؟)) گوتی بەدوای کارێکدا رۆیشت بەناچاری خۆم شوفێریم کرد. رێگای زقاریك زۆر ترسناکبوو هەموو جۆرە ئۆتۆمبێلّو پایسکلسوارو خەلّکی پیادە رێگایان لیّ گیرابوو. هەموو کەسێك هەوڵی بۆخۆرزگارکردن بۆشوێنێك دەدا، دایكو باوکیتر بوونیان هەبوو کەبەدوای منداڵەکانی خۆیان بەرەو قوتابخانەکان دەرۆیشتن. نەمتوانی لەقوتابخانە نزیك بم چونکە رێگاکان گیرابوون. دەنگی مەترسی ئاگادار کردنەوەی فرۆکەکان ترسی هەموومانی زیاتر دەکرد. دوکیلّ بەرەو ئاسمان دەرۆیشت. نەمدەزانی بەزیندوویی دەمێنمەوە یان دەتوانم منداڵەکانی خۆم ببینم. چاوی هەمووخەلّکی ترس لێدراو بۆ هەرلایەك دەرۆیشتن لەئاسمانبوو. بەبوونی ئەم هەموو ئالۆزییە کەبوونی هەبوو بەلآم کاتێك دەمانزانی هێزەکانی ئاسمانی ئێمە لەئاسمانی قاهیرە دژی هێزی هێرشبەر ئیسرائیل لەشەڕی ئاسمانی خۆیاندان ، شانازیمان بەخۆمانەوە دەکرد.

رادیۆیی ئۆتۆمبێلّم پێکردو دەنگم بەرزکردەوە تاکو بتوانم لەناو ئەم هەموو دەنگەی خەلّك ئاگاداری بارودۆخی کەلە ئارادابوو گوێبیستی هەواڵەکانبم. بێژەری رادیوی دەرەوەی سنوورەکان کەلەقاهیرە بلأودەکرایەوە بەناوی (دەنگی عەرەب) راگەیاندنی حکومەتی دەخوێندەوەو هاواری دەکرد:((دلأوەرانی هێزی ئاسمانی میسر سەدو پەنجا فرۆکەی ئیسرائیلیان خستنەخوارەوە!)) من وەك زۆر کەسیتر کەلەقاوەخانەو کافیتریاکان لەدەوری رادیۆ کۆببوونەوە هەستم خرۆشابوو، دوای ئەم هەواڵە کاتێك دەنگی مەترسی هێرشی ئاسمانی کەبلأو دەکرایەوە زۆر خەلّك خۆیان نەدەشاردەوە، بەپێچەوانە لەناو شەقامەکان سەمایان دەکرد. ئەوکات هیچ یەك لەئێمە نەماندەزانی بێژەری رادیو، ئەحمەد سەعید کەهەواڵەکانو

راگەیاندنەکانی حکومەتی لەسەر سەرکەوتنەکان دەخوێندنەوە لەم ڕێگایە ئەوەندە بەناوبانگ دەکەوێت.

منداڵەکانم بردن بۆماڵی خوشکمو راست ڕۆیشتم بۆنەخوشخانە، بەسەر بەرزی ڕۆیشتم بۆناو سێ سەد خۆبەش سەلاّوم لەهەموویان کردو گوتم خوشکان شەڕ دەستی پێکردو ئێمەش ئامادەین.

ئەمانەم بۆسەر چەند دەستەو گروپ دابەشکردنو بەرپرسێك بۆدەستەو گروپەکان کەدابەشی سەرنەخوشخانەکانی سەربازی بکرێن تاکو چاوەڕێی بریندارەکانبن. لەهەمان ئێوارە سەردانی هەموو نەخوشخانەکانی سەربازیم کردو ئەم خۆبەخشانەم بەبەرێوەبەری نەخوشخانە دەدانە ناساندن. بەردەوام دەنگی فرۆکەکانو هێزەکانی دژە ئاسمانی بەردەوامبوو، ڕێژەی زیانەکان لەقاهیرە ئەوەندە زۆرنەبوو. کاتێك گەڕامەوە بۆماڵەکەم زۆرماندوو بەلاّم رازیبووم. گروپەکانی خۆبەخش لەشوێنەکانی خۆیان جێگیرکرابوون، هەواڵەکانی رادیو تاکو ئەوکات زۆر باشبوون.

پرسیارم لەمنداڵەکان کرد:((باوکتان لەچ شوێنەکە؟)) دەمویست بەهاوبەشی باسی سەرکەوتنەکانی ڕۆژ بکەین.

لوبنا گوتی:((لەئەیوانی ژوورەکەی دانیشتووە.))

رۆیشتم بۆسەرەوەو هاوارمکرد:((ئەنوەر نازانی چەند هەواڵێکی زۆر خۆشم هەیە. خۆبەخشەکان لەنەخوشخانەکان ئامادەن ئەگەر بریندارێك بگاتە نەخوشخانە هاوکاری بکەن.))

نەوەلاّمی دایەوە نەتەماشای کردم.

بەهەستەوە بەردەوام بووم:((ئەنوەر چرکەیەك کات بەفیڕۆ نادرێت ئەوەندە بەجوانی چاودێری سەربازانی بریندار دەکرێت کەتاکو ئێستا وێنەی نەبووە.))

دیسان وەك خۆی بێدەنگو تەماشای خاڵێکی نادیاری دەکرد.

نیگەرانبووم نەوەك دیسان گیرۆدەی نەخۆشی دڵی بێت. گوتم:((ئەنوەر چی بووە؟ هەلومەرجی درەونیت باشە؟))

لەئەنجامدا رووی تێکردمو گوتی:((زۆر خرابتر لەئەمەیان.)) هیچ کاتێك رووخساری بەم شێوەیە نەبوو. گوتی:((لەشەڕدا دۆڕاوین.))

لەشەڕدا دۆڕاوین؟ شەڕ ئێستا دەستی پێکردبوو هەموو راپۆرتەکان باس لەسەرکەوتن دەکەن بەباوەڕ نەکردنەوە گوتم:((هەڵە دەکەیت، ئەنوەر، تەماشای دەرەوە بکە بزانە خەڵك لەسەر

شەقامەکان چۆن هەڵدەپەڕن خەڵك دەستە دەستە بەبارهەڵگر بۆبەشداریکردن لەم سەرکەوتنە سەردانی قاهیرە دەکەن.))

بەشێوەیە تەماشای کردم کەخۆشی نایەوێت باوەڕ بکات، گوتی:((ئێستا من لەگەڵ جەماڵ عەبدولناسرو عامر لەکۆبۆنەوە دابووم. هەموو فرۆکەکانی ئێمە لەناوچوون. سەربازانی ئیسرائیل ئەلعریشیان داگیرکردووە. سەربازەکانی ئێمە هەڵدێن. ئەمەیان بۆمیسر کارەسات هەژمار دەکرێت.))

نەمدەتوانی ئەوەی گوێبیستی دەبم باوەڕ بکەم، لەهەمان ماوەی کورت کەرۆیشتم منداڵەکان لەقوتابخانە بگەڕێنمەوە لەشەڕدا دۆڕابووین ، تەنیا لەماوەی دووکاتژمێر. هێزەکانی ئیسرائیل بەهێرشێك بۆسەر میسر هەمووشتێکیان بەکۆتایی هێنابوو. عامر، وەزیری بەرگری، لەم کاتژمێرەی چارەنووس ساز، بۆبەسەرکردنەوەی ناوەندەکانی ئاسمانی، خۆی سواری فرۆکەیەك دەبێتو بڕیارێك دەر دەکات تاکو ئەوکاتەی کەفرۆکەی عامر لەئاسمان بێت نابێت هیچ موشەکێکی دژەفرۆکە بتەقێتەوە. کاتێك فرۆکەی عامر نیشتەوە. ئیسرائیل هەموو فرۆکەخانەکانی لەقاهیرە تاکو ئەسکەندەرییە بۆمباران کردبوون. هێزەکانی دژە ئاسمانی ئێمە کرابوونە ئامانجی فرۆکەکانی ئیسرائیل. زیانێکی زۆر بەفرۆکەخانەکانی ئێمە گەیشتبوو کەتاکو چەند هەفتەیەك رێگای بەهیچ فرۆکەیەك نەدەدا هەڵفڕن.

هاوکات، هێزەکانی پیادەی ئیسرائیل، بەخێرایی لەسنووری خۆیان تێپەڕ دەبن‌و دەگەن بەبیابانی سینا، زۆر لەیەکەکانی ئێمە تاکو ئەوکات لەیەمەن سەرقاڵی شەڕکردنبوون، هێزەکانی ئێمە لەبیابانی سینا دەرفەتی شەڕکردنیان نەبوو. تاکو ئەوکات لەقسەکانی ئەنوەر جەستەم پەکی کەوتبوو توانای جوڵانەوەم نەبوو. دەنگی خەڵك لەشەقامەکان بەرزبوو هەڵپەرکێیان بۆسەرکەوتن دەکردو دروشمی: ((شەڕدەکەین! شەڕدەکەین! تاکو کەسی کۆتایی شەڕدەکەین!))

هەستم دەکرد هێزو توانام نەماوە دواتر بەزەحمەت زمانم گەڕاو گوتم:((ئەنوەر بۆچی لەچ شوێنێك هەڵەیەك هەبوو؟))

تاکو ئەوکات بەسەرگەردانی دانیشتبوو گوتی:((نەخشەکانی عامر بۆشەڕکردن باش نەبوون، ئیسرائیلییەکان سەرقاڵیان کردبوو، هەمووشتێکیان لەناوبرد، ئێستا هیچ هێزێکی ئاسمانیمان نییە کەسەربازەکانی ئێمە لەبیابانی سینا بپارێزێت هەموویان پێکەوە دەکوژرێن.))

وەك رەخنەگرتن گوتم: ((رادیو...))

ئەنوەر گوتی:((هەموو پروپاگەندەیە، ناسر نایەوێت بەهەواڵەکانی راستەقینە روحی خەڵك وێران بکات، تۆش نابێت ئەمەیان بکەیت.))

لەئەیوان راوەستامو تەماشای ئەنوەرم دەکرد، هەوڵمدا ئەوەی کەباسی دەکات تێگەیشتنی زیاترم بۆهەبێت.

بەئارامی رووی لێ وەرگێڕامو تەماشای حەوشەکەی ئێمەی دەکرد. زیاتر رووی قسەی لەخۆیبوو تاکو من:((ئیتر تەواوبوو.))

کاتێك بۆئامادەکردنی خواردنی منداڵان دەڕۆیشت بۆخوارەوەو ئەنوەرم بەجێهێشت ئاگاداری دەنگی تەقینەوەکان دەبووم کەهاوشێوەی دەنگەکانی بەیانیبوو، دەنگی فرۆکەکانی ئێمە نەبوون دەنگی فرۆکەکانی ئیسرائیل بوون کەفرۆکەخانەی رۆژئاوای قاهیرەیان بۆمباران دەکرد.

فرۆکەکانی ئیسرائیل بۆماوەی چوار رۆژ بەسەر ئاسمانی قاهیرە دەسوڕانەوە. زۆرجار بۆمبەکانی خۆیان خاڵی دەکردن بەڵام هەمووکاتێك بەم شێوەیە بەردەوام نەدەبوون. رۆژ لەدوای رۆژ ئاستی هەڵفڕینیان کەمتر دەبوو کاتێك بەخێرایی بەسەر قاهیرەدا دەڕۆیشتن پەنجەرەکانیان دەشکانو هەندێك لەماڵەکان بەناچاری تەختەداریان لەپەنجەرەی خانووی خۆیاندابوون، ئەوانەی کەپارەیان نەبوو بەلەسقە رێگایان لەشکانی شوشەی پەنجەرەکان دەگرت، هەموو خەڵك سەرگەردانبوون کەخەڵك لەتاریکایی بەدەوری چرایەکی کز کۆدەبوونەوە.

ئیسرائیل بۆئەوەی زیاتر ترس بخاتە ناو دڵی ئێمە سوودی لەپروپاگەندەکانی پێشووی خۆی وەردەگرت. پروپاگەندەکانی کەجاسوسەکانی ئیسرائیل بڵاویان دەکردەوە بەخێرایی لەناو قاهیرە دەگەیشتنە خەڵك:((رۆژی دواتر هێرش دەکرێتە سەر هلیوپۆلیس)) رۆژی هەینی معادیو زۆربەی خەڵکی قاهیرە منداڵەکانی خۆیان بۆهەموو شوێنێك دەبردن کەنەبن قوربانی دەستی ئیسرائیلو زۆرجار تەنیا بۆترساندنی خەڵکبوو. هیچ کردەوەی بەدوای خۆیدا نەدەهێنا.

ئیسرائیل دەیزانی ئەگەر هێرشی بەردەوام بکاتە سەر قاهیرە بێگومان لەبەرامبەردا هێرش دەکەینە سەر تل ئاویو. بەڵام پروپاگەندەی بەردەوام هەڵفڕینی فرۆکەکانی ئیسرائیل بەسەر قاهیرە نیشانەیەکبوو کەئێمە بەردەوام لەژێر بۆمبارانی فرۆکەکانی دوژمنداین. دەیانوویست نیشانی ئێمە بدەن کەئێوە لەژێر رەحمەتی فرۆکەکانی ئێمەدان. لەماڵی ئێمە کچی بچوکم جیهان هەرکاتێك دەنگی فرۆکەیەك دەهات دەستی بەهاوارکردن دەکرد. دواتر ناچاربووین

لەگەڵ دایکو خوشکمو‌کچی ڕەوانەی میت ئەبونەلکۆم بکەین. چونکە شوێنەکە تاکو ڕادەیەك ئارامبوو، ئەوکات ناچار نەدەبووم لەنەخوشخانە نیگەرانی ئەمانەبم.

ژنانی خۆبەخش بەردەوام بۆیان باسدەکردم ئەمڕۆ فڕۆکەکانی ئێمە هەشتا فڕۆکەی دوژمن خرانەخوارەوە! لەشوێنەکیتر پەنجا زیاتر! خۆم بێدەنگ کردو بەزەردەخەنە وەڵامی هەموویانم دەدایەوە. دوو ڕۆژی دواتر کاروانێکیتری برینداره‌کان گەیشت، گوێگرتن لەسەرکەوتنی بێبنەما لەڕادیو. تاکو ئەوکات حکومەت بانگێشەی ئەوەی دەکرد کەپیرۆزو سەرکەوتووە لەمەیدانی شەڕدا.

کاتێك لەرێگای ڕاگەیاندنی دەرەوە، وەك دەنگی ئەمەریکاو بی بی سی ئاشکرابوو. میسر گیرۆدەی بێدەنگیبوو، شادی خەڵك شوێنی خۆی گۆڕی لەگەڵ سەرشۆڕیو پەریشانی. دایکو باوکی برینداره‌کان لەنەخوشخانە بۆیان باسدەکردم ئیتر هیچ کاتێك باوەڕ بەقسەکانی حکومەت ناکەین. یەکێك لەبرینداره‌کانی سەرەتایی بۆی باسکردم: ((یەکەی ئێمە تەنیا دوانزدە کاتژمێر پێش دەستپێکی شەڕ ڕەوانەی بیابانی سیناکرابوو، دواتر لەبەرەبەیان فڕۆکەکانی ئیسرائیل بەبێ ئەوەی ئێمە ئاگادار بکرینەوە لەهێرشی ئاسمانی دوژمن، دوژمن هێرشی خۆیان بۆسەر ئێمە دەستپێکرد. ئێمە نەچەکی باشو نەهیچ ئامێرێکی وەك بێتەڵ بۆپەیوەندیکردن نەبوو. ئەم سەربازانە دەیانزانی نەخشەی شەڕکردنیان هەڵەی زۆری تێدایە تاکو بگاتە بەرپرسێکی بەرز. یەکێك لەسەربازەکانیتر کەدەستێکی پەڕیبوو بەگریان دەیگوت: ((ئێمە دەرفەتی ئەوەمان نەبوو تەنیا تەقەیەکی بچوك بکەین. ئێمە ئامادەی گیان فیدایی بووین، بەڵام هیچ شەڕێك لەئارادا نەبوو. کاتێك ویستمان بۆدواوە بگەڕینەوە هێرشکرایە سەرئێمە.))

لەهەشتی حوزەیران، ڕۆژی دوای هێرشی یەکەم، کاتێك لەگەڵ یەکێك لەهاوڕیانی خۆم لەنەخوشخانە دەگەڕامەوە، جارێکیتر دەنگی ئاگادارکردنەوەی هێرشی ئاسمانی بڵاو کرایەوە، بەخێرایی ڕۆیشتین پەنامانبرد بۆحەشارگەی هاوڕێمان لەماڵەکەیدا تاکو بەیانی لەهەمان شوێن ماینەوە. هەمان شەو خراپترین ساتەکانی ژیانی من بوون، لەتاریکییەکی ئەنگوستەچاو دانیشتبووین، دەنگی تەقینەوە ژێرپێی ئێمەی دەلەرزاند. بەتەنیا دەمرم دوور لەمنداڵەکانم لەگوندو ئەنوەر هاوڕێیەتی ناسری دەکرد؟

من هیچ ترسێکم لەتاریکایی شەو نەبوو، وانەکانی دایکم لەناو حەوشەی ماڵەکەمان بەبیرم دەهاتنەوە. بەڵام خەڵکانیتر ترسیان زۆربوو. هەبوو لەتاریکایی دەگریاو هاواری دەکرد.

خەڵکانێك هەبوون منداڵەکانی خۆیان ئارام دەکردنەوە. کەش‌و هەوا بەتەواوی پەریشان‌و بێدەرمانبوو. دیمەنەکان وەك فیلم بوون. بەڵام ئەمجارەیان ئەکتەرەکان خۆمانبووین. تاکو ئەوکات گوێم لەرادیو دەگرت کەلەناو گێرفانم دابوو بەردەوام پێداگری دەکرد کەئێمە سەرکەوتووی مەیدانی شەڕین.

ئەمەیان زیاتر لەڕادەی خۆیبوو. ناسر ئیتر نەیتوانی لایەنی راستەقینە لەخەڵك بشارێتەوە. رۆژی دواتر ئەحمەد سەعید لەرادیوی قاهیرە رایگەیاند شەڕ وەستاوە ئەم شەو ناسر وتارێك پێشکەشی خەڵك دەکات. کاتژمێر حەوتی ئێوارە نوێی حوزەیران، ناسر بەروخسارێکی هاوشێوەی نەخۆشەکان لەبەر پاڵەپەستۆکانی سەرمێشکی، لەتەلەفزیون‌و رادیو رایگەیاند میسر بەناچاری پاشەکشەی کردووەو ئەم شەرمەزارییە دەکەوێتە سەرشانی من. فرمێسك لەچاوەکانیدا بوون‌و دەنگی دەگۆڕاو دەڵەرزی. من لەکاتی بینینی وتاری سەرۆککۆمار لەنەخوشخانەبووم دەستم بەگریان کرد، توانای بینینی سەرۆککۆمارم بەم شێوەیە نەبوو. پیاوێکی بوێرو ئازا بەم شێوە تێکشکاوە بێتە بەرچاو. لەهەمان کات کەسێکی زۆر لەخۆبایی‌و لەسەرخۆبوو. بەڵام ئەوەی دواتر باسیکرد زیاتر ناخی خەڵکی هەژاند.

گوتی:((بڕیارمداوە بەشێوەیەکی گشتی بۆهەتا هەتایە دەست لەهەموو کاروبارێکی حکومی‌و سیاسی هەڵگرم. دەمەوێت بگەرێمەوە بۆناو خەڵك‌و وەك هاوڵاتییەکی ئاسایی ئەرکی خۆم جێبەجێ بکەم.))

وردبووم. جەماڵ عەبدوڵناسر دەست لەکارکردن هەڵگرێت؟ مافی ئەوەی نەبوو، ناسر رێبەرێکبوو خەڵك زیاتر لەهەموکاتێك پێویسی بەرێبەرایەتی هەبوو، بەڵێ، راستە ئێمە شکابووین، بەڵام پێویستیمان بەناسربوو، تاکو تێکشکانی خۆمان راست بکەینەوە، بەبێ ناسر نەماندەتوانی، ناسر بۆمیسر هەمووشتێك بوو. زۆر نەمابوو دڵم لەلێدان بکەوێت. هەموو کەسێك بەبێدەنگبوون.

وتاری سەرۆککۆمار کۆتایی نەهاتبوو کەهاواری خەڵك لەسەر شەقامەکان دەهات: ((ناسر، تەنیا ناسر!))، ((ناسر! ناسر!))

لەپەنجەرەی نەخوشخانە دەنگی هەزاران کەس دەهات‌و دواتر دەمانتوانی ببینین هەندێکیان بەجلوبەرگی خەوتن لەماڵەکانیان دەهاتنەدەرەوە بەرەو تەلەفزیون‌و رادیوی قاهیرە

دەڕۆیشتن، ئەم خەڵکانە بەبیرکردنەوەی خۆیان ئەگەر ڕێگایان لەبلاّوکردنەوەی وتاری ناسر لەتەلەفزیون‌و رادیو دەگرت دەیانتوانی ڕێگا لەناسر بگرن

((ناسر! ناسر!))

ڕۆیشتم کەبە تەلەفۆن پەیوەندی بەئەنوەر بکەم. لەبەر ئەنوەر دەپاڕامەوە ئەنوەر ڕێگای پێنەدەن بۆبەردەوامی پێویستیمان بەناسر هەیە، ئەرکی سەرۆککۆماری ولاّتە ئەم تێکشکانە قەرەبۆ بکاتەوە. داوا لەپەرلەمان بکە دەست لەکارکێشانەوەی قبووڵ نەکەن!))

ئەنوەر گوتی:((جیهان، ئارامی خۆت بپارێزە، ئەندامانی پەرلەمان پێشتر دەنگیانداوە کەبەهیچ شێوەیەك دەست لەکارکێشانەوەی قبووڵ نەکەن!))

بەلاّم دەیانتوانی بەهەمووشێوەیەك ڕێگا لەجەماڵ عەبدوڵناسر بگرن؟

خۆپیشاندان بۆچەندین کاتژمێر لەناو قاهیرە بەردەوامی هەبوو. خۆپیشاندانەکان نزیکەی دەهەزار کەس دەبوون‌و هەموویان پێکەوە هاواریان دەکرد ناسر ناسر ئێمە لەگەڵ تۆداین‌و تێکشکانی خۆمان بەسەرکەوتن چارەسەر دەکەین. لەهەمان کات دەنگی ئاگادارکردنەوەی هاتنی فڕۆکەکانی دوژمن دەهات بەلاّم کەس ئاگای لەم لایەنە نەبوو. بەدرێژایی شەو کەمن لەڕێگای تەلەفۆن پەیوەندیم بەخۆبەخشەکانەوە دەکرد زیاتر لەنیو ملیون کەس لەبەر دەرگای ماڵی ناسر لە(مەنشیەت ئەلبەکری) کۆبوونەوە.

من لەکاتی پەیوەندیکردم بەردەوام پێداگریم دەکرد دەبێت هەموومان پشتیوانی لەسەرۆککۆمار بکەین. دەبێت داوای لێی بکەین نابێت دەست لەکار بکێشێتەوەو بەردەوام بێت. تەلەفۆن بۆهاوڕێیانی خۆتان بکەن بەشداری لەخۆپیشاندانی بەیانی بکەن.

شوێنی خۆپیشاندانمان دیاریکرد، بەیانی ڕۆژی دواتر من ڕێبەرایەتی خۆپیشاندانی پێنج سەد ئافرەتم گرتەدەست بەجلوبەرگی سپی نەخوشخانە، لەپردی جەلاعەو تەحریر بەرەو بینایی پەرلەمان ڕۆیشتین. من هاوارم دەکرد:((ناسر بمێنەوە! ناسر بمێنەوە!)) ژنەکانیتر بەدوای مندا دووبارەیان دەکردەوە. هەزاران خەڵك لەسەر شەقامەکان لەئێمە کۆبوونەوە هەموویان پێکەوە هاواریان دەکرد:((ناسر، ناسر بەتەنیا جیمان مەهێڵە، ئێمە پێویستیمان بەتۆ هەیە.)) لەهەموو لایەك خەڵك بەرەو بینایی پەرلەمان دەڕۆیشتن پۆلیس توانای کۆنترۆڵکردنی خەڵکی نەبوو.

دەرخستنی ئەم هەموو هەستە بۆئێمە خۆشەویستییەکی خودایی بوو. چونکە ئەگەر بۆماوەی چەند کاتژمێرێك بێت توانیمان تێکشکانی خۆمان لەیاد بکەین، ئاگاداری خۆم دەبووم کەپێدەکەنم، بەجۆرێك پێدەکەنیم وەك ئەوەبوو تێکشکانی ئێمە گۆڕابوو بۆشادیو خۆشەویستی. لەم هەلومەرجەدا بەرەوە بینایی پەرلەمان دەڕۆیشتم کەسێك داوای لێکردم بەرەو لای بڕۆم چونکە کەسێك بێهۆش کەوتبوو. من لێدانێکی خێرا لەروخساری بەهۆشم هێنایەوە. کاتێك خۆپیشاندان گەیشتە بەردەرگای هوتێلێ هیلتۆن لەشەقامی کۆشکی ئەلعین گەیشتینە ئۆتۆمبێلەکانی پۆلیس کەئەئۆتۆمبێلەکانی ئاوپڕژێن لەبەرامبەر ئێمە وەستابوون نەیاندەتوانی کۆنترۆڵی خەلك بکەن وردە وردە کارەکان دژوارتر دەبوون بەرەو ئاژاوە. پۆلیس دەبێت کارێك بکات، پۆلیس بەئاو پاشەکشەی بەئێمەکرد، دروست لەتەنیشت من پرچی ناسروشتی کەسێك ئاو لەگەلێ خۆیدا برد. کاتێك بەبێ هۆ بەدوای هەمان پرچی ناسروشتی دەگەڕاین لەبەر پێکەنینی زۆر فرمێسك لەچاوەکانم دەهاتنەخوارەوە. کاتێك گەڕامەوە بۆماڵی خۆم هەموو جلوبەرگەکانم ئاویان لەبەر دەڕۆیشتو بەتەواوی تەر هەڵگەڕابووم. بەهەمام جلوبەرگ لەچێشتخانەی ماڵەوە دانیشتمو چاوەڕوانی دەنگوباسی رادیوم دەکرد، دوای ماوەیەکی کورت گوێبیستی هەواڵێکبووم کەهیوام بۆدەخواست، ناسر بڕیاریدا بوو لەپۆستی سەرۆککۆمار بمێنێتەوە، نامەی سوپاسگوزاری لەپشتیوانی خەلك لەلایەن ئەنوەر خوێندرایەوە.

من گوێبیست دەبووم سەرەتا دەنگی خەلك لەسەر شەقامەکان بەهلهلە دەستی پێکردو دواتر گۆڕا بۆسرووود. بەلام تەمەنی ئەم شادیانە زۆر کورتبوو، دواتر بۆمان ئاشکرا دەبووم چیمان لەدەست رۆیشتووە. قودس، پیرۆزترین شوێنی موسڵمانان دوای مەککەو مەدینە کەتبوو دەست ئیسرائیل. بیابانی سینا بەرزایەکانی جولان لەسووریاو لێوارەکانی رۆژئاوای رووباری ئۆردن هەموویان گەتبوونە دەست ئیسرائیل. لەشەڕی شەش رۆژەدا ئیسرائیل زیاتر لەسێ بەرامبەر لەخاکی پێش شەڕ داگیری کردبوو.

زیاتر لەپانزدە هەزار سەربازی میسری کوژران‌و زیاتریش برینداربوون، ملیونێك فەلەستینی لەسەر خاکی داگیرکراو دەژیان سەد هەزار فەلەستینی ئاواربوون. بەم شێوەیە ئیسرائیل ئامادە نەبوو دانپێدانان بکات کەولاتی فەلەستین وێرانبووە یان دانپێدانان بکات میللەتێك بەناوی فەلەستین بوونی هەیە. گوڵدا مایەر، کرابوو سەرۆك وەزیری ئیسرائیل، ماوەیەك دوای کۆتایی هاتنی شەڕ کەبەشێوەیەکی بەربلاو لەرۆژنامەکانی ئێمە رەنگدانەوەی هەبوو، رایگەیاند:((شتێك

بەناوی خەڵکی فەلەستین بوونی نییە.)) چۆن دەیتوانی ئەوەندە بێبەزەیانە خەڵکانێك بەنەبوون بزانێت کەهەزاران ساڵ بوونیان هەبوو؟ ئیسرائیل بەداگیرکردنی خاکی خەڵك دەبێت خاوەن وڵات. بەهەمان شێوە ئەوروپا کەیەهوودییەکانی ئازار دابوو ئێستا هەمان یەهوودی خەڵکی فەلەستین ئازار دەدەن.

لەسەرتاسەری میسر ئەوەی کەخەڵك هەستی پێدەکرد تێکشکان‌و شەرمەزارییبوو. چۆن ئەم رووداوە روویدا؟ جاری سێیەم بوو لەدەستی ئیسرائیل گیرۆدەی تێکشکان بووین، بەڵام تێکشکانی کۆتایی خراپترین بوو. لەشەڕی ١٩٥٦، سەر نەکەوتن لەبەرامبەر هێزەکانی بریتانیاو فەرەنساو ئیسرائیل چاوەڕوانکرابوو. بەڵام ئەمجارەیان هیچ بیانوویەك بۆ تێکشان نەبوو، دەردو ژانی ئەم تێکشکانە رۆژ لەدوای رۆژ قووڵتر دەبوو. ئۆقرەگرتن لەبەرامبەری زۆر دژواربوو.

هەمووکەسێك یەکتریان تاوانبار دەکرد: رێبەرایەتی جەماڵ عەبدولناسر بەنامەی هەڵەی عامر وەزیری بەرگری‌و ژنەراڵەکانی بەتاوانبار دەزانین کەنیانتوانی بەرگری بکەن. زۆرجار سەربازەکان تاوانبار دەکران کەنەیان دەتوانی شەڕبکەن. سەربازەکان هەمووشتێکیان بۆچەکی رووسیا دەگەڕاندەوە کەوەك چەکی ئەمەریکی دەستی ئیسرائیل بەتوانا نەبوو، کەرامەتی هەموو سوپا تێکشکابوو. خەڵك دژی هەموو کەسێك بەجلوبەرگی سەربازی قسەی ناشیرینی ئاراستە دەکردن:((سەربازە هەڵاتووەکان، بۆچی لەشەڕدا سەرکەوتوو نەبوون؟)) سەربازەکان تاکو ماوەیەك نەیاندەتوانی بەجلوبەرگی سەربازی بێنە دەرەوە. وەستانی ئۆتۆمبێلەکانی سەربازی لەبازاردا زۆر کەمتر لەجاران بەرچاو دەکەوتن، ئەفسەرانی سوپا زیاتر لەناو ئۆتۆمبێلەکانی ئاسایی هەستیان بەئارامی دەکرد. کەرامەتی ئێمە شکابوو. هەموومان هەستمان بەبرینداری دەکرد.

شەڕ میسری گیرۆدەی کێشەی دارایی کردەوە، دوو سەرچاوەی سەرکی ئابووریمان لەدەست رۆیشتبوون: بیرەکانی نەفت لەبیابانی سیناو نۆکەندی سوئێز، بەدرێژایی شەڕ بەکشتییەکانی تێکشکاو گیرابوو، لایەنی گشتوگوزار لەبەر بەردەوامی شەڕو نائارامی رووخابوو. سعودیاو کویت‌و لیبیا وەك هاودەردی کەهێرش کراوتە سەر ئێمە ئامادەیی خۆیان دەربڕی ساڵانە ٩٥ ملیون لیرەی میسر هاوکاری ئێمە بکەن. بەڵام لەسێ ساڵی دواتر یەك لەسەرچواری بودجەی

گشتی بۆكڕینی چەك تەرخانكراو خزمەتگوزاری پێویستی ڕۆژانەی خەڵكبوون بەتەواوی لاوازبوون، پەریشانی خەڵك زیاتر لەجاران دەستی پێكرد.

بنەمای ئیمانداری ئێمەی موسڵمانان كەوتبوو بەرشكو گومان. زۆر بابەت لەرۆژنامەكان بلاّو دەكرانەوە كەنووسەران پێداگریان دەكرد هۆكاری سەركەوتنی جولەكە لەشەڕدا دەگەڕێتەوە بۆبەهێزی ئیمانیان، لەكاتێكدا ئێمە لەرێگای خودا دوور كەوتینەتەوە. ئامادەبوونی خەڵك لەناو مزگەوتەكان ٦٠٠٪ زیاتربوو. ڕۆژانی هەینی هەمووشوێنەكی ئایینی پڕدەبوو لەخەڵك. ڕۆژانی یەكشەم كڵێساكان جمەیان دەهات كەساڵیانی ساڵبوو بەم شێوە نەبوو. ڕۆژانە پۆشینی جلوبەرگی ئیسلامی پیاوانو ئافرەتان لەناو شەقامەكان زیاتردەبوو. زیاتر لەمانگێك مەسیحییەكانی قبتی تارمایی حەزرەتی مەریم (د.خ) دەبینن لەسەر یەكێك لەكڵێساكانی شار كەزۆربەی مەسیحییەكان هاتووچۆی ئەم شوێنەیان دەكرد. پیاوانی ئایینی كڵێسا بەم شێوەیە لێكدانەوەیان بۆكرد كە مەریم زانیوویەتی خەڵكی میسر ناتوانن سەردانی قودسی پیرۆز بكەن بۆدیاری خۆی هاتووە بۆدیداری خەڵكی میسر. ئەم پەیامی سەردێری بەناوبانگترین ڕۆژنامەی میسری ئەهرامی پڕكردبوو، ئەم ڕۆژنامەیە زۆرترین خوێنەری هەبوو.

خوپیشاندان دەستی پێكرد كار گەیشتە شوێنێك كەبۆمب فڕەبدرێنە ناو ناوەندی كتێبخانەی هەواڵگەری ئەمەریكا. چونكە هەمووكەسێك دەیانزانی ئەمەریكا جگە لەپێدانی چەكی پێشكەوتوو بۆئیسرائیل لەلایەنی هەواڵگەری بەتەواوی هاوكاری ئیسرائیلی كرد. ئیسرائیل بەهاوكاری ئەمەریكا هەموو ئامانجەكانی ئێمەیان دەپێكا لەرێگاكانی جۆراوجۆر بڕیاری بۆسوپای ئێمە لەبیابانی سینا دەردەكرد كەبۆئەم شوێنانە جوڵە بەهێزەكان بكەینو ئیسرائیل لەهەموو جولەیەكی هێزەكانی میسر ئاگادار دەكرایەوە كەئەم هێزانە بكرێنە ئامانج یان بۆیان لەكەمیندابن.

لەهەفتەكانی داهاتوو شەپۆڵی برینداركان دەگەیشتنە ناو نەخۆشخانەكان دەردی ئەمانە دەردی من بوو. ئەنوەر زۆر لەئازاردابوو چونكە هیچ دەورێكی لەنەخشەی سەربازیدا نەبوو، وەك بەرپرسێكی حكومەت هەستی بەبەرپرسیارەتی تێكشكان دەكرد. من لەناو نەخۆشخانەكان لەگەڵ دەردو ژانی خۆم لەشەڕدابووم، بەلاّم كاردانەوەی ئەنوەر پێچەوانەبوو، خۆی بەرەو ئەمان دەبرد. هەمووكاتێك كەلە نەخۆشخانەكان دەگەڕامەوە پرسیارم لەچێشت لێنەر دەكرد:((ئەمڕۆ جەنابی سادات ڕۆیشتووە بۆدەرەوە؟)) وەلاّمی هەمووكاتێك نەرێنیبوو.

لەشێوازو ئەخلاقو بیرکردنەوەی ئەنوەر راهاتبووم هەمووکاتێك ئەگەر کێشەی دەرونی پەیدا دەکرد دەبێت بەتەنیاو لەتەنیایی کێشەکانی خۆی چارەسەر دەکردن. کاتێك بەم شێوەیە دەمبینی هەوڵم دەدا منداڵەکان بێدەنگ بکەم، هیچ کارێکیترم نەدەتوانی بۆی بکەم. بەڵام خەمۆکی بوونی ئەنوەر ئەمجارەیان زۆر لەجارەکانیتر زیاتربوو. سێ هەفتەی تەواو بەبێ ئەوەی وەڵامی تەلەفۆنێك بداتەوە دانیشتو قسەی لەگەڵ هیچ کەسێك نەدەکردن، لەسەر کورسی خۆی دادەنیشت.

شەوێك پێم گوت:((ئەنوەر بۆچی سەردانی ناوەندی سەربازی ناکەیت؟))

گوتی:((بۆچی برۆم؟))

شەوێکیتر لەرێگایەکیتر بۆی رۆیشتم:((ئەنوەر، سەربازەکانی کەلەنەخوشخانەکان کەوتوون دەبێت یەکێك لەسەرانی حکومەت سەردانیان بکات. لەگەڵ مندا دەتوانیت سەردانیان بکەیت؟))

بەبێدەنگی دانیشتو تەماشای شوێنێکی حەوشەکەی دەکرد. بۆپیاوێکی سەربازی وەك ئەنوەر تێکشکان خەفەتێکی بێ وێنەبوو تۆقرەگرتنی ئەوپەڕی توانایی دەویست. ناسر وەك ئەنوەر لەناو کۆشکی کۆماری نەدەهاتە دەرەوە.

هاتنی بارهەڵگرەکانی پڕ لەسەربازانی بریندار لەبیابانی سینا، بەهێزی تێکشکانی هێزەکانی ئێمەی نیشاندەدا. زۆر لەم سەربازانە بەشێوەیەکی ترسناك لەبەرامبەر بۆمبەکانی دوژمن سووتابوون چونکە ئەم سەربازانە بۆرزگارکردنی گیانی خۆیان لەبیابانی سینا هەڵدەهاتن فرۆکەکانی ئیسرائیل بۆمبی سوتێنەریان بەسەردا دەباراندن. زۆر لەسەربازەکان پێیو دەستو چاوی خۆیان لەدەستدابوون. زۆر لەسەربازەکان گیرۆدەی نەخۆشی دەروونی هاتبوون. لەسەرتاسەری میسر زۆربەی خێزانەکان کوڕ، باوك، برا، کەسوکارێکی خۆیان لەدەست دابوو. زۆر لەخزمانی منو ئەنوەر بەدژواری برینداربوون.

نازانم ئەم هێزەم لەچ شوێنێك بۆدەهات کەلەگەڵ زۆربەی بریندارەکان روبەرووبم کەبەشێوازی جۆراوجۆری مەترسیدار برینداربوون. شارەزایی دایکایەتی منو هاوکارانم هاوکاری ئێمەیان دەکرد کەلەگەڵ هەموو گیروگرفتەکان بەرامبەر ببینەوە. سروشتی ئێمە رێگاخۆشکەری ئێمەبوو کەچۆن ئارامی بەم بریندارانە بدەین یان ئەگەر پێویست بکان بەسەریاندا هاوار بکەین. نەخوشەکان منیان بە(ئوم شهدا) دایکی شەهیدەکان ناودەبرد، من خۆم هەمان هەستم هەبوو.

ڕۆژێك سەربازێك هاواری دەکرد دایە ناتوانم ببینم لەگەڵ پزیشك سەردانی بەشەکانم دەکرد تەماشام کرد ئەمەیان لەرووی جەستەوە ئازاری بەچاوەکانی نەگەیشتبوو بەڵام گیرۆدەی کوری دەرونیبوو. دەیتوانی بەچاوەکانی دەوروبەری ببینێت بەڵام نەیدەویست.. بۆماوەی دووکاتژمێر لەتەنیشتی دانیشتم، پرسیارم لەبارەی خێزانی لێدەکرد کەچاوەڕیی گەڕانەوەی دەکەن، بۆم باسدەکرد چەند سەربازێکی ئازابووە. ڕۆژانە سەردانم کرد، ڕۆژێکیان گوتی سپی جلوبەرگەکانت دەبینم. سەربازەکانیتریش گیرۆدەی نەخۆشی دەرونی هاتبوون، چەند کەسێك پێداگریان دەکرد کە پێغەمبەرن. هەندێك کەس هاواریان دەکرد. بەردەوام لەناو مێشکی خۆیاندا دەنگی فڕۆکەکان دەهات، هەندێکیان تەنیا بەبێ چاو نوقاندن تەماشای شوێنەکیان دەکرد. هەندێکیان بۆهەر لایەك ڕێگایان تێدەکەوت دەڕۆیشتن.

دوای بیستنی چیرۆکەکانی سەربازانی پیادەی ئیسرائیلم دەبیستن توانیم هۆکاری تێك شکانی دەرونی سەربازەکانی خۆمان بزانم. زۆرێك لەسەربازەکان کاتێك لەبیابان وندەبن‌و دواتر لەناکاو سەربازەکانی ئیسرائیل دەبینن‌و سەربازەکانی ئیسرائیل بەلێنی میوەو ئاویان پێدەدەن‌و دواتر هیچ یەکێك لەبەلێنەکانی خۆیان جێبەجێ ناکەن‌و بەردەوام دەبن لەکوشتنیان. هەندێکیان بەراستی دڵسۆزی خۆیان نیشاندابوو ڕێگا بەسەربازەکانی ئێمە نیشاندەدەن کەبگەڕێنەوە بۆوڵاتی خۆیان. دەردی توندی دەرونی سەربازانی ئێمە جێگای سەرسوڕمان نەبوو، نەیاندەزانی باوەڕ بەچ کەسێك بکەن، عەشایرەکانی سینا لەبەرامبەر شاردنەوەی سەربازەکانی ئێمە پارەی زۆریان لەسەربازەکانی ئێمە وەردەگرت کەجلوبەرگی خۆیان پێی بفرۆشن. هەندێك لەم بیابان نشینانە پارەی زۆریان لەسەربازەکانی ئێمە وەردەگرت‌و دواتر بەپارەی زیاتر ڕادەستی هێزەکانی ئیسرائیل دەکران، بازرگانیان بەسەربازەکانی ئێمە کردبوو.

بۆکەم کردنەوەی تاڵی ئەم ڕووداوە هەستێکی بێمانای هاوبەش لەنێوان زۆر سەربازانی بریندار هەبوو، بەدوای دەستەوشەیەك دەگەڕام. زۆربەیان بەرپرسانی حکومەتیان بەبەرپرسی بەتبەختی خۆیان دەزانین، کێشەی منیان زیاتر دەکرد، من خۆم هاوسەری یەکێك لەبەرپرسانی حکومەت بووم.

ئەفسەرێکی گەنج بەشێوەی سووکایەتی گوتی:((من لاقی خۆم لەبەر ئیسرائیلییەکان لەدەست نەدا، لەبەر فەرماندەی خرابی فەرماندەکان لەدەستم ڕۆیشتووە.))

من پرسیارم لێکرد:((بۆچی لەجیاتی ئەکادیمی ئەفسەری نەدەرۆیشتی ماف بخوێنی یان پزیشکی بکەیت، بۆچی نەدەبووی بەشاعێر؟ رۆیشتن بۆشەڕو لەدەستدانی ئەندامێکی جەستە ئەمەیان چارەنووسە، نەك تاوانی فەرماندەکانە، ئێمە وڵاتی یەکەم نین لەشەڕدا گیرۆدەی تێکشکان دەبین. بەڵام بۆچی بۆرێگاگرتن لەتێکشکان، پێنووس بەدەست هەموو رووداوەکان وەك خۆی بنووسە هەڵەکانی سەربازی لەچ شوێنێك رووباندا بۆفەرماندەکان رەوانە بکە تاکو جارێکیتر گیرۆدەی ئەم تێکشکانە نەبینەوە؟

من ئەرکێکم جێبەجێ دەکرد هیچ کاتێك بیرم دەکردەوە دەتوانم و ئەم توانایم هەیە. رۆژێکیان کەقسەم لەگەڵ سەربازێکی بریندار دەکردو ئەفسەرێکیتر لەژووری نەشتەرگەریان دەهێنایە دەرەوە تاکو ئەوکات لەهەلومەرجی بێهۆشی خۆیدابوو، سەریان بەتەواوی پێچابوو تەنیا دەمی دیاربوو. بینیم دەڕشێتەوە، بەڵام لەبەربوونی قەڵەباڵغی لەرادەبەدەرو کەمی خزمەتگوزار هیچ کەسێکم نەبینی بانگیان بکەم، بەدوای دەفرێك دەگەڕام، بەڵام نەمتوانی بیدۆزمەوە. بەبێ بیرکردنەوە دەستەکانم هاوشێوەی دەفر لەبەرامبەر دەمی بریندارم گرتن تاکو لەناویدا بڕشێتەوە. دواتر دەستەکانی خۆمو دەمی برینداڕەکەم خاوێنکردەوە. رۆژی دواتر بۆبینینی رۆیشتم، دەستی گرتمو چەندینجار ماچیکرد. گوتی:((بەروخسەتی ئێوە ناو کچی یەکەمی خۆم دەکەم بەجیهان.))

گوتم:((بۆمن جێگای سەربەرزییە.))

بەڵام کاتێك دەگەڕامەوە هەموو ئەم رووداوانم بۆئەنوەر دەگێڕانەوە بەڵام هیچ کاریگەریان نەبوو. رۆژێکیان بەرێکەوت لەنەخوشخانەی (المعادی) رۆیشتم بۆبینینی سەر لەشکر کەمال حەسەن عەلی، دواتر دەبێتە سەرۆك وەزیری ئێمە. ژنەراڵی بریندار گوتی:((خاتوو سادات دەمەوێت بەتەنیا قسەتان لەگەڵدا بکەم.)) کاتێك ژوورەکە چۆڵکرا گوتی:((زۆر گرنگە قسە لەگەڵ هاوسەرت بکەم، دەبێت راستییەکی ئەم شەڕە بۆی باس بکەم.))

هەمان شەو پەیامی ژنەراڵم گەیاندە ئەنوەر، ئەنوەر دوای سێ هەفتە بۆیەکەمجار ئامادەی گوێگرتن بوو. بەیانی رۆژی دواتر سەردانی سەر لەشکر کەماڵ حەسەن عەلی کرد لەهەمان شوێن بۆگەیاندنی پەیامی سەردانی ناسر دەکات. ئەنوەر هیچ کاتێك بۆی باس نەکردم سەر لەشکر باسی چی بۆ ئەنوەر کرد، بەڵام من لەوەی کەهاوسەرم هۆکارێکی بۆگەڕانەوە بۆژیان دەدۆزییەوە، زۆر خوشحاڵبووم.

بۆماوەی پێنج مانگ بەردەوام لەبەیانییەوە سەردانی نەخۆشخانەکانم دەکرد، تاکو درەنگانی شەو کارم دەکرد. پێش ئەوەی سەردانی مانگی سوورو خۆبەخشەکان بکەم پەیوەندیم بەنەخۆشخانەکانەوە دەکردو کەچی پێویستە بۆیان بکرێت. بۆهاوکاری نەخۆشخانەکان تۆڕێکی نیودەوڵەتیمان لەهاوسەرانی بالیوزەکانی میسر لەدەرەوە دروستکرد. کاتێك بەرپرسی نەخۆشخانەی سوپا لەهلیوپۆلیس داوای لەمن کرد بۆرێگرتن لەبڕینەوەی ئەندامانی بریندارەکانی سووتا پێویستیمان بەئامێرێکی تایبەت هەیە. پەیوەندیم بەهاوسەری بالیوزی خۆمانکرد لەبریتانیاو دەستبەجێ ئامێرەکە ڕەوانەکرا. ژیانی زۆرکەس بەم ئامێرە رزگارکرا.

بەلاَم نەماندەتوانی ژیانی زۆرکەس رزگار بکەین. لەکەناراوەکان لەسینا، بەهاوڕێیەتی ئەندامانی مانگی سوور. لەمانگی تەمووز سەفەری ئەم شوێنانەمان کرد، کارەسات لەڕادەی خۆی تێپەڕکردبوو. رۆژانە سەربازەکانی زیاتر بەشەپرویی لەبیابان دەگەیشتنە کەناراوەکانی نۆکەند کەقوربانی پاشەکشەی خرابی سوپا بەسەریان هێنابوو، بەبوونی ئاگربەست بەلاَم پێکدادانی پچڕ پچڕ بەدرێژایی نۆکەند بوونیان هەبوو. تاکو وەستانی تۆپخانەکانو داهاتنی شەو بەلەمە بچوکەکانی میسر نەیاندەتوانی سەربازانی بێپەنای ئێمە لەنۆکەند دەرباز بکەن. زۆربەی ئەم سەربازانە لەرێگای ژنانی خۆبەخش دەگوازرانەوە، چونکە بڕیاربوو جلوبەرگی سپی بەنیشانەی مانگی سووری سەر بازوویان ببێتە هۆی پاراستنیان. بەلاَم ئەم ئافرەتانە بەردەوام لەلایەن سەربازانی ئیسرائیلی ئازاریان پێدەگەیشت. سەربازێکی ئیسرائیلی لیمۆیەك فڕەدەداتە ئافرەتێکی خۆبەخشو بەشانی دەکەوێت هەست دەکات گولەیەك بەشانی کەوتووە بەردەوام دەیگوت سەگ باب، ئەم ئافرەتە زۆر بەخێرایی تووڕە دەبوو بۆماوەی نیوکاتژمێر لەسەر جنیودانی بەردەوامبوو.

نەك تەنیا سەربازانی ئێمە خەڵکی ئاسایی لەشارەکانی جۆراوجۆری ناوچەی نۆکەندی سوئێزو ئیسماعیلییەو پۆرت سەعیدو قەنتەرەو سوئێز، هەڵدەهاتن. ئیسرائیل یەکەمجار لەئاسمان هێرشی سەر ئەم شوێنانەی کردو دواتر بەتۆپ لەوبەری نۆکەند تۆپبارانی دەکردن. زۆرخەڵك لەترسان بەبریندارى ئاوارەی ناوچەکانیتر دەبوون، سەردانی ناوەندی مانگی سووری ئێمەیان دەکرد لەئیسماعیلییە بۆهاوکاریی‌و چارەسەری. هەندێك لەئەمانەمان ڕەوانەی ناو خانووەکانی تەواو نەکراو دەکردن کەپێشتر بۆکرێکاران دروست دەکران، کاتێك ئەم شوێنانە پڕبوون لەناو حەوشەی قوتابخانەو مزگەوت لەسەرتاسەری پارێزگاکانی دەورووبەری نۆکەندی سوئێز

خیمەمان بۆهەڵدان. تەماشاکردنی ئەم هەموو خەڵکەی بێتاوان منداڵەکانی خۆیان لەپشتی خۆیان بەستبوونەوە دەیان زانی ژیان هەموو لایەنی داراییان لەدەست رۆیشت، بەراستی جێگای بەزەیی بوون.

لەنیوان هەموو خەڵکی میسر زیاتر لەهەموکەسێك خەڵکی ناوچەی نۆکەند زیانیان بەرکەوتبوو. ئەنوەر لەساڵی ١٩٧٥، لەکاتی دووبارە کردنەوەی نۆکەند ناوچەی پۆرت سەعیدی کرد بەناوچەیەکی ئازادی بازرگانی، هەوڵیدا زیانەکان بەشێوەیەکیتر تاکو ڕادەیەك قەرەبۆ بکاتەوە. لەناوەندی شاری سوئیز یادەوەرییەکی سەردەمی شەڕ مایەوە دەبابەیەکی سووتاوی ئەمەریکی کەلەئیسرائیل گیرابوو.

دەمویست سەردانی ئەوبەری نۆکەند سوئیز بکەم بۆئەوەی زیاتر بتوانم هاوکاری سەربازەکانم. بەڵام فەرماندەی سوپا لەئیسماعیلییە رازیکردم کەنەڕۆم چونکە زیاتر دەکەوتینە بەر رەحمەتی گولەی سەربازانی ئیسرائیلو گیرانو رفاندنیان بۆ ئاسانتر دەبێت. دواتر چاوەڕێی گەڕانەوەی سەربازەکانم دەکرد هیچ کاتێك نەمتوانی لەگەڵ بارودۆخی دژواری هەمان ناوچە خۆم رابێنم، زۆرکەس لەوبەری نۆکەند مابوون.

پێی سەربازەکانی ئێمە لەبەر رۆیشتنی زۆرو گەرمای رۆژو سەرمای شەوانەی بیابان ڕەشو شین هەڵگەڕابوونو خوێنیان لەبەر دەڕۆیشت، هەندێك لەسەربازەکان لەبەر تینوێیەتی زمانیان ڕەشو باگرتوو ببوو توانای قسەکردنی زۆریان نەبوو. کاتێك پێی سەربازەکانم خاوێن دەکردنەوەو ئاوی میوەم پێشکەش دەکردن بەردەوام دەیانگوت: ((ئای دایە، ئای دایە.))

پێداگریم دەکرد ئەم سەربازانە زیاتر قسە نەکەن تاکو توانیان بەتەواوی بۆدەگەڕێتەوە سەربازانی کەتەنیا ماندوویەتی زۆر بێچارەی کردبوون ڕەوانەی ناو خێمەکانو بریندارەکانمان ڕەوانەی نەخوشخانە دەکردن. زۆربەیان گیرۆدەی سووتان هاتبوون زۆرجار لەبەر بوونی گۆشتی سووتاو نەماندەتوانی بەتەواوی رێگا لەڕشانەوەی خۆمان بگرین. بۆهەموو کەسانی کەسووتابوون باسم دەکرد:((ئێوە قارەمانی میسرن، ئێوە لەمن بەختەوەرترن، چونکە ئێوە خاوەنی نیشانەی بریندارەبوونتان لەسەر جەستەدا هەیە سەربەرزی پێوە دەکەن.)) چەندین کاتژمێرم تەرخان دەکردن بۆدانیشتن لەگەڵ ئەم سەربازانەدا تاکو خەو لەچاوەکانیان گرانی دەکردو دەخەوتن. زۆرجار تەنیا چاوەکانیان تەنیا بەشێکبوو لەجەستەیان کەبریندار نەبوو. زۆرجار لەبەرچاوی خۆم گیانی خۆیان دەسپارد. لەتەنیشت جەستەیەیان ئەم ئایەتەم

دەخوێندەوە ئەمڕۆ بەئارامی بەرەو پەروەردگار دەگەڕێتەوە کەرازیو بەختەوەرە لەکاروکردەوەکانت. هیچ کاتێك مەرگی ئەم سەربازانە بۆمن ئاسان نەبوو.

تەنیا جارێکیان وەك هەموو شەوەکانیتر لەناو چۆلێك سەربازی بریندار دەگەڕام پێی سەربازێکی گەنجمان لەناو ئاوی گەرم دانابوو کاتێك ویستم گلاسێك ئاوی پرتەقاڵی پێشکەش بکەم بینین لەنیوان لوتو دەمی برینێکی قووڵ هەیە لەناو برینەکەیدا چەندین کرمی بچوك دیاربوون. ئەم سەربازە بەردەوام دەیگوت خوا خێرتان بنووسێت بەلام من نەمتوانی لەبەرامبەر کرمەکانی بچوك هیچ جولەیەك بکەم نەمدەتوانی بۆسەربازی گەنج باس بکەم کەبرینی پڕلەکرمی بچوکن‌و گوتم بۆماوەیەك سەبرت هەبێت‌و ڕۆیشتم داوام لەخۆبەخشێك بەناوی عەقیلەئەلسامە کردو بابەتەکەم بۆباسکرد زۆر بەتوندی گوتی ئەمەیان هیچ کێشە نییە من چارەسەری دەکەم. تاکو گەیشتنی پزیشك برینەکانی ئەم سەربازە گەنجەی تیمارکرد. هەمان سەرباز پرسیار لەعەقیلە دەکات:((خاتوو سادات ڕۆیشت؟ لەبینینی زۆر خوشحاڵبووم.))

عەقیلە لەوەلامدا بۆی باسدەکات:((خاتوو سادات زۆر ماندوویە، زۆری نەمابوو بکەوێتە خوارەوە، نەیدەویست تۆبزانی چەند ماندووە بۆیە ڕۆیشت پشوویەك بدات.))

سەرباز بۆی باسدەکات لەجیاتی من سوپاسی بکە.

سەربازانی ئیسرائیلی بۆئەوەی زیاتر ترس لەدڵی سەربازەکانی ئێمەدا دروست بکەن کەلە نۆکەند دەپەڕینەوە سوودیان لەراپۆرتەکانی هەواڵگەری خۆیان وەردەگرت. سەربازانی ئیسرائیڵی بۆ سەربازانی میسری باس دەکەن:((خاتوو سادات لەوبەری نۆکەند چاوەڕێی ئێوە دەکات.)) سەربازانی ئێمە باوەڕیان بەقسەی سەربازانی ئیسرائیل نەدەکرد. چونکە هیچ هاوسەرێکی بەرپرسانی حکومەت سەردانی بەرەکانی شەڕیان نەکردبوو. کاتێك منیان دەبینی هاواریان دەکردو لەترسان دەلەرزین. چەندین کەسێك بەهەمان هەلومەرج بۆیان باسکردم سەربازانی ئیسرائیل هەمووشتێك دەزانن. هەموویانم ئارام دەکردنەوە بۆم باسدەکردن نابێت هیچ ترسێکتان هەبێت‌و هێزی خۆتان بپارێزن تاکو بەخێرایی باشترو سەلامەت بمێننەوە.

ئایا کەسێك هەیە ئەوەی کەمن بەچاوی خۆم بینی ببینن‌و ئیمانیان بەئاشتی نەبێت؟ لەهاوینی ساڵی ١٩٦٧من خۆم بەبێ ئەوەی کەسێك بۆمن باس بکات فێربووم شەڕ وەلامدەرەوەی هیچ کێشەیەك نییە، ئەم وانەیە بۆئێمە بەنرخێکی زۆر قورس تەواوبوو بریندارەکان بەردەوام دەگەیشتن.

لەتەواوی وەرزی هاوینو پایز لەنێوان قاهیرەو نۆکەندی سوئیز بۆدیداری بریندارانو دیداری خێزانم لەمیت ئەبوئەلکۆم لەسوڕانەوەی بەردەوامی خۆمدا بووم. کاتێك پشتراست بووم ئیتر هیچ هێرشێك ناکرێتە سەرقاهیرە، منداڵەکانی من گەڕانەوە بۆماڵی خۆمان لەقاهیرە. لەبەر سەرقاڵبوونم لەنەخۆشخانەکان کاتی زۆرم بۆمنداڵەکان نەبوو. بەڵام زۆریش نیگەران نەبووم داپیرو خاڵەتیان بەباشی چاودێری منداڵەکانی منیان دەکرد، پێکەوە لەگەڵ منداڵەکانی خاڵەتی خۆیان بەردەوام خۆیان سەرقاڵ دەکردو پێکەوە گەورە ببوون. وەك ئەرکی دایکایەتی لەبەرامبەر منداڵەکانی خۆم هەستم بەگوناح نەدەکرد، زۆرجار خۆیان سەردانی نەخۆشخانەکانیان دەکردو بۆسەربازەکان شێعرو چیرۆکیان دەگوتنو زۆرجار نامەیان بۆدەنووسین، بەڵام ئەنوەر رۆژ لەدوای رۆژ لەمن دوور دەکەوتەوە. هەرچەند وەك دیار لایەنگری رۆناکبیریو ئازادی ئافرەتانبوو بێگومان شانازی بەچالاکییەکانی من دەکرد، بەڵام لەناوەرۆك پیاوێکی رۆژهەلاتیبوو.

هەموو بەیانیان دەستی بەقسەکردن دەکرد:((جیهان تۆ نەچاودێری ماڵو هاوسەرو منداڵەکانت دەکەیت، ئەمانە منداڵن پێویستیان بەچاودێری هەیە دەمەوێت رۆژانە کاتژمێر دووی دوای نیوەڕۆ لەماڵەوە بیت، چ کەسێك چاودێری وانەکانیان دەکات؟ چۆن بزانین لەقوتابخانە چ دەکەن؟ ئەگەر دەتەوێت کاتژمێر پێنجی بەیانی سەردانی نەخۆشخانە بکەیت برۆ، کێشە نییە، بەڵام من دەمەوێت وەك جاران کاتژمێر دووی دوای نیوەڕۆ بگەڕێیتەوە ماڵی خۆت.))

سەرم دەهەژاندو دەمگوت:((هیچ شتێك وەك پێشوو نییە، ئەنوەر. وڵاتی ئێمە تێکشکاوە، هەزاران بریندار لەنەخۆشخانەکان کەوتوون. بۆیەکەمجار ژنان بۆهاوکاری هاتنە پێشەوە. ئەمانە پێویستیان بەمن هەیە.))

بەم شێوەیە بەردەوام دەبووینو دەیگوت:((منیش پێویستیم بەتۆ هەیە. من پیاوم پێم باشە دوای گەڕانەوەم خێزانەکەم لەماڵەوە بێت.))

کێشەمان بەم شێوەیە بەردەوام دەبوو:((ئەنوەر تۆ چاوەڕێی دەکەیت کاتێك کەکارێك بۆسەربازێك دەکەمو دەمی دەکاتەوە باسی دەردو ژانی خۆی بۆمن دەکات رێگا لەقسەکردنی بگرمو بۆی باس بکەم ببوورە سەرباز هاوسەرم چاوەڕێم دەکات دەبێت برۆم ئەگەر تۆبیت چی دەکەیت؟))

بەڵام هاوسەرم پێداگری دەکرد:((گوێبیستی قسەکانم بویت هەر ئەمەیانو تەواو.))

من لەنێوان ئەنوەرو ئەرکی هاولاتیبوونم دووپارچە دەبووم بەناچاری دەمگوت: ((زۆرباشە هەوڵی خۆم دەدەم.)) رۆژی دواتر کاتژمێر دوو گەڕامەوە، رۆژی دواتر سێ، رۆژی دواتر چوار بەم شێوەیە بەردەوام دەبووم.

شەوانە تاکو درەنگانی شەو لەنەخوشانەکان دەمامەوە لەکاتی گەڕانەوە بۆئەوەی ئەنوەر ئاگاداری گەڕانەوەی من نەبێت پیلاوەکانی خۆم بەهێواشی دادەنان بەلام دیسان ئاگای لەگەڕانەوەی من دەبوو بەشێوەیەکی مانادار تەماشای دەکردمو تەماشای کاتژمێری خۆی دەکرد. لەوەلامدا دەمگوت:((خۆت دەزانی میوان بووم نەسەردانی کۆنسێرتی هونەرمەندان دەزانی لەچ شوێنێکبووم.

کاتێك سەردانی ئیسماعیلییەو پۆرت سەعیدم دەکرد زۆرکەم بەتەلەفۆن پەیوەندیم لەگەڵدا دەکرد. چونکە نەمدەویست لەرێگای تەلەفۆن دیسان کێشە دروست بکەین. کاتێك لەقاهیرە دەبووم هەوڵی خۆمدەدا کێشەکانی ئێمە لەچوارچێوەی ماڵ نەڕۆنە دەرەوە چونکە لەشەڕی بەیانیان زۆر بێزار بووم.

پێشنیاری بۆدەکردم کاتژمێر دوو لەماڵ بمێنەوە.

من لەوەلامدا دەمگوت هەوڵی خۆم دەدەم.

بێگومان لەئەنوەر تێدەگەیشتم. هیچ پیاوێکی میسری، لەوانەیە هیچ پیاوێك لەجیهاندا نەبێت کەنەوێت کاتێك دەگەڕێتەوە بۆماڵەکەی هاوسەری بەزەردەخەنەو باوەشی کراوە، خواردنی گەرمو ئامادە لەپێشوازیدا بێت. ماڵێکی جوانو رازاوە، منداڵەکانی خاوێن کەتەواوی وانەکانی خۆیان تەواو کردبنو ژێرانە هەڵسوکەوت بکەن. لەراستیدا زۆربەی پیاوەکان دەیانەوێت هاوسەرانیان وەك کۆمپیۆتەربن، بەردەوام شادو خۆش ئەخلاق. ئەنوەر لەم پیاوانە جیاوازتر نەبوو.

دوای شەڕ منو هاوڕێیانم بۆبەرزکردنەوەی ئاستی پەریستاری لەنەخوشخانەکانی هێزەکانی ئێمە کارمان لەناو نەخوشخانەکانی حکومەت دەکرد وردە وردە ئیتر بەرگری لەباوەڕەکانی نەدەکردو سەربەخۆیی منی قبوڵ دەکرد. ئەوکات زانیم ئەرکی من لەژیاندا چییە: چاودێری کردنی بریندارو پەککەوتووەکان، هاوکاری کەسانی بێچارە، هەوڵدان بۆئاشتیو بەرزکردنەوەی ئاستی ئافرەتان. کاتێك ئەنوەر سادات پۆستی سەرۆککۆماری وەرگرت دەستم کراوەتربوو بۆئامانجەکانم. لەهەمان سەردەم کاتی هەردووکمان ئەوەندە کەمبوو هیچ یەك لەئێمە دەرفەتی

نیگەرانی یەکترمان نەبوو کێ لەماڵ دەمێنێتەوە کێ لەماڵ نابێت. بەڵام بێگومان لەسەردەمی شەڕی حوزەیران ژیانی هاوسەری ئێمە زۆرجار گیرۆدەی کێشە دەبوو. وەك دیار گومانو سەرسوڕمان زیاتر خۆیان دەردەخست.

هەواڵێك لەناو خەڵك بڵاوکرایەوە کە عەبدولحەکیم عامر وەزیری بەرگریو نزیکترین هاوڕێی ناسر، ئامادەکاری دەکات کودەتا لەسەر ناسر بکات. عامر پێش شەڕی ١٩٦٧ ناسر پشتراست دەکاتەوە میسر ئامادەی سەرکەوتنە، ئێستا هەستی دەکرد هاوڕێی دێرینی خیانەتی لێکردووە. لەهەمان قەیرانی کەمیسر تێکەوت پێشنیارکرا گۆڕانکاری لەهەموو کابینەی حکومەت بکرێتو خۆدی ناسر دەست لەسەرۆکایەتی کۆمار هەڵگرێت. تەنیا عامر ئامادە نەبوو دەست هەڵگرێتو بیری دەکردەوە ئەمەیان پیلانە دەیانەوێت تەواوی تێکشکانەکان بخرێنە سەرشانم. بەهەموو بیرکردنەوەکانی کاتێك بینی ناسر لەشوێنی خۆیدا ماوە بۆچی دەبێت وەزیری بەرگری بێتە گۆڕین. عامر خۆی بەهاوجووتی ناسر دەزانی دەبێت لەمانەوەو نەمان لەحکومەتدا پێکەوەبن. لەئەنجامدا ناسر ناچارکرا وەزیری بەرگری بگۆڕێتو لەشوێنی عامر محەممەد فەوزی کرایە وەزیری بەرگری.

عامر بۆبەدەستەوە گرتنی پۆستی خۆی دەستی بەکۆکردنەوەی پاڵپشتی بۆخۆی کرد لەلایەن سوپاو چەکی زۆری لەماڵەکەیدا ئەنبار کردبوو، گومانەکانی دوولایەنی ناسرو عامر زیاتر دەبوون، ناسر گومانی لەهێزی عامر لەناو سوپادا هەبوو، لەهەمان کات لەکاتی سەرۆکی کۆمیتەی خاوێنکردنەوەی خانەدانەکانو دەربەگەکانبوو سامانێکی زۆری بۆخۆی کۆکردبووە. ناسر هەستی بەخۆشەویستی عامر لەناو ئەفسەرانی سوپا دەکردو ترسی هەبوو کەدەست بەشۆڕش بکاتو عامر بۆپۆستی پێشووی بگەڕێتەوە یان خودی حکومەت لەناوببات. بەم هەموو گومانانە جەماڵ عەبدولناسر دوو دڵبوو کەهیچ هەنگاوێك دژی هاوڕێی دێرینی خۆی بکات. لەهاوین رۆژ بەرۆژ هەلومەرج خراپتر دەبوو. لەهەمان سەردەمی کێشەکان رۆژێك لەنەخوشخانە دەگەڕامەوە بۆماڵەکەم، بینیم وەزیری بەرگری پێشوو عامر لەئەیوانی ماڵەکەمان لەتەنیشت ئەنوەر دانیشتبوو، زۆر پەریشانو دڵشکاوە.

بۆئەنوەری باس دەکات:((عەبدولناسر چۆن دەتوانێت بەم شێوەیە هەڵسوکەوت لەگەڵ مندا بکات؟ هەمووکاتێك بەبرای خۆم دەزانی.))لەبینینو پێداگری عامر سەرم سوڕمابوو.

بەهیوای ئەوەی بتوانم ئەم کابرایەیی سەرکێش رازی بکەم. بەنەرمی بۆم باسکرد: ((بابەت ئەوە نییە کەناسر هیچ خۆشەویستییەکی بۆئێوە هەیە یان نا، ئێستا میسر لەسەردەمێکی زۆر هەستیار تێدەپەڕێت، کاتی گلەیکردن لەناسر نییە، وەك خوشکێك پێشنیارت بۆدەکەم بگەڕێنەوە بۆشوێنی لەدایکبوونت لەئیستەل، لەگەڵ خێزانی خۆت پشوویەك بدەن. کاتێك ئەم قەیرانانە تێپەڕیان کرد دەتوانی وەك پێشوو لەگەڵ هاوڕێی دێرین ئاشتی بکەن. لەبەرژەوەدی تۆدا نییە بەردەوام پاڵەپەستۆ بخەیتە سەر ناسر. حەکیم داوات لێدەکەم بەقسەی من بکە.))

بەلام بیرو بیرکردنەوەکانی عامر زۆر پەرتو بەربلاوبوون کەبتوانێت گوێی لەقسەکانم بگرێت. پێداگری دەکرد:((بەرپرسیارەتی ئەم تێکشکانە تەنیا لەئەستۆی مندا نییە. لەئەستۆی هەموومانە.))

گوتم:((گرنگ نییە هەڵەی چ کەسێکبوو، پیتان خۆش بێت یان نا خەڵك تۆ بەبەرپرسی ئەم تێکشکانە دەزانن. ئێوە وەك فەرماندەی سوپا دەبێت ئەم بەرپرسیارەتییە قبووڵ بکەن. ئەگەر لەناو مانگی سوور کەسێك هەڵەیەك بکات خەڵك دەست بۆئەمو ئەو درێژ ناکەن تەنیا من وەك جیهان دەناسنو هەڵەکان دەکەونە سەرشانم. ئێوەش بەهەمان شێوە.))

نەمتوانی باوەڕی پێی بکەم. عامر، بەبێ ئەوەی وەلامی من بداتەوە تەنیا سەری دەهەژاند. دوو هەفتە دواتر دەیویست سەردانی ناوەندی تەلەفزیونو رادیو بکات تاکو بابەتی خۆی لەگەڵ خەڵك بخاتەروو، رێگای پێنەدرا لەماڵ بێتە دەرەوە. دوای سێ هەفتە لەچواردەی ئەیلوول بەخواردنی ژەهر خۆی کوشت.

کاتێك بەتەنیا لەتەنیشت زەوییو زارەکانی عامر لەگوندی ئیستەل وەستابوومو فاتیحەم بۆدەخوێند. گریام. لەبەر مەترسی عامر بۆسەرحکومەت ناسر بڕیاریدابوو سەرانی حکومەت نابێت بەشداری بەخاکسپاردنی هاوڕێیو هاوسەنگەری کۆنیدا بکەن. بەلام من لەکاتی بیستنی ئەم کارەساتە کەکاریگەری زۆری لەمن کرد دەستبەجێ بۆهاودەردی لەگەڵ خێزانی لەئەسکەندەرییە رۆیشتم بۆمیسری عولیا. خێزانی تازە گەڕابوونەوە بۆدوورگەی جیزەو رۆژی دواتر من سەردانم کردن.

پێشوازیان لەمن نەکرد. کاتێك منیان بینی کچی هاواریکردو گوتی:((باوکم خۆی نەکوشت حکومەت کوشتی!))

بەڵام من تەنیا وەك دۆستو هاوڕێی ڕۆیشتبووم نوێنەری حکومەت نەبووم. لەناو حەوشەی ماڵەکەیان کوڕی عامرم بینی کەیەکێك لەئەفسەرانی سوپای میسربوو ڕووی لەمن کردو گوتی:((بۆچی خاڵەت، بۆ؟)) نەمدەتوانی هیچ قسەیەك بۆخۆیی‌و خۆم بکەم نەمدەزانی ئەم پیاوە بۆچی تاکو ئەم ڕادەیە دەبێتە دوژمنی هاوڕێی دێرینی خۆیی. ئەگەر عامر تاکو ئەم ڕادەیە پێداگر دەبوو دەبێت لەهەمان ساتی تێکشکانی لەپێنجی حوزەیران ١٩٦٧ خۆی دەکوشت. ئەوکات هەمووکەسێك هەستیان دەکرد غرووری ڕێگای بەم شەرمەزارییە بۆمیسر ندا، خۆکوشتنی زۆر سەربەرزانەتر دەبوو. بەڵام ئێستا تەنیا مردنێکی دڵتەزێن نەدەبوو.

بیستنی ئەم هەواڵە بۆناسر لەقاهیرە زۆر قورسبوو. بێ وەفایی‌و مەرگی هاوڕێی‌و تێك شکان لەشەڕدا، نەخۆشیکردن. شەکری ناو خوێنی دەڕۆیشتە سەرەوەو هەلومەرجی زۆرخرابببوو. لەهەمان سەردەم ناسر لەهەفتەیەکدا جارێك دەهاتە ماڵی ئێمە لەشەقامی ئەهرام بۆئەوەی لەگەڵ ئەنوەر گفتوگۆ بکەن. هەمووجارێك بەبینینی زیاتر خەمبار دەبووم. ئەوەندە تێکشکابوو هەستم دەکرد باری قورسی هەزاران کیو لەخەم لەسەر شانەکانی گرانی دەکەن، ئەوەندە لەئازاردابوو جەستەی ئۆقرەی جلوبەرگەکانی نەدەگرت. ناسر تاکو چ ماوەیەك ئۆقرەی ئەم هەموو خەم‌و خەفەتانەی دەگرت، میسر تاکو چ کاتێك بەم شێوەیە دەمایەوە؟

میسرییەکان تاکو ئەوکات شەڕیان دەکردو دەمردن. هەرچەند شەڕ لەمانگی حوزەیران کۆتایی هاتبوو، بەڵام جاربەجار شەڕ لەنزیك ئۆکەند بوونی هەبوو، لەمیسری علیاو جاربەجار لەناو خۆدی قاهیرە نزیکەی شەش ساڵی خایاند. بەدرێژایی ئەم ماوەیە ئێمە نەلەشەڕ دابووین نەئاشتی، ئیسرائیل بەردەوام تۆپبارانی شارەکانی ئیسماعیلییەو پۆرت سەعیدی دەکرد. ئێمەش لەبەرامبەریدا لەهێڵی بارلیو بەردەوام شەڕمان دەکرد. لەساڵی١٩٦٩ شەڕەکانی بچوك پەرەیان ساند، بوون بەشەڕی گەورەتر. ئەمجارەیان ئیسرائیل جگە لەناوەندەکانی سەربازی هێرشی سەر پیشەسازیی‌و مەدەنی دەکرد.

پاڵەپەستۆکانی سەر ناسر زۆر ترسناکبوون. لەئەیلوولی ١٩٦٩ گیرۆدەی وەستانی دڵبوو، هەرچەند بۆخەڵك باس دەکرا گیرۆدەی جۆرێك هەڵامەتە. ناسر هەستی بەنزیکبوونەوەی مەرگ‌و بەرامبەر بوونەوەی لەگەڵ پیلانەکانی سیاسی، ڕووی لەتەنیا هاوڕێی ڕاستەقینەی کرد. لەبیستی کانوونی دووەم دەڕۆیشت بەشداری لەکۆنفرانسی سەرانی عەرەب لەمەراکێش بکات، داوای لەئەنوەر کرد کاتێك بۆپێشوازی دەگەیتە فرۆکەخانە قورئانی خۆت لەگەڵ خۆتان بێنن.

ناسر، لەماڵەوە، پێش ڕۆیشتنی بۆفرۆکەخانە، مەراسیمی سوێندخواردنی ئەنوەری وەك جێگری سەرۆککۆمار جێبەجێ کردبوو. شەڕی هەڵوەشانەوە بەردەوامی خۆی هەبوو.

دیمەنی شارەکانی کەناراوەکانی نۆکەند دیمەنێکی دابڕاو، نەهەولێك لەژیان هەبوو نەکەسێك لەم شوێنانەبوو. لەئیسماعیلییە لەرۆژئاوای نۆکەند بینایەکی نوێی بوونی نەبوو. هەرکەسێك ئەم وێرانەیی دەبینی وەك من دەگریا، خانووەکانی وێران، پردەکانی هەڵواسراو جلوبەرگی خەڵك تەختە سووتاوەکان چەندین خەیاڵو رۆیا لەم شاردا ویڕانکرابوون؟ چەند کەس لەم شارەدا گیانیان لەدەستدابوو؟ نەمدەتوانی رێگا لەفرمێسکەکانی خۆم بگرم. شەقامەکان وەك خانووەکانی هەموویان چۆڵبوون، چونکە شار چۆڵکرابوو پەنایان بۆژێر خێمەکانی کەمپەکان بردبوو لەبیابان.

فرۆکەکانی ئیسرائیل هەموو پیشەسازییەکی لەسەرتاسەری میسر وێرانکرد، لەکۆتایی رووباری نیل لەمیسری عولیا تاکو باشوور واتە تاکو دەگاتە بەنداوی ئەسوان هەرچەند بەنداوی ئەسوان زۆر بەهێز دروستکرابوو بەڵام مەترسی روخاندنی لێدەکرا کەهەموو گوندەکانی سەر رێگاو خۆدی قاهیرەی سێ مەتر بکەویتە ژێر ئاو دەستیان لەهیچ شوێنێك نەدەپاراست. رۆژێکیان سەردانی نەخوشخانەیەکم لەپارێزگای شەرقیە کرد، لەئەیوانی نەخوشخانە تەماشای شەڕی نیوان فرۆکەکانی ئێمەو ئیسرائیلم دەکرد پاسەوانەکان لەخوارەوە هاواریان دەکرد بڕۆ ژوورەوە بەڵام نەرۆیشتم ویستم تەماشایان بکەم. لەژیانمدا هیچ کاتێك مەترسیم لەسەر ژیانی خۆم نەدەبینی ئەگەر بەپێچەوانە بیرم دەکردەوە نەمدەتوانی هیچ کارێك بکەم. بەڵام بەردەوامی شەڕ زۆر دژواربوو زیاتر لەچوار هەزار شارەزای بواری پیشەسازی لەم شەڕەی نافەرمی کوژرابوون.

لەکانوونی دووەمی ١٩٧٠، جارێکیتر ئاگادارکردنەوەی مەترسی هێرشی ئاسمانی لەقاهیرە لێدرا. هەمووکەسێك خۆیان لەناو سەنگەرەکانی کەبۆئەم مەبەستە دروستکرابوون حەشاردا، گوێبیستی هاتنەخوارەوەی یەکەمین بۆمبەکانبووم. ٧٠ کرێکار لەناو کارگەیەك لەدەوروبەری شار کوژران. کاتێك هەواڵەکانی دووەم هێرشم دەبیست، شەپۆلێکیتری تووڕەبوون وڵاتی گرتەوە. ئیسرائیل قوتابخانەی (بحرالبقر) لەپارێزگای شەرقیە لەنزیك بلبیس کرایە ئامانجی فرۆکەکان.

ئایا دەکرا ئیسرائیل بۆ مەبەستێك هێرش بکاتە سەر ئەم مندالآنە؟ باوەڕم نەدەکرد ئەوەندە دڵڕەقبن، بەلآم زۆر لەمیسرییەکان باوەڕیان دەکرد. کاتێك لەنەخۆشخانەکان دەگەڕام کە وشەیەك بیدۆزمەوە کەدەردی دڵی ئەم مندالآنە بڕێك سارێژ بکەم بوونی نەبوو، لەدەستدانی ئەندامێکی جەستەی سەربازەکان زۆر دژواربوو هەرچەند ئەم سەربازانە بۆبەرگری لەولآت شەڕیان کردبوو لەدەستدانی ئەندامێکی جەستەیەك تاکو ڕادەیەك چاوەڕوان کراوبوو بەلآم بۆمندالّەکانی بیّ دەستو پێی ڕاستە بێگومان نا. تاکو چەندین هەفتە دەنگی هاواری ئەم مندالآنە لەگوێچکەکانی من دەزرینگایەوە. هەوڵدانم بۆ ئارام کردنەوەی مندالّەکانی برینداری قوتابخانەی بحرالبقر ئاسان نەبوو.

کەسێك دەبێت وەلآمدەرەوەی ئەم ڕووداوانە بێتو کۆتایی بەقەتلوعام بێت. لەمانگی ئایاری١٩٧٠، نەتەوەیەکگرتووەکان بڕیارنامەی ٢٤٢ پەسەندکرد. لەم بڕیارنامەیەدا هاتبوو، لەبەرامبەر ناساندنی ئیسرائیل لەناو سنوورەکانی خۆی لەلایەن عەرەب دەبێت هێزەکانی خۆی لەخاکی داگیرکراو بکێشێتەوە، ئیسرائیلو میسر ئەم بڕیارنامەیان پەسەندکرد، بەلآم ئیسرائیل هیچ کاتێك پابەندی بەلێنەکان خۆی نەبوو. ئیسرائیل پێداگری دەکرد کەلەناو بڕیارنامەدا باس لەتەواوی خاك نەکراوە بەم شێوەیە لەداگیرکاری خاکی ئێمە لەسینا بەردەوامبوو.

دواتر گەورەترین پشتیوانی ئیسرائیل بۆچارەسەرکردنی کێشەکان دەهاتە پێشەوە. لەمانگی ئایاری ١٩٧٠، لەسەردەمی سەرۆکایەتی نیکسۆن، ئەمەریکا بەنەخشەی راجر، وەرگیراو لەناوی ویلیام راجر وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا، هاتەپێشەوە. لەم نەخشەیەدا پێشنیارکرا ئیسرائیل بۆدواوە بگەڕێتەوەو هەردوو لایەن پابەندی ئاگربەستی سیّ مانگی دەبن لەژێرچاودێری نەتەوەیەکگرتووەکان بۆچارەسەر کردنی کێشەی فەلەستین. ناسر قبووڵیکردو ئیسرائیل رەتیکردەوە.

دەبێت چەند قوربانیترمان پێشکەش کردبان تاکو ئیسرائیل بەگفتوگۆکان ڕازی بێت؟ تاکو ئەم شوێنە فەلەستینییەکان لەمیسر تووڕە بوون، عەرەبەکانی توندڕۆ دژایەتی عەرەبەکانی بنەماخوازیان دەکرد. فەلەستینییەکان هەستیان دەکرد ناسر وازی لەکێشەی فەلەستین هێناوە، سوێندیان دەخوارد لەگەڵ ناسرو هەرکەسێکیتر دوژمنایەتی دەکەن. هەلومەرج زۆر بەخێرایی خراپتر دەبوو، بەتایبەتی لەئۆردن چەکدارانی فەلەستین دژی حکومەتی ئۆردن دەستیان بەشۆڕش کردبوو. یەکێتیی عەرەب لەسەر لێواری هەڵوەشانەوە دابوو.

دوو مانگ دواتر، لەئەیلوولی١٩٧٠، ناسر بۆ کۆبوونەوەی سەرانی عەرەب لەقاهیرە لەهەوڵدانی بەردەوامی خۆیدابوو بۆدروستبوونی ئاشتی، هەرهیچ نەبێت لەئۆردن. چوار رۆژی هەناسەبڕ، ناسرو ئەنوەر لەکۆبوونەوەکانی بیستو چوار کاتژمێری لەهوتیلی هیلتۆن، کەزۆرجار هاوارکردنی لەگەڵدابوو بەردەوامبوو. تەواوی دەسەڵاتدارانی وڵاتانی عەرەبی ئامادە بوون. یاسر عەرەفات سەرۆکی بزوتنەوەی ئازادی بەخشی فەلەستین کەبزوتنەوەیەکی تازە دروستکراوبوو لەگەڵ سەرۆکی نوێی لیبیا موعەمەر قەزافی. قەزافی پێش دەستپێکردنی کۆبوونەوەی سەران لەمیوانداری جەمال عەبدولناسر بینیم، دیدارێك کەدەترسام ببێتەهۆی لەدەستدانی دۆستایەتی ناسر. هەمووشتێك کاتێك دەستی پێکرد کەفەتحییە، هاوسەری قەزافی رووی لەناسر کردو گوتی هاوسەرم بڕیاری گرتنی مامی منی دەرکردووە. ناسر زۆر خۆیانەو بەئەدەبەوە رووی لەقەزافی کردو گوتی:((برام موعەمەر، بۆچی ئەمەت لەگەڵ خزمانی هاوسەرت دەکەیت؟ دەبێت بڕیاری ئازادکردنی دەربکەیت.))

کەسانی ئامادەبوو بۆ پشتیوانی کردن لەقسەکانی ناسر سەریان دەهەژاند، بەڵام قەزافی روخساری تێك هەڵکێشاو بەتوندی گوتی:((من ئەم پیاوەم گرتووە چونکە دوژمنی شۆڕشی ئێمەیە.)) بێدەنگییەك  روویداو دواتر من ئەم بێدەنگییەم شکاند.

من رووم لەناسر کردو گوتم:((من هاورام لەگەڵ قسەکانی سەرۆك قەزافی، هەموو شۆڕش دەبێت لەبەرامبەر کەسانێك کەدەیانەوێت شۆڕش لاواز بکەن بەرگری لەخۆی بکات، بەتایبەتی لەقۆناخی دەستپێك.))

هەمووکەسێك هەناسە بڕاوبوون، چونکە هیچ کەسێك بوێری ئەوەی نەبوو لەبەرامبەر دژایەتی قسەکانی ناسر بکات، بەتایبەتی ئافرەتێك، دووریم لەدیدگای ئەنوەر دەکرد، بەڵام بەتەنیشتە چاوێك بینیم کەرووخساری هەڵگەڕاوە. تووڕەبوونی جەمال عەبدولناسر زۆر ئاشکرابوو.

بەزمانێکی توند رووی لەقەزافی کردو گوتی:((بەقسەی نەکە هەرچییەك بێت دایکی ئینگلیزە.))

زۆر تووڕە بووم. تەماشای ناسرم دەکردو گوتم:((جەنابی سەرۆککۆمار، لەوانەیە چیرۆکی جەواد حوسنیات بیستبێت، کەسێکی بەناوبانگ لەوڵاتپارێزیانی ئێمەبوو لەیادتان کردووە کەلەتۆکەندی سوئیز دژی ئینگلیزەکان شەڕیکرد. دایکی ئینگلیزبوو، بەڵام کاتێك سەربازانی بریتانی دەگرنو ئەشکەنجەی زۆری دەکەنو ئامادە نەبوون قومێك ئاوی پێی بدەن بەیەك وشە باسی ئەوەی نەکرد کەدایکی بریتانییە زۆرباش دەیزانی ئەگەر بۆیان باس بکات کەدایکی

بریتانییه بەشێوەیەکیتر هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا دەکرد، بەڵام ئامادە نەبوو لەم لایەنەوە هیچ قسەیەك بکات. ئەم قوتابیەیی زانکۆ وەك قارەمانێکی میسر ژیاو وەك قارەمانێکی میسر گیانی سپارد، سەربازەکانی بریتانی گەماڵەکانی خۆیان بەردانە گیانی ئەم قارەمانە پارچە پارچەیان کرد. نیو بریتانی جەستەی هیچی لەمیسریبوونی کەم نەکردەوە.

جارێکیتر بێدەنگی باڵی بەسەر نانخواردنی ئێمەدا هێنایەوەو کەسێك بابەتێکیتری دوور لەمەترسی باسکرد. کاتێك دەگەڕاینەوە بۆماڵی خۆمان منو ئەنوەر بەشەرهاتین‌و گوتی:((جیهان تۆبۆمن کێشە دروست دەکەیت.)) بەڵام من پەشیمان نەبووم، پرسیم: ((تۆ ڕێگا دەدەیت میراسی تۆ سووك بکرێت؟)) پێکەنی. گوتی:((مافی خۆتبوو، بەڵام بۆکەسانیتر ئاسان نییە لەگەڵ شێوازەکانی تۆ خۆیان بگونجێنن.)) بەهەرشێوەیەك بێت ناسر لەقسەکانی من تووڕە نەبوو. دوو سێ ڕۆژ دوای هەمان میوانداری بەپێکەنین بۆئەنوەر باسدەکات:((هاوسەرت ژنێکی رەسەنی میسرییە، وەك هەمووومان تاکو تۆڵەی خۆی نەکاتەوە ئارام نابێتەوە.))

لەرۆژی کۆتایی کۆبوونەوەی سەرانی عەرەب، بەیانی زوو لەخەو هەستام‌و لەسەر تەختی خۆم دانیشتم‌و دڵم لەلێدانێکی توند دابوو. بەخێرایی رۆیشتم بۆژووری ئەنوەر بەنیگەرانی پێم گوت:((خەونێکی زۆر خراپم بینی.))

وەڵامی دایەوە:((چ خەونێکیت بینی جیهان؟))

گوتم:((ناسر بەڵایەکی بەسەردێت!))

ئەنوەر گوتی:((بێمانایە دوێنێ پێکەوە بووین هیچ کێشەیەکی نەبوو. لەکۆبوونەوەی سەرانی عەرەب ماندوو دێتەبەرچاو، بەڵام ئەمڕۆ هەموویان دەڕۆنەوە دەتوانێت پشوویەك بدات.))

لەبەر ئەنوەر پاڕامەوە:((ئەنوەر، داواتان لێدەکەم گوێی بۆ قسەکانم راگری باشتر دەبێت. لەخەودا بینیم دروست دوای خۆرئاوا لەئەیوانی ماڵی دایك‌و باوکم لەدورگەی رۆزە وەستابووم خەڵکم دەبینی خەڵکانێکی زۆربوون لەشەقامەکان بۆلام دەهاتن. بەوردی تەماشام کرد سەرۆککۆماری سودان، نومێریم دەبینی دەگریا. دوو کەسیتر هاوڕێیەتیان دەکردو پێکەوە دەگریان. دواتر قەزافی‌و تەواوی کەسانی دەوروبەرم دەبینین، ئەوانیش بەهەمان شێوە دەگریان.))

ئەنوەر زیاتر بۆئارامکردنەوەی من نەهیچ مەبەستێکیتر، پرسیاریکرد:((بۆچی ئەمانە دەگریان؟))

((قەزافی چەندجارێك دەیگوت "باوەڕناکەم، باوەڕ ناکەم، چی بەسەر ناسر هاتووە؟ چی بۆناسر روویداوە؟"))

دواتر ئەنوەر گوتی:((زۆرباشە لەم خەوەنەی خۆت هیچ ترسێکت نەبێت هەلومەرجی ناسر زۆرباشە.))

دەنگی تەلەفۆن هاتو رۆیشتمو هەڵم گرت دەنگی ناسربوو دەموویست بۆی باس بکەم سوپاس کەسەلامەتی بەلام رێگام بەخۆم نەدا.

گوتی:((جیهان، ئەمشەو بۆنانخواردنی ئێوارە منو ئەنوەر پێکەوە لەماڵی ئێوە دەبین.))

گوتم:((بەخێربێن جەنابی سەرۆککۆمار.)) تەلەفۆنم دایە دەستی ئەنوەر، بەراستی خوشحاڵبووم، وەك جارانی پێشوو سەردانی ماڵی ئێمەی دەکرد، خۆشەویستییەکی زۆری بۆمنداڵەکانی ئێمە هەبوو لەبەرامبەردا منداڵەکانی ئێمەش خۆشەویستی زۆریان بۆسەرۆك هەبوو، بەتایبەتی کچی بچوکم جیهان بەردەوام رووی لەناسر دەکردو دەیگوت من ماچێکی بەهێزتان لێ دەدەم، هەردووکیان پێکەوە پێدەکەنین، دوای بینینی منداڵەکان من داوام لەمنداڵەکان دەکرد بێنەدەرەوە خواردنم بۆ ناسرو ئەنوەر دەبرد. رۆیشتم بۆچێشتخانەو گوتم خواردنێکی سادە دروست بکەن کەباب، زەلاتە، دۆڵمە، سەرۆککۆمار سەردانمان دەکات. بەلام بۆچی هەلومەرجم باشتر نەدەبوو؟ هەلومەرجی ناسر زۆرباشبوو دوای چەند کاتژمێرێك دەمان بینی. چی بەسەر هاتووە؟

هەستم دەکرد لەوانەیە گیرۆدەی هەلامەتێك بووبم دوو حەبی ئاسپرینم خواردن، گەڕامەوە بۆسەر تەختی خۆم کەهیچ کاتێك ئەمەیانم نەدەکرد. هەوڵمدا تاکو ئێوارە باشتربم، تاکو خەیاڵ ئاسوودەبم کەمێزی خواردن جوانتر ڕازاندنەوەی بۆبکرێت، گولەکان بەشێوازی من لەجێگای خۆیانبوون. بەلام هەلومەرجم خراپتر دەبوو. دوای نانخواردن هەستم دەکرد کێشم کەیشتووە بەدوو سەد کیلۆ. هەستم بەماندوو بوونێکی زۆر دەکرد، هەنگاوەکانم قورسو جەستەمگرانی خۆی زیاتر دەکرد. ئەنوەر کاتژمێر سێ دەگەڕایەوە یادداشتێکم بۆنووسیو گەڕامەوە سەرتەختی خۆم.

کاتژمێر شەش. دەنگی تەلەفۆن دەهات. کەسێك دەیگوت:((بەجەنابی سادات بڵێن سەردانی شوێنی مانەوەی سەرۆککۆمار بکات.)) بەباوەڕی من پەیوەندییەکی سەرسوڕ هێنەربوو، پەیامەکەم گەیاندە ئەنوەر هیچ هەڵوێستەیەکی نەکرد.

گوتی:((لەوانەیە بیرورای بۆهاتنی ماڵی ئێمە گۆڕابێت. دوای ئەم هەموو ماندووبوونەی لەماڵەوە پشوویەك بدات باشتر دەبێت.)) چونکە ناسر بۆبەرێکردنی هەموو سەرانی عەرەب بەجیا لەفرۆکەخانە دەمایەوە. لەماڵی ئێمە تاکو ماڵی سەرۆککۆمار چڵو پێنج خولەك کاتی پێویستبوو، کاتێك ئەنوەر لەدەرگای ماڵ دەرۆیشتە دەرەوە رووی لەمن کردو گوتی ئەگەر سەرۆککۆمار ویستی بۆنانخواردن بێتەماڵی ئێمە پەیوەندی بەمنەوە بکە. بەڵام پەیامی کەدوای کاتژمێرێكو نیو لەئەنوەر گەیشت شتێکی زۆر جیاوازبوو. ئێستا من دەبێت سەردانی ماڵی ناسر بکەم، ئەمەیان ئاسایی نەبوو. لەقاهیرە منو ئەنوەر هیچ کاتێك پێکەوە سەردانی ماڵی سەرۆککۆمارمان نەدەکرد جگە لەرۆژانی میوانداری. ئەنوەر بەتەنیا بۆبینینی ناسر دەرۆیشتو من بەتەنیا بۆبینینی هاوسەری ناسر دەرۆیشتم. هاوینان لەئەسکەندەرییە زیاتر بۆیەکتر بینین لەدەوری یەکتر کۆدەبووینەوەو شەربەتێکی ساردمان دەخواردەوەو دواتر هاوسەری عەبدولناسر منی بۆگەڕان لەناو باخی خۆیان دەبرد، ئەنوەرو ناسر یان پێکەوە سەرقاڵی قسەکردنبوون یان تەماشای فیلمیان دەکرد. ئەمەیان لەئەسکەندەرییە زۆرئاسایی بوو بەڵام لەقاهیرە بەم شێوەیە نەبوو.

تەماشاکردنی شوفێر لەئاوێنەی بچووکی ئۆتۆمبێل ئاسایی نەبوو یەکەم سووتانی خستە دڵم. ئەم پیاوە شوفێری پێشووتری من نەبوو. هەمان شوفێربوو کەمنی بۆبەخاکسپاردنی باوکم دەبرد، بەهەمان شێوە لەئاوێنە تەماشای دەکردم. لەهەمان کات زانیم کەسێك لەماڵی ناسر مردووە. داوام لێکرد رادیو بکاتەوە دەمویست لەم دڵەڕاوکێیە بێمە دەرەوە. دەستبەجێ دەنگی نەجات سەغیرە دەهات گۆرانی بەناوبانگی ((ئەی میسری خۆشەویستم)) دەگوت ئەم گۆرانییە بۆکەسانێکبوو کەبەهەر هۆکارێکی وەك خوێندن، کار، یان مەبەستێکیتر وڵاتی خۆیان کۆچیان دەکرد، گۆرانی گەیشتبوو شوێنێك کەپیاوێك لەوڵاتی خۆی دەرۆیشتە دەرەوە. رووم لەشوفێرکردو گوتم:((ئەم رادیویە بکوژێنەوە)) رووی پرلەپرسیاری تێکردم بەڵام رووی خۆم وەرگێڕاو تەماشای دەرەوەم دەکردو گوتم:((ببوورە نازانم بۆ، بەڵام توانای قسەکردنم نییە.)) ترسەکانی من دەستیان پێکرد. کاتێك گەیشتمە ماڵی ناسر وەزیری ناوخۆ لەسەر قادرمەکان دانیشتبوو سەری خۆی بەدەستەکانی گرتبوو.

پرسیم:((چی بووە؟)) وەلأمیان نەدایەوە. پرسیارم لەیەكێك لەخزمەتكارانی ناسركرد: ((ڕووداوێك بۆناسر ڕوویداوە؟)) بەلأم لەبەر گریان توانای وەلأمدانەوەی نەبوو. بەنەرمی پرسیم:((هاوسەری ناسر لەچ شوێنەكە؟))

لەوەلأمدا گوتی:((لەژووری خۆیدایە پزیشك درمانی ئارام كەرەوەی پێداوە.)) ڕۆیشتم بۆژووری هاوسەری ناسر لەڕێگا كوڕی گەورەی خالّدم بینی گوتم:((دەتوانم دایكت ببینم؟))

گوتی:((باوەڕ ناكەم چونكە بەدەرمانی ئارام كەرەوە خەوتووە.))

هیچ كەسێك بۆی باس نەكردم چی ڕوویداوە، وەك گێژەكان بۆهەموولایەك دەڕۆیشتم نەمدەتوانی چ بڕیارێك بدەم. چی بكەم؟ ئەنوەر لەچ شوێنێكبوو؟ تەماشای خۆمكرد جلوبەرگەكانم شینبوون، ئەم جلوبەرگانە بۆهەر ڕووداوێك كەڕوویدابێت لەبار نەبوون. بیرم كرد دەبێت بگەڕێمەوە بۆماڵەكەمو جلوبەرگەكانی خۆم بگۆڕم، ئەوكات دەمتوانی پێشوازی لەمیوانەكان بكەم یان لەتەنیشت هەموو ژنەكانی ئامادەبوو دانیشمو هەموو هاوكارییەك بكەم. لەناو ئۆتۆمبێلّ بیركردنەوەكانی خۆم لەسەر یەكتر دادەنان هاوسەری ناسر نەمردووە، خالّدم بەچاوەكانی خۆم بینی، بۆئەمەش هیچ ڕووداوێك ڕووی نەداوە.

لەوانەیە ناسربێت. بەلأم ئەمەیان نەدەكرا بەبێ ناسر دەمان توانی چی بكەین چۆن لەژیان بەردەوام دەبووین؟ زۆر دەترسام نەك تەنیا لەمیسر لەهەموو دونیا كەسێك نەبوو جێگای ناسر بگرێتەوە. میسر تەنیا كەشتی ناسربوو تەنیا ناسر دەیتوانی لەقەیرانەكان دەربازی بكات. هەژدە سالّ ڕێبەرایەتی ئێمەی دەكرد. كەسێك نەبوو هیوادار نەبێت هەژدە سالّیتر ڕێبەرایەتی بكات. فرمێسك لەچاوەكانم دەهاتنەخوارەوە. شوفێر پرسیاری لێكردم:((خاتوو سادات ڕووداوێك ڕوویداوە؟))

گوتم:((نازانم ڕاست دەكەم هیچ كەسێك قسەی بۆنەدەكردمو گوتم داوا لەئێوەش دەكەم هیچ پرسیارێك نەكەیت.))

كاتێك گەیشتمە ماڵەوە تەلەفزیونم داگیرساند هیچ هەواڵێك لەسەر ناسر بوونی نەبوو، بەپێچەوانە وێنەكانی ناسر بلأودەكرانەوە كەپێشوازی لەسەرانی عەرەب دەكرد. فیلمی خواحافیزی ئەمیری كویتم دەكرد كەناسر سەری خۆی لەسەر شانی ئەمیر دادەنا بەلأم زۆر ماندوو دەهاتە بەرچاو. ناسر جاران نەبوو. چەندینجار كەناڵەكانم گۆڕین لەهەردوو كەناڵی تەلەفزیونی هیچ هەواڵێك نەبوو. لەرادیو بەهەمان شێوە هیچ هەواڵێك نەبوو.

منداڵەکانم پرسیاریان لەمن دەکرد:((دایە چی بووە؟ بۆدەگرێیی باوکم شتێکی بەسەرهاتووە؟)) چەندینجار پشت راستم کردن باوکتان سەلامەتە هیچی بەسەر نەهاتووە، ویستم جلی ڕەشی خۆم دەربێنم چونکە جلوبەرگەکانیترم هەموویان رەنگیان روون و کراوەبوون.

یەکێك لەهاوسەرانی ئەندام پەرلەمان پەیوەندی کردو گوتی:((جەماڵ عەبدولناسر چی بەسەرهاتووە؟))

گوتم:((نازانم.))

بەلام هەردووکمان پێکەوە دەگریاین، گوتی من دێم پێکەوە دەبین، هەموویان دەڵێن جەماڵ عەبدولناسر مردووە.)) چۆن دەیانزانی؟ لێدانەوەی ئاسان نەبوو. ئەم قسەیە وەك بلێسەی ئاگرێکی سەرکێش لەهەمووشوێنێك کاری خۆی دەکرد. ناسر مردووە. ناسر مردووە. وەك دیار شێوەنێکی بێدەنگ لەشەقامەکان دەهات. خەڵك لەسەر شەقامەکان کۆدەبوونەوە. ناسر مردووە.

کاتژمێر حەوتی ئێوارە بەرنامەکانی تەلەفزیون دەبڕێن و دواتر ئایەتێکی قورئان بەدەرکەوت، لەسەرتاسەری میسر نیگەرانییەکان زیاتر دەبوون. کاتژمێر هەشتی شەو، کاتێك روخساری ئەنوەر لەتەلەفزیون بەدەرکەوت، خەڵك ئەوکات زانیان ئەوەی کەنەیان دەویست روویدات روویداوە. کاتێك چاوم بەرووخساری ئەنوەر کەوت زانیم هەمووکەس ئەم رووداوە دەزانن. نەگریا، نەفرمێسکی باراندن، دەردی زۆر لەم لایەنە قورستربوو. ئەنوەر بەخوێندنەوەی:((ئەمرۆ بەئارامی بەرەو پەروەردگارت دەگەڕێتەوە کەرازیو خوشحاڵە لەکردەوەکانت.)) مەرگی ئەوەندە کاریگەری بەسەر ئەنوەرەوە کردبوو کەبۆئەوەی هەناسە بکێشێت هەوڵێستەیەکی دەکرد. بەئارامی گوتی:((ئێستا ناخۆشترین هەواڵ لەسەر ئازاترین و شەریفترین مرۆڤ بەئێوە دەگەێنم. سەرۆککۆمار، جەماڵ عەبدولناسر، دوای نەخۆشییەکی درێژخایەن کەزانستی نوێی پزیشکی لەچارەسەرکردنیدا بێتوانابوون، کۆچی دوایی کرد.))

چۆن دەبێت ناسر مردبێت؟ تەمەنی تەنیا چەنجاو دووساڵبوو، بۆمن و تەواوی میسر هەواڵێکی چاوەڕوان نەکرابوو. بەلام کەسانی نزیك لەسەرۆککۆمار دەیانزانی ئەمەش یەکێك لەزیانەکانی شەڕ دەبێت. ناسر سەلامەتی خۆی لەشەڕی حوزەیران لەدەستدا. تێکشکانی شەرمەزارانەی ئێمە هەموو بیروباوەڕو بوونی لەناسر وەرگرت. ئەنوەر دواتر بۆی باسکردم:((ناسر دوای شەڕ

لەرۆیشتن بەتەنیا لەگەڵ خۆیدا قسەی دەکردن. بەڵام مەرگ لەدەستو روخساری بەجوانی بەدەر دەکەوت. چونکە ناسر لەبیستو پێنجی ئەیلوول نەمرد. ناسر لەپێنجی حوزەیرانی ١٩٦٧ مردبوو.)) لەپێنج شەممەی یەکی تشرینی یەکەمی ١٩٧٠، رۆژی بەخاکسپاردنی ناسر پێنج ملیون کەس ئامادەبوون. لەبەر خۆشەویستی ناسر لەلایەن سەرانی وڵاتانی عەرەبی ئێمە سێ رۆژ دواتر بۆفاتیحە خوێندنمان دیاریکرد، بەپێچەوانەی نەریتەکانی پێشوو. بەخاکسپاردنی ناسر گەورەترین مەراسیم بوو لەجیهاندا. خەونەکەم وەك خۆی دەبینیەوە قەزافی لەفرۆکە دەهاتەخوارەوە دەیگوت:((باوەڕ ناکەم، باوەڕ ناکەم.))

لەرۆژەکانی دواتر زۆر کەمتر ئەنوەرم دەبینی بەردەوام لەپێشوازی سەرانی وڵاتانبوو، پاراستنی ئەمنییەتی ئەم سەرانە لەکارەکانی زۆرپێویستی هەمان سەردەم هەژمار دەکرا. نەدەگەڕایەوە ماڵەکەمان. لەکۆشکی قوببە دەمایەوە کەجەستەی ناسر لەهەمان شوێنبوو. لەرۆژی بەخاك سپاردنی ئەنوەر بۆماوەیەك لەهۆش خۆی دەچێت دەیگوازنەوە بۆناوەندی فەرماندەی گشتی شۆڕش. پێنج کاتژمێر دواتر کاتێك لەخەو هەڵدەستێتەوە، ترسابوو دەبینێت خەڵکی خەمبار جەستەی ناسر لەشەقامەکان تێپەڕ دەکەن. کاتێك کەئەنوەر خۆی بۆناشتنی ناسر ئامادە دەکرد، من لەگەڵ هاوسەری بەرپرسانی حکومەت لەتەنیشت هاوسەری ناسر لەماڵەکەیان دانیشتین. چەند قورسبوو بۆهاوسەری ناسر، هەلومەرجێکی زۆر دژواربوو. خەمی خۆی لەناودڵدا رادەگرتو دەشاردەوە. بەردەوام بووم دووبارە دەکردەوە ئەمەیان خواستی خودابوو. بەڵام نەمدەتوانی لەخەمەکانی خۆم کەمتر بکەم.

یەکێك لەوانەی کەبۆسەرخۆشیو دڵنەوایی هاتبوو کاتێك گەیشتە تەنیشتمو لەژێر لێوەکانی گوتی:((خاتوو سادات، پیرۆزە.))

تەماشایەکی توندم لێکرد. باوەڕم نەدەکرد کەسێك تاکو ئەم رادەیە نەگونجاو قسەی هاوشێوە بکات. دەمویست هاوسەری سەرۆکی میسربم. ئەمەیان بارێکی قورسو بەرپرسیارەی زۆر گەورەبوو نەمدەویست زیاتر ژیانی تایبەتی خۆمان لەدەست بدەین. زۆر زیاتر لەدەستم دەرۆیشت کەرۆیشتبوو. ئەنوەر دوای مەرگی ناسر کەخۆشەویستی زۆری بۆناسر هەبوو خەمباربوو، هیچ کاتێك بیری نەدەکردەوە سەردەمانێك دەبێتە سەرۆککۆماری میسر. هەمووکاتێك بڕیاری کۆتایی لەدەستی سەرۆککۆماربوو.

ئێستا ئەم قورسایە لەسەرشانی ئەنوەربوو، هەرچەند بەفەرمی تاکو مانگێك وەك سەرۆکۆمار دەستی بەکار نەدەکرد. پاڵەپەستۆی زۆری روحی لەسەربوو. ئێمە لەشەڕ تێکشکابووین، خاکی ئێمە لەژێر دەستی دوژمن دابوو. خەزێنەی حکومەت ئەوەندە خاڵیبوو کەبۆچەند مانگێتر حکومەت نەیدەتوانی مووچەی سەربازو فەرمانبەرانی بدات لەهەمان کات گرتووخانەکانی ئێمە پڕبوون لەکەسانی سیاسی کەژمارەیان بیستو سێ هەزار تێپەڕیکرد، زۆربەیان ئیخوان موسلمین بوون، تەنیا هێزی بیانی کەپەیوەندیمان لەگەڵدا هەبوو یەکێتیی سۆڤیەت بوو کەئەنوەر هیچ کاتێك باوەڕی بەسوڤیەت نەدەکرد. من زیاتر باوەڕم بەئەنوەر هەبوو لەناو هەموو سەرکردەکانیتر کەبتوانێت بەردەوامی بەرێگای ناسر بدات. هاوسەرم ئازاترینو بەئیمان ترین کەسبوو کەئیمانی تەواوی بەخودا هەبوو کەپشتیوانی دەبێت. بەبوونی تەواوی ئەم لایەنانە دیسان نیگەرانی دەبووم. هەمووکاتێك کەسانێك لەدەوری ناسر دەسوڕانەوە تەنیا مەبەستیان دەرفەت قوستنەوەبوو، هەمان دەست بژاردەکانی بۆمانەوەی هێزو دەسەلاتی خۆیان گومانیان بۆناسر دروستکردن. ئێستا دەبوون بەدەسەلاتدار لەناو حکومەتی ئەنوەر.

دەمزانی دژی ئەنوەر دەوەستنەوەو بڕیارەکان جێبەجێ ناکەن. ئەنوەر ناچار دەبێت لەبەر دژایەتی ئەمانە بەتەنیا لەبەرامبەر هەمووکێشەکانی میسر بەرگری بکات. کەسانێك لەدەوروبەری دەبن کەهیچ وەفایەکیان بۆئەنوەر نابێتو بەردەوام ئازاری دەدەن. زۆری نەبرد لەهەمان کات کەناسر کۆچی دوایی کردو هاوسەرم جێگای گرتەوە وەك سەرۆککۆمار هەستم پێکرد.



## بەشی هەشتەم
## خائینانو خیانەت

لەناو باخی ئێمە لەجیزە وەستابووم. چوار دەورم هەموو بڵێسەکانی سوورو زەردی ئاگرێکی سەرکێشی بەهەڕەشەو گوڕشەو ترسناکدام، بلێسەکانی بەسەر گوڵەکانی ماگنولیاو سنوبەرەکان هەڵدەکشایە سەرەوە بەرزتر لەخانووی ئێمە. ئەم رووناکییەیی شووم لەچ شوێنێك هات؟ تەماشای خانووی خۆمان دەکەم لەناو ئاگردا دەسووتا! دەتوانم کڵپەو گڕی ئاگری سووتێنەر لەناو خانوودا ببینم کەلەناو هەموو پەنجەرەکان دەهاتە دەرەوە. هەوڵی خۆم دەدەم بۆرزگارکردنی گیانی منداڵەکانم، هاوسەرەو دایکم بەرەو ماڵەکەم بڕۆم، بەلاّم هێزی جوڵانەوەم نەبوو، دەمەوێت هاوار بکەمو داوای هاوکاری بکەم، بەلاّم هاوارکردم بێدەنگە. بەبێتواناى دەوەستم، تەماشای دوکێلّ دەکەم کەرووی رووباری نیلی داپۆشیبوو. بەلاّم تەماشای دەکەم ئەمەیان دوکێڵێکی ڕەش نییە. سپییە! ئەگەر وایە تاکو ئێستا هیوایەك هەیە. دەڵێم:((خودایە هاوکاریمان بکە، هاوکاریمان بکە میسر رزگار بکەین.))
ئەنوەر، دەبێت بۆئەنوەر باس بکەم. بەپەلە ڕۆیشتم بۆژوورەکەی تاکو خەونی خۆم بۆباس بکەم، بەهەست لێدراوی گوتم:((پیلانەکان دژی تۆ سەرکەوتوو نابن. دوژمنان هەوڵی کوشتنت دەدەنو وڵات بەدەستەوە بگرن، بەلاّم دەستیان بەتۆ ناگەن لەم لایەنەوە پشتراستم چونکە

دوكێڵی ئاگری كەلەخەودا بینیم سپی بوو نەك ڕەش. تۆ لەگەڵ میسر بەسەلامەت دەمێننەوە!))

هاوسەرم هیچ قسەیەكی نەكرد، بەڵام زەردەخەنەیەكی كرد، نازانم باوەڕی بەخەونی من هەبوو، ئایا من خۆم باوەڕم بەخەونەكانم هەبوو. بەڵام خەونم لەسەر ناسر دروست دەرچوو. ئایا ئەمە خەونە لەهەمان دەستە خەونەكانبوو؟ لەم لایەنەوە بیرم ئاسوودە بوو. بەڵام مەترسی سەر ئەنوەر زۆر گەورەبوو تاكو ئەوكات دەترسام.

ئەنوەر دەبێت بەتوندترین شێوە دژی ڕكابەرانی ڕاوەستێت. بیروباوەڕی ئەنوەر لەهەندێك لایەن لەگەڵ ناسر جیاوازبوو چونكە خەڵكانێكی زۆر لەناو میسر وەفاداری جەماڵ عەبدوڵناسر بوون. ئەنوەر بەپێچەوانەی ناسر، دەیویست سانسۆر سنوورداروئازادی بەیانی سیاسی هانبدات. ئەنوەر پێچەوانەی ناسر، دەیوویست دەرگای میسر بەسەر بازارەكانی بەسوودی ڕۆژئاوایی بكاتەوە، ئەنوەر بەپێچەوانەی لایەنگرانی ڕێگای ناسر، بەردەوامی بەشەڕ لەگەڵ ئیسرائیل بدات. بەڵام هەلومەرجی هاوسەرم لەپۆستی سەرۆككۆمار زۆر هەستیاربوو. بەباوەڕی هەندێك كەس نابێت لەبنەڕەتەوە ئەنوەر ببێتە سەرۆككۆمار.

زۆربەی ئەوانەی لەگەڵ ناسر لەحكومەتدا بوون دژی ئەنوەر بوون: سەرۆك وەزیر عەلی سەبری، وەزیری ناوخۆ جومعە شعراوی، وەزیری كاروباری سەرۆككۆمار سامی شەرەف، وەزیری بەرگری محەممەد فەوزی، وەزیری هەواڵگەری محەممەد فائق، سەرۆكی دەزگای زانیاریی‌و ئاسایش ئەمین هویدی. ئەم كەسانە، زۆربەیان لەناو كومیتەی تاریكی خاوێنكردنەوەی چاكسازیی زەوییەكانی كشتوكاڵی دەرەبەگەكان بەشداربوون، بەگرتنی كەسانی بەرهەڵستكاری خۆیان، گوێی گرتن لەپەیوەندییەكان‌و دروستكردنی ڕاپۆرت لەسەر بیروباوەڕی سیاسییان هەزاران كەسی ئاسایی میسر، دەسەڵاتی زۆر بۆخۆیان دەستەبەر كردبوو. لەسەردەمی ناسر ئەم گروپانە دەسەڵاتی خۆیان زۆر زیادكردبوو، هەموویان خاوەن ڕێكخستنی خۆیانبوون بەكردەوە نەدەكرا كۆنترۆڵ بكرێن. لەسەردەمی ئەنوەر سادات خەیاڵی ئەوەیان نەبوو بڕێك ئەم هێزەی خۆیان لەدەست دەربچێت.

لەدەستپێكی سەرۆكایەتی هاوسەرم، هەموو جوڵانەوەكانی تووڕەیی ئەم بەرەیی زیاتر دەكردو لەبەرامبەری دەوەستانەوە. ئەنوەر تەنیا دوای دوومانگ لەسەرۆكایەتی خۆیدا لەجیاتی كۆمیتەی كەسەربەخۆیانە دەستی بەسەر موڵك‌و ماڵی خەڵكی چینی ناوەند دەگرت، بڕیاری

دەست بەسەرداگرتن‌و تۆمارکردنی کەلوپەلی تایبەت کەدەکەوتە ژێر چاودێری حکومەت هەڵوەشاندەوە. لەجیاتی گوێی گرتن لەپەیوەندی تەلەفۆنی‌و دروستکردنی راپۆرتێکی رەش کەیەکێك لەکارەکانی وەزارەتی ناسربوو، ئەنوەر گوێگرتن لەپەیوەندی تەلەفۆنی خەڵك، بەبێ بڕیاری دادگە، بەنایاسایی راگەیاند. لەلایەنی مافی هاولاَتیبوون‌و دەستوەردان لەژیانی تایبەتی خەڵك ئامادە نەبوو راپۆرتێك کەپێشتر ئامادە دەکران بخوێنێتەوە.

هەموو ئەم هەنگاوانەی دیموکراسی بەدیدگای ئەندامانی کابینە تاوان هەژمار دەکران. ناسر پەیوەندی زۆرنزیکی لەگەڵ یەکێتیی سوڤیەت هەبوو، ئێستاش وەفادارانی هەمان بیروباوەڕیان هەبوو. کاتێك ئەورووپاو ئەمەریکا خوشحاڵی خۆیان سەبارەت بەئەوەی کەلەمیسر روویدەدا بە(بەهاری قاهیرە) ناویانبرد، دوژمنانی هاوسەرم لەرەخنەگرتن لەجولاَنەوەکانی لەرووی راگەیاندنەوە دەستیان بەپڕوپاگەندەی خراب دژی دەکرد. بۆئەندامانی پارتی یەکێتیی سوسیالیستی عەرەب دەیانگوت:((ساداتو هاوبیرانی لایەنگرو نوێنەرانی هێزی کۆنەپەرستو دواکەوتوون. کۆنەپەرستان بۆ لەنابردنی مافی کرێکاران‌و جوتیاران کەبەدەستیان هێناوە دووبارە دەکەن بەچینایەتی.)) پێنج ئەندام لەهەشت ئەندامی کۆمیتەی بەرزی بەرێوەبردنی یەکێتیی سوسیالیستی عەرەب، تەنیا پارتی سیاسی ولاَتی ئێمە زۆربەتوندی لایەنگری یەکێتیی سۆڤیەت بوون کەئەنوەر بەتاڵی باسی ئەمانەی دەکردو بەناوی پۆلیت بیروی ناودەبردن (کۆمیتەی سیاسەت داڕێشتن) ئەم کەسانە بۆبێباوەڕ کردنی هاوسەرم لەبەرامبەر خەڵکدا. دیدگای خۆیان بێترس دەگەیاند. لەرۆژنامەکان ڕەنگدانەوەی خۆیان هەبوو کەچۆن رەخنەیان لەسیاسەتی ئەنوەر دەگرت. دیپلۆماتەکانی بیانی. ئەلیوت ریچارد سۆن، نێردراوی سیاسی ئەمەریکا، دوای کۆتایی هاتنی رێورەسمی ناسرو گەڕانەوەی بۆولاَتی خۆی، بۆسەرۆك نیکسۆن باس دەکات ئەنوەر ناتوانێت بۆماوەی شەش هەفتە بەردەوام بێت. یەکێتیی سۆڤیەت هەمان بیروباوەڕی هەبوو.

ئەوەی زیاتر لەهەمووشتێك ئەندامانی کابینەی حکومەتی توورە دەکرد خوشحاڵی خەڵکبوو لەبەرامبەر بڕیارەکانی ئەنوەر. میسرییەکان لەبەرامبەر ئازادییەکانی نوێی خۆیان خوشحاڵبوون. بەتایبەتی هەڵوەشاندنەوەی یاسای سەفەرکردن بۆدەرەوەی میسر بۆهەموو کەسێك هیچ دەرفەتێك نەبوو. ئیتر بۆوەرگرتنی مۆڵەتی رۆیشتنە دەرەوە لەمیسر پێویست بەپڕکردنەوەی فۆرم‌و لێپرسینەوە نەبوو. میسرییەکانی کەپێشتر لەولاَتی خۆیان هەلاَتبوون

دەگەڕانەوە. هەمان گۆشەگیری کەمیسری لەناوخۆ گرتبوو بوونی نەدەما. کاری ناسریستەکان بۆلەناوبردنی هاوسەرم دەستی پێکرد.

دوای ماوەیەك دەستبەکاربوونی ئەنوەر یەکێك لەهاوڕێیانم منی لەمەترسییەك ئاگادار کردەوە:((شەوی رابردوو وەزیری ناوخۆ لەسەرمێزی نانخواردن زۆر بەخرابی باسی ئەنوەری دەکرد.)) یەکێکتر گوتی:((لەخۆدی سامی شەرفم بیستووە کەهاوسەرت کەسێکی لاوازە هیچ یەکێك لەوەزیرەکان رێزی ناگرن.)) کەسانێك کەژمارە تەلەفۆنی ئێمەیان دەزانی پەیوەندیان دەکردو هەموو پروپاگەندەکانی دژی ئەنوەریان بۆباس دەکردم. ئەوانەی کەژمارە تەلەفۆنی ماڵی ئێمەیان نەبوو سەردانی ماڵی ئێمەیان دەکرد. میسرییەکانی وەفادار من زۆربەی ئەم کەسانەم نەدەناسین، گیانی خۆیان دەخستە مەترسیو ئێمەیان لەهەموو رووداوێك ئاگادار دەکردەوە، لەهەموو کاتەکان سەردانیان دەکردین. من داوام لەخزمەتکاری خۆمان کردبوو لەهەمووکاتەکان رێگایان لێ نەگیرێتو من دەمەوێ هەموویان ببینم. مەترسی کودەتا زیاتر دەبوو. من دەموویست بزانم چ کەسێك لەپشت ئەم هەموو رووداوانەی دژی هاوسەرم وەستاوە.

دوای چوارمانگ لەسەرۆکایەتی ئەنوەر نەخشەی ئاشتی نوێی پێشکەشی پەرلەمان کرد، رەخنەو دژایەتییەکان زیاتربوون. ئەنوەر پێشنیار دەکات ئەگەر ئیسرائیل هێزەکانی خۆی لەبیابانی سینا بۆدواوە بگەڕێنێتەوە، میسر ئامادەیە دووبارە نۆکەندی سوئێز بکاتەوە. زیاترکردنی ئاگربەستی پێشنیارکراوی راجر لەسێ مانگ بۆشەش مانگ درێژ بکاتو ئامادەیی خۆی نیشاندا کەدووبارە پەیوەندییەکانی سیاسی لەگەڵ ئەمەریکا راگەیاند.

سەرسوڕهێنەرترین پێشنیاری واژۆکردنی رێکەوتنی ئاشتیبوو لەگەڵ ئیسرائیل لەرێگای نیوەندگیری نەتەوەیەکگرتووەکان. بەدرێژایی بیستو دووساڵ لەبوونی ئیسرائیل هیچ سەرکردەیەکی عەرەب ئەم هێزو بوێرییەیی نەبوو. دوژمنانی ئەنوەر لەبەرامبەر ئەم پێشنیارەی نوێیو گرنگ زۆرترسان، هەوڵی خۆیان چەند بەرامبەرکرد بۆزیاتر بێ باوەڕکردنی ئەنوەر، سیاسەتی ئەنوەر پشتیوانی گشتی بەخۆیەوە دەبینیو مەترسی لێدەکەوتەوە. دوورکەوتنەوەی لەیەکێتیی سۆڤیەتو سوسیالیزمو روو لەرۆژئاواو دیموکراسی کردن رەوتێکبوو دەبێت سەرکوت بکرێ.

رۆژانە باسی هەواڵەکانی جۆراوجۆرم بۆئەنوەر دەکرد کەرۆژانە بەدەستم دەگەیشتن. لەنیسان، شەش مانگ لەسەرۆکایەتی ئەنوەر دوژمنانی لەپڕوپاگەندە بلاوکردنەوە دژی ئەنوەر شانازیان

بەخۆیانەوە دەکردو بانگێشەی ئەوەیان دەکرد توانای ئەوەیان هەیە چیرۆکێك دژی ئەنوەر لەقاهیرەو دوای کاتژمێرێك لەهەموو میسرو دواتر لەقاهیرە دووبارە بەدەستەوە بگرن. لەرێگای تەلەفۆنی تایبەتی ئێمە راپۆرتی جۆراوجۆر بەدەستم دەگەیشت کەگومانی تێدا نەبوو تەلەفۆنی ماڵی ئێمە واتە شوێنی مانەوەی سەرۆککۆمار کۆنترۆڵ دەکرا. وەفادارانی ئەنوەر بەردەوام پرسیاریان لەمن دەکرد: ((بۆچی ئەنوەر هێز بەدوژمنانی خۆی دەدات؟ چون رێگا بەوەزیرەکانی دەدات باسی ئەنوەر لەناو خەڵکدا بکەن بەکەسێکی رواڵەتی وەك مەلیکەی بریتانیایە، ئەمانە بەجۆرێك خەڵك هەڵدەخەڵەتێنن کە وڵات تەنیا بەبڕیاری وەزیرەکان گۆڕانکاری دەکات نەك ئەنوەر؟))

لەمانگی نیسان شەوێك زۆربە ترش‌و تاڵی پرسیارم لێکرد:((ئەنوەر چاوەڕێی چی دەکەیت؟)) چاوەڕێی تاکو بێن قوڵبەست بکریت‌و ڕەوانەی گرتووخانەت بکەن؟ بەڵێ من هاوسەری تۆم نیگەرانی گیانی تۆم، لەهەمان کات نیگەرانی میسرم. ئەگەر کۆمۆنیستەکان دەست بەسەر میسردا بگرن دووبارە دەگەڕێننەوە بۆکۆشەگیری جاران تۆمیسر بەرەو دیموکراسی رادەکێشی بەرەو ئاشتی لەگەڵ ئیسرائیل‌و باشترکردنی پەیوەندی لەگەڵ وڵاتانیتری، بەڵام ئەمانە لادەرن.)) هەوڵمدا بەئارامی بمێنمەوە، بەئارامی قسەکانی خۆم بکەم، بەڵام نەمتوانی. بەدەنگی بەرز گوتم:((تۆ ئێستا لەگەڵ دوژمنەکانی خۆت لەکێبڕێی، براوە کەسێك دەبێت کەخێراتر ڕکابەری خۆی لەمەیدان دەربکات. ئەمانە هەموویان دژی تۆ یەکگرتوون توانای ئەوەیان هەیە کۆمەڵانی خەڵك دژی تۆ هانبدەن. چاوەڕێی چی دەکەیت ئەنوەر؟ بۆم باس بکە.))

زەردەخەنەیەکی ئارامیکردو گوتی:((زۆرباشە، جیهان، بەڵام تۆشتێکی زۆر گرنگت لەیاد کرد.)) روی لەئاسمان کردو گوتی:((خودا لەگەڵ مندایە.))

گوتم:((بەڵێ پشتراستم خودا لەگەڵ تۆدایە، بەڵام خودا هەمووکاتێك لەگەڵ ئەوانەدا نییە کەئاگاداری خۆیان نین. لەوانەیە خوداش لەتۆ بێزاربێت‌و بلێت لەتۆجوڵانەوەیەك لەمن بەرەکەت. ئەنوەر بەردەوام باس دەکەیت خودا لەگەڵ مندایە ئەمەیان بەتەنیا وەك پێویست نییە دەبێت خۆت جوڵانەوەیەك نیشان بدەیت تاکو خودا پشتوانیت بکات.))

دیسان بەزەردەخەنە گوتی:((جیهان مەبەستی من ئەوە نییە کەهیچ کارێك نەکەم‌و دانیشم من کاری خۆم دەکەم بەڵام بەبێدەنگی، وەك تۆنیم بەردەوام ورووژاندن بۆبابەتەکان بکەم‌و من تەنیا

گوێی لەقسەکانی بێکردەوە ناگرم، هەرکاتێك کاتی جولأنەوەبێت دەبینی کەمن بێ هەولۆێست نیمو ئامادەیی تەواوم هەیە.

بۆئەوەی لەم لایەنەوە پشتراستبم کەنەخشەی تایبەتی خۆی هەیە بۆپیادەکردن، گوتم:((ئەگەر شتێك روویدا من دەتوانم چی بکەم؟))

گوتی:((کەسانێك کە ئەم قسەوباسانە بۆتۆ باس دەکەن بالەسەر کاغەزێك بنووسنو لەژێرەوەی واژۆ بکەن تاکو من باوەڕیان پێی بکەم.))

خەیاڵم تاکو ڕادەیەك ئاسوودە بوو، زانیم دەیەوێ بەڵگە لەسەر هەندێك کەس کۆبکاتەوە کاتێك کەدادگایی دەکردن بەڵگەی تەواوی لەبەردەستبێ. بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ قسەکانی ئەمەیان دەگەیاند.

ڕۆژی دواتر یەکێك لەئافرەتانی ئەندامی پەرلەمان هەندێك دەنگوباسی پێی ڕاگەیاندم من داوام لێکرد لەسەر کاغەز بەواژۆی خۆی پێشکەش بەمن بکات.

بەبێ ئەوەی هیچ پرسیارێك بکات دەستی بەنووسین کرد:((وەزیرانی ئێمە بۆپارتی یەکێتیی سوسیالیستی عەرەب دەنووسن ڕێبەرایەتی ئێمە زۆر لاوازە ئێمە باوەڕمان بەم ڕێبەرایەتییە نییە سیاسەتەکانی ئەم دوایی میسر پێچەوانەی بیروباوەڕەکانی ناسرن.)) کاتێك ئەم ڕاپۆرتەم گەیاندە دەستی ئەنوەر، گوتی:((زۆرباشە نیشانی وەزیری ناوخۆ دەدەم.))

وەزیری ناوخۆ؟ ڕێبەری دژبەرەکان؟ سەرم سوڕمابوو، هاوارم کرد:((ئەنوەر چۆن دەتوانی ئەمەیان بکەیت؟ تۆئەم ئافرەتە نازەنینە کەهەواڵمان پێدەگەێنیت فڕەدەدیتە ناو لانەی شێر!))

ئەنوەر پێداگری دەکردو گوتی:((دەزانم چی دەکەم، دەبینی.))

دەمزانی کەهاوسەرم پێداگری لەسەر بنەماکانی ئەخلاقی دەکات، بەڵام چۆن دەیتوانی گیانی ژنانو پیاوانی دڵسۆزی ئێمە دەخاتە مەترسییەوە؟ دواتر زانیم چ دەکات. ئەنور بەنیشاندانی ئەم ڕاپۆتانە دەیویست نیشانی نەیارەکانی بدات من ئاگاداری مەبەستو ئامانجەکانی ئێوەم، نیشانیدا کەزۆر لەخۆی پشتراستو ئاگادارە. ئەمانەش دەیانزانی دەسەڵاتی کۆتایی لەدەستی سەرۆککۆمار دایە. هەرکاتێك بڕیار بدات دەتوانێت ئەمانە بخاتە ناو گرتووخانە، بەڵام ئەگەر ئەم بڕیارەی دەردەکردن، سوپا بەوەفاداری دەمایەوە یان لەگەڵ دوژمنی، وەزیری بەرگری دەمانەوە؟

ڕۆژێکیان یەکێك لەدراوسێیەکانمان گوتی:((هەمان ئەفسەری کەهاوسەری تۆ ڕەوانەی ماڵی ئێمەی کردبوو چەند پیاوێکی باشبوو.)) ئەفسەر؟ ((لەگەڵ وەزیری ناوخۆ هاتبوو پرسیاریکرد ئایا دەتوانێت لەنهۆمی سەرەوە چاودێری ماڵی ئێوە بکات. گوتی دەیانەوێت بزانن ئەگەر کەسێك ویستی هێرش بکاتە سەر هاوسەرتان، باشترین ڕێگای پاراستن لەماڵی چ شوێنێك باشتر دەبێت.))

سوپاسم کرد چونکە هەستی دەکرد کەچاکەی بۆئێمە کردووە. بەڵام دوو دڵبووم کە حەقیقەت شتێکیتر بێت. ئەمانە بەدوای باشترین شوێن دەگەڕان بۆگرتنی ئەنوەر.

هیچ کاتێك لەژیاندا ئەوەندە هەستم بەتەنیایی نەکردبوو، هیچ کەسێکمان نەبوو بۆ ڕوو تێکردن، نەکەسێك کەقسەی لەگەڵدا بکەین. هەمان شەو ڕۆیشتم بۆژووری ئەنوەر لەتەنیشت دەمانچەی سەر مێزی دانیشتم چونکە بەم شێوەیە زیاتر هەستم بەئارامی دەکرد. گوتم:((دەرگای قۆفڵ بکە.))

پرسیاریکرد:((بۆ؟ ئێمە هیچ کاتێك دەرگای خۆمان قۆفڵ ناکەین.))

پیداگریم کرد:((ئەمجارەیان دەبێت قوفڵ بکرێ.)) ئەوەندە بەسەر سوڕمانەوە تەماشای دەکردم کەزۆر تووڕە بووم. لەدەمم دەرپەڕی گوتم:((کاتێك نیوەی شەو بۆگرتنی تۆ هێرش دەکەنە سەرماڵی ئێمە نەتوانن دەستبەجێ تۆ بگرن و دەرفەتێك بۆئێمە دێتە پێشەوە کەخۆمان بەچەك ئامادە بکەین پێش ئەوەی تۆ بکوژریت چەند کەسێك بکوژی.))

ئەنوەر گوتی:((ئای جیهان تۆ بەبیرکردنەوەکانی خەیاڵی خۆت هەمووومان بەکوشت دەدەیت.)) بەڵام کاتێك من ڕۆیشتم دەرگام قۆفڵکرد هیچ قسەیەکی نەکرد.

ناسریستەکان لەگەڵ من بەهەمان ڕادەی ئەنوەر دوژمنایەتی خۆیان دەکرد لەدەست پێك ڕەخنەیان لەمن دەگرت لەبەرامبەر کاروچالاکییەکانی کۆمەڵایەتیم، بەردەوام ئاستەنگیان بۆ دروستکردم. لەسەردەمی تازییەیی ناسر لەتەنیشت هاوسەری ناسر دادەنیشتم و لەگەڵ بیروباوەڕکانی خۆم لەشەڕدابووم، ئایا ئێستا وەك هاوسەری سەرۆککۆماری نوێی میسر، دەبێت هاوشێوەی هاوسەری ناسر لەسەر داب و نەریتی کۆن دەڕۆیشتم کەلەماڵەوە دانیشم و دایك و هاوسەرێکی باشبم بۆمنداڵەکان و سەرۆککۆمار ئەم ئەرکەی کۆمەڵایەتی خۆم ڕازی دەبووم؟ یان دەبێت لەخزمەتکردنی خەڵك بەردەوام دەبووم؟

من ئەمەیانم دەزانی هەرکارێك لەناو کۆمەڵگەدا بکەم کێشە دروست دەکات، چونکە تاکو ئەوکات هاوسەری هیچ سەرۆککۆمارێك لەدەرەوەی چوارچێوەی ماڵیدا هیچ کارێکی نەدەکرد، هەرچەند لەسەردەمی میسری کۆن ژنان خاوەن پلەو پۆستو ڕێزی تایبەتی خۆیانبوون. لەشکر ڕەوانەکردنی مەلیکە حەتیشپسوت فەرمانڕەوایی میسری لەجیبۆتیو سومالی زیاد کرد. ئەم مەلیکەیە بۆ پێداگری کردن لەتواناکانی خۆی کەنیشانی دەوروبەر بدات بڕیارێك دەردەکات لەسەر بەردی گۆری لەلاکسور وێنەی بکێشن وێنەکە بەشێوەك دەربکەوێت کەخاوەن ریشە. تەنیا لەساڵەکانی دوایی پلەی ئافرەتان لەمیسر بۆخوارەوە دادەبەزی. هەموو ژنەکان خۆیان تەسلیمی ئەم بڕیارانە کرد. بەڵام نەمدەتوانی چالاکییەکانی کۆمەڵایەتی خۆم کەدەست پێکردبوون بەلاوە بنێم. هەستمکرد خودا هێزو هاوکاریکردنی خەڵكو توانای تێکەیشتن لەکێشەکانیانو کار لەگەڵکردنی پێداوم. وەك هاوسەری سەرۆککۆماری نوێ، دەمتوانی ببم بەهاوبەشی دەردی خەڵكو تاکو ڕادەیەك چارەسەریان بکەم، پەیوەندی نێوان خەڵكو ئەنوەریم. دەمزانی کەسانێك هەن ڕەخنە لەکارەکانی من دەگرنو ئەنوەر دەکەوێتە بەرهێرشی ئەم کەسانە کەبۆچی ڕێگا بەهاوسەری دەدات بێتە ناو کۆمەڵگە. بەڵام من پێداگربووم کەسانێك دژی دەوری من دەوەستنەوە بەنەبینراو بزانم. ئەمەیان لەسەر شانی من بوو کەچۆن سوود لەم دەرفەتانەی خودایی وەربگرم.

بەرامبەر بوونەوە لەگەڵ کەسانێك کەخۆیان بەنەریتخوازی گرێدابوو دەستی پێکرد، لەشەوی دەست بەکاربوونی ئەنوەر، میواندارییەك لەکۆشکی عابدین بۆبالیوزەکان ڕێکخرابوو. ئەمەیان نەریت بوو لەناو وڵاتان، بەڵام پەیامی ئەنوەر بۆمیوانەکان نەریت نەبوو. بۆدیپلۆماتەکان باس دەکات:((بەرێبەرانی خۆتان بڵێن میسر ئاشتی دەوێت، بەڵام داگیرکردنی خاکی خۆی قبووڵ ناکەت.))

ئەنوەر سادات بۆئەوەی نیشانی دونیا بدات شێوەی دەسەڵاتی لەکەسانیتر جیاوازە، جوڵانەوەیەکی بێوێنەیکرد، کاتێك منو ئەنوەر پێکەوە گەیشتینە شوێنی میوانداری، داوای لەمن کرد لەگەڵیدا هاوهەنگاویم، نەك وەك هاوسەری ناسر پێنج هەنگاو لەدوای هاوسەری دەڕۆیشت. گرنگتر لەهەموویان. کاتێك میوانەکان ویستیان چاكو چۆنی لەگەڵ ئەنوەردا بکەن منی لەپێش خۆیدانا بۆئەوەی یەکەمجار تەوقە لەگەڵ مندا بکەن دواتر ئەنوەر، من خۆشم لەم جوڵانەوەی ئەنوەر سەرم سوڕمابوو، چونکە تاکو هەمان سات هیچ ڕێبەرێکی موسڵمان ئەم

ڕێزگرتنەی لەهاوسەری وەك ئافرەتێك نەگرتبوو. بەڵام ئەنوەر دەیویست نیشانی دونیا بدات کەئێستا میسر لەژێر فەرمانڕەوای ڕێبەرێکی نوێدا هەنگاو هەڵدەگرێت. وێنەگرەکان بۆساتێك ئەم دەرفەتەیان لەدەست خۆیان نەدا بۆئەمانە ڕووداوێکی نوێبوو. کاردانەوەکانی نەرێنی دەستیان پێکرد.

کاتێك وەستام قاپی خواردنم دەدایە دەستی هەموو دیپلۆماتەکانی بیانی، هاوسەری وەزیری ناوخۆ بەهێواشی گوتی:((نابێت تۆ پێشوازی لەمیوانەکان بکەیت تۆهاوسەری سەرۆککۆماری!)) بەشێوەیەك بیری دەکردەوە لەبەرچاوی خەڵك بچوك دەبم بەڵام من بەپێچەوانە بیرم دەکردەوە، من دەموویست پەیامێکی نوێ لەیەکسانی نیشانبدەم.

لەکاتی پێشوازیکردن لەدیپلۆماتەکان، زەردەخەنەیەکم کردو گوتم:((بەئەدەب بوون چ کێشەیەکی هەیە؟ دەمەوێت پێشوازی لەمیوانەکان وەك ماڵەکەی خۆم بکەم، کاتێك دەبینن من لەخۆم پشتراستم، لایەنی بەرامبەر ڕێزم دەگرن.))جارێکیتر ڕووناکی فلاشی کامێرەکان ژووری پێشوازیان ڕووناك کردەوە.

ڕۆژی دواتر، کاردانەوەکان گەیشتنە ئەوپەڕی بەرزی خۆیان. وێنەی هاوسەرانی مەلێك فارۆق زۆرکەم لەڕۆژنامەکان چاپ دەکران. وێنەی هاوسەری ناسر بەدەگمەن. وێنەی من تاکو ئەوکات چاپ نەکرابوو. لەوێنەکانی کە لەڕۆژنامەکان چاپکرابوون بالیوزو هاوسەرانی خۆیان لەگەڵ ئەنوەر لەکاتی پێشوازیکردن تەنیا دەستم بەدەر کەوتبوو. زۆرپێکەنیمو لەهەمان کات زۆر تووڕە بووم. ئەگەر سەربازانی کۆنی ناسر لەسەر هەلومەرجی نوێی ئافرەتان لەشەردا بوون، زۆرباش دەبوو، من هیچ کێشەیەکم نەبوو. دەستبەجێ بەتەلەفۆن پەیوەندیم بەفەوزی عەبدولحافز سکرتێری ئەنوەر کرد، داوام لێکرد پەیوەندی بەوەزیری کاروباری سەرۆککۆمار بکات پرسیاری لێ بکات بۆچی تەنیا دەستی من لەوێنەکان دەرکەوتووە نەك من؟ بۆی باس بکەن دەبێت شانازی بەوێنەی هاوسەری سەرۆککۆمار بکات کە لەڕۆژنامەکان چاپ دەبێت ئیتر بەهیچ شێوەیەك بەبێ ڕەزامەندی من ئەمەیان دووبارە نەکرێتەوە.

فەوزی بەدووودڵی وەڵامی دایەوە من دەبێت لەهەمان کات ئاگادار دەبووم کەپەیامەکەم ناگەیێنێت. دوای کاتژمێرێك من بۆپێشوازی لەمیوانەکان دەڕۆیشتمە خوارەوە، فەوزی تەلەفۆن دەکاتو دەڵێت:((وەزیری کاروباری سەرۆککۆمار بۆبینی تۆ سەردانی ئێوە دەکات.))

پرسیارم کرد:((پەیامی من گەیشت؟))

بەنارزایەتی گوتی:((نەخێر.))
پێداگریم کردو گوتم:((سوێند بەخوداو پێت رانەگەیاند؟))
((گەر بۆم باس بکەیت پەیامی من بەشوێنی خۆی نەگەیشتووە زۆر خراپتر دەبێت.))
فەوزی پرسیاریکرد:((بۆچی؟))
گوتم:((ئەمەیان پەیامێك دەگەیێنێت کەتەلەفۆنی ئێمە کۆنترۆڵ دەکرێ ئەگەر پەیامی من بەوەزیر نەگەیشتبوو چۆن دەزانێت من توورەم؟))
روونکردنەوەی وەزیر سەبارەت بەدەرنەکەوتنی وێنەی من بەهەمان ڕادە خرابو گاڵتە ئامێزبوو. کاتێك سامی ئەشرەف گەیشتە ماڵی ئێمە گوتی:((خاتوون داوای لێبوردن دەکەم کەرێگام نەدا وێنەی تۆ لەرۆژنامەکان چاپ بکرێت. بیرم لەسەربازەکانی خۆمان دەکردەوە، بۆماوەی چوار ساڵە لەبیابانەکان شەڕ دەکەنو گیانی خۆیان فیدا دەکەن کاتێك وێنەی تۆ ببینن چۆن بیر دەکەنەوە.))
پرسیم:((بۆچی بینینی هاوسەری سەرۆککۆمار چ کێشەیەکی هەیە؟))
ئارەق لەنێوچاوانی دەهاتەخوارەوە. بەپەریشانی گوتی:((سەربازەکان بیر دەکەنەوە ئێمە لەم بیابانانە شەڕ دەکەینو ڕێبەرانی ئێمە لەقاهیرە بەشداری میوانداریيەکان دەکەن.))
وەڵامی وەزیرم دایەوە:((کام میوانداری؟ ئێمە لەمیوانداری یەکتر ناسینی بالیوزەکان ئەرکی خۆمان جێبەجێ دەکرد، نەك سەماکردن بۆهاوڕێیانی خۆمان! ئەوەی ئێمە دەمانکرد بەشێك بۆ لەئەرکی ئێمە.))
بەردەوام پێداگری لەقسەکانی دەکرد:((من نامەوێت سەربازەکانی ئێمە ئازاریان پێی بگات.
زۆربەتوندی بۆم باسکرد:((تۆمنت ئازاردا، بیردەکەیتەوە من دەبێت لەماڵەوە لەپشت پەردەیەك دانیشم نەوەك چاوی پیاوێك بەمن بکەوێت.؟))
گوتی:((داوای لێبوردن دەکەم خاتوون من پشتراستم گۆڤارەکان وێنەتان چاپ دەکەن.))
پرسیم:((بۆچی وێنەی من لەگۆڤارەکان چاپ بکرێت کێشەی نییە بەڵام لەرۆژنامەکان کێشەی هەیە؟)) ئەم پیاوە بۆروونکردنەوەی زیاتر هیچ قسەیەکی نەبوو.
رووداوی دواتر بەنێوانێکی کەمتر روویدا، تەنیا ئافرەتی ناو کابینەی حکومەت دکتۆر حیکمەت ئەبو زید، وەزیری کاروباری کۆمەڵایەتی، منی بۆمیوانداریيەك بانگێشت کرد لەسەر شانازی یەکەم ئافرەتی بۆشایگەری یەکێتیی سۆڤیەت بوو. میوانداریيەکی خۆشبوو، بەڵام دوای دوو

سێ رۆژ، کاتێك دکتور حیکمەت بەتەلەفۆن پەیوەندی بەمنەوەکرد، ئەوەی کەباسی دەکرد وشکبووم، گوتی من بروسکەم بۆ رەوانەکردبووی من دەڕۆم بۆبەشداریکردن لەکۆبوونەوەی ژنان لەسودان، ئەگەر پەیامێکتان بۆژنانی هەمان کۆبوونەوە هەبێت دەگەیێنێت. بەلاَم هیچ بروسکەیەك بەدەستم نەگەیشتبوو دواتر ئاشکرام کرد کەوەزیری کاروباری سەرککۆمار ئەم بروسکە دەشارێتەوە تاکو من بەبیرکردنەوەی خۆی وەك کەسێکی دیار لەبواری کۆمەلاَیەتی یان وەك شەریك لەنوێخوازی ژنانی میسر دەرنەکەوم.

زۆر تووڕە بووم، جارێکیتر بەدوای بینینی وەزیری کاروباری سەرۆککۆمار فەوزی ئەشرەفم کرد، پێداگری دەکرد هیچ بروسکەیەکی بەم شێوە بەدەستم نەگەیشتووە. بەلاَم دوای پێداگری زۆری من دۆزییەوەو ڕەوانەی نووسینگەی منیکرد. دواتر بۆمن ئاشکرا دەبوو کەدەبێت من وەك ئەنوەر دژی دوژمنانی کەرۆژانە لەناو حکومەت بەهێزتر دەبن شەڕ بکەم. ناسریەکان، وەك زۆر لەپیاوانی میسری، بەباوەڕیان ژنی باش دەبێت لەماڵ لەژێرو پشت پەردەیەك دانیشێت.

بەلاَم من رازی نەبووم، ماوەیەکی زۆربوو پیاوانی میسری بەبێ کێشە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ هاوسەرانی خۆیان وەك موڵکو سامانی تایبەتی خۆیانبوو، رۆبۆتەکانی کەئەرکیان تەنیا ئەمەبێت بەدیار نەکەون‌و ژێر دەستەیەکی تەوابن. ئەم جۆرە هەڵسوکەوتانە هیچ بنەمایەکیان نییە، لەناو ئاینی ئێمەدا هیچ بەڵگەیەك نییە کەدەبێت ژن تەنیا فەرمانەکانی لەپیاو وەرگرێت. لەهیچ شوێنێکی قورئاندا نەهاتووە کەدەبێت ژن لەماڵ بمێنێتەوەو لەدەرەوەی ماڵ هیچ کارێك نەکات. لەقورئاندا هاتووە ژن‌و پیاوی لەمافدا یەکسانن، لەهەڵسوکەوتدا یەکسانن. ئایەتی ١٢٤ سورەی نساء لەکتێبی پیرۆز دەڵێت:((هەریەك لەژن‌و پیاو کارێکی باش بکات، لەئیمان بەخودا، هەمان کەس دەچێتە بەهەشت.)) قورئان رێز لەرێبەرایەتی ژن دەگرێت. لەئایەتی بیست‌و سێ سورەی نمل دەڵێت:((لەناو هەمان موڵك ژنێکمان بینی کەبەسەر خەڵکی ولاَتی خۆی پاشایەتی دەکرد، بۆ ئەم ژنە هەموو جۆرە حکومەت‌و نیعمەت‌و جوانی کاروباری ئایینی پێشکەش کرابوو جگە لەم لایەنە تەختێکی شکۆداری هەبوو.))

نەکتێبی پیرۆزی ئێمە نەپەیامەکانی حەزەرتی محەممەد (د.خ) تۆزقاڵێك لەپلەو گەورەی ژنی موسڵمانی کەم نەکردووە، هۆکاری جیاوازی لەناو جیهانی عەرەبی دەگەڕێتەوە بۆنەریتەکان کەدەبێت پیاو لەئافرەت گەورەتر بێت. خۆرادەستکردنی ئافرەت کەپیاوە لەسەرەوەی ئافرەت بێت جیل لەدوای جیل دەبێتە نەریت بەلاَم ئەم نەریتە دەکرێت گۆڕانکاری بەسەردا بێت.

دەبێت لەچ شوێنێك دەست پێبکەم؟ ئەسیوت. دەبێت سەردانی ئەم شوێنە بکەم. دەمزانی بۆتێکۆشان‌و دژی بەرپرسانی حکومەت‌و بەشداریکردنم لەچالاکییەکانی کۆمەڵایەتی پێویستیم بەپشتیوانی خەڵك هەبوو، بەتایبەتی کەسێکی مەزهەبی. بەتایبەتی نەریتخوازترین‌و توندڕەوترین موسڵمان‌و قبتییەکانی مەسیحی لەئەسیوت، لەمیسری عولیا، دەژیان، شوێنێك کەنەریتی پاراستنی خۆداپۆشینی ژن‌و پیاوەکان زیاتر لەهەرشوێنێك جێگیرکرابوو. کەسانی ئایینی ئەسیوت، وەك نەریتخوازانی مەزهەبی لەهەرشوێنێکی جیهان، بەهێزترین‌و بەرگریکارترین کەسبوون لەربەرامبەر گۆڕانکارییەکان. ئەگەر دەمتوانی چەند شێخ‌و قوتابییەکی توندڕەویی زانکۆی ئەسیوت‌و قبتییەکان بەدەست بێنم، نیوەی سەرکەوتنم لەم تێکۆشانە دەستەبەر دەکرد.

بۆخوێندنەوەی وتاری خۆم هیچ شتێکم ئامادە نەکرد. دەمویست قسەی دڵی خۆم بۆئەم کەسانە باس بکەم کەدژوارترین گوێگربوون، هەرچەند دەبێت دانی پێدابنێم کاتێك تەماشای حەوشەکەم دەکرد تاکو ڕادەیەکی زۆر هەموویان پیاوبوون، دڵم ئەوەندە بەهێز نەبوو گوتم:((هاتووم بۆ ئەسیوت چونکە ئێوە نەریتخوازترین کەسانی میسرن. دەزانم ئێوە بۆئافرەتانی کەلەماڵەوە دادەنیشن تەنیا خزمەت بەمنداڵ‌و هاوسەری خۆیان دەکەن ڕێز دەگرن، من هەمان باوەڕم هەیە، بەڵام پرسیارێك لەئێوە دەکەم.

((من لەبەرامبەر دوو هەڵبژاردن وەستاوم. یەکێك بەناوی هاوسەری سەرۆککۆمار لەماڵەوە دابنیشم‌و بەخەیاڵی ئاسوودە کاتی خۆم تەرخان بکەم بۆخزمەتکردنی هاوسەرو منداڵەکانم، بەشداری چەند میوانداریەك بکەم لەکاتێك کەسانێك سەردانی میسر دەکەن‌و دواتر بۆخواحافیزیکردن لەگەڵیان تاکو فرۆکەخانە بڕۆم. ژیانێکی زۆر ئاسوودەو بێ کێشەیە بۆمن، بەڵام ئێستا سەردەمی بەئاسوودەیی دانیشتن نییە. ئێستا دەمەوێت وەڵامی ئێوە لەسەر هەڵبژاردنی دووەم بزانم.

((ئێستا کە قسە لەگەڵ ئێوە دەکەم خاکی ئێمە داگیرکراوە. من هەست دەکەم خاکی وڵاتی من ماڵەکەی خۆمەو حەوشەی ماڵەکەم داگیرکراوە. بابەتەکە ئەوەیە ئایا دەبێت لەماڵەوە بمێنمەوەو نەتوانم سەردانی حەوشەی ماڵی خۆم بکەم، یان بۆ وەرگرتنەوەی حەوشەی ماڵی خۆم هاوکاری هاوسەرم بکەم. ئایا بەهاوکاریکردنی ژن‌و منداڵەکان‌و کەسانی کەم ئەندام،

لەهەمان کات هەژارەکان نابێت من بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی میسر هاوکاریم‌و کارێك بکەم؟
ئەرکی هاوسەرێکی باش کامەیانە؟
من دەزانم دەبێت چی بکەم. دەمەوێت هاوکاری هاوسەری خۆم بکەم، هەر خزمەتێك کەبتوانم بۆولاَتی خۆم بکەم‌و بەشداریم. لەبەرامبەر خزمەتەکانی خۆم داوای هیچ لایەنێکی دارایی ناکەم. بەپێچەوانە، دەبێت کاتی خۆم تەرخان بکەم، دەبێت سەلاَمەتی خۆم لەسەر ئەم کاروبارانە دابنێم، چونکە پێویستی بەماندوو بوونێکی زۆر هەیە، کاتێك کە لەماڵەوە بەباشی چاودێری من دەکرێت. لەلایەك ئەمەی کەمن دەکەم هیچ خۆشییەکی بۆنییە، بەلاَم لەلایەنیتر هەست دەکەم‌و باوەڕ دەکەم خودا ئەم ئەرکەی لەسەر شانم داناوەو دەمەوێت بەباشی جێبەجێی بکەم.))
هەناسەیەکی قووڵم هەڵمژی. پرسیم:((وەلاَمی ئێوە چییە؟ دەمەوێت بزانم.))
ماوەیەك بێدەنگی باڵی بەسەر کۆبوونەوەی ئێمەدا کێشا. دواتر دەستیان بە چەپلە ڕێزان کردو ئەوەندە توندو بەدڵ ئەمەیان دەکرد دڵم گەرم دەبوو.
دواتر رووم لەکەسانی ئامادە کردو گوتم:((زۆر سوپاستان دەکەم، بەراستی ڕێز لەوەلاَمی ئێوە دەگرم. بەڵێن دەدەم هەرکارێك لەبەرژەوەندی ولاَتی من بێت دەکەم.))
لەهەمان ئەرکی کەدەمویست بۆولاَتی خۆم لەسەر شانم دابنێم پێویستیم بەلایەنی سەربازی هەبوو، لایەنێکی چارەنووس ساز، بۆئەم مەبەستە لەئەسیوت ڕاست ڕۆیشتم بۆبەرەکانی شەڕ لەنۆکەندی سوئێز. بۆلایەنی سەربازیم روونکردەوە کەمێژوو بەتایبەتی مێژووی ئیسلام پڕاوپڕە لەنموونەی ژن کەبەئازایەتی‌و بەهێز بەناوبانگن. بۆنموونە، نوسیبە بنت کەعب، شمشێر بەدەست لەزۆر لەشەڕەکانی موسڵمانان لەگەڵ دوژمن بەشداریکرد، جارێکیان پیاوێك دەکوژێ کەویستی هێرش بکاتە سەر پێغەمبەر. ئۆم موسلم ئەلمیلحەن هاوشانی پێغەمبەر شەڕیکرد، کاتێك دووگیان دەبێت بەردەوام لەمەیدانی شەڕدابوو، عایشە، هاوسەری خۆشەویستی پێغەمبەر، بەسواری حوشتر بەشداری لەشەڕ کرد، هیچ کەسێك تۆمەتی بۆدروست نەدەکرد کەموسڵمانێکی باش نییە.
گوتم ئەم نموونانە تەنیا گرێدارو بەرابردووی ئێمە نین، جەمیلە بوحیرد، قارەمانی بەناوبانگی جەزایری وەك زۆربەی ژنانیتری جەزایری بۆشەڕی سەربەخۆی جەزایر دژی فەڕەنسا بۆمب‌و چەکی بەقاچاخ دەگواستنەوە. فەرەنسییەکان جەمیلە دەگرن‌و بێ ڕەحمانە ئەشکەنجەی دەکەن، بەلاَم هیچ کاتێك ناونیشانی هەموو کەسانی فیدایی ئاشکرا نەکرد. بۆسەربازانم

باسکرد:((ئێمەش وەك جەزایرییەکان هاوخێزانین مەترسی لەسەر ئێمە هەیە. ئەرکی ئێمە وەك هاوسەرو دایك هاوشانی سەربازانی خۆمان بین، نەك تەنیا لەماڵەوە دانیشین‌و قورسایی کێشەکان تەنیا لەسەر شانی سەربازانی پیاوی ئێمە بێت.)) پشتیوانی سەربازەکان وەك خەڵکی ئەسیوت دڵگەرمی پێی دەبەخشیم، دواتر دەستیان بەدروشم گوتنەوە کرد((خودا یاوەرو پشتیوان بێت.)) بەخەیاڵو باوەڕێکی تەواو گەڕامەوە بۆقاهیرە.

دەمزانی نەخشەی من وەك ژنێك لەناوکاروبارەکان ئاستەنگی زۆر دروست دەبن. دوای ماوەیەك هەستم بەتاڵی ئەم نەخشەیە کرد. زۆری نەبرد کەلەبەرەکانی شەڕ گەڕامەوە. هەندێك لەقوتابیانی توندڕەویی زانکۆی قاهیرە دەستیان بەخۆپیشاندان کردو بوونی من لەبەرامبەر سەربازەکان بەکارێکی خراب لێکدانەوەیان بۆدەکردو هاواریان دەکرد: ((حکومەتی موشەدایان باشتر دەبێت لەحکومەتی جیهان!)) باوەڕم نەدەکرد، ئایا بەراستی قوتابیانی زانکۆ حکومەتی وەزیری بەرگری ئیسرائیل بەباشتر لەحکومەتی من دەزانن، لەکاتێکدا ئەم وەزیرەی ئیسرائیل لەژیاندا نەمابوو. سەرسوڕمابووم. بەڵام لەدەستپێك دەمزانی دەبێت فێریم چۆن لەبەرامبەر رەخنەی دژبەران ئۆقرە بگرم، هیواداربووم بتوانم بەرگەیان بگرم.

لەقاهیرە بەردەوام هاوسەری پیاوانێك سەردانی ماڵی ئێمەیان دەکرد کەلەسەردەمی حکومەتی ناسر پیاوەکانیان گیرابوون‌و داوای ئازادیان دەکرد. لەگەڵ هەموو ئەم ژنانە دادەنیشتم. رەخنەکان دژی من دەستیان پێکرد بەتایبەتی بەرپرسانی ناسریست کەئەم پیاوانەیان خستبوونە ناو گرتووخانە دەیان ویست کێشەی زیاتر بۆمن دروست بکەن.((خاتوو سادات کاتی خۆی بۆکەسانێك تەرخان دەکات کەنەرخی ئەم کاتەیان نییە.)) بەڵام من گرنگیم بەم توانجانە نەدا. دواتر بەفەوزی عەبدولحافز سکرتێری نووسینگەی ئەنوەرم گوت:((بۆکەسانێك باس بکە کەرەخنە لەدیدارەکانی من دەگرن من لەگەڵ هەموو کەسێك دادەنیشم کەپێویستیان بەمن هەبێت.)) بەردەوام دانیشتنم لەگەڵ هەمان ژنانی کەهاوسەرانیان لەگرتووخانە بوون، داواکاری ئەم ئافرەتانم دەگەیاندە ئەنوەر. دواتر ئەنوەر بەنزیك کردنی میسر بەدیموکراسی، ئەم گیراوانە لەگەڵ هەزاران گیراویتری ئازادکردن.

لەهەمان سەردەم هەوڵی خۆمدا کەدۆستایەتی خۆم لەگەڵ هاوسەرانی کەسانی ناو حکومەت بپارێزم. بەجۆرێك هەڵسوکەوتم دەکرد کەبەهیچ شێوەیەك ئاگاداری چالاکی هاوسەرانی ئەم کەسانە نیم کەدەیانەوێت کودەتا لەسەر ئەنوەر بکەن. بەجۆرێك باسی منداڵەکانی خۆمان

دەکرد کەهیچ قسەو دەنگوباسێك بۆباسکردن نەبێت، بەردەوام لەناو قسەکانیاندا بەدوای سەرە داوێك دەگەڕام. چاوەڕێم دەکرد قسەیەك لەدەمیان دەربپەڕێتە دەرەوەو پیلانەکانی هاوسەرانی ئەمانە ئاشکرا بکەن. لەکاتی خواردنەوەی شەربەتی سارد قسەکردن لەگەڵ ئەم ژنانە ماوەیەکبوو وەك هاوڕێی خۆم نیشاندا هەستم دەکرد لەناو کەسانی خراپ دانیشتووم، ئایا ئەم ژنانە هیچ هەواڵێکیان لەنەخشەی پیاوەکانیان هەبوو؟ دڵم زۆر بەپەندێك خۆشبوو کەدەڵێت:((بیر بۆکەسێك هەڵنەکەنە لەوانەیە یەکەم کەس خۆت بکەویتە ناوی.))

لەرۆژی یەکەمی مانگی ئایار، قەیران گەیشتە لوتکە. لەبەر پەیوەندی ئێمە لەگەڵ یەکێتیی سۆڤیەت، هەمان رۆژی کرێکاربوو، رۆژی جەژنی هەموو کرێکارانی میسربوو. بڕیاربوو ئەنوەرو وەزیری کار وتار پێشکەش بکەن. بەهەمان شێوە پاریزگاو ئەندامانی سەندیکای کرێکاران. تەواوی میسر. لەوانە خۆم، لەپێش تەلەفزیۆن دانیشتبووم. هەمان دیمەنی کەبینیم ترسناکبوو. کاتێك خەڵك چەپڵەیان دەکوتا کەسانی پێشەوە وێنەی جەماڵ عەبدولناسریان بەرز دەکردەوە ئەمەیان خۆدەرخستنبوو کەنیشانی ملیونان میسری بدەن ئەنوەر لەبەرامبەر گەورەی ناسر هیچ شتێك نییە. گوێی لەقسەکانی نەگرن تەنیا لەگەڵ کەسانێك بمێننەوە کەوەفاداری رێبەری گەورە ناسرن. باوەڕم نەدەکرد شەش رێزی پێشەوە لەژێر دەستی کەسانێك دابوون کەدژی هاوسەرم هەڵسوکەوتیان دەکرد.

زۆرترسام. ئێستا پیلانەکان بەئاشکرا دەردەکەوتن، وەك دیار زۆریاش رێکخرابوو، وێنەکانی ناسر ئەوەندە بەجوانیو رێکخراوی بەرز دەکرانەوە وەك ئەوەی هەموویان تەنیا کەسێکبن. ئێستا هەموو کەسێك لەمیسر دەیزانی کابینەی حکومەت دژی ئەنوەر هەڵسوکەوت دەکەن. ئایا ئێستا کاری ئەنوەر بەکۆتایی دەهات؟ یان ئەوانیتر؟ کاتێك ئەنوەر گەڕایەوە بەرەو رووی رۆیشتمو گوتم ئەنوەر ئێستا چی دەکەیت؟ لەوەڵامدا گوتی:((جیهان دواتر دەبینی.)) رۆژی دواتر عەلی سەبری، یەکێك لەدوو جێگری سەرۆککۆمار لەلایەنگرانی یەکێتیی سۆڤیەت لەمیسر لەسەر کار لابرد.

تێکۆشان دەستی پێکرد رۆژانە کەلەخەو هەڵدەستم بەسەرسوڕمان دەبینم ئەنوەر نەکوژراوە. رۆژانە بۆپاسەوانان دووبارەم دەکردەوە:((بەباشی چاودێری سەرۆککۆمار بکەن زۆر زۆر وشیاربن.)) خەڵك رۆژانە بەقسەی جۆراوجۆر سەردانی ماڵی ئێمەیان دەکرد. خراپترین هەواڵ محەممەد حەسنین هیکل، سەر نووسەری رۆژنامەی ئەهرام گەیاندییە ئێمە.

محهممهد گوتی:((خاتوو سادات دهبێت سوێند بخویت ئهوهی کهبۆتۆ باسدهکهم هیچ کهسێك نهزانێت. سهرۆککۆمار ئهوهنده لاوازو لهسهرخۆ کاردهکات باوهڕ دهکهم ئاگای لهبارودۆخی خراپ نییه. دهبیستم لهزۆر لهکۆبوونهوهکان باس لهلادانی سهرۆککۆمار دهکرێ. ئاگاداری هاوسهری خۆت بکه بههیچ شێوهیهك نهچێته ناوهندی تهلهفزیۆن‌و رادیو. وهزیری بهرگری هەندێك پاسهوانی لهم شوێنانه جێگیر کردوون بۆئهوهی ئهگهر سهرۆککۆمار باس لهپیلانێك دژی خۆی بۆخهڵك باس بکات رێگری لێ بکرێت‌و دهستبهجێ بگیرێت.))

دهستبهجێ رۆیشتم بۆلای فهوزی عهبدولحافز بۆم باسکرد:((بههیچ شێوهیهك رێگا بهئهنوهر نهدهن سهردانی ناوهندی تهلهفزیون‌و رادیو بکات، ناتوانم بۆتان باس بکهم تهنیا دهتوانم ئهمهیان باس بکهم ئێستا گهورهترین مهترسی بۆ ئهنوهر ههمان شوێنه.))

فهوزی بهروخساری گیراوی گوتی:((زۆرباشه، خاتوون.))

چهند رۆژی دواتر ئهنوهر باسیکرد لهسیانزدهی ئادار بۆبهشداری لهتاقیکردنهوهیهك سهردانی شاری تهحریر دهکات، گوتم:((ئهنوهر داواتان لێدهکهم، بههیچ شێوهیهك ئهم سهفهر نهکهیت، من ههست دهکهم مهترسییهك چاوهڕوانیت دهکات، دهکهویته ناو داوی نهیاران‌و دهکوژریت.))

نازانم لهبهر باوهڕکردن بهههستم بوو یان لایهنهکیتربوو سهفهری ئهنوهر ههڵوهشایهوهو گوتی:((ئێستا کارم زۆره پێویست بهبوونی من ناکات.))

سهرم گێژ دهبوو، ههستم دهکرد لهههموو لایهك بهمهترسییهکانی جۆراوجۆر دهور دراوم. دهبێت چاودێری ئهنوهرم بکردبا بهڵام چۆن؟ ئهنوره هیچ ئامادهیی لهخۆی نیشان نهدابوو کهدژی دوژمنهکانی ههوڵدانێك بکات. ههستی دهکرد تاکو ئێستا هیچ بهڵگهیهك بۆتاوانبارکردنیان بوونی نییه کهرادهستی دادگه بکرێت.

داوام لێدهکرد:((ئهنوهر پێش ئهمانه تۆ بکوژن دهبێت بگیرێن.))

بهڵام ئاماده نهبوو هیچ جوڵانهوهیهك دژی ئهمانه بکات. بهردهوام دهیگوت:((ئێمه حکومهتی یاساین دهبێت بهڵگهیهك ههبێت کهئهمانه تاوانبار بکات بهبێ بهڵگه نابێت خهڵك تاوانبار بکرێت، وهك پێشتر کهخهڵك لهناو حکومهتێکی پۆلیسی ڕهش بگیر دهکران، بهڵام ئێستا نابێت لهحکومهتی ئێمه دووباره بکرێتهوه.))

بەڵگەکان لەیانزدەی ئایار گەیشتن. پێش نانخواردنی ئێوارە، من لەگەڵ خوشکی خۆم‌و هاوسەری کەئەندامی پەرلەمانبوو، لەهۆڵی پێشوازی دانیشتبووین کەفەوزی هاتەژوورەوەو گوتی:((خاتوو سادات دەبێت دەستبەجێ پێکەوە چەند گفتوگۆیەك بکەین.))

داوای لێبۆردنم لەخوشکم‌و هاوسەری کرد رۆیشتم گوێی لەقسەکانی فەوزی بگرم.

فەوزی دەنگی خۆی نزم دەکردو گوتی:((ئەفسەرێکی وەفاداری هاوسەرت هەر ئێستا کاسێتێکی دەنگی بۆمن هێناوە کەتێیدا گفتوگۆیەك لەنێوان فەرید عەبدولکەریم‌و مەحموود سەعدانی، باس لەپیلانێك دژی حکومەت‌و کوشتنی خۆدی ئەنوەر سادات دەکەن.))

گوتم:((خواخێری بنووسێت، بەڵام ئێمە دەبێت هەمان هەڵسوکەوتی ئاسایی جارانمان هەبێت، لەوانەیە لەناو خزمەتکارانی ماڵەکەی ئێمە سیخوریان هەبێت. دەبێت هیچ جوڵانەوەیەك نەکەین تاکو خوشکم‌و هاوسەری نان دەخۆن‌و دەڕۆن، دواتر گوێی لەقسەکانی ناو کاسیت دەگرین.))

هەمان شەو بەهەزاران دەردەسەریی‌و بابەتی جۆراوجۆری سیاسی لەگەڵ خوشکم‌و هاوسەری تێپەڕمان کرد. بەڵام بەهیچ شێوەیەك باسی ئەنوەرمان نەکرد. ئەنوەر دواتر گەڕایەوە، بەبێ ئەوەی هیچ شتێك لەرووداوەکان بزانێت. لەگەڵ ئێمە دانیشتبوو. لەبێدەنگیدا بەخوشکم دەگوت:((بڕۆن داواتان لێدەکەم، دەپاڕێمەوە بڕۆن.)) نزیکەی نیوە شەوبوو رۆیشتن‌و من توانیم رووداوەکان بۆئەنوەر باس بکەم. بەترسەوە رۆیشتین بۆنهۆمی سێیەم، فەوزی کاسێتی هێناو جۆری کاسێت زۆر گەورەتربوو لەکاسێتەکانی ئێمە.

دواتر بەئەنوەرم گوت:((ئێمە(تەسجیلێکی) ئەم کاسێتانەمان لەئەنباردا هەیە.دەڕۆم بێنم.)) بۆئەوەی کەس نەزانێت ئێمە لەماڵەوە خریکی کارێکی نهێنین زۆر بەوریایی رۆیشتم‌و ئەوەی پێویست بوو دۆزیمەوەو هێنام بۆسەرەوە. کاتێك دەنگی وشەکانی بێ رەحمانە لەکەش‌و هەوای ژوورەکەدا دەنگی دەدایەوە، دەلەرزیم، ئەم دوژمنانە نەخشەی کوشتنی هاوسەری منیان دەکێشا، نەخشەی کوشتنی رێبەری پارتی خۆیان، سەرۆککۆماری وڵات. کاتێك دەنگی عەبدولکەریم، سەرۆکی پارتی یەکێتیی سوسیالیستی عەرەب لەجیزە گوێبیستی دەبووم کەبۆ محموود سەعدانی رۆژنامە نووس‌و ئەندامی پارتی، لەبەرنامەی ئەنوەر بۆدیداری لەتەحریر دەلێت، هەناسەی خۆم دەگرت بزانم باسی چی دەکەن:((کاتێك ئەنوەر بۆدیداری ئەم تاقیکردنەوە سەردانی تەحریر دەکات، خۆمان لەشەڕی رزگار دەکەین.))

هەناسە سوارتر دەبووم دەمزانی هەستم دروست کاردەکات کەرێگام نەدا ئەنوەر بۆبینینی هەمان تاقیکردنەوە برۆت.

((ئەگەر ئەنوەر سەردانی ناوەندی تەلەفزیۆن‌و رادیو بکات بۆئەوەی خەڵك ئاگادار بکاتەوەچ دەکەن؟)) لەوەڵامدا دەڵێت:((بیرمان لەم شوێنەکردیتەوە. چەند کەسێك لەم شوێنە جێگیرکراون کاتێك ویستی بچێتە ژوورەوە رێگای پێی دەگرن‌و قوڵبەستی دەکەن.))

رووم لەفەوزیکرد:((دروست هەمان شێوازی کەمحەممەد هیکل بەئێمەی گەیاندبوو دروست یەکتر دەگرنەوە.))

ئەنوەر ئیتر بەردەوام نەبوو لەبیستنی دەنگی ئەمانە بەڵام روخساری بەتەواوی گۆڕا، بەناباوەرانە پرسیاری لەمن کرد:((محەممەد هیکل ئەمەیان بۆتۆ باسکردبوو؟ تۆش لەم لایەنەوە هیچ شتێکت بۆباس نەکردم؟))

گوتم:((بەڵێ))

ئەنوەر دەنگی خۆی بەرزکردەوە گوتی:((بۆ؟ جیهان بۆ؟))

گوتم:((چونکە محەممەد هیکل سوێندیدام کەبۆ هیچ کەسێك باس نەکەم تەنیا بەفەوزیم راگەیاند ئەگەر ئەنوەر ویستی سەردانی بینایی تەلەفزیون‌و رادیو بکات رێگای پێی نەدە برۆت دەمزانی ئەگەر برۆیت رێگا بەتۆ نادەن.))

ئەنوەر هاواریکرد:((چ کەسێك هێزو توانای بەخۆیداوە رێگا لەسەرۆککۆمار بگرێت کەهیچ قسەیەك بۆخەڵکی خۆی نەکات، ئەمەیان پیلانێکی راستەقینەیە. قسەکردن تەنیا شتێکەو کردەوە شتێکیتر. دەبێت هەرئێستا قسە لەگەڵ محەممەد هیکل بکەم.)) نەمان دەتوانی بەتەلەفۆن پەیوەندی بکەین، چونکە تەلەفۆنی ئێمە کۆنترۆڵ دەکرا. کاتژمێر یەکی نیوە شەوبوو، بەڵام ماڵی محەممەد هیکل چوار کۆڵان لەئێمە دووربوو. بەیانی زوو کچی سیانزدە ساڵانەی خۆمان لەخەو هەستاند بۆم باسکرد:((نۆهییە، برۆ ماڵی محەممەد هیکل‌و پێی رابگەینە کەباوکم کارێکی خرای هەیە دەبێت سەردانی ماڵی ئێمە بکەیت.)) دوای ماوەیەکی کورت نۆهییە لەگەڵ محەممەد هیکل گەڕایەوە. ئەنوەر پرسیاری لەهیکل کرد:((محەممەد تۆپیلانی ناوەندی تەلەفزیۆن‌و رادیوت بۆجیهان باسکرد، بۆچی بۆمنتان باس نەکرد؟)) وەڵامی هیکل زۆر تێکەڵاوبوو، وەك دیار ئامادە نەبوو چارەنووسی خۆی تێکەڵاوی هیچ لایەنەك بکات،

گوتی:((تەنیا دەمویست بزانی کەئاگاداری خۆتانبن زیاتر لەبەر ئەم لایەنە بەخۆپارێزی پەیامەکەم گەیاند.))

ئەم کاسێتە هەموو بەڵگەکان خرانەروو کەچ کەسێك لەگەڵ ئێمەو چ کەسێك دوژمنی ئێمەیە لەبەردەستی ئەنوەربوو.

ڕۆژی دواتر دوانزدەی ئایار، ئەنوەر داوای کۆبوونەوەی لەگەڵ سەرانی سوپا کرد، لەوەفاداری ئەم سەرانی سوپا زۆر پشتڕاستبوو، دەیزانی خۆشەویستی ئەنوەر لەناو سوپا لەوەزیری بەرگری محەممەد فەوزی زیاترو زیاتر دەبێت. وەزیری بەرگری سەردەستەی پیلانگێڕانبوو، ئەنوەر دەیزانی ئەم دیدارەی لەگەڵ سوپا ڕوبەڕوو بوونەوەیەکی ترسناك دەبێت. فەوزیی وەزیری بەرگری بەشداری لەکۆبوونەوە دەکرد. هەموو کەس دەیزانی هەرکەسێك وەفاداری سوپای لەپشت بێت دەتوانێت کۆنترۆڵی میسر بکات.

لەم کۆبوونەوەیدا ئەنوەر ڕکابەرانی خۆی خستە بەرهێرشی ڕەخنەکان، بەتوندیی گوتی:((ڕێگا بەهیچ ناوەندەکی دەسەڵات نادەم هێزو توانایی خۆی نیشان بداتو میسر گیرۆدەی کێشە بکات، هەرکەسێك ئەمەیان بکات، وردی دەکەم.))

لەبینینی ڕووخساری تووڕەی وەزیری بەرگری کەلەناو کۆبوونەوە لەتەنیشت ئەنوەر دانیشتبوو لەتەلەفزیۆن تەماشامکرد، هەموو جەستەم دەلەرزی. ڕوبەڕوو بوونەوەیەکی توند ڕوویدابوو، سوپا چ کاردانەوەیەکی دەکرد؟ ئەفسەران هاواریان دەکرد:((زیندوو بێت سادات!)) پشتیوانی خۆیان بۆ ئەنوەر دووبارە کردەوە، پشتیوانییەکی کەمەر شێکنبوو تاکو ئەوکات هیچ کەسێك ئاگادار نەبوو کەئەفسەرانی سوپا تاکو چ رادەیەك لەحکومەتی پۆلیسی ناسریستەکانو شێوەی کاروکردەوەیان بێزاربوون.

ئەوکات هەمووکەسێك دەیزانی قەیران گەیشتووە بەلوتکەی خۆی. بەیانی ڕۆژی دواتر. سیانزدەی مانگی ئایار، ئەنوەر وەزیری ناوخۆ، جومعە شعراوی، یەکێك لەخائینەکان لەکار دوور خستەوە. دواتر ژنەراڵ لیسی نەسیف. فەرماندەی گاردی سەرۆککۆماری بانگێشت کرد کەتەنیا ئەرکی پاراستنی سەرۆککۆماربوو تەنیا دەیتوانی بڕیار لەسەرۆککۆمار وەربگرێت، نەك ئەندامانی کابینە، بەنزیکبوونەوەی ئەم بەرامبەر بوونەوەیە وەفاداری گاردی سەرۆککۆمار بڕیارێکی چارەنووس سازبوو. هەرچەند ئەنوەر دەیزانی کە ژنەراڵ پیاوێکی خاوەن بنەماو کەسێکی ئیمانداروو خواناسە، بەڵام ئەمەیانی دەزانی کە لیسی نەسیف زۆر وەفادارانە خزمەتی

ناسری کردبوو ساڵیانی ساڵ لەنزیکەوە وەزیرەکانی دەناسین کەدەستیان لەپیلانگێریدا هەبوو. ئەمانە دۆستی زۆر نزیکی ئەم ژنەراڵەبوون.

ئەنوەر پرسیاری لێدەکات:((لیسی ئەگەر داوا لەئێوە بکەم وەزیرەکانی کابینەی حکومەت قوڵبەست بکە ئایا ئەمەیان دەکەیت؟))

ژنەراڵ لیسی نەسیف بەبێ ئەوەی بچوکترین هەڵوێستە بکات گوتی:((بەڵێ جەنابی سەرۆککۆمار. ئەرکی من جێبەجێکردنی بڕیارو ئەرکی تۆیە.))

ئەنوەر پرسیاریکرد:((ئایا چەك‌و هێزی پێویستان هەیە کەهەموویان لەماڵەکانیاندا دەستبەر بکەیت؟))

فەرماندە وەڵامی دایەوە:((بەڵێ ئامادەم.)) بەڵام بەراستی ئامادەبوو؟ منو ئەنوەر دەمانزانی ژنەراڵ لەشوێنێکی خراب‌و بێچارەو لەسەر رێگا ماوە. لەوانەیە دەیزانی کە وەزیرەکان کاری پێچەوانەی یاسا دەکەن، بەڵام دیسان هەموو وەزیرەکانی هاورێی کۆنی ئەم ژنەراڵەبوون.

ئەنوەر گوتی:((نابێت ئەم گفتوگۆیە لەنێوان منو تۆ دەرباز ببێت.))

ژنەراڵ لیسی نەسیف گوتی:((پشتراستبن جەنابی سەرۆککۆمار.))

پیلانگێران هەمان شەو دەستیان بەپیلانی خۆیان کرد. منو ئەنوەر سەرقاڵی گوێگرتن لەدەنگوباسی کاتژمێر دەی شەو بووین، بەشی کۆتای دەنگوباسبوو کەدەنگی دەرگای ئێمە دەهات. ئەشرەف مەروان، زاوای ناسرو فەرمانبەری وەزارەتی سامی ئەشرەف، وەزیری کاروباری سەرۆککۆماربوو. دۆستی تایبەتی ئێمەبوو بەخێرهاتنم لێکرد، بەڵام ئەوەی کەبۆئێمەی هێنابوو بەڵگەنامەی کۆتایی کودەتابوو: دەست لەکارکێشانەوەی سەرۆکی پەرلەمان، وەزیری بەرگری، وەزیری زانیاریی‌و وەزیری کاروباری سەرۆککۆمارو چەندین ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی حیزب‌و دەستەی بەرێوەبردن. ئەشەرەف زۆر بەلەرزۆکی گوتی:((تاکو چەند خولەکێك لەوانەیە لەتەلەفزیون‌و رادیو بلاوبکرێتەوە، ساتەکانی چارەنووس ساز دەستیان پێکردبوو، کابینەی حکومەت بەدەست لەکارکێشانەوەی بەکۆمەڵ، بۆدروستکردنی قەیرانی یاسایی ‌بوو. لەخۆیان پشتراست بوون کەئەنوەر دەکەوێتە هەلومەرجێك کەبەناچاری دەست لەکار دەکێشێتەوە، بەهەڵگرتنی ئەنوەر لەسەر رێگایان، دەستیان بۆفەرمانرەوایی رەهای خۆیان بەسەر وڵات دەکرایەوە. دیاریکردنی کاتیان زۆر وردو

بێ کێشەبوو بەباوەڕی خۆیان. نەخشەی کودەتا بەم شێوەیە بوو کاتێك ئەمانە دەست لەکار دەکێشنەوە ئەنوەر نەتوانێت لەڕێگای تەلەفزیون کاردانەوەی خۆی نیشانی خەڵك بدات.

ئەنوەر تەماشای ئەشرەفی کردو بەناباوەڕی سەری خۆی دەهەژاند.

بێژەری تەلەفزیون زۆری نەمابوو باس بکات:((وەزیری بەرگری دەستی لەکار کێشایەوە، وەزیری زانیاری دەستی لەکارکێشایەوە. وەزیری...))

پیاوی گەنج بەنیگەرانی وەستابوو پرسیارم کرد:((ئەشەرەف، بۆچی خێراتر ئەم هەواڵەت بەئێمە نەدەگەیاند تاکو ئەنوەر دەرفەتی کاردانەوەی هەبێت؟))

گوتی:((وەزیرەکان ڕێگای هاتنە دەرەوەیان پێی نەدام.))

ئەشرەف ڕاستی دەکرد تەنیا فەرمانبەریەکبوو نەیدەتوانی هیچ بکات، هەرچەند ئەم وەزیرانە بۆدەست لەکارکێشانەوە کاتێکی زۆر زیرەکانەیان هەڵبژاردبوو، بەڵام کارەکانیتریان زۆر نەزانانەبوو. کاتێك کەئەنوەر تەماشای تەلەفزیونی دەکردو وەك بیرمەندەکان گوتی:((ئەمانە خۆیان کاری منیان ئاسانکرد. دەست لەکارکێشانەوەی خۆیان ڕادەگەینن، بەڵام نەك دەست لەکارکێشانەوەی من ئەوەی من دەمەویست بکەن ئەمانە کردیان.)) تەماشای تەلەفزیونی دەکردو گوتی:((من وەك سەرۆککۆمار دەست لەکارکێشانەوەی ئێوە قبووڵ دەکەمو ئێستا هەمووتان دەستبەسەر دەکەم.))

ژنەراڵ لیسی نەسیف بۆئەم هەلومەرجە ئامادبوو، بانگکرا. بەفەرماندەی گاردی سەرۆککۆمار گوتی:((ئێستا کاتی هات هەموو وەزیرەکانو ئەوانەی دەستیان لەپیلاندا هەیە لەماڵەوە دەست بەسەریان بکەنو پەیوەندیان لەنێوان یەکتر نەمێنێت.))

ژنەراڵ لیسی نەسیف وەڵامی دایەوە:((بەڵێ جەنابی سەرۆککۆمار.)) دەستبەجێ گارد ماڵەکانی ئەمانەی گرت. پیلانەکان دژی ئێمە بەکۆتایی دەهاتن. بەڵام ئایا بەم شێوەبوو؟ فەوزی عەبدولحافز نیوە شەو تەلەفۆنی کردو گوتی:((خاتوو سادات، چەند تانکێکی سەربازی بەرەو ماڵی ئێوە جولەیان پێکراوە، ئایا بەبڕیاری سەرۆککۆمار ئەمانە بۆپاراستنی ئێوە جولەیان پێکراوە؟))

بەرەو حەمام ڕۆیشتم چونکە ئەنوەر خۆی بۆبەیانی ئامادە دەکرد گوتم:((ئایا تۆ بڕیارتداوە تانکەکانی سەربازی بۆماڵی ئێمە جوڵەیان پێی بکرێت؟))

ئەنوەر گوتی:((هیچ بڕیارێکی لەم شێوەیەم نەداوە.))

بەپەلە بۆتەلەفۆن گەڕامەوە گوتم:((نەخێر فەوزی.))
ئەم تانكانە چ كەسێك ڕەوانەی ماڵی ئێمەی دەكرد؟ ئایا وەزیری بەرگی توانیبوو سوپای وڵات دژی ئێمە رازیی بكات؟ جگە لەهێرشكردنە سەر ئێمەو گرتنی ئەنوەر هیچ هۆكارێكیتر نەبوو؟
من دەبێت منداڵەكانی خۆم لەم مەترسییە رزگار دەكردن، بەپەلە ڕۆیشتم تاكو كچی گەورەمان لوبنا بەشێوەیەك ئاگادار بكەم، پێش ئەوەی بڕۆمە ژووری لوبنا هەناسەیەكم هەڵكێشا بۆئەوەی هیچ ترسێك خۆی لەدڵی نەدات، تاكو دەمتوانی باسی پیلانگێڕیم دژی باوكیان نەدەكرد. نەمدەویست ترسیان زیاتر بكەم چونكە تاكو ئەوكات منداڵبوون، لوبنا شانزدە ساڵبوو، جەماڵ چواردە، نۆهییە سیانزدەو جیهان تەنیا دەساڵ تەمەنیبوو. بێگومان وەك زۆربەی منداڵەكان زیاتر لەوەی دایكو باوكیان بیریان لێدەكردەوە دەیانزانی.
بەنەرمی گوتم:((لوبنا، ئەم شوێنە زۆر قەڵەباڵغو هاتووچۆی زۆری لەسەرە، بۆچی ئێستا براو خوشكەكانی خۆت هەڵناگریتو بڕۆ بۆماڵی خاڵەتی خۆت، هەمان شوێن زۆر ئارامترە لەماڵی ئێمە؟))
لوبنا رووی لەمن كردو گوتی:((دەتەوێت ئێمە لەماڵەوە بكەیتە دەرەوە چونكە ماڵی ئێمە شوێنێكی پڕ لەمەترسییە؟))
قبووڵم كرد:((لەوانەیە.))
بەڵام لوبنا زۆر لەپێش منداڵبوو. گوتی:((بەباوەڕی تۆ خراپترین رووداو لەوانەیە هێرش بكرێتە سەرماڵی ئێمەو هەمووومان بكوژرێن، بەڵام بەباوەڕی من خراپترین رووداو ئەوەیە كەئێمە ڕەوانەی دەرەوە بكەیتو هەردووكتان پێكەوە بكوژرێن. ئێمە لەم لایەنەوە پێكەوە بڕیاری خۆمانداوە نامانەوێت بەبێ ئێوە بەزیندوویی بمێنینەوە، ئەگەر بڕیاربێت هەمووومان پێكەوە بكوژرێن، هەرهیچ نەبێت پێكەوە دەبین.))
بەباوەڕ نەكردنەوە گوتم:((لەم لایەنەوە گفتوگۆتان لەگەڵ یەكتر كردووە؟))
لوبنا بەسەر پشتراستی كردم. گوتی:((لەگەڵ جەماڵ.))
ڕۆیشتم بۆژووری جەماڵ بەڵام تەختی جەماڵ كەسی لەسەر نەبوو. پرسیارم لەلوبنا كرد:((كوا جەماڵ؟))

لوبنا گوتی:((جەماڵ بەچەك لەناو حەوشە راوەستاوە.)) واق دامابووم. ((ئەمەیان چەندین شەوە جەماڵ بۆ بەرگریکردن لەماڵی ئێمە پاسەوانی دەکات، دەڵێت هەرکاتێك دوژمنەکان هێرشیان کردە سەرباوکم من دەتوانم پارێزگاری لەباوکم بکەم.))

بەپەلە رۆیشتم بۆخوارەوە. جەماڵم لەسەر قادرمەکان بینی کەدانیشتووە هەمان تفەنگ کەکاتێك لەگەڵ باوکی دەرۆیشتن بۆنێچیری باڵندەکان لەسەر چۆکەکانی خۆی دانابوو.

لەباوەشم گرت و گوتم:((جەماڵ باوکت بەبوێریی و ئازایەتی تۆ شانازی دەکات، بەڵام بەم چەکە ناتوانی بەرگری لەباوکت بکەیت. ئێستا برۆ کاتی خەوتنە.))

بەڵام قبووڵی نەدەکردو گوتی:((دەزانم ئەمەیان چەکێکی باش نییە بەڵام لەوانەیە دوژمنەکانی لەتاریکایی ئاگاداری ئەم لایەنە نەبن. من دەتوانم هەرهیچ نەبێت باوکی خۆم ئاگادار بکەم، تاکو کاتی بۆخۆ ئامادەکردن هەبێت. ئەگەر ببینم کەسێکی نەناس لەدەرگای حەوشەی ماڵی ئێمە دێتەژوورەوە گولەیەکی ئاراستە دەکەم، دەنگی زۆر بەهێزە. پێش ئەمانە بێنە ژوورەوە باوکم ئاگادار دەکەمەوە.))

دڵم لەبەرامبەر ئازایەتی ئەم منداڵە کەلەتاریکایی شەو دانیشتبوو بۆبەرگریکردن لەباوکی ژانی دەکرد. لەتەمەنی چواردەساڵی هەستی بەبەرپرسیارەتی دەکرد کەدەبێت باوکی بپارێزێت، پاراستنی گیانی باوکی لەگیانی خۆی بەباشتر دەزانی. چەند بارێکی قورسامان لەسەر شانی منداڵەکانی خۆمان دانابوو. لەکاتی لەدایکبوونیان هەوڵی زۆرمدابوو کەلەبەرامبەر دژوارییەکانی ئێمە پارێزگاریان لێ بکەم. هیچ کاتێك لەم لایەنە سەرکەوتوو نەبووم. بەهەمان شێوە کەخودا فەرمانی بەمن و ئەنوەر دابوو کەخۆمان بکەین بەقوربانی بۆمنداڵەکانی ئێمە بەهەمان شێوەبوو.

لەشەوی پانزدەی مانگی ئایار ١٩٧١، جەماڵم بەتفەنگی خۆیەوە لەسەر قادرمەکان و ئەوانیتر لەژوورەکانی خۆیان مانەوە. ئەگەر تانکەکان دەهاتن بۆکوشتنی ئێمە هەموومان پێکەوە دەمردین. لەکاتی گەڕانەوەم بۆژووری خۆم تەنیا دەمتوانی دوعا بکەم:((خودایە تەنیا تۆ هاوکاریمان بکە.))

دەنگی تەلەفۆن دەهات: ژنەراڵ لیسی نەسیف، دەیویست هاوسەرم نیگەران نەبێت لەهاتنی تانکەکان:((من تانکەکانم ڕەوانە کردن بۆپاراستنی ئێوە ئەگەر کێشەکان زیاترین، بەڵام تاکو ئێستا هەلومەرج ئاساییە هەموو پیلانگێڕان دەستبەسەر کراون.))

ڕۆیشتم تاكو جەماڵ بگەڕێنمەوەو هەواڵەكان بەلوبنا بگەێنم. ئەنوەر دەستبەجێ سەردانی ناوەندی تەلەفزیون و رادیویی كرد كەبۆخەڵك باس بكات كودەتا تێكشكاوە هەموو پیلانگێڕان دەستەسەر كراون و هەمان بەڵێنی ئازادی زیاتری ئێمە وەك خۆی دەمێنێتەوە.

دوای شەوێكی تاریك و پڕ لەكێشە، بەیانییەكی پڕ لەشادی هەڵدەهات. خەڵك بەبیستنی وتاری خۆشەویستانەی ئەنوەر لەتەلەفزیون و رادیو، ڕژانە سەر شەقامەكان. زۆر بەهەست و سۆز گوتی:((ئەگەر پاڵەپەستۆیەك بێتە سەر وڵاتی ئێمە، مەترسییەك بكەوێتە سەر ئازادی و سەربەخۆیی كەمن ئێستا باسی دەكەم وەك گوشتی وردكراویان لێدەكەم.)) خەڵك لەخۆشحاڵیدا شێت ببوون، تەنیا وشەیەكیان لەناو وتاری ئەنوەر هەڵبژاردبوو كەدواتر بەناوی ئەنوەر لە(چاكسازی شۆڕش) كرایە ناسنامەی ئەنوەر. خەڵك لەبەردەرگای ماڵی ئێمە دروشمی هەڵبژێردراوی خۆیان دووبارە دەكردەوە: ((وردیان بكە سادات! وردیان بكە!)) دوای ماوەیەك كاریكاتۆرەكانی لەم شێوەیە چاپ دەكران كەوەزیرەكانی كابینەی حكومەت بەوردكراوی لەچەرخی گوشت وردەكەر دەهاتنە دەرەوە. خەڵك هاواریان دەكرد:((ئێمە لەگەڵ تۆ وەستاوین سادات، ئێمە لەگەڵ تۆداین سادات!))

ئەنوەر روحی نوێی میسربوو. ئەنوەر سادات دوای سێ مانگ بڕیاری داخستنی دەرگای گرتووخانەكانی كەناویان لەناو خەڵكدا بەخراب ڕۆیشتبوو دەركرد كەبەبێ هۆكار خەڵك دەگیراو. بڕیاری ئازادی بۆهەزاران زیندانی سیاسی دەركرا، لەوانە ئیخوان موسلمین. بۆیەكەمجار دوای بیست ساڵ، سانسۆر هەڵگیرا. ئەنوەر پێداگری دەكرد كەسانێك كەساڵیانی ساڵ بوێرییان نەبوو قسەیەك بكەن و ڕەخنەیەك بگرن دەبێت قسەی دڵی خۆتان بكەن. دواتر بەبڕیاری دەدات هەموو دەنگەكانی خەڵك كەلەرێگای تەلەفۆن گیرابوون و لەئەنبارەكانی وەزارەتی ناوخۆ ئەرشیف كرابوون بسووتێنن.

دادگای پیلانگێڕان پێكهات هەموویان بەگیرانی هەتا هەتایی تاوانبار كران. لەم نیوەدا تەنیا هەواڵێكی خەمبار لەسەر ژنەراڵ لیسی نەسیف هەبوو، فەرماندەی گاردی سەرۆككۆمار. ئەركی خۆی بەتەواوی جێبەجێكرد. كاتێك ئەنوەر بڕیاری گرتنی وەزیرەكانی دەركردن دەستبەجێ هێزەكانی خۆی ڕەوانەكردن، بەڵام لەم كردەوەیی خۆی ئازاری زۆری كێشا. دوای ئەم ڕووداوە گیرۆدەی خەمۆكی دەبێت بۆچارەسەری ڕەوانەی لەندەن دەكرێ دوای ماوەیەك مانەوەی لەنهۆمی پێنجەم دەكەوێتەخوارەوەو گیانی خۆی لەدەستدا.

خەڵك لەمیسر باسایان دەکرد کەخۆی کوشتووە نەیتوانی لەنێوان ئەرك و وەفاداری بەناسرو یاوەرانی رێگایەك هەڵبژێرێت کەناخی بریندار نەکات. زۆر کەس باساین دەکرد نەسیف دەرمانی خەمۆکی دەخواردن و دەبوون بەهۆکاری لاوازبوونی دەگاتە رادەیەك کەلەنهۆمی پێنجەم بکەوێتەخوارەوە یان ئەوەندە لەرووی بیرکردنەوە تێکەڵاو تێك ئاڵابووە بەبێ ئەوەی هەست پێی بکات دەکەوێتەخوارەوە.

ئەنوەر سادات لەم رووداوە زۆر خەمباربوو، چونکە ئازاترین و گرێدراوترین پیاوبوو بەبنەماکانی ئەخلاقی خۆیەوە.

ئەنوەر، بەپشتیوانی خودا یەکەم قەیرانی سەرۆکایەتی خۆی تێپەڕکرد. ئێستا دەرفەتێکی باشتری لەبەردەستدابوو کەلەگەڵ هەندێك لەیاوەرانی کاریکات نەك دژایەتی بکەن، بەپشتیوانی خودا ئەنوەر رزگار دەبێت. میسر ئاسودەو رزگاربوو. ئێستا ئەوەی ئەنوەر دەیویست بۆمیسر بکات ئامادەبوو. بەڵام ئەوەی کەمن لەم نیو ساڵەدا بەڵێنم بەخودای خۆمدابوو، وەفادار دەبووم:((داوام لەخودا کردبوو ئەگەر ئەمجارەیان هاوسەرو وڵاتی من میسر رزگار بکات بۆماوەی مانگێك رۆژوو دەگرم و سەردانی مەککە دەکەم.)) خودا دوعاکانی منی قبووڵ کردبوون، ئێستا من بووم کەدەبێت وەفاداری خۆم نیشان بدەن. دوای دوو هەفتە لەسەرکەوتن و چاکسازیی شۆڕش، بەرەو مەککە رۆیشتم.



## بەشی نۆیەم

## خوێنی ئیبراهیم

(لبيك، اللهم لبيك! لاشريك لك!) داوا لەتۆ دەكەم، هەروەك ستایشو بەخشندەییو گەورەیو توانایی هەرتۆی، تۆ خاوەنی هیچ هاوبەشێك نیت، گوێی لەفەرمانەكانی تۆ دەگرم.بەفرۆكە رۆیشتم بۆمەككە، ئێستا لەناو هۆتیل،دروشمی تایبەت بەمەككە دووبارە دەكەمەوە، ساڵانە ملیونان موسڵمان، بەفرۆكە، پاس، ئۆتۆمبێل، ژمارەیەكی كەم بەحوشتر لەرێگای بیابان، لەمەككە كۆدەبنەوە. پیرۆزی مەككە ئەوەندە گەورەیە كەنزیكەی هەزارو چوار سەد ساڵە تەنیا باوەڕداران رێگایان پێدەدرێت. لەمانگی قوربان كاتێك موسڵمانەكان حەجی گەورە دەكەن، یەكێك لەپێنج بنەماو ئەستوونی ئایین بەجێ دەگەێنن، نزیكەی دوو ملیون زیارەتكار سەردانی ئەم شارە پیرۆزە دەكەن، رێورەسمی موسلمانان گەورەترینو گردبوونەوەی نیودەوڵەتییە لەجیهاندا.من بۆ حەجی گەورە نەڕۆیشتم بۆ مەككە، بۆعومرە واتە حەجی بچوك رۆیشتبووم. حەجی بچوك یان هەمان عومرە دەكرێت لەهەموو كاتێكی ساڵ بەجێ بگەێنیت. ساڵانی پێشتر بۆعومرە سەردانی مەككەم كردبوو، كاتێك ئەنوەر سەردانی مەلیك فەیسەڵی كرد، من شەوانە لەریازی پایتەختی سعودیا بەفرۆكە رۆیشتم بۆمەككەو گەڕامەوە. دواتر دووجاریتر سەردانم كرد. جارێكیان دوای شەڕی١٩٧٣، كەپێك هاتبووین لەگروپێكی حەفتا كەسی لەئافرەتانی خۆبەخش بۆسوپاسكردنی ماندبوونی ئەم ئافرەتانە رۆیشتین. جارێكیتر لەساڵی ١٩٨٤، بۆشوكرانەو نەمانی مەترسی لەسەرمان، لەگەڵ منداڵەكانو چەند هاورێیەكی خۆمان سەردانی

مەککەمان کرد. بەڵام ئەمجارەیان سەردانێکی تایبەتبوو، بەتایبەتی دوای کێشەکانی بەهاری١٩٧١، بۆمن زۆر کاریگەرو گرنگبوو. خودا بەرزگاری گیانی هاوسەرم دوعاکانی منی قبوڵکردن.

(لبيك اللهم لبيك!داوا لەتۆ دەکەم!) هەمان قورئانی کەبەردەوام لەناو جانتای منداڵبوو هێنامە دەرەوە بەدەنگی بەرز دەستم بەخوێندنەوەی سورەی حەج کرد:((خەڵك بۆبەجێ گەیاندنی رێورەسمی حەج رابگەینە تاکو بەپێیو سوار لەهەر رێگایەك بەرەو تۆ کۆببنەوە تاکو کۆبوونەوەی خەڵکانی جۆراوجۆری مرۆڤەکان بۆگەیاندنی راستی یەکپەرستی ئەرکی خودایی سودی زۆری بۆدونیا ئاخرەت هەبێت.)) بەدەنگی بەرز دووبارەم دەکردەوە. خودا لەسەر کەسانی کەسەردانی مەککە دەکەن دەکاتە ئەرك بەسەریاندا هەوڵی خۆیان بدەن بیری خۆیان لەهەمووشتێك خاوێن بکەن. بیری خۆم تەنیا دەخستە سەرخۆشەویستیو ئاشتی. ئەم شوێنە پیرۆزە نەشوێنی کێشەکانو گەورەیی دونیا نەشوێنی ملمڵانێیەکان کەچەند مانگ پێش بەسەر ئێمەدا تێپەڕیان کرد وەك هەموو کەسێك کەسەردانی ئەم شوێنە پیرۆزە دەکات بۆدروستکردنی پەیوەندی روحی لەگەڵ خوداو یەکسانیو هێزی دوعاکانی بەکۆمەڵ سەردانی مەککەمان کردبوو.

یەکەمجار لەمیسر خۆمان بۆ ئەم سەفەرە ئامادە دەکرد بەگۆڕینی جلوبەرگو لاچکەی سپی زیارەتو خۆدورخستنەوە لەزێڕو هەموو جۆرە خۆڕازاندنەوەیەکی دونیایی خۆم بەتەواوی ئامادەکرد. دوای دوو رکاعەت نوێژ، پاڕانەوە لەدەرگای خودا:((خودایە دەمەوێت سەفەری عومرە بەجێ بگەێنم، بۆم ئاسان بکەو قبووڵ بفەرموون.))

لەمەککە خەڵکانێکی زۆرم دەبینین کە بەهەمان جلوبەرگی تایبەتی حەجو عومرە کەسانێکی زۆرمان دەبینین بۆدەستبەرکردنی قورئان لەدۆکانەکانی بچوك بەقەبارەو ڕەنگی جیاواز دەگەڕان. تەکسیو پاسەکان لەماوەی بیستو چوار کاتژمێر خەڵکیان بۆنوێژو دوعاکردن دەگواستەوە بۆ مزگەوتی حەرام دەبردن. جلوبەرگی پیاوەکان بۆ زیارەت هەمان جلوبەرکی نەریتی جارانبوون، هەمان پارچەی سپی لەخۆیان دەپێچن. کەسانێك کەسەردانی مەککە دەکەن ئەم پارچە سپییە لەگەڵ خۆیان دەگەڕێنەوەو هەڵدەگرن وەك یادەوەرییەك بۆ سەفەری پیرۆزی خۆیانو دوای مردنیان وەك بەرگی مردوو سوودی لێوەر دەگرن.

(لبيك اللهم لبيك!) لەدەرەوەی مزگەوتی (الحرام) پێش نوێژو ڕێنیشاندەری خۆمان دەبینین. کاتێك دەچینە ژوورەوە زیارتکاران بەیەك دەنگ فەرمانەکانی خودا جێبەجی دەکەن. من وەك هاوسەری سەرۆککۆماری میسر، خاوەنی چەند پاسەوان‌و سکرتێرێك بووم، بەبوونی تایبەتمەندیم بەلاَم بەپاڵەپەستۆی خەڵك بۆپێشەوە دەڕۆیشتم‌و وەك ئەوانیتر بەدەنگی بەرز هاواری خودا دەکەم.

کاتێك لەگەڵ هەموو زیارتکاران دەگەین بەدەروازی ئاشتی هەموویان پێکەوە دەست بۆدوعاکردن بەرز دەکەنەوە:((خودایە تۆخۆت ئاشتی، ئاشتی لەتۆ بەردەوامە، خودایە ئاشتی‌و ئارامی پیمان بدە.)) پێغەمبەری خودا هەموو جوڵانەوەیەکی بەلای راست دەست پێدەکردو ئێمەش بەپێی راست دەڕۆیشتینە ژوورەوە.

لەبەرفەراوانی ناو مزگەوت هەناسە بڕدەبووم، خاوەنی حەوت دەرگاو شوێنی نیوملیون کەسی هەبوو دیوارو ئەستوونەکانی دوو نهۆمی سەرەوەی لەگەڵ حەوت منارە بەجوانترین شێوە نەخشێندرابوون. هەزاران سەردانکار پێش گەیشتنیان بۆناو مزگەوت کەستایسی خودای گەورەیان دەکرد لەناکاو، گوایە زمانیان لاڵبووە بێدەنگ دەبوون. شوێنی مزگەوتە هەزاران ساڵ پێش، پێش سەرهەڵدانی ئیسلام، شوێنێکی پیرۆزبوو. کەش‌و هەوای ئەم شوێنە یەکپارچە ئارام‌و بێدەنگە. دەلێت باڵندەکانیش تواناو بوێری ئەوەیان نییە بەسەر ئەم شوێنە پیرۆزەدا هەڵفڕن. تەنیا جاربەجار دەنگی منداڵەکانی بچوك ئەم بێدەنگییە دەشکێنێت کەدایکانی کەکەسێك نەبووە چاودێری منداڵەکانیا بکات لەگەڵ خۆیان بۆئەم شوێنە پیرۆزە دێنن. دەنگێك کەعاشقانە خۆشەویستیم بۆهەیە، دەنگی ژیان.

زۆر لەزیارەتکاران لەسەر مافۆرێکی ئەوریشمی سوور دادەنیشتن کە هەموو مزگەوتی دەگرتەوە لەبێدەنگی یان دوعایان دەکردن یان سەرقاڵی خوێندنەوەی قورئانبوون. دوای بەرزبوونەوەی دەنگی بانگ لەمنارەکانی مزگەوت بۆهەمووشوێنێك دەڕۆیشت ئێمە بەرێزبەندەکانی ڕێکوپێك رادەوەستاین، پیاوان لەرێزەکانی پێشەوە ئافرەتان لەدواوە هەموومان پێکەوە هیچ کەسێك پرسیار ناکات خەڵکی چ شوێنێکی بەچ زمانێك قسە دەکەیت، بەپیڕەوەیی کردن لەئیمامی پێش نوێژ هەموومان بەردەوامی بەنوێژی خۆمان دەدەین.

لەهیچ شوێنێکی جیهان هێزی ئیمانم وەك هەمان شوێن هەست پێنەکردووە. لەکاتی نوێژکردن هەموومان پێکەوە بەهەستێك‌و بیروباوەڕێك لەبەرامبەر خودا هیچ جۆرێك جیاوازی نژادی

چینایەتیو رەگەز بوونی نەبوو. لەناو خۆدی مزگەوت رێگا بەئافرەتان نادرێت خۆیان بەجۆرێك داپۆشن کەتەنیا چاویان بەدیار بکەوێت، رێگان پێی نادرێت پەنجەوانەیان لەدەستدا بمێننەوە. هاوبەبیرو گرێدراوی موسڵمانان، کەسێکی پاکستانی لەتەنیشت بەرپرسێکی نەفتی بەحرین، ئەندازیارو بیناسازانی میسری، کرێکارانی کارگەکانی گەورەی رووسیاو ئەندونزیا پێکەوە دەڕۆن بۆ کرنۆشبردن بۆخودا ژنانی ئەفغانی لەتەنیشت مامۆستایانی سریلانکا، پزیشکانی ئێرانی هاوسەرانی گەورەکانی عەرەبی ئیماراتی پێکەوە نوێژی خۆیان دەکەن. لەنیوانیاندا زیارەتکارانی ئەمەریکایی دەبینران. من خۆم جارێکیان لەکاتی سەفەری حەجو عومرە لەکاتی رۆیشتنم بۆناو مزگەوت محەممەد عەلی یاریزانی بەناوبانگی بۆکسێنم بینی کەدەهاتە دەرەوە. دوای تەواوکردنی نوێژ، زۆر لەزیارەتکاران سەردانی کەعبە دەکەن بینایەك لەبەرد دروستکراوە بەبەرزی پانزدە مەترو پانی دەمەترو نیو لەناوەندی حەوشەی مزگەوتدایە. لێرەدابوو کەباوکی ئێمە حەزرەتی ئیبراهیم، مەسیحیو جولەکە بەئابراهام ناوی دەبەن، زیاتر لەسێ هەزار ساڵ پێش یەکەمین خانووی بۆ پەرستینی خودای گەورە دروستکرد. خودا لەقورئاندا دەفەرموود:((دەڵێت کەعبە یەکەم شوێنە کەبۆ خەڵك دروستکراوە کەخودا پەرستی بکەن.)) کەعبە بەشێوەیەکی زۆر سادە دروستکراوە بەشێوەی چوار پاڵوویەکی گەورە دروستکراوە. دەرگای کەعبە نزیکەی سەدو هەشتا سانتیمەتر لەسەر زەوی بەرزتر دروستکراوە، هێزی ئەم خانووە واتە کەعبە هیچ سنوورێکی نییە، موسلمانانی سەرتاسەری دونیا، یەك لەسەر پێنجی هەموو جیهان، رۆژانە پێنجار لەکاتی نوێژکردن، روو لەکەعبە دەکەنو کڕنۆشی بۆدەبەن.

بینینی کەعبە بەچاوی خۆت لەدونیایی راستەقینەو لەنزیك بینینی تەنیا بینای کەهەموو موسڵمانەکانی جیهان لەیەکتر کۆدەکاتەوە، من زۆر کەوتمەژێر کاریگەری. ئەم بینایە گەورەیە بەپەردەی (کیسوە) داپۆشراوە، پەردەیەکی رەشی گەورە کەهەندێك ئایەتی قورئان بەئاوی زێر لەسەری نووسراون. لەکاتی منداڵی باش بەبیرم دێت کەئەم پەردە گەورەیە لەمیسر دروست دەکرا. کاتێك کەکاروانی حوشترەکان باریان دەکردو لەرێگای بیابان بەرەوە مەککە دەڕۆیشتن هەمان رۆژ لەتەواوی میسر دەبوو بەرۆژی پشوودان. بەڵام ئێستا ئەم پارچەیە ساڵانە لەسعودیا دروست دەکرێتو جوانی کەمتر لەجاران نییە. بەکۆتایی هاتنی فەریزەی حەج پەردەی رەش دەگۆڕێتو هەندێك لەکەسانی کەزیارەتی مەککە دەکەن پارچەکانی ئەم پەردەیە بەپارەیەکی زۆر دەکڕنو وەك پیرۆزی لەگەڵ خۆیان دەبنەوە.

لەگۆشەی باشووری رۆژهەڵاتی کەعبە بەردی ڕەش جێگیر کراوە کەبەرزی دەکاتە پانزدە سانتیمەتر دەوروبەری هەمووی بەزێر داپۆشراوە، گەورەی زۆری بۆئایینی ئێمە هەیە. لەحەدیسەکدا کەحەزەتی محەممەد(د.خ) لەکاتی دانانی ئەم بەردە لەسەر دیواری کەعبە ماچ دەکاتو پیرۆزی دەکات. لەقۆناخی دواتر ئێمە هەموومان بۆتەواو بەدەوریدا دەسوڕینەوە لەگەڵ هەزاران کەسیتر پێکەوە.

حەوت جار لەچەپەوە دەسوڕینو هەرکاتێك دەگەین بەبەردی ڕەش بەدەنگی بەرز دەڵێن (الله اکبر) دەست پێدەکەینەوە هەموو جارێك ئاگادار دەبووم کەئەوانەی توانای ڕێڕۆیشتنیان نەبوو بەتەخت کەسێك پاڵی پێوەدەنا. کاتێك لەباشووری رۆژهەڵات تێپەڕمان دەکرد جگە لەخودا گەورەیە دوعامان دەکردن، دوعایەك کەپێشتر پێغەمبەر (د.خ)دەیکرد:((خودایە ئێمە لەنیعمەتەکانی دونیاو ئاخرەت بێبەش نەکەیتو لەعەزابی دۆزەخ دوور بکەیت.))

هەرکاتێك دەگەیشتینە بەردەی ڕەش هەزاران کەس بۆی دەڕۆیشت تاکو دەستی لێ بدەن یان وەك پێغەمبەر (د.خ) ماچی بکەن. پاڵەپەستۆی خەڵك بۆگەیشتن بەم بەردە پیرۆزە زۆر دژواربوو، منو زۆر کەسیتر تەنیا دەستمان لەدوورەوە بۆدرێژ دەکردو دوعامان دەکردن. بەرزترین بەختەوەری هەمان بەختەوەری دەبێت کەبەبانگێشتی بنەماڵەی پاشایەتی سعود ڕێگای پێی بدرێت لەناو خودی کەعبە نوێژ بکات، ئەم بەختەوەرییە تاکو ئێستا دووجار منی بەختەوەر کرد. سەرکەوتمە سەرەوە لەڕێگای دەرگایەکەوە ڕۆیشتم بۆناو کەعبە چەند ئایەتێکی قورئان کەبەزێر نووسراون بەرچاو دەکەون. کاتێك لەسەرەوە تەماشای زیارەتکارانی سپی پۆش دەکەیت شەپۆڵ شەپۆڵ بەدەوری کەعبەدا دەسوڕێنەوە، هەستم دەکرد کە کەعبە خۆری ناوەندی دونیایە تەواوی جیهان بەدەوریدا دەسوڕێتەوە. کاتێك تەماشای زیارەتکاران دەکەیت وەك فریشتەکان بەدەوریدا دەسورێنەوە، بەتەواوی بوونی خۆم هەستم دەکرد بەراستی ئایین ناوەندی ژیانی ئێمەیە.

هەمان هەستی کەلەناو خۆدی کەعبە ڕووم لەمرۆڤ دەکات، بەرزترین هەستی مەعنەوی هەژمار دەکرێ. هەستم دەکرد من چەند بەختەوەرم کەلەپیرۆزترین شوێن وەستاوم، وەستان لەهەمان شوێن هیوای هەموو موسلمانانی جیهانە. لەکاتی نوێژکردن لەناو چوار دیواری کەعبەدا، کاتێك داوام لەخودا دەکرد لەوەرگرتنەوەی خاکی ئێمە لەئیسرائیل هاوکاری هاوسەرم بکات بۆگەیشتن بەئاشتیو سەلامەتی بەخێزانو هاوڕیانمان بدات، بەئاشکرا بوونی خودام لەنزیکەوە هەست

پێدەکرد. ناو کەعبە زۆر تاریکبوو، لەهەمان کات خاڵی کەنیشانەی ئەوەبوو کەماڵی ئیبراهیم سەردەمانێك شوێنی بۆت پەرستانبوو. پیغەمبەرو لەشکری دەهەزار لەخودا پەرەستانی لەساڵی ٦٣٠ زایینی، خودا بێباوەڕەیان لەمەککە دەرپەڕاندن، بۆتەکانیان شکاندن، جارێکیتر ئیمان بۆخودای تەنیا خودای ئیبراهیم گەڕایەوە. لەهەمان کات پیغەمبەر هاتنی کەسانی ناموسڵمانی بۆناو ئەم شارە قەدەخەکردو کردی بەئەرك بەسەر موسڵمانەکان کەبەدرێژایی تەمەنی خۆیان جارێك حەج بکەن بۆپەرستینی خودای تاكو تەنیا.

دوای تەواوبوونی تەواوف هەموومان پێکەوە ڕۆیشتین بۆمزگەوتی حەرام لەهەمان شوێن دوو رکەعەت نوێژمان کردن. بەکرنۆشبردن بۆخودا، بەبیرخۆمان دەهێنایەوە تەواوی پەرەستین تەنیا بۆخودای تاكو تەنیایە، دوای مزگەوتی حەرام بەرەو بیری زمزم لەنیوان مەرواو سەفا ڕۆیشتین.

ئەم دەشتایە وەك مەککەبوو ئیبراهیم پێش ئەوەی بەرەو فەلەستین برۆت لەگەڵ هاوسەری یەکەمی ساراو کوڕەکەیان ئیسحاق، هاوسەری دووەمی هاجەرو کوڕی گەورەی ئیسماعیل بەجێ دەهێڵێت. ڕەگەزی ئیسحاق لەفەلەستین ئایینی یەهودییەتو مەسیحییەتی بڵاوکردەوە. بەڵام ڕەگەزی ئیسماعیل لەسەر خاکی عەرەب نشین ئایینی ئیسلامی پەرەپێدا. ئیسحاقو ئیسماعیل هەردووکیان کوڕی ئیبراهیم بوون، ئێمە سارا بەدایکی یەهودییەتو مەسیحییەت ناو دەبەین بەڵام هاجەر بەدایکی موسڵمانەکان، باوەڕمان بەم لایەنە هەیە کەئێمەی موسڵمانو یەهوودیو مەسیحی ئامۆزای یەکترین.

هاجەر تاکو تەنیا لەبیابانەکان لەگەڵ منداڵی بچوکی واتە ئیسماعیل لەگەڵ کیسەیەکی بچوکی خورما بێچارە بەدوای کانیاوێك دەگەڕا بۆخواردنەوەی ئاو، حەوتجار لەنێوان دو تەپۆڵکەی سەفاو مەروا دەڕوات بەهیوای دۆزینەوەی ئاو. لەئەنجامدا جبرائیل لەژێر پێی ئیسماعیل کەبیرێکی وشکبوو ئاوی بۆگەڕاندەوە، ئەمەیان بەزەیی خودابوو بۆهاجەرو کوڕی ئیسماعیل کەلەمردن رزگاربن. بەهەمان بیری ئاو دەڵێن زمزمو تاکو ئێستابەردەوامی خۆی هەیە.

زیارەتکاران ئازادن یەکەمجار ئاوی زمزم بخۆنەوە یان نیوانی مەرواو سەفا حەوتجار تێپەڕ بکەن، من خۆم یەمجار ڕۆیشتم بۆمەرەواو سەفاو ئایەتێکی قورئانمان دەخوێندەوەو هاوارمان دەکرد خودا گەورەیە. لەرێگادا چەند نیشانەیەك بۆپیاوەکان هەبوو کەلەچ شوێنێك دەبێت بەڕاکردن برۆن بەڵام ئافرەتان تەنیا ڕۆیشتن تەواوە. هەلومەرجی ئێمە ئەمرۆ زۆرباشترە

لەهەلومەرجی ئەوکاتی هاجەر. ئێستا ئەم شوێنەی نیوان مەرواو سەفا سەرداپۆشراو ژێرپێیەکان هەمووی بەردی مەرمەڕ، هەوا گۆڕین بۆکەسانێك کەبتوانن لەسەر کورسییەکانی تایبەتی خاوەن تایە سوود وەربگرن. دالآنێکی تایبەت. بەڵام وانەی خۆراگری وەك خۆیەتی، ئێمەش وەك هاجەر هاوارمان دەکردو داوای هاوکاریمان لەخودا دەکرد. وەك هاجەر بەخواردنەوەی ئاوی زمزم کەئێستا بەشێوەیەکی جوان بەبەردی مەرمەر ڕازاندنەوەو جوانکاری زۆری بۆکراوەو سەدان شوێنی ئاوخواردنەوەی بۆدروستکراوە، دەمی خۆمان بەئاو تەڕ دەکەین. دواتر لەیەکتر کۆدەبووینەوەو هاوارمان دەکردەوە:((خودایە زانستو زانیاری ئێمە زیاتر بکە هەموو نەخۆشییەکانی ئێمە چارەسەر بکە. دڵم بەم ئاو خاوێن بکەو بەنوری خۆت پڕی بکە.)) چەند قومێك لەئاوی پیرۆز دەخۆمەوە چەند دڵۆپێکم بەسەرو روخسارو جلەکانی خۆم داکرد. زۆر لەزیارەتکاران باوەڕ دەکەن کەئەم ئاوە چارەسەری نەخۆشییەکان دەکات. لەم لایەنەوە شوشەیەك لەئاوە پڕ دەکەن تاکو لەگەڵ خۆیاندا بگەڕێنەوە. دواتر ڕێنەماکاری ئێمە بەشێکی بچوك لەمووەکانی سەری ئێمە بەمەقەس دەبڕێت بەشێوەکی رەمزی کەلەهەلومەرج دەردەچین‌و کۆتایی بەحەج یان عومرە دێنین. چەند کاتژمێرێك بۆئەم لایەنانە تەرخان دەکرێ بەڵام لەلایەنی مەعنەوەی کاریگەری زۆری خۆی هەیە.

سعودیا دوو ملیون حاجی لەخۆ دەگرێت (بۆهەمان کاتو سەردەم. و.ك) کەساڵانە بۆبەجێگەیاندنی ئەرکی حەج سەردانی مەککە دەکەن ئەمانە بەمیوانانی خودا ناودەبەن. هەموو ئەم دوو ملیون حاجییە دەبێت تاکو ڕۆژی حەوتی مانگی (زیحجە) سەردانی مەککە بکەن. بنەماڵەی پاشایەتی سعودیا بۆزیارەتو پێشوازیکردنیان هێلێکی ئاسمانی تایبەتی لەفرۆکەخانەی جدده لەهەشتا کیلۆمەتری دەریایی سوور دروستکردووە. لەکۆتایی حەج گەورەترین شوێنی سەرداخراو لەتەواوی جیهان بۆحاجییەکان دروستکراوە کەهەموو خزمەتێك پێشکەش بەحاجییەکان دەکرێت. خیمە، وەرگێڕ، خواردن، گواستنەوە، پارچەی سپی، نەخوشخانە بۆکەسانی بەتەمەن. خەڵکی سعودیا خزمەتکردن بەحاجیان بەئەرکی ئایینی خۆیان دەزانن کەلەجیهانی ئاخرەت بەخێر بۆیان هەژمار دەکرێ.

حاجییەکان هەمان ئەرکەکان جێبەجی دەکەن کەمن لەکاتی عومرەدا جێبەجیم دەکردن، نوێژکردن لەمزگەوتی حەرام، حەوتجار سورانەوە لەکەعبە، ڕۆیشتنی حەوتجار لەنێوان سەفاو مەڕوا، ڕۆژی دووەم ئەرکی حەج. لەهەشتی مانگی (زیحجە) زیارتکاران بەپێی پیادە یان

بەپاس بەرەو گەلی منا بەدووری نۆو نیو کیلۆمەتر لەدووری مەککە دەڕۆن و شەو لەهەمان شوێن بەئاگای دەمێننەوەو رۆژی دواتر هەشت کیلۆمەتر بۆگەیشتن بەکیوی عەرەفات بەرەو باکوور دەڕۆن. لەهەمان شوێن ئادەم و حەوا دوای سەرگەردانی پێك گەیشتن. لەهەمان شوێن خودا فەرمانی بەئیبراهیم کرد کە کوڕی خۆی ئیسماعیل بکاتە قوربانی. لەهەمان شوێن حەزرەتی محەممەد(د.خ) پێش نوێژی کۆتایی خۆی یان هەمان(خطبەی الوداع) چوار مانگ پێش وەفاتی لە٦٣٢ زایینی پێشکەشی کرد.

محەممەد(د.خ) چواردە سەدە پێش بۆپەیڕەوانی باس دەکات:((هەمووتان رۆژێك لەبەرامبەر خودا رادەوەستن و لێپرسینەوە لەهەموو کاروکردەوکانی ئێوە دەکات. بزانن هەموو موسڵمانەکان پێکەوە برانو هەموومان پێکەوە براین، هیچ کەسێك شتێك لەبرای خۆی وەرناگرێ تەنیا بەرەزامەندی خۆی نەبێت، دووری لەبێ عەدالەتی بکەن، ئەوانەی ئامادەن ئەوانەی ئامادە نین، ئەوانەی ئاگادارون ئەوانەی ئاگادارنین بۆیان باس بکەن، ئەوانەی گوێبیست دەبن لەبیری خۆتان بپارێزن.))

بۆملیونان کەس کەبەرەوە کیوی عەرەفات دەڕۆن تاکو رۆژی نۆیەمی (زیحجە) بەسەر کیوی عەرەفات سەردەکەون، مانای پەیامی کۆتایی محەممەد(د.خ) ئاشکرایە: تەنیا خودایەك بوونی هەیە، هەموو موسڵمانەکان پێکەوە برای یەکترن، هەموومان رۆژی ئاخرەت دەبینین. بۆئامادەکردنی خۆتان دزی نەکەن، خیانەت نەکەن، هەمووکاتێك کاری باش بکەن، ویژدانتان هەبێت، ئەم پەیامە بەخەڵکانیتر رابگەێنن تاکو نوری حەقیقەت ببینن.

حاجیان لەم رۆژەی گرنگی حەج هاوار دەکەن:((لبیك اللهمّ لبیك!)) لەم رۆژەدا خودا گوناحەکان پاك دەکاتەوەو بەخشایشی خۆی بەسەر هەموویاندا بلاو دەکاتەوە. هەموو حاجییەکان تاکو نیوەڕۆ دەبێت بگەن بەکیوی عەرەفات. چونکە هەرحاجییەك لەشەوی بەئاگابوون و رۆیشتن بۆکیوی عەرەفات بەجێ نەگەێنێت، حەجی قبوولّ ناکرێت. زیارەتکاران بۆماوەی شەش کاتژمێر بەپێی پەتی لەبەرامبەر گەرمای پەنجا پلەی سیرێزی رادەوەستن و دوعاو قورئان دەخوێنن. حاجییەکان دەتوانن سوود لەسەیوانە وەربگرن، یان لەژێر سێبەری دروستکراو بوەستن، بەڵام کەسانێك کەخاوەنی ئیرادەیەکی بەهێزن ئەم دژواریانە بەباوەشی کراوە قبوولّ دەکەن تاکو ببێتە خۆشییەك بۆئیمانیان. لەکاتی رۆژئاوا هەموویان دادەگەڕێن

بۆدەشتی نیوان عەرەفاتو مناو لەهەمان شوێن پشوو دەدەنو دەست بەدوعاكردن دەكەن، ڕۆژی چوارەمی حەج خۆیان بۆبەرد فڕەدان ئامادە دەكەن.

ڕۆژی دواتر بەهاواركردنی خودا گەورەیە بەردەكانی خۆیان بۆشوێنێكی دیاریكراو فڕەدەدەن، دروست لەهەمان شوێنبوو كەئیبراهیم گیرۆدەی جۆرێك دوودڵی دەبوو كەئایا كوڕی خۆی بۆخودا بكاتە قوربانی. حاجییەكان وەك ئیبراهیم دەیانەوێت ئەم دوودڵییە لەخۆیان دووربخەنەوە، فڕەدانی بەردێك بیری خرابی دوودڵی دەڕەوێتەوەو قورسای سەرشانیان سووك دەبێت.

دواتر حاجییەكان بۆجەژنی قوربان بەرەو دەشتی منا دەڕۆن بۆبەبیر هێنانەوەی ئیبراهیم كەدەیویست ئیسماعیل لەرێگای خودا بكات بەقوربانی لەجیاتی ئیسماعیل خودا بەرانێكی بۆرەوانەكرد كەبكاتە بەقوربانی. زیاتر لەملیونێك بزنو مەڕو حوشتر دەكەن بەقوربانی. لەسەرتاسەری جیهان خەڵكی موسڵمان بۆجەژنی قوربان چوار ڕۆژ دەكەن بەجەژن، دەبێتە پشوودانێكی فەرمیو بۆمنداڵەكانی خۆیان جلوبەرگی نوێ دەكڕنو بۆشوێنەكانی گەشتیار دەبەن، خێزانەكانی كەتوانایی داراییان هەبێت وەك حاجییەكان لەمنا قوربانییەك دەكەن.

من لەمیسر هەمووجارێك دوو بزنم دەكڕین، چونكە گوشتی قوربانی جگە لەخزمان دەبێت لەنیوان هەژارەكان دابەش بكرێت، مەڕی میسر نەرخیان دەكاتە ١٠٠ لیرەی میسری بەڵام بزنی سومالی هەرزانترە نرخی تەنیا ٦٠ لیرەی میسرییە، چونكی خاوەن دوونگ نییەو وەك مەڕی میسری خۆش نییە. پێش جەژنی قوربان بازارەكانی قاهیرە پڕدەبێت لەبزنو مەڕ، دەنگی بەع بەعیان شەقامەكان پڕدەكەن، هەموو منداڵەكان یاری لەگەڵ ئەم ئاژەڵە خۆماڵییە دەكەن چونكە زۆربەیان لەناو حەوشەكانی خۆیان رادەگرن تاكو ڕۆژی قوربانیكردنیان دەگات.

ڕۆژی جەژنی قوربان دەنگی قەساب لەناو كۆڵانەكان بەدەر دەكەوێت كەبەقەسابی گەڕۆك ناویان دەركردبوو. ئەم قەسابانە لەكاروباری خۆیان زۆر شارەزابوون لەسەربڕینو روو لەقیبلەكردنی ئاژەڵان بەشێوەی شەریعەت. قەساب لەكاتی سەربڕین دەیگوت:((بسم الله! الله اكبر!)) بەمنداڵی ئەم جۆرە سەربڕینە ترسناكبوو بەڵام بۆهەندێكیان ئاسایبوو.، وەك دایكی ئەنوەرو كچم هیچ كاتێك گوشتی قوربانیان نەدەخواردو بەردەوام گیاخۆربوون.

هیچ شتێكی قوربانی بەهەدەر نەدەرۆیشت ڕۆژی دواتر دڵو لایەنەكانیتری مەڕمان ئامادە دەكرد تاكو ئەنوەرو جەماڵ لەمزگەوت دەگەڕانەوە. پیستی حەیوان بەخیو وشك دەكراو لەبازارەكانی میسر دەفرۆشرا بەڵام لەناو قاهیرە كۆدەكرانەوە پێشكەش بەهەژارەكان دەكران.

ئێوارانی هەمان ڕۆژ زیاتر لەپەنجا کەس لەخزمان لەماڵی ئێمە لەجیزە کۆدەبوونەوە، وەك نەریت پارەیان پێشکەش بەمنداڵەکان دەکرد. باوکم باسی دەکرد سەردەمی ئێمە لەجیاتی دراوی کاغەزی سکەی زێڕیان پێشکەشی منداڵەکان دەکرد، ئەوکات باشتربوو. بەباوەڕی منداڵەکانم بەتایبەتی جەماڵ جۆری دراو یان دیاری پێشکەشکراو زۆرگرنگ نەبوو.

لەیەکێك لەجەژنەکان زانیمان کەجەماڵ چ دەکات من دراوی کۆکراوەی منداڵەکانم وەردەگرت‌و ڕۆژانە بۆخەرجییەکانم پێشکەش دەکردنەوە بەڵام جەماڵ بەم شێوەیە ڕازی نەبوو. شوشەکانی خاڵی لەچێشتخانە کۆدەکردنەوەو بەپارەی دەدانە خوشکانی سادەی خۆیی‌و هەمان پارەی خۆیی‌و خوشکەکانی دەبرد یارییە ئاگرینیەکانی دەکڕین ئێمەش وەك هەموو میسرییەکان ئێواران لەیەکتر کۆدەبووینەوە بۆئەوەی بەپێی خواستی خۆمان تکەو خواردنەکانیتر بخوین، ملیون زیارەتکار لەمنا دوای بڕینی بەشێك لەمووەکانی سەری خۆیان زیارەتیان بەکۆتایی دەهات‌و جلوبەرگی ڕەنگاو ڕەنگی خۆیان دەپۆشینەوە. لەبیابانی مینا وەك قاهیرە کەسانێك کەتوانای دارایی باشیان هەبوو مەڕیان دەکردن بەقوربانی‌و ئەوانەی کەتوانایان نەبوو بەخۆرایی لەگۆشتی قوربانی کەسێکیتر سوودیان وەردەگرت. دوای کۆتایی هاتنی جەژن، گۆشتی زیادە کۆدەکەنەوە لەناو سارکەرەوەکان دادەنێن‌و بۆ وڵاتانی هەژار ڕەوانە دەکەن. ئەمەیان بەشێکی گەورەبوو لەهاوبەشکردنی کەسانیتر لەشادی‌و بەختەوەری خۆیان. زیارەتکاران تاکو دوو ڕۆژیتر دەمانەوەو بەردەوامیان بەدوعاو پاڕانەوەکانی خۆیان دەداو دواتر دەگەڕانەوە بۆوڵاتی خۆیان. کەسانی بەتەمەن کەلەهەمان سەفەری حەج نەدەگەڕانەوە جێگای خوشحاڵیانبوو نەك گریان. چونکە موسڵمانەکان باوەڕیان بەم لایەنە هەیە هەرکەسێك لەسەفەرەی حەج بمرێت یەکسەر بۆبەهەشت دەڕۆت.

سەفەرەکانی ئێستا بۆحەج زۆر ئاسانترە لەجاران کەهیچ فرۆکە نەبوو، جاران بەپێی پیادە تاکو دەگەیشتن بەحەج هەزاران زیارەتکار لەرێگادا گیانی خۆیان دەسپارد. بەڵام بۆهەندێك کەس سەفەرەی حەج وەك تەمەنێك هیوا خواستنە. دوای گەڕانەوەی زیارەتکار ڕێزێکی زۆری لێدەگیرێت. لەناوچەکانی گوندنشینی میسر گەڕانەوەی حاجی گوندەکەی خۆیان دەکەن بەجەژن‌و ڕازاندنەوەی کوڵانەکان بەچراکانی ڕەنگاو ڕەنگ‌و جلوبەرگی جوانی خۆیان دەپۆشن وەك کاتەکانی کەدەڕۆن بۆشایی خزمان، حاجی دیوارەکانی ماڵی خۆی بەنیشانەکانی حەج دادەپۆشێت‌و پێشوازی لەمیوانەکان دەکات‌و بەگوتنی حەجتان پیرۆزبێت دەچنەژوورەوە.

زیارەتکاری حەج دەتوانێت تاکو کۆتایی تەمەنی سوود لەناوی (حاجی) وەربگرێت پێش ناوی خۆی. ئەم پێش ناوە زۆر ڕێزی لێدەگیرێت ئەمەیان بەیادهێناوەی تەواوکردنی پێنج ئەستوون یان ڕۆکنی ئاینی ئیسلامی بەجێ گەیاندوون‌و خودای خوشحاڵ کردووە.

دوای گەڕانەوەم لەحەجی بچووك واتە هەمان عومرە گەیشتن بەقاهیرە، هەستم بەنوێبوونەوە دەکردو زیاتر ئارامی پێدەبەخشیم. بەڵام ئەنوەر ڕۆژ لەدوای ڕۆژ نائومێد دەبوو، ئابووری میسر تێکشکابوو، خاکی ئێمە لەژێر داگیرکاری ئیسرائیلدابوو. سەربازانی میسری بۆئازادی میسر بەردەوام لەبەرەکانی شەڕ جاربەجار گیرۆدەی شەڕ دەبوون لەدەوروبەری تۆکەندی سوئیز دەکوژران. پەنجەرەی تەواوی ماڵەکان‌و چراکانی ئۆتۆمبێلەکان تاکو هەمان کات بەڕەنگی خۆڵەمێشی داپۆشرابوون نەوەك ڕووناکییە بەدەربکەوێت‌و دوژمن بەتۆپ هێرشیان بکاتە سەر. لەقاهیرە سەنگەرەکان وەك خۆیان مابوون، پەنجەرەکان بۆئەوەی گیرۆدەی شکان نەبن لەکاتی هێرشی ئاسمانی دوژمن بەشێوازەکانی جۆراوجۆر دەیانپاراستن. لەهەمان سەردەم کەمێژوو نووسان بەسەردەمی((نەشەڕ نەئاشتی)) ناودەبەن. هەلومەرج زۆر خەمبارو دڵگیربوو هەموومان لەم هەلومەرجە بێزاربووین‌و دەمان ویست بەخێرایی ئەم هەلومەرجە بگۆڕێت، بەتایبەتی ئەنوەر.

چەندینجار رایگەیاند دەبێت ساڵی ١٩٧١ ساڵێکی چارەنووس سازبێت، ساڵێك کەمافی میسری وەردەگرتەوە، خاکی خۆمان بەشەڕ یان ئاشتی وەردەگرتەوە. ئەنوەر زۆرجار رایگەیاند ئەگەر پێویست بکات میسر لەگەڵ ئیسرائیل گیرۆدەی شەڕ ببێت بێگومان ئەم شەڕە دەکەین.، بەڵام ئەمجارەیان بۆ سەرکەوتن، ئەوەندە ئەم وشانەی خۆی دووبارە دەکردنەوە کەئیتر هیچ کرپارێك بۆئەم وشەیە نەبوو. خەڵك بەجۆرێك لێکدانەوەی بۆدەکرد کەئەمەیان تەنیا خۆدەرخستنی ئەنوەرە نیشانی ئێمە دەدات. بەڵام من دەمزانی کەبەراست ئەم بڕیارانە جێبەجێ دەکات، ڕۆژانە ئەنوەر کۆبوونەوەی لەگەڵ راوێژکارانی خۆی دەکرد، شەوانە بەردەوام فیلمەکانی کۆنی شەڕەکانی لەسینەمای ماڵەکەمان دەبینین‌و لێکدانەوەی بۆفیلمەکان دەکرد. تەنیا ڕێگری ئەنوەر بۆبەدەستهێناوەی کەرامەتی لەدەست ڕۆیشتوومان یەکێتیی سۆڤیەت بوون.

ئەنوەر بەردەوام باسی دەکرد ئەوەی کەسەلامەتی جەماڵ عەبدولناسری لێ ساندەوە گومانی زۆری لەبەڵێنی ڕووسەکان بوو لەبەرامبەر میسر. ئێستا نوەرەی هاوسەرم ئەنوەربوو کەبێزاری

لەسۆڤیەتەکان دەبوون بەهۆکاری نەخۆش کەوتنی. یەکەم هەنگاوی ئەنوەر دوای بوونی بەسەرۆککۆمار دروستکردنەوەی سوپای میسربوو کەبتوانێت بەشێوەیەکی پێشکەوتوو بەچەکی باش رێکبخرێت. لەم لایەنەوە لەساڵی ۱۹۷۱ رێکەوتنێکی لەگەڵ یەکێتیی سۆڤیەت واژۆکرد بەهیوای ئەوەی کەلەسەر بەڵێنی خۆیان بمێننەوەو کاری پێی بکەن‌و موشەکی پێشکەوتوو پێشکەشی میسر بکەن.، بەلآم بەبوونی ئەم رێکەوتنە هیچ هەواڵێك لەوەرگرتنی موشەکەکان نەبوو.

ئەنوەر لەساڵی ۱۹۷۱ و ۱۹۷۲ بەردەوام سەردانی مۆسکۆی دەکرد، بەردەوام سۆڤیەتەکان هیچ ویستێکیان نیشاندا ئەنوەر دەگەڕایەوە بۆمیسر. بەتووڕەیی دەیگوت:((ئیسرائیل چەکەکانی خۆی لەئەمەریکا دابین دەکات بیست هەنگاو لەپێش ئێمەدان، دیسان سۆڤییەتەکان هاوکاری ئێمە ناکەن تەنیا هەنگاوێك بڕۆین بۆپێشەوە.)) من هیچ کاتێك لەگەڵ ئەنوەر نەڕۆیشتم بۆسۆڤیەت، چونکە ئەم سەفەرانە زۆر کورتبوون‌و من خۆشم نەمدەویست سەردانی سۆڤیەت بکەم کەتێیدا سەرکوتکردن‌و شکاندنی سنووری تایبەتی خەڵك کەشێوازێکی زۆرئاسایی‌و بەربڵاوبوو. چونکە من زۆر لەمیسر ئازارم کێشابوو لەگوێگرتن لەقسەکانی ماڵی ئێمە. بەلآم لەبێ باوەڕی ئەنوەر لەسۆڤیەتەکان هاوڕابووم، بەڵێنی زۆرو کرداری کەم کارو سیاسەتی سۆڤیەتەکانبوو.

لەبەهاری ۱۹۷۲، سۆڤیەتەکان تاقەت‌و سەبری ئەنوەریان بەکۆتایی گەیاند. جارێکیتر لیۆنید برژنف بەڵێنی بەئەنوەردا پێش هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی ئەمەریکا لەمانگی تشرینی دووەم کۆمەڵێك چەکی سۆڤیەت بگەن بەمیسر. دیاریکردنی ئەم کاتە زۆر هەستیاربوو چونکە ئەنوەر دەیویست ئەگەر سەرۆککۆماری نوێی ئەمەریکا ئەگەر چارەسەری کێشەکانی رۆژهەڵاتی ناوەراست نەکات، دەبێت پشتراست بکرێتەوە کەمیسر ئامادەی تەواوی هەیە بۆشەڕکردن لەگەڵ ئیسرائیل. بەلآم کاتێك کەئەنوەر لەبەهاردا چاوەڕێی هاتنی چەکی سۆڤیەتی دەکرد، برژنف‌و سەرۆك نیکسۆن چاویان بەیەکتر کەوت. لەمانگی ئایار دوو هێزی گەورەی جیهان سیاسەتی نوێی خۆیان لەسەر بنەمای تەشەنە نەکردن راگەیاند. برژنف نەیدەویست نیکسۆن لەخۆی دوور بخاتەوە یان کێشە بۆ هەلومەرجی نوێ دروست بکات، جارێکیتر فرۆشتنی چەکی سۆڤیەت بۆ میسر دواخرا.

ئەنوەر زیاتر بەبێدەنگی دادەنیشت، پەریشانتر لەجاران، زۆربەی جارەکان لەشوێنی مانەوەی لەبەنداو کەشوێنێکی حکومی دوور لەقەڵەبالغی شاربوو. هیچ کاتێك پرسیارم نەدەکرد دواتر چی دەکات، چونکە من هیچ پۆستێکم نەبوو کەدەست لەکاروباریان وەربدەم. بەردەوام هەوڵی خۆمدا منداڵەکان بۆشوێنی مانەوەمان لەجیزە ڕەوانە بکەم بۆئەوەی زیاتر بتوانێت پشوو بدات. لەدەستپێکی هاوین بەردەوام لەناو باخ دادەنیشت. ڕۆژەکان تێپەڕ دەبوون‌و هیچ هەواڵێك لەچەکەکان بەدەستی ئەنوەر نەدەگەیشت. لەمانگی تەمووز دوومانگ پێش دروستبوونی کێشەکان‌و سێ مانگ پێش هەڵبژاردنی سەرۆککۆماری ئەمەریکا. پەیامێك لەسۆڤیەت بۆ ئەنوەر ڕەوانە دەکرێت کەبەبیرکردنەوەو لێکدانەوەی خۆیان بەهەر شێوەیەك بێت میسر توانای سەرکەوتنی لەشەڕ لەگەڵ ئیسرائیلدا نییە، پرچەك کردنی میسر هیچ سوودێکی نییە.

بەدەگمەن ئەنوەرم تاکو ئەم ڕادەیە تووڕە بینیبوو بەروخساری هەڵگەڕاوی بەرەو ناوەندی تەلەفزیۆن‌و رادیو ڕۆیشت‌و رووی لەمن کردو گوتی:((دەبێت برۆم قسە بۆخەڵك بکەم.)) ئەنوەر زۆرجار قسەی بۆخەڵکی میسر دەکردن زۆر گرنگیم بەم لایەنە نەدا، بەڵام دەبێت قسەکانی هەمان رۆژ جیاوازبن. کاتێك لەدەرگای دەرەوە دەرۆیشت گوتی:((دەبێت راوێژکارانی سۆڤیەت لەمیسر دەرکەم.))

سۆڤیەتەکان دەریکات؟ بۆماوەیەك بێدەنگبووم. زیاتر لەپانزدە هەزار سەربازی شارەزا لەبوارەکانی جیاوازی سۆڤیەت لەمیسر دەژیان. ئەگەر ئەنوەر فەرمانی دەرکردنیان بدات لەوانەیە ئەم هێزە گەورەیی سۆڤیەتی کۆمۆنیزم حکومەتی ئەنوەر بروخێنێت. لەوانەیە ئەم جوڵانەوەیی ئەنوەر نیوانی خرابی ئێمە لەگەڵ ئەمەریکا زیاتر بکات. پشتراست لەم لایەنە ئەمەریکا پاڵپەستۆی زیاتری لەبەرژەوەندی ئیسرائیل دەخستە سەر میسر. بەپەلە گوتم: ئەنوەر تۆ لەم لایەنە پشتراستی کارێکی ئەقلانی دەکەیت؟ یەکێتیی سۆڤیەت لەبەرامبەر ئەم بڕیارەی تۆ چ دەکەن؟)) بەڵام رۆیشتبوو، هەرچەند زیاتر بیرم لەم بڕیارەی ئەنوەر دەکردەوە زیاتر تێدەگەیشتم‌و دروستر دەهاتە ناوبیرو بەرچاوم.

((هاوپەیمانێك لەتەنیشت تۆ نەبێت، داوای هاوکاری بکەیت هاوکاریتان نەکات چ سوودێکی هەیە؟ لەکاتی تەنگانە کەپێویستیت بەهاورێی هەبێت، ئەگەر هاوکاری نەکات، سوودی ئەم دۆست‌و هاورێیە چییە؟ ئەمەیان بۆ سۆڤییەتەکان زۆر راست‌و دروستبوو، هیچ کاتێك

سۆڤیەتەکان بەڵێنەکانی خۆیان جێبەجێ نەدەکردن. بێگومان لەسەردەمی نەشەر نەئاشتی ئێمە لەگەڵ ئیسرائیل هاوکاری ئێمە نەبوون.))

سەرقاڵی تەماشاکردنی وتاری ئەنوەربووم لەتەلەفزیۆن کەدەنگی خەڵك لەشەقامەکان دەهات دەستیان بەشادیو خۆشی کردبوو. لەزۆر شوێن سەماو گۆرانی گوتن بەدەنگی بەرز گوێبیستی دەبووم. رۆژانی دواتر بۆ هەرشوێنێك دەڕۆیشتم خەڵك دەوروبەری ئۆتۆمبێلی منیان دەگرت دەستی خۆیان وەك سەرکەوتن بەرز دەکردەوە.

سۆڤیەتەکان لەمیسر لەناو خەڵکدا خۆشەویست نەبوون، هیچ کەسێك خۆشەویستیان بۆ نەبوو، هەرچەند تووڕەبوونی ئەنوەر لەسۆڤیەتەکان لەلایەنی سیاسی خۆی هەبوو بەلاّم خەڵکی میسر لەبەرامبەربوونەوەی رۆژانەیان لەگەڵ سۆڤیەتەکان زۆر بێزاربوون.

هەزاران سۆڤیەتی لەمیسر خەڵکانێکی دوورە پەرێز بیرتەسكو ڕوو گرژ بوون لەمیسر بەهیچ شێوەیەك خۆشەویست نەبوون.

رووسەکان لەمیسر هیچ کاتێك ئامادە نەبوون خواردن یان چایەك لەگەڵ میسرییەکان بخۆنەوە. تەنیا لەگەڵ خۆیان کۆدەبوونەوە. تەنیا بالیوزو هاوسەری من خۆم هیچ کاتێك لەقاهیرەو ئەسکەندەرییە کەژمارەیان زۆربوو لەگەڵ کەسێکی یەکێتیی سۆڤیەت دۆستایەتیو هاوڕێیەتیم نەبوو. دۆستایەتیو میوان دۆستی لەتایبەتمەندی سەرەکی فەرهەنگی ئایینی ئێمەیە. بەلاّم سۆڤیەتەکان هیچ ویستێکیان بۆ ئەم لایەنانەی ئێمە نەبوو. نەبەشداریان لەجەژنەکانی ئێمە دەکردو ئێمەیان بۆماڵەکانی خۆیان بانگێشت نەدەکرد. هیچ کاتێك رێزیان لەئایینی ئێمە نەدەگرت، لەئایینی ئێمەدا خواردنەوەکانی کحولّی حەرامکراوە بەلاّم رووسەکان لەپێش چاوی خەڵکی میسر خواردنەوەی کحولّیان دەخواردەوە، خۆشیان باوەڕیان بەهیچ ئایینێك نەبوو. کەسانی شادو بەختەوەر نەدەهاتنە بەرچاو. میسرییەکان لەناو کولاّنو بازارەکان پێکەوە پێدەکەنینو قسەی خۆشیان بۆیەکتر دەکرد، بەلاّم رووسەکان هیچ گرنگیان بەم لایەنە نەداو رووخساری خۆیان تێك هەڵدەکێشاو دەڕۆیشتن.

کەسانی بازرگانو فرۆشیار لەهەموو کەسانی بیانی کەلەوڵاتی ئێمە دەژیان زیاتر لەسۆڤیەتەکان بێزاربوون چونکە کەسانی دەستکراوە نەبوون لەهەمان کات زۆر بەرچاو تەنگبوون، کاتێك کەشتێکی بچوکی هاوشێوەی پێنووسیان دەکڕی بگرەو بەردەیان لەگەڵ فرۆشیار دەکرد. سۆڤیەتەکان ئامادە نەبوون تەنیا لیرەیەك سوود بەخەڵکی ئێمە بگەێنن. زۆرکەم روویداو

شتێكی بەنرخ لەبازار بكڕن بەردەوام بەدوای كەلوپەلی هەرزان دەگەڕان هیچ كاتێك كارێكی دەستی كەبەجوانترین شێوە دروست دەكران وەك كورسیو مێزو قاپەكانی جۆراوجۆری بۆخۆیان دەستەبەر بكەن. تەنیا هیوایەتی ئەم سۆڤیەتانە كڕینی زێربوو هیچ كاتێك لەم لایەنە تێر نەدەبوون، چونكە نرخی لەسۆڤیەت هەرزانتربوو، لەهیچ شتێك تێپەڕیان نەدەكرد ئەگەر زێڕبا، وەك ئەنگوستیلەو گەردەنبەند. خەڵك وەك نوكتە باسیان دەكرد سۆڤیەكات ددانی زێری خەڵك دەكڕن! لەم لایەنەوە جێگای سەرسوڕمان نەبوو كەخەڵك لەم بڕیارەی ئەنوەر زۆر خوشحاڵبوون. رۆژێك یەكێك لەهاوڕیانم سەردانی دەكردمو بەتەكسی تاكو پێش ماڵی ئێمە هاتبوو، شوفێری تەكسی بۆهاوڕێی من باس دەكاتو دەڵێت لەجیاتی من سلاو لەسەرۆككۆمار بكەن ئێستا كەرووسەكان لەولاتی ئێمە دەركردن من بەقارەمانی خۆم دەزانم. هاوڕێم لەم لایەنەوە سەری سوڕ دەمێنێتو دەڵێت:((رووسەكان خاكی ئێمەیان داگیر نەكردبوو بۆچی ئەوەندە لەئەمانە بێزارن؟)) شوفێر تەكسی لەوەلامدا دەلێت:((خاتوون ئێوە نازانن لەبازار، چێشتخانەكان، ناو تەكسی چەند خۆیان قورس دەكەن تاكو كەمترین پارە پێشكەشی ئێمە بكەن لەبەرامبەر ئەوەی بۆیان دەكەین. كۆمۆنیستەكان هەموویان بەدوای كەلوپەلی هەرزان دەگەڕین لەدەستكراوی هیچ نازانن لەناو مێشیان جێگای نابێتەوە.))

بەم شێوەیە سۆڤیەتەكان لەمانگی تەمووزی ١٩٧٢ لەمیسر رۆیشتن، ئەنوەریان خستە ناو هەلومەرجێك كەشایستەیبوو: میسر قەرزاری هیچ كەسێك نەبێت. ئەنوەر بۆی باسكردم بۆهەمان شەڕی كەخۆم بۆئامادە دەكەم، سۆڤیەت شارەزایانی بواری سەربازی بۆئێمە ئامادە بكات، سەركەوتنی ئێمە بەسەر ئیسرائیل تەنیا بۆخۆی هەژمار دەكات. ئەنوەر دەیویست دونیا بزانێت میسرییەكان دەتوانن لەسەر پێی خۆیان راوەستن. دەركردنی رووسەكان دەبێتە هۆكاری دروستبوونی داپۆشینێك كەئەنوەر بەدوایدا دەگەڕا. ئێستا هێزەكانی گەورەو خودی ئیسرائیل گەیشتبوون بەئەنجامێك كەئەنوەر دەستی لەخاكی داگیركراوی خۆی هەڵدەگرێت.

دڵشكانی ئەنوەر لەیەكێتیی سۆڤیەت تەواو نەبوو سەرچاوەیەتری دڵشكان بۆ سۆڤیەت دەركەوت: موعەمەر قەزافی سەرۆكی لیبیا.

یەكەم نیشانی نایەكسانی بوونی قەزافی لەكۆبوونەوەی سەرانی عەرەب ئاشكرابوو كەناسر لە١٩٧٠ ئامادەی كردبوو، لەهەمان كۆبوونەوە قەزافی مەلیك حوسێن پاشای ئۆردن بەشێت ناودەبات كەشوێنی لەنەخوشخانەی چارەسەری شێتەكانە. ماوەیەك دوای سەرۆكایەتی

ئەنوەر، دانیشتنی سەرانی عەرەب ئامادەکرا کەتێیدا قەزافی ئامادەی نیشاندا کەلیبیا دەیەوێت یەکێتییەك لەنیوان لیبیاو میسرو سووریاو سودان بکات، دوای بیستو چوار کاتژمێر پەشیمان دەبێتەوە. جارێکیتر لیبیا بڕیاریدا کەمیسرو لیبیا یەکێتییەك دروست بکەن میسرو لیبیا وەك یەك وڵات، بەبێ ئەوەی ئەم لایەنە لەبەرچاو بگرێت ئەنوەر لەگەڵ میسرییەکان چ دەکات.

لەئابی١٩٧٢، قەزافی بەبێ ئەوەی راوێژ لەگەڵ ئێمە لەمیسر بکات لەدروستبوونی یەکێتیی نوێی نیوان میسرو لیبیا رادەگەیێنێت دەڵێت ئەنوەر دەبێتە سەرۆکی حکومەتی نوێو من دەبم بەجێگری سەرۆککۆمارو فەرماندەی گشتی هێزەکانی هاوبەش. کاتێک ئەنوەر ئاگاداری وتاری قەزافی دەبێت پێدەکەنێت چونکە بەهیچ شێوەیەك ئەنوەر دەسەڵاتی هێزی چەکداری میسری نەدەخستە بەردەستی قەزافی. موعەمەر قەزافی چۆن دەیتوانی باسی ئەم جۆرە یەکگرتنە بکات، بەبێ ئەوەی پرس بەمیسرییەکان بکات؟

ئەنوەر یەکەمجار موعەمەر قەزافی دوای شۆڕشی لیبیا لە١٩٦٩ بینی، ئەوکات قەزافی گەنجێکی بەتوانابوو باشترینەکانی بۆوڵاتی خۆی دەویستو زۆرجار بۆراوێژکردن لەگەڵ ئەنوەر پەیوەندی دەکرد. ئەنوەر رێزی لەئارامانخوازی رێبەری گەنج دەگرت، چونکە شۆڕشی لیبیا سەرچاوەی خۆی لەئەفسەرانی ئازادی میسر وەرگرتبوو. ئەنوەر بەردەوام بەکوڕی خۆی بانگ دەکرد، چەندینجار بانگێشتی ماڵی خۆمان لەقاهیرەو میت ئەبوئەلکوم دەکرد. لەساڵی یەکەمی سەرۆکایەتی ئەنوەر، قەزافی بەردەوام دەیگوت:((ئەنوەر تۆ لەشوێنی باوکی منی، ئەگەر هەڵەیەکم کرد، من رێنوێنی بکە.)) قەزافی چەند مانگێک دوای نەخشەی پێشنیارکراوی خۆی بۆبوونی میسرو لیبیا وەك وڵاتێك جارێکیتر هەوڵدانێکی نابەپرسیارانەی دەست پێکردەوە، بەڵام بەشێوەیەکی زۆر مەترسیدار. ئەنوەر بۆرێزگرتن لەداوای قەزافی، بۆزیاتر پشتیوانیکردنی لەلایەنی دەریایی، رەزامەندی نیشاندا دوو ژێردەریایی میسری بەکەسانی شارەزای میسری بداتە لیبیا. یەکەم فەرمانی قەزافی بەبوونی ئەم دوو ژێردەریایی دونیا لەکارەساتێك نزیك دەبوو. قەزافی فەرمان بەئەفسەرانی ناو کەشتییەکانی ژێردەریایی میسری دەکات:((بەبێدەنگی خۆتان دەربازی ناو ئاوەکانی نیودەوڵەتی بکەن کەشتی مەلیکە ئەلیزابێتی دووەم پێش ئەوەی بتوانێت سەردانی ئیسرائیل بکات نقومی ژێر ئاوی بکەن.)) کەشتی مەلیکە ئەلیزابیتی دووەم نقوم بکرێت؟ ئەمەیان شێتایەتی قەزافی بوو. ئەم کەشتییە پڕبوو لەکەسانی ئاسایی، کەسانێك لەبریتانیاو ئەمەریکا بۆگەشتوکوزار سەفەری ئاسایی خۆیان

بۆ ئیسرائیل دەکرد. فەرماندەی یەکێك لەم ژێردەریایە بەبێتەلّ پەیوەندی بەهێزەکانی ئێمە لەئەسکەندەرییە دەکاتو دەستبەجێ هەواڵەکە بەئەنوەر دەگەیێنن، ئەمەیان بەخێرایی ئاشکرابوو. ئەنوەر نەیتوانی خۆدی قەزافی بیدۆزێتەوەو داوای لێ بکات فەرمانەکانی جێبەجێ نەکات. رێبەری لیبیا وەك جاری جاران، چاوەڕێی کۆتایی هەموو قەیرانێکی دەکرد، لەناو خێمەی خۆی لەبیابان بەسەری دەبرد. ئەنوەر ناچار دەبێت فەرمان بەژێردەریاکان بکات دەستبەجێ بگەڕێنەوە ناوەندەکانی خۆیان لەئەسکەندەرییە.

هیچ کاتێك ئەم بینی هاوسەرم ئەوەندە ئاسوودە بێت کاتێك هەواڵیان پێگەیاند ژێر دەریاکان بەسەلامەتی گەڕانەوە شوێنی پێشووی خۆیان. ئەنوەر دەڵێت:((ئەقڵو تێگەیشتنی موعەمەر قەزافی تاکو ڕادەیەك منداڵانەیە، بەلام کێشە لێرەدایە پێویستی یاریکردنی منداڵانەی چەکی راستەقینەیە.))

ئەنجامی هەمان هێرش چۆن دەبوو کەشتی مەلیکە ئەلیزابێتی دووەم نقوومی ژێر ئاو بکات، ڕای گشتی جیهان لەکوشتنی ژنو منداڵەکانی بێتاوان بەدەستی عەرەب کاردانەوەی چۆن دەبوو، ئەمانە هیچ پەیوەندیان بەکێشەی نیوان ئیسرائیلو میسر نەبوو. کێشەکانی هەمان سەردەم، لەساڵی ١٩٧٣، گرنگترین کێشەکانی فیکری ئەنوەر هەژمار دەکران. من هیچ هەواڵێکم نەبوو، قەزافی بەهەمان شێوە ئاگادار نەبوو، ئەمەریکاو یەکێتیی سۆڤیەت بەهەمان شێوە ئاگادار نەبوون، بەلام ئەنوەر دەیوویست بچێتەناو شەڕێکیترەوە.

((جیهان جانتای من ئامادە بکە ئەم شەو ناتوانم بگەڕێمەوە بۆماڵ. لەبیری نەکەیت جلوبەرگەکانی سەربازی من لەناو چانتا دابێت.))

سەردانی دەرەوەی ولات دەکەیت؟))

((نا))

((دیسان بۆبینینی سەربازەکانی نزیك نۆکەند دەڕۆیت؟))

((لەوانەیە.))

((تەنیا دەستەیەك جلوبەرگی سەربازی پێویستە.))

((نا، هەرچی هەیە دەمەوێ، لەوانەیە ناچاریم زیاتر لەشەوێك بمێنمەوە، ئەگەر کارێکی پێویست هەبوو من لەرێگای فەرماندەی سوپا لەکۆشکی ئەلتەراح دەدۆزیتەوە.))

کۆشکی ئەلتەراح؟ ناوەندی فەرماندەی گشتی سوپا؟ هیچم باس نەدەکرد. ئەنوەر بەهەمان ئارامیو دیدگاکانی پڕ لەبیرکردنەوەی شارەزایی زۆرم لەم جۆرە نیگایانەی هەبوو، ڕێزم لێدەگرت.

پێنجی تشرینی یەکەمی ١٩٧٣، ٩ ڕەمەزان، لەکاتی پیادەڕۆیی لەناو باخی ئێمە لەدوورگەی جیزە، دەمزانی ئێستا کاتی گاڵتەکردنو قسەی زیادە نییە. ئەگەر دەیویست هۆکاری ڕۆیشتنی خۆی بۆفەرماندەی سوپا باس بکات هیچ هۆکارێك نەبوو کەهۆکاری راستەقینەی خۆی بۆم باس بکات. بەڵام دڵم گەواهی دەدا ئەنوەر دەیەوێت شەڕ لەگەڵ ئیسرائیل بکات.

چەندین مانگبوو نیشانەکانم دەبینین: کۆبوونەوەکانی بەردەوامو درێژی لەگەڵ وەزیری بەرگری، سەفەرەکانی نائاسایی بۆبەرەکانی شەڕ، لەکەڵ خۆدا کۆبوونەوەی زۆر درێژ. لەمانگی ئاب، ئافرەتێك نامەیەکی بۆهێنام کەلەهاوسەری لەبەری شەڕ لەنۆکەندی سوئێز بۆی ڕەوانە دەکات، هەمان ئافرەت نامەی دایە دەستمو گوتی زۆر نیگەڕانم چونکە داوای کردووە بەتەواوی چاوم لەمنداڵەکان بێت. ئایا ئەمەیان بەمانای ئەوە نییە کەئێمە دەچینە ناو شەڕێکیتر؟))

من خۆم هیچم زیاتر لەم ئافرەتە نەدەزانی، بەڵام ئارامم دەکرد:((لەوانەیە مەبەستی هاوسەرت لەچەند هێرشێکی نهێنی بێت بۆسەر دوژمن.))

لەسەر ئەم نامەیە بۆ ئەنوەرم باسکرد، بەڵام هیچ وەڵامێکی نەدایەوە تەنیا شانەکانی بەرزکردنەوە:((پڕوپاگەندە، پروپاگەندە، نامەیەك لەهاوسەری ئافرەتێك لەبەرەکانی شەڕدا مانای ئەوەیە کەمیسر گیرۆدەی شەڕ دەبێت.)) بەڵام من ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاتر پشتراست دەبووم کەدەچینە ناو شەڕێکیتر. ئێوارەی یەکێك لەڕۆژەکانی مانگی تشرینی یەکەم، بەهەڵکەوت گوێبیستی بەشێك لەقسەکانی ئەنوەرو وەزیری بەرگری بووم، ئەنوەر لەکاتی ڕەوانەکردنی ئەحمەد ئیسماعیل وەزیری بەرگری دەیگوت من دەمەوێت بۆمێژوو هەموویان وێنەی بگیرێت. دەیوویست چ شتێك فیلمی بگیرێت.؟ بێگومان مەبەستی هێرشی میسرییەکانبوو. دڵی خۆم دەدایەوە دەمگوت ئەمجارەیان ئامادەیی تەواومان هەیە. یەکێتیی سۆڤیەت دوای دەرکردنی سەربازانی سۆڤیەت لەلایەن ئەنوەر بەڵام بەشێك لەچەکەکانی کەئەنوەر داوای کردبوون گەیشتنە دەستی ئەنوەر.

دەترساین هەمووومان دەترساین سێ جار گیرۆدەی شەڕبووین، چاوەڕێی بارینی بۆمبەکانی دوژمن بووین بەسەر سەری خۆماندا، گوێبیستی مەرگ دەبووین، بینینیی دەردو لەدەستدانی

بەشێك لەجەستەی گەنجەکان، وێرانی شارەکان. لەشەڕی فەلەستین لە١٩٤٨،شەڕی سوئیز١٩٥٦، شەڕی١٩٦٧ لەگەڵ ئیسرائیلو هاوپەیمانان سووکایەتیان بەئێمە کردبوو. سێ تێکشکانی بەدوای یەکدا ورەی ئێمەیان روخاندبوو باوەڕی ئێمەیان لەئێمە وەرگرتبوو. ئیسرائیل بەتێك نەشکاو دەهاتە بەرچاو.

لەکاتی لەدایکبوون فێرکراین لەئیسرائیل بێزاربین‌و خۆمان فێربووین کەدەبێت ترسمان لەئیسرائیل هەبێت. وێنەکانی منداڵەکانی ئێمە لەقوتابخانە لەجیاتی وێنەی گول تەنیا وێنەی موشەك‌و فرۆکەبوون. بۆیان باس دەکرا ئیسرائیل دەست لەهێرشەکانی بۆسەرخاکی ئێمە هەڵناگرێت سنووری خۆی لەرووباری نیل تاکو رووباری فورات لەعێراق دەگرێتەوە، ئیسرائیل تاکو ئێستا بەشێك لەبیابانی سیناو فەلەستین‌و بەشێك لەئۆردن‌و سووریایی بەدەست هێناوە، ئایا دواتر بۆگرتنی وەلاتی ئێمە دەهات؟

وێنەی گەنجەکانیان لەسەر دیوار دەکێشاو لەسەری دەنووسرا:((فەلەستینی داگیرکراو ئازاد بکەن!)) ((سینا ئازاد بکەن.)) بەلاَم لەخۆمان پشتراست نەبووین، دەمانزانی ئیسرائیل بەچەکی پێشکەوتووی ئەمەریکا زۆر لەئێمە بەهێز دەردەکەوێت. چۆن دەمانتوانی ترس لەخۆمان بەدوور بگرین؟ هەلومەرجی ئیسرائیل لەهەموو بوارێك لەهەلومەرجی ئێمە باشتربوو، لەلایەنی زیرەکی، نەبوونی بەزەیی، ئەفسانەکانی کەبۆیان دروستکرابوون، زۆر بەجوانی داهێنانیان بۆکردبوو کەزۆربەی میسرییەکان لەوانە خۆم تاکو ئەوکات هاوشێوەی ئەم جۆریان گوێی بیست نەبووم. چۆن دەمانتوانی رۆژێك پشتراست بین دەتوانین ئەمانە تێك بشکێنین؟

لەپێنجی تشرینی یەکەم، کاتێك لەگەڵ هاوسەرم لەناو باخەکەماندا پیادەرەویی خۆمان دەکرد، بۆم باسکرد:((ئەنوەر دەزانم بەهەموو توانایەك دەتەوێت خاکی ئێمە لەدوژمن وەربگریت، ئەگەر میسر لەم شەڕدا تێك بشکێت کەسێك تۆ تاوانبار ناکات، هەمووو رێبەرانی جیهان هەست بەمافی ئێمە دەکەن‌و نرخی هەوڵدانەکانی تۆ دەزانن.)) بەدوای هەندێك وشە دەگەڕام کەئەنوەر بزانێت دوای تێکشکانی ئێمە لەبەرامبەر ئیسرائیل کە گومانم نەبوو دووبارە تێك دەشکێین بەلاَم پشتیوانی دەکەم. بۆم باسکرد:((ئێمە جارێك ژیاوین جارێك دەمرین هیچ رێگایەك لەئەمەیان باشتر نابێت کەئازایانە لەگەڵ چارەنووسی خۆمان بەارمبەر ببینەوە، ژیانی ژێر دەستە چ سوودێکی هەیە. باشترین رێگا ئەوەیە کارێك بکەیت ئەگەر سەر نەکەوتی هیچ کێشەیەك نییە بەلاَم نابێت قبووڵ بکەین خاکی ئێمە بەداگیرکراوی بمێنێتەوە.))

ئەنوەر لەشوێنی خۆی وەستاو، گوتی:((جیهان من دەزانم لەم شەڕدا سەردەکەوین.))
سەرم سوڕما کاتێکدا دڵی هاوسەری خۆم دەدایەوە بەڵام هیچ پێویستی بەدڵدانەوەی من نەبوو. چۆن ئەوەندە لەخۆی پشتراست بوو کەسەر دەکەوین ئەم هێزو باوەڕەی لەچ سەرچاوەیەك وەردەگرت بەڵام دواتر زانیم پشتراستبوونی ئەنوەر لەپشت بەستنبوو بەخودای گەورە. لەهەمان کات بەدواوە کەزانیم کەئەنوەر پشت بەخودا دەبەستێت‌و من خۆم پشتراستبووم.
رۆژی دواتر شەشی تشرینی یەکەم جانتای ئەنوەرم ئامادە کردو پرسیارم کرد ئایا ئەمڕۆ منداڵەکان ڕەوانەی قوتابخانە بکەم؟ بۆئەوەی بزانم شەڕ نزیکە لەئێمە. وەڵامی دایەوە:((بەڵێ بۆچی رەوانەی ناکەیت؟))
لەدەرگای دەرەوە لەباوشم گرت نەمدەزانی ئەمەیان جاری کۆتایی دەبێت یان دیسان دەتوانین یەکتر ببینین. نیگەرانی خۆم لەئەنوەر دەشاردەوە، لەسەرخۆ پرسیارم کرد: منداڵەکان کاتژمێر یەکی دوای نیوەڕۆ دەبن بەپشوو هیچ کێشەیەك نییە؟))
ئەنوەر گوتی:((رێگایان پێی بدە وەك جاران بڕۆن بۆقوتابخانە.))
کاتێك سواری ئۆتۆمبێل دەبوو دەستم بۆبەرزکردەوەو گوتم:((ئەمانەتی خودا بیت))
ئەوەی لەقسەکانی ئەنوەر تێگەیشتم‌و لێکدانەوەم بۆدەکرد کاتژمێر یەکی دوای نیوەڕۆ شەڕ دەست پێناکات. تەواوی کارەکانی خۆم دوای هەمان کاتژمێر دواخستن. دەموویست هەمان ئێوارە بەتەنیا بمێنمەوە تەنیا گوێی لەدەنگوباسی رادیو بگرم. لەدیدارەکانی بەیانی بیروهۆشم وەك پێویست کاریان نەدەکرد. نەمتوانی گوێبیستی وشەیەك لەقسەکانی نەهلە، هاوسەری عەبدولوەهابی گۆرانیبێژبم. کاتێك رۆیشت بەخێرایی رۆیشتم بۆ نهۆمی سەرەوەو بەتۆهییەم گوت ئاگات لەدەنگوباسەکان گرت؟ لەشێوەی قسەکردنی من شێوابوو گوتی:((چ هەواڵێك؟))
لەجۆرو شێوە پرسیاری خۆم پەشیمانبووم گوتم هیچ.
رۆیشتم لەژووری نووستن گوێم لەرادیو گرت، چیرۆکێکی باس دەکرد دەمویست ژنانی خۆبەش لەمانگی سوور ئاگاداریان بکەم کەئامادەبن بۆپێشوازیکردن لەبریندارەکان، بەڵام نەمتوانی ئەمەیان بکەم. ئەنوەر تاکو ڕادەیەکی زۆر بەنهێنی کارەکانی خۆی دەکردن، شەپۆلی زۆربوونی خەڵك لەنەخوشخانەکان سەرنجی جاسوسانی ئیسرائیلی رادەکێشا کەبەردەوام لەدەوروبەری ئێمە دەسوڕانەوە، ئەوکات دەبوو نیشانەیەکی دیار لەجوڵانەوەکانی ئێمە. من بیروباوەڕەکانی

خۆم بۆکچەکانی خۆم باس نەدەکردن. بەردەوام گوێم لەرادیو دەگرت منداڵەکان پرسیاریان دەکرد:((دایە نیگەرانی، بۆچی؟)) من وەڵامی منداڵەکانم نەدەدایەوە.

لەناکاو، کاتژمێر یەكو نیوی دوای نیوەڕۆ، بەرنامەکانی ئاسایی رادیو بڕان کەمن چاوەڕێی هەواڵەکانم دەکرد:((ئاگاداری هێزەکانی دوژمن هێرشی سەر هێزەکانی ئێمەیان کرد لەنۆکەندی سوئیز. سەربازانی ئێمە ئێستا سەرقاڵی دورخستنەوەی دوژمنەکانن.))

گومانم دەکرد هەستم دەکرد هێزەکانی ئێمە هێرشی خۆیان بۆسەر دوژمن دەستپێکرد بێت. من راستم دەکرد. دوای چەند خولەکێك ئاگادارییەکیتر بلاوکرایەوە:((هێزەکانی ئاسمانی میسر هێرشی سەر سەربازەکانی دوژمنیان لەناوچەی سینا کرد! سەربازانی ئێمە لەنۆکەندی سوئیز دەربازبوون! ئێمە ئەم شەڕە بەشەڕی تشرینی یەکەمو ئیسرائیلییەکان بەشەڕی یوم کیپۆر ناودەبەن.

کاتێك داوام لەکۆمیتەی ژنانی خۆبەخشی مانگی سوور کرد کەئامادەبنو داوام لەخەڵك کرد پێداویستی پێویستی پزیشکی بۆنەخوشخانەکان ڕەوانە بکەن. گوایە هەموو ئەمانە بەکارەبا وشك کرابوون. ئەوەی کەنەدەکرا روویدات روویدابوو. سەربازانی میسری توانیان دەست بەسەر ١٧٦ کیلومەتر سەنگەرەکانی ئیسرائیلدا بگرن لەهێڵی بارلیو لەرۆژهەلاتی نۆکەندی سوئیز سەرکەوتبوون، ئەمیان هەمان هێڵی بەرگری ٢٣٨ ملیون دۆلاری ئیسرائیلبوو بەبەرزی چواردە مەتر کەسۆڤیەت ئێمەی ئاگادار دەکردەوە تەنیا بەبۆمبی ئەتۆم ئەم هێڵەی شەڕ هەڵدەگیرێت!

سەربازانی ئێمە، لەدەستپێکی هێرشی خۆیان بەناوی شەڕی (بەدر)، لەکاتی تێپەڕکردنیان لەنۆکەندی سوئیز هاواریان دەکرد الله اكبر. ئەنوەر، بۆئەوەی ئازایەتی زیاتر بەسەربازان بدات هێرشی نهێنی سەربازەکانی ئێمەی لەنۆکەند ناونابوو بەدر، بۆبەیاد هێنانەوەی گەمارودانی پێغەمبەر(د.خ) لەساڵی ٦٢٤ زایینی کەتیدا ٣٠٠ کەس لەپەیڕەوانی محەممەد(د.خ) لەگەڵ هەزاران فریشتە خودا بۆهاوکاریان ڕەوانەی کردبوون توانیان بەسەر هەزار سەربازی دوژمن سەربکەون. ئێستا سەربازانی ئێمە کارێك کەبەبیری هیچ کەس نەدەکرا توانیان بەئەنجامی بگەیێنن.

هێزی ئاسمانی ئێمە لەماوەی بیست خولەك توانیان بەسەرکەتوو ٩٠٪ ئامانجەکانی خۆیان بۆمباران بکەن تۆپخانەکان هەموو ئامانجەکانی خۆیان بەدرێژایی بەنداوی خول لەهێڵی بارلیۆ ئیسرائیلییەکان تێك بشکێنن. هێزەکانی پیادە لەبەر ئەوەی پێشتر لەساڵی ١٩٦٧ بیابانی

سینایان لەدەستدابوو بەهیوای تۆڵەکردنەوە لەئیسرائیل، پێش بەرنامەی دیاریکراو، بەبەلەمەکانی پلاستیکی لەنۆکەند دەرباز دەبن‌و لەهێڵی بارلیۆ بەگوریسەکانی تایبەت دەرفەتی بۆ هێزەکان خۆشکرد بەسەر دیوارەکان سەربکەون‌و بەچیمەنتۆ بۆرییەکانی کەبۆناگرو ناپاڵمی گەورە کەلەم رێگایەوە فڕەبدەن گیرا. سەربازەکانی میسر توانیان موشەکی کورت مەودای دژە تانك بەهەمان شێوە بەسەر هێڵی بەرگری ئیسرائیل دەرباز بکەن ئەم جوڵانەوەی خێرایی سەربازانی میسری دونیای سەرسامکرد، ئەندازیارانی سوپای میسر بەسوود وەرگرتن لەپۆمپەکانی بەهێزی ئەڵمانی رێگایەکی گەورەیان لەهێڵی بەرگری ئیسرائیل دروستکردو تانکەکانی سوپای ئێمە بەرەوە بیابانی رۆژهەلاتی نۆکەند هەندێك پردی خێرای سەرئاویان دروستکردن.

لەماوەی شەش کاتژمێر، ئیسرائیل لەرووخان زۆر نزیکبوو. ئەم هێرشانەی لەناکاو لەدوو لایەن خەیاڵی ئیسرائیلییەکانی ئاسوودە کرد لەرۆژنامەکان باسکرابوو کەسەرانی سوپا خۆیان بۆسەفەری حەج ئامادە دەکەن‌و سەربازانی میسری لەکەناراوەکانی نۆکەند بەتەواوی لەبەرچاوی ئیسرائیلدان‌و سەربازانی ئیسرائیل هەستیان دەکرد زۆربەیان لەپشوودان. لەماوەی بیست‌و چوار کاتژمێر بەرگری هێزەکانی ئیسرائیل تێکشکا، لەماوەی چوار رۆژدا نۆکەندی سوئێز کەوتە دەستی میسر. ئەفسانەی ئیسرائیل تێکشکا، لەهەمان کات میسر لەسەر ئاست‌و بەرچاوی جیهان هێزو باوەڕی بۆگەڕایەوە.

خەڵك لەبەر دەرگای ماڵی ئێمە دروشمیان بەرز دەکردنەوە:((تێپەڕمان کرد! تێپەڕمان کرد! خودا سادات بپارێزێت!))

بریندارەکان دەگەیشتنە نەخۆشخانەکان، جیاوازی لەجۆری بیرکردنەوەیان لەگەڵ شەڕی ١٩٦٧ سەرسوڕهێنەر بوو، لایەنی دەرونی سەربازان زۆر کەمبوو. هەموو هەوڵدانەکانی ئێمە تەرخان دەکرا کەبریندارەکان رازی بکەین تاکو بەتەواوی چاك دەبنەوە لەنەخۆشخانە دەرنەچن‌و دووبارە بگەڕێنەوە بۆبەرەکانی شەڕ. زۆر لەسەربازەکان ئامادە نەبوون جلوبەرگەکانی خوێنی خۆیان داکەنن‌و جلوبەرگی خاوێنی نەخۆشخانە بپۆشن. سەربازێك سەری زۆرخراب بریندار ببوو بەلاّم پێداگری دەکرد ئامادە نییە هیچ خواردنێك بخۆت تاکو نەگەڕێتەوە بەرکەکانی شەڕ، پزیشکان داوایان لەمن کرد کەلەم لایەنەوە گفتوگۆی لەگەڵدا بکەم.

رووم لەسەربازکردو گوتم:((هەرکاتێك چاك بوویتەوە دەتوانی دووبارە بۆ بەرەکانی شەڕ بگەڕێتەوە. بەڵام ئێستا بوونی تۆ بەم شێوەیە لەبەرەکانی شەر هیچ سوودێکی نییە. ئێمە پێویستیمان بەسەربازەکانی تەندروست هەیە نەك وەك ئێوە بێچارە.)) کەوچکی برنجم لەدەمی نزیك کرد، بۆیەکەمجار دوای پێنج رۆژ ئامادەبوو دەمی بۆ خواردن بیات.

رۆژێکیتر لەکاتی بەهۆش هاتنەوەی سەربازێکی گەنج ئامادە بووم بەردەوام بەنەرمی دەیگوت:((دایە دەزانی یەکەم کەس بووم ئالأی ولأتی خۆم لەرۆژهەلأتی نۆکەند هەڵداو شەکایەوە، من دەستی ئەم سەربازەم گرت؟)) زۆر بەبێچارەی دەستی گرتم ماچیکرد.

هەستم هەڵخرۆشابوو، بەبێ ئەوەی ئاگاداربم دەستی ئەم سەربازەم گرتو ماچکرد، گوتم:((دەبێت دەستت ماچ بکرێت نەك من.)) فرمێسك لەچاوەکانم دەهاتنەخوارەوە: ((تۆ ئالأی ئێمەت گەڕاندەوە شوێنی خۆی، خاکی خۆمان.))

رۆژی دواتر وێنەی دیداری من لەگەڵ ئەم سەربازە لەرۆژنامەکان چاپکرا، بەڵام هیچ ئاماژەیەك نەکرابوو کەمن دەستی ئەم سەربازەم ماچکردووە. کەسانی ناو رۆژنامە ئەم جولأنەوەیە بەشایستەی هاوسەری سەرۆککۆماریان نەزانیبوو. بەڵام بەباوەڕێی خۆم هیچ گرنگ نەبوو. ئەم گەنجەو هەزاران گەنجیتر قارەمانەکانی میسربوون.

سەربازانی ئێمە لەوپەڕی بەرزی ئازایەتی شەڕیان دەکرد. فەرماندەکان دووریان لەهەڵەکانی رابردووی ساڵی ١٩٦٧ دەکرد، فەرمان بەم فەرماندە سەربازیانە کرابوو لەمەیدانی شەڕدا دەبێت خۆیان بڕیار بدەن نەك کەسێك لەدوورەوە فەرمانیان پێی بکات. کاتێك ئەنوەر سەردانی بەرەکانی دەکرد بۆسەربازەکان باسدەکات لەتێکشکان هیچ ترسێکتان نەبێت بەڵام بەهەموو توانای خۆتان شەڕ بکەنو ئەگەر پێویستیکرد بەسەربەرزی خۆتان بکەن بەقوربانی. من خۆم بەپرسیارەتی هەموو هەڵەکان لەئەستۆ دەگرم.)) سەربازانی ئێمە بەهەموو توانای خۆیانەوە دژی دوژمن شەڕیان دەکرد. لەشەڕی پێشووی ١٩٦٧ منیان بەدایکی شەهیدان ناودەبرد. ئێستا ناوێکیتر بۆمن دیاریکرابوو:((دایکی قارەمانەکان))

ئیسرائیل لەترسی تێکشکانی یەکجاری ئەوەی توانی دەیکرد تاکو باوەڕ بەخۆبوونی سەربازانی ئێمە کەمتر بکات. لەرادیوی ئیسرائیل بەزمانی عەرەبی پەیامیان بۆسەربازانی ئێمە لەنۆکەند ڕەوانە دەکرد:((رۆژی رووناك لەئێوە دەکەین بەشەوی تاریك کەبتوانن ئەستێرەکانی ئاسمان ببینن‌و سەرتان لەناو قوڕو لیتە دەنێن‌و ئێسکەکانتان ورد دەکەین.))

ئەمجارە رادیوی ئیسرائیل نەیدەتوانی کەس لەقاهیرە بترسێنێت. زۆر لەسەربازەکانی ئێمە باوەڕیان دەکرد لەم شەڕدا خودا پشتیوانی ئێمە دەکات. لەناو قاهیرە هەندێك جزو لەناو خەڵك بڵاو دەکرانەوە کەلەناویدا ئاماژەیەك هەیە کەفریشتەکانی خودا کەبەشداربوون لەشەڕی بەدر دووبارە هاوکاری موسڵمانەکان دەکەنەوە، ئەم جۆرو لێکدانەوەیە ئەوەندە لەناو خەڵك بڵاوکرایەوە کەئەنوەر ناچاربوو بەخەڵك رابگەیێنێت ژنەراڵ فوئاد عەزیز غالی یەکەم فەرماندەی سەربازی میسربوو لەنۆکەند دەربازبوو، موسڵمان نەبوو کەسێکی قبتی بوو.

تاکو چەند رۆژێك هەستم دەکرد لەهەلومەرجی هەڵفڕیندام، بەبێ ئەوەی هەست بەبچوکترین ماندوو بوون بکەم رۆژو شەو کارم دەکرد، شادی دەرونم کێشی سووك کردبووم، ئەنوەر بەهەمان شێوە شادو بەختەوەر دەهاتە بەرچاو من لەماڵی خۆم نەدەمامەوە چونکە ئەنوەر لەکۆشکی سەرۆکایەتی نەدەگەڕایەوە. یەکەم ئەوری کەسێبەری لەشادی من کرد چاوپێکەوتنم لەگەڵ فرۆکەوانێکی بریندار کەلەهێرشەکانی دەستپێك بۆ ئیسرائیل بەشداریکردبوو. بۆی باسکردم پێنج خولەك دوای دەستپێکی هێرشەکانی ئێمە فرۆکەی عاتف برای ئەنوەر کەتەمەنی ٢٦ ساڵبوو لەئاسمان دەبێت بەپارچەیەك ئاگرو کەوتە خوارەوە. هەناسەم بڕا. چ کەسێك دەتوانێت لەم هەلومەرجە بمێنێتەوە؟ دەستبەجێ زانیمان عاتف گیانی خۆی لەدەستدابوو.

لەگەیاندنی ئەم هەواڵە بەئەنوەر خۆم دەپاراست. توانام نەبوو. حوسنی موبارەك، فەرماندەی هێزەکانی ئاسمانی نەیدەویست ئەنوەر بزانێت. هیچ کەسێك نەیدەویست ورەی بەرزی ئەنوەر دابەزێنێت شەو رۆژ لەناوەندی فەرماندەی سوپا کاری دەکرد.

چوار رۆژ دوای دەربازبوون لەنۆکەندی سوئیز بۆ ئەنوەرم باسکرد:((عاتف ونبووە.))

دوای دوو رۆژ بۆم باسکرد:((لەنەخوشخانەکان بەدوایدا دەگەڕێن.)) هەواڵەم زۆر لەسەرخۆ دەگەیاند تاکو بەیەکجاری نەروخێت، ئەم دوو برایە زۆر لەیەکتر نزیکبوون، عاتف ساڵانە دوو سێ هەفتە لەماڵی ئێمە دەمایەوە. لەزۆربەی بوونەکانی ئایینی ئێمە بەشداری دەکرد. ئەنوەر قارەمانی عاتفی برایبوو، ئەنوەر ٢٩ ساڵ لەعاتف گەورەتربوو ئەنوەر هیچ کاتێك بەبرا بانگی نەدەکرد بەردەوام دەیگوت عاتف کوڕم. دوای هەشت رۆژ بەردەوامی شەڕ حەقیقەتی راستەقینەم بۆباسکرد کەبرات کوژراوە.

ئەنوەر بۆخولەکێك لەبەرامبەرم راوەستاو سەری خۆی بادا لەئەنجامدا گوتی:((هەستم کردبوو، هەستم کردبوو.)) بۆدووەم جار لەژیانمدا بینیم فرمێسك لەچاوەکانی ئەنوەر دەهاتنەخوارەوە.

پێشتر ئەنوەر تەنیا جارێك گریابوو لەهەمان کات کەدایکی لەباوەشیدا گیانی خۆی دەسپارد.
ئێستا هەوڵی خۆیدا کەبەسەر هەستەکانیدا بالآدەست بێت گوتی:((تەواوی ئەوانەی لەرێگای
ولآتی خۆیان گیانی خۆیان کرد بەقوربانی کوڕو براکانی منن، خۆدی برای من.)) بەماتەم گێڕان
گەڕایەوە بۆسەرکاری خۆی. نەیدەویست خەمباری خۆی زیاتر لەخەمی کەسانیتر بێت کەگیانی
خۆیان لەم رێگایە کرد بەقوربانی.

لەسەر بانگێشتی یەکێتی سۆڤیەتو ئەمەریکا بۆ ئاگر بەست، سوپای ئێمە هێرشەکانی خۆی
لەبیابانی سینا توندتر دەکردن. من تەواوی رۆژ لەنەخوشخانەکان کارم دەکرد شەوان لەژووری
خەوتنم وەلآمدەرەوەی تەلەفۆنەکانبووم کەپەیوەندیان بەئەنوەر دەکرد یەکێك لەتەلەفۆنەکان
وەزیری دەرەوەی بریتانیابوو لەکاتژمێر پێنجی بەیانی. بەلآم ئەنوەر ئامادە نەبوو ئاگربەست
رابگەێنێت تەنیا بەمەرجێك ئیسرائیل هێزەکانی خۆی لەخاکی عەرەب بباتە دەرەوە.

بۆیەکەمجار میسر لەسەر بنەمای هێز کاری دەکرد. لەسێ رۆژی یەکەمی شەڕ، هێزەکانی
ئاسمانی ئێمە یەك لەسەر سێی هێزەکانی ئاسمانی ئیسرائیلی لەبەرەی میسری ناو بردبوون.
سووریا لەلای خۆیەوە دەستی بەهێرش دژی ئیسرائیل کردبوو، زۆربەی هێزەکانی ئاسمانی
ئیسرائیل لەباکوور لەناوچوبوون. لەرۆژی چوارەمی بەردەوامی شەڕ، سوپای میسر زیاتر
له١٢٠ تانك‌و زرێپۆشی گرنگی ئیسرائیلی لەناو بردبوون. ئەوەی کەس باوەڕی نەدەکرد ئێستا
باوەڕ دەکرا. ئەگەر دەمانوویست رێگای تل ئاویو لەبەرامبەر سوپای میسر کراوەبوو.
لەئیسرائیل خۆراگری موشەدایان تێکشکابوو لەبەرامبەر رۆژنامەنووسان دەستی بەگریان کرد.
بەلآم هەواڵەکان بەهەمان خێرایی خرابتر دەبوون. ئیسرائیل داوای لەئەمەریکا کرد کەرزگاریان
بکات. کاتێك پنتاگۆن رایگەیاند ئیسرائیل لەئاستی تێکشکاندایە ئەنجامی پاڕانەوەکانی
ئیسرائیل دەردەکەوتن. لەنەخوشخانەکان هەستمان بەزیانەکانی زۆر دەکردو جۆری
برینەکانیان جیاوازبوو، پزیشکان بۆئەوەی بتوانن زیاتر کار بکەن دەرمانی توانابەخشیان
دەخوارد من‌و خۆبەخشەکان ئیتر خەوتن لەبوونی ئێمەدا نەمابوو.

هەواڵەکان باسیان دەکرد کەکەشتییەکانی گەورەی ئەمەریکا لەبەندەری ئەلعریش چەکی
پێشکەوتوو بۆئیسرائیل دەگوازنەوە لەوانە بۆمبەکانی خۆشەیی کەدژی هێزەکانی ئێمە بەکار
دەهاتن.

چۆن دەماتوانی بەرگری لەخۆمان بکەین؟ دواتر زانیمان لایەنی دارایی چەکەکانی ئەمەریکا بۆئیسرائیل کەلەهەموو چەکێکی پێشکەوتوو پێکدەهات نرخی زیاتربوو لەدوو ملیاردو دووسەد ملیون دۆلار، زیاتر لەخەرجییەکانی پردی هەوای بەناوبانگی هاوپەیمانەکان بۆبەرلین دوای شەڕی جیهانی دووەم. لەجیاتی تانەکانی کەهێزەکانی ئێمە تێکیان دەشکاند ئیسرائیل تانکێکی نوێی وەردەگرت. زۆر لەتانەکانی کەبەدەست سوپای ئێمە دەکەوتن ئەوەند نوێبوون کەنیشانیدا ئەمانە تەنیا ١٢٠ کیلۆمەتر رۆیشتوون. واتە لەنیوانی بەندەری ئەلعریش تاکو نۆکەند. لەنەخوشانەکان پروپاگەندەکان بلاّوکرانەوە کەئەمەریکا چەکی نوێی پێشکەش بەخۆبەخشەکانی جولەکە دەکات. زۆری نەخایاند کەموشەکەکانی ئەمەریکا دوو ناوەندی موشەکی ئێمەی وێرانکردن، ئێمە نەماندەتوانی لەبەرامبەر چەکی نویَ بەرگری لەخۆمان بکەین. بەتوندتر بوونی شەڕو پێکدادان، دۆستو هاوپەیمانەکانی ئێمە لەبەرگریکردن لەئێمە یەکیان گرت. تیتۆ، سەرۆککۆماری یوگسلاوی، ١٤٠ تانك بۆمیسر ڕەوانە دەکات، بۆمدین، سەرۆککۆماری جەزایر ١٥٠ تانك. شای ئێران زیاتر لەپێنج سەد هەزار تۆن نەفتی ڕەوانەکرد هەموو ولاّتانی عەرەبی، بەرێبەرایەتی مەلیك فەیسەل پاشای سعودیا، شەڕێکی نوێی دەستپێکرد. یانزدە ولاّتی عەرەبی بەرهەم هێنەری نەفت بۆ سزادانی ئەمەریکاو پشتیوانی زۆری ئاشکرای بۆئیسرائیل، ناردنی نەفتیان بۆ ئەمەریکا راگرت، ئەم بڕیارانەی پاشای سعودیابوون بەهۆکار کەبەنزین لەسەرتاسەری ئەمەریکا بەرزبوونەوەیەکی خەیاڵی بەخۆیەوە ببینێت.

بەلاّم هەلسوکەوتی موعەمەر قەزافی بەشێوەیەکی زۆر زاڵمانە باوەڕ نەکرابوو، لەجیاتی ئەوەی هاوکاری میسر بکات ئەوەی لەتوانایدا بوو کێشەی بۆمیسر دروست دەکردن. پێش دەستپێکی شەڕ بەلێن بەئەنوەر دەدات پارچەکانی بیستو پێنج فرۆکەی میراژ پێشکەش بەمیسر دەکاتو چوار ملیون تۆن نەفت بۆ قەربۆکردنەوەی زیانەکانی میسر ڕەوانە دەکات. چونکە ئەنوەر بۆپاراستنیان کاری بیرە نەوەتییەکانی میسر دەوەستێنێت. بەلێنی دابوو کاتێك کەبەندەری ئەسکەندەرییە وێران بکریَ میسر دەتوانێت سوود لەبەندەری تۆبرق وەربگرێت. بەختەوەرانە بەندەری ئەسکەندەرییە وەك خۆی مایەوە. بەلاّم ئەنوەر باسدەکات هیچ هەواڵێك لەکەلوپەلی زیادەی فرۆکەکانو نەفت بوونی نەبوو.

سەرکەوتنەکانی سەرەتایی ئێمە جێگای ڕەزامەندی قەزافی نەبوون. قەزافی لەم لایەنەوە زۆر تووڕەبوو کەئەنوەر کاتی دەستپێکی هێرشی بۆسەر ئیسرائیل بۆ ئاشکرا نەکردبوو، دوو ڕۆژ دوای تێپەڕبوونی سوپای ئێمە لەنۆکەندی سوئێز رادیوی لیبیا رایگەیاند هیچ جۆرە بەختێك یاوەڕی ئەم شەڕە نابێتو سەرکەوتن بوونی بۆنییە.

رادیوی دەرەوەی سنوورەکانی لیبیا رایگەیاند:((سەربازانی میسری زمان بەستراون کەتەنیا بەتێکشکان راهاتوون، ئەمانە بۆجاری چوارەم لەبەرامبەر ئیسرائیل تێك دەشکێن.)) ڕەش بینی رادیوی لیبیا دەبوون بەهۆکار ورەیی سەربازانی ئێمە لاوازبکەن.

لەدەیەم ڕۆژی شەڕدا کەهەژدە ڕۆژ درێژەی کێشا ئیسرائیلییەکان توانی هەندێك شوێن پێشڕەویی بکەن لەناوچەی دیفرسوارو نۆکەند دەربازبن، تاکو ئەوکات قسە بێماناکانی لیبیا بەردەوامی هەبوو. میسر لەهەمووکات زیاتر پێویستی بەدرواسێیەکانی عەرەبی خۆی هەبوو، بەڵام لەلایەن لیبیا زیاتر جنویان بەئێمە دەدان. ئەحمەد بداوی دواتر بۆی باسکردم:((کاتێك گوێبیستی قسەکانی رادیوی لیبیابووم هەستم دەکرد گوێی لەرادیو ئیسرائیل دەگرم. بەڵام دواتر ئاگاداربووم رادیوی لیبیایە، دانپێدادەنێم ئەوکات گریام. چۆن دەکرا یەکێك لەبراکانی ئێمە لەبەرامبەر ئێمە راوەستێت؟))

بەپشتیوانی تەواوی ئەمەریکا ئەنوەر تەنیا دەیتوانی کارێك بکات. لەنوزدەی تشرینی یەکەم ئاگر بەستی راگەیاند. نامەیەك بۆحافز ئەسەد سەرۆککۆماری سووریا ڕەوانە دەکات: بەدڵێکی پڕلەخوێن ئاگربەستمان قبوولکرد دەماوێت شەڕ لەگەڵ ئیسرائیل تاکو کاتێك کەپێویست بکات بەردەوامی پێی بدەم بەڵام لەگەڵ ئەمەریکا ناتوانین بەردەوام بینو ڕێگا نادەم هێزەکانی ئێمە دووبارە گیرۆدەی تێکشکانبن. بەڵام ئیسرائیلییەکان ڕێزیان لەئاگربەست نەگرت، دوو کاتژمێر دوای ئاگر بەست دەستیان بەهێرشکردەوە. ئەنوەر نەیدەویست دیسان ئەمەریکا بێتە پێشەوە زۆر بەوریایی بەرگری دەکردو وەڵامی هێرشەکانی دەدایەوە.

ئەنوەر دەیبینی هەموو هیواکانی بۆگرتنەوی سینا بەرەو نەمان دەڕۆن هەلومەرجی زۆر خرابیوو. شەوانە کاتی بەربانگ داوام لیدەکرد شتێك بخوات بەڵام ئامادە نەبوو هیچ شتێك بخوات. لەبەر ئازاری ئەنوەر لەئازار دابووم، پیاوێك کەشەوانە زیاتر لەهەشت کاتژمێر دەخەوت، چەندین هەفتەبوو کەڕۆژانە بیست کاتژمێر کاری دەکرد. نەیدەتوانی قابێکی بچوکی شۆرپای سادە بخوات، تەنیا ئاوی میوەکانی دەخواردەوەو خۆی پێی دەگرت. ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لاوزاتر

دەبوو، رەنگو روخساری گۆڕابوو بەردام بیدەنگ دادەنیشت. لەتشرینی دووەم خوێن لەژووری کارکردنی بەدیار کەوتبوو. بەردەوام لەلایەن ئیسرائیل رێز لەئاگربەست نەدەگیرا شەڕەکان بەشێوازەکانی جوراوجۆر بەردەوامیان هەبوو.

بێگومان ئەمەریکابوو ئاگری شەڕی خۆش دەکردو ئێستاش ئەمەریکابوو داوای راگرتنی شەڕیان دەکرد. لەپانزدەی کانوونی دووەم هنری کیسەنجەر، وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا بۆ دووەم جار لەماوەی چوار هەفتەدا، سەردانی ئەنوەری دەکرد لەقاهیرە. جاری دووەم ئەنوەری لەهەموو جۆرە هێرشێك بۆسەر ئیسرائیل ئاگادار کردەوە وێنەکانی مانگە دەستکردەکان نیشانی دەدا کەتانکەکانی میسری هێزەکانی ئیسرائیلیان گەمارۆ داون‌و دەیزانی مەبەستی ئەنوەر تۆڵەکردنەوەیە لەئیسرائیل دەڵێت: ئەگەر ئەمجارە هێرش بکرێتە سەر ئیسرائیل بەچەکی سۆڤیەت ئێمە هیچ تێکشکانێکیتر بەچەکی سۆڤیەت قبووڵ ناکەین‌و خۆمان هێرش بۆ سەر میسر دەست پێدەکەین. سیاسەتی جیهانی ئەمەریکا رێگا نادەت چەکی سۆڤیەت بەسەر چەکی ئەمەریکا سەربکەوێت. هێزەکانی ئەمەریکا لەسەرتاسەری جیهان ئامادەیی تەواویان هەیە.

بەنیوەندگیری ئەمەریکا لەنیوان وڵاتی ئێمەو ئیسرائیل، لەکانوونی دووەمی ١٩٧٤، یەکەم رێکەوتنی دژایەتی نەکردنی هێزەکانی ئێمەو ئیسرائیل واژۆکرا. میسر رۆژهەڵاتی نۆکەندی سوئێزی بەدەستهێنایەوەو ئیسرائیل قبووڵیکرد هێزەکانی خۆی لەرۆژئاوا بکێشێتەوە. شەڕێکیتر لەنیوانمان بەکۆتایی هات هەزاران کوژراو برینداری لیکەوتەوە. زیانەکانی ئێمە پێنج بەرامبەربوو لەگەڵ ئیسرائیل.

ئایا ئەم رەنج‌و ئازارانە بەکۆتایی دەهاتن؟ زۆر لەبریندارەکانی ئیسرائیلی کەبەدیل گیرابوون لەنەخوشخانەکانی ئێمە دابوون. هاواری دەردی ئەم بریندارانە هیچ جیاوازی لەگەڵ ژان‌و دەردی بریندارەکانی ئێمەدا نەبوو. گریانی دایکان‌و باوکان‌و منداڵی کوژراوەکان لەدەستدانی ئازیزانی خۆیان. هیچ خێزانێکی میسری بوونی نەبوو کەزوڵمی لێنەکرابێت. سێ رۆژ دوای ئاگربەست، نامەیەك لەدایکێکی ئیسرائیلی بەدەستم گەیشت بەناوی روت لیس، کوڕی لەشەڕدا کوژرابوو.

خاتوون، لەوبەری شەڕ دەست بۆئێوە درێژ دەکەم داوا لەئێوە دەکەم تەواوی ژنانی کەوەك منو تۆ هیوایان کۆتایی هاتنی شەڕی ماڵوێرانە وەرن پێکەوە یەکێتییەك دروست بکەین‌و

هاوکاری ژنانی ئیسرائیل بکەن. ئێمەی ئافرەتان ئەگەر پێکەوە یەکگرتوو بین دەبین بەهێزێکی گەورە. لەم لایەنەوە هیچ گومانێك نەکەن، رۆژێکیان هەمان یەك رۆژ دەبێت، هەموو رۆژێك کەتێپەڕ دەبێت بەبێ ئامانج کەسانی زیاتر دەبن بەقوربانی...

لەگەڵیدا هاوڕابووم، هیچ جیاوازی نەبوو کەلەکام نەژادین یان خاوەن چ مەزهەبێکین؟ ئازاری ئێمە لەشەڕدا هەمان دەردو ژان هەموویان یەکبوون.

لەنامەیەکدا بۆخاتوو روت لیس دەنووسم، دواتر سەرم سوڕما لەرۆژنامەکانی ئیسرائیل چاپکرا. گوتم:((هیواخوازم وشەی شەڕ لەفەرهەنگو پەیوەندی مرۆیی بسڕێتەوە.))

باوەڕێکی تەواوم هەیە ئافرەت وەك دایك، هاوسەر، خوشك، کچ دەتوانن کاریگەری تەواوی خۆیان هەبێت لەبەرگریکردن لەکەرامەتی مرۆڤایەتی لەبەرامبەر ترسو تۆقاندن لەشەڕەکاندا. دایکایەتی پێمان دەڵێت دەبێت خێزانێکی بەختەوەربین، منداڵەکانی خۆمان لەناو هەلومەرجێکی بەختەوەر شادو خۆشەویستانەو ئارام گەورە بکەین. جیلی گەنج مافی خۆیانە هیوا بەژیانێکی خۆش بخوازن تاکو بتوانن وزەی داهێنەرانەی خۆیان بۆژیان تەرخان بکەن...

هیوا دەخوازم رێبەرانی ئیسرائیل هەوڵدانی خۆیان بکەن بۆ ئاشتی، چونکە کێشەکانی مرۆڤەکان بەزۆر چارەسەر ناکرێن. ئەمەیان بیروباوەڕی راستەقینەی خۆمو قسەکانی هاوسەری منە. ئێمە دەبێت بزانین خۆشەویستی زۆر باشتر دەبێت لەدوژمنایەتی.

پشتیوانی لەبانگێشتو دۆستایەتی ئێوە دەکەم. هیوای من ئەوەیە کەهەموو ژنان خۆیان تەرخان بکەن بۆکاری دژواری دروستکردنو ناسینی ئاشتی بکەن.

هەشت ساڵ دواتر هاوسەرم ئەنوەر گیانی خۆی لەپێناو ئاشتیدا بەختکرد.



## بەشی دەیەم

## نووسینگەی خاتوونی یەکەم

((ئەنوەر، داوا دەکەم لەوتاری خۆتدا باس لەرێکخستنی خێزان بکەیت. هەرهیچ نەبێت ئاماژەی پێی بکە.))

((ئەنوەر، دەکرێ ئەمڕۆ لەگەڵ پسپۆرانی بیانی نەخوشی سەرەتان کەلەکۆنفرانسی من بەشداریان کرد دیدارێکی کورت بکەیت؟ تەنیا بەخێرهاتنیان بکە، بەڵێن دەدەم داوای هیچ شتێکیتر نەکەم.))

((ئەنوەر، داوای لێبۆردن دەکەم دیسان ناتوانم بۆنانی ئێوارە لەماڵ بمێنمەوە. ئەمڕۆ نوێنەرانی سودانو لوبنان بۆبینینی ناوەندی ئیمانو ئومێد سەردانی ئێمە دەکەن، دەبێت من ئامادەبم.))

دوای شەڕی تشرینی یەکەم، لەبەرەبەیان تاکو رۆژئاوا بەردەوام کارم دەکرد. دەستمان بەچەند پرۆژەیەکی نوێ دەکرد، بابەتو بیرۆکەکانی کەمن لایەنگری بووم. دوای تێکشکانی ئیسرائیلو دیاریکردنی سنوورەکانی میسر کەدیاریکران دەستمان پێکرد. حکومەت دەیتوانی بەردەوام گرنگی بەکێشەکانی ناوخۆیی میسر بدات کە بەردەوام هێقەی میسریان گرتبوو.

ئەنوەر وەك سەرۆککۆمار دەیتوانی کارەکانی زۆر گەورەو گۆڕانکاری گەورە لەبواری کۆمەڵایەتیدا بکات. میسرییەکان بەهەستو سۆزی زۆرەوە خۆشەویستیان بۆرێبەرانی خۆیان هەبوو، ئەگەر ئەم رێبەرانە شاو خەلیفەو سوڵتان بن، یان وەك پۆستی ئێستا سەرۆککۆمار.

دیدگای ڕێبەرانی ئێمە باش‌و خراپ دیدگای ئێمەبوو. ئەگەر ڕێبەرەکان لاوازدەبوون خەڵکی ئێمە هەستی بەلاوازی دەکرد. ئەگەر ڕێبەرێك وەك ئەنوەر بەهێزو نویخواز دەبوو، خەڵك بەهەمان شێوە هەستیان بەهێزی‌و ئازایەتی دەکرد. دوای شەڕی تشرینی یەکەم، سەردەمی گۆڕانکارییەکانبوو.

ئەنوەر هیچ کاتێك تاکو هەمان سەردەم خۆشەویستی نەبوو. لەسەرەتاسەری میسر بۆهەرشوێنێك دەڕۆیشت خەڵك بەیەك دەنگ سوپاسیان دەکرد. خەڵك بۆئەوەی بەخێرهاتنی بکات بەرەو ئۆتۆمبیلی هێرشیان دەبردو هاواریان دەکرد:((زیندوو بێت سەرداری پەڕینەوە لەتۆکەند.)). هەستی خەڵکی لادێی زۆر زیاتربوو، هاواریان دەکرد:((گیان‌و خوێنی ئێمە فیدای تۆبێت، سادات.)) هەوڵی خۆیان دەدا لەهێڵی پاسەوانەکانی دەربازبن بۆئەوەی بتوانن دەستیان بگاتە ئەنوەر یان لەباوەشی بگرن‌و لەسەر شانی دابنێن. لەم لایەنەوە کەئەنوەر لەلایەن خەڵك خۆشەویستی هەبوو هیچ گومانی تێدا نەبوو. بەلام کێشەکانی کەبەرامبەری دەبوونەوە زۆر کەمەر شکێن بوون. زیاتر لەبیست ساڵ بەسەر شۆڕش تێپەڕیکردبوو، بەلام حکومەت بەئامانجەکانی نەگەیشتبوو. لەناوچەکانی لادێی، کەشوێنی ژیانی نیوەی خەڵکی میسربوو، زۆر لەجوتیارانی ئێمە سوودیان لەخاکەناسی دەستە کورتی سەردەمی فیرعەونەکان وەردەگرت، هەڵکێشانی ئاو لەبیرەکان لەرێگای راکێشانی گامێش‌و مانگاو ڕەشەولاغ دەردەهات. هەرچەند خوێندن بۆمنداڵەکان بەناچارییبوو دەبێت هەموویان فێری خوێندن‌و نووسین دەبوون. بەلام ڕێژی نەخوێندەواری کەسانی بەتەمەن زۆربوو:٤٣٪ بۆپیاوان‌و ٦٠٪ بۆئافرەتانی دەگرتەوە. خەڵکی ئێمە بەدەرهاوردەی ساڵانەی ٩٠ دۆلار، خەڵکانێکی زۆر هەژاربوون. لەشارەکان سەدان دادوەر، ئەندازیارو کەسانیتری خوێندەوار لەئیدارەو زانکۆکان بەبێ کاروبار شوێنەکیان دەستەبەر دەکرد کەتەنیا ٥٠٪ لەسەد هێزی کاری خۆیان بەکار دەهێنا.

ئەنوەر دەیزانی کەدەبێت لەم لایەنەوە کارێکی بنەڕەتی بکرێت. ئەنوەر بەهەمان ڕادەو بوێری دەیتوانی کێشەکانی سەربازی چارەسەر بکات، ئامادەبوو کێشەکانی ئابووری چارەسەر بکات. لەساڵی ١٩٧٤، بەراگەیاندنی سیاسەتی نوێی ئابووری بەناوی دەرگاکانی کراوە، هەنگاوێکی بنەڕەتی هەڵگرت کەجیاوازی زۆری لەگەڵ سیاسەتی خۆگۆشەگیرکردنی ناسر هەبوو. ژمارەی گەشتیارانی ئەمەریکاو ئەوروپا زیادیکرد. گرنگتر لەم لایەنە کاری زۆرتری بۆخەڵك دەستەبەر

دەکرد. بۆیەکەمجار، دەروازەکانی میسر بەسەر وەبەرهێنەرانی بیانیدا کرانەوە. کەسێك دەیویست لەگەڵ بازرگانێکی میسر کار بکات دەیانتوانی پێکەوە وەبەرهێنان بکەن، کارگەی نوێی‌و بانك‌و هوتێلەکانی جوان دروستکران. میسرییەکان توانیان سرامیك بەرهەم بێنن لەگەڵ جلشۆرو ، تەلەفزیۆن‌و رادیو بەبەرهەمی خۆماڵی خۆیان خەریك بکەن. میسرییەکان توانیان ئۆتۆمبێلی فیاتی ئیتالی لەناوخۆی میسر بەرهەم بێنن. پیشەسازیی قورسی وەك ئالومینیۆم، نەفت، پترۆشیمی لەسەرەتاسەری وڵات گەشەی کرد.

ئەنوەر پێچەوانەی ناسر، میسرییەکانی هاندا کەبتوانن لەدەرەوەی میسر کار بکەن. هەزارن کەسی میسر کەتاکو ئەوکات دەرەوەی میسریان نەبینیبوو بۆوڵاتانێك دەڕۆیشتن کەلەرووی گەشەکردن لەئێمە دواکەوتووتر بوون، وەك کارەکانی ژمێریاری، پزیشك، مافناس‌و پسپۆر لەکارێکدا سەرقاڵی کارکردنبوون. وەزارەتی پەروەردە تەنیا لەساڵی ١٩٧٤، نزیکەی سی هەزار مامۆستای میسری لەقوتابخانەکانی وڵاتانی عەرەب‌و ئەفریقی دامەزراند. شارەزایانی ئێمە لەدەرفەتەکانی کار لەدەرەوەی میسر بەپارەی زیاترو بەگەرمی پێشوازیان لەم هەنگاوە دەکرد. لەلێکدانەوەیەك دەرکەوت کەئەم میسریانە ساڵانە نزیکەی ملیاردیك دۆلاریان بۆخێزانەکانی خۆیان لەمیسر ڕەوانە دەکرد، ئابووری وڵات سوودی زۆری لەم لایەنە دەکرد.

ئەگەر ئەنوەر وەك سەرۆککۆمار توانیبوو کاریگەری بەسەر خەڵکەوە هەبێت، من بەهەمان شێوە هیواداربووم، وەك خاتوونی یەکەم کاریگەریم بەسەر خەڵکەوە هەبێت. دوای شەڕی تشرینی یەکەم، دەستم بەچالاکی کۆمەڵایەتیکرد، بەڕێوەبەرایەتی نزیکی سی ناوەندی خێرخوازی جۆراوجۆرم دەکرد. سەرۆکایەتی مانگی سوور، ناوەندی بانکی خوێن، سەرۆکی فەخری ڕێکخستنی خێزان، سەرۆکی ئەنجوومەنی کەسانی گیرۆدەبوو بەنەخۆشی پەنجەشێر، ئەنجوومەنی پاراستنی ئاسەوارەکانی میسر، ناوەندی زانستی ژنانی میسر، ناوەندی خۆشکردنی ژیانی قوتابیانی زانکۆو قوتابخانەکانی ئامادەیی. بۆئەنوەرم باسکرد:((ئەنوەر، ئەگەر قوتابییەك نەتوانێت کتێب بکڕێت‌و نەتوانێت جلوبەرگەکانی خۆی دابین بکات، پێشنیاری خوێندنی باڵا چ سوودێکی بۆئەم قوتابیانە دەبێت؟)) زۆرجار لەبەرامبەر ئەنوەر کەحکومەت پشتیوانی لەبەرنامەی ڕێکخستنی خێزان بکات‌و بەخێرایی یاسای مافی ئافرەت دەربچێت، زۆرم باس دەکرد بەردەوام گلەیم دەکردن، بێزارم دەکرد یەکێك لەپەندەکانی بەناوبانگی بۆدەگێڕامەوە:((ئۆقرەکردن کارێکی باشە، جیهان.)) هەوڵی خۆمدا بەسەرخۆمدا زاڵبم. بۆی

باسكردم:((خودا ئەم جیهانەی بەحەوت رۆژ دروستكردووە، چۆن چاوەڕێی لەمن دەكەیت بە رۆژێك بگۆڕم؟ ئۆقرە گرتن كارێكی زۆرباشە.))

ژووری خەوتنم پڕبوو لەراپۆرتەكان‌و لێكۆلینەوە لەبوارەكانی نوێی‌و جۆراوجۆر ئۆتۆمبێلی من بەهەمان شێوە. یەكێك لەژوورەكانی خانووی خۆمان لەجیزە تەرخانكرد بۆنووسینگەی كاركردنم‌و سێ فەرمانبەرم دامەزراندن. چالاكییەكانی كۆمەلایەتی من سەرنجی رۆژنامەكانی نیودەولەتی بەدوای خۆیدا ڕاكێشابوو، دەبێت سكرتێرێكم بۆ كارەكانی راگەیاند تەرخان دەكرد. سەرنجی راگەیاندنەكان سەرەتا زۆریان نیگەران دەكردم، دەمزانی دەركەوتنم لەناو راگەیاندنەكانی نیودەولەتی رەخنەی كەسانی نەریتخوازو توندڕەو بەدوای خۆیدا رادەكێشێت. لایەنێتری نیگەرانییەكانم رۆژنامەكانی بیانی زیاتر لەوەی گرنگی بەكارەكانی من بدەن گرنگیان بەخۆدی مندا. بەلام باسكردنی پرۆژەكانم‌و پرۆژەكانی نوێی‌و كۆن لایەنی دارایی زیاترم بۆكارەكانم دەست دەكەوت. هەستم دەكرد كارەكانی كەنەدەكران وردە وردە دەبوون بەراستی.

لەسالی ١٩٧٢، نەخۆشخانەیەك‌و شوێنی حەوانەوەم بۆكەسانی پەككەوتە دروستكرد، ئەم پرۆژە ئیلهام وەرگیرابوو لەكۆنە سەربازانی پەككەوتەی بێژماری چالاكییەكانم لەسەردەمی شەڕی سالی١٩٦٧. دوای شەڕ، كاتی سەردانم بۆ نەخۆشخانەكانی سوپا، ئەم پیاوانە لەدەوری ئۆتۆمبێلی من دەسوڕانەوە دەیانگوت:((دایە، دایە، ئێمە چی بكەین؟ پزیشكەكان ئێمەیان لەنەخۆشخانە دەركرد هیچمان نییە جگە لەدارەكانی دەستمان‌و ئەم كورسییەیی كەلەسەری دانیشتووین، بۆ ئێمە باس دەكەن بگەڕێنەوە بۆگوندەكەی خۆتان ئێمە لەگوند بەپەككەوتەیی چی بكەین، تەنیا دەبین بەسەرباری خێزانەكانی خۆمان.)) نزیكەی چوار سالدەبوو باری ئەم پیاوانە قورسایی خۆیان لەسەر شانەكانی من دەكرد، كەسانێك دەیانتوانی بگەڕێنەوە مالەكانی خۆیان بەلام بەهیچ شێوەیەك فێرنەكرابوون چۆن بەم شێوەیە كار بكەن. سەربازانی میسری لەبەر پەككەوتوویی‌و نەبوونی ئەركی قورس لەبەردەوامی خزمەتی سەربازی ، تەنیا پشتیان بەخێرو خێراتی خەلك‌و لەرێگای كاری دەستفرۆشی وەك جگارە لەسەر شەقامەمان، ناچار بەجۆرێك لەتێپەڕكردنی ژیانبوون كەشایانی ئەم هەموو سووكایەتییە نەبوون.

من نەمدەویست میسر وەك زۆر ولاتانیتر بێت، لەكاتی گەڕانەوەی سەربازەكانیان بۆمالەوە وەك قارەمان پێشوازی بكرێن‌و دواتر لەیاد بكرێن. پیاوانی ئێمە قارەمانانە خزمەتی ولاتی

خۆیانکرد. ئێستا ئێمەبووین دەبێت خزمەتی ئەم سەربازانە بکەین. دوای گفتوگۆی زۆر لەگەڵ پزیشکانی نەخوشخانەی کۆنە سەربازەکان لەسەر پێداویستیان. بڕیارمدا ناوەندێکی فێرکردن دروست بکەم کەتیدا هاوکاری سەربازانی پەککەوتوو بکرێ تاکو وەك کەسانی خۆبژێوی بگەڕێنەوە بۆناو کۆمەڵگە، نەك خێریان پێی بکرێ. حاکمی قاهیرە هەندێك چولەوانی لەنزیك قاهیرە خستیە خزمەتی ئەم پرۆژەیەو وەزیری کارو کۆمەلآیەتی شێوازی دروستکردن ئامادە کرد تاکو پەککەوتووەکان وەك خۆیان بتوانن سوودی لێ وەربگرن. لەبەر ئەوەی خەڵکی ئێمە ئیمانیان بەپەککەوتانی ئێمە هەبوو، پەککەوتەکان ئومێدیان هەبوو، ناومان بۆدانان، ((شاری ئیمانو ئومێد.))

بەهەمان دیدگای ئەرێنی کەدوای سەرکەوتن بەسەر ئیسرائیل، سەبارەت بەهاوسەرمو میسر دروستبوو، پارەی ولآتانی عەرەبی، سعودیا، قەتەر، دوبەیی ولآتانی تازە بەسەرمایە گەیشتوویی کەنداو بۆئەم ناوەندە ڕەوانەکرا. لەئەنجامدا توانیم بەئامانجی خۆم بگەم لەدروستکردنو بەرفراوانکردنی((شاروچکەی ئیمانو ئومێد))، بەشێوەیەك جگە لەپەککەوتەکانی شەڕ هاوکاری هاوولآتیانی ئاسایش بکرێت. وەلآمی داواکاریم بۆ بودجەی ئەم ناوەندە لەبەرچاوبوو. پیاوێك لەسعودیا ئامادەیی خۆی دەربڕی کەسەدو بیست هەزار لیرەی میسری پێشکەش بکاتو لەکاتی مردنی هەمان ژمارە پێشکەش بکرێتەوە، باوەڕکردنی ئەم جۆرە دەستکرانەوەیە زۆر ئاسان نەبوو، کاتێك بیستم سەردانی قاهیرەی کردووە، کەسێکم بەدوایدا ڕەوانەکرد، بیرم دەکردەوە لەوانەیە کەسێکی پیربێتو لەمردن زۆرنزیك بێت. بەلآم لەوپەڕی باوەڕ نەکردن لەبەرامبەر خۆمدا کەسێکی گەنجم بینی بەناوی سالح کامل.

بۆی باسکردم:((بێگومان بەتەواوی پشتیوانی لەکارەی تۆ دەکەم. ولآتێك کەدەرفەتی ئەم خوێندنەی بۆمن دروستکرد هەست بەبەرپرسیارەتی ئایینی دەکەم.)) ئەم گەنجا ئێستاش مانگانە دەهەزار لیرەی میسری پێشکەش بەم ناوەندە دەکات.

ئەم جۆرە هاوکاریانە لەئیتالیا، بریتانیا، فەرەنساو ئەمەریکا وەردەگرین. هنری کیسەنجەر، وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا، رۆژێك لەکاتی سەردانی بۆمیسر دوای شەڕی تشرینی یەکەم، گوتی:((بیستوومە خۆتان سەرقاڵی دروستکردنی ناوەندی پرۆژەی توانا بەخشین بەبریندارەکانی شەڕ دەکەیت.))

گوتم:((بەڵێ دکتۆر کیسەنجەر، هەوڵی خۆم دەدەم لەحکومەتو خەڵکی ئەمەریکا کەبکرێت پارە کۆبکەمەوە.))

بەسەرسوڕمانەوە گوتی:((خەڵکی ئەمەریکا؟))

بەزەردە خەنە گوتم:((بەڵێ، دروستە کەئێمە لەبەرچاو لەگەڵ ئیسرائیل شەڕ دەکەین، بەلأم چەکی سەربازی لەئەمەریکا بۆیان ڕەوانە دەکرێت. دۆلارەکانی باجی خەڵکی ئەمەریکابوون کەبوون بەهۆکارەی ئەوەی دەستو پێی سەربازانی ئێمە لەجەستەیان جیابکرێنەوەو پێویستیان بەتوانا بەخشینەوە هەبێت.))

پێکەنی زانی کەتووتە داوی من. گوتی:((زۆرباشە، ئەگەر بەم شێوەیە بێت، ئێمەش دەبێت هاوکاریتان بکەین.)) حکومەتی ئەمەریکا شەش ملیون لیرەی میسری پێشکەشی ئەم ناوەندە کرد.

بەم شێوەیە دەملیون لیرەی میسری بۆ((شاری ئیمانو ئومێد)) کۆکرانەوە، پرۆژەیەك کەزیاتر شانازی پێوە دەکەم. لەناو ئەم شارەی ئومێدو هیوا دەستمان بەدروستکردنی خانووی نیشتەجێکردنی تایبەت، ئیدارەکان، نەخوشخانە، قوتابخانە بۆمندالأنی سەربازانی کەمئەندام کرد. کارگەیەکی دروستکردنی دەستو پێی دەستکرد بەدەزگاکانی زۆر پێشکەوتوو ئامادەمان کرد کەپزیشکان لەسەرتاسەری ئەفریقیاو جیهانی عەرەب، بۆخوێندنی شێوازو بینینی شێوەی پەروەردەیی کەمئەندامانی ئێمە سەردانی ئەم ناوەندەیان دەکرد. زۆر لەولأتانی عەرەبی کەسانی پەککەوتووەکانی خۆیان بۆئەم ناوەندەی قاهیرە ڕەوانە دەکردن کەتواناو ئومێدیان بۆبگەڕێتەوە.

دواتر لەناو هەمان((شاری ئومێدو هیوا)) ناوەندێکمان دروستکرد بۆپەروەردەکردنی کەسانێك کەلەرووی بیرکردنەوە دواکەتوون. ئەمجۆرە کەسانە لەولأتانی وەك ئۆردن، سودان، عومانو لوبنان وەردەگرتن. هەموو نەخوشخانەی ئەم ناوەندە لەنووسینگەو دوکانەکانو خواردنگەکانی هەمان شاری تایبەت دادەمەزران. بەپێداگری من بۆدەست نیشانکردنی نرخی دەرمان کەلەگەڵ دەرهاوردەی ئەم کەسانە بگونجێت. هەزاران کەس لەم ناوەندەی ئێمە سوودمەند بوون. خەڵك بەدانی پارەیەکی زۆرکەم دەیانتوانی پێویستییەکانی دەستکردی کەسانی پەککەوتوو بەدەست بێنێتو باوەڕ بەخۆبوونی بۆبگەڕێتەوە.

لەکاتی سەفەرەکانی فەرمی من لەگەڵ ئەنوەر بۆوڵاتان داوام دەکرد من بۆشوێنەکانی پێویستی نوێی پەککەوتووەکان لەنەخوشخانەکان بن، یان بینینی لەئامێرەکانی پێشکەوتوو بۆ منداڵانی کەزووتر لەوادەی خۆیان لەدایك دەبن‌و بینینی باخچەی ساوایان. وەك خۆم پێم خۆشبوو لەجیاتی ئەم شوێنانە سەردانی مۆزەخانەکان بکەم بەڵام زۆرکەم ئەمەیان روویدا. بۆهاوکاریکردنی خەڵکی میسر فێربوون‌و بینین زۆربوون.

لەرۆم شێوازی کەئیتالیا بۆپاراستنی شوێنەوارەکان بەکاریان دەهێناو لەشەودا هەمان رووناکی سەرسورهێنەریان بەکار دەهێنا. شوێنەوارەکانی ئێمە زۆرکۆنتربوون لەم شوێنەوارانە، بەڵام ئێمە لەم لایەنەوە کەم‌و کورتیمان زۆربوو وەك پێویست خزمەتمان لەشوێنەوارەکانی خۆمان نەکردبوو. بۆنموونە، تۆکەندی قەلاّ کەدەگەڕایەوە بۆ سەدەی دوانزدەهەم کەگرێدراوبوو بە کەنداوی فۆم ئەلخەلیق لەقاهیرە، کرابوو شوێنی ئۆتۆمبێلەکانی لەکار کەوتوو زبڵ‌و پاشماوەکان. ئەگەر گەشتیارەکان دەیانویست ئۆتۆمبێلەکانی کۆنی ئێمە ببینن چ پێویست دەکرد سەردانی ئەم شوێنانە بکەن؟ کۆمیتەیەکمان دروستکرد بۆپاراستنی شوێنەوارەکانی میسر لەئاستی بەرزی شارەزایی دەستم پێکرد، بەتایبەتی خاوێنکردنەوەو دروستکردنی رووناکی بۆ گەورەترین گەنجینەکانی رابردووی ئێمە، لەوانە کلێسای (موعەلەقە) کەلەسەدەی چواردەهەم دروستکرابوو لەناوچەی قبتییەکانی قاهیرە، مزگەوتی هەزار ساڵەی ئەبن تولۆن، زۆر کەس شێوازی ئەندازەیی ئەم مزگەوتە بەجوانترین هونەری تالاّر سازی ئیسلامی جیهان هەژمار دەکەن. لەلایەن تەکنیکی پاراستنی شوێنەوارەکان، لەسەرتاسەری جیهان بۆبەشداریکردن لەکۆنفرانسێك لەقاهیرە بانگێشت کران. زۆر لەم شارەزایانە رێنمایی زۆر بەنرخیان پێشکەش کردین.

بەهەمان شێوە کاتێك ئاشنایەتیم لەگەڵ ئەنجوومەنی نەخۆشی پەنجەشێر لەئەمەریکا دروستبوو بۆقاهیرە بانگێشتم کردن. کاتێك کەمیسر ئەندامی ئەنجوومەنی نەخۆشی پەنجەشێربوو، پزیشك‌و لێکۆڵەرەکانی زانستی ئێمە لەلایەنی لیکۆلینەوەکانی خۆیان کەسانی سەرناسبوون لەجیهان. بەلاّم زۆر لەمیسرییەکان شارەزایی تەواویان لە نەخۆشی پەنجەشێر هەبوو نەجۆری خۆپاراستن لەم نەخۆشییەیی ترسناك. بەم شێوەیە لەرێگانی جۆراوجۆری وەك کۆنفرانس‌و ئاگادار کردن‌و رێنمایکردنی خەڵك لەرێگای تەلەفزیۆن هەوڵدانێکی زۆرم لەسەرتاسەری وڵات دەستپێکرد. پێشنیارم بۆژنانی بەتەمەن دەکرد ساڵانە جارێك پشکنین

بكەن چونكە پەنجەشێری مەمك لەقوناخی یەكەم دەكرا دەست نیشانو چارەسەر بكرێ. ئەگەر میسرییەكان یەكێك لەنەریتەكانی كۆنی خۆیان واتە جگارەكێشان بەلاوە بنێن مەترسی گیرۆدەبوون بەشێرپەنجەی سیپەلك زۆر كەمتر دەبوو.

لەپەیامێكی تەلەفزیونی داوام لەخەڵك دەكرد:((لاواز نەبن. بەهێزبن بەنەكێشانی جگارە بەهێز بەولاَتانی خۆتان بدەن. هەمان لایەنی دارایی كەبۆ جگارە تەرخان دەكرێتو دەبێت بەدوكێلّ بەرەو ئاسمان دەڕۆێت. سەلاَمەتی ئێوە لەناو دەبات. پزیشكیك بۆی باسكردم بەچاوی خۆم سیپەلكی كەسانی جگارە كێشو خەڵكی جگارە نەكێش دەبینم.)) مەترسی جگارەكێشان زیاتر لەڕادەی خۆی هەست پێدەكەم. زاوای من جگارەكێشبوو. هاوسەرم، تاكو گیرۆدەی نەخۆشی دڵبوو جگارەكێشبوو. دواتر قەلوونی دەكێشا. زۆر داوام كرد تەنیا چەند رۆژێك وازبێنە، من ئەگەر نەمدەتوانی هاوسەری خۆم رازی بكەم، چۆن دەمتوانی ملیونان كەس رازی بكەم؟

بەلاَم نەمتوانی ئەنوەر رازی بكەم دەست هەلَگرێتو بەردەوام دەیگوت:((جیهان من چەندین كاتژمێر لەكۆبوونەوەكانی حكومەت تێپەڕ دەكەم من ژیانی خۆم تەرخان كردووە بۆخزمەتكردنی خەڵك، ناتوان بەئاسانی سەردانی دەرەوەی ماڵ بكەم ناتوانم بەبێ پاسەوان پیادەڕەوی بكەم. بەچەند شتێك دڵخۆش دەبم یەكێك خودی قەلوونی تووتنی خۆم ناتوانم لەبەرخاتری تۆ ئەمەیان بەلاَوە بنێم.)) بەردەوامی پێدا.

بۆچاودێریكردنی نەخۆشانی پەنجەشێر كەلەكۆتایی تەمەنی خۆیان نزیك دەبوونەوە، هەوڵی خۆمدا وەك ئەوروپا شوێنێك بۆ رۆژو هەفتەكانی كۆتایی ئەم كەسانە دروست بكەین كەبەئاسایی لەم شوێنانە تامو چێژ لەمانەوەی خۆیان بكەن. یەكەم ناوەندی ئێمە لەژێرەوەی مزگەوتێكمان دروستكرد، جێگای سەرسوڕمانی هەندێك كەسبوو تاكو دواتر توانیم رازیان بكەم شوێنێكی زۆر گونجاوە. بۆم باسكردن كەسانێك كەلەرۆژی مەرگی خۆیان نزیك دەبنەوە بیستنی چەند ئایەتێك لەقورئان هەست بەئارامی دەكەن.

هەرچەند سەفەری زیاترم دەكردن بیرۆكەی زیاترم بۆ كۆدەبوونەوە كەهەلومەرجی ژیانی خەڵكی میسر زیاتر ئاسانتر بكرێت.

بۆمن ئەم بیرۆكانە وەك هیواو ئاواتبوون، دەمزانی ناتوانم بەهەموو هیواكانی خۆم بگەم، بەلاَم زۆربەیان جێبەجێ دەكران. بۆنموونە لەزانكۆ شوێنی حەوانەوەی وەك بەشی ناوخۆی بۆقوتابیان وەك پێویست نەبوو، زۆر لەقوتابییەكان توانای بەكرێگرتنی شوێنیان نەبوو، تەنیا

کەسانێکی کەم نەبن. ئایندەی میسر لەدەستی ئەم گەنجانەبوو. ئەوەی توانیم بۆدەستەبەرکردنی پێداویستیو شوێنی حەوانەوەیان دەمکرد. دوای دروستکردنی ئەنجوومەنی قوتابیانی زانکۆ کۆبوونەوەم لەگەڵ وەزیری پەروەردەو خوێندنی باڵاو وەزیری کاروباری کۆمەلایەتیو سەرۆکی زانکۆکان کرد. هەموویان داکۆکیان دەکرد دەبێت شوێنی گونجاو بۆقوتابییەکان هەبێت. بەهاوکاری دارایی حکومەتو هاوکاری کەسایەتییەکانو بەشێك کەقوتابییەکان لەبازار کۆیانکردەوە، توانیمان بەشی ناوخۆیی بۆقوتابیانی زانکۆی قاهیرە، ئەسیوت، زقازیق، تەنتاو ئەسکەندەرییە دروست بکەین. قوتابیانی زانکۆ تەنیا پێنج لیرەی میسری، کەدەکاتە حەوت دولاڕ بۆشوێنی حەوانەوەیان بدەن. دەستەبەرکردنی خوێندن بۆ قوتابیان، پرۆژەیەك خەڵك بەباشی پەسەندیان دەکرد. زۆر خەڵك بۆئەوەی گەنجان بەردەوامی بەخوێندن بدەن مانگانە هەندێك لایەنی دارایی خۆیان پێشکەش دەکرد.

لەدەرەوەی وڵات لێشاوی هاوکاری شارەزایانە بەرەو میسر دەهاتەخوارەوە. بۆنموونە لەسەردانم بۆ ئەڵمانیاو نەمسا، داوای بینینی گوندەکانی بەناوبانگی (ئیس ئۆئیس)م کرد، گوندی تایبەتی مندالآنی بێ دایكو باوك کەجەنابی گامینر دامەزرێنەری بوو. دیاری زۆرم لەمیسر بۆئەم مندالآنە بردبوون. بەلآم دیاریو خۆشەویستو ئومێدی کەئەم مندالآنەی ئیس ئۆئیس پێشکەشی منیان کرد زۆر گەورەتربوو. لەمیسر بەباشی چاودێری کەسانی بێ دایكو باوك دەکرا، بەلآم بەپێچەوانەی ئەم مندالآنە تامو چێژیان لەژیان نەدەبرد. لەگوندی ئیس ئۆئیس منداڵەکان خاوەنی دایکی خۆیانبوون ماڵەکانی بچوك بەشێوەیەك ژیانی خۆیان بەسەر دەبرد وەك ئەوەی ئەمانە خێزانێکی ئاسایی بن دایکێك بۆ ئەم شێوازە بەتایبەت پەروەرد کرابوو. وەك مندالآنی خۆی هەڵسوکەوتی دەکرد، فێری هەموو شتێکی دەکردنو وەك پەروەردە، خواردنی بۆ ئامادە دەکردنو خۆشەویستی تەواوی بۆمنداڵەکان هەبوو. کاتێك لەم گوندە دەهاتمەدەرەوە گوتم: ((جەنابی گامینر ئەم مندالآنە بەختەوەرن لەمیسر بەم شێوەیە نییە.))

سێ رۆژ دوای گەڕانەوەم بۆقاهیرە، گامینز بەتەلەفۆن پەیوەندیکرد. پرسیاریکرد: ((پێتان باشە ئێوەش لەمیسر بین بەخاوەنی گوندێکی ئیس ئۆئیس بۆمندالآنی بێ دایكو باوك؟)) هیوایەك لەدڵمدا زیندوو دەبوو، بەلآم بوێریم ڕەنگو روخساری گۆڕا. نەمدەتوانی داوای بودجەی زیاتر لەوەزارەتی کاروباری کۆمەلایەتی بکەم چونکە تاکو ئەوکات بودجەیەکی زۆر بۆ

پەککەوتووەکان، قوتابیانی زانکۆ، نەخوێندەواری ژنان زۆر لایەنیتر خەرج دەکرا، باری ئەمانە زۆرگرانبوو. گوتم:((جەنابی گامینز، بێگومان زۆر خوشحاڵدەبووم بتوانم ئەمەیان بکەمو ببین بەخاوەنی گوندی ئیس ئۆئیس، بەڵام ئێستا حکومەت توانای خەرجکردنی ئەم بودجەی بۆئێمە نییە.))

بێدەنگی لەنێوانماندا روویدا. دواتر گوتی:((زۆرباشە، ئەگەر ئێستاش وەك هەمان کاتی بینینی گوندی ئێمە تامەزرۆیی، ئێمە گوندێکی هاوشێوەی ئێمە لەمیسر بۆتان دروست دەکەین.))

هەستم دەکرد بەدروستی تێنەگەیشتمو پرسیارم لێکرد:((تەواوی خەرجییەکەی خۆتان پێشکەش دەکەن؟))

گوتی:((بەڵێ، بەدوو مەرج، شوێنی دروستکردنو بەڕێوەبردن لەخۆتان.))

گومانی تێدا نەبوو وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتی زەوی پێویستی بۆم ئەم پرۆژەیە تەرخان دەکرد. لەدەوروبەری شاری ئیمانو ئومێد پارچە زەوییەك هەبوو بەڵام بۆ سەرۆکایەتی گوندی ئیس ئۆئیس؟ بێگومان سەرۆکایەتی ئەم گوندەم وەردەگرت. پرسیارم کرد:((کارەکان چ کاتێك دەست پێدەکەن؟)) لەوبەری تەلەفۆن هەستم بەزەردەخەنەکانی دەکرد گوتی:((تاکو دوو رۆژیتر دەست پێدەکەین.))

ئەنوەر بەفەرمی بەشداری لەکردنەوەی گوندی ئیس ئۆئیس کرد کەبۆزیاتر لە٣٠٠ منداڵ لەقاهیرە کرایەوە. دواتر دوو گوندیتر یەکێك لەئەسکەندەرییە بۆ وەرگرتنی ٢٠٠ منداڵو ئەویتریان لەتەنتا بۆ٧٠ منداڵ کردەوە. بۆوەرگرتنی ئافرەت سەرەوەی سی ساڵ هەواڵێکمان لەرۆژنامەکان بلاَوکردەوە، ژنانی موسڵمان بۆمنداڵانی موسڵمانو ژنانی مەسیحی بۆمنداڵانی مەسیحی دامەزرانو بەباشی پەروەردە کران تاکو منداڵانی هەردوو گروپ لەگەڵ ئایینی خۆیان پەروەردە بکرێن. هەریەك لەم دایکانە تەنیا چاودێری چوار منداڵی دەکرد، ژمارەی منداڵان بۆ دایکێك دەگەیشتە نۆ منداڵ، کاتێك ئەم دایکانە بۆپشوودانو یان بینینی منداڵەکانی خۆیان دەڕۆیشتن، دەستبەجێ خاڵەتێك جێگای دایك دەگرتەوە، ئەم خاڵەتە بەشێوەی خاڵەت پەروەردە دەکران.

بۆچاودێریکردنی ئەم دایكو خاڵەتانە، لەم گوندانە، باوکێك دادەمەزرا. بەرپرسیارەتی دارایی و چاودێریکردنی دایکانو خاڵەتانی دەکردو کاتێك نەخۆشی یان رووداوێك بۆ ئەم منداڵانە دەهاتە پێشەوە کاروباری بردن بۆنەخۆشخانە لەئەستۆی ئەم باوکەبوو. چاودێری منداڵەکانی دەکرد

کەئەم مندالأنە وەك مندالّەکانیتر دەبێت لەقوتابخانەی حکومەت بخوێنن. سالأنە ئەم مندالأنەمان دەبردن بۆ کەناراوەکانی مرسی مەتروح، بەشێکیان بۆ ئەسکەندەرییە، بەشێکیتر بۆ ئۆردوگای ئەبو قیر کەخۆمان دروستمان کردبوون. نیوانێکی زۆری لەگەلّ مالّی ئێمە لەمەعموره نەبوو. رۆژی یەکەمی سالّ ئەم مندالأنەمان دەبردن بۆجەژنی سەری سالّ لەهوتێلەکانی گەورەی وەك قاهیرە، میناهۆز، هیلّتۆن‌و شیراتۆن.
بەمەبەستی گەورەبوونی ئەم مندالأن لەکاتی دەرکەوتنیان لەم گوندانەی ئیس ئۆئیس، بەرنامەی پشتیوانیمان بۆرێکدەخست. منو مندالّەکانم‌و زۆر لەخێزانەکانیتر، لەمیسرو دەرەوەی میسر، مانگانە دەلیرەی میسریمان دەخستە سەر ژمارەی بانکی ئەم مندالأنەی بێ دایك‌و باوك تاکو ببێتە پاشکەوت بۆ دوا رۆژی ئەم مندالأنە لەدەرەوەی ئەم گوندانە. بەم شێوەیە کرانەوەو گەشانەوەی مندالّەکان دەستی پێکرد. هەتیوەکانی کەپێشتر روخساری خەمبارو پێکەنینی بێماناو بەزۆر دەیانکرد، لەناو کەش‌و هەوای ئەم گوندانەی ئیس ئۆ ئیس دەنگیان پڕبوو لەشادی‌و گەرمی سروشتی‌و هەستی بەختەوەرانەبوو.
لەکاتی کارکردن لەسەر تەواوی ئەم پرۆژانە، شەرێکی نوێم بۆبەدەستهێنانی مافی ئافرەتان دەستپێکرد، کەسانی زۆر دژی من وەستانەوە. کاری ئێمە بۆ بریندارانی دوو شەڕی رابردوو هۆکاربوون کەرێزی زیاتر لەئافرەت بگیرێت لەسەرتاسەری ولأت لەکۆتایدا ناسین وەك هاوبەش لەپلەی هاوتای پیاو لەتێکۆشانی نیشتیمانی. ئێستا کاتی پێشەوەبردنی لایەنێکبوو کەلەگەلّ شۆڕش دەستی پێکردبوو. لەسالّی ١٩٥٢ توانیمان مافی دەنگدان‌و مافی یەکسان لەگەلّ پیاوان لەبواری خوێندن‌و بەشداری بەرامبەر لەگەلّ پیاو لەئیدارەکانی حکومەت، پیشەسازیی‌و مەیدانەکانیتری کارکردن. بەلأم لەناو بێدەنگی جیاوازی ڕەگەزی زیاتر دژی ئافرەتان دەکرا لەناو هەموو بەشەکانی کۆمەلّگە نوێنەریان پێویستبوو.
بۆپێداگری خوێندنی ئافرەتان، لەتەمەنی ٤١ لەزانکۆی قاهیرە خۆم ناونووس کرد. بەشی ئەدەبیاتی عەرەب، دەبێت لەم لایەنەوە زۆر لایەنیتر فێردەبووم. زمانناسی، شێعرەکانی پێش ئیسلام، مێژووی سەردەمی ئەمەویی‌و عەباسی.
کاتێك کەدەرفەتێك دەهاتە پێشەوە دەرۆیشتم بۆ ژووری تایبەتی فیلم بینینی ئەنوەر کەلەکۆتایدا ناوی دەرهێنەرو سیناریۆ نووسی فیلم بزانم‌و دواتر دەست بەخوێندن بکەم ئەنوەر زۆرجار دەیگوت زۆر خۆت سەرقالّکردووە دەت بینم بەردەوام گوێی لەدەنگی ماموستاکانت

لەناو ئۆتۆمبیلْ دەگریت. بەم هەموو کاروبارانە چۆن دەتوانی دەست بەخوێندنی ئەدەبیاتی عەرەب بکەیت بەشێکیتری ئاسانی وەك مێژوو بخوێنەوە، زانیاریان زیاتر دەبن و تەنیا پێویستە پێداچوونەوە بەوانەکاندا بکەیت.

بەلاَم من نەمدەویست دەست لەئەدەبیاتی عەرەب هەلگرم. بۆ ئەنوەرم باسکرد ئەم بەشەم هەلبژارد ناتوانم دەست هەلگرم. چونکە ماموستاکان و هاو بەشەکانم لەخوێندن هەستیان دەکرد من زۆر بەباشی دەتوانم بابەتی جۆراوجۆر بنووسم. هاوکات لەگەلْ خۆمدا سیْ لەمندالەکانم لوبنا، نۆهییەو جەمالْ قوتابی زانکۆ بوون. مندالەکانم چاوەڕێی زیاتریان لێدەکردم. رۆژانە پرسیاریان دەکرد ئەمرۆ لەتاقیکردنەوە چەندتان بەدەستهێناوە؟ دەیانوویست پێش من بکەون. بەیانی زوو لەخەو هەلدەستام تاکو خۆم ئامادە بکەم. دەموویست بۆهەموویان نموونەبم، لەوانە مندالەکانی خۆم. ئەگەر باشتر لەمندالەکانی خۆم کارم نەدەکرد، هیچ هۆکارێك نەدەمایەوە کەرێز لەبڕیارو راسپاردەکانی من بگرن.

زۆرجار لەلایەنی دەروونی دوودلْ دەبووم. بەلاَم دواتر هاوڕێی و راوێژکارم لەزانکۆ، پرۆفیسۆر سوهێر ئەلقەلەماری دەهێنایە بەرچاو کەیەکەم ئافرەتی میسربوو توانی بگاتە پلەی بەرزەی خوێندن. لەهەمان سەردەمی سالْی ١٩٣٩ زۆر لەپیاوەکان کۆبوونەوە تاکو رێگای پێنەدەن بچێتە ناو هۆلی تاقیکردنەوەکانی کۆتایی خۆی، کاتێك لەنیوانیان تێپەڕی هەمووکەس هاواریان دەکرد، دواتر لەدەرەوە بەردەیان فڕەدەدانە ژووری تاقیکردنەوەی ئەم ئافرەتە بوێرەدا، دواتر مامۆستاکانی ناچاربوون ژووری تاقیکردنەوەی بگۆڕن.

ئەم دکتۆریانە بۆپشت راستبوون لەتواناکانی بۆماوەی شەش کاتژمێر لەسەربابەتی ئەدەبی هەلبژێردراوی کفتوگۆی توند بکەن و پرسیاری زۆر قورس و بەهێزی لیْ بکەن، لەوانە شیعری رۆمانتیکی عەرەب، بۆقوتابیانی کوڕ ئەم بابەت و گفتوگۆیانە لەسەر بابەتی هەلبژێردراویان تەنیا سیْ کاتژمێر کاتی پێویست دەکرد. لەناو ماموستاکان کەسێك هەبوو بەناوی دکتۆر تەها حوسێن شارەزاو پسپۆڕ لەبواری ئەدەبیاتی عەرەب، ئەم پیاوە جگە لەوەی بینایی خۆی لەدەستدابوون بەلاَم توانیبوو دکتورای خۆی لە زانکۆی سۆربۆنی فەڕەنسا وەربگرێت و دواتر دەبێتە سەرۆکی زانکۆی قاهیرەو وەزیری پەروەردە. دروشانەوەی سوهێر لەم تاقیکردنەوەیەدا بیْوێنەبوو، سوهێر دواتر توانی خوێندنی دکتۆرای خۆی تەواو بکات بەپلەی زۆرباش و ببێتە

مامۆستای زانکۆ. بەردەوام لەگەڵ خۆمدا قسەم دەکردن ئەگەر سوهیر توانی لەم تێکۆشانەی خۆیدا سەربکەوێت، من وەك سوهیر سەر دەکەوم.

من توانیم قۆناخی زانکۆ لەساڵی ١٩٧٨ تەواو بکەم، دواتر بۆ بەدەستهێنانی ماستەر بەردەوام بووم. لەساڵی ١٩٨٠ توانیم تەواوی بکەمو تاقیکردنەوەی زارەکی من بەشێوەی راستەخۆ لەتەلەفزیون بلاّو دەکرایەوە، لەسەرتاسەری ئەم تاقیکردنەوەی من رووداوەکانی ئەلقەلەماوی باوەڕ بەخۆبوونیان بۆدروست دەکردم. دوای تێپەڕکردنی ئەم ئەزموونە کاتێك داوایان لەمن کرد هەفتەی دوو رۆژ دەتوانی لەوانەکانی زانکۆ بەشداری بکەیت. بۆوەرگرتنی دکتۆرا بەردەوامی بەخوێندن بدەیت. بۆمن جێگای شانازیبوو.

تاقیکردنەوەم لەبەرنامەی راستەوخۆی تەلەفزیۆن زۆر دەترسام بەلاّم دەمویست ببم بەسەرمەشق بۆژنانیترو خەڵك بزانێت هەمان پلەی کە وەردەگرم بەهەوڵو تێکۆشانی خۆمبوو نەك لەبەر ئەوەی من هاوسەری سەرۆككۆمارمو لەسەرسینی زێرین پێشکەش بەمن کراوە. ئەوکات زۆرکەس ئامادەبوون کەژنێك بەخوێندنو توانای خۆی نەریتەکانی کۆن تێك بشکێنێت دەکەوتە بەر رەخنەی زۆرینەی خەڵك.

ژنانی کەم توانیان سوود لەدەستکەوتەکانی شۆڕش وەربگرن. لەم لایەنەوە لەساڵی ١٩٧٤ بڕیارمدا بەشداری لەهەڵبژاردنێکی حکومەت بکەم تاکو بتوانم رێگایە نیشانی ژنان بدەم کەبتوانن بەشداری لەسیاسەت بکەن. بەشداریم لەهەڵبژاردنی پەرلەمان نەکرد. تەنیا دەمویست کورسییەك لەئەنجومەنی منوفیە بەدەست بێنم کەدەسەلاّتی بەسەر ٣٠١ گوندا هەبوو لەوانە میت ئەبوئەلکۆمو تلا. لەلایەنی سیاسی زۆرباش نەبووم، نەهەلومەرجێکی بەهێز. چونکە من بەناوی ئەندامی حیزب خۆم کاندید نەکرد وەك کەسێکی سەربەخۆ کاندید بووم. مەبەستم تەنیا کردنەوەی رێگابوو بۆژنانیتر کەلەم لایەنەوە هەنگاوی باشتر هەڵگرنو بەشداری لەدارێشتنی سیاسەتی گوندەکان بکەن.

دوای کۆتایی هاتنی شەڕی تشرینی یەکەم، کاتێك لەم لایەنەوە گفتوگۆم لەگەڵ ئەنوەر کرد، گوتی:((هەرچییەك خودا بکات.)) بەلاّم ئاگاداری کردم. گوتی:((جیهان بتەوەێت بەشداری لەهەڵبژاردن بکەیت یان نەکەیت پەیوەندی بەخۆتەوە هەیە. بەلاّم لەیادی نەکەیت هەرچەند لەدەرەوە کار بکەیت زیاتر گیرۆدەی ڕەخنەی خەڵك دەبیتەوە. ئەمەیان هەنگاوێکی گەورەیە،

تاكو ئێستا تەنیا دوو ژن لەناو ئەنجوومەنی گەل خزمەتیان كردبوو. لەناو ئەنجوومەنی منوفیە هیچ ئافرەتێك بەشداری نەكردبوو.))

گوتم: لەبەر ئەوەیە لەناوچەكانی گوندنشین گرنگی بەكاروباری ئافرەتان نەدراوە. لەزانكۆی قاهیرە رێژی كچو كوڕ یەكسانە. بەڵام لەمیت ئەبوئەلكوم زۆربەی ئافرەتان نەخوێندەوارن. لەقاهیرە رۆژانە ئافرەتان دەبن بەپارێزەرو پزیشك كەبەدامەنی سادە كار دەكەن. بەڵام لەمیت ئەبوئەلكوم بەجلوبەرگی جاران بەبێ وەرگرتنی هیچ دەست هاوردەیەكی دارایی كار دەكەن. ژنانی لادێی ئامادەنین كچانی خۆیان ڕەوانەی قوتابخانە بكەن، چۆنكە بۆكچەكانی خۆیان هیچ ئایندەیەك نابینن جگە لەدووبارە بوونەوەی ژیانی خۆیانو داپیرەكانیان. لەقاهیرە هەشت ژن ئەندامی پەرلەمانن، تۆ خۆت عایشە ئەلراتب كردتان بەوەزیری كاروباری كۆمەڵایەتی. ئەنوەر ژنانی لادێی دەبێت چ بكەن؟ هیچ یەك لەئەمانە كاریگەریان لەناو سیاسەتدا نییە.))

ئەنوەر گوتی:((جیهان پێویست ناكان وتاری سیاسی پێشكەشی من بكەیت ئەگەر دەتەوێت بەشداری هەڵبژاردن بكەیت، بكە، بزانە پیاوەكان دەنگ بەتۆ دەدەن یان نا.))

بۆم باسكرد:((ئەنوەر تۆ دەنگی ئافرەتانت لەیاد كرد.))

بەڵام ئایا ئافرەتان دەنگیان دەدایە من؟ ئەمانە كەسانی دوور لەسیاسەتبوون بۆیان سیاسەت بۆیان ئەوەند گرنگ نەبوو، لەناو رەوتی دیموكراسی سیاسەت هیچ گرنگی خۆی نەبوو. تاكو ئەوكات لەمیت ئەبوئەلكوم لەدەوروبەری بیری ئاوی ناوەندی گوند تەنیا باسی پیاوەكان دەكرا، هەموو گفتوگۆكان لەسەر پیاوەكانو كوڕەكانبوو كەئایا من كوڕانە دەبن بەزاوای چ كەسێك. لەهەمان كات ئەم ئافرەتانە خاوەن دەنگی خۆیان بوون بەپێی یاسای هەڵبژاردن پێویستی دەكرد ئافرەتان دەنگ بدەن.

لەبەیاننامەی شۆڕش لەساڵی ١٩٦٢ هاتبوو ژنو پیاو لەگەڵ یەكتردا یەكسانن بەڵام ژنان خۆیان رێگریان لەپێشكەوتنی خۆیان دەكرد. لەهەڵبژاردنی ساڵی ١٩٧٤ زۆربەی ئافرەتانی لادێی نەیاندەتوانی كارتی دەنگدان بخوێننەوە كەدەنگ بەچ كەسێك بدەن. بەربژێرەكان بەنیشانەیەك خۆیان بەخەڵك دەناساند ـ خۆر، شێر، داری خورما، زۆربەی ئافرەتان توانای نووسینی ناوی خۆیان نەبوو تەنیا سوودیان لەپەنجەمۆر وەردەگرت. دەبێت هەمان هەلومەرج گۆڕانی بەسەردا دەهات. بۆ گەیشتن بەجۆرێك دیموكراسی لەمیسر ئافرت دەبێت خۆی هوشیار كردبایەوە، دەبێت هانبدرێت تاكو دەوری هەبێت لەهەڵسوڕاندنی كاروباری وڵات، لەجیاتی

پەسەندکردنی بڕیارەکان خۆی بەشداربێت لەبڕیاردان. پشتراست بووم کاتێك ببینن دەرفەتێك رەخساوە جولانەوەیەك دەکەوێتە ناو ئافرەتان.

لەمیت ئەبوئەلکۆم هەفتەی جارێك بەیانی لەخەو هەڵدەستام بەهاوکاری ئافرەتان سەردانی گوندەکانی وەك تلاو ئەوانیترم دەکرد. دەڕۆیشتم بۆسەر بیری ئاو هەڵکێشانی گوندەکان کەبەردەوام ژنان لەسەری کۆدەبوونەوە، بۆم باسکرد:((ئێوە زۆر رێزتان لەمن دەگرت لەبەر خزمەتەکانی کەمن لەسەردەمی شەڕدا پێشکەشم دەکردن، بەڵام ئێستا من نامەوێت باسی رابردوو بکەم، من باسی ئایندە دەکەم. دەبێت باسی بەشداری ژن لەناو حکومەت بکەم.)) زۆری نەخایاند، پیاوەکان وەك ژنان لەمن کۆدەبوونەوە، هەندێکجار وەك سەرنج راکێشانیان بۆ بینبینی هاوسەری سەرۆککۆمار، بەڵام زیاتر بۆبینینی ژنێکی سەیر کەبەدڵ چاوەڕێی قسەکانی منیان دەکرد.

تاکو ڕادەیەك لەم پارێزگایە کەسێکی ناسراو بووم، لەهەموو شوێنێك پێشوازیان لەمن دەکرد:((بەخێربیت، دایکی قارەمان، بفەرموون چایەك بخۆنەوە!))، ((ماڵی ئێمەتان نورانی کرد دایکی جەماڵ، زیاتر سەردانی ئێمە بکەن!))، ((خودایە ئەمەیان روخساری تۆیە یان مانگ دەرکەوت؟ دڵم بۆبینینت حەپەساوە!)) من وەك کەسێکی ئەندازیار، جوتیار، ماموستاو یاساناس شارەزایم نەبێت ئەنجوومەنی گەل لەپارێزگا پێك دەهات لە٣٦ ئەندام، بەڵام دەبێت دانپێدانان بکەم کارەکانم زۆرباش بەرێوە رۆیشتن. من وەك هاوسەری سەرۆککۆمار لەناو خەڵك زۆر خۆشەویست بووم. خەڵکی لادێی زیاتر باوەڕیان بەمن هەبوو بتوانم کارێکی باش لەناو ئەنجوومەن بکەم، پشتیوانی ئەنوەر لەم لایەنەوە زۆربوو کاتێك خەڵك بیری دەکردەوە ئەنوەر رێگا بەهاوسەری بدات بەشداری لەهەڵبژاردن بکات. بێگومان بەشایستەی دەزانێت.

کاتێك ئافرەتێکیتر بەناوی سوئاد نەجار بۆکورسییەکی خالی ئەنجوومەن بەشداریکرد. دیدی خەڵك بۆبەشداری ئافرەت لەکارو بڕیاردا زیاتر قبوولکرا. سوئاد لەمنوفیە خاوەنی رێزێکی زۆربوو. چونکە توانیبوو باخچەی ساوایان بۆمنداڵەکان بکاتەوە لەگەڵ شوێنێك بۆفێربوونی ئافرەتان کەبتوانن کاری درووومانی بکەن. ئەمەیان دەستپێکی زۆر باشبوو کەخەڵك باوەڕ بەسوئاد بکەن. سوئاد ژنێکی خاوەن سەرمایەیی زۆربوو. ساڵانە بەپێشکەشکردنی پارەو زەویی بۆچالاکییەکانی کۆمەڵایەتی تەواوی کاتو هێزی خۆی تەرخان دەکرد بۆهاوکاری خەڵك. گومانی تێدا نەبوو کەوەك من، کەمو کورتی مەیدانی خۆی بەکارکردن لەبوارەکانی نوێ قەرەبۆ

دەکردنەوە. هەردووکمان بەپێچەوانەی ئەندامانیتری ئەنجوومەن، لەسەر بیرەکانی ئاو هەڵکێشانی ناوەندی گوند فێری زۆر لایەن دەبووین.

لەرۆژی هەڵبژاردن لەئەیلوولی ١٩٧٤، ژنانی میت ئەبوئەلکۆم، بۆیەکەمجار دەیانتوانی ئافرەتێك هەڵبژێرن، بۆدەنگدان لەقوتابخانە کۆبوونەوە. دواتر، وەك نەریتی لادێی بۆنیشاندانی پشتیوانی خۆیان بۆمن سەردانی ماڵی ئێمەیان کرد. چەندجار کەناوی ئەنوەر لەسەر کاغەزی دەنگدان دەردەکەوت خەڵکی ئامادە لەماڵی ئێمە دەستیان بە گۆرانی گوتن دەکرد. ژنان بەدەف پیاوەکان بەگۆرانی گوتن بەسەر ئەنوەردا دەستیان پێدەکرد:((ئەنوەر، ئەنوەر، ئەی سادات! ئێمە تەنیا تۆمان دەوێتو هەڵدەبژێرین.)) ژنان بەدەستو هلهلە لێدان. ئەوانیتر وەلأمیان دەدایەوە:((ئەی سادات بۆ پێشەوە ئێمە لەپشت تۆ وەستاوین!)) جەژنو سەما تاکو نیوەی شەو بەردەوامی هەبوو. دوای جەژنو سەما ئەنوەر هەموویان بۆخواردنەوەی چا هێنایە ژوورەوە، من لەگەڵ ئافرەتان لەژوورێکیتر دانیشتم. دواتر هەموویان گەڕانەوە بۆماڵەکانی خۆیان.

لەرۆژی هەڵبژاردن ماڵی ئێمە پڕبوو لەخەڵك کەبەشێوازی جۆراوجۆر خۆشی خۆیان دەردەبڕی. ئەمجارە بەشداری ژنان لەهەڵبژاردن زۆر زیاتربوو، دواتر زانیم کەژنان لەسەرتاسەری پارێزگا بەشداری زۆر کاریگەریان هەبووە. ژنانی میت ئەبوئەلکۆم سرودێك بۆسەرکەوتنم دروست دەکەن پێکەوە دەیانگوت:((ببینە! ببینە! تەماشاکە! تەماشاکە! ئەمەیان دایکی قارەمانە!)) دواتر کەئەنجامەکان دەرکەوتن کەمنو سوئاد لەهەڵبژاردنی ئەنجوومەن منوفیە سەرکەوتین. ئەم ئافرەتانە سرودی خۆیان گەیاند پێش بینایی ئەنجوومەن لەمنوفیەو دەستیان بەسەماو شادی خۆیانکرد.

بۆماوەی چوار ساڵ لەناو ئەنجوومەنی منوفیە خزمەتم کرد، مووچەی خۆم مانگانە پێشکەشی ناوەندی فێرکردنی ئافرەتانم دەکرد لەگوندی تلا. دوای هەڵبژاردنەوەی دووبارەم لەساڵی ١٩٧٨، بۆماوی سێ ساڵیتر وەك یەکەم ژنی سەرۆکی ئەنجوومەنی منوفیە لەمیسر، خزمەتم کرد. دوای مەرگی ئەنوەر سادات لەساڵی ١٩٨١، دەستم لەکارکێشایەوە، زۆر پەریشانبووم کەبتوانم بەرپرسیارەتی هەڵگرم. بەڵام زۆر دڵخۆشو سوپاسگوزارم کاتێك بیستم ئەندامانی ئەنجوومەن دەنگیان لەسەر دابوو وەك ڕێزگرتن هەمان یەکساڵی ماوەی سەرۆکایەتیم کورسی سەرۆکایەتی بەخاڵی بمێنێتەوە. ئێمە بەهاوکاری یەکتر توانیمان کارەکانی زۆر گەورە بکەین.

کاتێك بۆیەکەمجار هەڵبژێردرام، هەستم دەکرد کارێکی زۆر دژوار دەبێت چونکە هیچ ئەندامێکی پیاو منیان قبووڵ نەبوو. گرنگ نەبوو باسی چی دەکەین‌و چ بابەتێك دێتە پێشەوە، بەلام پیاوەکان تێکەڵکێشیان لەگەڵ مندا نەدەکرد. یەك بەیەك دەیانگوت ئێمە هاوڕاین لەگەڵ خاتوونی یەکەم، خاتوونی سەرۆککۆمار راست دەکات. لەم لایەنەوە تووڕە دەبووم. بۆم باسکردن من لەم شوێنە هاوسەری سەرۆککۆمار نیم تەنیا ئەندامێکی ئەنجوومەنم پێویست ناکات هەڵسوکەوتی ئێوە لەگەڵ مندا بەم شێوەیە بێت. ئەمەیان ئەوە دەگەیێنێت کەهیچ رێزێك لەبیروباوەڕکانم ناگرن. دوای مانگێك لەهەڵبژاردنم بەیانییەك یەکێك لەئەندامانی ئەنجوومەن بەتوندی دەستی خۆی لەمێز دەداو گوتی:((خاتوو سادات تۆ هەڵە دەکەیت.)) پێکەنیم‌و زانیم کەئیتر لەم ساتە بەدواوە دەتوانین پێکەوە کار بکەین.

هەندێك لەکۆبوونەوەکان دەبوون بەتوفانێکی راستەقینە. بەتایبەتی کاتێك هاوسەرم رێگای بەدروستکردنی سێ پارتی سیاسی دژبەردا لەساڵی ١٩٧٦ ئازادییەکانی سیاسی لەمیسر گەشیان کرد. لەکاتی سەرۆکایەتی من لەئەنجوومەن، تەلەفزیونێکی ئەمەریکا کۆبوونەوەیەکی ئێمەی وێنەدەگرت لەناکاو ئەندامێکی ئەنجوومەن لەپارتی کرێکارانی دژبەر روی لەمن کردو دەستی بەهاوار کرد. کۆبوونەوەی ئەنجوومەن لەسەر دروستکردنی پردێکبوو کەمن لەبودجەی ئەنجوومەن بۆم تەرخانکرد. هەموو ئەندامانی ئەنجوومەن رازیبوون، بەلام ئەم ئەندامە تاوانباریکردم کەبەبێ رەزامەندی ئەنجوومەن بەشێوەیەك دوور لەدیموکراسی بڕیارمداوە.

بەدەنگی بەرزو تووڕە گوتی:((چۆن رێگا بەخۆت دەدەیت هەشت سەد هەزار لیرە بۆ قیرتاوکردنی جادەی شەهیدانی منوف تەرخان بکەیت؟ ئێوە مافی ئەوەتان نییە سەربەخۆ لەجیاتی هەمووومان بڕیار بدەیت.))

تەواوی ئەندامانی ئەنجوومەن لەشێوەی قسەکردنی هەمان ئەندام نیگەرانبوون لەبەرامبەر کامێرای تەلەفزیونێکی بیانی. بەلام من هیچ نیگەران نەبووم.

بۆم باسکرد:((مافی خۆتە، ئێستا دەتوانی پێشنیارەکانی خۆت باس بکەیت.)) هاوار کردنی ئەم پیاوە بەردەوامی هەبوو.

لەئەنجامدا یەکێکیتر لەئەندامانی ئەنجوومەن رووی لەهەمان پیاو کردو گوتی:((تۆ شەرم ناکەیت، خاتوو سادات زۆر رێزی گرتی کەرێگا بەئێوە دەدەن بەم شێوەیە قسە بکەیت.))

من پێداگریم كرد:((رێگای پێی بدەن قسەی خۆی بكات.)) دەمزانی هەمووكاتێك دەتوانین سوود لەلایەنی دژبەری خۆمان وەربگرین.

دوای كۆتایی كۆبوونەوە هەمان پیاو بەدەنگی بەرز رووی لەمن كردو گوتی:((ئەمەیان هەمان دیموكراسی راستەقینەیە، سوپاس كەرێگات پێدام تاكو بابەتی خۆم روونتر بكەم.))

ئەنجامی ئەم گفتوگۆیانە ئاوەدانی زۆری بۆئەم پارێزگایە دروستكرد: دوو ملیون لیرە بۆدروستكردنی پردێك لەنێوان كەناراوەكانی رۆژهەلاّتو رۆژئاوای شیبین ئەلكومو دوو ملیونو دووسەد هەزار لیرە بۆدروستكردنی جادەی نویّ، قیرتاو كردنی جادەكانی كۆن راكێشانی كارەبا بۆهەموو گوندەكانی ئەم پارێزگایە كەتاكو هەمان سەردەم لەم لایەنە بێبەشبوو. بۆباشتركردنی لایەنی تەندروستی نەخوشخانەی نوێمان دروستكردن، راكێشانی ئاو بۆماڵەكان. بۆكاری پیشەسازیی كەگریدراوی بیانییەكان نەبین لەبیابان توانیمان دووكارەگە بۆرستنو كارگەیەك بۆچنین دروست بكەین. هاندانی خەڵك بۆ خویندن، چەند بەشێك لەزانكۆی منوفیە زیادكران لەناوچەكانی جۆراوجۆری بەتایبەت بەشی كشتوكاڵو پیشەسازیی، زانست بۆبەشەكانی جۆراوجۆر قوتابی وەردەگیران. لەساڵی ١٩٧٩، سیانزدە هەزار قوتابی لەزانكۆ ناونوس كرابوون. نەخشەمان بۆدروستكردنی بەشی پزیشكیو بازرگانی ئاماد كردبوو.

زۆرترین كێشەكانی پارێزگای منوفیە گرێدرابوون بەكشتوكاڵ نووسینگەی من بەئامادەكردنی پرۆژەیەك بۆدروستكردنی شوێنی تایبەت بەپەلەوەرو هیلّكە، بەخیوكردنی مانگا بەشێوەی كێلّگەو بەخیوەكردنی ماسی قەلّەباڵغتر دەبوو. بۆ بەرزكردنەوەی ئاستی بەرهەمی كشتوكاڵی خۆمان دەستمان بەهەندێك تاقیكردنەوە كرد، وەك تەماتەو لۆبییە نۆك هەندێكیان لەسەر داربەستەكانی داری. تاقیكردنەوەمان لەسەر زۆر میوە دەكرد بەتایبەتی وشكردنی تەماتە لەبەر هەتاو زۆر سەركەوتوو بوو. ڤیتامینی لەناو نەدەچوو دەكرا بۆماوەیەكی درێژ هەڵبگیریّ. ئافرەتان ناچار نەبوون دوو رۆژ جارێك بۆفرۆشتنیان سەردانی بازار بكەن.

بەپێچەوانەی پاریزگاكانیتر، ئێمە ئەنجامی ئەم تاقیكردنەوەكانی خۆمان بەنهێنی رانەدەگرت، ئەنجامەكان بۆ ئەنجوومەنەكانیتر رەوانە دەكران. بۆیەكەمجار خۆمان سەردانی ئەنجوومەنی شارەكانیترمان كرد تاكو دیدگاو شارەزایی خۆمان لەگەل یەكتر ئالوگۆر بكەین. كاتێك دەمانتوانی شارەزایی زۆر لەیەكتر وەربگرین. چ سوودێكی هەبوو پارێزگاكان بەجیا لەیەكتر بۆخۆیان كار بكەن؟

کاتێك سەردانی شوێنەکانم دەکرد لەهەلومەرجی خۆم لەناو ئەنجوومەن سوودم وەردەگرتو بابەتی ئافرەتم دەهێنایە پێشەوە: توانای ئافرەت لەرێگای پەروەردەی کارو بەدەستهێنانی سەربەخۆیی دارایی‌و رزگاربوون لەنەریتەکانی کۆنی پیاو سالاری. بۆنموونە، کاتێك کارم لەپارێزگای منوفیە دەسپێکرد ئەم پارێزگایە گیرۆدەی کێشەی گواستنەوەی خەڵكو کەلوپەلەکانبوو، توانای جوتیارانی بۆفرۆشتنی بەرهەمەکانی خۆیان لەبازارەکانی گەورەی دەوروبەر سنووردرابوو.

بەتایبەتی ئافرەتان ناچاربوون هێلکەو پەنیری خۆیان تەنیا لەشوێنی خۆیان بفرۆشنو ئەم کێشەیە خەڵکی دەخستە ناو هەلومەرجێکی ناجێگیر. ئەنجوومەنی ئێمە توانی هیلی پاس دروست بکات، بەم شێوەیە ئافرەتان دەیانتوانی باری فرۆشتنی خۆیان لەهەموو بازارەکانی گەورە بەسوودی زیاتری ناوچەکە بفرۆشن.

بۆ چارەسەرکردنی کێشەی باخچەی ساوایان لەناوچەکانی لادێی، لەگەڵ وەزیری کاروباری کۆمەلایەتی عایشە راتب کەپەیوەندیی‌و هاوکاری نزیکمان هەبوو لەساڵی ١٩٧٤ کەتەنیا سەدوچل باخچەی ساوایان بەشێوەی بەربلاو بوونیان هەبوو، ئەمەش کاری دایکانی زۆر دژوار دەکرد. وەزیری کار توانی باخچەی ساوایان لەسەرتاسەری میسر دروست بکات، وەك بڕیار دەبێت لەهەموو پارێزگاکان بەشێك لەبودجەی خۆیان بۆدروستکردنی باخچەی ساوایان تەرخان بکەن. من بەهاوکاری وەزیر عایشە سەفەرەکانی هەفتانەمان بۆپارێزگاکانو دیدارمان بۆ ناوەندەکانی خوێندن پشتیوانیم لەپرۆژەی وەزیر دەکرد. وەلامدەرەوەی خواستی خەڵکبوو. لەساڵی ١٩٨١ ژمارەی باخچەی ساوایان لەسەرتاسەری میسر گەیشتە ١٦٠٠دانە. دیسان پێویستیمان بەدروستکردنو کردنەوەیان هەبوو.

بابەتی زۆربوونی ژمارەی خەڵك یەکێك لەکێشەکانی گەورەی میسر هەژمار دەکرا، هەرچی دەمانکرد، لەقوتابخانە ناوەندەکانی خێرخوازی خزمەتی رۆژانەی خەڵك، پێشکەوتنمان لەبواری پەروەردە دیسان وەلامدەرەوی حەشاماتی خەڵك نەبوو. بەهیچ ئەنجامێکی کۆتایی نەدەگەیشتین. ئەگەر هێرشی سەر بلای گیانی خۆمان نەدەکرد چارەیەکیتر نەبوو. من خۆم شاهێدی زیادبوونی قوتابیانی زانکۆی قاهیرە بووم کە ژمارەیان دەگەیشتە هەشتاو پێنج هەزار قوتابی. تەنیا هەزار قوتابی لەهۆلی وتاربێژی ئامادە دەبوون. لەکاتی وانەپێشکەشکردنی من زۆرجار قوتابییەکان لەسەر پەنجەرەو ژێر پێی کەسانیتر دادەنیشتن. رۆژی یەکەم کەوەك

قوتابی ڕۆیشتم بۆزانکۆ. کورسییەك بۆمن خاڵی کرابوو، بەڵام من ئامادە نەبووم لەسەری دانیشم دەمویست خەڵکانیتر لەسەری دابنیشن.

هەلومەرج لەناوچەکانیتری شار لەزانکۆ باشتر نەبوو. زۆرچار خەڵك بەشێوەیەك هێرشیان بۆپاسەکان دەبرد کەجیان نەدەکرایەوە خۆیان بەدەرگاو پەنجەرەکانەوە دەگرت‌و زۆرجار لەسەر سەری پاس دادەنیشتن. شەقامەکان ئەوەندە قەڵەباڵغ بوون کەمانەوەی چوارکاتژمێر لەناو ترافیکدا کارێکی زۆرئاسایی هەژمار دەکرا. قاهیرە تەنیا بۆ سێ ملیون کەس دروستکرابوو، بەڵام ژمارەی دانیشتوانی گەیشت بەنۆملیون کەس. خزمەتگوزارییەکانی شار توانای خزمەتکردنی ئەم ژمارەی خەڵکیان نەبوو. کاتێك بارانێك دەباری ئاوەڕۆییەکان دەگیران، زۆرجار ئەگەر کەسێك دەیویست پەیوەندی تەلەفۆنی لەڕۆژئاوای شار بەڕۆژهەلاتەوە بکات پانزدە خولەکی پێویستبوو کەهێڵی تەلەفۆن بکرێتەوە. منو هەزاران میسری بۆ پەیوەندیکردن بەکەسێك چەندینجار بەبێ هۆ هاوارمان دەکرد:((ئەلۆ؟ ئەلۆ؟ ئەلۆۆۆۆ؟))

کۆچی خەڵی لادێی بۆشار کێشەکانی قاهیرەی گەورەتر دەکرد، هێرشی جوتیاران بۆقاهیرە بەمەبەستی ژیانێکی باشتر بۆخۆیان‌و خێزانەکانیان دەبوون بەهۆکار کەلە٩٠ چرکە کەسێك لەقاهیرە زیادبێت. زۆر لەم کەسانە نەیاندەتوانی شوێنێك بۆمانەوەی خۆیان بیدۆزنەوە ناچار لەسەر بانی خانووەکان یان لەناو کۆلانەکان سەرپەنایەکیان دروست دەکرد. نزیکەی نیوملیون کەس لەناو گۆرستان دەژیان. نەبوونی خانووی پێویست کاریگەری خۆی لەسەرچینی مام ناوەند کردبوو. زۆر لەکەسانی گەنج لەبەر نەبوونی شوێنێك بۆژیان مێژووی هاوسەرگیری خۆیان بۆکاتێکی نادیار دوادەخست.

ولاتی ئێمە لەخۆراك کێشەی خۆراکی هەبوو. لەدەیەکانی ١٩٦٠ میسر بەرهەمی کشتوکاڵی خۆی ڕەوانەی ولاتانی جیهان دەکرد. ئێستا بەرهەمی میسر وەلامدەرەوەی ناوخۆ نەبوو بەناچاری لەدەرەوە هاوردە دەکرا. هێرشی خەڵك لەلادێی بۆشار کێشەی کشتوکاڵی ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاتر دەبوون. کریکار بۆکاروباری کشتوکاڵی کێشەیەکیتری بۆجوتیاران دروستکرد. زۆر لەجوتیاران ناچار دەبوون لەجیاتی بەرهەمی کشتوکاڵی زەوی خۆیان بگۆڕن بۆکورەی گەورەی کەرپووچ دروستکردن، ئەمەش کێشەیەکیتری کشتوکاڵی میسربوو. بەم شێوەیە زۆر لەزەوییەکانی کشتوکاڵی تەرخان دەکران بۆنیشتەجێبوون.

ئەنوەر خۆی لەخێزانێکی ١٧ کەسی لەدایکبوو دژی کۆنترۆڵکردنی زیادبوونی خەڵکبوو بۆم باسکرد:((ئەنوەر، لەهەفتەیەکدا ئەگەر ئەم یاسایە دوادەخرا بیستو پێنج هەزار کەس لەمیسر زیادیان دەکرد.)) وەڵامی دەدایەوە:((جیهان، رێکخستنی خێزان بە شێوەی تۆ بیردەکەیتەوە ئاسان نییە. زۆرکەس پێداگری دەکەن پێچەوانەی یاساکانی ئیسلامە.))

بەنائومێدی چەندینجار بۆم دووبارە دەکردەوە:((تۆش وەك من دەزانی بەم شێوەیە نییە. موسڵمانان لەکۆنفرانسەکانی جۆراوجۆر لەسەرتاسەری دونیا ئەگەر لەباربردن نەبێت رێگری کردن بێت قبووڵ دەکەن، پزیشکان دەڵێن لەدایکبوونی بەردەوامی منداڵ لەئافرەتێکدا مەترسی لەسەر سەلامەتی دروست دەبێت.))

وەڵامەکانی هەموو جارێك وەك یەکبوون:((جیهان هەموو ئەمانە دەزانم بەڵام دەبێت لەم لایەنە لەگەڵ کەسانی نەریتخواز کار بکەین.))

ئەم کێشەیە هیچ کاتێك چارەسەر نەکرا، ژمارەی دانیشتوانی میسر بەخێرایی زیادبوو.

ئەنجوومەنی پاراستنی خێزان ئەوەی لەتوانایدابوو دەیکرد. بەڵام زۆر لەخەڵکی لادێی نشین زۆرترین ئاماری زیادبوونیان هەبوو، لەهەموو رێگایەك بۆ رێگرتن لەزۆری منداڵ گومانیان هەبوو. نەزانی باڵی بەسەر ئەم خەڵکانەدا گرتبوو، ژنێکی لادێی بەسەر سوڕمانەوە تەماشای منی دەکردو گوتی:((حەبەکانی کەلەناوەندی رێکخستنی خێزان وەرم دەگرتن رۆژانەم دانەیەکم دایە هاوسەری خۆم بەڵام دیسان دووگیان دەبووم.)) هەندێك کەسیتر گلەیی ئەوەیان هەبوو بەدەرمانەکان گێژ دەبن. بۆم باسکردن زۆرمنداڵبوون ئێوە گێژ دەکات نەك دەرمانەکان. بۆم باسکردن منو کچەکانی خۆم کەخاوەن هاوسەرن سوود لەهەمان دەرمان وەردەگرینو گێژوێژ نابین.

بیرکردنەوەی خەڵك بۆزیاتر پەیدابوونی منداڵ جیاوازبوو، خەڵکی خاوەن کێڵگەی کشتوکاڵی بەجۆرێك بیریان دەکردەوە زیادبوونی منداڵێك واتە زیادبوونی کرێکارێك بۆکارکردن بەبێ بەرامبەر. بەزیادبوونی ئەندامانی خێزان شوێنی شایستە بۆهەمان ئافرەتی خاوەن منداڵی بێژمار لەبەرچاو دەگیرا. جگە لەم لایەنە منداڵ وەك بیمەی دڵنیایی بۆدایكو باوکی پیریان هەژمار دەکرا. ئافرەتان دەیانزانی هەرچەند کوڕی زیاتریان هەبێت کێشەی تەڵاقدانو ژنی دووەم کەمتر دەبێت. لەبەرچاوی خەڵك پیاوێك کەزیاتر کوڕی هەبێت زیاتر رێز گیراوە. جێگای سەرسوڕمان نەبوو کەهیچ کەسێك ئامادە نەبێت گوێی بۆقسەکانم رابگرێتو یاسای رێکخستنی

خێزان جێبەجێ نەكات. بەتایبەتی لەناوچەكان لادێی دوای شەڕی ٦٧و ٧٣ بەرەو زیادبوونی زیاتر دەڕۆیشت.

بۆسوڕانەوە لەم بەرگریكردنە لەبەرامبەر ڕێكخستنی خێزان دەبێت زۆر بەهوشیاری كار بكرێت. بۆنەنجوومەنی ڕێكخستنی خێزان باسمكرد زۆربەی ئافرەتان شەرم دەكەن لەسەر ئەم بابەتە لەگەڵ پیاوانی پزیشك گفتوگۆ بكەن پێویستە ئافرەتان بۆئەم بوارە ئامادەو ڕەوانەی ناو گوندەكان بكرێن.

سوپایەك لەكچانی خوێندەوار كەجەماڵ عەبدولناسر بۆئامانجەكانی ناسیونالیستی شۆڕش لەگوندەكان ئامادەی كردبوون لەگەیاندنی پەیامی كۆنترۆڵكردنی خێزان هاوكار بوون. باشترین كەسبوون دەیانتوانی پەیامی ئێمە بەئافرەتان بدەن قابلەكانبوون، قابلەكان كەسانی گەریدەبوون لەناوگوندەكانی میسر پەیوەندی ڕاستەخۆیان لەگەڵ ئافرەتان هەبوو.

پێش دروستكردنی نەخۆشخانە لەگوندەكان كاری لەدایكبوونی منداڵەكانیان دەكرد. پێش ئەوەی خەتەنەكردنی منداڵانی كچ قەدەخە بكرێت قابلەكانبوون پێشتر ئەم كاروبارەی وەحشیانەیان دژی منداڵانی كچ دەكرد.

لەساڵی ١٩٧٤، دكتۆر مەمدوح جەبر، وەزیری تەندروستیو سەرۆكی ڕێكخستنی خێزان، پێشنیار دەكات قابلەكان فێربكرێن بەشێوازەكانی سەردەمیانە لەرێگرتن لەدووگیانی ئافرەتان. لەم لایەنەوە دەلێت ئەگەر ئێمە پزیشكی زیاتر بۆناو خەڵك ئامادە بكەین دیسان ئەگەر پەیوەندی لەنێوانیان نەبێت ناتوانن وەك پێویست كار بكەن. بەلام قابلەكان لەناو خەڵكدا ناسراونو پەیوەندی زۆرباشیان لەگەڵ خەڵكدا هەیەو دەتوانن بەبێ پەردە لەگەڵ ئافرەتان قسەی خۆیان بكەنو بەرامبەر بەهەمان شێوە بەبێ شەرم باسی كێشەی خۆیان بكەن.

بۆیەكەمجار بینیم هەندێك لەئافرەتان هەوڵی خۆیانداوە كەمنداڵی كەمتریان هەبێت لەكارگەی گوندی تلا كەئافرەتانمان فێری دروستكردنی دروومان دەكردن دەیانزانی ئەگەر بەردەوامی بەكاری خۆیان بدەن ناتوانن خاوەن منداڵی زۆربن هیچ یەك لەم ئافرەتانە زیاتر لەچوار منداڵیان نەبوو. دەیانزانی لەكاتێكدا ناتوانن دەرهاوردەی خۆیان بپارێزنو بەدوای یەكدا ببن بەخاوەن منداڵ. ئەگە زیاتر كارمان بۆئافرەتان دەكرد ئەوانیش زیاتر ئامۆژگارییەكانی ئێمەیان جێبەجێ دەكردن لەرێكخستنی خێزان جگە لەدۆزینەوەی دەرفەتی كار یەكجار لەهەفتە پەیامێك بۆرێكخستنی خێزان لەلایەن پزیشك ئاراستەی ئەم ئافرەتانە دەكرا. لەهەمان كات لەناو هەموو

نەخۆشخانەکان پشتیوانی لەرێکخستنی خێزان کرا. بۆراکێشانی ئافرەتان بۆناو بەرنامەی رێکخستنی خێزان ئەوانەی بەشداریان دەکرد گول‌و روون بێبەرامبەر بۆدروستکردنی خوارد پێشکەشیان دەکرا. هەوڵماندا بیٚ حەبی رێگری لەمنداڵ نەگەرێنەوە بۆماڵی خۆیان.

بەتەواوی هەوڵدانەکانی خۆمان بەرنامەی رێگری لەزیادبوونی منداڵی زۆر وەك پێویست نەبوو. جارێکیان پێشنیارن بۆ ئەنجوومەنی رێکخستنی خێزانکرد بۆچی ئێمە دەبێت هێزو توانای خۆمان لەسەر ئافرەتان کۆبکەینەوە؟ دەبێت بەرنامەیەك بۆپیاوان ئامادە بکرێت. جگە لەهەموو لایەنەکان هێزو تواناو قسەی کۆتایی خێزان لەدەستی پیاو دابوو. چونکە پیاوەکانبوون ئەگەر هاوسەری نەیدەتوانی کوڕی پەیدا ببێت لەماڵەوەی دەردەکرد، پیاوەکان بەرگریکاری بیرکردنەوەی پیاو سالاٚریبوون.

دەبێت هەمان بیرکردنەوەی کەریشەی لەناو خەڵك داکوتابوو کەمنداڵی زیاتر دەبێتە بەختەوەری خێزان. ئەندامانی ئەنجوومەن لەوتارەکانی جۆراوجۆری خۆیان لەقوتابخانەکانی شەوانە، لەناوەندەکانی سەربازی لەسەرتاسەری وڵات بۆیان باس دەکرد:((زۆر بەسادەیی تەماشا بکەن ئەگەر لەشوێنی چوار منداڵ تەنیا خاوەنی دوومنداڵ دەبوون مووچەتان چەند دەمایەوە کەبتوانن پێویستییەکانی ژیانی رۆژانەی خۆتان دەستەبەر بکەن، خێزانتان سەلاٚمەتر دەبوو بۆباشترکردنی ژیانی خۆتان هەوڵی زیاتری خۆتان بەکار دەهێنا.)) پێشنیار بۆئەم کەسانە نەدەکرد زیادبوونی منداڵەکان کۆنترۆڵ بکەن چونکە زۆربەیان جوتیاری نەخوێندەوار بوون، چونکە بەهیچ شێوەیەك قبوڵیان نەدەکرد. ئامانجی ئێمە پەیامێکبوو بگاتە شوێنی خۆی منداڵی کەمتر ژیانێکی ئاسانترو خۆشتر، دەمان ویست لەم رێگایە کاریگەری لەبیرکردنەوەیان بکەین. من دەمووویست زیاتر پاڵەپەستۆ لەسەر پیاو دروست بکەم‌و بەردەوامی بەم رەوتە بدرێت تاکو لەم رێگایە رێگاڵە زیادبوونی خەڵك بگیرێت: هاوسەرم.

((ئەنوەر، شێخی ئەزهەر بەئاشکرا پشتیوانی لەکۆنترۆڵی زۆربوونی خەڵك دەکات لەرێگای وەزیری ئەوقاف. بۆچی ئێوە رازی نابن؟))

بەلاٚم دیسان ئەنوەر نەدەرۆیشتە ژێرباری ئەم بڕیارانەو گۆمانی لەکۆنترۆڵکردن‌و رێکخستنی خێزان هەبوو.((من کاری زۆر لەم لایەنە گرنگترم هەیە من دەبێت بیر لەنیشتەجیٚ بوون‌و خواردنی خەڵك بکەم، دەبێت یەکەمجار بیر لەچارەسەری ئەم لایەنە بکەین.))

نەمدەویست ئەنوەر بەپێداگری خۆی من لەم رێگایە سارد بکاتەوە. لەکاتی خۆئامادە کردنی بەردەوام بۆم باسکرد ژمارەی دانیشتوانی میسر لەساڵی ١٩٠٠ تاکو ١٩٧٠ سێ بەرامبەر زیادیکرد تاکو بیستو پێنج سالیتر سی ملیون کەس زیاتر دەبێت. بەردەوام بەنەرمی کارم لەگەڵدا دەکرد:((ئەنوەر چارەسەری ئەم کێشەیە تەنیا رێکخستنەوەی خێزانە. ئەگەر رێژەی خەڵك بەم شێوەیە بۆسەرەوە هەڵنەدەکشا تۆهیچ کێشەت نەدەبوو بەناوی تێرکردنی زکی خەڵكو شوێنی حەوانە بۆ ئەم هەموو خەڵکە.))

بەتەنیا بەردەوام لەسەر ئەم بابەتە گفتوگۆی زۆرمان دەکردو جارێکیان لەساڵی ١٩٧٧، لەکاتی تۆمارکردنی چاوپێکەوتنێك لەگەڵ تەلەفزیۆنی ئەمەریکا بۆماوەی کاتژمێرێك، کار گەیشتە ناو خەڵك.

مۆرلی سیفەر، پێشکەشکاری بەرنامە پرسیار لەئەنوەر دەکات:((سەرۆك سادات، ئێوە دەزانن هاوسەرتان لەئەنجام گەیاندنی کاروبارەکان زۆر ئۆقرە ناگرێت؟))

روخساری ئەنوەرم دەبینی لەتووڕە بوون ڕەش هەڵدەگەڕا. بەتووڕەیی گوتی: ((رێکخستنی خێزان! رێکخستنی خێزان! لەکاتێکدا خەڵکی لادێی بیردەکەنەوە رێکخستنی خێزان پێچەوانەی ئایینە من دەتوانم چی بکەم؟ هەندێك لەکەسانی لۆژیکی کەهاوسەرم یەکێك لەم کەسانەیە رۆژانە پاڵەپەستۆم بۆدروست دەکەن:" رێکخستنی خێزان، رێکخستنەوەی خێزان. تەقینەوەی خەڵك نزیکبووە." بەڵێ، من دەزانم، بەلاَم من دەتوانم چی بکەم؟ لەرێگای یاسا چارەسەر ناکرێت.))

دەستبەجێ بەئیلهام وەرگرتن لەهەوڵەکانی ئایندیرا گاندی بۆکۆنترۆڵی زیادبوونی خەڵك لەهیندستان وەلاَمی خۆم دایەوە:((بۆچی یاسا بۆهیندستان دەبێت؟ دەبێت رێکبخرێ، هەرکەسێك زیاتر لەسێ منداڵی هەبێت سزا بدرێت.))

بیگومان دەمزانی ئەمەیان بڕیارێکی راست نییە. بەلاَم هیوام دەخواست خاوەنی یاسایەکی لەم شێوەبین. پێشتر چاوپێکەوتنم لەگەڵ وەفدێکی بیانی رێکخستنی خێزان کردبوو، بۆیان باسکردم لەچین خێزانەکان تەنیا دەتوانن خاوەنی منداڵێکبن. بەلاَم ئەم یاسایە بەسیستەمی دیکتاتۆری هیچ کێشەیەکی نەبوو جێبەجێ دەکرا، لەمیسری دیموکراتیك، خەڵك مافی هەبوو بەنا وەلاَم بداتەوە جێبەجێکردنی ئاسان نەبوو. ئەنجوومەنی رێکخستنی خێزان بابەتی سزادانی خێزانەکان لەسەر ئەوەی کەزیاتر لەسێ منداڵیان نەبێت بەلاَم ئەنجامی پێچەوانە دەردەچوو.

وەزیری پەروەردە رایگەیاند:((خێزانەکان بۆئەوەی سزا نەدرێن لەوانەیە منداڵەکان ڕەوانەی قوتابخانە نەکەن‌و نەخوێندەواری زیاتر سەرهەڵبداتو نەزانین بەدوایدا سەر هەڵدەدات. تەنیا رێگا پەروەردەکردن دەمێنێتەوە.

بەڵام زیادبوونی خەڵك وردە وردە ئێمەی ئیفلیج دەکرد. ئەمەیان بۆخۆدی وڵاتانی کەقەرزیان لەمیسر هەبوو کێشەی دروستکرد. لەکۆبوونەوەی پاریس لەساڵی ١٩٧٨پێکهاتەی ئابووری ئەورووپای رۆژئاوا بەناو گروپی پاریس، زیادبوونی خەڵکی میسر بەگەورەتر لەقەرزەکانی خۆیان راگەیاند. ئێمەیان تێدەگەیاند ئەگەر حکومەت نەتوانێت بەشێوەیەکی پێداگر رێژەی هەڵکشانی ژمارەی دانیشتوانی کۆنترۆڵ بکات لەوانەیە ئێمەش پشتیوانی دارایی خۆمان بۆ میسر رابگرین.

ئەنوەر دەبێت کارێك بکات. دوای ئەوەی کە وەفدێکی ئەمەریکا بۆرێکخستنی خێزان‌و بینینی وێنەکان سەردانی ماڵی ئێمەیان کرد کەئاژانسی نیودەوڵەتی گەشەکردن ئامادەی کردبوو، کاتێك وێنەکان بەدوای یەکتر ژمارەی دانیشتوانی میسری نیشاندان میسر لەزۆربوونی خەڵك لەمەترسیدایە، روخساری ئەنوەر سات بەسات سەرسوڕماوتر دەبوو. نەیدەتوانی رەت بکاتەوە ئەگەر حکومەتو هەموومان پێکەوە زیادبوونی خەڵك کۆنترۆڵ نەکەین، بەڵایەکی گەورە بۆوڵات دروست دەبێت. ئامارەکان زۆر ترسناکبوون، بەڵام لەدڵی خۆمدا خوشحاڵبووم کەئەنوەر لەئەنجامدا ناچار دەبێت روبەرووی ئەم کێشەیە ببێتەوە.

ئەنوەر لەتشرینی یەکەمی ١٩٧٨، کاتێك وتاری جەژنی نەتەوەیی نۆکەندی سوئێزی پێشکەشکرد، گوتی:((کێشەکانی بنەڕەتی ئێمە پێکەوە گرێدراون... خۆراك، ئاسایش، پۆشاك، نیشتەجێ بوون، نرخەکان، مووچەکان پێویستیان بەسیاسەتێکی یەکپارچە هەیە کەرەوتی گۆڕانی ئێمە بەرەو ئابووری سەردەمی ئاشتی بێت. بەڵام لەم لایەنەوە ناکرێت هەندێك لەرێگرییەکان بەنەبینراوی ببینین کەدەستو پێی خەڵکی ئێمەی لەلایەنی دەروونی‌و ئابووری گرێداوە، رێگرییەکانی وەك نەخوێندەواری‌و زۆری خەڵك. لەبەرخاتری یەك بەیەکی خێزانەکانی میسرو تەواوی خێزانی میسر، دەبێت زۆربوونی خەڵك کۆنترۆڵ بکەین.))

لەئەنجامدا ئەنوەر سەبارەت بەم بابەتەی گرنگ قسەی خۆی لەگەڵ خەڵکدا کردو لەئەنجامدا بەکردەوە کاری لەسەر دەکرد. ماوەیەکبوو هەموو خێزانەکانی، لەبچوك‌و گەورە، دەیانتوانی بەخواردنێکی هەرزان کەبەهاوکاری حکومەت دەستەبەر دەکرا. بەڵام لەهەمان کات بەدواوە

تەنیا خێزانەکانی کەژمارەیان تاکو دەگەیشتە پێنج کەسی دەگرتەوە. خێزانەکانی گەورە دەبێت خۆیان ئەم خۆراکانە دەستەبەر بکەن.

بۆرازیکردنی خەڵكو کەمتر کردنەوەی منداڵەکان، هەڵمەتێکی گەورە لەسەرتاسەری وڵات رێکخرا. لەپێش دەرگای هەموو پارێزگاکان وێنەیەکی گەورە بەدەرکەوتن کەخێزانێکی بەختەوەری خاوەن دوومنداڵی نیشاندەدا لەناو خانوویەکی خۆشو دەوربەریان پڕبوو لەمریشكو مراوی، لەتەنیشت ئەم وێنە وێنەی خێزانێکی گەوەر هەڵواسرابوو کەبەخەمباری دانیشتبوونو منداڵی زۆریان لەدەوربەر دانیشتبوونو خانوویان زۆر بچووك ناڵەباربوو. خەڵك بەردەوام بانگێشت دەکرا بۆناوەندەکانی رێکخستنی خێزان. دواتر بەپشتیوانی دارایی ئەنجوومەنی رێکخستنی خێزان داوا لەشاعێرو هونەرمەندان کرا شێعرو گۆرانییەك لەم لایەنەوە ئامادە بکەنو شێعرو گۆرانی یەکەم خەڵات دەکرا کەباس لەخێزانێکی دوومنداڵی بەختەوەری جوتیار بکات لەهەمان کات باس لەخێزانێکی نۆکەسی نابەختەوەر بکات. رۆژانە سێ چوارجار لەتەلەفزیون پێشکەش دەکرا بەناوی تەماشای دەوروبەری خۆت بکە. پیاوێکی نیشان دەدا کەچەند جار بەدەوروبەری خۆیدا دەسوڕایەوە خێزانی گەورەتر دەبوو دواتر لەبەر بێچاربوونی دادەنیشتو دەستی بەگریان دەکرد، لەهەمان کات باوکەکیتر دەر دەکەوت بەدوو منداڵی خۆی زەردەخەنەی لەسەر لێوانبوو بەئارامی دانیشتبوو. ملیونان کەس ئەم کورتە فیلمەی بەهەمان شعێرو گۆرانی ئامادە کراو دەبینی من خۆم شاهێدی بووم کەهەڵکشانی خەڵك وردە وردە کەمتر دەبوو.

ئەنوەر بۆ کۆنترۆڵکردنی دانیشتوان بەرنامەی هاندانی رێکخست بەناوی ((مووچەی سادات)) کەلەساڵی ١٩٨٠ کەوتە واری جێبەجێکرد. بەپێی ئەم یاسایە کەسانێك کەتەمەنیان دەگەیشتە ٦٠ ساڵ مووچەی خانەنشینی وەردەگرت کەبۆیەکەمجار کەسانی پیر دەیانتوانی بەبێ پشتیوانی دارایی منداڵەکانی خۆیان ژیانی پیری خۆیان هەڵسوڕێنن. لەهەموو پارێزگاکان بەئارامی جێبەجێ دەکرا، هاوسەرم هیوای دەخواست ئەم بەرنامەیە سەرتاسەری وڵات بگرێتەوە. لەیەکەم رۆژی جێبەجیکردنی لەپارێزگاکان ئەنوەر خۆی دەرۆیشت بەدەستی خۆی ئەم مووچەی پێشکەش دەکردو سوپاسی دەکردن کەزەحمەتی زۆریان بۆمیسر کێشاوە.

زۆرجار من لەگەڵ ئەنوەر دەرۆیشتم، شانازیم بەخۆمەوە دەکرد، کەکەسێکی بەتەمەنی وڵاتی ئێمە دەتوانێت ژیانی خۆی بە سەربەرزانە تێپەڕ بکات، لەلایەکیتر ئیتر لایەنی دارایی ئەم

کەسانە مسۆگەر دەبوو ناچار نەدەبوون منداڵی زیاتر پێشکەش بەکۆمەڵگە بکەن بەهیوای ئەوەی لەدوارۆژدا هاوکاریان بکەن.

بەچاوخشاندنەوە بەرابردوو نازانم چۆن توانیم بەسەلامەت بمێنمەوە. رۆژانە کاتژمێر پێنجی بەیانی لەخەو هەڵدەستام دەرۆیشتم بۆحەمامو دواتر نوێژی بەیانیو خواردنەوەی قاوەیەکو پێداچوونەوە بەوانەکانی خوێندنم لەزانکۆ خوێندنەوەی راپۆرتەکانی ئەنجوومەنی پارێزگاو تەواوی راپۆرتەکانی گرێدراو بەپرۆژەکانی خێرخوازی، دواتر کاتژمێرێك وەرزش یان یاری تێنیس. کاتژمێر نۆ ئەنوەرم لەخەو هەڵدەستاندو رۆژنامەمو رادیوم بۆدەبردن لەگەڵ چایەك، دواتر خۆم بۆبەرنامەکانی رۆژ ئامادە دەکرد. دە رۆژ لەمانگدا تەرخانم دەکردن بۆ دەزگاکانی ژێر چاودێری خۆم، دوو هەفتە جارێك بەشداریم لەکۆبوونەوەی ئەنجوومەنی پاریزگا دەکرد رۆژێكو نیوم تەرخان دەکردن بۆبینینی دیپلۆماتەکانی بیانی، لەهەفتەدا پێنج رۆژ تەرخان دەکرا بۆزانکۆ، دواتر لەهەفتەدا دوو رۆژ وەك ماموستای وانەبێژ وانەم پێشکەش دەکردن. زۆرجار تاکو درەنگانی شەو کارم دەکرد لەهەمان کات دایکی چوار منداڵی نیو گەنج بووم.

شەوانە بەگشتی شەش کاتژمێر دەخەوتم، کاتێك خەڵك پرسیاریان لەمن دەکرد هیوا بەچ دەخوازی، هەمووکاتێك دەموویست بۆیان باس بکەم((حەوت کاتژمێر خەوتن)) زۆرجار بەپەیامنێرەکان پێدەکەنیم کەدەیانگوت ئەگەر هەفتەیەك کارەکانی ئێوە بەکەین پێویستیمان بەهەفتەیەك پشوودان هەیە. جگە لەم لایەنانە هەمان خێرایی بۆ کاروبارەکان تەرخان دەکرا، شەوان کاتێك دەگەڕامەوە تەنیا هەوڵی خۆم دەدا بەخێرایی بگەڕێمەوە لەهەمان کاتەکانبوو هەستم بەژانی پێم کرد کەژانی نەبە ئەسپیرینو نەلەناو ئاوی گەرم چارەسەر نەدەبوو. بەڵام بەپۆترێك کەلەناو ئاوی گەرم دەکرا کاریگەری خۆی هەبوو. دواتر دەمتوانی بەبێ دەردو ژان بخەوم. رۆژی دواتر ئامادەی کارکردن بووم. زۆرجار سەرئێشە بێچارەی دەکردمو چاوەکانم لێڵ دەبوون ئەوکات نەم دەتوانی کاربکەم. دەبێت بەشداریم لەکۆبوونەوەکانی ئەنجومەنەکانی خێرخوازی، دوو کۆبوونەوە لەبەیانی کۆبوونەوەیەك ئێواران زۆرجار ژانی سەرم ئەوەند توندبوو کەسی وتاربێژم نەدەبینی باسی چ دەکات. ئەوکات دەمتوانی دانی پێدابنێم کەماندووم.

بەڵام هەموومان ماندوو بووین لەشکری ژنانی خۆبەش کەرۆژانە کاریان لەنەخۆشخانەو قوتابخانەو ناوەندەکانی رێکخستنی خێزان دەکرد، لەهەر شوێنێك کەپێویستی دەکرد ئامادە

بوون. من هاندەریان بووم ئەوان بەهەمان شێوە هاندەرم بوون. بەبێ هاوکاری، گیان فیدای ئەمانە من نەمدەتوانی هیچ کارێك بکەم. بۆخەڵکی میسر کاری زۆرمان کردن.

بەلآم رۆژانە بیرم دەکردەوە هاوسەرانی رێبەرانی ولآتانی دەوروبەری ئێمە بۆهاوکاری خەڵك چ کارێك دەکەن کەکێشەکانی خۆیان چۆن چارەسەر دەکەن. رێگەچارەکانی ئێمە لەمیسر چین کەنەیانتوانیوە بەئەنجامەکانی ئێمە بگەن؟ دەتوانن لەچ لایەنێك ئێمە فێربکەن؟ کاتێك دەماتوانی لەرێگای ئالوگۆڕی زانیاری هاوکاری یەکتر بکەین، بۆچی لەیەکتر دووربین. پیاوەکان لەدانیشتنەکانی نیودەوڵەتی لەدەوری یەکتر کۆدبوونەوە بۆچی ئێمەی ئافرەتان نەتوانین؟

لەهاوینی ١٩٧٤، ئافرەتانیتری ئەندامانی پەرلەمان، کۆنفرانسێمان بۆ ژنانی ولاتانی ئەفریقیاو عەرەبی لەقاهیرە رێکخست، ژنانی ئەندام پەرلەمان بانگێشتی هاوپیشەکانی خۆیان کەسانی چالآك لەبواری کۆمەلآیەتی لەولآتان کرد، من وەك هاوسەری سەرۆك بانگێشتنامەم ئاراستەی هاوسەرانی سەرۆککۆمارەکانی ئەفریقیاو عەرەبی کرد. بەگشتی زیاتر لەدووسەد ئافرەت لەسی ولآت بەشادییەکی زۆرەوە بانگێشتمان کردن.

ئەمەیان یەکەم کۆبوونەوەی ژنانبوو لەجۆری خۆی کەتاکو ئەوکات میسر بەخۆیەوە نەبینیبوو. زۆر لەم ژنانە بۆیەکەمجاربوو سەردانی دەرەوەی ولآتی خۆیان دەکرد.

وەلآمی ئەم ئافرەتانە هەرچەند تامەزرۆبوو بەهەمان رادە دڵگەرمبوو. وەفدەکان پێکهاتبوون لەولآتی کنیا،ئەتیوپی، ئۆگاندا، ساحلی عاج، بۆروندی، تۆگۆ، چاد، غەنا، نێجیریاو زەئیر، بەهەمان شێوە لەموریتانیا، مەراکێش، جەزایر، یەمەن، قەتەر، کویت، بەحرین، عومان، لوبنان، سووریا، عێراق، بۆئەم کۆنفرانسەی ئێمە هاتن. هاوسەری ئەحمەدو ئاهیجو سەرۆکی کامرۆن بانگێشتنامەی منی قبووڵکرد، هاوسەری موسا ترائۆرە لەمالی، هاوسەری جولیوس نایرە لەتانزانیا، هاوسەری ئەحمەد سکو تورە لەگینەو هاوسەری سەرۆکی تونسو سومالی بەشداریان کرد. مەلیکە عالییە، هاوسەری مەلیك حوسێن پاشای ئۆردن، دەیتوانی بەشداری نەکات چونکە ماوەی دوو هەفتەبوو ئەرکی دووگیانی خۆی بەجێ گەیاندبوو بەلآم نەیوویست ئەم دەرفەتە لەدەستخۆی بداتو سەردانی قاهیری کرد.

من بەتەواوی سەربەرزییەوە میسرم بەم ئافرەتانە ناساند، پێکەوە سەردانی پرۆژەی کەم ئەندامانو پرۆژی مندالآنی بێ دایكو باوکی گوندی ئیس ئۆئیسم بردن. سەردانی مۆزەخانەی میسریان کردو دواتر بۆبینینی شوێنەوارەکانی مێژووی میسر بەکەشتی لەرووباری نیلم

تێپەڕکردن بۆمیسری عولیا. سەردانی کارگەیەکیان کرد کەژنو پیاو پێکەوە شان بەشانی یەکتر کاریان دەکرد، بۆئەوەی زیاتر ئاشنایەتی لەگەڵ شەڕی ئازایانەی سەربازانی میسر ببینن بردم بۆ نیشاندانی هێڵی بارلیو لەبیابانی میسر. دەموویست ئێستاو ئایندەی میسر نیشانی ئەم وەفدانە بدەم کەبزانن ئێمە بەشێکین لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستو بەشێکە لەئەفریقیا، دەموویست جیاوازییەکانی نیوانمان بزانم لەهەمان کات دەموویست ئالوگۆڕی زانیاری لەنیوانماندا بکەین. مەلیکە عالیە زۆر تامەزروی وردەکارییەکانبوو پرسیاری لەمن دەکرد چ بەرنامەیەکتان بۆ کەسانی نابینا هەیە؟ خەرجی پرۆژەی ئیمانو ئومێد چۆن چارەسەر دەکەیت؟ چۆن بەسەر رێگرییەکانی پرۆژەکانی خۆت سەردەکەویتو بەرگری دەکەیت؟ زۆرخوشحاڵبووم کەزانیارییەکانی خۆم پێشکەش بەم ئافرەتانە بکەم، لەبەرامبەردا من زۆر لەمەلیکە عالیە ژنانیتر فێربووم. هەموو وەفدەکان راپۆرتێکیان لەسەر دەوری ئافرەت لەوڵاتی خۆیان پێشکەش دەکرد کەپرسیارو وەڵامی زۆر سەرنج راکێش و ئەزموونی لەنێوانمان دروست دەبوون.

دۆستایەتی لەنیوان هەموومان دروستبوو، بەتایبەتی منو مەلیکە عالیە زۆر لەیەکتر نزیکبووین. دوای ئەم گردبوونەوەی هەموومان پێکەوە پەیوەندیمان پێکەوە هەبوو. چەند ساڵی دواتر مەلیکە لەگەڵ مەلیك حوسێن سەردانی میسریان کرد. منو عالیە ئێوارەی زۆر پێکەوە دەبووینو قسەی زۆرخۆشمان دەکرد. لەهوتێل کاتاراکت کەبەسەر روویاری نیل لەئەسوان دەیروانی دادەنیشتین. عالیە بەجەستەی باریكو رێکوپێکی خۆی نموونەی ژنێکی عەرەبی ئەمڕۆیی بوو، لەزارکردنەوەی کەسانیتر زۆر شارەزابوو. لەیەکێك لەم ئێوارانە باسی سەفەری خۆی بۆ عوممان دەکرد کەلەگەڵ دایکی سوڵتان قابوس تێپەڕیکردبوو، ئەوەندە پێکەنین زۆری نەمابوو هەناسەبڕیم. قسەو جوڵانەوەکانی دایکی سوڵتانی دەردەهێنانو کوڵمی لەمن دەدان لەهەمان کات وەك دایکی سوڵتان قسەی دەکردن:((دەبێت زیاتر خواردن بخویت، تۆزۆر لاوازو بێ گیانی، بخۆ، بخۆ، بخۆ، تاکو سەلامەت بیت.))

دوای دوومانگیتر عالیە لەرووداوێکی کەوتنەخوارەوەی کۆپتەری لەبیابان، گیانی خۆی سپارد. بەبوونی کەشوهەوای خرابی تۆفانی پێداگری دەکات دەبێت سەردانی نەخوشخانەیە بکات، لەناکاو گیرۆدەی تۆفانی بیابان دەبنو کۆپتەری دەکەوێتە خوارەوە. لەبەر ئەوەی زۆر گەنج بوو لەدونیا رۆیشت خەمباربووم لەهەمان کات خەمی هاوسەرو دوو منداڵم دەخوارد کەبۆئەم

ئافرەتە داخباربوون، بۆئەوەی سەرخۆی لەکەسوکاری بکەم دەستبەجێ سەردانی ئۆردنم کرد، هۆکاری سەردانم هۆکارێکی خەمباربوو بۆیەکەم سەفەرم بۆئەم ولأتە. لەفرۆکەخانە تاکو کۆشك بۆبینینی مەلیکەی دایكو کەسانیتر، لەسەر دەرگای دووکانەکانی داخراو وێنەی بووکێنی مەلیکەی گەنج بەرچاو دەکەوت.

مەلیك حوسێن لەسەردانم بۆ ئۆردن ئاگادار دەبێت ویستی دوای ئەوەی سەردانی مەلیکەی دایك دەکەم سەردانی بکەم. لەسەر رێگام بۆکۆشك بەپێش گڵکۆی عالییە تێپەڕ بووم، مەلیك بڕیاریدابوو گلکۆی ژنی گەنجی لەشوێنێك ئامادە بکەن کەلەپەنجەرەی ژوورەکەیدا دیاربێت. کاتی گەیشتن بۆناو کۆشك، بەبینینی تابلۆیەکی گەورە لەعالییە لەتەنیشت وێنەی شا، زیاتر خەمباری کردم. بەگەیشتنی شا بەهەمان ژوور، نەمتوانی رێگا لەگریانی خۆم بگرم. کاریگەری زۆری لەشا کردبوو کەوەك نەخوشکەکان دەهاتە بەرچاو. نەمدەتوانی وشەیەك بیدۆزمەوە بۆئەوەی دڵی ئەم پیاوە ئارام بکات کەهاوسەری گەنجو جوانی لەدەست رۆیشتبوو. ئێستا لەگەڵ دوومنداڵیدا بەتەنیابوو.

کچێكو کوڕێکی بچوك.

شا بۆی باسکردم:((دەزانم ئێوەی چەند خۆشدەویست. هەردووکمان دڵمان بۆی تەنگ دەبێت.))

مەلیکە عالییە کاری زۆری بۆ ولأتی خۆی کردبوون دەیتوانی زیاتریان بکات. وەك زۆر لەهاوسەرانی فەرمانڕەوای عەرەبو ئەفریقیا، رۆژ لەدوای رۆژ زیاتر گیرۆدەی کێشەکانی کۆمەلأیەتی خەڵکی ولأتی خۆی دەبوو. لەکاتی یەکەم کۆبوونەوەی هاوکاری ژنانی ولأتانی ئەفریقیاو عەرەب لەقاهیرە، روحێکی نوێ لەهاوکاری پشتیوانی دوولأیەنە لەهەموو لایەکەوە سەری هەڵدا. گەشەکردنی ژنانی میسری لەناو کۆمەڵگەو ژیانی پێشەیی دوای شۆڕش، وردبینی زۆر کەسی هەڵخرۆشاندو ئەم بەئاگاهاتنەوەی خێراو گەشەکردوو لەسەرتاسەری رۆژهەلأتی ناوەراست کاریگەری خۆی هەبوو، ژنانی موسڵمان ئامادەو تامەزرۆیی گۆڕانبوون.



## بەشی یانزدەهەم

## ژن لەئیسلامدا

ئافرەتان، هەموو هێزو ئامانجەکانی بەرنامەی من بوون بۆ بەهێزکردنی ئافرەت: راگرتنی زاو زێ، لەڕەگەوە هەڵکێشانی نەخوێندەواری، پەروەردە کردن‌و فێرکردنی گەنجان، گەورەکان بەخۆهێناوەم بەنموونە، دەستبەرکردنی خزمەتگوزاری پزیشکی، خۆراك‌و چاودێری منداڵان، رەخساندنی هەڵی کار، بەرزکردنەوەی ئاستی ژیان، هاندانی ژنان بۆبەشداری زیاتر.

ئاینده لەدەستی ژناندابوو، لەهەموو شوێنێکی جیهان ژنبوون کەبەهاو بنەمای خۆیان بۆمنداڵەکانی خۆیان دەگواستەوە، ئەمانەبوون کەکوڕەکانی خۆیان دەگەیاندە قۆناخی پیاوەتی‌و خۆیان دەبوون بەسەرمەشق بۆکچەکانیان. دەلێن کاتێك دەستێك بتوانێت جووڵانەوە بەبێشکە بکات دەتوانێت فەرمانڕەوایی جیهان بکات. ژن خاوەنی توانای زۆرن، بەڵام لەزۆربەی کۆمەڵگەکانی ئیسلامی ڕێگایان پێنادرێت کردەوەی کارەکانی خۆیان نیشانبدەن، چ بەفیڕۆدانێك! ئەمەیان دەگەڕێتەوە بۆئەنجامی لێکدانەوەی شەریعەت لەلایەن پیاوان، واتە کۆمەلێك یاسا کەلەقورئان‌و حەدیس، لەکۆمەلێك قسەی پێغەمبەر وەرگیراون.

چەندین سەدەیە زانایانی موسڵمان لەسەر ماناکردنی شەریعەت‌و سوود وەرگرتن لەسەردەمی نوێ سەرقاڵی گفتوگۆن. بۆنموونە، کاتێك لەسەدەی پانزدەی زایینی جیهانی ئیسلامی شارەزایی خواردنەوەیەکبوو بەناوی قاوە، زانایانی ئیسلامی لەچوار سوچی جیهان کۆبوونەوە

تاكو گفتوگۆ بكەن كەئایا موسڵمانان دەتوانن سوود لەخواردنەوەی قاوە وەربگرن. هەندێك هۆكار دێننەوە وەك شەراب خەڵك سەرخۆش دەكاتو قورئان ئەمەی حەرامكردووە. كەسانێتر هەبوو دەیانگوت قاوە، چونكە بزوێنەرە كاتێكی زیاتر بۆپەرستینی خودا دەداتە خودا پەرست. قسەی گروپی دووەم جێگای خۆی كردەوە قاوە حەڵاڵكرا. دوای پێنج سەدەی دواتر، كاتێك وڵاتانی عەرەبی بوون بەخاوەنی یاسای تایبەت بەوڵاتانی خۆیانو لێكدانەوەی جیاوازیان بۆبابەتەكانی شەریعەت دەكرد، زاناكان بەشێوەی قاوە رێگایاندا موسلمانەكان سوود لەرادیو وەربگرن. بەپێچەوانەی كەسانێك كەرادیویان بەپێچەوانەی فەرمانەكانی خودا دەزانی. بەڵام گروپی دووەم دەیانزانی دەكرێت لەرێگای رادیو قورئانو پەیامی خودا باشتر بەموسڵمانان بگات. رادیو حەڵاڵو بەسوود بۆ ئیسلام هەژمار كرا.

بەڵام لەسەر بابەتی ژن، جیاوازی زۆرتوند لەنیوان زاناكانی ئیسلام لەناو وڵاتانی جۆراوجۆردا هەیە. سعودیا، وڵاتێك كەزانایانی ئایینی نەریتخوازترین زانان لەسەر شرۆڤەكردنی شەریعەتی ئیسلامی، ژنان رێگە پێدراونین شوفێری بكەنو لەگەڵ پیاوەكان كاربكەنو بەبێ كەسێكی نزیك لەخۆیان سەفەر بكەن.(ئێستا دەتوانن شوفێری بكەن. و.ك)لەكۆنفرانسی نیودەوڵەتی ساڵی ژن كەلەساڵی١٩٧٥ لەلایەن نەتەوەیەكگرتووەكان لەمكزیكوسیتی بەرێوەچوو من سەرۆكی وەفدی ژنانی میسری بووم، وەفدی سعودیا هەموویان پیاوبوون. لەكۆنفرانسی هەمان شێوەی ساڵی ١٩٨٥ لەنایرۆبی هەلومەرجی سعودیا وەك خۆیبوو. دەبێت ژنانی عەرەبستانی سعودیا سوود لەجۆرێك خۆداپۆشینی زۆر نەریتخوازانە بكەن، ئەگەر ژنێك ئەم یاسایانەی جێبەجێ نەدەكردن لەدەرەوەی ماڵی خۆیدا لەلایەن پۆلیسی ئایینی گیرۆدەی لێپێچینەوە دەبوو. كاتێك كەهاوسەری جێگری سەرۆككۆماری خۆمان مەجدە شەفیقی، لەزیارەتی مەككە بەسەر دانەپۆشراو بینرابوو، پۆلیسی مەزهەبی بەمەبەستی تەمێ كردن پێیەكانی داركاری كران.

لەزانكۆكانی سعودیا كچو كوڕ لەزانكۆكانی جیاواز دەخوێنن. لەساڵی ١٩٧٣ كاتێك یەكەم زانكۆی كچان كرایەوە، تەنیا مامۆستایانی ئافرەت كەزۆربەیان میسری بوون دەیانتوانی لەم زانكۆیە وانە پێشكەش بەقوتابیانی كچ بكەن. كاتێك رێگا بەمامۆستای پیاو درا لەم زانكۆیە وانە پێشكەش بكات دەبێت لەرێگای تەلەفزیۆنی كەبۆئەم مەبەستە ئامادەكراو پێشكەشی دەكرد نەك روبەروو. پرسیاری قوتابیان لەرێگای تەلەفۆنبوو. بێگومان بۆقوتابیانی كچ بەم شێوەیە خوێندن كێشەیەكی گەورەبوو چونكە نەیاندەتوانی مامۆستای خۆیان لەنزیك ببینن.

یاساکانی ئێمە لەمیسر بۆژنان جۆراوجۆرتر بوون، تێکەڵاوییەك لەیاساکانی شەریعەت‌و ناشەریعەتی هەبوو ئەنوەر ئەمەیان لەتێکەڵاوییەك لەئیمان ناودەبرد. زانکۆکانی ئێمە تێکەڵاوبوون یەك لەسەر سێی قوتابیانی ئێمە کچ بوون. کارگەکانی ئێمە پڕبوو لەئافرەتان کەشانبەشانی پیاوان کاریان دەکرد. لەساڵی ١٩٧٦، ٣٠٪ قوتابیانی دەرچووی بەشی پزیشکی، دەرمانسازی‌و ددان کچ بوون بەپێی ئامارەکانی ڕۆژەکانی یەکەمی شۆڕش٩٣/٣٪ ژنانی میسر نەخوێندەوار بوون. جیاوازییەك لەئاسمان تاکو خاکی ژێرپێمان نیشانی دەدا. بەبوونی زۆر پێشکەوتن لەمیسر وەك ژنانی وڵاتانی عەرەبی سەرکوت دەکران‌و هاوبەشی زۆریان هەبوو.

هەموومان داپۆشراو بەجلوبەرگی ڕەشی قورس لەئیماراتی کەنداو، چ بەجلوبەرگی ئەورووپی لەمیسری لەقاهیرە، چ ئەوانەی لەناو لەشکری لیبیا شەڕیان دەکرد، چ ئەوانەی لەسعودیا تەنیا بۆرێگەپێدان کەشوفێری بکەن شەڕیان دەکرد، لایەنێکی هاوبەشمان هەبوو. هەموومان دەمانوویست زنجیری پیاوساڵاری کەرێگری ئێمەبوون کەهەموو تواناکانی خۆمان بەکاربێنین لەکاروبارەکانی کۆمەڵایەتی، ئەگەر نەپسێنین تەنیا برێك شلّی بکەین. پیاوەکان تامەزرۆ بوون باس بکەن ئەم ئایینەی هاوبەشمان ئیسلام رێگری زۆری بۆچالاکی ژنان دروستکردووە، بەڵام هەڵەیان دەکرد. لەراستیدا، ئازادی‌و پێشکەوتنی ژنان لەناو دڵی خۆدی ئیسلامدایە.

ئیسلام لەسەرەتا سەبارەت بەشوێن‌و پێگەی ئافرەت دیدگای زۆر ئەرێنی‌و شۆڕشی هەبوو، زۆر لەلایەنەکانی پەراوێزخراوی سەردەمی نەزانی‌و راستکردەوە. بۆنموونە، قورئان کوشتنی کچانی بچوکی قەدەخەکرد. کردەوەیەك لەناو عەرەبدا زۆرباوبوو تاکو کۆتایەکانی زۆر نزیك چینییەکان لەسەر ئەم شێوازە بەردەوام بوون. چواردە سەدە پێش ئیسلام ژن مافی خوێندنی وەك بەرامبەری، مافی کارکردن‌و هەبوونی کاری خۆی مافی دۆسییە پێشکەشکردن بەدادگەو مافی کڕین‌و فرۆشتنی زەوی‌و خانووی هەبوو. سەدان ساڵ رۆیشتن تاکو ژنانی ئەورووپا بەقسەی ئەوکات رۆناکبیرانی رۆژئاوا ئەم مافەیان بۆئافرەت دەستەبەرکرد. تاکو دەستپێکی سەدەی بیستەم ژنێکی فەرەنسی نەیدەتوانی بەبێ هاوسەری ماڵ‌و موڵك بفرۆشێت یان بداتە کەسێکیتر.

من هەمووکاتێك لەقولایی خوار تێگەیشتن لەسەر بابەتی ژن لەناو ئیسلام سەرسوڕماو بووم. لەئەورووپاو رۆژئاوا بەگشتی پرسیاریان لەمن دەکرد لەسەر نەریتی مارەبڕین کەبەیاسای

پاشکەوتوو ناویان دەبرد، لەیاسادا هاتووە پیاوێکی موسلمان دەتوانێت ببێت بەخاوەنی چوار هاوسەر، دایكو باوك زاوا دیاری دەکەن. بەلاّم زانیاری ئەمانە زۆر تەواو نەبوو. بەلیّ دایكو باوك دەیانوویست هاوسەرێکی باش بۆکچەکانی خۆیان بیدۆزنەوە، بەلاّم قورئان داوای رەزامەندی کچ دەکات لەم لایەنەوە، ئەمەیان بە بەراوردکردن لەگەلّ نەریتەکانی کۆنی هۆزنشینی پێش ئیسلام کەکچەکان ناچاربوون دەبێت بەناچاری یان بەدلّی خۆیان هاوسەرگیریان لەگەلّ کوڕی مامی خۆیان کردبایە ئەمەیان پێشکەوتنێکی گەورەیە.

مافی هاوسەرگیری لەگەلّ چوار ژن لەدونیای ئەمڕۆ جێگای سەرسوڕمانە، بەلاّم لەهەزارو چوارسەد سالّ پێش هەنگاوێکی گەورەبوو لەپێشکەوتنی ژن. پێش ئیسلام، پیاو دەیتوانی چل هاوسەری هەبێت بەبڕیاری خۆیو چۆن دەیتوانیو دەیوویست هەلسوکەوتی لەگەلّدا دەکرد. قورئان هاوسەری بۆپیاوەکان سنووردار کردو کردی بە ئەرك بەسەر پیاودا دەبێت بەیەکسانی هەلّسوکەوت بکات، ئەمەیان هەنگاوێکبوو بۆ پشتیوانی ئافرەت. لەسورەی چوارەم، (انساء) دەلێت:((ئەگەر بترسیت چەند ژنێك بێنیتو نەتوانی یەکسانی لەنیوانیاندا دروست بکەیتو زوڵمیان لیّ بکەیت تەنیا ژنێك بێنە ئەمەیان نزیکتر دەبێت لەیەکسانیو زوڵمی لێناکریّ.)) لەسەرتاسەری دونیای عەرەب هێنانی چەند هاوسەر بەدەگمەن لەسەر ئەم بنەمایەبوو. لەمیسر تەنیا لەسەدا سێی پیاوان چەند هاوسەربوون. تونس چەند هاوسەری لەسالّی١٩٦٣ قەدەخەکرد، چونکە زانایانی ئایینی ئەم ولاّتە گەیشتن بەئەنجامێك کەیەکسانی لەنێوانیاندا نییەو تەنیا لەیەك هاوسەری یەکسانی جێبەجێ دەکریّ.

موڵكو مالّی باوك بەم شێوەیە کەلەنێوان مندالّی کچو کوڕ دابەش دەکریّ بەهەمان شێوە کەدێتەبەرچاو کچ نیوەی کوڕ بەدەست دێنێت نایەکسانی تێدا نییە. بێگومان راستە کچی نیوەی کوڕ دەبات. بەلاّم کچ چەند بباتو بەدەست بێنێت بەپێی یاساکانی ئیسلام ناچار نەکرایە کەخەرجی ژیان دایكو بابو مندالّەکانی خۆی بدات چەندی بەدەستهێناوە تەنیا بۆی خۆی دەبێت هیچ کەسێك لەگەلّیدا هاوبەش نییە، هەرکاتێك پێویستی بەلایەنی دارایی بێت ئەرکە لەسەر براکانی کەهاوکاری بکەن، بەلاّم ئەرکە لەسەر کوڕ خەرجی دایكو بابو مندالّەکانو لەکاتی پێویست خوشکەکانی بدات. لەسەر یاسای دابەشکردن زۆر پێشکەوتووانە لەقورئاندا هاتووە. تاکو سەدەی بیست لەبریتانیا کەسێك کەدەبوو خاوەنی موڵكو مالّی باوکی لەبریتانیا تەنیا کوڕی گەورەی مالّبوو.

بەم لایەنە، لەئەوروپاو ولاَتانیتری رۆژئاوا، بۆپاراستنی ئەم وێنەی کلێشەیی پەردەنشینو ستەم لێکراوی ژنی موسڵمان پێداگری دەکرێت. یەکەم سەفەری فەرمی خۆم بەبێ ئەنوەر بۆدەرەوە لەساڵی ١٩٧٥ رێکخرا تاکو ئەوکات یەکەم سەفەری فەرمی هاوسەری رێبەرێکی موسلمانبوو، لەفرۆکەخانەی ئەڵمانیایی رۆژئاوا سەدان کەس پێشوازیان لەمن کرد. گومانم نەدەکرد کەچاوەڕوانیان دەکرد پێشوازی لەژنێکی داپۆشراوی موسلمان دەکەن کەدەوروبەری بەپیاوانی چەکدار گیراوە، بەلاَم ئیسلام هەمان نەبوو. سەرسوڕماو بووم کەخەڵکانێکی زۆر پێویستیان بەفێربوونی جێگای ژن لەناو ئیسلامدا هەیە.

نەمن نەژنانیتر بۆگۆڕانکاری بنەڕەتی لەمیسر شەڕێکمان هەڵنەگیرساندبوو، چونکە دەمانزانی بەداواکاری زۆر ئەنجامی باشی نابێتو زیاتر زیانبەخش دەبێت. بەپێچەوانە، هیواشو لەسەرخۆو ورد جولاَنەوەمان دەکرد تاکو بەدەستهێنانی ئازادییەکانی بچوك، بەئارامی سەریکەوینو دەرفەتەکانی باشتر بۆژنان دەستەبەر بکەین. لەولاَتانی رۆژئاوا، تێکۆشان بۆمافی ژنان لەدەیەکانی حەفتا بە((شۆڕشی ژنان)) ناوبانگی دەرکردو ژنانی بەشداربوو بە((فێمێنیست)) ناویان دەبردن، بەلاَم ئێمە لەمیسر نەماندەویست ناوی جۆراوجۆر بەدوای ئێمەدا زیاد بکرێنو ئێمە داوای شەڕو شۆڕشمان نەدەکرد. لەسەرخۆ جوڵەمان دەکرد. باوەڕم بەم لایەنە هەبوو بۆهەڵگرتنی دیواری جیاوازییەکانو دژی ئازادی ژن پێویستەو دەبێت کەرپووچ بەکەرپووچ هەڵبگیرێ نەك دیواری جیاوازییەکان بەیەکجاری بروخێنین.

بەم لایەنە زۆر لەدەسەلاَتدارانی عەرەب سەبارەت بەشوێنی ئافرەت لەناو کۆمەڵگە بیروباوەڕی توندیان هەبوو، بەتایبەتی لەلیبیا، سەرۆککۆمار قەزافی بەلێکدانەوەیەکی توند خۆی بەنەخشی ژن لەئیسلام گرێدابوو. رێبەری لیبیا لەکتێبی سەوزی خۆی لەبەشێك وەك((سێیەم تیۆری جیهان لەخۆگرتن))لەسەر مێژووو پێشکەوتنی کۆمەلاَیەتی، دەنووسێت:((داوای یەکسانی لەنێوانیان (ژنو پیاو) لەکارەکانی پیسی کەجوانی ژن خەدشەدار بکاتو لەژنایەتی کەم بکاتەوە، ناعەداڵەتیو زوڵمکردنە لەمافی. خوێندنێك کەناچاری بکات پێچەوانەی سروشتی خۆی بێت، ناعەداڵەتیو زوڵمکردنە لەمافی.))

بێگومان، قەزافی لەدەربڕینی بیروباوەڕەکانی، زۆر توندو سەرەڕۆبوو. من رۆژ لەدوای رۆژ لەشێوەی هەڵسەنگاندنی لەسەر شێوازی هەڵسوکەوتی ژنان لەجیهانی عەرەبی نارازیبووم، بەتایبەتی لەسەر خۆم.

لەساڵی١٩٧٢بۆدیداری سەربازانی ئێمە لەبەرەکانی پۆرت سەعیدو دەریایی سوور ڕۆیشتبووم، هەلومەرجی سەربازەکانی ئێمە زۆر دژواربوو. لەبەرەی شەڕو لەناو بیابان دەژیان. لەماوەی دوو سێ مانگ دەیانتوانی سەردانی خێزانەکانی خۆیان بکەن. وەك دایك، من دەمویست ئەم سەربازانە بزانن کەئێمەی خەڵکی میسر هیچ کاتێك فیداکاری ئەم سەربازانە لەیاد ناکەین‌و بەم شێوەیە ژیان بەسەر دەبن لەیاد نەکراون.

کاتێك کەسواری ئۆتۆمبیلێکی سەربازی دەبووم لەنیوان شەپۆلەکانی هەڵگیرسانی بای بیابان لەبیابانی سوئیز بەرەو دورگە دەڕۆیشتم. کەش‌و هەوا زۆر خرابوو. کاتێك لەدورگەی شەدەوان دابەزیم روبەرووی توفانێکی زۆر بەهێزی بیابان بووین کەدیدگای ئێمەی کەمتر دەکردو هەناسەی دەبڕین. بەختەوەرانە جلوبەرگەکانم بەرگەی ئەم تۆفانیان گرت. بەسەربازەکانم گوت نیگەرانی من نەبن خۆتان چ دەکەن؟ کاتێك ئێمە بەئاسوودەی لەماڵەوەو ئیدارەکانی خۆمان لەقاهیرە دادەنیشین، ئێوە لەم شوێنە بەردەوام لەناو مەترسی تۆفانی بیابان دەمێننەوە. من سەربەرزم کەڕۆژێك لەناو ئازاری ئەم توفانەدا بمێنمەوەو هاوبەشی لەگەڵ ئێوە بکەم. هیچ شتێك لەگەڵ ئەم دژواریانە بەراورد ناکرێ کەئێوە بەردەوام لەگەڵیدا روبەروو دەبنەوە.))

دواتر بیستم کەسەردانی من کاریگەری لەسەر بەرزکردنەوەی روحییەیی سەربازەکان هەبووە. بەڵام دیداری من بۆبەرەکانی جەنگ تووڕەیی کۆنەپەرستانی لیبیایی بەدوای خۆیدا هێناوە. ڕۆژی دواتر هاواریان لەرادیو ڕۆژنامەکان دەهات:((هاوسەری سەرۆککۆمار زیاتر لەڕادەی خۆی ڕۆیشتووە، دیدار لەگەڵ سەربازەکان ئەرکی سەرۆککۆمارە نەك هاوسەری. لەجیاتی ئەوەی سەردانی پیاوەکان بکات دەبێت سەردانی ژن‌و مندالەکان بکات.))رەخنەی نەریتخوازەکانی لیبیا چەندین ڕۆژ بەردەوامی هەبوو.((خاتوو سادات بۆچی ئەوەند هاوار دەکات بۆمافی ئافرەت؟ ژنان مافی یەکسانی خۆیان وەك پێویست هەیەو زۆر لەم لایەنەوە رازین. ئەم ئافرەتە تەنیا کێشە دروست دەکات.))

زۆر پێداگریم دەکرد سەر دەربێنم کەبۆچی قەزافی ئەم جۆرە دیدگایەیی هەیە. لەدیدارەکانیدا هەمووکاتێك زۆر بەئەدەبو لەسەرخۆبوو. وەك دەهاتە بەرچاو لەکاروچالاکییەکانی من لەبوارەکانی کۆمەلایەتی وەك هاوکاریکردنی هەژارەکان‌و نەخۆش‌و پەککەوتووەکان ڕێزم دەگرێت، بەڵام هیچ کاتێك لەکارکردنم لەگەڵ پیاوان‌و چالاکی من لەبواری بەدەستهێنانی مافی ژنان رازی نەبوو.

زۆرجار نەریتخوازی بەتایبەتی لەسەرجۆری جلوبەرگی لەبار بۆژنان، شێوازێکی پێکەنیناوی لەخۆدەگرت. لەیەکێك لەرۆژەکانی گەرمی هاوینی ١٩٧٠ لەگەڵ کچەکانم سەردانی لیبیامان کرد، گلەیی لەجلوبەرگەکانی نانا کردن‌و گوتی بۆچی ملەکانی بەدیار دەکەون، ئەوکات نانا تەنیا تەمەنی نۆساڵانبوو:((دروست نییە پشتت بەدەر بکەویّ.)) هەڵسوکەوتی موعەمەر قەزافی لەگەڵ هاوسەری دووەمی سەفییە، کاتێك لەنەخۆشخانەی ترابلۆس نەشتەرگەری بنەڕیخۆڵەی ئەستەمی بۆدەکرا سەفییە وەك پەرستیار چاودێری دەکات‌و یەکتر دەناسن‌و دڵیان بۆیەکتر لێدەدات‌و دوای ئەوەی کەقەزافی لەنەخۆشخانە دەردەچێت هاوسەرگیری دەکەن. دەمتوانی هەست بەکێشەی نیوانیان بکەم، چونکە سەفییە کچێکی بەبیروهۆش‌و زیرەکبوو، هەستێکی گەرمی بۆژیان هەبوو، عاشقانە خۆشەویستی بۆهاوسەری خۆی هەبوو هەموو خواستەکانی جێبەجیّ دەکردن.

سەفییە بۆی باسکردم رۆژی جەژنی هاوسەرگیر خزمان روخساری بەدەرمانەکانی جۆراوجۆری جوانکاری دەرازێننەوە، بەڵام هاوسەری وەك کەسێکی غەریب تەماشای دەکرد. دوای تەواوبوونی جەژن روو لەسەفییە دەکات کەدەبێت روخساری خۆت خاوێن بکەیتەوە، سەفییە دەستبەجیّ بڕیارەکانی جێبەجیّ دەکات. دواتر لەبەر رازی نەبوونی قەزافی هیچ کاتێك پێویستییەکانی جوانکاری ئافرەتان بەکار ناهێنێت. بەبڕیاری قەزافی جلوبەرکی درێژو لاچکەی سەری بەکار دەهێنا.

سەفییە جیاواز لەبابەتی هاوسەری سەبارەت بەژنان، ژنێکی پێشەنگ‌و پێشکەوتوو هەژمار دەکرا. رۆژێکیان لەلیبیا منی بۆمیواندارییەك بانگێشتکرد کەخاتوو غیزی، سەرۆکی بزوتنەوەی ژنان لەبنغازی ئامادەبوو. کاریگەری زۆری لەمن کرد، ئەم خاتوونەی بەتەمەن، بۆبەرزکردنەوەی تەمەنی کچان بۆشانزدە ساڵی لەتێکۆشانی بەردەوامبوو، بەردەوام لەناوتێکۆشانی ژنان چالاکبوو. لەراهێنانی کچان بەماکینەی دروومان، ماندانی بۆخوێندن. سەفییە یەکێك لەچالاکوانەکانبوو، دەیوویست فێربێت‌و کاریگەری هەبێت لەسەر هاوکاریکردنی خەڵك. لەساڵی ١٩٧٢ بانگێشتم کرد بۆقاهیرە تاکو بەرنامەکانی جۆراوجۆری کۆمەڵایەتی‌و ئەنجوومەنی ژنان لەمیسر ببینێت. بۆیەکەمجار بەتەنیایی سەفەری دەکرد. هاوسەری بۆهاتنی تەنیا مەرجێکی هەبوو: پۆشینی جلوبەرگەکانی بپارێزێت‌و وێنەی لەراگەیاندنەکان دەرنەکەوێت.

لەلیبیا ئاشنایەتیم لەگەڵ زۆرکەس پەیدا کرد، یەکێك لەوانە، دایکی قەزافی، ئوم موعەمەر. ئوم موعەمەر ژنێکی دەشتەکیبوو هاورا لەگەڵ هاوسەری لەبیابان بۆ ترابلۆس هاتبوون تاکو لەنزیك کوڕی خۆیانبن. خوێندەواری نەبوو، بەلاّم شارەزایی زۆر تەواوی لەکاروبارەکاندا هەبوو. منو کەسانی وەك من کەشارنشین بووین هیچ یەك لەهەمان شارەزایی‌و توانای ئوم موعەمەرمان نەبوو. ئوم موعەمەر بۆخۆیی‌و خێزانی ئەوەی لەتوانایدابوو کۆتایی نەکردبوو: منداڵەکانی خۆی بەپێویستییەکانی زۆر سەرەتایی گەورە کردبوون، لەچاندنی گەنم‌و کردن بەئاردو، بزن‌و مەڕ بەخێوکردن‌و لەوەڕاندنیان لەبیابانەکان، بەشیریان ماست‌و پەنیری دروستکردبوو، ژنانی وەك ئەمانە شایانی رێزگرتنی زیاتربوون. ژنانی دەشتەکی لەوەرزی بەهار بەخوری مەڕەکان هەموو جۆرە هونەرێکی دەستی‌و پێویستییەکانی ژیانیان دەستەبەر دەکرد، پێخەوەکانی زستان، جلوبەرگ، گوڵدۆزی. هەموویان وەك ئوم موعەمەر خوێندەوار نەبوون، بەلاّم لەهەموو لایەکەوە خۆ بژیوبوون، لەبەر زۆری تەمەنی لەناو دەشت‌و بیابان‌و بێدەنگی هەستی بیستنی زۆر بەهێزبوو.

ئوم موعەمەر ژنێکی خاوەن قسەی نەستەق‌و گاڵتەئامێزبوو، وەك زۆر لەکەسانی بیابان نشین، تام‌و چێژی لەگەپ‌و گاڵتەکردن لەگەڵ خەڵك دەبرد. بەلاّم لاوزای جەستەیی من بۆی کێشەبوو بەردەوام دەیگوت چیبووە نەخۆشی؟ هاوسەرت خواردنت پێنادات؟ لەهەمان کات لەدەروندا کەسێکی خۆشەویست‌و زمانخۆش‌و بەردەوام دەیگوت:((تۆزۆرجوانی! بێگومان ئەم جوانییە لەبەر خۆشەویستییە کەهاوسەرت پێشکەشی تۆی دەکات.))

سەفییە زۆر خۆشەویستبوو، منی دەبرد بۆتەماشاکردنی بیناکانی سەردەمی رۆمییەکان‌و مۆزەخانە‌و پیکەرە‌و وێنەکانی کۆنی سەردەمی یونان. رۆژێکیان لەبەر سەردانم بۆ ترابلۆس میواندارییەکی گەورەی لەناو باخی ماڵەکەی بۆهاوسەرانی رێبەرانی شۆڕش‌و وەزیرو دیپلۆماتەکان رێکخست، لەتەواوی کاتی میوانداری تیپێکی مۆزیکی بیابانی بەردەوامبوو لەگەڵ سەماکردن. لەهەمان میوانداری بینینم کەوێنەکانی عەبدولناسرو من‌و ئەنوەری لەرۆژنامەکان بڕیبوون بەدیوارەوە هەڵواسیبوون. دوای گەڕانەوەم بۆمیسر، لەگەڵ سوپاسنامەیەك وێنەکانی دروستم بۆڕەوانە کردن.

سەفییە خاوەنی هەشت منداڵبوو عاشقی هەموویانبوو. لەساڵی ١٩٨٦ کاتێك ئەمەریکا لەهێرشێکی دژەتیرۆریستی هێرشی ئاسمانی کردە سەر لیبیا کچی بچوکی حەنای پانزدە

مانگان کەبەمندالّی خۆی قبوولّکردبوو، کوژراو بچوکترین کوڕی بەدژواری بریندارببوو، دلّم ژانیکرد. بەبوونی ناکۆکییەکانی میسرو لیبیا، من ناتوانم هێرشی ئاسمانی بۆسەر خەلّکی سڤیل بۆچارەسەری کێشەکانی سیاسی قبوولّ بکەم. بەبینینی چاوەکانی پڕلەفرمێسكو خەمباری سەفییە لەسەر تەلەفزیون، پەریشانبووم. دەموویست سەردانی بکەمو لەدلّدانەوەی هاوبەشی بکەم. بەلاّم پەیوەندی دوو لایەنەی ئێمە وەك ولاّت سالاّنی پێشتر لە١٩٨٦ نەمابوون.

پێشتر، توانیم بەجۆرێك خۆم لەگەلّ ڕەخنەکانی توندی قەزافی لەچالاّکییەکانی کۆمەلاّیەتیم رابێنم. دەمزانی ئەم رەخنەگرتنەی قەزافی راستەوخۆ بۆسەرمن نەبوون، دەگەڕانەوە بۆبیرکردنەوەی بەرامبەر هەموو ژنان. راهاتبووم کەهەلّفڕینەکانی لەناکاوی کەبەبێ ئەوەی ئێمە ئاگادار بکاتەوە سەردانی میسر بکات. هەوالّی گەیشتنی تەنیا بۆرجی چاودێری لەفرۆکەخانە ئێمەی ئاگادار دەکرد. ئەگەر سەفییەی خێزانی هاوسەفەری قەزافی دەبوو، دەبێت هەموو کاروبارەکانی خۆم راگرتبان بۆپێشوازی بەپەلە منو ئەنوەر دەرۆیشتین. هیچ کاتێك نەماندەزانی قەزافی چ کاتێكو رۆژێك سەردانی ئێمە دەکات. رۆژێکیان لەئەسکەندەرییە میوانی نافەرمی ئێمەبوو، دواتر خواحافیزی لەئێمە کردو رۆیشت کەبەگەرێتەوە لیبیا. دوای کاتژمێرێك کەمنو ئەنوەر رۆیشتین لەناو بازاری ئەسکەندەرییە بسوڕێنەوە، بینیمان کەئۆتۆمبێلّی لەناو باخی ئێمە راوەستاوە، خۆی لەگەلّ جەمالّ سەرقالّی یاریکردنبوون کە جەمالّو هاوڕێیەکانی خیمەیەکی سەربازیان هەلّدابوو لەناویاندا یاری سەربازیانەی خۆیان دەکرد. قەزافی لەگەلّ ئەم مندالاّنە هەمان یاری دەکرد.

لەیەکێك لەسەفەرەکانی زۆری قەزافی بۆمیسر بۆپێشەوەبردنی بیرۆکەی یەکێتیی لەنیوان میسرو لیبیا بەیەکجاری دۆستایەتی منی لەدەستدا. ئەنوەر چەندینجار بۆ قەزافی باسکردبوو کەمیسر کۆمەلّگەیەکی دیموکراسییە بۆیەکێتیی فەرمی نیوان دوو ولاّت دەبێت رەزامەندی خەلّك وەربگیرێت. ئەنوەر بۆی باسکرد:((لەمیسر تۆ ئازادی بۆهەرشوێنێك برۆیتو بەشداری لەکۆبوونەوەکانی خەلّکدا بکەو گفتوگۆیان لەم لایەنەدا لەگەلّدا بکە بیروباوری خۆتان باس بکەن، ئەگەر ویستیان کەیەکێتیی لەنیوان ئێمەو لیبیا هەبێت من رێز لەخواستی خەلّك دەگرم.)) من لەم لایەنە کەولاّتی ئێمە ولاّتێکی دیموکراسیو ئازادی بەیان هەژمار دەکرێت، لەیەکێك لەسەفەرەکانی قەزافی بۆقاهیرە لەسالّی ١٩٧٢، بانگێشتم کرد بۆیەکێك لەکۆبوونەوەکانی یەکێتیی ئافرەتان لەقاهیرە کەوتارێك پێشکەش بکات. هەزار ژن

بەچاوەڕوانییەکی زۆر لەهۆلی کۆبوونەوەکانی ناوەندی حیزب کۆبوونەوە تاگوێی لەوتاری ڕێبەری گەنجی شۆڕشگێر بگرن، لەسەر هیواکانی بۆژنانی عەرەب. قەزافی داوای تەختی ڕەش‌و گێچ دەکات. بۆی ئامادە دەکەن‌و ئەنوەر پێش وتارێکی کورت پێشکەش دەکات‌و موعەمەر قەزافی دەداتە ناسین‌و بانگێشتی دەکات کەوتاری خۆی پێشکەش بکات. کاتێك قەزافی بەهەنگاوەکانی بەرزی ڕۆیشت‌و دەستی بەنووسین لەسەر تەختەی ڕەش کرد، هۆلی گەورەی قاهیرە هەمووی بێدەنگبوو.. دواتر خەڵك بەهیواشی دەستیان بەقسەکرد.

چاویلکەی خۆم لەچاوەکاندا نەبوو ببینم چ دەنووسێت. لەدایکی هاوسەری کچەکەم، سوئاد مەرعی کەلەتەنیشتی چەپی من دانیشتبوو، پرسیارم کرد:((چی نووسی؟ چی بووە؟)) سوور هەڵگەڕابوو بەشەرمەوە گوتی:((شەرم دەکەم باس بکەم.))

بەدوای چاویلکەی خۆم لەناو جانتاکەم دەگەڕام‌و ڕووم لەسەفییە کرد کەلەتەنیشتی ڕاستم دانیشتبوو بەئاشکرا لەدەنگە دنگی خەڵك سەخڵەتبوو. کاتێك چاویلکەکانی خۆم لەچاوەکانم کردو بینیم گوتم:((وای خودای گەورە!))

قەزافی بەگەورەی لەسەر تەختی ڕەشی بەگەچ نووسیبوو:((پەردەی کچێنی. سووری مانگانە. زاوزێی.))

دواتر باسی لەبیروباوەڕەکانی کرد:((ئێوەی ئافرەتان داوای یەکسانی دەکەن، بەڵام ناتوانن بەرامبەربن. کوڕێکی گەنج دەتوانێت لەناوکێڵگەیەك کار بکات، لەکارگە، دروستکردنی خانوو، بەڵام کچێکی گەنج ناتوانێت بەتەنیایی بۆهیچ شوێنێك بڕۆت‌و بەرگری لەخۆی بکات.)) نەمن باوەڕم دەکرد چی دەبینم‌و دەبیستم نەژنانی ئامادەبوو نرمە نرمی ژنەکان وردە وردە بەرزدەبووە بۆهاوارکردن. قەزافی بەردەوامبوو:((ژنان چۆن دەتوانن لەگەڵ پیاوەکان داوای یەکسانی بکەن لەکاتی سووری مانگانەو شیردان بەمنداڵی شیرخۆری ناتوانن کاربکەن؟ لەلایەنی سروشتی هیچ جۆرە بەرامبەری‌و یەکسانی لەنیوان ژن‌و پیاو لەلایەنی سروشتی وەك تاك‌و هێزی جەستەیی بوونی نییە.)) قەزافی دەنگی نارەزایی کەسانی ئامادە کەسات بەسات بەرزتر دەبوو بەنەبیستراوی دەزانی بەردەوامبوو لەسەر نەخشەی ژن لەناو کۆمەڵگەدا کەهیچ جیاوازییەکی لەگەڵ مانگادا نییە، چارەنووسیان شتێك نییە جگە لەدووگیانی‌و هێنانی گوڵکەو شیرپێدانی نییە. کۆبوونەوە ئاڵۆزی زیاتری تێکەوت.

دکتۆر زەینەب ئەلسوبکی هاواریکرد:((جەنابی سەرۆککۆمار، پزیشکم، لەگەڵ تەواوی قسەکانی تۆ هاوڕانیم هیچ یەکێك لەئەمانە رێگری لەکارکردنم ناکەن. من خاوەن منداڵمو سەرۆکی بانکی خوێنم. بەشداری لەچالاکییەکانی کۆمەڵایەتی دەکەم، تاکو ئێستا رۆژێك لەکارەکانی خۆم دوانەکەوتووم.))

بەڵام قەزای پێداگری تەواوی لەقسەکانی خۆی دەکرد، گوتی:((من پێداگری لەقسەکانم دەکەم کەراست دەکەم. ئایا ئێوە لەکاتی سووری مانگانەی خۆتان دەتوانی رۆژانە کاری پیشەیی بکەیت، جادە دروست بکەیت، بارێکی قورس لەسەر شان دابنێیت؟))

ژنان پێکەوە هاواریان دەکرد:((بەڵێ! بەڵێ! ئەگەر دەرفەت بەئێمە بدرێت.))

ئەنوەر بەسەرسوڕمانەوە تەماشای قەزافی دەکرد. ژنان هەڵدەستانو قسەی خۆیان دەکرد.

ئامینە سەعید، رۆژنامەنووسی دیاری ئێمە، گوتی:((جەنابی سەرۆککۆمار لەوانەیە ئێوە لەیادتان کردبێت لەسەردەمی پێغەمبەر ژنان هاوشانی پیاوان شەڕیان دەکرد چۆن دوای ئەم هەموو ساڵە ژنان ئێستا ناتوانن لەگەڵ پیاوەکان یەکسانبن؟))

قەزافی دەنگی خۆی بەرزکردەوەو گوتی:((ئێستاش دەڵێم من راست دەکەم. ئایا ئیوە دەتوانن هەموو رۆژێك لەناو کارگەیەکی گەورەدا کار بکەنو وەك پیاوەکان لەبەرامبەر کورەی ئاگر راوەستن؟ ئۆقرەی گەرمای دەگرن؟ پشتراستم ناتوانن. گەرمای کورەی ئاگر جوانیتان دەگۆڕێت. ئەمەیان ئەوپەڕی توانای ئێوەیە. هەندێك لەکارەکان تایبەتن بەپیاوو هەندێك بەئافرەت.))

ژنەکان هاواریان کرد:((نە! نە!))

سەفییە کاتێك دەیبینی هەموو ژنان لەهاوسەری تووڕەنو نەیدەتوانی هیچ کارێك بکات لەدڵەڕاوکێی تەواو دابوو. بەهیواشی بۆم باسکرد:((خۆت تەنگەتاو نەکەیت، کێشە نییە باژنەکان قسەی خۆیان بکەن. لەوانەیە روونکردنەوەیان بێن بەهۆکار کەهاوسەرت لەشێوەی توندی خۆی بەرامبەر ئافرەتان بێتەخوارەوە. بەڵام نەهات. لەرووخساری قەزافی دەمخوێندەوە کەتامو چێژ لەدروستکردنی کێشەکان دەبات. قەزافی خۆی بەئازاد دەبینی ئەوەی دەیویست باسی دەکرد. هاوسەرم هەوڵی خۆی دەدا رێگا لەپێکەنینی خۆی بگرێت، پێکەنینێك لەئەنجامدا دوای کۆتایی کۆبوونەوەو کاتی گەڕانەوەمان بۆشوێنی پشوودان لەناو ئۆتۆمبێل تەقییەوە.

کاتێك پێدەکەنیو روخساری ڕەنگی خۆی دەگۆڕی گوتی:((جیهان، دەبێت روخساری ژنەکانت بدیتبان ئەگەر من لەشوێنی قەزافی دەبووم ئامادەبووم لەگەڵ هەموو هێزەکانی ئیسرائیل روبەروو ببم نەك ژنەکان.))

هەمان رۆژ دوای نانی نیوەڕۆ لەپشوودانو خەوشکاندێکی کورتدابووین یەکێك لەراوێژکارانی ئەنوەر بەتەلەفۆن پەیوەندی کرد. قەزافی سەردانی ئێوە دەکات. بەپەلە خۆم ئامادە کردو رۆیشتمەخوارەوە، مەعەمەر قەزافی لەگەڵ دوو لەهاوڕێیانی شۆڕشگێڕی، محەممەد جلودو عمەر مهاشی ، روبەروو بووم.

قەزافی گوتی نامەوێت ئەمەیان لەگەڵ تۆدا باس بکەم بەلآم هەندێك لەم ژنانە ژنی باش نین.

لەبەرامبەریدا زۆر پەشووکاوبووم پرسیم:((مەبەستی تۆ کام ئافرەتە، برام موعەمەر؟))

وەلآمی دایەوە:((ئامینە سەعید. دەزانی جگارە دەکێشێت؟)) بەشێوەیەك باسی دەکرد کەگوایە جگارە کێشان تاوانبێت.

گوتم:((بۆچی ناکێشێت پەیوەندی بەخۆیەوە هەیە.))

گوتی:((هەندێك هەڵسوکەوتیتر دەکات نامەوێت باسی بکەم.))

پرسیم:((وەك چی برام موعەمەر؟))

بێدەنگبوو، دواتر بەدەنگی بەرز گوتی:((بیستوومە بیرا دەخواتەوە.))

خۆم راگرتو رووم لەقەزافی کردو گوتم:((شۆڕشگێڕەکانی دەوروبەری تۆ شەراب دەخۆنەوە، خۆیان دەزانن لەگەڵ خودای خۆیان.))

بەتووڕەیی تەماشای دەکردم.

کاتێك ئەنوەر دەگەیشتە لامان، رووم لەقەزافیکردو گوتم:((ئەگەر لەژنەکانی ناو کۆبوونەوە تووڕەی داوای لێبۆردن دەکەم، بەلآم بۆئەم ئافرەتانە ئاسان نەبوو بێدەنگ دانیشنو ئێوە لەگەڵ مانگایەك بەراوردیان بکەیت. ئەگەر مانگا دەبوو تووڕە دەبوو چونکە ئەرکی مانگا لەژیاندا تەنیا شیردان نییە ئەرکی گەورەتری لەشیر بۆگوڵکەدان زیاترە.))

بەلآم قەزافی هیچ کاتێك بیروباوەڕەکانی نەگۆڕان. من رۆژ لەدوای رۆژ نیگەرانی هەڵسوکەوتەکانی نابەجێی بووم.

دوای رەخنەگرتنێکی توند لەرێگای رادیوی لیبیا لەهێزەکانی ئێمە لەشەڕی ١٩٧٣، قەزافی داوای لەئەنوەر کرد رێگای پێی بدات لەناو پەرلەمانی ئێمە وتارێك پێشکەش بکات. ئەنوەر

قبوولێکرد، چونکە بەشێوازێك بیری دەکردەوە لەوانەیە قەزافی داوای لێبۆردن لەتۆمەتەکانی لیبیا بۆسەر میسر بکاتو داوای ئاشتبوونەوە بکات. قەزافی ناراستەوخۆ داوای لێبۆردنی کردو بۆ هەلاواردنو رەوتی گەڕانەوەی دوو دڵی خۆی بانگێشەی ئەوەی کرد کەوتەکانی من سەرچاوەیان لەدەربازبوونی دووبارەی ئیسرائیل بوو لەدەربازبوونەوەی لەتۆکەند کەئەم هەستەی لادروستبووە کەکاری هەموومان بەکۆتایی هاتووە. داوای دووەمی لەئەنوەر لەکاتی هاتنی بۆقاهیرە لەگەڵ سەفییەی خێزانی سەرسوڕهێنەرتربوو.

ئێمە قەزافیو هاوسەری لەفرۆکەخانە تاکو کۆشکی قوببە هاوڕێیەتیمان کردن لەناو کۆشك بۆئەنوەر باسدەکات:((جەنابی سەرۆککۆمار، بەروخسەتی ئێوە دەمەوێت بەتەنیا قسە لەگەڵ هاوسەرت بکەم.))

بەتەنیا؟ بەهەرشێوەیەك بێت ئەوەی باسی دەکرد بۆئەنوەرم دووبارە دەکردەوە. ژنی لەم لایەنەوە چۆن بیردەکاتەوە؟ لەکارەکانی ناسروشتی پیاوێکی موسلمان دەیەوێ بەتەنیا قسە لەگەڵ ژنێك بکات. دەترسام بیرم دەکردەوە لەوانەیە بمکوژێت؟

قەزافیم بۆژوورێکی بەتەنیای کۆشکی قەببە رێنوێنیکرد دەرگام بەکراوەیی جێهێشت. هانی خۆمدا کەبەسەر خۆمدا زاڵبم. تاکو نەزانێت من ترساوم. نەمدەتوانی چاو لەسەر دەمانچەی کەقەزافی هەڵگرم، بەردەوام لەگەڵ خۆیدا هەڵدەگرت، پشتراست بووم دەیەوێ دەمانچەی دەربێنێتو بمکوژێت.

گوتی:((من دەمەوێت کچی تۆ هاوسەرگیری لەگەڵ ئامۆزای مندا بکات.))

سەرم سوڕما. قسەی تایبەتی ئەمەبوو؟ لەوپەڕی باوەڕ نەکردنم گوتم:((مەبەستی تۆ کام کچی منە؟))

وەلامی دایەوە:((کچی بچوکتان نانا))

گومانم دەکرد بەتەواوی گوێی بیست نەبووم. نانا ئێستا تەمەنی دوانزدە ساڵانە! نەمویست لەبەرامبەریدا بێڕێزی بکەم. گوتم:((جەنابی سەرۆککۆمار، کچم نانا تاکو ئێستا بەتەمەنی یاسایی خۆی نەگەیشتووە.))

بەلام قەزافی بیری لەم لایەنە کردبوو گوتی:((هەمان رازیبوون بەهاوسەرگیریان تەواوە، کاتێك گەورەبوونو ئامۆزای من باشتر بناسێتو خۆشەویستی بۆهەبێت، هاوسەرگیری خۆیان دەکەن.))

گوتم:((جەنابی سەرۆککۆمار، رێگابدەن هەمان کات بیر لەهاوسەرگیرییان بکرێتەوە. تاکو ئەوکات کاتی زۆرمان لەبەردەستە.))

وەك دیار گوێی بیستی قسەکانی من نەدەبوو، چونکە بەردەوامبوو:((ئامۆزای من هیچ کێشەیەکی نییە، لەشوێنی برای خۆمە، ئێوەو کچەکەتان زۆر لەم گەنجە رازی دەبن.))

ئەوکات زانیم بۆچی دەیوویست بەتەنیا قسە لەگەڵ مندا بکات. بیری دەکردەوە چونکە من دایکم دەتوانم کچەکەم رازی بکەم هاوسەرگیری لەگەڵ ئامۆزایدا بکات، پێکەوە دەتوانین باوکی رازی بکەین. بەڵام هاوسەرگیری لەم شێوەیە بەهیچ شێوەیەك جێگای قسەکردن نەبوو؟ دوای هەموو بێرێزییەکانی کەبەئافرەتانی دەکرد چاوەڕێی ئەوەی دەکرد خزمایەتی لەنێوان ئەم دوو خێزانەدا دروست بکاتو من قبووڵی بکەم؟ دەیویست بۆیەکگرتنی لیبیاو میسر لەدابونەریتەکانی قەبیلەیی وەربگرێت، بەڵام دابو نەریتی، دابو نەریتی ئێمە نەبوو. ئامادە نەبووم لەبەرچاوم ئەم بابەتە وێنا بکەم کەرێگا بەکچی خۆم بدەن هاوسەرگیری لەگەڵ کەسێکی بیانی بکات. رێگام نەدەدا وەك بارمتە بۆکاری سیاسی بەکاربێنێت.

زۆر لەسەرخۆ بۆقەزافیم روونکردەوەو گوتم:((سوپاست دەکەم بەڵام نابێت.)) بەڵام دەستی لەداواکاری خۆی نەدەکێشایەوە. لەئەنجامدا، بۆکۆتایی هێنان بەم گفتوگۆیە، گوتم:((نەریتەکان بەم شێوەن کەدەبێت کچ لەباوك خوازبینی بکرێت. بۆچی قسە لەگەڵ باوکی سەرۆك سادات ناکەیت؟))

دژی بیروبۆچوونەکانی من بوو. دواتر موعەمەر قەزافی هەوڵی خۆیدا هاوسەرگیرییەکی هاوشێوە بۆئامۆزایەکیتری لەگەڵ زرکچی بورەقیبە، سەرۆککۆماری تونس رێکبخات، لەهەمان لایەن وەك من هیچی نەدایە دەست قەزافی.

بەباوەڕی قەزافی بۆگەیشتن بەئامانجی یەکێتیی جیهانی ئیسلامی، هیچ نەخشەو بیانووەکانی پڕوپووچ زیادڕۆیی هەژمار نەدەکران. دووساڵ دوای سەرنەگرتنی یەکێتیی لەنیوان میسرو لیبیا لەرێگای ژن خواستن سەری نەگرت، دەستی بەسەرسوڕهێنەرترین جوڵانەوەی خۆیکرد بەبیرکردنەوەی خۆی میسرییەکان گوێیان لەقسەو بڕیارەکانی قەزافی نەگرتووە، لەوانەیە بەقسەی خەڵکی لیبیا بکەن. داوا لەخەڵکی لیبیا دەکات: ((سەردانی میسر بکەن! میسرییەکان دەبێت بزانن ئێوە چەند تامەزرۆیی یەکێتین لەنیوانماندا.)) رۆژنامەکان تەلەفزیونی ئێمە لەمانگی ئابی ساڵی ١٩٧٥، پڕبوو لەراپۆرتەکانی کەباسی هەزاران هەزار کەسی لیبیایی دەکرد

کەبەئۆتۆمبێل‌و بارهەڵگر لەپشت سنووری ئێمە لەرێگای بیابانی رۆژئاوا کەخۆیان بە ئەسکەندەرییە بگەیێنن. هیچ کەسێك باوەڕی نەدەکرد ئەنوەر لەناخی دڵەوە بەجوڵانەوەکانی بێمانای قەزافی پێدەکەنی‌و دەیگوت:((ئەمەیان چ جۆرە یەکێتییە؟ هیچ کەسێك بەداری زۆری ناتوانێت یەکێتیی دروست بکات، لەوانە خۆدی قەزافی.)) بەڵام حکومەتی ئێمە دەیزانی کەقەزافی دەتوانێت کارەکانی زۆر سەیروسەمەرە بکات‌و ئەمەیان بەمەترسیە. بۆرێگرتن لەرێڕەویی خەڵکی لیبیا، وەزیری ناوخۆ بڕیاریدا بۆئامادەبوونی هەموو ئەگەرێك جادەی بیابانیان بەبەشەکانی شەمەندەفەڕ داخست. رێڕەویی لیبیاکان هیچ کاتێك سەری نەگرت. بەهەمان شێوە یەکێتیی فەرمی نیوان میسرو لیبیا نەگەیشت بەئەنجامەکانی خۆی.

بەبوونی هەڵسوکەوتەکانی قەزافی لەلیبیا ژنانی چالاکی لیبیا ئازایانە بۆمافەکانی خۆیان شەڕیان دەکرد. وەك هەموو ژنانی جیهانی ئیسلامی، بەهەوڵدانی خۆیان بۆبەدەستهێنانی ئازادی، سەرکەوتنی زۆربەرچاویان بەدەست دەهێنان. هەرچەند تێکۆشانی ئێمە وەك جیهانی رۆژئاوا بەربلاو نەبوون‌و وەك ئەوان داوای زیاترمان نەدەکرد، دیسان دەستکەوتی زۆرباشمان بەدەست هێنابوون، هەستێکی تازە لەغرورو ئامانجخواز لەبوونی ژنانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست گەشەی دەکرد. فەرەح دیبا، هاوسەری شای ئێران، دوای گەیشتنی من‌و ئەنوەر بۆتاران لەحوزەیرانی ١٩٧٦، پرسیاریکرد:((چۆن توانیت خەڵکی لادێی نشین رازی بکەین کچەکانی خۆیان رەوانەی قوتابخانە بکەن؟ چۆن توانێت ژنان بۆناوکاروباری پیشەیی رابکێشیت؟))

لەگەڵ سەردانی فەرمی خۆمان بۆئێران، سعودیاو ئیماراتی یەکگرتوو دەستپێکرد. بۆ هەرشوێنێك کەدەڕۆیشتم، لەدیدگای گەشەکردووی ژنان زۆر خوشحاڵ دەبووم. لەتاران پرسیارەکانی فەرەح، وەك مەلیکە عالییە، تەواوبوونیان نەبوو. من لەوەڵامدانەوە ماندوو نەدەبووم.

لەماوەی چوار رۆژی کەئێمە میوانی شاو فەرەح بووین، تێگەیشتن‌و رێزگرتنێکی هاوبەش لەنیوانماندا دروستبوو. مێژوویەکی هاوبەشمان لەسەر بابەتی ئافرەتان هەبوو کەدەبێت بۆئایندە چۆن تێکۆشانی خۆمان لەم لایەنە بەردەوامی پیێ بدەین. سەرمان سوڕمابوو. فەرەح بۆی باسکردم ژنانی ئێرانی لەدەستپێکی دەیەکانی ١٩٠٠، دژی بریتانیا لەئێران خۆپیشاندان دەکەن. ژنانی ئێرانی وەك هۆدی شەعەراوی‌و هاوڕێیانی دژی هێزەکانی بریتانیا خۆپیشاندان دەکەن. ژنانی ئێرانی وەك هۆدی شەعەراوی‌و یاوەرانی، ماوەیەك دوای خۆپیشاندان زێرەکانی

خۆیان دەفرۆشن بۆئەوەی یەکەم قوتابخانەی کچان لەئێران دروست بکەن، دواتر کچەکان دەست بەخوێندن دەکەن. فەرەح وەك منو زۆر لەژنانیتر لەقاهیرە بەهەمان بیرکردنەوە هەوڵی خۆیان دەدەن کەخانووە کۆنەکان بکەن بەباخچەی ساوایانو قوتابخانەو شوێنی فێربوونی پیشەیەك بۆژنان. خوێندن بۆکەسانی بەتەمەنو رستنو چنین بۆ ژنان دەستەبەر بکەن.

جگە لەگەشتی ناو تارانی پایتەخت سەردانی تالاری ئاوێنەمان لەکۆشکی گوڵستان کرد کەبەشوشەکانی چەند پالوویی دروشاوە وەك ئەڵماس دیوارو ئەستوونەکانی داپۆشراو بوون بینەری حەپەساو دەکرد، فەرەح منی بۆبینینی مۆزەخانە برد. لایەنگری زۆری هونەربوو، پێشانگای زۆری هونەری دەکردنەوە، لەسەفەرەکانی بۆدەرەوەی ئێران کەلوپەلەکانی کەگرێدراوبوون بەئێران دەکڕیتو بۆئێرانی دەگەڕاندنەوە، دواتر لەناو مۆزەخانە جێگای بۆدەکردەوەو کەزۆربەیان بەرچاو دەکەوتن. من بەراستی نقرۆی تەماشاکردنی مۆزەخانەی باوەڕ نەکراوی زێرەکانی پاشایەتی بووم: تەختی زێری پاشایەتی، ڕازاوە بەبەردەکانی بەنەرخ، تاووسەکان بەقەبارەکانی سروشتی لەژێر دنووکی یاقووتو زمرووتو یاقووت بەڕەنگی ئاویی، جامەکانی گەورەی پڕلەزێڕ بەڕەنگەکانی سوور۔ شین، سەوزو ئەڵماسی سپی کەبەبریقەکانی خۆیان دەدرەوشانەوە. منو فەرەح سەردانی پێشکەتووترین نەخۆشخانەو قوتابخانەو باخچەی ساوایانمان کرد، ئەوەی کەدەبینیم زۆر کاریگەربوون بەتایبەتی ویستێکی زۆری بۆپەروەردە هەبوو.

لەیەکێك لەدامەزراوەکانی پەروەردەیی، فیلمێك لەهەوڵدانەکانی فەرەح بۆفێرکردنی خوێندەواری لەشوێنەکانی دووری کۆچەرو هۆزنشین لەبیابانەکان نیشانیاندا، لەرەوتی ژیان بەتەواوی لەم سەدەیە دوور کەوتبوون. وەك زۆر لەکۆچەرەکانی میسر لەشوێنەك دەحەسانەوەو قوتابخانەی تایبەتی خۆیان لەبیابان هەبوو، هۆزەکانی ئێران تاکو هەمان سەردەم سەرقاڵی کۆچکردنی هۆزی خۆیانبوون. فیلمێکی زۆر کاریگەربوو. فیلم نیشانیدا کەچۆن کتێبەکان بەبار هەڵگرێك لەتاران سەفەری خۆی دەست پێدەکات بەتێپەڕکردن لەرێگاکانو دواتر جادەکانی خوڵو لەکۆتایدا گەیشتن بەبیابان دەگاتە شوێنێك کەجادە کۆتایی خۆی نیشان دەدات. کتێبەکان سواری پشتی ئەسپەکان دەکرێن تاکو کتێبەکان بەگەن بەدەستی مامۆستاکان کەلەنیوان ڕەشماڵەکانی هۆزەکان لەسوڕانەوەدان.

ئەمەیان تەنیا دووەم دیداری منو فەرەح بوو. ماوەیەکی کورت کەئەنوەر دەبێتە سەرۆککۆماری نوێی میسر، پەیوەندییەکانی میسرو ئێرانی بۆپێشەوە بردن، شابانۆ فەرەح‌و شای ئێران سەردانی میسریان کرد. بەلاّم شای ئێران‌و ئەنوەر سالاّنی پێشتر یەکتریان دەناسی. ئەنوەر لەیەکەمجار کەشای ئێران دەبینێت لەگێڕانەوەی بێزار نەدەبوو، لەڕێوڕەسمی سەربازی لەقاهیرە بەبۆنەی هاوسەرگیری شا لەگەڵ خوشکی مەلیك فارۆق لەساڵی ١٩٣٨بوو. ئەنوەر بەپێکەنین بەبیری شای دەهێنایەوە:((تۆ لەشوێنێکی بەرز دانیشتبووی من لەبەرامبەرتۆ بەڕێوەڕەسمی سەربازی دەڕۆیشتم، وەك شوێن جێگامان لەیەکتر دوور نەبوو، بەلاّم لەراستیدا نێوانێکی زۆربوو. تۆخاوەنی وارسی تەخت‌و تاجی شاهانەبووی من ئەفسەرێکی خەڵکی لادێ کەتۆ تاکو ئەوکات ناوی ئەم شوێنەت نەبیستبوو.))

سی ساڵ تێپەڕیکرد تاکو ئەنوەر جارێکیتر لەکۆبوونەوەی سەرانی ولاّتانی ئیسلامی لەربات یەکتر ببینن، پەیوەندییەك سەرەتا بەتووڕەیی‌و قسەی توند دەست پێدەکات. دوای سووتاندنی مزگەوتی ئەقسا بەدەستی گەشتیارێکی هەڵگری نەخۆشی دەروونی لەساڵی ١٩٦٩، ناسر ئەنوەر ڕەوانەدەکات بۆهەمان کۆبوونەوە بەنوێنەرایەتی میسر بۆراگۆڕینەوە لەگەڵ ڕێبەرانیتر تاکو بزانن چۆن دەکرێت پارێزگاری لەشوێنەکانی پیرۆزی ژێر دەسەلاّتی ئیسرائیل بکرێت. ئەنوەر پێشنیاری شای ئێران بەلاّواز دەزانێت دواتر بەزمانی عەرەبی بەسەرانی ئامادەبوو بەزمانی عەرەبی دووبارە دەکاتەوە. شا بەتووڕەیی وەلاّم دەداتەوە. ئەم بابەتە جۆرێك بەکۆتایی دێت ئەنوەر ئاگادار دەبێت وەرگێڕان‌و دەربڕینەکانی بەزمانی فەڕەنسی بۆشا، دەبێتە بابەتێکی هەڵخروشێنەر، دواتر ئەنوەر بەزمانی فارسی رستەیەك پێشەکەش بەسەرانی ولاّتانی ئیسلامی دەکات. شا بەناوبانگبوو کەهیچ کاتێك پێناکەنێت.، لەهەمان کات لەشوێنی خۆی هەڵدەستێت‌و بەپێکەنین چەپڵە بۆئەنوەر لێدەدات، لەهەمان کات بەدواوە نەمامی دۆستایەتی لەنێوانیان هاتە چاندن. ئەنوەر بەمەتەڵێکی عەرەبی شا خوشحاڵ دەکات:((هیچ دۆستایەتییەك بەبێ دوژمنایەتی بوونی نییە.))

شاو ئەنوەر بەبوونی جیاوازییەکانی زۆری نیوانیان لەرابردوو، بەلاّم بەهەڵکەوت خاوەنی رۆژگارێکی هاوشێوەبوون. هەردووکیان لەدایکبووی ١٩١٨، هەردووکیان لەساڵی ١٩٣٨ بەپلەی ئەفسەر لەکۆلێژی سەربازی دەردەچن، هەردووکیان رێبەری دوو ولاّت بەشارستانیەتی کۆن. ئیمپراتۆری ئێران بەدوو هەزارو پێنج سەد ساڵ مێژوو، میسر بەمێژوویەکی حەوت هەزار

ساڵی. ئەم جۆرە پەیوەندییانە لەنێوان ئەم دوو وڵاتە مانایەکی تایبەتی بۆ نزیکبوون لەیەکتری دوو رێبەر هەبوو، دیدارمان لەتاران زیاتر یەکترمان دەناسی.

رۆژێکیان کاتێك شا بەئۆتۆمبێلی خۆی ئێمەی لەکۆشکی هاوینەی بۆشوێنی مانەوەمان لەهوتیلی رامسەر لەتەنیشت دەریایی مازندەران دەبرد، بەپێکەنین هەوڵی خۆمدا کەرێگا نەدەم پرچی دەستکردم لەسەرم بفرێت. لەکورسی پشتەوە داوام لەشا کرد: ((لەسەرخۆ برۆن ئەگەر نە کەچەڵ دەبم.))

شا بەپێکەنین رووی لەئەنوەر کرد:((نەتدەویست کێشەکانی ئێمەش لەم شێوەیە دەبوون؟))

چەند جوان تەنیا سەفەری خۆم بۆئێران بەیاد دێتەوە، نەك تەنیا لەبەر ئەوەی دۆستایەتی من لەوکات تاکو ئێستا لەگەڵ فەرەح وەك خۆی ماوە، لەهەمان کات موژدەی لەدایکبوونی نەوەی ئێمە، شەریف. پێش ئەوەی بەشداری لەمیوانداری ئێوارەدا بکەین کەلەسەر شەرەفی ئێمە ئامادەکرابوو لەهوتیل دانیشتبووین، لەناکاو کەسێك لەدەرگایدا. خزمەتکار هاتەژوورەوە بەشادی گوتی:((لەقاهیرە پەیوەندی تەلەفۆنیتان هەیە، پیرۆزە!)) نۆهییە نوەی من! کچی لوبنای کچە گەورەم لەباوەش گرت کەلەگەڵ ئێمە هاتبوو بۆئێران بەردەوام ماچم دەکرد، فرمێسکی شادی لەچاوەکانم دەهاتنەخوارەوەو ئەنوەر لەسەر زەوی دانیشتو سوپاسی دەرگای خودای دەکرد.

لەکاتێکدا کەبەردەوام سوجدەی بۆخودا دەبردو بەدەنگی بەرز دوعای دەکردن: ((خودایە من سوپاسی نیعمەتەکانی دەرگای تۆدەکەم کەمنداڵێکت پێشکەش بەئێمە کرد، من بۆ رێنوێنی رێگاکانی دروست سەرکەوتوو بکە، من لەناو رێزی بەندەکانی شایستەی خۆت هەژمار بکەن.))

لەناو سەفەری ئێمە بۆئێران تەنیا شتێك سێبەری رەشی خۆی لەمن دەکرد. تەواوی پێشکەوتنەکانی کەوەك میوانی شای ئێران بەچاوی خۆم بینین، لەهەمان کات ئاگاداری جیاوازییەك بووم لەنیوان خەڵکی دەوڵەمەندو هەژار بوونی هەبوو. شاو هاوسەری کەسانی زۆر رووناکبیر بوون بەراستی دەیانوویست چاکسازی کۆمەڵایەتی لەوڵات بکرێن، بەڵام کەسانێك زیاتر لەهەموو کەسێك پێویستیان بەم لایەنە هەبوو بێبەشبوون. بۆنموونە، ئەوەی زۆرنیگەران‌و نائومێدی دەکردم کاتێك فەرەح قوتابخانەیەکی بچوکی نیشاندام کەلەناو باخی کۆشکی شاهانەی تاران زۆر بەسادەیی دروستکرابوو بۆئەوەی منداڵەکان لەچینەکانی جۆراوجۆر بتوانن لەگەڵ منداڵەکانی بخوێنن. ئاگاداربووم هەرچەند بەمەبەستی خێر ئەمەی کردبوو، بەڵام

ئەمەیان لەگەڵ هەمان سەردەم نەدەگونجا. ڕێگای گەیشتن بەدیموکراسی منداڵەکانی پاشایەتو هەموو منداڵەکان بچن بۆقوتابخانە نەك چەند منداڵێکی دەست بژاردە بۆخوێندن سەردانی کۆشك بکەن.

لەمیوانداری کۆتایی سەفەری ئێمە بۆخواحافیزی کەیەکێك لەبەرپرسانی حکومەت لەسەر شەرەفی شاو ئێمە لەناو کێڵگەی تایبەتی خۆی لەدەرەوەی تاران ڕێکخرابوو، من زیاتر نیگەرانبووم. تاکو ئەوکات سەردانی زۆر کۆشکی جۆراوجۆرم لەسەرتاسەری جیهانم کردبوون، لەزۆر لەمیوانداریەکان پێشوازی کرابووم بەڵام تاکو ئەم ڕادەیە بەهەدەردان بوونی نەبوو. شوێنێکی جوان، میوانەکانی سەرنج ڕاکێش. خواردنەکانی بێوێنە، بەڵام ئێران وڵاتێکی هەژاربوو، بەگشتی زیادەڕۆیی زۆری بەرچاو دەکەوت.

قادرمەکانی چوونەژوورەوە هەمووی کریستاڵبوون کەهیچ کاتێك بەم شێوەم بەرچاو نەکەوتبوون. هۆلی پێشوازی مەرمەڕ بەهەموو جۆرە خواردنەوەیەکی کحولیو شەربەت پێشوازی لەمیوانەکان دەکرا. ئۆرکستراپەك لەناو باخی کۆشك ئامادەکرابوو سەرقاڵی گۆرانیو موسیقابوون، ئامادەکاری تەواو بۆخواردن لەژێر دارەکان کرابوو مێزەکان پڕبوون لەخواردنەکانی گۆشتی، لەژێر دارێکیتر خواردنەکانی سەوزەواتو ساڵات، لەژێر دارێکیتر هەموو جۆرە ماسییەك، بەشێوازەکانی جۆراوجۆر ئامادەکرابوون جۆری دانان خۆی شاکاربوو.

ئەنوەر تەنیا میوەی دەخوارد، کاتێك ڕۆیشت میوە لەناو قاپی دابنێت سەری سوڕدەمێنێت، هەموو جۆرە میوەیەك لەناوتوکڵی کاڵکو شفتی کەبەداهێنانێکی جوان بەشێوەی بەرگی گوڵ دەرهاتبوون میوەیان لەناو دانابوون، ترێ هەنجیر هەموو جۆرە میوەیەك کەلەناویدا تاڤگەیەکی ئاو دەهاتەخوارەوە. لەم میوانداریە هیچ شتێك سروشتی نەبوو، هەموو جۆرە شوکلاتو شیرینیو دسێر لەبەرامبەر ئاکواریۆمێکی گەورە ئامادە کرابوون کەپڕبوو لەماسییەکانی ناوچەکانی جۆراوجۆر. لەناو قاپەکانی زێر خواردنمان دەخوارد.

دوای هەمان میوانداری سواری هەلیکۆپتەری شابووینو گەڕاینەوە بۆتارانو بۆئەنوەرم باسدەکرد:((هەست دەکەم لەم نزیکانە شۆڕشێك ڕوودەدات، چینی سەرەوە خاوەن سامانێکی زۆرو هەژارەکان زۆر هەژارن. چینی ناوەند وەك پێویست نییە کەبتوانێت پارسەنگ ڕابگرێت. شای ئێران بۆئارامکردنەوەی هەلومەرج دەبێت کارێك بکات، زیاتر لەموڵکی خۆی پێشکەش بەخەڵك بکات، لەوانەیە باشتربێت ناوی شا لەسەر خۆی هەڵگرێتو خۆی بکاتە سەرۆککۆمار،

ئێستا جگه لەژاپۆن هیچ ئیمپراتۆرێك لەجیهان نەماوە، هیروهیتۆ وەك مەلیکەی بریتانیا تەنیا پۆستێکی روالەتییە. دونیا بەرەو گۆران دەچێت ئیتر هیچ شوێنێك بۆئیمپراتۆر نییە. ئەمەیان بۆشا باس دەکەم.))

ئەنوەر تەقییەوە. بەسەر سەرم هاواریکرد:((تۆهیچ شتێك بۆی باس ناکەیت! هیچ پەیوەندی بەتۆیەوە نییە، چ کەسێك داوا لەتۆ دەکات دەسوەردان بکەیت؟ شا خۆی ئیمپراتۆر هەژمار دەکات. بۆبوون بەئیمپراتۆر لەدایکبووە. ئەوکات تۆ دەتەوێت ناوی بگۆڕی بۆسەرۆککۆمار؟ رێگا پێدراوی نیت ئەمەیان لەگەڵ شادا باس بکەیت، گوێی بیستی بوویت چیم گوت؟ رێگا پێدراو نیت!))

گلەیم کرد گوتم:((ئەنوەر خۆشەویستیم بۆشا هەیە خۆیی‌و فەرەح دۆستانی ئێمەن، لەوانەیە بەهەمان شێوەی کەخەڵك ئێران دەبینێت نەبینن، یان لەوانەیە ئاگاداری نەبن.))

دووبارە هاواریکرد:((ئەگەر بۆیان باس بکەیت دەبێت بەچ شێوەیەك فەرمانڕەوایی وەڵاتی خۆیان بکەن ئیتر هاوڕێی ئازیزی ئێمە نابن. نابێت دەسوەردان لەکاروباری خەڵکدا بکەیت. لەوانەیە لەرووی رێزگرتنەوە گوێی لەقسەکانی تۆ بگرێت، بەڵام هیچ گۆڕانێك روونادات. بۆچی قسەی خۆت هەڵدەدەیت بۆئاسمان؟)) دواتر بەچاوێك تەماشای کردم‌و بەردەوامبوو:((فەرمانت پێدەکەم یەك وشە لەم لایەنەوە بۆشا باس ناکەیت.))

لەسەر قسەی خۆم پێداگربووم:((دەبینی، ئەنوەر، شۆڕش دروست دەبێت.))

رۆژی دواتر بۆ سعودیا هەڵفڕین‌و من قسەکەم بۆ شای ئێران نەکرد.

مەلیك خالد، پاشای سعودیا لەفڕۆکەخانەی جەددە پێشوازی لێکردین، تەوقەی لەگەڵ مندا کرد هەمان بەخێرهاتنی عەرەبی کەبۆ کەسێك دەگوترێت کەلەرێگایەکی دوورەوە گەیشتبێ:((حمدالله علی السلامه، سوپاس بۆخودا کەبەسەلامەتی گەیشتن.)) ئەنوەری لەباوەش گرت‌و یەکتریان ماچکرد. هەردووکمان وەڵامی سلاوٚمان دایەوە: ((الله سلمك، خودا ئێوە بەسەلامەتی بپارێزێت.))

مەلیکە خالد لەگەڵ بیست لەشازادەکان بەجلوبەرگی سپی جامانە بەسەر وەك بەفر بۆ پێشوازی ئەنوەر هاتبوون بەرێزەو دەیانگوت سوپاس بۆخودا کەبەسەلامەتی گەیشتن. لەهەمان کات خزمەتکاران ئاوی میوەو دۆی ساردی تام پوونگیان لەنیوانماندا دەگێڕا، کامێرای تەلەفزیون لەسەر سەرمان دەسوڕانەوە. پەیامنێرەکان، ئەنوەرو بێگومان شازادەکانی سعودیا

دەیانزانی کەئەم ساتە لەجۆری خۆی ساتێکی مێژوویی دەبێت. من بڕیارمدابوو شان بەشانی هاوسەرم بڕۆم بۆناو دەسەلأتی پاشایەتی، نەك لەدوای ئەنوەر.

کاتێك لەتەنیشت ئەنوەر لەدەرگای فرۆکە دەرکەوتم، هیچ کەسێك بەهەناسەبڕاوی هەناسەی خۆی هەڵنەدەکێشا، هیچ جۆرە دژایەتیم بەرچاو نەکەوتن‌و هەستم پێنەکرد. شازادەکان سیاسەتوانتربوون لەوەی کەبەنیشاندانی هەستی خۆیان کەمن‌و ئەنوەر بڕەنجێنن. بەلأم هەمووکەسێك دەیزانی لەکۆمەڵگەیەکی نەریتخوازی وەك عەرەبستانی سعودیا، ژنی موسلمان لەگەڵ پیاو دەرناکەوێت. پێش سەفەری ئێمە، بالیوزخانەی سعودیا لەقاهیرە ئەم بابەتەی بەتەواوی بۆروونکردینەوە، کەدەبێت دوای کاتژمێرێك ڕۆیشتنی ئەنوەر من لەناو فرۆکە بمێنمەوە، تاکو ڕێورەسمی فەرمی تەواو دەبێت‌و شاو ئەنوەرو شازادەکان لەفرۆکەخانە دەڕۆنە دەرەوە. بۆیان باسکردین هەفتەیەك پێش هاوسەری تیتۆ سەرۆککۆماری یوگسلاڤیا بەم شێوەی کەئێمە باس دەکەین لەسەفەری بۆسعودیا لەناو فرۆکە مایەوە. بەلأم من لەبەرامبەر پێشنیاریان وەستامەوە.

دوای بیستنی پەیامی بالیوزخانەی سعودیا بۆئەنوەرم باسکرد:((لەم سەفەردا من خۆم لەکەڕی دەدەم. پێویست ناکات کەسێك لەم لاینەوە فێرم بکات دەبێت ژنی موسلمانی باش واتەچی. من ڕێز لەئایینی خۆم دەگرم. هیچ کارێکی پێچەوانەی دەستووری ئاین ناکەم. هاوکارییەکانم بەمنداڵەکان‌و کەسانی هەژار هەمان جەوهەری ئایینی ئێمەیە. چ کەسێك باسیکردووە کەمن ژنم دەبێت خۆم حەشاربدەم.؟ لەمیسر خۆم لەبەرچاوی پیاوەکان نایشارمەوە. لەشوێنەکانیتر بەهەمان شێوە ناکەم. بۆمن هیچ جیاوازییەك نییە کەلە کام شوێنی جیهانم، لەژاپۆن یان سعودیاو هەسارەی مانگ، ئەمەیانم.))

ئەنوەر بەبێدەنگی دانیشتبوو گوتی:((لەبیستن‌و کاردانەوەکانت سەرسوڕماو نیم. ماوەیەکی زۆر دەبێت خۆم ڕادەستی بیروباوەڕەکانی تۆ کردووە، ئێستا پشتیوانیت دەکەم بەلأم هەزمکردنی ئەم بابەتە لەوانەیە بۆکەسانیتر کاتێکی زیاتر داوا بکات.))

بەلأم کامیراکانی تەلەفزیونی سعودیا منیان لەکاتی دەرچوون لەفرۆکەخانە هاوکات لەگەڵ شازادەکانی سعودیا بەدوای مندا دەهاتن، کاتێك بەرەو ئۆتۆمبێلی لیموزینی برای شا، شازادە فوئاد بن عەبدولعەزیز، شازادەی جەددە ڕێنوێنی دەکرام بەدوامدا دەهاتن. لەهەمان کات ئەنوەر لەگەڵ خۆدی شا سواری ئۆتۆمبێلی پێشەوە بوون. کاتی تێپەڕکردنمان لەناو شار،

ئەمن بچوکترین نیشانم لەخۆم نیشاندا کەتەنیا لەگەڵ پیاوێك سواری ئۆتۆمبێلم، ئەشازادە فوئاد خۆی بەهەمان شێوە نیشاندا کەلەتەنیشتم دانیشتووە. لەرێگادا پرسیاری زۆرم لەشازادە دەکردن لەسەر بابەتی خزمەتەکانی خێزانی پاشایەتی بۆخەڵكو هاوکاریکردنی کەسانی پەککەوتوو لەهەمان کات کەسانی نابیناو بەهەمان شێوە پێگەی ئافرەتو چەندین پرسیاریترم دەکردن. بۆشازادە فوئاد باس دەکەم:((یەکەم سەفەرم بۆزیارەتی مەککە، پاشا بەگەورەیی خۆی منی بەفرۆکەی خۆی لەجەددە بۆ مەککە ڕەوانەکرد، کاتێك بینیم خزمەتکارانی ناو فرۆکە ئافرەتن زۆرخوشحاڵبووم، هەستم دەکرد ئیتر رێگایان بەئافرەتانی سعودیا داوە کەکار بکەن بەلآم کاتێك گوێی بیستی قسەکانیانبووم زانیم خەڵکی سعودیا نینو لوبنانین. هیوادارم لەسەردەمێکی نزیك بین بەسعودی.))

شاهزادە بەشێوازێکی نهێنی ئامێز گوتی:((بەزوویی، بەزوویی.))

دیارنەبوو ئەم زوویە چ کاتێكو سەردەمانێك ڕوودەدات. ژنانی عەرەبستانی سعودیا بۆ بەدەستهێنانی مافی خۆیان دەستیان پێکردبوو بەلآم رێگایەکی زۆر درێژ لەپێشیاندا مابوو، بەلآم هیچ گومانێکی تێدا نەبوو لەم پانزدە ساڵای رابردوو سەرکەوتنی باشیان بەدەست هێنابوون. حکومەتی سعودیا لەساڵی١٩٦٠ یەکەم قوتابخانەی کچانی کردەوە. ژمارەی پیاوەکانی کەدژی ئەم قوتابخانەیە شۆڕشیانکرد ئەوەندە زۆربوون کەحکومەت ناچاربوو بۆئارامکردنەوە داوای هاوکاری لەگاردی کۆماری بکات. مەلیك فەیسەڵ بەتوندی لەبەرامبەر خوپیشاندانەکانو دژبەرەکانی کردنەوەی قوتابخانەی کچان وەستایەوەو بەرگری لەمافی خوێندنی کچان کردو ملیونان ملیون ریاڵی سعودی بۆخوێندنی ژنان تەرخانکرد. مەلیك فەیسەل یەکەم زانکۆی ئافرەتانی لەساڵی ١٩٧٣ دامەزراند، هەنگاوێکی زۆر گەورەبوو بۆپێشەوەبردنی ولآتێك کەبیروباوەڕەی قەبیلەیی لەسەر پێگەی ئافرەت بەتوندی رێکخراوە، خێمەکانی قەبیلەکان لەعەرەبستانی سعودیا بۆدووبەش دابەش دەبن، بەشێك بۆپیاوان بەشێك بۆئافرەتان، خوێندەوارترین ئافرەتی سعودیا، بەبوونی نەریتەمدکانی توند لەژێرناوی ((پاراستن)) پاڵپێوەنانیان بۆجیهانێکی جودا، دەرفەتەکانی کاری خۆیان زۆر سنووردار دەکەن.

هەموو ئەمانم پێش ئەوەی سەردانی سعودیا بکەم بیستبوون. ئاشنایەتیم لەگەڵ یادگارو بەهاکانی نەریتخوازی بنەماڵەی خاندانی پاشایەتی سعودی کەئێستا ببوون بە میراسی

نەریتخوازانە هەبوو. ئال سعود ئەحفاد محەممەد بن سعود، دامەزرێنەری خاندانێك بوون کەزیاتر لەدووسەد ساڵ لەبەشێك لەدوورگەی عەرەبی فەرمانڕەوایی خۆیان دەکرد. سعود کەسێکی بیابان نشین بەسیاسەتکردن زۆر بەناوبانگبوو، لەساڵی ١٩٣٤ دەرفەتێکی بۆخاندانی ئێستای حاکم رێکخست کەفەرمانڕەوایی ولات بکەن. خاندانی پاشایەتی بەسەپاندنی سیاسەتی بناژۆخواز میراتی خۆیان بەردەوامن، فەرمانەکانی قورئان تەنیا وەك یاسا بۆخۆیان دەپارێزن، بۆدروستکردنی هاوکێشە لەنیوان نەریتەکانو شێوەی نوێی ئەمرۆیتر، بەشێوەیەکی توندتر بەردەوامی بەیاساکانی ئیسلام دەدەن.

هەمان شەو ئەنوەر لەگەڵ پاشاو شازادەکان لەکۆشکێك بۆنانخواردن ئامادەبوون. من لەکۆشکی مەلیکە، نزیکەی سی ئافرەتیتر لەشازادە خاتوونەکانو هاوڕێیانیان بەشداربوون.. میوانەکان یەك بەدوای یەکتر لەلیموزینەکانی جام ڕەش بەجلوبەرگی داپۆشراوی ڕەش دەهاتنەخوارەوە، بەلام لەژێر جلوبەرگەکانی ڕەش بەجلوبەرگی زۆرجوان خۆیان رازاندبوویەوە. هەموو ئەمانە خویندەنێکی باشو سەفەری زۆریان بۆدەرەوەی ولات کردبوو. لەگەڵ خۆیاندا فیلمی سینەمایی، شانۆ، کۆنسێرەتو زۆر لەکتێبەکان کەلەسعودیا قەدەخەکراو بوون لەگەڵ خۆیان هێنابوون. کاتێك وەك دابو نەریتی عەرەبانە لەسەرکورسییەکانی کەلەدەوری هۆلی دانیشتن دانرابوون، بۆئەوەی بزانم ئەمەیان ئەوانیتر کێن کێشەم بۆدروست دەبوو. هەموویان کچی مام، کچی خاڵ، کچی خاڵەت، خاڵەت، پوور، خوشك یان بووکی ئەویتربوون.، خاندانی پاشایەتی تەنیا لەنیوان خۆیاندا هاوسەرگیری دەکەن. بەپێچەوانەی میسر، لەهەمان میوانداری یاسایەك بۆدانیشتنی کەسانی ئامادە بوونی نەبوو. بۆنموونە، لەولاتی من میسر هاوسەری وەزیری بەرگری دەیزانی سەبارەت بەهاوسەری جێگری سەرۆککۆمار شوێنی دانیشتنی دیاربوو. لەسعودیاو ولاتانیتری ئیسلامی، شوێنی دانیشتن هیچ جیاوازی نەبوو. خواردنێکی خۆشیان ئامادە کردبوو، قۆناخی یەکەم نانی گەرم لەگەڵ نۆکی کوتراو لەناو ڕوونی کونجی، بانجانی پانکراوە بەهەموو جۆرە تامێك، قاپەکانی ماست، تەماتە، زەیتون، خەیارو پەنیر، دواتر بەرخوڵەیەکی سوورکراوە، مریشکی سووراکراوە، کۆتری سوورکراوە، لەتەنیشتیان برنجی بەزەعفەران. خاندانی پاشایەتی کاتێك بەتەنیابن گۆشت بەدەستی راست دەخۆن، بەلام هەمان شەو بەکەوچکو چەنگاڵی زێر خواردنیان دەخوارد.

دوای خواردن میوەو شیرینییەکانی هەنگوینیو قاوە لەدوای قاوەی یەمەنی، کەبۆ هەرەسکردنی خواردن هێلَیان تێدەکرد. قسەکردنمان شاگەشەی کرد.کاتێك رۆیشتنی بۆناو باخی کۆشك بۆنی گوڵەکانی جۆراوجۆرو لیمو لەهەموو لایەکەوە دەهات، شازادەکانی کچ لەگەڵ هاوڕێیانی خۆیان پرسیاری زۆریان دەکردن:((خاتوو سادات، نوێترین پرۆژەی ئێوە چییە؟ چالاکیتان تەنیا بۆژنانی میسر نییە، بۆهەموومانە.)) بۆیان باسکردم وێنەکانت لەکاتی کردنەوەی دەزگای خێرخوازی کەلەرۆژنامەکان چاپ دەکرێن دەبینین. هیچ ژنێکی سعودی رێگا پێدراو نییە وێنەی بۆ خەڵك بەگشتی بێت، هیچ ژنێکی سعودی وەك ئەکتەر رێگا پێدراو نییە لەتەلەفزیون دەربکەوێت. لەعەرەبستانی سعودیا ژنان مانای ژیان لەناو کۆمەڵگەیان نەدەزانی کەلەناویدا جیاوازی لەنیوان ژنو پیاو نەبێت.

لەمیوانداری شەوی دووەم لەماڵی برای مەلیکە، ژنانی زیاتر لەمن کۆبوونەوە پرسیاریان سەبارەت بەمیسر دەکردن. کچێکی دەرچووی زانکۆ گوتی:((ژنانی میسر زۆر بەختەوەرن کەدەتوانن ئازاد بەبێ چادر لەسەر سەری خۆیان دابنێن دەچنە دەرەوە. ئێمە لێرەدا خۆمان حەشارداوە، هیچ کەسێك نازانێت ئێمە کێین. خاوەن ناسنامەی خۆمان نین. سنووردار کراوین. ژنانی میسری دەتوانن لەبەشی زانستی مرۆیی بخوێنن، نەك لەبەشی مافو ئەندازیاریی. ئەگەر لەبەشی پزیشکی بخوێنین تەنیا دەتوانین ببین بەپزیشکی منداڵ یان ژنانو بەشی لەدایکبوون.))

دروست هەمان قسەم بۆگێڕایەوە کەبەهەموو ژنانیتر دەڵێم:((بۆوەرگرتنی مافی خۆتان دەبێت تێکۆشانی خۆتان بکەن. هیچ کەسێك پێشکەش بەئێوە ناکات، هیچ کەسێك بانگمان ناکات"بفەرموون ئەمەیان مافی ئێوەیە." هیچ کاتێك ئەم رووداوە روونادات، تاکو خۆمان بۆخۆمان شەڕ نەکەین، هیچ کەسێك شەڕ بۆئێمە ناکات ئەم پەندەتان لەبیرخۆتان بێت" تەنیا چاومان بۆمان دەگرێت.")) 

یەکێك لەئەندامانی بنەماڵەی پاشایەتی پرسیاریکرد:((لەچ شوێنێك دەست پێی بکەین چونکە ئێمە بەشداری کاروبارەکانی خێرخوازانە دەکەین، بەلاَم کاتی بێکاریمان زۆرو پێویستییەکان زۆر سنووردارن. بوێری ئەوەمان نییە هەنگاو هەڵبگرین بۆشوێنی کارکردنی پیاوان، چونکە ترسی ئەوەمان هەیە کۆمەڵگە ئێمە قبووڵ نەکاتەوە. ئایا لەمیسر بەم شێوەیە؟))

ئەم کچەگەنجەم پشتراست کردەوە:((من تاکو ئێستا بەرچاوم نەکەوتووە. لەمیسر ژن‌و پیاو پێکەوە کار دەکەن. پیاوەکان ئەمەیان قبووڵکردووە. بەباوەڕی من جیاوازی لەکارکردنی ژن‌و پیاو بوونی نییە.))

ژنێکیتر گوتی:((بەڵام ئێمە دەترسین، نازانین چۆنەدەرەوە بەبێ خۆداپۆشین یان کار کردن لەتەنیشت پیاوان واتای چییە.))

گوتم:((کارەکانی خۆتان بەشێوەی کەخودا داوات لێدەکات ئەنجام بدەن. قسەکانی لەقورئاندا بەبیرخۆت بێنەوە:"هەرکارێکی باش بکەیت لەلایەن خودا پاداشتێکی تەواو وەردەگریت، هیچ کاتێك زوڵم‌و ستەم ناگاتە ئێوە." بۆچی بەکردەوە بیرناکەینەوە. ئەگەر پیاوەکان نایانەوێت ئێوە دەرهاوردەیەکی سەربەخۆتان هەبێت، بەردەوامی بەکارەکانی خێرخوازی خۆتان بدەن، بەڵام کاتی زیاتری بۆتەرخان بکەن. هەفتانە سێ تاکو چوار رۆژ بەردەوامی بەکاری خۆتان بدەن. بۆئەوەی پیاوەکان هەست بکەن ئێوەش خاوەن بەرپرسیارەتین. دواتر ورده ورده زیاتر سەردانی دەرەوە بکەن. تاکو لەم لایەنەوە خۆیان رادێنن. ئارام بەدوای سازان بگەڕێن. سەرەتا بەکارەکانی بچووك بەڵام هیچ کاتێك دەست لەویستەکانی خۆتان بۆپێشکەوتن هەڵنەگرن. رۆژێك دەبینن تاکو شوێنی کارەکردنی خۆتان بەئۆتۆمبێلی خۆتان دەڕۆن، لەبەرهەمی کارەکانی خۆتان هەست بەسەربەرزی دەکەن.))

رۆژی دواتر کاتێك من ئەوەنور دەمانوویست کۆتایی بەسەردانی خۆمان بێنین. بینیم هاوسەرم مەلیك خالد پێکەوە پێدەکەنن. لەکاتی رۆیشتنمان بۆوڵاتی ئەمیرنشینی دوبەی پرسیارم لەئەنوەر کرد:((ئێوە بۆچی پێدەکەنین؟))

ئەنوەر گوتی:((مەلیك خالد بۆی باسکردم زۆرخوشحاڵم بەسەفەری ئێوە بۆ سعودیا. گوتی:"دەبێت ئاگاداربم، جیهان لەنیوان ژنان خەریکی شۆڕش دروستکردنە.")) گوتم:((خۆزگە دەمتوانی.))

بەڵام لەراستیدا هەمان هەنگاوەکانی بچووك هەلومەرج لەبارتر دەکەن بۆبەتوانابوونی ژنان. لەفرۆکەخانەی دوبەی شێخ زاید، حاکمی هەمان ئیمارات هاتە پێشوازی ئێمە. دەستی بۆمن درێژکردو گوتی:((سوپاس بۆخودا کەبەسەلامەت گەیشتن. خاتوون. هاتنەخوارەوەت لەفرۆکەخانەی جەددە لەتەلەفزیۆن تۆم بینی زۆر چێژم وەرگرت. ژنان ئەم هەنگاوەی تۆیان پێی خۆشبوو.)) بەسەرسوڕمان تەماشامکرد. نەمدەتوانی لەقسەکانی خۆم پشتراست بکەم

کەبەراستی ئەم قسەیە دەکات، بەڵام وەك دیار راستی دەکرد. شێخ زاید بەپێکەنین بۆئەنوەری باسکرد:((جەنابی سەرۆك، هاوسەرتان وەك ئێوە کەسێکی شۆڕشگێڕن.))

شێخ زاید تەماشایەکی لەدەوروبەریکرد دەنگی خۆی کزکرد بۆی باسکردم:((ئەمڕۆ بۆیەکەمجار هاوسەرم بۆپێشوازی لەمیوانێکی بیانی هاتووە بۆفرۆکەخانە. بەداخەوە لەبەر تیمەکانی راگەیاندن نەیتوانی زیاتر بێتە پێشەوە. بەباوەڕی من شایستە نابێت، بەڵام کاتێك پیاوەکان رۆیشتن لەگەڵ ئێوە سواری ئۆتۆمبێل دەبێت.))

خوشحاڵبووم لەسەرکەوتنێکیتر. لەدڵەوە بۆشێخە فاتیمە خوشحاڵبووم. شێخە فاتیمە لەسەفەری رابردووم بینیی زۆر لەبینینی خوشحاڵبووم. لەوەڵامی شێخ گوتم:((شیخ زاید، بۆمن سەربەرزییە کەمیوانی ئێوەو هاوسەری تۆم. گەورەیتان زیاتر.))

هەمان شەو ئیوارە خواردنێکی نەریتی بۆئێمە ئامادە کرابوو، ئەنوەر لەگەڵ پیاوان من لەگەڵ ژنان خوارنی خۆمان خوارد. شێخە فاتیمە میوانداریییەکی زۆر رێکوپێکی بۆمن رێکخست، هاوسەری هەموو دیپلۆماتەکانی بیانیو هاوسەرانی وەزیرانی حکومەتو خاتوونەکانی خانەدانەکانی دوبەی بانگێشت کردبوون. کەسانی خزمەتیان دەکرد هەموویان ئافرەتبوون، ژنانی پاکستانیو هیندی کەلەهێزەکانی کاری ولآتانی کەنداو بوون. ئەمەیان زۆر ناسروشتی دەهاتە بەرچاو. چونکە لەولآتی ئێمەو عەرەبستانی سعودیا بەشێوەیەکی نەریتی، خزمەتکردن لەمیوانەکان لەئەستۆی پیاوەکانبوو. بەڵام رووداوی کەدواتر روویدا زۆر ناشروشتیتر بوو، لەراستیدا بێوێنەبوو.

دوای نانخواردن سەری ئێمە بەگویگرتن لەگۆرانی گەرمبوو کەدەنگێکی بەرز لەپشت دەرگا دەهات لەبەرامبەر چاوی واق وڕماوی ژنان، شێخ زاید هاتەژوورەوە.

گوتی:((هاتووم سلاو لەخاتوو سادات بکەم. رێگام بدەن لەگەڵ ئێوە گوێی لەگۆرانی بگرم؟))

گوتم:((بیگۆمان بفەرموون، بۆچی نابێت؟))

تەوقەی لەگەڵ هەموو ژنانی ئامادەبوو کردو، سەرسوڕماوتر دەبوون، شیخ زاید دواتر لەتەنیشت من دانیشت، چەپلەی بۆگۆرانبێژ لێداو گوتی:((بفەرموون ئێستا باگوێی لەگۆرانی گوتن بگرین.))

تاکو کۆتایی شەو نەمزانی ئەم رووداوە چەند تایبەتبوو. ژنانی ئامادە هەموویان دەهاتن بەهیواشی دەیانگوت:((خاتوو سادات سوپاست دەکەین کەئەم دەرفەتان بۆئێمە رەخساند،

یەکەمجارە کەشێخ زاید دەبینین.)) بۆخۆدی من جێگای باوەڕکردن نەبوو کەئافرەتان بەتایبەتی هاوسەری دیپلۆماتەکانی بیانی، هیچ کاتێك حاکمی ئیماراتی عەرەبیان لەنزیك نەبینیبوو، بەلاّم ئەمەیان حەقیقەت بوو. هاوسەری بالیوزی سوئێد بۆی باسکردم:((سێ ساڵە لەگەڵ هاوسەرم لێرەم ئەمەیان یەکەمجارە تەوقە لەگەڵ شێخ زاید بکەم. سوپاست دەکەم.))

ڕۆژی دواتر ئافرەتانی دوبەی لەکۆبوونەوەیەکی گەورە کەشێخە فاتیمە ئامادەی کردبوو پرسیاریان لەمن دەکرد:((چۆن توانیت لەمیسر ئەم سەرکەوتنە بەدەست بێنیت؟)) نزیکەی پەنجا ئافرەت، هەندێکیان پێشتر دەستیان بەکاروبار چالاکی کۆمەلاّیەتی کردبوو هەندێکیان دەیانوویست دەست بەکاربن. لەم کۆبوونەوەیە ئامادە بوون. لێکدانەوەکانی ناسەرکەوتووی خۆیان باسکرد.

بۆیان باسکردم:((ژنێك دەرچووی بەشی مافە، بەلاّم لەخێزانێکی سەرناسە لەترسی نەوەك کەرامەتی بشکێت ڕێگای پێنادرێت لەوەزارەتی داد کاربکات. ژنێکی ئەندازیار هەیە، تەنیا لەبەر ئەوەی لەگەڵ برای لەناو یەك کۆمپانیدان ڕێگای پێدراوە کاربکات. ئێمە ناتوانین ببین بەسکرتێر، چونکە نابێت پیاوەکان ئێمە ببینن.))

بۆم باسکردن:((بەراستی جێگای داخە، لەمیسر زۆر لەژنەکان سکرتێرن. بەباوەڕی من کاری سکرتێری بۆئافرەت هەنگاوێکی زۆرباشە کەبتوانن هەنگاوی زیاتر هەڵگرن بۆپێشکەوتنی ئافرەت بۆپلەکانی بەرزتر کەبتوانن بەرپرسیارەتی وەربگرن ئەمەیان ڕێگایەکی زۆر ئاسانە.بەلاّم ئەگەر نەتوانن لەگەڵ پیاوەکان کار بکەن، هەندێك کاریتر بیدۆزنەوە کەبتوانن تووڕەیی پیاوەکان کۆنترۆڵ بکەن. هاوکاری نەخوشخانەکان بکەن لایەنی خێرخوازی بۆکۆکردنەوەی داهاتێك بۆهەژارەکان دروست بکەن. لەسەرخۆ دەستی پێی بکەن، بەلاّم دەبێت دەست پێی بکەن.))

دەمزانی ئەم کاروبارانە کێشەیە بۆئەم خاتوونانە، چونکە لەدوبەی وەك زۆر لەئیماراتی بچوکی کەنداو، خاوەنی زانکۆ نەبوون. نەبوونی زانکۆ بۆپیاوان بابەتێکی زۆر گرنگ نەبوو، چونکە کورسی خوێندن کەحکومەت تەرخانی دەکردن زۆر دەستکراوە بوون کەبتوانن لەدەرەوە بخوێنن. بەلاّم بۆئافرەتان چوونەدەرەوە پێویستی بەڕێگا پێدانی خێزان هەبوو، هەلومەرجێکی زۆر دژواربوو. تەنیا کەمتر لەدووسەد کەس دەرفەتی بۆ ڕەخسابوو لەدەرەوە بخوێنن، زۆربەیان دەرچووی زانکۆی میسربوون، پشتراست بووم زۆربەی ئافرەتانی کەلەدەوری من

دانیشتبوون لەماوەیەکی کورت سەردەکەون‌و بەهیواکانی خۆیان دەگەن. بڕیاربوو یەکەم زانکۆی دوبەی لەساڵی ١٩٧٧ بکرێتەوە. ژنانی دوبەی بەرێبەرایەتی شێخە فاتیمە، بەدروستی رێبەرایەتی دەکران.

لەنیوان هاوسەرانی فەرمانڕەوایانی کەنداو، یان لەجیهانی ئیسلامی هیچ ژنێك نەبوو وەك شێخە فاتیمە یان توندترو بەهێزتر بۆبەدەستهێنانی مافی ژنان هەوڵدانی خۆی بکات. بۆئەوەی ببێت بەسەر قافلە بۆکەسانیتر بەردەوام بوو لەخوێندن، ئینگلیزی دەخوێندو عەرەبی تەواو دەکرد. بەرنامەی زیادکردنی خوێندەواری لەسەرتاسەری دوبەی، ناوچەکانی گوندنشین‌و شارنشین دەستی پێکردبوو. لەساڵی ١٩٧٣، بەپشتیوانی هاوسەری، ئەنجوومەنی هوشیاری ژنانی لەدوبەی کردەوە، ئەنجوومەنێك بەخێرایی گەشەیکردو بۆریشە کێشکردنی نەخوێندەواری‌و فێربوونی کارێکی پیشەیی ژنانبوو، دواتر دەتوانێت چوار بەشی ئەنجوومەنە لەچوار ئیماراتی کەنداو بکاتەوە.

چونکە خودی شێخە فاتیمە، لەمنداڵی سوودی لەخوێندن وەرنەگرتبوو، بەڵام جیلی داهاتووی ژنان لەدوبەی گرنگی زۆریان پێدابوو. بۆهاندانی خەڵك کەکوڕو کچەکانی خۆیان ڕەوانەی قوتابخانەکانی تازە دروستکراو بکەن سوودی لەبەرنامەی تەلەفزیونی وەرگرت بەڵام کەسانێك کەلەبیابانەکان ژیانی خۆیان بەسەر دەبرد نەیاندەتوانی تەلەفزیون ببینن‌و کچانی خۆیان لەتەمەنی هەشت ساڵی لەقوتابخانەکان دەهێنانە دەرەوە، سەردانی ناوچکەیکرد لەگەڵ تەواوی خێزانەکان دادەنیشت کەبەبڕیارەکانی خۆیاندا بچنەوە. ئەم خەڵکە رێزی دەگرن‌و قبوولی دەکەن.

هەمان شەو لەهەمان کۆبوونەوەی ئازاد، یان ئەنجوومەن، شێخە فاتیمە هەفتانە بۆهەموو ژنانی سەرتاسەری وڵات رێکدەخات ئامادە بووم، رێزگرتنم بۆئەم ئافرەتە زیاتربوو. بێگومان زۆر لەفەرمانڕەوایانی کەنداو گردبوونەوەی لەم جۆرە بۆخەڵك ئامادە دەکەن بۆچارەسەری کێشەکان، بەڵام ئەمەیان شێخە فاتیمەبوو کەبۆئافرەتانی ئامادە دەکرد. لەمیسر لەم جۆرە کۆبوونەوەیە نەبوون بەڵام تاکو ئێستاش لەزۆر لەوڵاتانی عەرەبی بوونیان هەیە، ستایشیان دەکەم.

هیچ کەسێك پێویستی بەروخست وەرگرتن نییە کەبەشداری بکات. رێگا بۆهەموو کەسێك کراوەیە لەشوانێك بگرین تاکو بەرزترین پلەی حکومەت بەخێرهاتنیان دەکرێت سەدان کەس

بەشداری دەکەن. پێش دەستپێك خەڵك لەگەڵ ئەمیری خۆیان نوێژ دەکەن‌و لەکۆتایدا خواردن بۆھەمووکەسێك ئامادە دەکرێت. خەڵك پرسیارو پێشنیارو داواکاری خۆیان پێشکەش دەکەن. خزمەتکاران چا بۆخەڵك دەگێڕن. ھەندێك کەس تەنیا بۆئامۆژگاریکردنی ئەمیری خۆیان سەردانی دەکەن‌و ئەمیرەکان بەردەوام گوێی لەئامۆژگارییەکان دەگرن. زوڵم نەکردن، گرنگیدان بەڕێنوێنی‌و ڕێنەمایی کەسانیتر بەشێکە لەپەروەردەی ئیسلام.

زۆربەیان داوای ھاوکاری دارایی دەکەن. داوا لەحکومەت دەکەن کەسێکی نەخۆش ڕەوانەی دەرەوە بکەن بۆچارەسەری، ھاوکاریکردنی جوتیاران بەتایبەتی لەسالآنی کە بەرھەمی جوتیار وەك پێویست نەبووبێت. لیکۆلینەوەی ئەمیر لەسەرپێچییەکان‌و نیوەندگیری لەنیوانیان. ئەگەر خۆدی ئەمیر نەتوانێت لەھەمان کات کێشەکان چارەسەر بکات ئاگاداری تەواوی لەسەر نەبێت بۆنموونە بابەت گرێدراوی بەشی دارایی بێت ڕەوانەی ھەمان شوێن دەکات بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی. بەپەیڕەویکردن لەنەریتەکانی ئیسلام ھەموو خواستەکان وەلآم دەدرێنەوە. لەسەردەمی پێغەمبەر یان یاوەرانی ئەگەر کەسێك سەردانی دەکرد بۆھاوکاری لەبوارەکانی جۆراوجۆر بەلێنی چارەسەریان دەدا. ئەگەر داوای چارەسەری لەموسلمانێك بکرێت‌و بتوانێت چارەسەری بکات دەبێت بۆی جێبەجێ بکات.

لەکۆبوونەوەی شێخە فاتیمە، پەنجا ژن لەتالآر دانیشتبوون، بیروباوەڕی خۆیان ئازادانە باس دەکردو داواکاری خۆیان پێشکەش دەکرد، پێویستی لایەنی دارایی کەھاوسەریان نەخۆشبوون بۆڕەوانەکردنی بۆدەرەوە. زۆر لەداوکارییەکان داوایان دەکرد ھاوکاریان بکات کەکێشەی نیوان کوڕو ھاوسەریان چارەسەر بکات. ژنێك رووی لەشێخە فاتیمە کردو گوتی:((ھاوسەرم‌و کوڕم کێشەی زۆرتوندیان لەنیواندا ھەیە، ھاوسەرم دەیەوێت کوڕم لەدوکان لەگەڵ باوکی کار بکات، بەلآم کوڕم دەیەوێت لەناو حکومەت کار بکات.)) ناونیشانی ھەمان خێزان نووسرا شێخە فاتیمە بۆی باسکرد بۆچارەسەکردنی نوێنەری خۆی بۆچارەسەرکردن ڕەوانە دەکات. ھەندێك لەژنەکان دەبێت چەندین کاتژمێر چاوەڕێیان کردبا بەلآم لەم لایەنەوە ھیچ جۆرە بێزاریان لەخۆیان نیشاندا. ئەم کۆبوونەوەیە جگە لەلایەنی کۆمەلآیەتی لایەنی سیاسی بەخۆیەوە دەگرت، ئەمەیان شوێنێکبوو کەژنان لەیەکتر فێردەبوون‌و بیروباوەڕی خۆیان باس بکەن. زۆرجار داوا لەژنانی دیپلۆماتکارەکان دەکرا بەشداری بکەن. سکرتێری شێخە فاتیمە کچێکی میسری دەرچووی زانکۆی ئەمەریکابوو لەقاھیرە کەشارەزایی لەزمانی ئینگلیزی‌و فەرەنسی

هەبوو، زۆرجار کاری وەرگێڕانی دەکرد. کاتێك گەڕامەوە بۆمیسر لەژێرکاریگەری هەمان کۆبوونەوەی شێخە فاتیمەدا بووم. فەرمانڕەواو خەڵك پێکەوە نوێژ دەکەن. پێکەوە خواردن دەخۆن. پێکەوە کێشەکانی خۆیان چارەسەر دەکەن، هیچ بەربەستێك لەنیوان هەژارو دەوڵەمەند نەبوو. جیاوازی لەنیوان فەرمانڕەواو بێ دەسەڵات بوونی نەبوو. بەبوونی مەترسی ئەم جۆرە ئازادیانە، ئەم نەریتە بەردەوامی هەیە. لەساڵی ١٩٧٥، مەلیك فەیسەڵ لەکۆبوونەوەیەکی هاوشێوە لەریاز لەلایەن کەسێکی خزمی خۆی کوژرا.

بۆشوێنەکانی کەسەفەرم دەکرد رێزی زۆریان دەگرتم‌و من لەدیدارەکانی خۆمدا داوام لەژنان دەکرد سەردانی میسر بکەن زۆریان سەردانی ئێمەیان کرد. شێخە فاتیمە یەکەم هاوسەری یەکێك لەئەمیرەکانی کەندابوو کەلەماوەیەکی کورت خۆی بەتەنیایی سەردانی میسریکرد. تەنیا داوکاری شیخ زاید ئەوەبوو کەوێنەی لەرۆژنامەکان دەرنەچێت. فەرەح دیبا چەندینجار سەردانی میسری دەکرد، ئیریس فرەنجیە، هاوسەری سەرۆکی لوبنان‌و بوتینا نمیری لەسودان.

میوانەکانی خۆم بۆبینینی پرۆژەکانم دەبردن، بۆئاشنایەتی لەگەڵ رێکخراوەکانی ئافرەتان لەقاهیرە بینینی کارگەی تلا. پێکەوە سەردانی کارگەکانم لەگوندەکان دەبردن، لەم شوێنەبوو کەژنانی وڵاتانیتر دەیانتوانی ژن‌و پیاوەکانی میسر ببینن کەچۆن پێکەوە کاردەکەن بۆباشترکردنی هەلومەرجی ژیانی خۆیان. بەڵام بەبوونی هەموو پێشکەوتنەکانی ئێمە لەمیسر، بەشێکی سەرەکی بوونی هەبوو کەژنان لەناویدا بەشێوەیەکی زاڵمانە لەهەلومەرجێکی زۆرخرابدا بوون. لەساڵی ١٩٢٩، ژنان لەمیسر بەیاسای باری کەسیەتی گرێدراوبوون، یاسا بەئاشکرا پێگەی ئافرەت لەخوارەوەی پیاوی هەژمار دەکرد. گروپی جۆراوجۆری ژنان لەوانە یەکێتیی ئافرەتانی میسر، چەندین ساڵبوو بۆهەموارکردنی ئەم یاسایەیی نزمکردنی پێگەی ئافرەتان تێکۆشانی خۆیان دەکرد. بەتایبەتی لایەنی گرێدراو بەهاوسەرگیری‌و تەڵاق، ٩٨٪ ژنانی میسر خاوەن هاوسەربوون، بەبوونی ئەم لایەنە ئەم یاسایە ئەوەندە زاڵمانەبوو لەسەر هاوسەرگیریی‌و جیابوونەوە. لەساڵی١٩٧٧من وەك ئافرەتێك بۆیەکسانی زیاترو هەستکردنی ئارامی لەخێزاندا خۆم خستەرێزی ئەم تێکۆشانە لەماوەی دووساڵ هەموارکردنی یاسای باری کەسیەتی دەبێتە گرنگترین بابەتی ژیانم.

سەبارەت بەهەندێك یاسا نەمان دەتوانی هیچ کارێك بکەین. بۆنموونە قورئان رێگا بەپیاوەکان دەدات بەویستی خۆیان دەتوانن نەگەڕێنەوە بۆماڵ. بۆوەرگرتنی ئەم مافە هیچ رێگایەك نییە.

بەڵام لەشێوەی سوود وەرگرتنی پیاوان لەم مافە دەکرا قسەی زۆری لەسەر بکرێت. سورەی دووەم، (بەقەرە)، دەڵێت:ئەم جۆرە تەڵاقدانە دوو قوناخ لەخۆدەگرێت کەدەڵێت، زانایانی ئیسلامی بەم شێوەیە لێکدانەوەی بۆدەکەن. دەبێت پیاوەکان دوای تەڵاقدانی قۆناخی یەکەم مانگێك خۆی بگرێت، چونکە بۆپیاو رێگا پێدراوبوو کەسێ جار بەدوای یەکدا دووبارە بکاتەوە((من تۆم تەڵاقداوە.)) کۆتایی بەژیانی هاوبەش دێنێت. بەڵام لەمیسر پیاوەکان تەنیا رێگای خێرایان هەڵدەبژارد، هەندێك پیاو جیاوازتربوون ئامادە نەبوون لەبەرامبەر هاوسەری خۆیان ناوی تەڵاق بێنن. تەڵاق یان هەمان جیابوونەوە لەکاتێکدا باوەڕ پێکراوە کەبەئامادەبوونی دوو شاهید رابگەیێنێت. زۆر لەژنانی میسری ئاگاداری تەڵاقدانی خۆیان نەبوون، زوڵم لەئەمەیان گەورەتر نەبوو.

لەکاتێکدا کەتەڵاقدانی ژن بۆپیاو لەمیسر زۆرئاسانبوو. تەڵاق وەرگرتنی ژن لەپیاو کارێکی دژواربوو. قورئان لەسورەی (نساء)داوا لەپیاوەکان دەکات دەبێت بەباشی هەڵسوکەوت لەگەڵ ئافرەتان بکرێت ئەگەر بەدڵی ئێوەش نەبێت چونکە زۆر لایەن بوونیان هەیە پەسەند نین بەڵام خودا بەچاکە بۆئێوە هەژمار دەکات. ژن بۆئەوەی جیا ببێتەوە دەبێت سەردانی دادوەر بکاتو دواتر بۆدادگە روونبکاتەوە کەپیاوەکەی بێتوانایە، توانای خەرجی ماڵو هاوسەرو منداڵەکانی نییە، شێتە، گیرۆدەی نەخۆشییەکی درێژخایەنە کەچارەسەری نییە. یان بەشێوەیەکی مەترسیدار خرابە. ئەگەر پیاوێك لەهاوسەری بدات ئەم لێدانە نەبێتە هۆکاری پەکنەکەوتی یەکێك لەئەندامانی جەستەی، یان ژنێکیتر بێنێتو وەك خزمەتکار هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکات. ژن نەیدەتوانی خۆی لەم پیاوە تەڵاق بدات، هەرچەند هیچ یەکێك لەم هەڵسوکەوتانە باش نەبوو. کاتێك کەژن چاوەڕێی بڕیاری دادگای دەکرد زۆرجار سێ بۆچوار ساڵ درێژەی دەکێشا، تاکو ئەوکات بەپێی یاسا ناچاربوو بڕیارەکانی هاوسەری جێبەجێ بکات.

من خۆم شاهێدی یەکێك لەم جۆرە تەڵاقانەی خزمانی خۆمبووم. ژنانی خێزانەکانی گەورە هیچ کاتێك خۆیان نەدەڕۆیشت بۆدادگا کەلەهاوسەری جیاببێتەوە یەکێك لەخزمانی خۆی رادەسپارد کەکارەکانی بۆجێبەجێ بکات لەبەر ئەوەی نەیدەویست لەبەرچاوی خەڵك لەناو کۆمەڵگە خۆی بەبچووك ببینێتەوە. هەمان ژنی خزمی ئێمە هەموو هۆکارەکانی بەدادگا دەگەیاند بەڵام هیچ وەڵامێك بۆداواکاری نەبوو دواتر ناچار پەنای بۆباوکی برد کەئەگەر نەتوانێت خۆی تەڵاق بدات پەنا بۆخۆکوشتن دەبات. جار هەبوو لەسەر کیلۆیە شوکلات کێشەی ژن دروست دەکرد نەوەك

ژنی دانەیەك زیاتر لەبەشی خۆی هەڵگرتبێت. باوكی داوای لەزاوای كرد كچەكەی تەڵاق بدات، ئەگەر باوكی قبووڵی نەدەكرد بەپێی یاسا ناچاربوو لەگەڵ هاوسەری بمێنێتەوە، ئەوكات یاسایتریان بۆزیاد دەكرد وەك ئەوەی كەنابێت لەماڵ بچێتەدەرەوە تاكو بڕیاری دادگا دەگەڕێتەوە.

تاكو سەردەمی سەرۆكایەتی ئەنوەر، ئەگەر ژنێك بەبێ قسەی هاوسەری یان بڕیاری دادگا لەماڵی هاوسەری دەڕۆیشتە دەرەوە، لەوانەیە بەپێی یاسا گیرابا. بەپێی یاسا دەبێت لەماڵی خۆی نێتەدەرەوە، ئەنوەر لەساڵی ١٩٧٦ ئەم یاسایی هەڵوەشاندەوە هاوسەر دەیتوانی داوای هاوكاری لەپۆلیس بكاتو بگەڕێنێتەوە ماڵی هاوسەری، بۆرێگاگرتن لەهەڵاتنی دووبارە دەرگای لەسەر قوفڵ بكرێت. دواتر هاوسەری دەیتوانی وەك بەڵگە هەڵاتنی لەماڵەوە بەكاربێنێت، ئەمەیان پێداگرییەكبوو كەژن ئیتر نەتوانێت بەهیچ شێوەیەك داوای تەڵاق بكات. بۆئەوەی ئەم لایەنەی خەمبار نێتە پێشەوە لەژیانی هاوبەشی ژنو پیاو. هەندێك لەئافرەتان داوایان دەكرد لەكاتی مارەبڕین بكرێتە مەرج بەسەر پیاوان كەمافی تەڵاقدان بەهاوسەری بدات. بەڵام ژمارەی ئەم كەسانە كەمینەبوو نەك زۆرینە. بەڵام هیچ پیاوێك ئەمەیانی قبووڵ نەدەكرد تەنیا بەمەرجێك ئەگەر هەمان ئافرەت خاوەن دارایی‌و پیاو هیچی نەبێت. ئەوكات زۆر سروشتی هەژمار دەكرا كەهاوسەری ئایندە گومان لەبووك بكات. زۆر لەژنانی بەتواناو بەچاوێكی كەمتر تەماشای ئەم بابەتانەیان دەكرد. هەبوونی ماف بۆئەمجۆرە ئافرەتانە كەدەتوانن خۆیان تەڵاق بدەن بەنرخێكی زۆر گران تەواو دەبوو. ئەوكات ژنان ناچار دەكران بەپێی یاسای باری كەسیەتی نرخێكی زیاتر بدەن بۆئەوەی بەم شێوەیە مارەبڕینیان بۆبكرێت. پیاوەكان رێگا پێدراون كەهاوسەرێك زیاتر بۆخۆیان بێنن. چونكە بەپێی قورئان ژمارەی هاوسەرگیری زیاتر بۆپیاو بەرێگەپێدراوە. ژمارەیەكی زۆر لەپیاوان كەهاوسەرگیری دووەمو سێیەمی دەكرد بەپێی یاسا ناچار نەبوو هاوسەری یەكەم یان دووەمی ئاگادار بكاتەوە. ئەگەر ئاگادار دەبوون دیسان نەیدەتوانی هیچ هەڵوێستێك وەربگرێت یان نارەزایەتی دەربڕێت. بەپێی یاسای باری كەسایەتی ژمارەی ژنانی نەدەبوون بەبەڵگە كەهاوسەری یەكەمی داوای تەڵاق بكات زۆربەیان تەنیا زوڵمو ستەمیان لێدەكرا.

رۆژێكیان لەكاتی كردنەوەی بازاری خێرات لەقاهیرە ژنێكی گەنج كەكچی بچووكی لەملبوو گوتی:((خاتوو سادات هاوكاریم بكە هاوسەرم سێ ساڵ پێش ژنی دووەمی هێناوە بەڵام ئامادە

نییە من تەلاق بدات. ئێستا لەمیسر نەماوە دادگا بەردەوام نامەی بۆڕەوانە دەکات بەلام وەلام ناداتەوە.)) چەندین مانگ بۆهەرشوێنێك دەرۆیشتم کەپێشتر راپاندەگەیان من سەردانی فلان شوێن دەکەمو وتارێك پێشکەش دەکەم بۆکردنەوی قوتابخانە یان کۆکردنەوەی هاوکاری بۆنەخوشخانەکان، ئەم ئافرەتەی گەنجو منداڵی ئامادەبوون. روخساری بەردەوام لەبەرچاوم بوو، روخساری گریانی. دەپارایەوە تاکو هاوکاری بکەم. بەلام بەپێی یاسا نەمنو نەدادگا نەیاندەتوانی هیچ کارێك بۆئەم ئافرەتە بکەین. هیچ هۆکارێکی یاسای بۆوەرگرتنی تەلاق نەبوو، هاوسەری لەدەرەوەی دەسەلاتی دادوەری میسربوو نەیدەتوانی داوای تەلاق لەم پیاوە بکات. من نەمدەتوانی کەسێك بەدوای ئەم پیاوەدا ڕەوانە بکەم کەبیروباوەڕی بگۆڕێت چونکە هەلاتن لەبەرامبەر بەرپرسیارەتی لەدەرەوەی ولات بەردەوام شوێنی خۆی دەگۆڕی. بەردەوام خەمی ئەم ئافرەتم هەبوو چونکە زۆر گەنج بوو، دەیتوانی دووبارە هاوسەرگیری بکات.

ژنانی هاوشێوەی ئەمانە زۆربوون کەبەم شێوەیە بەردەوام زوڵمیان لێدەکرا.

بۆهاوسەری یاسایەك هەبوو کەدەیتوانی بۆهاوسەری باسی هاوسەری دووەمی نەکات یان بۆهاوسەرانی باسی هاوسەری نەکات کەلەیەکێك لەگەڕەکانی شار لەگەڵ هاوسەری چوارەمی بەردەوامە لەژیانی خۆی. چیرۆکی پیاوەکان زۆرن ئەوانەی هاوسەرگیری دووەم بەشێوەی نهێنی دەست پێدەکەن. زۆرجار روویداوە تاکو مردنی پیاو هەندێکیان خزمانی خۆیان نەدەناسین لەوانەیە پیاوێکی خاوەن دوو هاوسەر هاوسەرەکانی یەکتریان ناسیبێت بەلام نەیاندەزانی پەیوەندی خزمایەتیان هەیە تاکو رۆژی مردنی پیاو ئەوکات دەردەکەوت ئەمانە لەلایەك خزمو لەلایەك دژبەری یەکترن. ئەوکات ژنی دووەم بەناسنامەی خۆییو منداڵەکات دەردەکەوت. ژمارەی ئەم رووداوانە کەم نەبوون بەلام ژنەکان چیان دەکرد ئێستا هەردووکیان بێوەژن بوون. داوای میراسی خۆیانو منداڵەکانی خۆیان دەکرد. زۆرجار لەبەر ئاشکرابوونی خیانەتی هاوسەری دەردی لەدەستدانی هاوسەری زۆر کەمتر دەبوو.

چیرۆکی بەناوبانگی یەکێك لەم ئافرەتانە زۆر سەرنج راکێشە من زۆر خۆشم دەویست: کاتێك ژنی دووەمی هاوسەری ئامادە دەبێت ژنی یەکەم بەخێرایی دەرۆتە ژووری خۆی جلوبەرگەکانی ڕەشی دەگۆڕێتو دەگەڕێتەوە روو لەکەسانی ئامادەبوو دەکات کاتی خۆتان بەفیڕۆ نەدەن بۆهیورکردنەوەی من یان هەرهیچ نەبێت هاوبەشی لەخەمی من بکەن. بۆپیاوێك کەچەندین ساڵە خیانەت لەمن دەکات ئامادە نیم یەك دانەفرمێسکی بۆبرێژم.)) لەلایەنی روحی خۆشەویستی

زۆرم بۆبوێری ئەم ئافرەتە هەبوو. پەسەندی دەکەم. من خۆم هیچ کاتێك ئۆقرەی ئەم فێڵبازیانەم نەدەگرت. ئەگەر ئافرەتێك خۆشەویستی بۆهاوسەری هەبێت، پێکەوە بەردەوامیان بەژیان دابێتو هاوبەشبن لەهەمووشتێك، شەرەف فەرمانی پێدەکرد هیچ نەبێت حەقیقەتی بۆباس بکات. یاسا بەهەمان شێوە.

رۆژێك بۆگفتوگۆ کردنو راگۆڕینەوە لەگەڵ عایشە راتب، وەزیری کاروباری کۆمەلآیەتی لەسەر بابەتی رێکارەکانی هەموارکردنی یاسای جێگای باسی ئێمە رۆیشتبووم، منی ئاگادار کردەوەو گوتی:((نەریتخوازەکان بەهێز لەبەرامبەر ئێمە رادەوەستن، پێشتر کە پێشنیاری گۆڕانمدا، هەندێك خەڵك دژی من خۆپیشاندانیان کرد.))

سەرسوڕماو نەدەبووم بەشێك لەنەریتخوانی مەزهەبی، نەخشی ئافرەت دیاریکراوبوو: خزمەتکردنی بەردەوامی پیاو بەبێ گلەیکردن. بۆعایشەم باسکرد:((ئێمە پێچەوانەی قورئان داوای ناکەین، یاساکانی ئیسلام خاوەنی چوار مەکتەبی جیاوازە، لەهەموویان توندتر باوەڕە دەکەن.))

عایشە شانەکانی بەرزکردنەوەو گوتی:((رازیکردنی ئەمانە لەم جۆرە بابەتانە کارێکی زۆر دژوار دەبێت.))

زۆر تووڕەبووم. بۆم باسکرد:((بەلآم دەبێت نەریتخوازەکان بزانن کەیاسای ئێستا بۆرێگەگرتن لەتەلآق هاندەری سەرەکییەبۆ پیاو. لەناو حەدیسەکان باسکراوە((لەنیوان هەموو بڕیارەکان لەلایەن خودا تەلآق لەهەموویان خراپترو ناپەسەندە.))

عایشە گوتی:((خاتوو سادات من لەگەڵ بیروباوەڕەکانی تۆدام، ئێمە بۆگۆڕانکار دەبێت بەردەوامی بەرێگای خۆمان بدەینو لەتێکۆشان دەست هەڵنەگرین، بەلآم نەریتخوازەکانی ئایینی باوەڕی تەواویان بەرێبەرەکانی ئیسلامی خۆیان هەیە. بۆ گۆڕینی ئەم یاسایە دەبێت بەجوانی هەڵسوکەوت بکەین.))

ئامارەکان بەتەواوی لەکۆبوونەوەکانی جۆراوجۆری ناوەندەکانی ئافرەتان لەمیسر پێشکەش دەکران. زۆر لەئەندامانی وەك کەریمە سەعید سەرۆکی ناوەندی ئافرەتانی میسر بۆگۆڕینی ئەم یاسایە هاودەنگ دەبوون. بابەتەکان لەبەرگریکردن لەیاسای نوێ زۆر لۆژیكو سەلمێنراوە سێ کەسی پەلەبەرزی ئایینی وەك محەممەد عەبدولرەحمان بیسار شێخی ئەزهەر، وەزیری ئەوقافو کاروباری ئایینی شێخ محەممەد عەبدولمعەنم نمر، موفتی میسر شێخ جەد ئەلحەق

بەئەندامبوون لەکۆمیتەی پێشنیاری چاکسازیی بۆپەرلەمان رازیبوون. وەزیری داد عەبدل ئاخەر، محەممەد عەبدول ئاخەر بەشداریان لەکۆمیتەدا کرد.
من بیرم دەکردەوە ئەگەر ئەندامانی پەرلەمان خەڵکی جۆراوجۆری میسر ببینن دەتوانن پشتیوانییەکی بەهێزتر بۆچاکسازیی ئەم یاسایە بەدەست بێنن، لەبەر ئەم هۆکارانە ناوی خۆم لەئەندامەتی کۆمیتە ڕەشکردەوە. لەکارکردن لەپشت پەردە بۆئافرەتانو پشتیوانی لەئامانجیان بەتەواوی رازیبووم. بەڵام لەسەرەتا ویستی من بۆبەشداریکردن دەبوو هۆکار هەندێك لەگروپەکانی ژنان نارازی بن.
لەیەکەمین کۆبوونەوەی پشتیوانی هەمواری یاسا ئامادە بووم، ئامینە سەعید منی ئاگادار کردو گوتی:((خاتوو سادات، من دەترسێم چونکە تۆ هاوسەری سەرۆککۆماری کاری پشتیوانی ئێوە ئاسان نابێت، چونکە ئێمە بۆگەیشتن بەئامانج بۆهەموو ئەگەرێك ئامادەین، لەوانەیە خۆپیشاندان بکەین لەناو خۆپیشاندان توندوتیژی بەکاربێنین، لەوانەیە زۆر لەئێمە بگیرێنو ڕەوانەی گرتووخانەکان بکرێن. ئێوە ناتوانن ئەمەیان بکەن.))
دەستبەجێ وەڵامی ئامینەم دایەوە:((ئەگەر ئێوە بگیرێن من خۆم دێم بۆگرتووخانە من لەگەڵ ئێوە دەمێنمەوە. ئایندێرا گاندی سەردەمانێك دەیگوت:"راستە زۆرجار ژنان زێدەڕۆیی دەکەن بەڵام لەهەمان زێدەڕۆیی کەسانی بەرامبەر گوێی لەقسەکانی ئێمە دەگرن." بەڵام ئێستا بیر لەلایەنی گرتووخانە ناکەینەوە. هاوسەری من کەسێکی کراوەیە دژی ئێمە هیچ هەڵوێستێك وەرناگرێت. دژایەتی ئێمە لەلایەن سەرۆککۆمار نابێت، لەلایەن کەسانی ئایینی دەبێت. من دەمەوێت لەم ڕێگایە هاوکاری ئێوەبم.))
کۆمیتە بۆکەمکردنەوەی مەترسییەکانی بەرگریکردن لەیاسای پێشوو بەڵگەی بەهێزیان بۆپشتیوانی هەمواری یاسا کۆکردنەوە. پێویست بەبیروڕا نەبوو، پێویست بەحەقیقەتەکان هەبوو. کۆمیتەی ئامادەکار ئەم حەقیقەتانەی لەبەرهەمی یەکێك لەمامۆستایانی دیاری کۆمەڵناسی زانکۆی قاهیرە دۆزییەوە. لێکۆڵینەوە زۆربەباشی دەری دەخست هەرزەکاری گەنجەکان دەبێتە هۆکاری بەرزبوونەوەی تەڵاق لەمیسر. بەهەمان شێوە لەلێکۆڵینەوەکانی عەزیزە حوسێن یەکێك لەدامەزرێنەرانی ڕێکخراوی ڕێکخستنی خێزان لەمیسرو یەکەم ئافرەت کەدەبێتە ئەندام لەنوێنەرایەتی میسر لە نەتەوەیەکگرتووەکان. لێکۆڵینەوەی پاتۆلۆژی عەزیزە حوسێن بەڕوونی نیشانیدا کەرێژەی لەدایکبوون لەمیسر تەنیا بڕیاری بیمەی دڵنیایی ژن

لەبەرامبەر تەلاقە:ڕێژەی ٤٪ تەلاق لەنیوان ژنانی کەزیاتر لەچوار منداڵیان هەیە تاکو ٦٢٪ لەنیوان ژنانی تەلاقدراو کەمنداڵیان نەبوون. جێگای سەرسوڕمان نەبوو بۆچی ڕێژەی زاوزێ لەولاتی ئێمە لەسەرەوەیە. لەژێر یاسای باری کەسێتی، تەنیا پشتیوانی ژن لەبەرامبەر هاوسەری کەتەلاق نەدرێت بەردەوام زاوزێیوو.

کۆمیتە بۆئەوەی پشتراست بێت کەهیچ یەك لەم چاکسازیانە، دژی قورئانو حەدیسو شەرع نەبن بەوردی پێداچوونەوە. ئەندامانی کۆمیتە دەیانزانی کەنەریتخوازەکانی ئایینی، هەرچەند کەمینە بوون، کاریگەری زۆریان لەسەر چینی گەنج هەبوو. دەبێت لەشێوەی دەربڕین ئاگاداری وشەکانبن بەجوانی دەربڕینیان بۆبکرێت تاکو بەهەمان شێوە پەیڕەویکردن لەیاساکانی ئیسلامی زیاترین خزمەت پێشکەشی ئافرەتان بکرێت جگە لەلایەنی خۆپاراستن من بۆخێراکردنی پرۆژە یاسای چاکسازیی هەستم بەناچاری دەکرد. زیاتر لەهەمووشتێك داوای پاراستنی ئاسایش بۆژنانو منداڵەکانم دەکرد. دەمزانی ئەنوەر پشتیوانی لەهەوڵدانەکانی ئێمە دەکات. گەر دەرفەتێك بۆسەرکەوتن لەیاسای چاکسازیدا هەمان بێت، دەبێت لەسەردەمی سەرۆکایەتی ئەنوەر روویدابا.

کافر! دیکتاتۆر! کودیلە! دوژمنی خێزان! ئەمەیان چەند ناوێکبوون کەنەریتخوازنی ئایینی لەبەهاری ١٩٧٨، پێشکەشی ئێمەیان دەکردن. کۆمیتە ناوی پێشنیارەکانی بەراستی لەسەرخۆ پێشکەشو بلاویکردنەوە: دادگا بەمەبەستی هەوڵدان بۆچارەسەری ناکۆکی نیوان هاوسەرانی کەداوای تەلاق دەکەن، ناوبژیوانی بۆباشتربوون لەخزمان دیاری بکرێت، پێویستە هەردووکیان بەخێرا لەیەکەم رۆژی هاوسەری لەتەلاقدانی، پێویستە هەردووکیان بەتەواوکردنی هاوسەری لەنیازی خۆیان لەسەر بنەمای بواردان بەهاوسەری نوێ، سەبارەت بەم لایەنە، ماف بەلایەنیتر بدرێت بۆداواکردنی تەلاق لەنیوان دوانزدە مانگدا، مافی دایکی تەلاقدراو بۆبەدەستهێنانی بەخیوکردنی منداڵانی بۆکوڕ تاکو دەساڵیو بۆکچ تاکو دوانزدە ساڵی. دەبێت دادگا دیاری بکات بۆ بەرژەوەندی سەرپەرشتیکردن منداڵەکان، مافی ژنی تەلاقدراو لەبوارەکانی تایبەت نەك تەنیا بەوەرگرتنی خەرجی ژیان لەهاوسەری پێشووی بەلکو وەرگرتنی پارە بەقوناخێك بۆپێویستی بەدرێژایی ژیانی هاوبەش، ئەوەی لەهەموویان جێگای باسو گفتوگۆی زۆربوو، مافی ئافرەتبوو کەخانووی بۆخۆی بپارێزێت لەبەر منداڵەکانی.

ئەندامانی کۆمیتە دەیانزانی داواکانیان لەناو هەمواردا پێچەوانەی یاساکانی ئیسلام نین. یاسای کەماف بەپیاو دەدات چوار ژن بۆخۆی بێنێت خرایەژێر پرسیارەوە، چونکە ئەم دوولایەنە لەقورئاندا باسکرابوون نەدەگۆڕان. بابەتی شاهێدی دانی ژن لەبەرامبەر دادگا کەنیوەی شاهێدی پیاو هەژمار دەکرێ باس نەکرا.، چونکە ئەم لایەنە لەقورئاندا باسکرابوو. کێشەی مافی پیاو بۆهاوسەرگیری دووەم دەستبەجێ دوای بڕیاری تەلاق تاکو پشتراست بێت کەدووگیان نییە، بەلاوەنرا، چونکە ئەمەش لەقورئاندا هاتووە. هەموار لەپێشنیاری کەمافی پیاوە لەتەلاقدانی ژنی بەویستی خۆی باسی نەکرابوو، بەداواکاری ئێمە بۆهەموارکردنی ئەم لایەنەی سادە توفانێکی لەئاگر لەسەرتاسەری ولات هەلگرد.

یەکێك لەئۆقرە براوترین شێخەکانی نەریتخواز کەهەفتانە دوای نوێژی هەینی یاساکانی هەموارکراوی بەبادەدانو هاواری کردبوو:((ئەمانە"یاکساکانی خاتوو جیهانن"نەك یاساکانی ئیسلامی، جیهان ژن دەکاتە پیاو، پیاو دەکاتە ژن! ئەم یاسایانە دەبن بەهۆکاری هەلوەشانەوەی پێکهاتەی خێزان لەمیسر سەدان کەس بەرەو بێخودای دەبات! ئەم یاسایانە پێچەوانەی شەریعەتو قسەی خوان لەقورئاندا!))

هیچ کەسێك لەئێمە سەرمان لەقسەکانی شێخ سوڕنەمابوو. کاتێك من زانیم ئەم یاسایانە بەناوی ((یاساکانی جیهان)) ناویان دەرکردووە سەرم سوڕمابوو. یەکێك لەماموستایانی زانکۆ ئەمەریکی سەرقالی نووسینی کتێبێك دەبێت سەبارەت بەژنانی میسر دەیویست چاوپێکەوتن لەگەل مندا بکات یەکەم کەسبوو ئەمەیانی بۆباسکردم.

ڕۆژێکیان بۆی باسکردم:((دەمەوێت لەسەر یاساکانی جیهان لەگەل ئێوە گفتوگۆیەك بکەم.))

پرسیم:((یاساکانی جیهان؟ چ یاسایەکن؟))

بەسەرسوڕمان تەماشای کردمو گوتی:((نازانی؟ لەسەرتاسەری ولات هەموویان ئەم رستەیە بۆ یاساکانی پێشنیارکراوی باری کەسێتی بە"یاسانی جیهان" ناودەبەن.))

ئێستا من بووم کەسەرم سوڕمابوو بۆم باسکرد:((زۆرباشە جێگای سەربەرزییە بۆمن ئەگەر هیچ کارێکیترم نەکردبێت، ئەمەیان بۆمن سەرو زیادیە.))

زۆربەخێرایی هەموو ڕۆژنامەکان، گۆڤارەکان، دەنگوباسی تەلەفزیون راپۆرتەکان لەسەر "یاساکانی جیهان" بلاودەکرانەوە. شێخێکی زۆر بەناوبانگ دەگێرێتەوە لەسەر بنەمای یاساکانی ئیسلامی مەکتەبی حەنەفی باسدەکات:((خەرجی ژنو مندالەکان تەنیا مانگێك

دەدرێت، تەنیا بەمەرجێك زیاتر دەكرێت كەلەكاتی هاوسەرگیری باس كرابێت!)) ناكوك لەگەڵ قسەكانی شێخ عەبدولمنعەم نەمر، وەزیری ئەوقافو كاروباری ئایینی لەسەر بنەمای مەكتەبی شافعی ئەم بیرۆكەی رەتكردەوەو گوتی: ((دانی خەرجییەكان دەبێت پیاو پێشكەش بەهاوسەری تەلاقدراوی خۆی بكات تاكو كۆتایی.)) شێخێكی نەریتخوازیتر دەڵێت:((ژن ناتوانێت داوای تەلاق بكات، ئەگەر بەزۆریش هەڵسوكەوتی خرابی لەگەڵدا كرابێت.)) شێخ بیسار، شێخی مزگەوتی ئەزهەر لەوانەیە دیارترینو كاریگەرترین ئەندامی كۆمیتەی چاكسازییو هەمواركردن بێت لەرەتكردنەوەی ئەم قسەیەدا دەڵێت:((مەكتەبی مالكی دەڵێت ئەگەر ژن هەڵسوكەوتی خرابی لەگەڵدا بكرێت لەلایەن هاوسەری، چ بەقسە یان جەستە، دەتوانێت داوای تەلاق بكات. بێگومان ژیانی هاوبەش بەبێ رازیبوونی هەردوو لایەن زیانی زیاتر دەبێت.))

تاكو مانگی ئایاری ١٩٧٩، لەزۆربەی گۆڤارەكانی میسر لەسەر رازیبوونو ناڕازیبوون بلاودەكرانەوە. بەگەرمبوونی بابەتەكان، پاڵەپەستۆكان زیاتردەبوون. من وەك زۆربەی ئەندامانی كۆمیتە لەهەموو دەرفەتەكان بۆپشتیوانیكردن لەهەمواركردنی یاساكان وتارم پێشكەش دەكردن. نەریتخوازانی مەزهەبی دژە هێرشیان دەكردن. هەموویان ئێمەیان بەپێشێلكردنی قورئان تاوانبار دەكرد:((پێغەمبەری ئێمە گوتوویەتی پیاوان سەرپەرشتی ژنان دەكەن چونكە خودا یەكێكی بەسەر ئەویتردا زاڵكردووە.)) من بەرێنوێنییەكانی قورئان لەقەدەخەكردنی منداڵانی كچو دانی مافو خاوەندارێتی وەك خوێندن بۆژنان وەڵامی هەموویانم دەدایەوە:((پێغەمبەر لەموجاهیدەكانی چەسپاندنی مافی ئافرەتبوو.))

رۆژێكیان لەكاتی وتار پێشكەشكردنم سەبارەت بەپێویستی هەمواركردنی یاساكان لەخێوەتگەیەكی هاوینانی قوتابیان لەئەسكەندەرییە، لەناكاو خۆم گیرۆدەی گفتوگۆیەك لەگەڵ شێخێكی گەنجی نەریتخواز كرد. هەرچەند نەمدەویست و خەیاڵی ئەوەم نەبوو گفتوگۆی درێژی لەگەڵدا بكەم، بەڵام هیچ چارەیەكم بۆنەمایەوە، چونكە لەنیوان خەڵك رەخنەی لێگرتم.

شێخی گەنج هاواریكرد:((خاتوو سادات، چۆن دەڵێت پیاوێك ناتوانێت لەگەڵ زیاتر لە ئافرەتێك هاوسەر گیری بكات؟ ئەمەیان مافی ئێمەیە.))

وەلامم دایەوە:((ئێمە رێگری لەمافی ئێوە ناكەین. تەنیا دەمانەوێت هەندێك بەربەست بەلێنی هاوسەرەكان دادەنێن، چونكە وەك قورئان باسدەكات پاراستنی یەكسانی لەنیوان چەند هاوسەرێك بۆپیاو كارێكی زۆر دژوارە.))

شێخی گەنج پێداگری لەسەر قسەکانی خۆیکردو پرسی:((بۆچی ئەگەر من هاوسەری دووەم بۆخۆم بێنم دەبێت هاوسەری یەکەمی خۆم ئاگاداربکەم؟ ژن دەبێت فەرمانەکانم جێبەجێ بکات. ئەمەیان ئەرکی ژنە. کاتێك من خانووو پێویستییەکانی ژیانی بۆدابین بکەم لەئەمەیان زیاتر چی بۆبکەم.))

گوتم:((نە، ئەمانە وەك پێویست نین. بێگومان مافی خۆتانە دووبارە هاوسەرگیری بکەن، بەلآم ژنی یەکەم مافی ئاگاداربوونی هەیە. لەوانەیە بییەوێت لەئێوە جیاببێتەوە لەگەڵ کەسێکیتر هاوسەرگیری بکات.))

لەهەموو وەلآمدانەوەکانم قوتابیان چەپڵەیان دەکوتا. دەیانزانی هیچ یەکێك لەقسەکانم پێچەوانەی ئایینو شەریعەت نین. ئەگەر بەم شێوەیە نەبێت هاوسەرم هەموارکردنی واژۆ نەدەکردن، من خۆم بەهەمان شێوە.

دواتر بەردەوام شێخەکان لەنوێژی هەینی بەبێ ئەوەی ناوی کەسێك بێنن دەستیان بە خرابکردنی ناوی منو عایشەو ئامینە کردبوو:((ئەم ژنانەی کەبەدوای مافەکانی خۆیان کەوتوون هاوشێوەی ژنانی رۆژئاوا هەڵسوکەوت دەکەن، وەك پیاوەکان بۆهەموو لایەك دەسوڕێنەوە. شوێنی ژنی باشو موسڵمان تەنیا ماڵەوەیە.)) کەسانی توندڕەوی ئیسلامی سەرلەنوێی دەستیان بەنووسینی بابەتی درێژکرد لەسەر لاوازی سروشتی ژن. لەیەکێك لەبابەتەکان بانگێشەی ئەوەیان کردبوو ژنان زۆر راڕان تاکو بتوانن بەرپرسیارانە پەیڕەویی لەیاساکان بکەن. ئەگەر بۆژنێك باس بکرێت هاوسەری ئێوە ژنی دووەمی هێناوە بەبێ ئەوەی بیربکاتەوە بەخێرایی گیرۆدەی هەستەکانی جیاواز دەبێتەوەو دەستبەجێ داوای جیابوونەوە لەهاوسەری دەکات.

بەلآم ئەم کەسانەبوون کەوەك دەهاتە بەرچاو گیرۆدەی هەستەکانی خۆیان بووبن، لەکۆبوونەوەکان لەشوێنی خۆیان هەڵدەپەڕین تاکو بەهاوارکردن پشتیوانی لەکەسانی دژی ژن بکەن. هاواریان دەکرد:((ژن دەبێت لەماڵ بمێنێتەوەو خواردن ئامادە بکات، جلوبەرگەکان بشۆتو ماڵ خاوێن بکاتەوە، بەردەوام چاودێری منداڵەکان بکات. تەنیا ئەمەیان بکاتو بەس. بەهەشتی ژن ئەمەیە. ئەگەر ژنێك لەنیوان پیاوەکان کاربکات. لەسەر رێگای راستەقینەی دەچێت. نیشاندانی سەرو دەستو پێی گوناحو تاوانە.))

هێرشی ئەمانە ناوەڕۆکی ئەم کەسانەی نیشاندا لەکۆتایدا زۆر نائومێدانەبوو. چونکە وێنەیەك لەشێوەی پیاوەکان دەردەکەوت.

کێشەکە ئەوەندە گەرم بوو ڕۆژێکیان لەئەزهەر، ناوەندی مەرجەعییەتی ئیسلامی، تەقییەوە شۆڕش هەڵگیرسا. خۆپیشان دژی"یاسای جیهان"دەستی پێکرد، بەخێرا ئاڵۆزی دروستبوو. سەدان قوتابی کوڕ، جلوبەرگری درێژی عەرەبیو عەڕەخشە بەنیشانی ئیمان لەسەریان نابوون، دەستیان بەخۆپیشاندان کرد لەدەوروبەری زانکۆ هاواریان دەکرد:((یەك! دوو! سێ! چوار! ئێمە یەك! دوو! سێ! چوار! هاوسەرمان دەوێن.)) وەك دەهاتە بەرچاو بۆئەمانە بچوکترین گرنگی نەبوو کەئێمە مافی پیاوانمان لەبەرامبەر بەرپرسیارەتی هاوسەرایەتی رەخنەمان لەهەڵسوکەوتیان گرتووە. هەستو گەرمی مەزهەبی کەسانێك کەخۆپیشاندانیا دەکرد لەراستیدا هیچ حەقیقەتێکی لەناودا نەبوو. کاتێك خۆپیشاندەران ڕژانە سەرشەقامەکان، پۆلیس ناچاربوو کەسانی هەڵخرۆشاو بڵاوەیان پێبکات.

منو ژنانیتر کەبۆچەسپاندنی یاسا تێکۆشانمان دەکرد نامەی پشتیوانیو دژایەتیکردن بەدەستمان دەگەیشتن. ئامینە سەعید بۆی باسکردم چانتایەکی گەورەی نامەکانی پڕ سوکایەتی بەدەستم گەیشتوون. هەڕشەکردن لەمنو ئامینە ببوو بەکارێکی زۆرئاسایی چاو گویچکەکانم پڕبوو لەم قسەلۆکانە گرنگیم بەم لایەنە نەدا. هەموو هەوڵەکان دژی ئێمە بیری بەرتەسکبوون. لەناو زانکۆ وێنەکانی منیان وەك کاریکاتۆر بەجلوبەرگی سەربازی دەکێشا. قوتابیانی لایەنگری مافی ئافرەت ئەم وێنانەیان کۆدەکردنەوە دیسان وێنەیەکیتریان هەڵدەواسی.

ڕەخنەکانی کەلەدۆستو هاوڕێیان بەدەستم دەگەیشتن بەهەمان شێوە بیرۆکەی کوربینانەو بەرتەسکبوون. کاتێك من لەکۆبوونەوەکان بەشداریم دەکرد پیاوەکان بانگیان دەکردم بۆیان باس دەکردم ئێمە لەگەڵ یاساکانین کەگۆڕانیان بەسەردا بێت بەڵام دژی فلانە برگەی یاسان: خانوو ببێتە بۆژنو منداڵەکان. لەشارێکی قەڵەباڵغی وەك قاهیرە دۆزینەوەی خانوویەك بۆژیان وەك دۆزینەوەی گەوهەرێکبوو. بەڵام کێشەی پیاوەکان بۆپاراستنی ئارامی خۆیانبوو کەگوایە پێوەری دوولایەنەبوو لەناو کۆمەڵگەی ئێمە هەموو پیاوەکان لایەنگریان دەکرد. من ئەمانە سەرکۆنە دەکەم: ((ئێوە دەزانن کەهیچ کەسێك بۆئافرەتێکی سەرگەردان لەسەر شەقامەکان

ڕێزیان نییە. ئێوە پیاون دەزانن لەهەمووشوێنێك دەتوانن بخەون. بەڵام ژن‌و منداڵەکانتان ناتوانن.))

پیاوەکان زۆرجار لەسەر ئەم لایەنەی یاسا گاڵتەیان لەگەڵ مندا دەکرد، من دەمزانی لەناخیاندا بەهیچ شێوەیەك گاڵتە نەبوو. هەمووکاتێك بەپێکەنین دەیانگوت:((خاتوو سادات، چ کارەساتێك بەسەرمان دێنیت؟ ئێستا ئێمەین کەبەدوای مافی خۆماندا بگەڕین.))

من بەپێکەنین‌و بەشێوەیەکی شیرین وەڵامی ئەم پیاوانەم دەدایەوە:((پێویست ناکات بەدوای مافی خۆتان بگەڕێن، هەزاران ساڵ دەبێت ئێوە ئەم مافەتان هەیە. ئێستا نۆرەی ئێمەیە.))

ئەنوەر کەم تاکو زۆر پێداگری دەکرد کارەکانی گرنگتر لەیاسای مافی ئافرەت بوونیان هەیە بۆمیسر بکەین. لەماڵەوە من بەتەنیایی تێکۆشانی خۆم دەستپێکردبوو. لەساڵی ١٩٧٧و دووبارە لەساڵی ١٩٧٨ پرسیاری لەمن کرد:((بۆرۆژی لەدایکبوونت چیت دەوێت؟))

وەڵامم دایەوە:((مافی ئافرەتان.))

وەك جاری جاران:((بۆرۆژی دایك چیت دەوێت؟))

وەڵامی من پێشبینکراو بوو:((مافی ئافرەت.))

بەردەوام گلەیم لەئەنوەر دەکردن، بێگومان من دەمزانی وەك من بەتەواوی ژنانی میسر دەبێت یەکسانی خۆیان بەدەست بێنن. هەمووجارێك کەئەنوەر لەگەڵ من‌و ڕاگەیاندنەکان گفتوگۆی دەکرد، بەسوود وەرگرتن لەدەرفەتەکان تەنگەتاومان دەکرد.

دواتر بەگۆڕان بۆی باسکردم:((جیهان، لەمیسر دیموکراسی بوونی هەیە. من کارێك دەکەم کەخەڵك داوابکات.))

پاڵەپەستۆی زیاترم دەخستە سەری:((ئەنوەر زیاتر لەنیوەی دانشتوانی میسر ئافرەت پێکدێنن. تاکو ئەوکاتەی کەئافرەتان بەڕادەی پیاوان ئازاد نەبن، میسر نابێتە وڵاتێکی دیموکراسی. تۆ وەك ڕێبەری وڵات ئەرکە ئەمەیان جێبەجێ بکەیت.)) لەهەرشوێنێك کەئەنوەر وتاری پێشکەش دەکرد بوونی پرسیارەکان لەسەر یاسای پێشنیارکراوم لەناو خەڵك هەڵدەخرۆشاندن، ئەوکات داواکاری مافی ئافرەت زیاتر دەبوو، کاردانەوەکانی ئەنوەر زیاتر دەبووم. لەیەکێك لەکۆبوونەوەکانی سیاسی لەقاهیرە لەڕێگای یەکێك لەپاسەوانەکانم نووسراوێکی بچووکم بۆ ئیمتحال ئەدیب، یەکێك لەئەندامانی دیاری بزوتنەوەی ئافرەتان، کەلەوبەری هۆلی کۆبوونەوە دانیشتبوو ڕەوانەکرد:((پرسیار لەسەرۆککۆمار بکە ئەگەر بەئێوە

بگوترێت ٩٠٪ گەنجانی هەرزەکار تاوانبار لەم ولآتانە لەخێزانەکانی تەلآقدراون، ئایا هەموارکردنی یاساکانی کەپێگەی خێزان بەهێز دەکەن‌و دەرفەتی تەلآق کەمتر دەکەن، دەخەیتە بەرچاوی خۆت؟ کاتێك ئیمتحال ئەم پرسیارەی ئاراستەی سەرۆککۆمار کرد، پێش ئەوەی ئەنوەر وەلآمی بداتەوە، بەچاوەکانی نێوانی من‌و ئیمتحالی دەپێوا.

هەوڵدانەکانی خۆم لەدەرەوەی ولآت بەهێزتر کردن. رۆژی چاوپێکەوتنی ئەنوەر لەگەڵ قوتابیانی میسری لەئەمەریکا نامەیەکی بچووکم بۆدکتۆر عەفاف، بالیوزی میسر لەواشنتۆن رەوانەکرد لەم سەری هۆڵ دەستبەدەست گەیشتە دەستی. بۆم نووسیبوو: ((سەرۆککۆمار سادات، ژنان‌و مندالآنی میسر لەنائەمنی سەرچاوەگرتوو لەیاسای نایەکسانی پەسەندکراوی ساڵی ١٩٢٩ لەئازاردان. ئەگەر ئافرەت هەست بەئەمنییەت بکات، خێزان کەبەشی سەرەکی کۆمەڵگەیە لەئەمنییەت دادەبێت. کاتێك دەست بوو چارەسەری چارەسەرکردنی مافی ئافرەتان چارەسەر دەکەیت کەلەناو هەمان هەلومەرجی ناجێگیرو نایەکسانی خێزانی میسر بێتەدەرەوە؟))

ئەنوەر دەستبەجێ پرسیاریکرد:((جیهان لەکوێیە؟)) لەناو کەسانی ئامادەبوو بەدوای روخساری من دەگەڕا.

بەزەردەخەم بۆکرد تاکو ئاگاداری نیوانی من‌و دکتۆر عەفاف بێت. بەلآم ئەنوەر هەڵنەخەلآتا.

پێکەنین‌و رووی لەئامادەبووان کردو گوتی:((هاوسەرم بووتە بەپارێزەری ئافرەتان، بەردەوام گلەیی لەمن دەکات‌و داوای مافی ئافرەت دەکات. زۆرباشە، بەلێنی وەفاداری بێت. بەلآم ئێستا نا، ئێستا کاتی خواردن‌و دابینکردنی شوێنی حەوتنەوەو قوتابخانەو خزمەتگوزاری پزیشکییە بۆخەڵك. بێگومان باس لەمافی ئافرەتان دەکەین، بەلآم ئێستا نا.))

لەوانەیە ئەنوەر هۆکارەکانیتری هەبووبێت. بەلآم لەکاتی تێکۆشان بۆ چاکسازیی‌و هەموارکردنی یاسا من کاتم نەبوو. بۆپەیامنێرەکان ئاشکرابوو بەتایبەتی لەئەمەریکا کەبەردەوام بەدوای یەکتر پرسیاریان ئاراستەی من دەکردن:((ژنان لەناو ئیسلامدا چ مافێکیان هەیە، ئەگەر مافێك لەئارا دابێت؟ ئایا راستە کەپیاو بەگوتنی من تۆ تەلآق دەدەم تەلآق دەدرێت؟ ژنان چ هەستێکیان بەرامبەر هاوسەرگیری ناچاری هەیە لەگەڵ پیاوێکدا کەدایك‌و باوکی هەڵدەبژێرن؟ لەچاوپێکەوتنەکانی نیوکاتژمێری چەندینجار ئەم پرسیارە دووبارە دەکرایەوە، بەردەوام وەلآمم دەدایەوە تاکو ئەوشوێنەی کەقورگ‌و بیرم وشك دەبوون. بەلآم

دەرفەتەکانی کەبۆ شیکردنەوەی کۆمەڵگەی ئێمەو پێشوەبردنی ئامانجمان بۆژنان لەدەست دەڕۆیشت.

لەم لایەنەوە ئەنوەر لەدەستی من ئاسوودە نەدەبوو. ژمارەی ژنان لەناو هەموو ئاستەکانی حکومەت وەك پێویست نەبوو لەئەنجام زۆر لەبابەتەکانی گرێدراو بەئافرەت لەبەرچاو نەدەگیران. لەکاتی هاوکاریم لەئەنجوومەنی پارێزگای منوفییە، هەستم پێکرد کەئێمە پیویستیمان بەئافرەت هەیە، بەنوێنەرایەتی ئافرەتان زۆر لەئافرەتان توانیان لەئەنجوومەنی پارێزگاکان کورسی ئەنجوومەن بەدەست بێنن. بەهاوکاریکردن لەگەڵ چەند ئافرەتێك لەپەرلەمان هەستم پێکردبوو کەئێمە لەسەر ئاستی نیشتیمانی پێویستیمان بەژنانی زیاتر دەبێت لەناوحکومەت. لەسەفەری ساڵی ۱۹۷٦ لەگەڵ ئەنوەر بۆسودان، ئاگاداربووم کەهەندێك لەکورسییەکانی پەرلەمان بۆئافرەتان دیاریکرابوون. بۆ ئەنوەرم باسکرد:((ئەگەر لەسودان ئەوەندە رێز لەئافرەت بگیرێت بۆچی تۆ لەمیسر ئەمەیان ناکەیت؟ ئێمەی نیوەی میسر پێکدێنین. ئێمەش دەبێت نوێنەرانی زیاتر لەسەر ئاستی سیاست داڕێشتن دامەزرێنین.))

ئەنوەر رازیبوو لەم لایەنە گوتی:((نوێنەرایەتی زۆر لەگروپەکان دەبێت دیاری بکرێت‌و پشتیوانی بکرێن ئێستا جوتیاران نوێنەری خۆیان لەناو حکومەت هەیە، بەلأم گەنجان‌و قوتابیان چۆن؟))

لەگەڵ ئەنوەردا هاوڕابووم:((ئەمانە دەبێت خاوەنی کورسی خۆیانبن، بۆچی بەشێك لەکورسییەکان بۆگەنجان‌و ئافرەتان تەرخان نەکرێن؟))

لەمانگی مارسی ئادار ساڵی ۱۹۷۹، رۆژی دایك نزیك دەبوو. بەهاوسەرم گوت: ((ئەنوەر ئەمساڵ تەنیا هیوای دیارییەکی زۆر تایبەت دەکەم، دیارییەك کەزۆر پێم خۆش دەبێت وەریبگرم.))

پرسی:((چ هیوایەك؟))

زمانم لاڵبوو، پرسیم:((پێشکەشم دەکەیت؟))

پێکەنی گوتی:((ئەگەر لەتوانای من دابێت.))

گوتم:((بەڵێ ئەمجارەیان دەتوانی.))

هەناسەیەکم هەڵکێشاو گوتم:((مافی ئافرەتان.))

زۆر پێکەنیو هاواریکرد:((بەڵێ، جیهان، بەڵێ، ئەمساڵ ساڵی وەفاکردن بەبەڵێنەکانە، ژنان شایستەیی خۆیان هەیە.))

لەبیستی حوزەیرانی ١٩٧٩، ئەنوەر دوو فەرمانی لەفەرمانەکانی سەرۆککۆماری بۆبابەتی ئافرەت تەرخانکرد، دەبێت لەناو پەرلەمانی میسر سی کورسی بۆئافرەت لەبەرچاو بگیرێن، ٢٠٪ کورسییەکان لە٢٦ ئەنجوومەنی پارێزگا لەتەواوی میسر، ئەنوەر لەهەنگاوێکی بوێرو ئازایانە ژمارەی ژنانی لەسەر ئاستی گشتی حکومەت پێنج بەرامبەرکردو ژمارەی ژنان لەئەنجوومەنی دارێشتنی سیاسەت لەناوچەکانی گوندنشین لەحەوت کەس کرد بەسی کەس. لەهەشت ساڵ تەنیا دوو ئافرەت لەناو ئەنجوومەنی پارێزگای منوفییە ئەندامبوون، ئێستا ژمارەیان دەگەیشتە ١٠ ئەندام.

فەرمانی دووەم لەخواستەکانی دڵم زۆر نزیکبوو:بڕیاردرا یاسای باری کەسێتی لەمانگی تەمووز لەناو پەرلەمان بخرێتە دەنگدان.

هیچ شتێك نەیدەتوانی خوشحاڵی من کەم بکاتەوە، بەڵام تاکو ئەوکات رێگرییەکیتر هەبوو بۆتێپەڕکردن: دەنگدان لەناو پەرلەمان. ئێمە لەپشتیوانی خۆمان پشتراست بووین، دەمانزانی هەمواری بارکەسێتی لەناو پەرلەمان بیروباوەڕی زۆرینەی ئەندامان دەبێت. بەڵام ئەم دەنگدانە دەرفەتێکی بۆنەریتخوازەکان دەرەخساند کەلەئێمە بسورێنەوە. ئێمە دەبێت پێش نەریتخوازەکان لۆبیمان لەناو پەرلەمان دروست دەکرد تاکو نەتوانن گفتوگۆکانی ناو پەرلەمان درێژەی پێی بدەنو کاتێکی باشتریان لەبەردەست بێت کەلایەنگر بۆخۆیان زیاتر بکەن. عایشە چاوی بەهەموو ئەندامانی ئافرەت لەناو پەرلەمان کەوتو نەخشەیەکیان دارێشت.

پێشنیار دەکات:((کاتێك ئەندامانی نەریتخواز لەدژایەتیکردنی پێشنیاری هەموارکراو داوای وتاری پێش دەستور دەکەن، ئێوە تەنیا قسەیەك نەکەن. رێگانەدەن بەسوود وەرگرتن لەدوو لایەن لەهەمان بگرەوبەردەکانی کۆنی مەزهەبی بابەتی جیاوازی نیوان ژنو پیاو بێتە ئاراوە. رێگا بەئەندامانی پیاوی پشتیوانی هەمواری یاسا بدەن قسەی خۆیان بکەنو بەرگری لەم یاسا بکەن. لەلایەن سەرنج راکێشانی خەڵك زۆرباشتر دەبێت کەببینن ئەمجارەیان پیاوەکان لەگەڵ ئێمەدان، نەك دژی ئێمە.))

رۆژی دەنگدان منو عایشە هەناسەمان بڕابوو. ژنانی ئەندام پەرلەمان زمانی خۆیان گرت. لەرۆژی سێیەمی تەمووزی ١٩٧٩، دوای چوار کاتژمێر گفتوگۆی پڕاوپڕ لەکێشە هەمواری یاساو بەشی نوێی ئافرەت لەناو کاروبارەکانی حکومەت، بەزۆرینەی دەنگ پەسەندکرا.

رۆژی دواتر ئافرەتانی ئەندام پەرلەمان بۆجەژن گێڕان سەردانی ماڵی ئێمەیان کرد. یەکترمان لەباوەش دەگرتو هاوارمان دەکرد:((ئێمە مێژوومان دروستکرد، ئێستا ژێر دەستەنین.))

یەکێك لەئەندامانی پەرلەمان گوتی:((زۆرم پێی باشبوو من لەناو هۆڵی پەرلەمان چەند قسەیەکم کردبان بەڵام گوێگرتن لەپیاوەکان کەچۆن بەرگریانی لەمافی دایكو خوشكو کچانی خۆیان دەکرد زۆرباشتربوو.))

گەورەترین هیواکانی بەدەستهاتبوون ، ئومێدی زیاتر بەرێوەبوون. لەهەڵبژاردنەکانی گشتی کەدوای دیاریکردنی رێژەکان بەرێوەچوو سی کورسی بۆئافرەتان جێگیرکرانو گەیشتن بەپەرلەمان. زۆرکەس لەرۆژئاوا وڵاتی ئێمەیان بەدواکەوتوو هەژمار دەکرد، ئێستا لەناو ئەنجوومەنی سیاسەت دارێشتن، ٥٪ زیاتربوو لەکۆنگرێسی ئەمەریکا، ١٠٪ زیاتربوو لەپەرلەمانی فەرەنسا کەئەندامی ئافرەت لەپەرلەمان بوونیان هەبوو.

ئافرەتانی میسر لەکۆتاییدا دەنگی سیاسی خۆیان بەدەستهێنا. لەژیانی تایبەت زیاتر پارێزراو بوون. لەساڵی یەکەمی جێبەجێکردنی ئەم یاسایە رێژەی تەڵاق بۆ٢٥٪ دابەزی کەبەباوەڕی گروپەکانی ئافرەتان، لەبەر هۆکاری کەپیاوەکان نەیاندەویست خانووی خۆیان لەدەست دەربچێت. لەنیوانیاندا بەپێی یاسای نوێ کەتوانی خۆی تەڵاق بدات هەمان ژنی گەنجبوو کەبەردەوام لەشوێنەکانی گشتی بەدوای مندا دەگەڕاو داوای هاوکاری دەکردو من نەمدەتوانی بەهەمان یاساکانی پێشووتر هاوکاری بکەم. هیوادارم دووبارە بتوانێت ژیانی هاوبەش دروست بکاتو خۆییو کچی بچوکی بەختەوەرین کەبەراستی تواناو لێهاتووی بەختەوەری زیاتری هەبوو.

هەمان یاسای هەموارکراو تاکو ماوەیەکی درێژ گفتوگۆی لەسەر دەکرا بەیاساکانی جیهان ناوی دەهات، کاریگەری خۆی لەسەر تەواوی جیهانی عەرەب کرد. جاری کۆتایی کەبۆ زیارەتی کعبە رۆیشتم بۆمەککە، ژنێکی سعودیا خۆی لەمن نزیکرد ئەوەی کەمنو ژنانی میسر سەبارەت بەمافی هەمووژنانی عەرەبکردمان، زۆر بەنەرمیو لەسەرخۆ سوپاسی کردین. لەهەمان سەردەم

حکومەتی سعودیاو زۆر لەولاَتانی عەرەبی پەیوەندی خۆیان لەگەڵ میسر بڕیبوون. بەلاَم هەوڵدانەکانی هاوسەرم بۆمافی ئافرەتانو پاراستنیان گەورەترین ڕێزی هەبوو.

هاوسەرم ئازایەتی زۆری لەخۆی نیشاندا. لەساڵی١٩٧٩ فەرمانی سەرۆکایەتی بۆتواناو پێگەی ئافرەتی دەرکرد. نەریتخوازانی سیاسی لەئێران حکومەتی شای ئێرانیان ڕووخاندو شای ئێرانیان بۆدەرەوە ڕەوانەکرد. توانای نەریتخوازانی سیاسی لەناو حکومەت گەشەیان کردبوو. بۆئەنوەر بەرزکردنەوەی پێگەی ئافرەت لەمیسر، لەبەرامبەر هەلومەرجێکی لەم شێوەی سیاسی کۆنەپەرستانە هەوڵدانێکی بوێرو ئازا بوو، بەلاَم ئەنوەر هیچ کاتێك لەخستنەواری جێبەجێکردنی چاکسازییەکانو پێشەنگ بوون لەسیاسەتەکانی کەزۆربەی ڕێبەران دووریان لێدەکرد شانی دەدایەبەر. ئەنوەر کەسێك نەبوو بۆرازیکردنی ویستەکانی سیاسی یان بەدەستهێنانی لایەنی بیروباوەڕی خۆی بکاتە قوربانی بەرژەوەندییەکان. ئەنوەر لێڕوانینی بۆدروستکردنی دیموکراسی لەمیسر، یان تێکۆشانی بۆکۆتایی هاتن بەکێشەکان، خۆی لەهیچ دەستەوەردانێك نەدەپاراست.

له١٩٧٩، ئەنوەر دەستی بەتێکۆشانێکی بوێرانەی نوێکرد. ئەمەیان لەدووساڵ پێش تەنیا بەسەفەرێك، بەلاَم سەفەرێکی تایبەتی دەسپێکرد. لەم سەفەرەی تایبەت من هاورێیەتیم نەدەکرد، بەتەنیایی ڕۆیشت. بەلاَم هاوسەرم بەبێ ئەوەی گوێی بداتە مەترسی گەورەی کەدەمزانی بەرامبەری دەبێتەوە، بەدوعاوی خێری منو دوعای خەڵك دەستی بەسەفەری خۆیکرد، لەهەرشوێنێك دەبوو هیوای ئاشتیبوو. ئەگەر لەم کارەی سەردەکەوت، مێژوویی میسرو تەواوی ڕۆژهەلاَتی ناوەڕاستی دەگۆڕیی.



## بەشی دوانزدەهەم

## رێگای ئاشتی

کاتێك کەهاوسەرم ویستی خۆی بۆرۆیشتنی ئورشەلیم (قودس) بۆئاشتی لەگەڵ ئیسرائیل رایگەیاند، دەمزانی لەسەری دەکوژرێت، نەمدەزانی مەرگ لەکام کاتو ساتو شوێن دێتەسەری یان بەدەستی چ کەسێك دەکوژرێ. تەنیا دەمزانی کەژمارەی پێچەوانەی رۆژانی ژیانی منو هاوسەرم لەم هەسارەیی خاکی دەستی پێکردووە. لەهەمان سات بەدواوە لەتشرینی دووەمی ١٩٧٧ تاکو کاتی تیرۆرکردنی سەرنێشەی کەساڵانێکبوو ئەسیری کردبووم بوو بەهەمیشەیی تەنیا رۆژێك بەبێ ئەم سەرنێشەیە تێپەڕم نەکرد.

پێش سەردانی ئەنوەر بۆقودس تەنیا چەند کەسێك هەواڵی سەردانیان دەزانی. من یەکێك لەم ژمارە کەسانەبووم. ئەگەر ئەنوەر ئەم بڕیارەی لەگەڵ مندا باس دەکرد، سەدا سەد رازی دەبووم. دەمزانی لەکۆتایدا بەنەرخو بەهای گیانی تەواو دەبێت، بەڵام دەمزانی رێگای ئاشتی لەگەڵ ئیسرائیل تەنیا رێگایەکبوو کەبەرووی میسردا کراوەبوو.

لەشەڕی داهاتوو هیچ دەسکەوتێکی بۆئێمە نەبوو. ئیسرائیل دەیتوانی بیابانی سینا، ناوچەی زیخەڵانی بیابان نشین بخاتە ژێر فەرمانڕەوایی خۆیی، بەڵام ئیسرائیل، وڵاتێك بەژماری دوو ملیون کەس، هیچ کاتێك نەیدەتوانی وڵاتێکی چل ملیونی وەك میسر داگیربکات. لەهەمان کات، ئێمەش، ئەگەر هێزەکانی ئێمە دەگەیشتن بەتل ئاویو، نەماندەتوانی ئیسرائیل داگیر بکەین.

چونكه ئەمەریكا رێگر دەبوو. ئەنوەر چەندینجار باسیكرد:((شەڕەكانی بەردەوامی بەدوای یەكتردا لەگەڵ ئیسرائیل گەوجییە، براوی تێدا نییە.))
ئەنوەر لەساڵی ١٩٧٣ بەمەبەستی ئاشتیكردن شەڕی لەگەڵ ئیسرائیل كرد. هیچ چارەیەكیتر نەبوو. بەردەوام دەیگوت تاكو ئیسرائیل بەئەنجامێك نەگات كەمیسر وەك ئیسرائیل دەتوانێت هەمان كارەسات بەسەریان بێنێت كەئەوان بەسەری ئێمە دێنن، ئاشتی لەگەڵ ئیسرائیل جێبەجێ ناكرێت. سەركەوتنی سەرسوڕهێنەری ئێمە لەشەڕی ١٩٧٣، پێش دەستوەردانی ئەمەریكا، ئەم بیروباوەڕەی ئەنوەر دروست دەردەچوو. دوای ئەم شەڕەبوو كەتوانی بەئیسرائیل رابگەیێنێت ئێمەش بوونمان هەیە، لاوازنین. ئێستا وەرن پێكەوە دانیشین. دواكەوتن باش نەبوو.
دڵی ئەنوەر لەناو داماوی میسربوو. دەیوویست قوتابخانەو نەخوشخانەو ناوەندەكانی پێشەسازییو دەرفەتەكانی نوێ دروست بكات، بەڵام نرخی هەمووشتێك بەرەو هەڵكشانبوو. سیاسەتی ئابووری كراوە، راكێشانی كۆمپانیاكانی بیانی بەرژەوەندی نوێی بۆمیسر دروست دەكرد. بەڵام خەرجی ژیانی رۆژانە بەردەوام هەڵدەكشا. ژمارەی كەسانێك كەنەیاندەتوانی خانوویەك بۆخۆیان دەستبەر بكەن یان زكی منداڵانی خۆیان تێربكەن زیاتر دەبوو. لەساڵی ١٩٧٧، قەرزەكانی دەركی سەر میسر گەیشتن بە پانزدە ملیارد دۆلار. وڵاتی ئێمە لەناو كێشەیەكی گەورەی دارایی بەسەر دەبرد كەهیچ كۆتایی دیارنەبوو. چوار شەڕ لەگەڵ ئیسرائیل بۆ ئەوكات نەرخی دەگەیشتە ملیاردها لیرەی میسری، لەبەر مەترسییەكانی ئیسرائیل ئەنوەر ناچاربوو یەك لەسەر سێی بودجەی گشتی ساڵانەی وڵات، لەجیاتی خەرجی خزمەتگوزاری بۆخەڵك بكرێت بۆكاروباری بەرگری خەرج دەكرا. بەهای ئەم شەڕانە لەلایەن زیانی گیانی، زۆر گەورەبوو. هەزاران میسری گیانی خۆیان بەختكرد، خاكی ئێمە لەژێر دەسەڵاتی داگیركاری دابوو.
بۆكۆتایی هێنان بۆكێشە تێك هەڵكێشراوەكانی بەڵاێدراو، كەسێك بۆچارەسەری دەبێت هەنگاوی یەكەم هەڵگرێت. كاتێك بینیم ئەم كەسە هاوسەری منبوو، بەهیچ شێوەیەك سەرسوڕماو نەبووم.
رۆژی نۆیەمی تشرینی دووەم برێك درانگتر لەجاران لەخەو هەستام. دەبێت پێش رۆیشتن بۆژووری ئەنوەر لەخەو هەستێنم بەپەلە وانەكانی زانكۆم تەواو بكەم.

پەردەی پەنجەرەم لاداو گوتم:((بەیانی باش .))

وەلأمی دایەوە:((بەیانی باشتر.))

رۆژنامەی بەیانیم پێدا، ئاگاداری ئارامی روخساری بووم. گوتم:((باش خەوتی؟))

وەلأمی دایەوە:((زۆرباش.)) چاوەکانی روونبوون نیشانەیەك لەئالۆزییو باگرتوویی لەچاوەکانو خراب خەوتنی بەدیار نەدەکەوت.

دەموویست لەنزیکی بمێنمەوە، خواردنی بەیانی پێکەوە بینو پێکەوە بەبابەتەکانی رۆژنامەدا بچینەوە. بەلأم لەبەرنامەکانی خۆم دواکەتبووم. گوتم:((ئەم شەو زوو ناگەڕێمەوە، کۆبوونەوەیەکی گرنگم لەگەڵ ئافرەتان هەیە.))

ئەنوەر بەگاڵتەگوتی:((سەری خۆت قەڵەبالغ کردووە جیهان، من ئەمڕۆ جگە لەپێداچوونەوەی وتاری کرانەوەی نوێی پەرلەمان هیچ کارێکم نییە.))

من بەهەمان شێوەی گاڵتە گوتم:((خۆزگە بەخۆت زۆرباشە سەرقاڵی بیرکردنەوەت کەمترە، خودا بتان پارێزێت.))

ئێوارەی هەمان رۆژ لەرێگای رۆیشتن بۆکۆبوونەوەی رێکخراوی ژنان لەناو ئۆتۆمبێلّ خەریکی نەخشەی بەرزە پردێکی نوێبووم کەهەوڵم دابوو بودجەی لەپارێزگای منوفییە دەستەبەر بکەین. ئۆتۆمبێلی من وەك مێروڵەکان لەناو قەڵەبالغی قاهیرە بەرەو پێشەوە دەڕۆیشتو من هەوڵمدا بۆبینینی سینەماو چێشتخانەکانی سووتاوی دەمانگی رابردووی شۆڕش وێرانکرابوون، خەمباری نەمگرێ. حکومەت بەئامۆژگاری سندووقی نیودەوڵەتی دراو لەکانوونی دووەمی ١٩٧٧، بڕینی هاوکاری حکومەت بۆهاوولأتیان وەك خۆراکی سەرەکی نان، گۆشت، شەکر، برنج، سابوون دەرکردبوو. چونکە لەلایەنی لێکدانەوەی بەشی ژمێریاری راگرتنی ئەم هاوکاریانە هەنگاوێکی عەقلأنیبوو: ئەم هاوکاریانە ساڵانە ملیارێك دۆلار خەرجی بۆحکومەت زیاد دەکرد. بەلأم بۆملیونان میسری کەبۆتێرکردنی زکی خۆیان، پشتیان بەم هاوکارییە دەبەست، بڕینی زوڵمێکی زۆریان لێدەکرا.

بەخوێندنەوەی لاپەڕەی یەکەمی رۆژنامەی ئەهرام لەهەژدەی کانوونی دووەم هەستم دەکرد گیرۆدەی کێشە دەبین. هاوکارییەکانی وەك چا راگیرا، نرخی شەکرو برنج هەڵدەکشایە سەرەوە! نرخی قلینەی غاز گەیشتە ٩٥ پیاستر! بەلأم ئەوەی کەچاوەڕێمان نەدەکرد ئەنجامی ئەم کێشانەبوو. لەئەیوانی خانووی خۆمان لەجیزە دوکێل لەناو قاهیرە بەرز

هەڵدەکشا. دوعام دەکردن ئەنوەر لەناو قاهیرە بێتو بۆپێشوازیکردن لەمارشاڵ تیتۆ، سەرۆککۆماری یوگسلاڤیا نەرۆیشتبێت بۆئەسوان. بەنیگەرانی پەیوەندیم بەنووسینگەی فەوزی عەبدولحافز سکرتێری ئەنوەر کرد: ((ئەمەیان چییە روودەدات؟))

فەوزە گوتی:((دوکانەکانو یانەکانی ناوەندی شارن لەجادەی ئەهرام. خۆپیشاندانی هێمنانە دژی بڕینی هاوکارییەکان گۆڕا بۆشۆڕش. ئاژاوەگێڕەکان خەڵکیان بۆئاگر تێبەردان هاندا.))

دووبارە گەڕامەوە بۆئەیوانی ماڵەکەمان، دەنگی تەقینەوەی بەدوای یەکی ئۆتۆمبێلو دوکانەکان دەهات. ئەم دەنگە بەرزانەی تەقینەوەکان بیری گەڕاندمەوە بۆشۆڕشی ئاگر تێبەردانی گەورەی قاهیرە لەساڵی ١٩٥٢. ئەوکات هیچ کەسێك بەشێوەیەکی دروست نەیدەزانی چ کەسێك هۆکاری ئەم توندوتیژیی خەڵکن، بەڵام ئەمجارەیان من گومانم لەکۆمۆنیستەکان هەبوو، دژی سیاسەتی ئەنوەر بۆکرانەوەی میسر بەرووی جیهانو هاتنی سەرمایەیی بیانی بەردەوام دەبوون. دوکانەکانی کەکاڵای بیانیان دەفرۆشت یان خزمەتگوزاری گەشتیاریان پێشکەش دەکرد، زیاترو زیاتر دەکەوتنە بەرهێرشی سووتان. تەماشای تەلەفزیونم دەکرد بەردەوام لەنیوان بیست خولەك پەیوەندیم بەنووسینگەی ئەنوەر دەکرد. شۆڕش گەیشتە ئەسوانو ئەسکەندەرییە. شوێنەکانی کەخەڵکی تووڕە بەنیشانەکانی سەرمایەیی رۆژئاوایان دەزانیو توانای کڕینیان نەبوو، ئاگریان تێبەردەدا.

خەڵك دروشمیان دەگوتەوە:((سەرداری پەڕینەوە، خواردنی ئێمە کوا؟))، ((جیهان، جیهان، خەڵك برسین.)) شۆڕش سێ رۆژ بەردەوامبوو زیاتر لەسەد کوژراو بریندادی لێکەوتەوە. مەلیکە عالییە لەئوردن پەیوەندیکردو گوتی ئێوە باشن؟ ئێمە زۆر نیگەرانی ئێوەین. مەلیکە فەرەح لەپاریس پەیوەندیکردو گوتی خوزگە بەخێرایی تەواو دەبوو دڵی ئێمە لەلای ئێوەیە. سوپاسگوزاری هاوسۆزیانبووم. بەڵام لەهەمان کات وێنەکانی نائارامی میسر کەبەشتێکی زۆربچووك دەستی پێکرد، لەتەواوی دونیا بڵاو دەکرایەوە. زۆر ترسام.

شۆڕش بوو بەهۆکارێك کەمارشاڵ تیتۆ سەفەری خۆی بۆمیسر هەڵوەشێنێتەوەو ئەنوەر بەپەلە لەئەسوان گەڕایەوە.

پرسیارم لەئەنوەر کرد:((ئێستا چی دەکەیت؟))

گوتی:((دووبارە هاوکارییەکان پێشکەش دەکەینەوە.))

گوتم:((ئەمەیان واتە لەبڕیاری حکومەتی خۆت پاشگەز دەبیتەوە.))

ئەنوەر گوتی:((کامیان باشتر دەبێت، بەردەوامبوون لەسەر هەڵە یان قبووڵکردنی هەڵەی کۆمیتەی ئابووری؟

گوتم:((ڕاست دەکەیت، ئەنوەر.))

دوای ئەوەی ئەنوەر بڕیاری هاوکارییەکانی بۆخەڵك گەڕاندەوە، خەڵك گەڕانەوە بۆ ئارامی خۆیان، بەڵام هەمووومان دەزانی ئێمە لەکاتی زیادکراو زیندووین، ئابووری ئێمە تاکو ڕادەیەك رووخابوو، تین‌و تاوی دڵی ئێمە بەهەمان شێوە.

لەئێوارەی نۆی تشرینی دووەم، کاتێك لەکۆبوونەوەی ڕێکخراوی ژنان دەگەڕامەوە، بچوکترین کچم نانا، بەورووژاو هاواریکرد:((دایە ! دایە ! گوێبیستی هەواڵەکان بوویت؟))

دڵم وەستا. کچم نوهییە لەمانگەکانی کۆتایی دووگیانی دووەمی خۆیدا بەسەر دەبرد. ڕووداوێك بۆی هاتبێتە پێشەوە؟

بەپەلە پرسیم:((چ هەواڵێك، نانا؟))

بەشێوەزێکی باوەڕ نەکراو گوتی:((باوکم دەیەوێت سەردانی ئیسرائیل بکات!))

پرسیم:((باوکت دەیوێت چ کارێك بکات؟))

نانا بەخێرا گوتی:((ئەمەیان ئەمڕۆ لەوتاری لەناو پەرلەمان ڕاگەیاند. پێشنیاریی کرد سەردانی قودس بکات.))

دەچێتە قودس؟ ئەنوەر؟ گوتم:((لەکوێیە، نانا؟))

گوتی:((لەسەرەوە لەژووری خەوتنی.))

بەپەلەڕۆیشتم بۆسەرەوەو گوتم:((ئەنوەر، نانا ڕاست دەکات؟))

سەری بەنیشانەی پشتراستی هەژاندو گوتی:((بەڵێ، ماوەیەکە ئێمە لەپایتەختەکانی خۆمان دانیشتووین بەردەوام ئیسرائیل ئاگادار دەکەینەوە کەخاکی داگیرکراوی ئێمە بگەڕێنێتەوە ئەگەر نا ئەمەیان ئەوە دەکەین. شتێکی ناشیرین‌و گاڵتەئامێز لەخۆمان نیشانی دونیا دەدەین. بەردەوام باسی وەرگرتنەوەی خاکی خۆمان دەکەین، بەڵام ناڕۆین ئەم داوایە لەکەسانێك بکەین کەداگیری کردووە. بڕیارمداوە خۆم بڕۆم بۆئیسرائیل، چارەیەکیترم هەیە؟

((ئەگەر دووبارە سینا لەڕێگای ئاشتی بەدەست نەهێنین ناچارین هەڕەشەکانی خۆمان بکەین بەکردار، جارێکیتر شەڕ لەگەڵ ئیسرائیل هەڵگیرسێنین. کەسانی زیاتر گیانی خۆیان دەکەن بەقوربانی. ئایا ئەمەیان ئەوەیە کەبۆخەڵکی خۆمان داوا دەکەین؟ گیانی منداڵەکانی خۆمان

بكەین بەقوربانی كەهیچ یەكێك لەم دوو وڵاتە سەرناكەوێت. لایەنی دارایی خۆمان لەجیاتی ئەوەی بۆئاوەدانكردنەوەی وڵاتو خەرجی خەڵكی خۆمان بكەین دەبێت لەجیاتی ئەم لایەنانە چەك دابین بكەین؟ جیهان ئەمەیان زێدەڕۆییە. زێدەڕۆییەك كەهیچ كۆتایی نییە. من دەبێت ڕێگاكان بۆئاشتی لەنێوان هەردوو وڵات تاقیكردنەوەی لەسەر بكەم.))

پرسیم:((بۆچی دەبێت خۆتان بڕۆن؟ ناتوانی تاكو كۆنفرانسی ژنێف دوابخەیت؟ ئەنوەر سەری خۆی هەژاندو گوتی:((ئاشكرا نییە لەناو كۆنفرانسی ئاشتی چ دەردەكەوێت، یان كۆنفرانس دەكرێت. لەوانەیە لەسەر كێشەی دیاریكردنی كاتی كۆنفرانس وەفدەكانی بەشدار، ئایا فەلەستین بەشداری دەكەن، مانگو ساڵ كات بەفیڕۆ دەدەن. نە، جیهان. تەنیا ڕێگای گەڕان بەدوای ئاشتی، گفتوگۆی ڕاستەوخۆی ڕاستگۆیانەیە لەنێوان دوو وڵات. من بۆئەم ڕێگایە ئامادەم.))

ئاشتی، ئاشتی لەگەڵ ئیسرائیل. بەناباوەڕی سەری خۆم دەهەژاند. تاكو ئێستا هیچ یەكێك لەسەرانی عەرەب سەردانی ئیسرائیلیان نەكردبوو. بەڵام هاوسەری من كەسێكی ئاسایی نەبوو. ئەنوەرم لەباوەش گرتو ماچم كرد، گوتم:((وای ئەنوەر، ئەگەر ئاشتی لەگەڵ ئیسرائیل ڕوویدات. بەڵام ئەگەر سەرۆك وەزیر بگێن نەویست تۆ ببینێت چی؟))

ئەنوەر گوتی:((ئەمەیان ئیتر كێشەی خۆیەتی، هەنگاوی داهاتوو بەخۆیانەوە گرێدراوە نەك من.))

گێژو سەرسوڕماو بووم. بۆگەڕانەوەم بۆئەم دونیایە، ڕۆیشتم بۆبینینی بەرنامەكانی هەواڵی تەلەفزیون، پێشنیاری مێژوویی ئەنوەر لەناو پەرلەمان:((من ئامادەم بۆ ئەوسەری دونیا بڕۆم ئەگەر بزانم ئەمەیان ڕێگا لەبریندار‌بوونی سەربازێك، ئەفسەرێك لەناو منداڵەكانم دەگرێت - دەڵێم بریندار‌بوون، كوشتن شوێنیتری خۆی هەیە.)) ئەنوەر ئەوەندە ئارام قسەی دەكردن وەك دەهاتە بەرچاو دەیەوێت باسی كەشو هەوا بكات. ((بەڵێ، ئێستا من ئامادەم تاكو ئەوسەری دونیا بڕۆم. ئیسرائیل كاتێك گوێبیستی بێت كەئێستا لەبەرامبەر ئێوە دەڵێم ئامادەم بۆگفتوگۆ لەگەڵیاندا بۆماڵەكەیان، بۆناو خۆدی كنێنیست بڕۆم، سەریان سوڕ دەمێنێت.))

وەك دەهاتە بەرچاو ئەندامانی پەرلەمان باوەڕیان نەدەكرد ئەوەی دەبیستن دروست بێت. كام یەكێك لەئەندامانی پەرلەمان دەیتوانی ئەم جۆرە بیرۆكەیە تێكەڵاو خەیاڵهێنەر بەخێرایی وەربگرێت؟ لەنێوان میسرو ئیسرائیل هیچ كاتێك شتێك جگە لەگومانو توندوتیژی بوونی نەبوو.

ئێمە هیچ کاتێك بەفەرمی گفتوگۆمان لەگەڵ یەکتر نەکردبوو. لەمیسر قسەکردنی هەموو بەرپرسێکی فەرمی لەگەڵ ئیسرائیل پێچەوانەی یاسابوو. ئێمە ئامادە نەبووین ئیسرائیل بەفەرمی بناسین. لەنەخشەی جوگرافیایی ناوچەکە ئیسرائیل تەنیا وەك خاکی داگیرکراوی فەلەستین دیاری دەکرا. ئێستا هاوسەرم رایدەگەێنێت من دەڕۆم بۆهەمان شوێن.

تەماشای نوێنەرانی پەرلەمانم دەکرد کەزۆر بەئەدەبانە چەپلەیان دەکوتا، یاسر عەرەفات بەسەردان لەمیسربوو. گەیشتە ناو کۆبوونەوە. زۆرکەس دواتر پێداگریان دەکرد کەرێبەری ئازادی فەلەستین کاتی بیستنی ئەم هەواڵەی لەناکاو، وەك داریکی وشك دانیشتبوو. بەلاّم وەك هەموو کەسانی سیاسی ئامادە لەناو پەرلەمان پێش ئەوەی لەناوڕۆکی پیامی ئەنوەر تێگەیشتبێت چەپڵەی لێدەدا. وتارەی هیوابەخشی ئەنوەر بۆزۆربەی کەسانی میسرو فەلەستین بەخیانەت لێدانەوەی بۆدەکرا. دوای وتاری ئەنوەر، عەرەفان بەهەنگاوەکانی بەرزی لەپەرلەمان رۆیشتە دەرەوە، دواتر لەمیسر رۆیشتە دەرەوەو هیچ کاتێك بۆمیسر نەگەڕایەوە.

ولاّتی میسر بۆماوەی هەفتەیەك بەبێدەنگی بەسەری دەبرد. هیچ کەسێك قسەکانی ئەنوەری باوەڕ نەدەکرد. هیچ کەسێك جگە لەمن. لەڕۆژەکانی کەئەنوەر چاوەڕێی وەلاّمی مناخیم بگی بوو، دەنگی تەلەفۆنی ماڵی ئێمە بۆساتێك نەدەبڕایەوە. هاوڕێیەك پرسیاریکرد:((ئایا راستە کەسەرۆککۆمار دەیەوێت سەردانی قودس بکات یان ئەمەیان تەنیا قسەیەکبوو کردی؟ بێگومان ئەگەر رۆیشت خۆشەویستی خۆی وەك جاران نامێنێت.))

وەلاّمم دایەوە:((ئێوە لەهاوسەرم تێنەگەیشتوون، نیگەرانی خۆشەویستی خۆی نییە. نیگەرانی بەرژەوەندی ولاّتی خۆیەتی.))

هاوڕێیەکیتر پەیوەندیکرد:((بۆم باسکە ئایا ئەنوەر دەیەوێ سەردانی قودس بکات؟

گوتم:((ئەگەر بگین رەزامەندی نیشاندا دەڕۆت.))

هاوڕێم گوتی:((وای، ئەمەیان باس نەکەیت جیهان.))

گوتم:((بۆچی باس نەکەم؟ دەبێت کەسێك رێگای ئاشتی بۆکەسانیتر خۆش بکات.))

دراوسێیەکانی ئێمەی عەرەب بەهەمان شێوە سەرسوڕماو بوون. ئەنوەر دەیزانی ئەمانە لەبەرامبەر پێشنیاری دەوەستنەوەو بۆیە ئەم بڕیارەی بەبێ گفتوگۆ کردن لەگەڵ ئەمانەدا باسکرد. بەلاّم زۆر هیواداربوو بتوانێت هاوسەنگەری سەربازی خۆی حافز ئەسەد رێبەری سووریا رازیو پشتیوانی لێی بکات. ئەنوەر، سێ رۆژ دوای وتاری لەناو پەرلەمان سەردانی

سووریایی کرد، تەنیا ئەنجامی ئەم سەردانەی دەستی بەتاڵو لەرزانبوو. بەرووخسارێکی ماندوو بۆی باسکردم:((تاکو کاتژمێر چواری بەیانی گفتوگۆم لەگەڵ حافز کردو بۆم باسکرد بەرپرسیارەتی خۆم بەتەنیایی هەڵدەگرم. ئەگەر سەرکەوتمو ئاشتی دروستبوو، ئەوکات دەبێتە سەرکەوتنی هەموومان. ئەگەر سەرنەکەوتین من ئەم تێکشکانە بەتەنیایی لەئەستۆی خۆم دەگرم.))

بەڵام حافز ئەسەد لەدژایەتی خۆی بەرێگای ئاشتیانەی ئەنوەر نەگۆڕبوو، دژی خۆدی ئەنوەر وەستایەوە. دوای گەڕانەوەی ئەنوەر لەسووریا، رادیوی شام زۆر ناشایستە هێرشیکردە سەر ئەنوەرو هەرکەسێك کەبڕیاربوو هاوڕێیەتی بکات لەم سەفەردا. رادیویی سووریا رایگەیاند هەرکەسێك هەنگاو هەڵگرێت بۆ قودس بەدوژمنی عەرەب هەژمار دەکرێتو خوێنی هەموو عەرەب لەئەستۆی خۆیەتی لەرێگای ئازادی فەلەستین کەگیانی خۆی دەکاتە قوربانی. لەهێرشەکانی ئەسەد بۆسەر ئێمە وشکبووم. زۆر لەئەنوەر نزیکبوو، لەماڵی ئێمەیان خواردن پێکەوە دەخوارد، بۆیەکتر نوکتەیان دەگێڕایەوەو پێکەوە پێدەکەنین. ئێستا داوای کوشتنی هاوڕێی خۆی دەکات. دوای تیرۆرکردنی ئەنوەر زانیاریم بەدەست گەیشتن کەحکومەتی سووریا، بۆرێگا گرتنی ئەنوەر کەلەبڕیاری ئاشتی خۆی پەشیمان ببێتەوە، بڕیان لەگرتنی ئەنوەر دەکردەوە کاتێك سەردانی سووریایی کردبوو، تەنیا لەساتەکانی کۆتایی حافز ئەسەد لەبڕیاری گرتنی پەشیمان دەبێتەوە. هەندێك کەسی سیاسی میسر دژی ئەنوەر بوون. پێش رۆیشتنی ئەنوەر بۆسووریا بۆدیداری سەرۆك حافز ئەسەد، وەزیری دەرەوەی میسر، ئیسماعیل فەهمی، لەناکاو دەستی لەکارکێشایەوەو جانتای وەزیر پێش خۆی گەیشتە پایتەختی سووریا. سەرم لەجوڵانەوەی وەزیر سوڕمابوو، نابێت ئێمە چاوەڕوانیمان کردبا کەهەمووکەسێك وەك ئەنوەر تەماشای دوورتری بابەتەکان بکات. زۆر ناروحەت بووم. گومانم دەکرد لەوانەیە ئیسماعیل بۆدۆزینەوەی دەرفەتێك کەنەبێتە بەشێك لەهەوڵەکانی ئەنوەر ئەگەر سەری نەگرتو خۆی لەم لایەنە دەرباز بکات. من خۆم هەستم دەکرد هاوڕێیەکم لەدەست رۆیشتووە. منو ئەنوەر لەهاوڕێیانی نزیکی وەزیری دەرەوەو هاوسەری عفاف بووین. دوای دەست لەکارکێشانەوەی ئیسماعیل فەهمی، لەهەرشوێنێك کەعفافم دەبینی چاکو چۆنیمان لەیەکتر دەکرد، بەڵام هیچ کاتێك وەك هاوڕێی سەردانم نەکرد.

ئەنوەر چاوەڕێی دژایەتی زۆری دەکرد. دەیزانی لەلایەنی سیاسیو کەسایەتی بەرەو پێشوازی هەلومەرجەکانی مەترسیدار دەڕۆت. من بەهەمان شێوە بیرم دەکردەوە. لەم لایەنەوە ئاگادارم دەکردەوە:((ئەگەر خەڵك لەگەڵ بیروڕای تۆدا نەبن بۆئاشتی، ناچار دەبیت لەبەرگریکردن دەست هەڵگریت.)) گوتی:((دەزانمو ئەمەش قبووڵ دەکەم جیهان. بەڵام دەبێت زیاتر لەسیاسەت گرنگی بەئاشتی بدەین، بێگومان نرخێك بۆ ئەم هەوڵدانە دەدەین بەڵام لەکۆتایدا میسر سەردەکەوێت.))

لەپانزدەی تشرینی دووەم، سەرۆك وەزیر بگین بانگێشتنامەیەکی فەرمی بۆئەنوەر ڕەوانەکرد. نوێنەرانی میسرو ئیسرائیل دەستیان بەلێکدانەوەی ناوەڕۆکی سەفەری ئەنوەر کرد. بۆرێزگرتن لەسەبەتی یەهوودیان، ئەنوەر بڕیاریدا فڕۆکەی دوای رۆژئاوی رۆژی شەممە نۆزدەی تشرینی دووەم، لەئیسرائیل بێتەخوارەوە. رۆژی یەك شەممە دەبوو جەژنی قوربان، گرنگترین جەژنی مەزهەبی ئێمە بڕیاربوو ئەنوەر بەیانی نوێژی جەژن لەمزگەوتی ئەقسا، لەقودس بکات، دواتر سەردانی کلێسای قیامەت بکاتو هەمان ئێوارە سەردانی کێنێست وتارێك پێشکەش بکات.

داوام لەئەنوەرکرد لەکاتی هاتنەخوارەوەی لەقودس جلوبەرگی دژی گولەی خۆی دەبەر خۆی بکات. قبووڵی نەکردو گوتی:((ماوەیەکی زۆر ئێمە گومان لەیەکتر دەکەین. بەڵام کاتێك سەربازێك سەردانی ماڵی دوژمنی خۆی دەکات دەبێت پێشتر خۆی بۆهێرشی بەرامبەری ئامادە بکات، بەڵام من بۆ ئاشتی دەڕۆم بۆ ئیسرائیل.))

جاری یەکەم نەبووم لەئارامی ئەنوەر بێزار دەبووم. وەك من دەیزانی کەسانێك بوونیان هەیە هاوشێوەی لایەنگرانی دژایەتی دەکەن. لەوانەبوو یەهوودییەکان ئەنوەر بکوژن. نەریتخوازەکانی ئیسلامی بەهەمان شێوە. گومانم لە فەلەستینییەکان دەکرد. لەخۆم پشتراست بووم کەئەنوەر بەزیندوویی لەقودس ناگەڕێتەوە.

چەند رۆژێك پێش سەفەری ئەنوەر کەهەموو ئەندامانی خێزان لەئیسماعیلییە لەیەکتر کۆبووینەوە، نەمدەتوانی چاوەکانم لەسەر ئەنوەر هەڵگرم، بەردەوام وێنەی خێزانیمان دەگرت، چەندین وێنە لەئەنوەر کەبەزەردەخەنەی شەریف نەوەی بچوکی ئێمە بۆئاسمان بەرزدەکردەوە، ئەنوەر لەکاتی کێشانەوەی شەریف لەجوگەڵەی ئاو کەشەریف پێداگری دەکرد دەبێت بچێت بۆناو ئاو. تەماشای هەموو جوڵانەوەکانی ئەنوەرم دەکردو لەبیرمدا دەپاراستن.

هەرچەند هیچ کەسێك قسەیەکی لەم لایەنە نەکرد، بەڵام هەمووماں دەمانزانی لەوانەیە ئەمانە ساتەکانی کۆتایی پێکەوە بوونی ئێمەبن. ئەنوەر دەیگوت:((نانا، وەرە. نۆهییە، وەرە. وێنەیەك پێکەوە بگرین، نزیکتر لەیەکتر هەموومان خۆمان لەیەکتر نزیك بکەین.))

دەنگی تەلەفۆن نەدەبڕایەوە، بەرنامەکان سات بەسات دەگۆڕان. بڕیاربوو ئەنوەر لەفرۆکەخانەی جناکلیس لەبیابان هەڵفڕێت. ئایا بەکۆپتەری بچووك یان گەورە دەڕۆیشت بۆفرۆکەخانە؟ وەفدی هاوڕێی، سەرۆك وەزیر مستەفا خەلیلو پترۆس غالی، سێیەم وەزیری دەرەوەی، محەممەد ریاز وەزیری ناوخۆی پێشوو جێگری ئیسماعیل فەهمی، وەزیری دەرەوەی پێشوو کەدەستی لەکارکێشایەوە. دوانزدە کاتژمێر دوای وەرگرتنی ئەم پۆستە دەستی لەکارکێشایەوە. ئەنوەر بەردەوام بەتەلەفۆن پەیوەندی دەکرد، دەموویست تەلەفۆنەکە داخراو بکەم بەڵام نەمدەتوانی. هیچ کاتێك تاکو ئەم ڕادەیە لەنیوان دوو هەستی جیاواز نەچەقیبووم. لەلایەك زۆرخوشحاڵبووم کەئەنوەر سەفەری ئاشتی خۆی دەست پێدەکات، لەلایەکیتر زۆر نیگەرانی گیانی بووم.

کاتی ڕۆیشتن دەستی پێکرد. لەخوارەوەی دەرگای کۆپتەر پێم گوت:((خواپشتو پەنات بێت ئەنوەر، خودا بتان پارێزێت، لاالەالاالله.))

وەڵامی دایەوە:((محەممەد رسول الله))

منو منداڵەکان لەکاتی هەستانی کۆپتەر لەبیابان وەستابووین، با بەردە وردەکانی بیابانی لەروخسارمان دەباراندن. ئەوکات ڕێگامدا فرمێسکەکانی من بێنەخوارەوە. شەریف بەردەوام پرسیاری لەمن دەکرد:((دایەگەورە چی بووە؟)) کاتێك بینی وەڵامی نادەمەوە رووی لەدایکی کرد:((چی بووە دایە؟))

نۆهییە نەیدەتوانی وەڵامی بداتەوە.

تەماشای تەلەفزیۆنم دەکرد. ماسولکەکانن ئەوەندە هەڵکشابوون تاکو چەند ڕۆژێك نەمدەتوانی سەری خۆم بسوڕێنم. بێژەری تەلەفزیون نەدەکرا باوەڕ نەکردن لەشێوەی قسەکردنی بەدوور بگریت، دەڵێت فرۆکەی ٧٠٧ میسر هەڵگری ئەنوەر سادات لەفرۆکەخانەی بن گوریون دەنیشێتەوە. بڕیارە سەرۆککۆمار کاتژمێر هەشت بگاتەجێ ئێستا هەمان کاتی دابەزینە.

نەوەکەم لەکاتی کەبەپەلە گەڕاینەوە بۆقاهیرە تاکو پێشوازیکردن لەئەنوەر تەماشا بکەین لەسەر قادرمەکان کەوتەخوارەوە لێوی خراپ هەڵدڕابوو، ئارامم دەکردەوە. کچی خۆم نۆهییە کەبڕیاربوو دوای دوو هەفتەیتر منداڵی دووەمی لەدایك ببێت ڕەوانەی ماڵەوەم کرد کەپشوویەك بدات. شەریف لەلام مایەوە. ئێستا منو شەریف فرۆکەی ئەنوەر دەبینین لەفرۆکەخانە وەستابوو، قادرمەکان دەبنەپێشەوە. شەریف کەلەسەر چۆکەکانم دانیشتبوو لەدەردی لێوەکەی برینداری دەگریا، بەڵام فرمێسکەکانم لەترسو باوەڕ نەکردنبوو، ئەنوەر لەئیسرائیل. کارێکی نەکراوە.

دەنگی مۆزیکی گەیشتنی لێدرا. دەرگای فرۆکە دەکرێتەوە. هەمان کات کەئەنوەر لەقادرمەکانی فرۆکە دادەبەزێتە خوارەوە دڵم لەلێدانێکی زۆر خێرا دابوو. ڕوخسارێکی ئارامی بەخۆیەوە گرتبوو. لەپشت هەمان هەستو ڕوخساری ئارامی دەبێت چی هەبێت دواتر بۆی باسکردم هەستم دەکرد خودا منی بۆ بەرپرسیارەتی ئاشتی ڕەوانە کردبوو. کاتێك هەنگاوم نایە سەرخاکی ئیسرائیل هەستم دەکرد لەم جیهانەدا بوونم نییەو لەهەڵفڕیندام. من کەتەماشای تەلەفزیونم دەکرد هەستم دەکرد ئەمەیان لەوانەیە خەون بێت من دەبینم. بەڵام خەونێك زۆر نزیك لەترسبوو. دەموویست چاوەکانم کامێرای تەلەفزیون دەبوون تاکو بتوانم لەناو خەڵکدا کەسانی گوماناوی بیدۆزمەوە تاکو کات لەباربێت لولەی دەمانجەکانی کەهەڵدەکشان ببینم، بێگومان بەباشی ئەنوەر دەپارێزرا. کەسانی ئەمنی ڕۆژی پێشتر سەردانی ئیسرائیلیان کردبوو، ژمارەیەکی زۆر هاوڕێیەتی ئەنوەریان دەکرد. بەڵام مەترسی بۆمن زیاتر لەهەموو ئەمانەبوو. دروستە کەئەنوەر سەرۆککۆماری ئەمانەبوو، بەڵام لەقوناخی یەکەم هاوسەرم بوو.

باوەڕم نەدەکرد چ دەبینم ئەنوەر تەوقە لەگەڵ ئەفاریم کاتزیر، سەرۆککۆمارو مناخیم بگین سەرۆك وەزیر دەکات. ڕێبەرانی دوو وڵات کەهەزاران کەس بۆئەمانە خۆیان بەکوشتدا، ئێستا پێکەوە لەسەر تەلەفزیون دەردەکەون، سرودی نیشتیمانی وڵاتی ئێمە دەبیستم کەئۆرکسترای سەربازی ئیسرائیل دەیان ژەنی:((دەزانی دەزانی، وڵاتم، وڵاتم، ئاڵای میسر دەبینم لەتەنیشت ئەستێرەی داوودی ئیسرائیل دەشەکێتەوە چۆن دەکرێت؟

جاری کۆتایی کەئاڵای ئیسرائیل لەتەنیشت ئاڵای میسرم بینیبوو چواردە ساڵ پێش لەئەڵمانیابوو، شوێنێك کەمنو ئەنوەر بۆبەسەربردنی پشوودان بەسەرمان دەبرد ئەوکات ئەنوەر سەرۆکی پەرلەمانبوو. ئێوارەی ڕۆژێکیان کەدەگەڕامەوە بۆهوتێل. بەترسەوە بینیم

کەئالأی ئیسرائیل لەتەنیشت ئالأی ئێمەیە لەدەرگای پێشەوە. بەترسەوە رۆیشتم بۆ ئەنوەرم باسکرد:((ئەنوەر بەخێرا دەبێت کەلوپەلّی خۆمان کۆبکەینەوەو بڕۆین.)) گوتی:((بۆ دەبێت بڕۆین؟)) گوتم:((ئیسرائیلییەکان لەم شوێنن دەبێت بەخێرایی بڕۆین.)) ئەنوەر دووبارە گوتی:((تاکو بەتەواوی نەزانم بۆچی بڕۆین ناتوانم لەم شوێنە بڕۆم. دەبێت سەرەتا بەرنامەیەك دابنێین‌و بەیانی دەڕۆین.)) گوتم: ((ئەگەر ئەمانە ئێمە ببینن دەمانکوژن.)) بەلأم ئەنوەر قبوولّی نەکرد من تاکو بەیانی بەئاگا خۆم راگرت، پشتراست بووم کەئێمە لەناو جێگاکانی خۆمان دەکوژرێین.

هاوکات لەگەلّ کۆتایی هاتنی سرودی نیشتیمانی ئێمە لەقودس. دەنگی تەقەکردن بەرز دەبێتەوە. دەمزانی! ئەنوەر! شەریفم بەتوندی لەباوەش گرتبوو بۆماوەیەك ئازارەکانی شەریفم لەیاد کردبوون. تەماشام دەکرد ئەنوەر نەکەوتەخوارەوە بەلأم دواتر ئاگاداربووم ئەمەیان تەقاندنی بیست‌و یەك گولەی پێشوازیکردنبوون. خولەکی یەکەم هیچ رووداوێك رووی نەدا خولەکی دواتر چی دەبێت.

بەردەوام دەنگی تەلەفۆنی مالّی ئێمە دەهات بەلأم وەلأمم نەدەدایەوە. ئامادە نەبووم بۆساتێك چاوم لەسەر بەنامەی پێشوازی ئەنوەر هەلّبگرم. پەیامی هاورێیان بەردەوام دەگەیشتن:((کاتیان ناگرین، بەلأم بۆیان باس بکە کەئێمە لەگەلّیاندا هاورێین بۆ سەرۆککۆماری دوعای خێر دەکەین. دیمەنەکان زۆر کاریگەرن بەردەوام تەماشایان دەکەین.

موشە دایان. ئاریل شارون. گولّدا مایەر. مورداخای گور. هەموو بەرپرسان ئامادەن، بەرپرسانی رابردوو لەگەلّ ئەوانەی ئێستا. بەرێز وەستاون. ئەنوەر بەرەو روویان دەڕۆت تەوقە دەکەن، ئەنوەر پێدەکەنێت! هەولّی خۆم دەدەم لەلێوەکانیان بزانم باسی چی دەکەن. وەك ئەوەبوو کەهاورێیانی کۆن چاك‌و چۆنی لەگەلّ یەکتر دەکەن. ئەگەر شەرکردن کارێکی بێ ئەنجام‌و بێماتابێت ئەم دیمەنانە زیاتر بێمانای دەکەن. ئاریل شارون، ژنەرالّی ترسێنەر کەهێلّی بەرگری ئێمەی لەشەڕی ١٩٧٣ تێکشکاندو هێزەکانی ئیسرائیل لەنۆکەندی سوئێز دەربازکردن، دەستی ئەنوەر بەتوندی دەگرێت وەك دیداری دوو سەربازی هاوسەنگەری کۆن شەڕەکان دەستی یەکتر بەرزو نزم دەکەنەوە.

ئەنوەر دواتر بۆی باسکردم ئێستا ئەم کابرایە وەزیری فەرهەنگە بەگاڵتە پێی گوتبوو: ((دەمویست ڕێگای تێکشکانی هێڵی خۆمان بەتەواوی بەسەرتان دابخەم، بەلام نەمتوانی بتان خەمە ناو داوی خۆمەوە.))

لەسەر تەلەفزیون شارون دەبینم کەلەبەر پێکەنینی سەری خۆی وەرگێڕاوە. لەوەلامی ئەنوەر دەلێت:((خوشحالم کەئێوە وەك میوان بۆولاتی خۆمان بەخێرهاتنت دەکەم.))

کاتێك ئەنوەر دەگاتە لای گولدا مایەر، هەناسەی خۆم دەگرم. دروست پێش ڕۆیشتنی بۆقودس داوام کردبوو:((ئەنوەر داوات لێدەکەم گرنگی زیاتر بەگولدا مایەر بدەن.)) بەسەرسوڕمانەوە تەماشای کردمو گوتی:((باسی چ دەکەیت جیهان وەك ئەوەیە کەمن نەناسیت، دەزانی ئەمەیان ئافرەتە گرنگی پێنادەم؟))

بەلام پشتراستم کرد:((نا، ئەنوەر مەبەستی من ئەوە نییە زۆرجار تۆ هەستەکانی دەروونی خۆت دەرنابڕیتو نیشانی نادەیت خەلك بەجۆرێکیتر لێکدانەوەی بۆدەکەن، کەسانی وەك خاتوو مایەر تۆ بەتەواوی ناناسنو لەوانەیە بیربکاتەوە تۆ کەسێکی هەست ساردو خۆت لەخەلك بەدوور دەگریت.))

دواتر ئەنوەر بەگاڵتە گوتی:((بەچاوان، جیهان، دەبینی لەبەرخاتری تۆ چۆن گرنگی بەخاتوو گولدا مایەر دەدەم.))

زۆرجار کەبۆم باسی مافی ئافرەت دەکرد بەردەوام ناوی گولدا مایەرو ئایندیرا گاندیم وەك دوو ژنی زۆر ئازا دەهێنایەوە، دواتر لەخۆم شەرم دەکردەوە. هەردووکیان پێکەوە لەسەردەمی شەڕ سەرۆکایەتی حکومەتیان دەکرد. خاتوو مایەر لەشەڕی ١٩٦٧ لەنێوان میسرو ئیسرائیل، ئایندیرا گاندی، لەشەڕی هیندستانو پاکستان، هەردووکیان براوەی شەڕبوون. ئێستا ئەنوەر دەگەیشتە خاتوو مایەر کەچاکو چۆنی لەگەلدا بکات. هیچ خۆشەویستیم بۆئەم ئافرەتە نەبوو لەهەمان کات ڕێزم لێدەگرت.

دەبینم کەئەنوەر دەستی خاتوو مایەری لەناو دەست گرتبوو، زۆر بەوردی گوێی لەقسەکانی ئەنوەر دەگرێت. لەناکاو بینیم کەمایەر بەروخساری پیر هەلگەڕاوی پێدەکەنێت، من بەهەمان شێوە بەبێ ئەوەی بەدەستی خۆم بێت پێدەکەنیم.

دواتر ئەنوەر هەوالی گفتوگۆی خۆی لەگەل خاتوو مایەر پێگەیاندم:((خاتوو مایەر تۆ لەوەلاتی ئێمە زۆر بەناوبانگی، دەزانی چ ناوێکیان بۆداناوی؟))

مایەر دەپرسێت:((نازانم، چییە؟))

ئەنوەر بۆی باسدەکات:((بەهێزترین پیاوی ئیسرائیل.)) هەمان کاتبوو کەخاتوو مایەر دەستی بەپێکەنین کردو لەوەڵامدا:((دەڵێت ئەمەیان وەك پێناسەکردن هەژمار دەکەم جەنابی سەرۆککۆمار.))

کاتێك ئەنوەر بۆی باسکردم رەنگی پێکەنینم گۆڕا، چۆنکە پشتراست نەبووم کەباش لەمەبەستی ئەنوەر گەیشتبێت، لەوانەیە تێگەیشتبێت. لەکاتی بەرامبەر بوونەوەم لەگەڵ خاتوو مایەر بڕیارمدا بۆ هەمووشتێك لێبۆردنم هەبێتو لەیادیان بکەم. ئەنوەر دەیوویست لەجیاتی گلەیی لاپەڕەیەکی نوێی لەپەیوەندی میسرو ئیسرائیل بکاتەوەو سەردەمێکی نوێی ئاشتی دەست پێی بکات وەك دیار لەم لایەنەوە سەرکەوتوو بوو.

بەدرێژایی رێگا تاکو قودس خەڵکانێکی زۆر بەشادیو یەك دەنگ گۆرانیان دەگوتن: ((سادات! سادات!)) زۆریان چاو بەفرمێسك بوون. کاتێك کەئەنوەر رایگەیاند سەردانی ئیسرائیل دەکات، بۆخەڵکی ئیسرائیل وەك خەڵکی میسر باوەڕکردنی ئەوەی کەرێبەری وڵاتێکی دوژمن بۆئاشتی سەردانی دەکات ئاسان نەبوو. لەنیوان خەڵکدا هەندێك لەرۆژنامەکان بەرزکرابوونەوە، سەردێری رۆژنامەی ئۆرشەلیم پۆست بەگەورە نووسرابوو:((بەخێربێیت، سەرۆککۆمار سادات.)) ئافرەتی زۆر لەناو خەڵکدا بوونیان هەبوو، دایکان کەمنداڵەکانی بچوکی خۆیان بەرز دەکردەوە تاکو پیاوی ئاشتیخواز ببینن. ئەنوەر دواتر باسیکرد بەبینیی ئەم ژنو منداڵانە زیاتر کەوتمە ژێر کاریگەریان هەستم دەکرد هەریەکێك لەم دایکانە بۆم باسدەکەن پەیامی ئاشتی تۆ گەیشتو قبووڵی دەکەین. تەماشای منداڵەکانمان بکەن ئێمە ئیتر شەڕمان ناوێت.))

لەقاهیرە بەردەوام شەریف لەباوەش دەگرمو حەبێك بەشەریف دەدەم بۆئەوەی ژانی نەمێنێت. ئەنوەر بەسەلامەتی گەیشتە هوتێلی شا داوود. وەفدی میسر لەهەمان هوتێل بوون. ئێستا دەمویست کۆتایی بەنەخەوتنی خۆم بێنم چونکە رۆژی دواتر بەرنامەکان زۆربوونو پێویستیم بەوزەو هێزی زیاتر هەبوو. بۆئەنوەر نوێژکردن لەمزگەوتی ئەقسا، سێیەم پەرستگەی پیرۆز لەئیسلام، گرنگترین پاڕانەوەی ئەنوەر دەبێت لەخودا. لەحەدیسدا ئاماژە پێکراوە نوێژێك لەقودس. بەرامبەر لەگەڵ هەزار نوێژ لەشوێنەکانیتر. لەهەمان کات زۆر مەترسیدارە. کوشتنی یەکەم رێبەری موسلمان لەکاتی نوێژکردن لەشوێنی پیرۆز لەکاتی دروستبوونی ئیسرائیل، کوشتنی ئەنوەر لەکاتی کڕنۆشبردن لەم شوێنە پیرۆزە، گەورەترین

بیرکردنەوە دەبێت بۆدوژمانی دەمارگیری ئاشتی لەگەڵ ئیسرائیل. دوعا دەکەم:((خودایە دەپاڕێمەوە ئەنوەر بەتۆ دەسپێرم.)) بەهەمان شێوەی کەشەریف لەباوەشم بوو خەو گرانی خۆی لەچاوەکانم زیاتر کردو خەوتم.

نیوەی شەو بەتەلەفۆنی بەپەلەی زاوامان، حەسەن مەرعی، لەخەو هەڵسامەوە. دڵگرانی لەسەفەری ئەنوەر بۆ قودسو نۆهییە بۆنەخۆشخانەو لەدایکبوونێکی پێش وەختە.

بەپەلە خۆم بەنەخوشخانە دەگەێنم دەبینم کەدایكو خاڵەتی حەسەن لەگەڵ نۆهییە بوون. چونکە لەکاتی لەدایکبوونی نەوەی ئێمە شەریف، منو ئەنوەر لەئێران بووین نەمانتوانی وەك پێویست لەتەنیشتیان بین. ئەمجارەیان بەختەوەرانە من لەقاهیرە بووم. دەستی خۆم بەسەری نۆهییەدا دەهێناو بۆم باس دەکرد:((ئارامبە کچم ئێستا تەواو دەبێت.)) دوای لەدایکبوونێکی دژوار لەبەرەبەیان کچێکی جوان لەدایکبوو. بەپێکەنین گوتم:((منالێکی زۆر ناشیرینە، بەلآم هەنگاوەکانی پیرۆزن بێگومان هەواڵ هێنەری ئاشتی دەبێت.))

پەیوەندی بەئەنوەر لەقودس دەکەم، ئەنوەر خۆی بۆنوێژ ئامادە دەکاتو لەهۆتیل دەڕۆتە دەرەوە. بۆم باسکرد:((بووین بەخاوەنی نەوەیەکی کچ روخساری سەوزێکی توندەو زۆرجوان نییە. وەك تۆیە.))

بەپێکەنین دەڵێت:((ئەگەر لەسەوز هەڵگەرانی وەك من بێت بێگومان جوان دەبێت.))

لەنەخوشخانە، لەتەلەفزیون تەماشای دیداری ئەنوەرم دەکرد بۆحەرەمی شەریف. لەبەر بیرکردنەوەکانی جیاوازی روحیو ماندوو بوون گێژ دەبووم. لەدایکبوونی نەوەی ئێمە دەبێت خۆشترین ساتەکانی ئێمەبن. بەلآم جارێکیتر دوو دڵی باڵی بەسەردا کێشام.

زۆر دەبێت ئاگاداربیت ئەنوەر دەبێت بزانێت چ کەسێك لەتەنیشتی چەپو راستی تۆ نوێژ دەکات. دەزانم هێزەکانی ئیسرائیل پشکنین بۆهەموو کەسێك دەکەن کەبۆ نوێژ سەردانی ئەم شوێنە دەکەن بەلآم دیسان نەریتخوازەکانی ئایینی زۆر زیرەکن. خولەکێك تێپەڕی هیچ شتێك رووی نەداوە لەقاهیرە هیچ شوێنێك بۆحەوانەی من نییە، ئەنوەر لەقودس ئەنوەر هیواکانی کردن بەراستی.

ئەنوەر دواتر بۆم باسدەکات:((لەکاتی نوێژکردنو کڕنۆشبردن هەستم نەدەکرد نیوچاوانی خۆم لەمزگەوتی ئەقسا داناوە، زۆرنەمابوو، گریانم بێت، ئایا بەراستی ئەم رووداوە بۆمن روویدابوو؟ هیوام دەخواست هەموو موسلمانەکان بتوانن لەم شوێنە پیرۆزە نوێژی خۆیان بکەن.))

دەخولەك تێپەڕ دەبن ئەنوەر دەبینم کەبەسەلامەتی لەمزگەوت دەردەچێتو بەرەو (قوببە السخرە) لەوبەری مەیدان دەڕۆت هەمان شوێنی کەئێمە باوەڕی پێدەکەین کەپێغەمبەری خودا میعراجی بەناوبانگی شەوانەی خۆی بۆبەهەشت لەم شوێنە دەست پێکردو هەمان شوێن کەمەسیحیو یەهوودییەکان باوەڕیان هەیە کەئیبراهیم کوڕی خۆی ئیسحاق ئامادە کرد بۆقوربانیکردن. ئەنوەر ئاگاداربە گروپێکی فەلەستین لەهەمان شوێن خۆپیشاندان دژی تۆ دەکەن، بەدەستەکانی گرێ کراو جنێو قسەی ناشیرینی ئاراستە دەکەن. هێزەکانی ئەمنی بەرەو کولانەکانی کۆنی قودس پاشەکشەیان پێدەکەن. ئەنوەر تاکو ئەوکات بەزیندوویی دەردەکەوتو سەلامەت بوو.

خۆم بۆهەلومەرجی راستەقینەی قاهیرە دەگێڕمەوە. ئەمڕۆ ئێوارە میوانداری خاتوو بورەقیبە، هاوسەری سەرۆکی تونس بۆخواردنەوەی چا دەکەم. بەرنامەی دیداری ماوەیەکی زۆربوو ئامادە کرابوو، پێش ئەوەی ئەنوەر سەفەری خۆی بۆ ئیسرائیل دەست پێبکات. لەبەر ویستی من بۆتەماشاکردنی ئەنوەر لەرێگای تەلەفزیون دیداری خۆم دواخستبوو. هیچ هۆکارێکیتر بۆدواخستنی ئەم دیدارە بوونی نەبوو. بەخێرایی جلوبەرگەکانی خۆم گۆڕین تاکو یەکتر ببینین. کاتی ئێمە پێش وتاری ئەنوەر دەبێت لەکێنێست. بەکچی بچوکم گوت نانا چاوت لەشەریف بێت. دەمویست کاتێك دەچم بۆناو میوانەکان تەماشای دەکەم بزانم خاتوو بورەقیبە گوێی لەوتاری ئەنوەر دەگرێت سوپاس بۆئەم دەرفەتە بەخێرایی گەڕامەوە بۆماڵەکەم.

کاتێك ئەنوەر کاتژمێر چواری ئێوارە گەیشتە ناو کێنێست، کەسانی ئامادە هەستی خوشحاڵی خۆیان دەردەبڕن. ئایا ئیسرائیلییەکان دوای وتاری هەست بەخوشحاڵی دەکەن؟ ئەنوەر وتاری خۆی دەست پێدەکات:((ئاشتیو رەحمەتی خودای گەورە لەسەر ئێوەو هەمووومان بێت، انشاالله. ئاشتی بۆهەموومان، لەسەرخاکی عەرەبو ئیسرائیل، لەسەر تەواوی بەشەکانیتری جیهانی گەورە کەئێستا لەناو کێشەیەکی تێکەڵ کێشدایە، لەجیاوازییەکانی قووڵ گیرۆدەی پەریشانی خۆیبووە، بەردەوام بەشەڕەکانی وێرانگەر مەترسی زیاتری دەکەوێتە سەر کەمرۆڤ بۆلەناوبردنی هاوشێوەی دروستی دەکات.)) بەبینی سەرنج راکێشی بەجلوبەرگەکانی ڕەشی، بەهەمان شێوە کەبەبێ ترس لەبەرامبەر نوێنەرانی پەرلەمانی ئیسرائیل دانیشتبوو کاریگەری زۆری لێدەکردم. روو لەشەریف دەکەمو دەلێم:((باپیری خۆت دەبینی تۆدەبێت وەك ئەوبیت باشە.))

دوای کاتژمێرێك من دەبم بەکسێك وەك ملیونان کەس لەجیهان کەکارێکی نەکراو تەماشام دەکردو گوێی بیستی دەبووم. ئەنوەر بەزمانی عەرەبی وتاری خۆی پێشکەش دەکرد. وەرگێرەکان هەوڵی خۆیان دەدا لەهەمان کات وەرگێڕن بۆزمانی عبری:((ئەمڕۆ بەنیازێکی نەگۆڕ بۆپێکهێنانی ژیانێکی نوێو دروستبوونی ئاشتی هاتووم بۆ لای ئێوە. ئێمە هەموومان خۆشەویستیمان بۆئەم خاکە هەیە، خاکی خودا، هەموومان، موسڵمانو مەسیحیو یەهوودی، هەموومان خواپەرستین... ئامۆژگاریو فەرمانەکانی خودا، خۆشەویستی، راستی، ئەمنیەتو ئاشتییە.))

من وەك زۆر خەڵکیتر، دەکەومە ژێر کاریگەری داواکاری خێرایی کۆتایی هێنان بەشەڕ: ((هەرگیانێك کەلەشەڕ وەردەگیرێت گیانی مرۆڤێکە، ئەم مرۆڤە گەر عەرەبێت یان ئیسرائیلی، هەر ژنێك کەدەبێتە بێوەژن مرۆڤێکە شایانی ژیانی خێزانی بەختەوەرە، چ عەرەب بێت یان ئیسرائیلی. منداڵانی بێتاوان کەلەسۆزو خۆشەویستی بێباوك دەبن، منداڵانی ئێمەن، ئەگەر لەسەر خاکی عەرەب بن یان ئیسرائیل... لەبەرخاتری هەموو ئەمانە. لەبەرخاتری جیلەکانی داهاتوو، لەبەرخاتری زەردەخەنەی سەر لێوی منداڵێك کەلەسەر خاکی عەرەب دەژین یان ئیسرائیل. لەبەرخاتری هەموو ئەمانە، بڕیارمداوە، بەبوونی هەموو مەترسییەکان، هاتووم بۆلای ئێوە کەقسەتان لەگەڵدا بکەم.))

کامیرا لەسەر روخساری بەرپرسانی حکومەتی ئیسرائیل دەگەڕا: ئابا ئیبان، وەزیری دەرەوەی پێشوو. برلیو، داهێنەری هێڵی بەرگری کەبەباوەڕی هیچ کەسێك نەیدەتوانی بەسەریدا دەربازبێت. عیزر وایزمەن، وەزیری بەرگری ئێستا، روخساری زۆر رەنگ گۆڕاو دەهاتە بەرچاو. دواتر زانیمان کە وایزمەن بۆبەشداری کردن لەم کۆبوونەوەیە پیداگری کردبوو کەلەنەخوشخانە بێتە دەرەوە، چونکە لاقو دەستو دوو پەراسوی لەرووداوی ئۆتۆمبێل شکابوون، داوای لەپزیشکانی خۆی کردبوو:((جانتاکانی خۆتان هەڵگرن لەهێروینو کۆکائینو حەشیش لەهەرشتێك کەدەتانەوێت پڕیکەن من دەمەوێت تاکو بیستو چوار کاتژمێریتر لەسەر پێیەکانی خۆم راوەستم.)) بۆهێنانی بۆپەرلەمانی ئیسرائیل، سوود لەکورسییەکی تایبەتو کوپتەرێك وەرگیرابوو. ئەوەی گوێبیستی دەبوو، هەموو ئیسرائیلییەکان گوێبیستی دەبوون جێگای ئاسوودەیی خەیاڵی هەموو کەسێکبوو، بەڵام شەپۆلەکانی راچڵەکانی بۆجیهانی عەرەب ڕەوانە دەکردن.

ئەنوەر روو لەكەسانی ئامادەبوو لەناو كنێنێست دەكاتو دەلێت:((ئەگەر دەتانەوێت لەم بەشەی جیهان لەتەنیشت ئێمە بەردەوامی بەژیانی خۆتان بدەن، لەوپەڕی راستگۆییو ئەمنییەتو سەلامەتی تەواو پێتان دەلێم بەخێربێن. ئەمەیان لەدەروندا خالێكی بازدانی گەورەیەو یەكێك لەنیشانەكانی رێگای گۆڕانو چارنووس سازو مێژووییە... بەلێ، ئێمە ئێوە قبوولّ دەكەین، ئێمە هۆكارەكانی ترسی خۆمان هەبوون. بەلام ئەمڕۆ من بۆتان باس دەكەم، بۆهەمووجیهان رادەگەیێنم، ئێمەژیان لەتەنیشت ئێوە لەئاشتییەكی جێگیر لەسەر بنەمای عەدالەت قبوولّ دەكەین. ئێمە نامانەوێت ئێوە یان خۆمان لەناو دەوردانێكی موشەكەكانی ویرانگەرو ئامادە یان تۆپەكانی پڕ لەرەقو كینە دابنێین.))

دەستەواژەی كەحكومەتەكانی عەرەب دەترسان: ناساندنی هەبوونی ئیسرائیل وەك كیانبوو. من بوێری ئەنوەر لەقبوولّكردنی بوونی ئیسرائیل بەرز هەلّدەسەنگێنم، بەلام ناتوانم هەست بەبوونی ترس نەكەم. لەئێستاوە ئێمە دەبێت تاوانی راستگۆی خۆمان وەردەگرت. لەهەمان ساتی كەفرۆكەی ئەنوەر لەئیسرائیل دەنیشتەوە، مەكتەبی پەیوەندییەكانی میسریان لەترابلۆس ئاگر تێبەردا. قەزافی پەیوەندییەكانی خۆی لەگەلّ میسر بڕین. كەسانی ئایینی لەمزگەوتەكانی شامی پایتەختی سووریا داوایان لە خەلّك دەكرد دوعا بۆئاشتی نەكەن، نەعەلّەت لەم ئاشتییە بكەن. لەناو كەمپەكانی فەلەستین لەسووریا وێنەكانی ئەنوەریان دەسووتاندن، بۆمبێك لەناو بالیوزخانەی میسر تەقییەوە، تای نەفرەت لێكراو سەرتاسەری رۆژهەلاتی ناوەڕاستو دەریایی ناوەڕاستی دەگرتەوە. لەیونان هەندێك قوتابیانی عەرەب هێرشیانكردە سەر بالیوزخانەی میسر، پۆلیس هەندێك قوتابی بریندار كردن. لەئیسپانیا فەلەستینییەكان توانیان بالیوزخانەی میسر بەدەستەوە بگرنو بالیوزی ئێمە كەكوڕی مامی یەكێك لەزاواكانم بۆماوەیەك وەك بارمتە كەوتە دەستیان. توفان دەستی پێكرد، لەولاتانی عەرەبیو ئیسرائیل.

كاتێك ئەنوەر مەرجەكانی ئاشتی راگەیاندن، رووخساری بەرپرسانی ئیسرائیل تێك هەلّدەچوون. ئەنوەر بەبڕاوەیی گوتی:((بەبێ بچووكترین هەلّوێستە لەسەر كردن پێتان رابگەیێنم من نەهاتووم داواتان لێ بكەم هێزەكانی خۆتان لەناوچەكانی داگیركراو بۆدواوە بگەڕێننەوە، پاشەكشەی تەواو لەخاكی داگیركراوی عەرەب دوای شەڕی ١٩٦٧ بڕیارێكی لۆژیكیو قسەی لەسەر ناكرێت. كەسێك ئەمەیان داوا ناكات... ئاشتی لەسەر خاكی داگیركراوی

خەڵکێتر دروست ناکرێت، بەمەرجێك کەهەمان ئاشتی ئاشتییەکی تەواو نەبێت.))عیزر وایزمەن دەبینم کەزۆر بەرەوانی قسەکانی بەزمانی عەرەبی دەکان پێویستی بەوەرگێڕانی بۆعبری نەبوو، یادداشتێك بۆ مناخیم بگێن‌و موشەدایان ڕەوانە دەکات، دەخوێننەوەو سەری خۆیان بەمانای قبووڵکردن دەجولێنن. دواتر ئاشکرابوو کەنووسرابوو دەبێت خۆمان بۆشەڕ ئامادە بکەین.

ئەنوەر لەسەر بابەتی فەلەستین هیچ نەگۆڕابوو:((ئامادەبووان، لێرەدا بۆتان باس دەکەم دووریکردن لەبەفەرمی ناساندنی خەڵکی فەلەستین‌و مافی خۆیان وەك هەبوونی سەربەخۆیی‌و گەڕانەوەیان بولآتی خۆیان هیچ ئەنجامێکی نابێت... ئێوەش دەبێت وەك من دەبێت ئازایانە لەبەرامبەر هەبوونی راستییەکان رووبەروو ببنەوە. هیچ کێشەیەك بەگوێی نەدان‌و خۆلادان چارەسەر نابێت. ئەگەر هەوڵدانەکان لەخزمەت سەپاندنی ماناکانی خەیاڵی سەربکەون کەدونیا پشتی لەئەمانە کردووەو یەك دەنگ باس لەرێزگرتن‌و ماف دەکات، ئاشتی جێگیر نابێت.))

کاتێك ئەنوەر دەیەوێت قسەکانی لەچەند رستەیەك پۆلێن بکات، بۆنیشاندانی پێك چوونەکان‌و بیروباوەڕەکان لەکتێبی پیرۆزی هەردوو لایەن دەگەڕێتەوە. فرمێسکەکانی لەخۆبایی لەچاوەکانم دێنەخوارەوە. ئەنوەر دەڵێت:((من لەگەڵ زکریا دووبارە دەکەمەوە: خۆشەویستی، حەق‌و عەدالەت. لەقورئانی پیرۆز ئەم ئایتە دەگێڕمەوە: بلێن ئێمەی موسلمان باوەڕو ئیمانمان بەخودا هێناوە، بەهەمان کتێبی کە بۆپێغەمبەر ڕەوانەکراوە، ئەوەی کەبەسەر پێغەمبەران رابردوو وەك ئیبراهیم‌و ئیسماعیل‌و ئیسحاق‌و یەعقوب‌و منداڵەکانی‌و موساو عیسا ڕەوانەکردووە، بۆهەموو ئەوانەی کەلەلایەن خودا هێناویانە باوەڕمەندم‌و هیچ نیوانێك لەنیوان پێغەمبەراندا ناکەم.)) ئەنوەر تەماشایەکی ناو هەموو کێنێستی کردو گوتی:((هەموومان رازین.)) دواتر سلاو ڕەحمەتی خودا لەسەر هەمووتان بێت:((السلام علیکم.))

لەکاتی گەڕانەوەی ئەنوەر بۆقاهیرە چل‌و چوار کاتژمێر لەرۆیشتنی بۆ ئیسرائیل تێپەڕیکردبوو. خەڵك هاواریان دەکرد تەواوی ئەم ماوەیە دڵمان لەگەڵ تۆدابوو! ملیونان میسری لەهەردوو لایەنی جادەی بیست کیلومەتری لەفرۆکەخانە تاکو جیزە وەستابوون، هەستی خۆیان دەردەبڕی، گوڵەکانی سپیان هەڵدەباراندن‌و هلهلەی خۆیان دەست پێدەکرد:((گیان‌و خوێنمان قوربانی تۆ بێت، سادات!)) سەربازەکان بۆرێگەگرتن لەئۆتۆمبێلی ئەنوەر، بازنەیان دروستکردبوو، بەم شێوەیە ئۆتۆمبێلی ئەنوەر زۆر لەسەرخۆ هەنگاو بەهەنگاو دەیتوانی

بۆپێشەوە جوڵە بكات. بێژەرەكانی تەلەفزیۆن‌و رادیو رێگای تێپەڕبوونی سەرۆكیان بەخەڵك دەگەیان:((سەرۆككۆمار ئێستا لەهلیوپۆلیس وەستاوە، خەڵك رێگای پێنادەن تێپەڕ بكات.))

كەسانێك كەخانوویان خاوەنی ئەیوانی خۆیبوو، لەئەیوان كۆببوونەوە، ئەوانیتر لەسەر بانی ئۆتۆمبێلەكانی وەستاو لەقەراخ جادەكان. لەدارەكان دەڕۆیشتنە سەرەوە. لە تابلۆكانی رێگا هەڵدەكشانە سەرەوە. هاواریان دەكرد سادات! سادات! كوپتەرەكان لەسەرەوە ماتۆر سوارەكان لەخوارەوە چاودێرو پاسەوانی ئەنوەریان دەكرد، جەماڵ لەناو یەكێك لەفرۆكەكاندا پێشوازی گەورەی خەڵك لەباوكی وێنەی دەگرت. من خۆم لەجیاتی ئەوەی برۆم بۆپێشوازی ئەنوەر لەماڵەوە لەرێگای تەلەفزیون تەماشام دەكرد. تاكو ئەوكات هیچ پشوازییەكی لەم شێوەی پڕ لەهەست‌و سۆزم نەبینیبوو. ئەم خۆپیشاندانەی خورسك كەخۆی لەخۆیدا دروست دەبوو، هەستی شادی دەربڕین بەراستی گەورەبوو لەفرۆكەخانە تاكو ماڵی ئێمە، تەنیا نزیكەی بیست خولەكی دەویست، ئەمڕۆ نزیكەی سێ كاتژمێری خایاند، جەماوەر بەدەوڵ‌و زڕنای خۆیانەوە هەموو شەقامەكان وەك پێش دەرگای ئێمەی لەجیزە داخرابوون.

كاتێك ئەنوەر گەیشتە ماڵەوە لەبەرامبەرم وەستا، نەمتوانی رێگا لەهەستەكانی خۆم لەئاسودەیی خەیاڵ بگرم. بەرەو ئەنوەر رۆیشتم دەستم لەباوەشم گرتوو لەبەرامبەر چاوی وەزیرەكان‌و كەسانی هاوڕێی ماچم كرد. دوای نانخواردن، كاتێك وەزیرەكان رۆیشتن، لەئەنجامدا توانیم بۆی باس بكەم سات بەسات لەقودس زۆر نیگەرانی گیانی تۆبووم.

ئەنوەر بەزەردەخەنە رووی لەمن كردو گوتی:((ئەم مەترسییەیی دەهێنا. ئەگەر نەدەڕۆیشتم هیوام بۆئاشتی هیچ كاتێك بەئەنجام نەدەگەیشت. ئێستا هیچ نەبێت دەتوانین راستەوخۆ قسە لەگەڵ ئیسرائیلییەكان بكەین.))

پێكەوە نوێژی كۆتایی هەمان رۆژمان بەجێ گەیاند سوپاسی خودامانكرد بۆكۆتاییەكی سەركەوتوو ئەمەیان یەكەم هەنگاو بەرەو ئاشتی. نەماندەزانی هەنگاوەكانیتر تاكو چ رادەیەك ئەستەم دەبن.

بەدەستپێكی ساڵی ١٩٧٨، گۆڤاری هەواڵی ئەمەریكی تایم لەبەر هەوڵدانەكانی بۆئاشتی بەپیاوی ساڵ دایەناسین. بەڵام جگە لەدوو سێ تێڕوانین بۆرێگا چارەكان هیچ هەواڵێك لەئاشتی نەبوو. نازانم ئەنوەر ئەم هەموو سەرچاوەی سەبرو ئۆقرەگرتنی بۆبەردەوامی كۆبوونەوەكانی بەدوای یەك لەگەڵ بەرپرسانی ئیسرائیل هەبوو. ئیسرائیل بەردەوام پێداگری دەكرد لەسەر

مانەوەی لەباریکەی غەزە کەلەشەڕی ١٩٦٧ دەستی بەسەردا گرتبوو رەتیدەکردەوەو بەردەوام شاروچکەی لەسەر دروست دەکردن‌و بەرفراوانی دەکرد. ئەنوەر دووەم کۆبوونەوەی سەران ئەمجارە لەرۆژی لەدایکبوونی ئەنوەر لەبیست‌و پێنجی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٧٧ لەئیسماعیلییە بەرێوەچوو بۆی باسکردم:((بگێن رەهەندی زۆری بۆ هۆلووکاست هەیە. بەگومانترین کەسە تاکو ئێستا من بینیم بێت. بەبوونی خۆشەویستی بۆ وڵاتی خۆی رێزی دەگرم، بەڵام لەکاتی گفتوگۆ بەراستی کەسێکی بێزارکەرو قەڵسە.)) بەهەبوونی ئەم لایەنانە ئەنوەر بێزار نەدەبوو.

گوتم:((بێگومان خودا کەسێکی وەک تۆی ئۆقرەگرتوو بۆگفتوگۆ لەگەڵ کەسێکی ئاڵۆزی وەک بگین هەڵبژاردووە، ئەگەر من دەبووم ماوەیەک پێش وازم دەهێنا.))

رەوتی ئاشتی لەگەڵ ئیسرائیل گەیشتبوو خاڵی داخراو. پەیوەندییەکانمان لەگەڵ دراوسێیەکانی عەرەب. لەبەر هۆکاری هێرشەکانی فەلەستینییەکان دژی هاوسەرم، نارەزایەتی توندوتیژیان لەدەرەوە، ئەنوەر دوو رۆژ دوای گەڕانەوەی لەقودس بڕیاریدا هەمووناوەندەکانی ئازادی بەخشی فەلەستین لەمیسر دابخرێن. دواتر داوای لەهەموو برایانی ئێمەی عەرەب کرد بۆگفتوگۆ لەسەر ئاشتی لەمانگی کانوونی دووەم لەهوتیل میناهۆز لەقاهیرە کۆببنەوە. بەڵام بزوتنەوەی ئازادی فەلەستین، سووریا، یەمەنی باشوور، عێراق، جەزایر، لیبیا بانگێشتنامەی ئەنوەریان قبووڵ نەکرد. بەپێچەوانەی دانیشتی سەرانی خۆیان لەدووەمی کانوونی دووەم لەترابلۆس بەرێوەبرد، لەهەمان کۆبوونەوە بڕیاریاندا کۆتایی بەپەیوەندی سیاسی خۆیان لەگەڵ میسر بێنن. ئەنوەر، تووڕە لەوەی کەعەرەب لێکدانەوەی بابەتی ئاشتی رەتکردەوە، بەدەرکردنی ٣٠٠ دیپلۆماتکاری ئەم وڵاتانە لەمیسر کاردانەوەی نیشاندا، سۆڤیەت گفتوگۆکانی ئەنوەری بۆئاشتی بایکوت کرد، ئەنوەر لەبەرامبەردا بڕیاریدا باڵیوزخانەو کۆنسولگەرییەکانی خۆیان‌و هاوپەیمانەکانی وەک چیکوسلاڤاکی، پۆلۆنیا هەنگاریاو ئەڵمانیایی رۆژهەڵات لەسەرتاسەری میسر دابخرێن. لەم نیوەدا سایروس ونس، وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا بەگەڕان‌و سوڕانەوەی لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاست هەوڵیدا نیوەندگیری‌و ئاشتی بپارێزێت.

لەرۆژهەڵاتی ناوەراست تەنیا دەنگێک پشتیوانی لەئەنوەر کرد. شای ئێران پەیامێکی چاوەڕوان نەکراو لەکانوونی دووەم بۆئەنوەر ڕەوانەکرد:((من تەنیا بۆشەوێک سەردانی ئەسوان دەکەم.)) کاتێک ئەنوەر بۆپێشوازی رۆیشت بۆفرۆکەخانە، شا بۆی باسدەکات تەنیا بۆئەوە هاتووم

کەپشتیوانی پەیامی ئاشتی بکەم نەك تەنیا لەجیهان، بەتایبەتی لەناو عەرەب بپارێزێت. شا بۆ ئەنوەر باسدەکات:((من سەردانی عەرەبستانی سعودیا دەکەم تاکو پرسیار لەمەلیك خالیدو ئەمیرانی سعودیا بکەم بۆچی لەپشتیوانیکردنی تۆ دواکەوتوون. ئەمانە دەبێت بزانن کەتۆ هەموو توانای خۆت بۆئاشتی لەتەواوی ناوچە تەرخانکرد، ئاشتییەکی فرەلایەنو یەکسان، گەڕاندنەوەی مافی عەرەب.)) سەفەری شا بۆجەددە بێ ئەنجامبوو، بەلاّم ئەنوەر هیچ کاتێك لەیادی نەکرد هاوڕێی بەبێ ئەوەی داوای لێکرابێت، چەند هەوڵیدا بۆهاوکاری ئەنوەر.

توندوتیژی بەردەوامبوو. لەشوباتی١٩٧٨، یەکێك لەکۆنترین هاوڕێیانی ئەنوەر، یوسف سباعی، بەڕێوەبەری گەورەترین رۆژنامەی میسر، لەنیکوزیا، پایتەختی قوبرس، فەلەستینیەك لەپشتەوە تەقەی لێکردو کوژرا. تەنیا تاوانی هاوڕێیەتیکردنی ئەنوەربوو بۆقودس. کاتێك بۆهاوخەمی سەردانی هاوسەرو دوو منداڵی یوسفم کرد لەقاهیرە. دڵم ژانیکرد. زولمێکی چەند بێمانا لەم خێزانە کرابوو.

بۆچی فەلەستینییەکان سەرنەکەوتنی خۆیان بەسەر ئێمەو هاوڕێیانی خۆیان خاڵی دەکەن؟ بۆچی لەتەنیشت ئێمە بۆپاراستنی خاکی خۆیان رێگەچارەیەکیان دیاری نەدەکرد؟ بێگومان ئێمە بیانووی فەلەستینییەکان بۆزۆر لایەن دەبێت لەبەرچاو بگرین کەخاکیان داگیرکراوە، تاکو ئێستاش داگیرکراوە، زۆربەیان لەناو کەمپەکان بەردەوامی بەژیانی خۆیان دەدەن. بەلاّم دەبێت فەلەستینییەکان بزانن دەرفەتی زۆریان بۆگەیشتن بەچارەسەر لەدەست رۆیشتووە. ئەمڕۆ یاسر عەرەفات دەتوانێت باس بکات:((من سەردانی ئیسرائیلو پەرلەمانی ئەم ولاّتە دەکەمو بەخەڵکی دونیا رادەگەینم بەمەرجێك ئەگەر خاکی ئێمە بگەڕێنەوە من لەگەڵ ئیسرائیل ئاشتی دەکەم.)) ئەگەر بتوانێت ئەم بڕیارە بداتو سەرانی ئیسرائیل دەکەوتنە تەنگەبەرىو ناچار دەبوون بۆئاشتی بانگێشتی بکەن یان بەرەتکردنەوەی پێشنیاری ئاشتی دونیا ئیسرائیلی تاوانبار دەکرد. بەلاّم ئەمەی نەکرد، توندوتیژی لەهەمان دەستپێك سەری هەڵدا، تاکو ئەمڕۆ بەردەوامی هەیە.

ولاّتانی عەرەبی وەك یاسر عەرەفات کەڵەڕەقبوون، ئەنوەر بەردەوام لەوتارەکانی خۆیدا دووباری دەکردەوە ئاشتی لەگەڵ ئیسرائیل تەنیا رێکەوتنێك نییە لەنێوان میسرو ئیسرائیل، ئەم رێکەوتنە پەیوەندی بەهەموو ولاّتانی عەرەبییەوە هەیە. ئەم ئاشتییە تەنیا سوودی بۆمیسر نییە سوودی بۆتەواوی ناوچەکە هەیە. بەلاّم برایانی عەرەبی ئەنوەر گوێچکەکانی

خۆیان لەسەر بابەتی ئاشتی داخستن. چەندینجار بۆی باس دەکردن:((ئەگەر ئێوە ڕێگایەکی باشترتان هەیە بۆمان باس بکەن، من بەڵێن دەدەم لەسەر هەمان ڕێگا بڕۆم.)) بەڵام جێگای سەرسوڕمان نەبوو کەهیچ یەکێك لەئەمانە ڕێگاچاریەکیتری نەبوو. عەرەبەکان وەك ئێمە دەیانزانی کەبۆ وەرگرتنەوەی خاکی ئێمە هیچ کاتێك ناتوانین لەڕێگای شەڕ بەدەست بێنین، ئەمەریکا ڕێگای نەدەدا ئیسرائیل بشکێت و هیچ یەکێك لەئێمە توانای تێکشکاندنی ئەمەریکامان نەبوو، تەنیا ڕێگەی ئێمە وەرگرتنەوەی خاکی ئێمەبوو لەسەر بنەمای گفتوگۆو ئاشتی. ڕێگەیەك کەئەنوەر بەسەرکەوتن بەسەر ئیسرائیل لەشەڕی ١٩٧٣ بەدەستی هێنابوو. میسر ئیتر دەیتوانی لەسەربنەمای هێزو باوەڕ بەخۆبوون بچێتەناو گفتوگۆکان، بەڵام عەرەب هیچ دەورێکیان لەناودا نەبوو.

تەواوی هێزو توانای خۆم بۆخوێندنی زانکۆ تەرخانکردبوو خۆم بۆتاقیکردنەوەکانی کۆتایی ئامادە دەکرد. یەکەمین خولی چوار ساڵەم لەناو ئەنجوومەنی پارێزگای منوفییە بەکۆتایی دەهات، بڕیارمدا دووبارە خۆم هەڵبژێرم. سەرقاڵی کۆکردنەوەی هاوکارییەکانبووم بۆدەزگاکانی خێرخوازی، پێکهێنانی کۆمیتەیەك بۆیاساکانی باری کەسیەتی کەپێشنیاری نوێم بوو. لەلایەکیتر سەرقاڵبووین بۆگرنگترین ڕووداوی خێزانی کوڕی ئێمە هاوسەرگیری دەکردو دەبوو بەهۆکاری جیاوازی زۆر لەنیوانمان.

جەماڵ لەتەمەنی پانزدە ساڵی، لەگەڵ دینا عەرەفات لەقوتابخانەی ئامادەیی دورگە یەکتر دەناسن لەهەمان کات عاشقی دەبێت. بەڵام من دژی هاوسەرگیری ئەمانەبووم. جەماڵ لەساڵی یەکەمی زانکۆ زۆر بچوکتربوو کەبیر لەهاوسەرگیری بکاتەوە. من، بەهیوای کەمکردنەوەی ئەم خۆشەویستییەیی سەردەمی مێردمنداڵی، بینینی دینام لەجەماڵ قەدەخەکرد. بەڵام ئەم هۆکارەم خۆشەویستی نیوانیان زیاتر کردبوو. کاتێك منو ئەنوەر بۆتێپەڕکردنی پشووی هاوینە جەماڵمان ڕەوانەی لەندەن کرد، هیچ شتێك نەگۆڕا. جەماڵ بەردەوام لەبەرم دەپاڕایەوە:((دایە، داوات لێدەکەم، من خۆشەویستی زۆرم بۆدینا هەیە، دەمەوێت هاوسەرگیری لەگەڵدا بکەم.)) بەڵام من بەهیچ شێوەیەك ڕازی نەدەبووم و ئامادە نەبووم ئەم کچە ببینم. یەکەم کچ کەدەهاتە ناوژیانی کوڕم دینابوو. من بەهیوای ئەوەی تەمەنی زۆر بچوکبوو دەموویست تێکەڵاوی لەگەڵ کچانیتر هەبێت. جەماڵ قوتابی زانکۆ بچوکتر لەم لایەنەبوو بەرپرسیارەتی ژنو منداڵەکان هەڵگرێت. پێنج ساڵ درێژەی کێشا تاکو جەماڵ توانی بیروباوەڕم بگۆڕێت.

رۆژێکیان دوای بەشداریکردن لەکۆبوونەوەی سەرۆکایەتی رێکخراوی ئیمانو ئومێد، کاتێك جەماڵم بەچاوەکانی پڕ لەفرمێسك لەپێش دەرگای نووسینگەی خۆم بینی، بەرەو رووی رۆیشتم. بۆی باسکردم:((تۆ تەواوی کاتی خۆت تەرخان دەکەیت بۆگوێگرتن لەکێشەکانی خەڵك، کێشەکانی خەڵك چارەسەر دەکەیت. بەڵام هاوکاری کوڕی خۆت ناکەیت.))

دڵم داڕما، لەوانەیە راست بکات.

گوتی:((من خۆشەویستیم بۆ دینا هەیە، خۆشەویستیم بۆتۆش هەیە، بەبێ رەزامەندی تۆ هاوسەرگیری ناکەم. داوات لێدەکەم، دایە داوات لێدەکەم.))

هەستێکی باشم نەبوو. گوتم:((بۆچی خوێندنی خۆت تەواو ناکەیت، تاکو دواتر بزانین چ دەبێت؟))

ئەنوەر بەدوای جەماڵدا هاتە ژوورو گوتی:((جیهان، بەراستی ئەمانە خۆشەویستیان بۆیەکتر هەیە. بۆچی رێگایان پێنادەین بەفەرمی مارەبڕینی خۆیان بکەن؟ دوای ساڵێکیتر کەجەماڵ خوێندنی تەواوکرد هاوسەرگیری بکەن.))

تاکو ئەوکات بەباوەڕی من جەماڵ گەنجێکی بچووك دەهاتە بەرچاوم. بەڵام لەدژایەتی خۆم دوودڵبووم. ئەمەیان هەمان کێشەبوو کاتێك من عاشقی ئەنوەر بووم بۆم دەهاتە پێشەوە. ئایا ئەمەیان دژایەتی دایکی خۆم دووبارە دەکردەوە؟ ئایا ئەنوەر هەمان کەسایەتیو پشتیوانو رەئوفی باوکم بوو؟ تەماشای روخساری جەماڵم دەکردو خۆم لەتەمەنی بیستو هەشت ساڵی دەبینییەوە.

بۆکوڕم باسکرد:((پەیوەندی بەخۆشەویستی خۆت بکە تاکو من ببینم.))

لەناکاوی ڕەنگی گۆڕاو گوتی:((دایە من نامەوێت بەم خێرایە ناچاربیت بیروباوەڕی خۆت بگۆڕیت.))

بەخۆشەویستی بۆم باسکرد:((خێرا نییە، جەماڵ. من خۆشەویستی تۆم بۆدینا تاقیکردەوە، ئەگەر دوای ئەم هەموو ساڵانە بیروباوەڕت نەگۆڕاوە، دیارە بەراستی خۆشەویستی تۆیە، پەیوەندی بکە.))

کاتێك دینا ئاگای لەدەنگی من بوو زمانی لاڵبوو. بۆم باسکرد:((دینا، منو ئەنوەر دەمانەوێت ئەمڕۆ ئێوارە بۆناسینی دایكو باوکت، سەردانی ئێوە بکەین.))

بەئەستەم قسەکردن گوتی دایکی، نیکوڵ، لەپاریسە، بەڵام باوكو داپیری لەماڵەوەن.

گوتم:((زۆرباشە منو هاوسەرم سەردانتان دەکەینو قاوەیەك پێکەوە دەخوینەوە.))
دینا دەستبەجێ پەیوەندی بەدایکی خۆیەوە دەکات بەبیستنی ئەم هەواڵە چاوەڕوان نەکراوە راستەوخۆ بۆسوپاسگوزاری دەچێتە کڵێسای بەناوبانگی نوتردام. نیکۆڵ ژنێکی لوبنانی مەسیحی دواتر بووین بەهاوڕی ئازیزی یەکتر، دواتر بۆی باسکردم: ((کرنۆشم بردو خاکی کڵێسام ماچکرد. لەکۆتایدا کچم بەبەختەوەری خۆی گەیشت.))
بەختەوەر. هیچ کاتێك روخساری بەختەوەری جەماڵم بەهەمان شێوە نەبینیبوو کەمنو باوکی بۆرۆیشتن بەماڵی خۆشەویستی لەدەرگای ماڵ دەڕۆیشتینە دەرەوە. منو کچەکانم کەلەگەڵ ئێمە هاتبوون، بۆئەوەی بزانین چ لایەنێکی ئەم کچە دڵی کوڕی منی بردووە، لەژێر چاو تەماشام دەکرد. دینا بەکراسی کەبەپەڵە لەخاڵەتی خۆی بەقەرز وەرگرتبوو وەك دەهاتە بەرچاو دڵی مرۆڤی رادەکێشا، وەك دیار لەکچەکانی لەسەرخۆبوو وەك کوڕەکانی شاڵوار جینو بلوزێکی دەبەرخۆیان دەکەن. بەم دیدارەی ئێمە ئارام نەبوو. کاتێك ئەنوەر گوتی من لەگەڵ هاوسەرو کچەکانی خۆم هاتووم بۆخوازبینی دینا بۆجەماڵی کوڕم، وەك دەهاتە بەرچاو باوکی دینا خۆی ونکردبوو، تەنیا شتێك کەتوانی باس بکات ئەمەبوو:((جێگای سەربەرزی ئێمەیە، جەنابی سەرۆککۆمار.))
دیناو خاڵەتی زۆر خوشحاڵتربوون کەقسەیەك بکەن. دەماینەوە منو داپیری. بۆم باسکرد:((ئەوەی تۆ بەختی هەبوو کەهاوسەرگیری لەگەڵ کوڕی مندا بکات.))
وەڵامەکانی ئامادە بوون، بەخێرایی وەڵامی دایەوە:((بێگومان، خاتوو سادات، کوڕی تۆش بەختی هەبوو.)) لەجۆری وەڵامدانەوەی دلێرانەی زۆر رازیبووم. پشتراستم کرد: ((هەردووکیان بەختیان هەبوو.)) کاتژمێرێکم وەك دیاری دەزگیرانی بۆدینام بردبوو لەدەستی دینام کردو روخسارم ماچکرد. بۆمێژووی جەژنی هاوسەرگیری بۆساڵی ئایندە رێککەوتین. کاتێك کەبەقورسایی لەتەنیشت یەکتر دانیشتبووین، نەمدەزانی بڕیارە ئەم هاوسەرگیرییە هاوکات بێت لەگەڵ چ رووداوێك.
لەئێوارەیەکی یەکێك لەرۆژانی گەرمی مانگی ئایاری ساڵی ١٩٧٨، لەمانگی رەمەزان، ئەنوەر لەئەسکەندەرییە بۆی باسکردم:((دەمەوێت سەردانی ئەمەریکا بکەم. سایروس ونس بانگێشتنامەیەکی بۆمن رەوانەکردووە لەلایەن سەرۆککۆمار کارتەر بۆبەشداری لەدانیشتنەکێتر لەگەڵ بگینو من قبووڵم کردووە.)) جارێکیتر بۆئاشتی بەهیوا بووین. نزیکەی نۆ مانگ بەسەر

هەمان سەفەری ئەنوەر بۆقودس تێپەڕ دەبوو کەداوای ئاشتی دەکرد. تەنیا وەلاَتێك کەدەیتوانی پاڵەپەستۆی زیاتر بخاتە سەر ئیسرائیل، ئەمەریکابوو. ئەنوەر خۆشەویستی زۆری بۆجیمی کارتەر سەرۆککۆماری ئەمەریکا هەبوو کەسێکی بەئەخلاَق و ئایینی دەزانی. چونکە تاکو هاوسەرگیری جەماڵ، لەبیست و چواری ئەیلول، مانگێك زیاتر نەمابوو، پرسیارم لەئەنوەر کرد:((چ ڕۆژێك دەڕۆیت؟))

گوتی:((هەرچی زوو، بەلاَم نیگەرانی بابەتی هاوسەرگیری جەماڵ نەبیت، باوەڕ دەکەیت بەشداری لەئاهەنگی هاوسەرگیری کوڕی خۆمدا نەکەم؟))

بەبیرم هێنایەوە:((من دەبێت لەدەستپێکی مانگی ئەیلوول لەگەڵ شەریف سەردانی پاریس بکەم.)) نوەی بچوکی ئێمە نەخۆشی هەناسەسواری هەبوو پزیشکی ئێمە چەند مانگ پێش داوای لەپزیشکێکی پسپۆڕی ئەم نەخوشییە کردبوو کاتی سەردانی بۆدیاری دەکات.

ئەنوەر گوتی:((ئەوکات من لەکەمپ دیوید دەبم.))

لەڕۆژی پێنجی ئەیلوولی١٩٧٨، لەپاریس پەیوەندیم بەئەنوەر کرد:((ئەنوەر تۆباشی؟ کۆبوونەوەکان باشن؟ دەنگوباس سانسۆر دەکرێن من هیچ شتێکی نوێم نەبیست.))

ئاهێکی هەڵکێشاو گوتی:((بگین پیاوێکی قورس کەسێکی بەڕق و کینە.))

هانمدا:((بەلاَم تۆکەسێکی ئەم کابرایە باش دەناسی، ئەنوەر دەبێت هەوڵی خۆت بدەیت.))

گوتی:((جیهان، هەوڵی خۆم دەدەم، بەلاَم باش نییە ئەنجامی باش نین.))

بۆم باسکرد:((سبەینێ هەمووشتێك دەگۆڕێت، ئەنوەر سەبرت هەبێت و ببینە. ئێمە دەبێت هیوا و ئومێدی خۆمان بپارێزین. لەم هەوڵدانە خودا پشتیوانی تۆیە. من دوعات بۆدەکەم و خودا هاوکاریت دەکات.))

شەوانە لەپاریسەوە پەیوەندیم بەئەنوەر دەکرد، ڕۆژانە هەواڵەکانی خراپتر دەبوون. سەرۆك کارتەر بەجیا چاوی بەئەنوەرو بگین کەوت دەیوویست لەنیوانی زۆریان کەمتر بکاتەوە. لەهەمان کات وەزیرانی دەرەوەی سێ وڵات، سایروس ونس، موشە دایان و محەممەد ئیبراهیم کامل، لەسەر وردەکارییەکان کاریان دەکرد، هەرچەند ئەم بابەتە وردەکاری زۆری نەبوون.

دوو ڕۆژ دواتر پەیوەندیم کردەوەو گوتم:((ئەنوەر هەست دەکەم زۆر ماندوویی.))

دەنگی ئاهی ئەنوەرم دەبیست. وەلاَمی دایەوە:((شەڕکردن بۆئاشتی، بەراستی توانای دەوێت.))

هەواڵەکانی جیهان بەهەمان شێوە خراپو خەمباربوون. لەئێران شۆڕش دەستی پێکردبوو، تەلەفزیۆنی پاریس ڕۆژانە هەواڵەکانی پێکدادانەکانی دەگواستەوە. بینینی چاوەکانی پڕلەکینەی نەریتخوازەکانی مەزهەبی، هاواری مردن بۆشا، بەراستی ترسناکبوو.

پەیوەندیم بەفەرەح دیبا لەتاران کرد:((فەرەح ئێوەو شا باشن؟ خۆپیشاندانەکان لەتەلەفزیون دەبینم نیگەرانی ئێوەم.))

دەنگی زۆر ئارامبوو. گوتی:((ڕۆژەکانی زۆر دژوار تێپەڕ دەکەین، دوعا دەکەم زووتر تەواو ببێت.)) بەلأم تەواو نەبوو.

هەواڵەکانی تەلەفزیون لەپاریس شەوانە بەشێك لەنائارامییەکانی ئێرانی دەگواستەوە. فیلمی ئافرەتان کەلەسەر گۆڕی کەسانی خۆیان دەگریان کەبەشێوەیەکی نادیار دەکوژران، چاوپێکەوتن لەگەڵ ئێرانیانی فەرەنسا کەتوندوتیژی کەسانی ئەمنی سەواك، پۆلیسی نهێنی ئێران، هەلأتبوون، راپۆرتەکان لەسەر گەندەڵیو وەرگرتنی سوودی تایبەت لەکاروباری حکومەت، فەرەنسا هەلومەرجی ئێرانیان بەباوەڕی من بەڕەشو سپیان دەبینی، حەیرانو شێواو بووم. هەواڵەکانی پێهەڵگوتن ئیمام خومەینی و یاوەرانی، کەئەوکات لەفەرەنسا بوون ماتو حیرانی زیاتر دەکردم.

پەیوەمندیم بەئەنوەر کرد:((من پەیوەندیم بەفەرەح لەتاران کرد.))

پرسی:((چۆنبوون؟))

((فەرەح گوتی باشن، بەلأم سەردەمێکی دژوار تێپەڕ دەکەن.))

ئەنوەر، بەدواداچۆنی ڕووداوەکانی ئێرانی لەکەمپ دیوید دەکرد، گوتی:((من زۆر نیگەرانم، من خۆم پەیوەندیم بەشا کرد، بۆم باسکرد دوعای بۆدەکەم.))

بەئەنوەرم گوت:((من دوعا بۆئێوەو هەنگاوەکانی ئاشتی دوعا دەکەم.))

منو نوهییە لەگەڵ شەریف لەنەخوشخانەیەك بووین کەسەرقاڵی چارەسەری نەخۆشی شەریف بوون، کاتیترم تەرخان دەکرد بۆ ڕووداوەکانی ئێران. توانای دیدار لەگەڵ هاوڕێیانو خواردن لەخواردنگەکانم نەبوو. چونکە هەواڵەکان بەردەوام نەخۆشتر دەبوون. بۆخۆدوورخستنەوە هەواڵەکانی ئێران خۆم سەرقاڵی ئامادەکاری جەژنی هاوسەرگیری جەماڵو دینا کرد.

بڕیاربوو خیمەیەك بەڕەنگی سەوزو سپی، ڕەنگی ئالأی میسر پێش شۆڕش، لەناو باخی حەوشەکەی ئێمە ئامادە بکرێت. سەرمێزەکانو گوڵەکانی سپی، تەختی نووستنی بووکو زاواو

گوڵی سەری کچەکانی کەهاوڕێیەتیان دەکەن هەموویان سپی. ٢٥٠٠ میوان بۆئەم جەژنەی هاوسەرگیری بانگێشت کرابوون، لەوانە هەموو ئافرەتانی هاوکارم لەکارگەی تلا، ئافرەتانی ئەندامی پەرلەمان، ئافرەتانی بواری چالاکییەکانی کۆمەڵایەتی کەهاوکاری منیان دەکرد. هەموویان.

زۆر لەگۆرانی بێژەکان کەبەخۆبەش ئامادەی بەرنامەکان دەبوون.، بەڵام ئێمە تەنیا توانیمان داواکاری چوار پێنج کەس قبووڵ بکەین، ئەگەرنا ئەم جەژنە چەند هەفتەیەك درێژەی دەکێشا. کاتێك بڕیاربوو سەباح، کچی جوانی لوبنان یەکێك لەخۆشەویسترین گۆرانی بێژەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەراست، بەشداری بکاتو گۆڕانییەکانی خۆی پێشکەشی ئێمەوە میوانەکان بکات زۆر خوشحاڵبووم. جەماڵ منداڵی کۆتایی ئێمەبوو دەیویست هاوسەرگیری بکات دەموویست ئەم جەژنە هیچ کەمو کورتی نەبێت. ڕۆژانە لەپاریس پەیوەندیم بەنووسینگەی خۆم لەقاهیرە دەکرد: ئایا سەماکارەکان، گروپی سەماو فلکلۆری ریدا، کەسانی کومێدیەن‌و نوکتەزان‌و گاڵتەچی، ئەسپەکانی سپی‌و جوان کەبڕیاربوو لەناو باخ سەما بکەن، هەموویان ئامادە بوون؟ بەتەلەفۆن پرسیاری کێکی حەوت قاتم دەکرد. بڕیاربوو کاتێك جەماڵ‌و دینا ئەم کێکە ببڕن کوترەکانی سپی لەسەر سەریان هەڵفڕن. ئایا ئەم کوترانەی سپی دەبن بەهێمایەك بۆئاشتی؟ لەشەوی پانزدەی ئەیلوول، دە ڕۆژ دوای گەیشتنی ئەنوەر بۆکەمپ دیوید، وەك جاران بەردەوام تەلەفۆنم بۆئەنوەر دەکردن.

کاتێك گوێبیستی دەنگی بووم زانیم کێشەیەکی بۆدروستبووە. گوتم:((ئەنوەر شتێك ڕوویداوە؟))

گوتی:((لەکەمپ دیوید دەڕۆم!))

((لەکەمپ دیوید دەڕۆیت؟ چە ڕوویداوە ئەنوەر؟))

((بگین قسەی دروستی لەسەری ناچەقێت، ئامادە نییە دەسەڵاتی لێوارەکانی ڕۆژئاوا بۆعەرەب بگەڕێنێتەوە. شەوی رابردوو موشەدایان گوتی تاکو ئێستا ئیسرائیل بڕیار نییە هیچ رێکەوتنێك واژۆ بکات. بەردەوامی ئەم کارانە هیچ سوودێکی نییە. هەموو رەنجەکانی ئێمەیان بەبادا.))

((ئەنوەر داوات لێدەکەم دوو ڕۆژیتر بمێنەوە بزانە چی ڕوودەدات ئەم هەموو ماوەیە ڕاوەستاوی با ئەم ڕۆژانەشی لەسەر بێت.))

((جیهان هیچ سوودێکی نییە.))

((بەڵام ئەنوەر ئەگەر بگەڕێتەوە دەرفەتێك بۆ گەیشتن بەئاشتی نامێنێت. دەبێت بمێنیتەوە. بمێنیتەوە.))

((جانتاکانم ئامادەن‌و داوای کۆپتەرمان کردووە کەئێمە بگەیەنێت بەفرۆکەخانەی واشنتۆن.))

((سەرۆك کارتەر هەواڵی ڕۆیشتنی ئێوەی هەیە؟))

((بەڵێ، داوای لێکردم بەتەنیا ببینم، بەڵام من هیچ هۆکارێك بۆئەم دیدارە نابینم.))

((ئەنوەر تۆ بەڵێنت بەکارتەر داوە هەرچی لەتوانات دابێت بۆئاشتی بکەیت. ئێستا بەڵێنی خۆت دەشکێنی کارتەر کەسێکی بەئەخلاق‌و خاوەن بنەمایە، تۆش بەهەمان شێوە. نابێت بەم شێوەیە هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکەیت.))

((هیچ چارەیەکم نییە.))

((بۆچی، دەتوانی گوێی لەقسەکانی کارتەر بگریت. داوات لێدەکەم، ئەنوەر.))

بەدەنگێك وەك ئەوەی لەژێر پاڵەپەستۆ بێت گوتی:((زۆرباشە جیهان.))

لەهەمان کات زۆر خەمباربووم کەلەتەنیشت ئەنوەر نەبووم، ئەگەر دەبووم دەمتوانی نەرمی بکەم، بەردەوام روحییەم پێدەدا. دواتر زانیم کەسەرۆك کارتەرو هاوسەری روزالین داوایان کردبوو هاوسەری هەردوو ڕێبەر بۆساردکردنەوەی توندییەکانی نیوانیان‌و زیاتر لۆژیکی بوون لەسەفەری کەمپ دیوید ئامادەبن. ئەلیزا بگین لەکەمپ دیوید بوو، بەڵام من ناچاربووم نەخشەی هاوسەری لەڕێگای تەلەفۆن لەو بەری ئۆقیانووس جێبەجێ بکەم.

دوای دووکاتژمێر ئەنوەر پەیوەندیکرد. گوتی:((دەمێنمەوە جیهان، بەڵام هیچ بەڵێنێك نادەم.))

گوتم:((خودا خێرت بداتەوە، ئەنوەر، خودا خێرت بداتەوە.))

دوو رۆژ دواتر لەژووری خۆم لەهوتێل بووم، دەنگی تەلەفۆن دەهات. ئەمجارەیان دەنگی ئەنوەر سەرخۆش لەبادەی سەرکەوتنبوو. گوتی:((گەیشتین بەرێکەوتنێك.))

باوەڕم نەدەکرد. بەخوشحاڵی لەڕێگای تەلەفۆنەوە هاوارم کرد:((دوبارەی بۆم باس بکە ئەنوەر، دووبارە تاکو باوەڕ بکەم.))

ئەنوەر گوتی:((وای جیهان، جارێك باسمکردو بەتەواوی گوتم. ئیسرائیل بەڵێنی داوە لەدروستکردنی شاروچکە لەکەنارەکانی رۆژئاوا رابگرێت، دەست بەگفتوگۆ لەگەڵ فەلەستین

بکەن بۆدروستکردنی حکومەتی ئۆتۆنۆمیو مێژوویی دیاری بکرێت. ئێستا بۆراگەیاندنی سەردانی واشنتۆن دەکەین.))

گوتم:((دوعاکانم قبوولکران.))

ئەنوەر توند توند گوتی:((ئەمشەو سەردانی مەراکێش دەکەم. تۆ وەرە بۆلام.))

گوتم:((بێگومان دێم، بەم هەواڵە بەبێ فرۆکەش هەڵدەفرم.))

ئاشتی. لەئەنجامدا ئاشتی. کچی خۆمو هاوڕێیەك کەلەگەڵ ئێمە دابوو لەباوەشم گرتن: ((ئەمرۆ سەردانی خۆشترین چیشتخانەی پاریس دەکەین، دەکەین بەجەژن. هەڵبژاردن لەئێوە. میوانداری لەمن.))

بەشێوەیەکی پەرچوویی لەناو شەقامەکان هاوڕێیانی قاهیرەی خۆمان، ئەمین شاکر. یەکێك لەوەزیرانی حکومەتو هاوسەری زینا، کچەکەیان مونا،بینیمان.

پرسیارم لێکردن:((هەواڵەکانی خۆشتان بیستوون؟)) کاتێك هەواڵەکەم پێی گەیاند زمانی ئەمینو زینا لاڵبوو. گوتم:((وەر بابڕۆین پێکەوە بکەین بەجەژن. میوانی منن.))

ئەمین پێداگری کرد دەبێت ئێمە میوانی بینو گوتی من پیاوم. هەمووومان پێکەوە رۆیشتین لەبەر ئازایەتی ئاسوودەیی خەیاڵی ئەنوەر رۆیشتین کردمان بەجەژن.

کاتێك لەمەراکێش ئەنوەرم بینی، بۆی باسکردم رێکەوتنی ئێمە لەقۆناخی سەرەتایی خۆیدایە، هەندێك وردەکاری ماون دەبێت چارەسەری بکەین. پرسیارم لەئەنوەر کرد: ((چەند درێژە دەکێشێت؟))

گوتی:((لەوانەیە سێ مانگ.)) دواتر بۆئاهەنگی هاوسەرگیری کوڕی خۆمان گەڕاینەوە بۆمیسر. میوانەکان روویان لەئەنوەر دەکردو دەیانگوت:((پیرۆزە.)) لەسەر شەقامەکان خەڵك کۆببوونەوە تاکو بۆجەماڵو بۆئەنوەر کەئاشتی بۆولآت هێنابوو، دوعای خێریان دەکرد باخی ماڵی ئێمە هیچ کاتێك ئەوەندە جوان نەبوو. رەنگەکانی سەوزو سپی رەنگی ئاشتی بوون. کاتێك کوترەکانی سپی هەڵفڕین. فرمێسك لەچاوی زۆر لەمیوانەکان دەهاتەخوارەوە. ئاشتی. هاوسەرگیری کوڕی ئێمە. بەیانی هەمان رۆژ کەلەئەیوانی ماڵەکەمان دانیشتبووین تەماشای خەڵکمان لەسەر شەقام دەکرد سەماو هەڵپەڕکێیان دەکرد ئەنوەر گوتی:((جەماڵ وەرە، دینا وەرە.)) دەستی یەکترمان گرت وەك بازنە، دواتر لەبەرامبەر نیگاکانی باوەڕ نەکراوی ئێمە دەستی بەسەمای دبکات کردو هەنگاوەکانی ئێمەی رێنوێنی دەکرد. من لەسەرسامیو شادی

زیاتر لەڕادەی خۆیی کەلەڕوخساری ئەنوەرم دەبینی، ئەوەندە سەماو هەڵپەڕکێو پێکەنیم کەتەنیشتەکانم ژانیان دەکرد. ئەمەیان یەکەمجارو جاری کۆتایی بوو کەسەماکردنی ئەنوەرم دەبینی.

لەبیستو حەوتی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٧٨، خەڵاتی ئاشتی نوبڵ بەهاوبەشی پێشکەشی ئەنوەرو مناخیم بگین کرا. لەئەمەریکا، ئەوروپا، میسر کەمو زیاد بەچاوی فریشتە تەماشای ئەنوەریان دەکرد، شەهیدی زیندوو کەئامادەبوو بەبێ مەرج گیانی خۆی بکات بەقوربانی لەڕێگای کۆتایی هێنان بەچەندین سەدە کێشەی نیوان یەهوودییەتو موسڵمانان. بەڵام لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاست ئەنوەر بەکەسێکی خرابو ئەم جۆرە ئاشتییە بەکوفر هەژمار دەکرا. شەش مانگ دوای گەڕانەوەی ئەنوەر لەکەمپ دیوید، وڵاتانی عەرەبی پێشنیاریان بۆدەکرد تاکو ماوەی دەساڵ ساڵە پێنج ملیارد دۆلار پێشکەشی دەکەن بەڵام دەبێت پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئیسرائیل ببڕێت. ئەنوەر بەئاشکرا ئەم بەرتیلەی ڕەتکردەوە. لەوتاری خۆی لەناو پەرلەمان گوتی بۆخەڵکی میسر پاراستنی بنەمای ئەخلاقیو بەهاکان لەهەمووشتێک گرنگترە. میسر ((وەك وڵاتانیتر نییە کەبەسەد ملیون دۆلار ئەم بڕیارە بداتو بەسەد ملیون دۆلار بڕیارێکیتر. نەخێر، تەواوی ملیاردەکانی ئەم جیهانە ناتوانن ئیرادەی میسر بکڕن.))

سەرم سوڕ دەما لەهاوڕێیانی ئێمەی عەرەب کەلەزۆر لایەن پێکەوە هاوبەش بووین. دەمزانی زۆربەی فەرمانڕەوایانی عەرەب لەدڵەوە هاوڕان لەگەڵ ئاشتی ئەنوەر، بەڵام بوێری هێنانی بۆسەر زمانیان نەبوو. دیپلۆماتێکی بیانی،، لەگەڕانەوی لەکۆبوونەوەی ئیماراتی کەنداو، بۆی باسکردم. یەکێك لەبەرپرسانی حکومەت لەکەنداو ستایشی کاری ئەنوەری دەکرد بەگەڕاندنەوەی خاکی میسر لەڕێگای ئاشتی، ڕۆژی دواتر هەمان بەرپرسی حکومەت لەبەرامبەر چاوی پەیامنێران دەڵێت ئەوەی ئەنوەر کردی کارێکی دروست نەبوو. چونکە ئیسرائیل خاکی فەلەستینی داگیرکردووە هەموو عەرەبەکان دژی گفتوگۆن لەگەڵ ئیسرائیل.

مەلیك فەهد، لەسەردمی جێگری پاشایەتی بەردەوام لەجیزە لەماڵی ئێمەبوو، ئێستا ڕێگای بەرۆژنامەکاندا کەهێرش بکرێتە سەر کەسایەتی ئەنوەر. بەهەمان شێوە هێرش دەکرایە سەرکەسایەتی من، من لەناو شازادەکانی ژن لەسعودیا ڕێزی تایبەتم لێدەگیرا بەڵام دیسان هێرشەکان بەردەوام بوون. ڕۆژنامەکانی سووریا بەهەمان شێوە هەرچەند دۆستایەتی ئێمەو

حافز ئەسەد بۆسالأنی پێش سەرۆکایەتی دەگەڕایەوە بەلأم زۆر بێبەزەیانە هێرشیان دەکردە سەر ئێمە.

لەم هێرشانە بەردەوام لەئازار دابووم، رەخنەی هاوسەرانی سەرانی عەرەب لەسەر دیدگایان بۆئاشتی ئەنوەر خەمی زۆرم دەخواردن. خاتوو وەسیلە هاوسەری بورقیبە، سەرۆککۆماری تونس، کاتێك منو ئەنوەر لەکۆشکی جوانیان لەقەراخ دەریا بۆدیداریان رۆیشتین، میوانییەکی جوانو رێکوپێك لەبەر من رێکخرابوو، لەکاتی سەفەری ئەنوەر بۆقودس میوانی فەرمی ئێمەبوو لەقاهیرە. ئەوکات زۆر لایەنگری داخوازی ئاشتیانەی ئەنوەر دەهاتە بەرچاو، بەلأم دواتر نامەیەکی تایبەتم بۆڕەوانە دەکاتو لەنامەکەیدا گلەیی لەرێکەوتنی ئاشتی کەمپ دیوید دەکات. وەلأمێکی زۆرجوانم بۆ ڕەوانەکرد، بەختەوەرانە دۆستایەتی ئێمە وەك خۆی مایەوە. بەلأم زۆربەی هاوسەرانی سەرانی عەرەب بەتەواوی پەیوەندییەکانی خۆیان لەگەڵ مندا بڕین. لەم هەڵوێستەیان بەراستی ئازارم کێشا، چونکە پەیوەندییەکانی تایبەتیو تاکەکەسیك لەسەربنەمای سیاسەت دیاری دەکران، چ زیانێکی بێمانا.

نائارامیو تووڕە بوونی هاوسەری ئەحمەد خەتیب زۆرباش بەیادم دێتەوە، کاتێك کەهاوسەری لەماوەیەکی کورت دەبێتە سەرۆك وەزیری ولأتە یەکگرتووەکانی عەرەبی، لەرۆژنامەکان هێرشیکردە سەر میسر، بەسەردانێك لەقاهیرە دەبێت. هیچ یەکێك لەئافرەتانی میسر ئامادە نەبوون لەمیوانداری بەتایبەتی من. لەگەڵ رەخنەکانی هاوسەری هاوڕا نەبووین، ئێمە زۆر لەهاوسەری تووڕە بووین نەك لەخویی. کاتێك رۆیشتم لەتەنیشت هاوسەری ئەحمەد خەتیب دانیشتم فرمێسك لەچاوەکانی هاتنەخوارەوە. بەگریانەوە گوتی:((جیهانی ئازیزم، خوشکم، ببوورە، ئەمانە تەنیا زاراوەی سیاسین.)) ئارامم کردەوەو گوتم:((بەڵێ بێگومان هەمووکمان دەزانین سیاسەت واتە جیاوازییەکان لەکۆتایدا چارەسەر دەکرێن. پەیوەندی بەئێمەوە نییە. باشتر دەبێت سیاسەت بەلأوە بنێن لەهاوبەشی ژنانەی خۆمان تامو چێژ وەربگرین.)) هەمووکاتێك ئەم هەستەم هەبوو. بەلأم هەموویان بەم شێوەیە نەبوون.

لەهاوینی ١٩٧٨، مونا ناسر، یەکێك لەکچەکانی جەماڵ عەبدولناسر، بەتەلەفۆن پەیوەندی بەمنەوە کردو گوتی:((خاڵەت جیهان، دەبێت بەتەنیا بتان بینم، ئێستا لەلیبیا گەڕاومەتەوە پەیامێکی موعەمەر قەزافیم بۆتۆ هێناوە.))

دواتر بۆم باسکرد:((مونا، ئێستا ناتوانم، ئەنوەر سەردانی سودان دەکات، کاتێك بەڕێمانکرد من خۆم پەیوەندی بۆتۆ دەکەم.))

پەیامێك لەقەزافی؟ ساردبوومەوە، چەندین مانگبوو قەزافی هەڕشەی کوشتنی لەئەنوەر دەکرد. ئایا دەیوویست ئەنوەر لەسوودان تیرۆر بکات؟ ڕۆیشتم بۆنهۆمی خوارەوە تاکو بۆی باس بکەم رام گۆڕاوە دەمەوێت لەم سەفەردا هاوڕێیەتی بکەم. باسی پەیوەندی تەلەفۆنی مونام نەکردو لەسەفەری دوو ڕۆژەی بۆسوودان، نەوەك کەسێك بوێری ئەوەی بەخۆی دابێت شتێك لەئەنوەر بکات لەتەنیشتی نەدەجولآمەوە. دوای گەڕانەوەمان، بانگێشتی مونام کرد سەردانم بکات. مونا هەستەکانی منی پشت ڕاستکردنەوە. قەزافی بۆی باس دەکات ئەگەر جیهان لەهەمان ڕێکەوتنی کەمپ دیوید پەشیمان نەکاتەوە ناچار دەبێت ئەنوەر بکوژێت.

هەڵخرۆشام. داوام لەمونا کرد کەزۆر لەم لایەنەوە لەئازاردابوو گوت:((داوات لێدەکەم پەیامی من بەموعەمەر قەزافی بگەێنە من وەك هاوسەری سەرۆککۆمار دەستوەردان لەکاروبارەکانی سیاسی حکومەت وەرنادەم. بەلآم لەلایەنی کوشتنی ئەنوەر سادات تەمەن تەنیا لەدەستی خودا دایە.))

هیچ وەلآمێکم وەرنەگرتەوە. بەپێچەوانە، ڕاگەیاندنەکانی لیبیا هێرشی خۆیان دژی من دەست پێکرد. ڕۆژنامەکانی لیبیا رایان گەیاند:((جیهان سادات دەیەوێت فەرمانڕەوایی میسر بکات. هاوسەری تەنیا بڕیارەکانی جێبەجێ دەکات!))

ئیسرائیل دەستیان لەکردەوەکانی بێشەرمانەی خۆیان هەڵنەدەگرد. سێ مانگ لەڕێکەوتنی نیوانمان تێپەڕی نەکردبوو دەستیان بەشکاندنی بەڵێنەکانی خۆیاندا. لەجیاتی ڕاگرتنی شاروچکەکان دەستیان بەدروستکردنی شاروچکەی زیاتر کرد. ئەنوەر ئەمەی دژی روحی ریکەوتنی ئاشتی پێناسەکرد. ئەوەندە تووڕە بوو ئامادە نەبوو سەردانی ئۆسلۆ بکات بۆوەرگرتنی خەلآتی نوبڵ بەهاوبەشی لەگەڵ بگین. لەجیاتی ئەنوەر سەعید مەرعی ڕۆیشت، سەرۆکی پەرلەمان ڕۆیشت، باوکی هاوسەری کچم. ئەنوەر هەمان لایەنی دارایی خەلآتی وەرنەگرت و رایسپاردن کەخانووە قورەکانی میت ئەبونەلکۆمی پێی دروست بکرێنەوە. لەبیست و پێنجی کانوونی دووەمی ١٩٧٨، ئەنوەر سالرۆژی لەدایکبوونی خۆی لەگوند بەبیرکردنەوە کردەوە من و منداڵەکان هەوڵی خۆماندا هەستی بەرز ڕابگرین.

من وەك زۆر کەسیتر لەبەلێنەکانی بێبنەمای ئیسرائیل بێزاربووم. لەهەمان ساتی رۆیشتنی ئەنوەر بۆقودس هەزاران میسری بەباوەشی کراوە لەجیاتی دوژمنایەتی دۆستایەتیی ئیسرائیلیان قبووڵ کردبوو. دوای سەردانی ئەنوەر گروپێکی رۆژنامەنووسانی ئیسرائیل سەردانی میسریان کرد بەباوەشی کراوە خەڵك پێشوازی لێدەکرد بەوشەی (شلوم) واتە سلاو دیاریان پێشکەش دەکرد. من بەنیگەرانی چاوپێکەوتنم لەگەڵ رۆژنامەنووسێك قبووڵکرد. چونکە بۆیان باسکردم (ئۆری ئەونری) یەکێك لەپشتیوانانی ئاشتیبوو لەگەڵ فەلەستینییەکان تاکو دەرکرانی لەپەرلەمانی ئیسرائیل لەلایەن گوڵدا مایەر، وتەبێژی پارتی ئاشتی ئیسرائیل بوو. ئێستا بەبێ ئومێد لەئاشتی، ئامادەم چاوپێکەوتن لەگەڵ ئوری ئەونری بکەم.

پرسیارم لێکرد:((لەوەلاتی ئێوە چی تێپەڕ دەبێت؟ یەکەم بەئاشتیخوازی دەستان پێکرد داواتان کرد بەفەرمی بتانناسین هاوسەرم خەیاڵی ئێوەی کرد بەحەقیقەت. ئێستا تەنیا کارێك کەدەکەن بەرد دەخەنە ژێر کالێسکەی ئاشتی بۆ؟))

ئوری نەیدەتوانی دژایەتی قسەکانی من بکات. دواتر روونیکردەوە:((خەڵکی ئێمە ڕق لەدڵن. ئازارو ئەشکەنجەی یەهوودیان لەئەوروپا فێریکردین کەگومانمان لەهەمووشتێك هەبێت. ئاشتی دێت بەلاّم زەمەن لەگەڵ خۆیدا دەبات.))

بەگاڵتەم پێگوت:((لەراستیدا ئێوە بۆئاشتی پێویستیتان بەرێبەرێکی ئازا نییە، زیاتر پێویستیتان بەوەفدێکی شیکاری دەروونی هەیە تاکو ڕقەکانتان رزگارتان بکات.))

ئۆری جگە لەقبووڵکردنی چارەیەکیتری نەبوو:((بەڵێ راست دەکەیت.))

ساڵی ١٩٧٨ کۆتایی دەهات هەموومان نائومێد بووین. زیاتر لەساڵێك بەسەر دیداری ئەنوەر بۆقودس تێپەڕیکرد، سێ مانگ لەرێکەوتنی کەمپ دیوید هیچ هەواڵێك لەئاشتی لەگەڵ ئیسرائیل نەبوو. هەواڵەکانی ئێران زۆر خراپتر دەبوون. قوتابیانی زانکۆ دژی شای ئێران خۆپیشاندانیان کرد، ژنانو منداڵەکان هەموویان دژی شا خۆپیشاندانیان دەکرد. لەبەخاکسپاردنی قوربانییەك بەدەستی پۆلیس خوپیشاندانێکی نوێتری سەری هەڵدەدا. لەرێورەسمی چلەمینەکان خۆپیشاندان زیاتر دەبوونو خەڵکانی زیاتر دەکوژران. لەهەمان سەردەم لەئێران توندوتیژییەکان زۆر بەباشی رێکدەخرانو لەناوبردنی شا نزیکتر دەبوو.

لەدەستپێکی ساڵی زایینی ١٩٧٩، پەیوەندیم بەشابانۆ کرد:((فەرەح. لەرۆژنامەکان خوێندمانەوە بەرنامە سەفەرتان بۆپشوودان هەیە. بۆچی سەردانی ئێمە لەمیسر ناکەن؟))

فەرەح وەڵامی دایەوە:((نا، جیهان، سوپاست دەکەم. تاکو ئێستا هیچ بەرنامەیەك بۆ سەفەری پشوودانمان نییە.)) دوای پەیوەندی سەرم لەم بابەتە دەرنەدەچوو تاکو ڕادەیەك گێژ دەبووم. کاتێك باسی سەفەرو پشوودانی ئێوە لەرۆژنامەکان بلاّو دەکرێتەوە، دواتر هەستمکرد ئەمەیان سەفەرێکی ناچارییە. ژیانی ئەمانە لەئێران لەمەترسیدایە. ئایا فەرەح هەستی بەم لایەنە نەدەکرد؟ بۆچی بانگێشتی ئێمەی رەتکردەوە؟ بێگومان دەیزانی جگە لەبابەتەکانی سیاسی ئەمانە لەلایەن منو ئەنوەر خۆشەویستن، هاوڕێی ئێمەن.

داوام لەئەنوەرکرد:((دەکرێ پەیوەندی بەشای ئێرانەوە بکەیت کەبۆچی بیروباوەڕیان سەبارەت بەهاتن بۆمیسر گۆڕاوە؟ نازانم بۆچی میوانداری بانگێشتنانەی ئێمەیان قبووڵ نەکرد.)دواتر ئەنوەر بابەتی بۆچیو چۆنی ڕووداوەکانی بۆباسکردم:((بالیوزی ئەمەریکا لەتاران پاڵەپەستۆی زۆریان خستووتە سەر شا کەبۆماوەیەك سەفەری دەرەوەی وڵات بکات کەحکومەتی نوێ بتوانێت ئارامی بۆئێران بگەڕێنێتەوە بەلاّم شا نایەوێت بڕوات، کاتێك تۆ تەلەفۆنیان بۆدەکەیت گومانیان پەیدا کردووە کە ئەمەریکا لەرێگای منەوە دەیەوێ شا لەئێران بچێتە دەرەوە. کاتێك پشتراستم کردەوە ئەمەیان بانگێشتنامەیەکی تایبەتییە هیچ پەیوەندی بە سیاسەتەوە نییە.، بیروباوەڕیان گۆڕا. فەرەح هەفتەی داهاتوو سەردانمان دەکات.)) گوتم:((ئەنوەر، چ هەواڵێکی باش، هەردووکیان زۆر ئازاریان کێشاوە.))

ئەنوەر گوتی:((ئەوەی لەتوانام دابێت بۆ پێشوازی لەشا دەکەم. هیچ کاتێك هاوکاری شا لەشەڕی تشرینی یەکەمو پشتیوانی لەئاشتی نیوانمان لەیاد ناکەم. ئێستا ئەرکی ئێمەیە لەتەنیشتی ڕاوەستین.))

لەهەفدەی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٧٩ فرۆکەی تایبەتی شا لەفرۆکەخانە نیشتەوە من لەگەڵ ئەنوەر لەفرۆکەخانە ئەسوان وەستابووم. ئەنوەر بڕیاریدابوو پێشوازی بەشێوەیەکی فەرمیو سەربازی تەواو ڕێکبخرێ، هەرچەند حکومەتێکی کاتی لەئێران دامەزرابوو بەلاّم شا سەرۆکی وڵاتی خۆیبوو. تەواوی وەزیرەکانی حکومەت، بالیوزی ئێران لەمیسر، عەباس نیری بۆپێشوازیکردن لەفرۆکەخانە ئامادە بوون. بالیوزی ئێران عەباس وەك ئێمەی دەزانی کەشا هیچ کاتێك ناگەڕێتەوە بۆئێران، خۆشی وەك بالیوز کەپێشوازی لەشا کردبوو لەلایەن حکومەتی نوێ لێپێچینەوەی توند کرا. بەلاّم عەباس وەك هاوسەرم کەسێکی خاوەن بنەمای نەگۆڕبوو. شای ئێران تاکو ئەوکات شاهنشای ئێرانبوو.

شا زۆر پیداگر دەهاتە بەرچاو کاتێك هەنگاوی نایە سەر فەرشی سوور بەرێکو پێکی لەبەرامبەر سەربازەکانی پێشوازی وەستایەوە کەبە شەرفمەندی هاتنی بیستو یەك گوڵە تەقێندران. مۆزیکی سەربازی لەلێدانی سروودی نیشتیمانی هەردوو وڵاتی میسرو ئێران بەردەوامبوو. ئەوکات منو ئەنوەر نەماندەزانی شای ئێران گیرۆدەی نەخۆشی پەنجەشێر بۆتەوە. من لاوازبوونی جەستەی شام بۆپاڵەپەستۆی سیاسی ناوخۆی ئێران دەگەڕاندەوە دڵم بۆی دەسووتا. ئەنوەر بەگەرمی پێشوازی لەشا کردو یەکتریان ماچ کرد، راوێژکارانی، لەبەر ئەوەی وێنەی لەهەموو رۆژنامەکانی جیهان دەردەچێت، پێشنیاری بۆدەکەن زۆر خۆت لەشا نزیكو گەرمو گوڕی لەخۆتان نیشان نەدەن. بەڵام ئەنوەر کەسێك نەبوو بەهەڵگەڕانەوەی کاغەزی سیاسی پشت لەهاوڕێی خۆی بکات.

ئەنوەر روو لەشای ئێران دەکات کەچاوەکانی پڕ لەفرمێسك بوون، دەڵێت:((محەممەد، خەیاڵت ئاسوودە بێت، تۆ لەوڵاتی خۆتو لەنیوان خەڵکی خۆتو براکانی خۆتدایی.))

کاتێك شاو ئەنوەر لەگارد تێپەڕ دەبوونو منو فەرەح لەپشتەوەیان دەهاتین. فەرەح ئافرەتێکی زۆر خۆشەویستبوو، ئێستاش هەروایە. زەحمەتی زۆری بۆوڵاتی خۆی کێشابوو. خوزگە کاتی زیاتری دەبوو. لەسەردەمی کەچوار منداڵی بچووکبوون نەیدەتوانی وەك پێویست چالاکی کۆمەڵایەتی خۆی ئەنجام بدات. بەڵام دواتر بەگوێگرتن لەکێشەکانی خەڵك دەبێتە بازنەی پەیوەندی نیوان خەڵك وشای ئێران. کاتێك بەئۆتۆمبێل پێکەوە بەرەو هوتیل ئۆبریو دەڕۆیشتین، دەستی خۆم لەسەر شانەکانی دانابوونو داوتر لەباوەشم گرت. بەپێی بڕیاری ئەنوەر، وێنەکانی شا کەلەیەکێك لەسەفەرەکانی بۆقاهیرە لەگەڵ ئەنوەر گیرابوون، لەرێگای فرۆکەخانە بۆهوتیل هەڵواسرابوون، بەڵام گومان دەکەم کەشا بەهەمان ئالۆزییەکانی مێشكو دەروونی وێنەکانی بینیبن. لەناو ئۆتۆمبێل کاتێك شاباسی خواحافیزی ژنەراڵەکانی لەفرۆکەخانە دەکات، فرمێسك لەچاوەکانی دێنەخوارەوە:((کاتێك پاسەوانم دەستی گرتمو داوای دەکردو دەیگوت"ئێمە بەجێمان مەهێڵە، ئێران بەبێ تۆ لەدەستمان دەڕۆت. ئایندەمان تاریکە." هەستی هەمان فەرماندەی سەربازیم هەبوو کەمەیدانی شەڕ چووڵ دەکات.))

ئەنوەر دەستبەجێ هێزەکانی چەکداری ئێران لەنیوان ئالۆزییەکان وەفاداری شابوون، پێشنیاری پەنابەری بۆدەرخستن. بۆشای ئێران باسدەکات بۆچی هێزی ئاسمانیو دەریایی

خۆتان لەئێران ناهێننە دەرەوە؟ میسر ئامادەیە تاکو ئارام بوونەوەی هەلومەرجی ئێران ئەمانە بپارێزێت.))

بەلاّم وەلاّمی شا نیشانەی نائومێدیبوو. بەخەمباری دەلێت:((ئەمەریکا ڕێگا نادەت، منیان ناچارکرد لەولاّتی خۆم بێمە دەرەوە. بالیوزی ئەمەریکا لەفرۆکەخانە خولەك بەخولەك تەماشای کاتژمێری دەکردو دەیگوت خولەکێك مانەوەت نەلەبەرژەوەندی ئێرانە نەخۆت.))

ئەنوەر دواتر بۆی باسکردم باوەڕم نەدەکرد هیچ ڕێبەرێك، بەتایبەتی شای ئێران ڕێگا بدات ولاّتی لەلایەن خەلّکی بیانی ئیدارە بکرێ. ئەوکات زانی کاری شای ئێران تەواوە.

ڕۆژنامەکانی میسرو ئێران مانەوەی شای ئێران لەمیسر بۆ تێپەڕکردنی پشوودانی شاو خێزانی دەبێت. فەرەح تەنیا بەچەند دەستە جلوبەرگێك سەفەری خۆی دەست پێکردبوو. لەپێنج ڕۆژی دواتر چەندینجار دووبارەی دەکردەوە دەگەڕێنەوە بۆتاران. شا زیاتر بەرچاو روونبوو، دلّتەنگبوو بۆگەڕانەوەی بۆئێران. بۆی باس دەکردین جگە لەئەمەریکا ڕاوێژکارانی خۆی داوایان لێدەکرد بۆماوەیەك لەئێران بچێتەدەرەوە چونکە بەگومانی ئەمانە بەم شێوەیە ولاّت ئارام دەبوو. هەردووکیان پێکەو دەیانگوت ئێمە چاوەڕێی دەرفەتێکی باشین بۆگەڕانەوە. بەلاّم هەواڵەکانی هەلومەرجی ئێران ڕۆژانە خراپتر دەبوون. بابەتی قسەکردنمان ئەوەبوو شا نەیدەتوانی دەردو ئازاری خۆی لەهەڵەکانی کەڕوویاندابوو بشارێتەوە، هەڵەکانی کەزۆربەیان خۆی بەتاوانبار دەزانی. بەشێك لەئەندامانی خێزانو بەرپرسانی کەسانی گەندەلّبوون. پۆلیسی نهێنی، ساواك، زیاتر لەڕادەی خۆیان زولّم لەخەلّك دەکرا. زۆربەی هەواڵەکان بەدەستی نەدەگەیشتن‌و لەئەنجامدا لەچارەسەر کردنیان بێتوانابوو لەهەموو هەولّدانەکان رادەگیرا. ڕاوێژکارانی زیاتر لەڕادەی خۆیان بەلاّوە نابوو. ئێمە بۆئارامکردنەوەی بەردەوام دەمانگوت: ((سوپاس بۆخودا کەئێستا بەسەلاّمی گەیشتوویی.)) شای ئێران‌و هاوسەری بەراستی لەناو شەوە موتکەیەك دەربازیان ببوو، لەوانەیە هەردووکیان کوژرابان.

شا بەیانیان لەدەوروبەری هوتێل ئۆبریو کەدورگەی دەستکرد لەنیوان رووباری نیل، ئێمە لەبەر دووره پەرێزی لەخەلّك‌و ئارامی ئەم شوێنەمان بۆهەلّبژاردبوو، کاتژمێرێك پیادەڕەوی دەکرد. لەلایەکی ئەم دورگەیە چراکانی ئەسوان بەدەر دەکەوتن، دیویتری ئارامگای ئاغاخانی ئیمامی ئیسماعیلییە، فرقەیەکی بچووك لەموسلمانەکانی شیعەبوون هەرچەند ئاغاخانی گەورە، باپیری ئاغاخانی ئێستای، میسر نەبوو، بەلاّم ویستیبوو لەئەسوان بەخاك بسپێرن. یەکێك

لەنهێنییەکانی شاراوەی کەشیاوی لێکدانەوە نەبوو رووداوەکانی ئاغاخان بوو، لەتەواوی ماوەی مانەوەی بەکورسی جوولەیی دەسوڕایەوە دەیتوانی لەئەسوان بەبێ دەرد لەسەرپێیەکانی خۆی بسوڕێتەوە. لەوانەیە هۆکاری نەمانی دەردی پێیەکانی کەش‌و هەوای ئەسوان بێت، کەش‌و هەوای ئەسوان ئەوەندە وشکبوو کەپێش دروستکردنی سەدەی گەورەی ئەسوان هیچ کەسێك لەئاسمانی ئەم ناوچەیە پەلەئەوەرێکی نەبینیبوو. چ کەسێك نهێنی‌و رازی بیابان دەزانی؟ ئاغاخان هەموو سالێك زستانان بەمەبەستی پشوودان‌و هەنگاو هەلگرتن سەردانی ئەسوانی دەکردو بۆسالّی داهاتوو بەناچاری لەسەر کورسی جوولەیی خۆی بەناچاری تێپەڕ دەکرد. من هیواداربووم نهێنی‌و رازی ئەسوان رەنگ‌و روو گۆڕاوی شای ئێران بۆی بگەڕێنێتەوە.

لەچوارەم رۆژی سەفەری شای ئێران بۆمیسر، ئەنوەر بۆبەشداری کردنێکی گرنگ لەگەلّ سەرۆککۆماری تۆمیری داوای لێبۆردنی لەشا کردو رۆیشت بۆسوودان، من بۆشاو فەرەح گەشتێکم لەناو رووباری نیل رێکخست. ئاسوودەتر دەهاتنە بەرچاو بۆ گەشتکردن ئامادەییان هەبوو. بەبردنی خواردن‌و کولاو برێك شیرینی بۆماوەی سێ کاتژمێر بە بەلەم لەناو دەریاچەی ئارامی ناسر لەسەرەوەی بەنداوی گەورە تاکو وێرانەکانی یونانی‌و رۆمی‌و پەرستگەی فیلا رۆیشتین.

هەرکاتێك بەلەمی ئێمە لەکەناراوەکان نزیك دەبوو، خەلّك هاواریان دەکرد بۆشاو فەرەح: بەخێربێن بۆمیسر بەخێربێن، شاو فەرەح سلاّویان لێدەکردو دەکەتنەژێر کاریگەری هەست‌و خۆشەویستی خەلّك. بەلاّم دەمتوانی لەچاوەکانی شای ئێران بخوێنمەوە دەربڕینی هەستی ئەم خەلّك جگە لەخوشحالّی ئازاری خۆی هەبوو، میللەتی خۆی لەئێران سووکایەتییان پێدەکرد.

لەبیست‌و یەکی کانوونی دووەم، شاو فەرەح وەك دەهاتە بەرچاو بەتەواوی پشووی خۆیانداوە‌و ئارام دێنەبەرچاو، ئامادەی رۆیشتن بوون لەمیسر بۆمەراکێش. کاتێك فەرەحم بۆخواحافیزی ماچ دەکرد گوتم:((ئەگەر کاتێك ویستان بگەڕێنەوە بۆمیسر، هەرکاتێك‌و کاتژمێرێك، تەنیا هەوالّی گەڕانەوەتان بەئێمە بگەێنن. هەمووکاتێك بەخێربێن بۆمیسر.))

لەیەکی شوبات ئایەتولا خومەینی گەڕایەوە بۆئێران.

لەکاتی گەڕانەوەم بۆقاهیرە بینیم بلێسەکانی ئاگری نەریتخوازی ئیسلامی ئێرانیان گرتبووە، لەهەمان کات گەیشتبوو زانکۆی ئێمەش. کاتێك دەرۆیشتم بۆزانکۆ هەندێك وێنە‌و دروشمی ئیسلامییەکانی نەریتخوازم دەبینین کەستایشی شۆڕشی ئێرانیان دەکردو بەدیوارەکانەوە

هەڵیاندەواسین نیگەرانبووم. گەنجەکانی خاوەن ریش‌و کچانی سەرداپۆشراو ئاگادارییان بلاودەکردنەوە ئاگادارکردنەوەیەك تێدا بەرچاو دەکەوت حکومەتەکان ئەگەر یاساکانی ئیسلامی رەچاو نەکەن، دەبێت چاوەڕوانی هەستانی خەڵك بکەن.

هەلومەرجم خرابوو، نەك بەجۆرێك کەهەست بەمەترسی بکەم. دەمزانی رووداوی کەلەئێران روویداوە لەمیسر رووی نەدەدا. بچوکترین لێکچوون لەنیوان میسرو ئێران نەبوو. لەمیسر، ئێمەی موسڵمانی سوننە باوەڕمان بەبیروباوەڕی خۆمان هەبوو. شیعەیانی ئێران سیاسیترو ئامادەی زیاتریان هەبوو بۆتوندوتیژی. شیعەکان دوای شەهید بوونی ئیمامی خۆیان(حوسێن د.خ) لەئێراق‌و لەلایەن سوپای یەزید، لەسەدەی حەفدەهەم بەدواوە، هەستێکی خرۆشاو شۆڕش‌و راپەرین دژی کەسانی بەهێز دەکەن بەمیراسی خۆیان. ئەمانە پلەی شەهیدان بەبەرز دەنەرخێنن، گەرم‌و گوڕییەك تاکو ئێستا، لەکوشت‌و کوشتاری شەڕی ئێران‌و عێراق بەردەوامی هەیە. لەئێران، کەسانێك کەلەشەڕی عێراق دەکوژرێن لەگۆرستانێکی تایبەت بەشەهیدان بەخاك دەسپێرن، خێزانی ئەم شەهیدانە خاوەن تایبەتمەندی تایبەت‌و رێز لێگیراون لەناو کۆمەڵگەدا.

دیدگای شیعەکانی ئێران لەسەر خومەینی‌و پێشوایانیتری مەزهەبی زۆر جیاوازە لەگەڵ دیدگای ئێمەی سوننەکان لەمیسر بۆرێبەرانی مەزهەبی ئێمە. موسلمانەکانی سوننە باوەڕدارن هەموو خەڵك بەندەکانی خودای گەورەن‌و لەبەرامبەریدا یەکسانن. هەژارترین کەس بەرادەی شێخ لەخودای گەورە نزیکە. بەلام شیعەکانی ئێران بۆزانایانی ئیسلامی بەرزترین پلەی مەعنەویی‌و سیاسی بەشایستەی دەزانن، قسەی ئایەتولاکانی خۆیان بەیاسا دەزانن. ئەمجۆرە بیروباوەڕە هەندێك زنجیرە قۆناخ دەبڕێ تاکو دەگاتە ئایەتولا خومەینی کەهیچ قسەیەك لەسەرەوەی قسەیدا بوونی نییە. لەوانەیە ببێتە بەرزترین پلە لەسیستەمی حکومەتی نوێی ئێران. لەمیسر، رەشەهۆگرترین سوننەکان رازی نابن کەمرۆڤێك دەتوانیت بەناوی خودای گەورە قسە بکات.

بەم شێوەیە ریتخوازانی ئیسلامی توندڕەو لەزانکۆی قاهیرەو سەرتاسەری میسر هوشیار دەبوونەوە. ئەگەرچی ئەم توندڕەوانە نوێنەرایەتی بەشێکی بچوکی خەڵکیان دەکرد، بەلام زۆر بەرێکوپێکی رێکخرابوون نابێت بەنەبینراوی هەژمار بکرێن. ئەوەی کەمن لەناو زانکۆ بەرچاوم دەکەوت بۆئەنوەرم دەگێڕایەوە، بۆم باسکرد:((گەنجەکانی ئێمە بەرەو نەریتخوازی ئیسلامی دەڕۆن. ئێوە میسرتان چەند هەنگاوێك بەرەو پێش بردووە، بەلام کەسانێك بوونیان هەیە بەرەو دواوە بگەڕێننەوە.))

ئەنوەر قبوولی دەکرد، هەرچەند گومانی دەکرد من بەرەی کاریگەری توندڕەوەکان لەزانکۆ زیاتر لەڕادەی خۆی گەورە دەکەم.

پێداگریم لەقسەی خۆمکرد:((ئەنوەر تەنیا باسی لایەنێك دەکەم کەبەچاوی خۆم بینیی بێت.))

کاتێك ئەنوەر لەمانگی شوبات سەردانی زانکۆی ئەسیوتی کرد کەوتارێك پێشکەش بکات بەئارامی هەناسەی خۆم هەڵدەکێشا. رایگەیاند:((ئێمە نەرێگا دەدەین ئایین دەستوەردان لەناو سیاسەت بکاتو نەسیاسەت دەستوەردان لەئایین بکات. من باوەڕ دەکەم کەدەبێت بەچاوی فەرهەنگ تەماشای مەزهەب بکرێت... نەك بەشێوەیەك کەئەمڕۆ هەندێك کەسی ئایینی لێکدانەوەی بۆدەکەن. ئەمەیان نابێت دەبێت بەچاوی فەرهەنگ تەماشای بکەین کەئارامی مەعنەوی بۆجیهانو کۆمەڵگەو تاکەکانی وڵاتان دەگەڕێنێتەوە.)) دوای وتاری هاوسەرم، خۆپیشاندانەکان ئارامیان بەخۆیانەوە گرت.

بەڵام ئاشتی لەگەڵ ئیسرائیل وەك خۆی بەبێ ئەنجام بەردەوامی هەبوو. شەش مانگ دوای گەڕانەوەی ئەنوەر لەکەمپ دیوید، گفتوگۆکانی لەسەر چارەنووسی رۆژئاوای قودس، کەلەشەڕی ١٩٦٧، لەلایەن ئیسرائیل دەستی بەسەردا گیرابوو، خاوەنداریەتی نەفت لەبیابانی سینا، وەك جاران بابەتی ئۆتۆنۆمی فەلەستین گەیشتبوو قۆناخی داخرانو ئیسرائیل بەردەوام بەدروستکردنی شاروچکەکان دەدا لەکەناراوەکان. کەپێچەوانەی رێکەوتنی کەمپ دیویدبوو. رەوتی ئاشتی لەلێواری هەڵوەشانەوەی خۆیدابوو.

لەدەستپێکی مانگی ئادار ئەنوەر گوتی:((جیهان سەرۆك جیمی کارتەر بڕیاریداوە بۆ بەردەوامی گفتوگۆکان لەگەڵ مندا سەردانی میسر بکات، دواتر سەردانی ئیسرائیل بکات جگە لەم لایەنە هیچ بەختێك بۆئاشتی نابینم.))

بوێری ئەوەم نەبوو جارێکیتر خۆم هیوادار بکەم لەسەرخۆ گوتم:((هەواڵێکی زۆر خۆشە ئەنوەر.))

بەردەوامبوو گوتی:((خاتوو کارتەر لەگەڵ کارتەر سەردانی میسر دەکات.))

ئەمجارەیان هەواڵێکی خۆشبوو. لەیەکەم دیدارم لەگەڵ رۆزالین لەواشنتۆن دوای سەرکەوتنی کارتەر لەهەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی ئەمەریکا لەساڵی ١٩٧٦، ئاگاداری هەندێك لایەنی هاوبەشی نیوانمان بووم، لەوانە هەوڵەکانم بۆکەسانی دواکەوتوی فیکری کەسانی بەتەمەن، پەککەوتووانی شەڕ. بەبانگێشتنی چەندین ناوەندی لەم شێوەیە میوانداریەکی لەکوشکی سپی

بۆئەم کەسایەتییانە ڕێکخست. خودی ڕۆزالین ژنێکی خۆشەویستو وردبین بوو. بەدرێژایی گفتوگۆکانی کەمپ دیوید خواردنێکی بەشێوەی جۆراوجۆر ڕێکخستبوو، وەفدی ئەمەریکی بەخواردنەکانی ئەمەریکیو وەفدی ئیسرائیل بەخواردنەکانی کاشرو وەفدی میسر بەخواردنەکانی سادەی وەك، مریشکی کولاّو سەوزەواتو چای تام پوونگی ئامادە کردبوو. ئەنوەر گوتی بێگومان خانوویەکی کردووە بەمزگەوت.

منو ڕۆزالین لایەنی هاوبەشمان هەبوو کەبەراستی ئێمەی پێکەوە گرێ دەدا، بەهەمان رادەی من کەهاوسەرم بتوانێت لەگەڵ ئیسرائیل بکات بەئاشتی هیوایەتیبوو هاوسەری نیوەندگیری ئاشتی دەکرد. هاوسەرانی ئێمە پیاوی زۆر ئازابوون، هەردووکیان بەرپرسیارەتی مەترسییەکانیان هەڵدەگرت.

ڕۆزالینو جیمی کارتەر لەرۆژی هەشتی ئاداری ١٩٧٩، بەپێشوازییەکی زۆر گەرم گەیشتە قاهیرە. کارتەر دووەم سەرۆکی ئەمەریکابوو کەسەردانی میسری دەکرد، بەڵام یەکەم سەرۆکبوو کەلەناو پەرلەمان وتاری پێشکەش دەکرد. بەهەرشێوەیەك بێت لەدیدگای خەڵکی میسر، گرنکترین خاڵی قسەکانی هەستکردن بەبەڵێنی کەسایەتی خۆی بۆگەیشتنی ئێمەبوو بەئاشتی. کاتی ڕۆیشتنی لەفرۆکەخانە بۆ کۆشکی قوببە، کەبڕیاربوو کارتەرو هاوسەری لەهەمان کۆشك بمێننەوە، ملیونان میسری لەهەردوو لایەنی شەقام بەهۆراکردن وەستابوون. لەسەر هەندێك کاغەزەکان بەئینگلیزی نووسرابوو(بەخێربێن کارتەر)، (خۆشەویستی کارتەر)، خواخێرت بنووسێت کارتەر. ڕۆزالین لەناو ئۆتۆمبێلٚ بەگاڵتەوە گوتی:((ئێمە دەبێت بەرەو قاهیرە کۆچ بکەین.))

سەرۆك کارتەرو ئەنوەر بابەتی زۆریان بۆگفتوگۆ هەبوون. لەهەمان کات دەمانوویست لەم دوو ڕۆژەدا میسر نیشانی دۆستەکانی ئەمەریکایی خۆمان بدەین، لەبەیانی ڕۆژی دواتر بەشەمەندەفەری زۆر کۆن لەقاهیرە بۆئەسکەندەرییە ڕۆیشتین. کاتێك تەماشای زەوییەکانی کشتوکاڵی ناوچەی دڵتامان دەکرد. ڕۆزالین گوتی داخو کەسەر خاکی ڕەشو بەهێزی ئێمە دەخوات کەخاڵی بەرامبەر خاکی سووری کیڵگەی کشتوکاڵی هاوسەری لەجۆرجیایە. کاتێك گەیشتینە قاهیرە، لەگەڵ ڕۆزالین بۆبیستنی وتاری کارتەر لەسەر هیواکانی بۆئاشتی، بەگێرانەوەی هەندێك ئامۆژگاری قورئانو وتاری بەناوبانگی عیسا لەسەر چیا بەرپرسیارەتی نویێ، سەردانی ئەنجوومەنی یاسادانانمان کرد. ئەندامانی پەرلەمان چەندینجار وتاری

سەرۆككۆمار كارتەریان رادەگرت لەبەر چەپلەلێدان، بەرادەی ئێمە خوازیاری ئاشتیبوو. بەرادەی ئێمە كەسێكی مەزهەبیبوو.

رۆژی دواتر تەنیا لەماوەی پانزدە خولەك كاتی ئازاد پێش رۆیشتنی كارتەرو رۆزالین بۆئیسرائیل، بەپەلە بۆنیشاندانی ئەهرامەكان بردم. كەبەراوردبوو لەگەڵ دەستپێكی پێنجەمین، واتە رۆژێك كەبۆماوەی پەنجا رۆژ لەبەهاردا باو تۆفان هەڵدەستێت، بەبوونی سووتانو خولباریتو راستەوخۆ بۆناو چاوەكانمان وەك دیار كارتەرو رۆزالین وەك ئێمە هەستیان بەهێزی سیحراوی ئەهرامەكان دەكرد. سەرۆك جیمی كارتەر دوای خواحافیزیكردنی لەئێمە بەرەو ئیسرائیل لەگەڵ رۆزالین، گوتی لەبەرامبەر ئەهرامەكان هەست بەبێ دەماری دەكات.

رۆیشتنی كارتەر بۆقودس سەرسورهێنەربوو تەنیا هەزاركەس بۆپێشوازی ئامادە بوون لەفرۆكەخانە. لەسەر كاغەزەكانی دەستی خەڵك نووسرابوو((كارتەر بگەرێنەوە بۆ وڵاتی خۆتان))، ((بەخێربین برای بیلی.)) چۆن دەكرا ئیسرائیل خوازیاری ئاشتیبێت لەكاتی گەیشتنی ئۆتۆمبێلی كارتەر بۆهوتیل شا داوود لەقودس كەشانزدە مانگ پێش ئەنوەر لەهەمان هوتیلبوو، خوپیشاندانێكی گەورە رێكخرابوو ئەوەندە لەسەرۆك كارتەر نزیكبوون كەدەیانتوانی هیلكە لەئۆتۆمبێلی بگرن.

بەهەرشێوەیەك بێت، ئامادەیم نەبوو هەڵسوكەوتی بێەدەبانەی ناو كنێنێست ببینم لەكاتی پێشكەشكردنی وتاری كارتەر. لەناو ئەنجوومەنی یاسادانانی میسر چەپلەیان بۆدەكوتا. سەرەتا وتاری لەناو پەرلەمانی ئیسرائیل بەبێدەنگی دەستی پێكرد بەڵام بێدەنگی باشتربوو لە هەراوهوراو كێشە دروستكردن لەكوتایی وتاری خۆیدا. دەنگەكان ئەوەندە بەرزبوون كەسەرۆك وەزیر بگین زۆر بەدژواری توانی وتاری خۆی پێشكەش بكات.

كاتێك منو ئەنوەر لەتەلەفزیۆن تەماشای ئەم هەڵسوكەوتەی خرابمان دەكرد بۆم باسكرد:((تەواوبوو.))

رۆژنامەكانی میسر لەسەر هەڵسوكەوتی ئیسرائیلییەكان بەتوندی هەڵچوون. رۆژنامەی كۆماری دەنووسێت:((ئەگەر ئاشتی لەدایك نەبێت، تەواوی جیهان بەتایبەتی ئەمەریكا بەدوای تاوانباران بگەرێت كەتاوانی دژی مرۆڤایەتیان كردوون.)) راگەیاندنەكانی ئەمەریكا رایانگەیاند تاكو ئێستا هیچ روانگەیەكی روون بۆئاشتی نییە. لەسیانزدەی مارس، كارتەرو رۆزالینی هاوسەری

بۆماوەیەکی کورت گەڕانەوە بۆقاهیرە، چونکە کارتەر دەیوویست لەفرۆکەخانە ئەنوەر لەگۆڕانکاریو پێشکەوتنەکانی گفتوگۆکان ئاگادار بکاتەوە، ئەگەر پێشکەوتنێك روویدا ئاگاداربێت. کاتێك منو ئەنوەر بۆدیداریان لەفرۆکەخانە دەڕۆیشتین، نائومێدی من بەڕادەی تووڕە بوونی هاوسەرم بوو. ئەنوەر لەکاتی پێشوازیکردن لەجیمی کارتەر گوتی:((خەڵکی ئێمە لەمیسر لەهەڵسوکەوتی ئیسرائیلییەکان دژی هاوڕێی ئێمە جیمی کارتەر زۆر تووڕەن.)) کاتێك هەردوو رێبەر بۆگفتوگۆ بۆژوورێك رۆیشتن، منو رۆزالین، کەبەڕادەی من نائومێد دەهاتە بەرچاو، لەتەنیشت یەکتر دانیشتین. کاتژمێرێك تێپەڕبوو. دواتر کاتژمێرێکیتر. منو رۆزالین لەهۆڵی پێشوازی، پێکەوە دوعامان دەکردن.

کاتێك هەردوو سەرۆك هاتنەدەرەوە. دەمزانی شتێکی باوەڕ نەکراو روویداوە. رووخسار سەرۆك کارتەر کاتی هاتنی بۆقاهیرە گیراو شێواو بەرچاو دەکەوت. بەڵام ئێستا بەپێکەنین. بەدوای نیشانەیەك لەرووخساری ئەنوەر دەگەڕام، پرسیم:((ئەنوەر، چی بوو؟ چی روویداوە؟))

ئەوکات رێگای بەخۆیدا زەردە خەنەیەك بکات. گوتی:((منو سەرۆك کارتەر ئێستا بەتەلەفۆن پەیوەندیمان بەبگین لەقودس کرد توانیمان بگەین بەرێکەوتنێك.)) بێگومان هاوارم کردووە، دەبێت لەخوشحاڵیان هەڵپەڕینم کردبێت بەجۆرێك لەجۆرەکان. هیچ شتێك لەم لایەنەوە بەبیرم ناهێتەوە. تەماشای رۆزالینم کرد، بەڵام فرمیسکەکان رێگایان لەبینینی هەردووکمان گرتبوو، کاتێك سەرۆکەکان بەرەو شوێنی چاوپێکەوتن لەگەڵ پەیامنێرانی نیودەوڵەتی دەرۆیشتن، بۆم باسکرد:((خودای گەورە گوێبیستی دوعاکانی ئێمەبوو.)) پەیامی ئاشتی بڵاوکرایەوە دوژمنایەتی سی ساڵی نیوان ئێمەو ئیسرائیل هێزی ئێمەی هەڵکێشابوو، بەکۆتایی دەهات. کاتێك سەرۆك جیمی کارتەر راگەیاندنی مێژوویی خۆی دەخوێندەوە، تەماشای روخساری هەڵکشاوی هاوسەری خۆم دەکرد کەرەوتی ئەم ئاشتییەیی دژواری کرد بەهەمیشەیی.

ئەنوەر سادات. ماخیم بگین. جیمی کارتەر. ئەم پیاوانە، ئەم رێبەرانە. دەست لەناو دەست، یەکتر لەباوەش دەگرن. دیمەنێك کەبەئاسانی ناکرێت تێگەیشتنمان بۆهەبێت. لەبیستو شەشی ئازاری ساڵی ١٩٧٩، دەرۆژ دوای راگەیاندنی ئاشتی لەفرۆکەخانەی قاهیرە، لەناو کۆشی سپی دابووین، شوێنێك کەئەم سێ رێبەرانە رێکەوتنی ئاشتی کەمپ دیویدیان واژۆکرد. باوەڕم نەدەکرد ئەم رووداوەی گرنگ روویداوە.

لەتەواوی ڕۆژدا بێدەنگبووم، ڕووداوەکان بەخواردنێکی ئارام لەشوێنی تایبەتی حەوانەوەی خێزانی کارتەر لەکۆشکی سپی دەستی پێکرد. مێزی نانخواردن بۆشەش کەس ئامادە کرابوو: سەرۆککۆمارو خاتوو رۆزالین کارتەر، سەرۆك وەزیر بگین‌و هاوسەری، سەرۆککۆمار ئەنوەر سادات‌و هاوسەری. بۆیەکەمجار لەبەرامبەر سەرۆك وەزیری ئیسرائیل دادەنیشتم، روخساری ئەم پیاوەم لەتەلەفزیون‌و رۆژنامەکانی میسر بەباشی دەناسی.

کاتێك ئێمە بەیەکتر دەناسێنن. دەستی خۆی بۆدرێژ کردم‌و گوتی:((خاتوو سادات زۆر بەختەوەرم کەلەکۆتایدا تۆم بینی.))

بەشێوەیەکی نائیرادی دەستی دەگرم هەمووکاتێك گومانم دەکرد ئەمەیان دەستێکی زۆرخرابە. لەوەلأمدا دەلێم:((جێگای خوشحالییە بۆمن.)) بەلأم لەدەروندا دەلەرزیم. ئایا ئەم پیاوەی کەهۆکاری هەموو کارەساتەکانبوو بۆئێمە ئایا بەوازۆکردنی ڕێکەوتن کێشەکان بەکۆتایی دێن یان دووبارە بیروباوەڕی دەگۆڕێت؟

دوودڵێم کەم‌و زیاد دروست دەرچوو. نەلەبەر شك‌و گومانەکانم لەبگین لەخولەکەکانی کۆتایی، لەبەرگیانی هاوسەری، لەکاتی نانخواردنمان هاوسەری بگین گیرۆدەی کۆخەو تەنگی هەناسە دەبێتەوە، هەناسەی دەبڕێت هەموومان لەشوێنی خۆمان وشکبووین، رەنگی روخساری شین هەڵگەڕا. ئایا لەبەرامبەر ئێمەدا گیانی خۆی دەسپێرێت؟ دوعام دەکردن، خودایە رزگاری بکە. رزگاری بکە. لەهەوڵی گەڕاندنەوەی هەناسەی، دەستی بۆجانتای خۆی دەبرد دەرمانێك لەناو چانتایدا بوو هێنایە دەرەوە لەناو دەمی دەکرد خودایە هاوکاری بکە. دواتر وردە وردە باشتربوو تەنیا ئەمەی روویدا چەند ساتێکبوو بەلأم بەباوەڕی من درێژترین ساتەکانی ژیانی من بوون.

سێ سەرۆکەکان پێکەوە باسی ئاشتیان دەکردو هیواداربووم هیچ کەسێك ئاگاداری فرمێسکەکانی من نەبێت. هەوڵی خۆمدەدەم بەسەر هەستەکانی خۆمدا زاڵبم‌و تەنیا بیرو بیرکردنەوەی خۆم تەنیا لەسەر وتاری سەرۆکەکان بێت. بەلأم ئەمڕۆ لەتوانای خۆمدا نەماوە. تەماشایەك لەنزیك خۆم دەکەم خودایە کەسێکی ناسیاو لەنزیك خۆم دەبینم زۆربە وریایی تەماشای دەکەم.

خودایە موشە دایان! لێرەیە! دەستبەجێ نیگای خۆم وەردەگێڕم بەلأم پێش سوورانەوەی نیگای خۆم ئاریل شارون، وەزیری بەرگری پێشوو، لێدانی دڵم ئەوەندە خرابوو هەستم دەکرد

لەسەر جلوبەرگەکانم خەڵك هەست پێدەکات. هەموویان ئامادە بوون، ئەم کەسایەتیانەی ئیسرائیلی دەورێکی زۆر خرابیان لەژیانی مندا هەبوو. ئەم پیاوانەی کەسی ساڵ دوژمنی ئێمەبوون لەناکاو دەبن بەهاوڕێی.

بەدرێژایی میوانداری کوشکی سپی بۆئەم ڕێکەوتنەی ئاشتی هەستێکی ناراستەقینەی ئەم ڕووداوانە دەستیان لەسەرم هەڵئەدەگرت. مێزەکانی نانخواردن لەژێر خێمەیەکی سەوزو سپی ئامادەکرابوون هەمان ڕەنگەکانی کەمن لەئاهەنگی هاوسەرگیری کوڕم بەکارهێنابوون. لەدەوری هەموو میزەکان ئیسرائیلیو میسریو ئەمەریکی پێکەوە دانیشتبوون. تەماشای دەوروبەری خۆم دەکەم بۆئەوەی ئاگاداری هەمووشتێك بم. ئەم پیاوانە لەساڵی ١٩٤٨ لەگەڵ یەکتر شەڕیان کردبوو، یەکتریان بریندار کردبوو. براو کوڕانی یەکتریان کوشتبوون ئێستا لەتەنیشت یەکتر دانیشتبوونو پێکەوە خواردن دەخۆن. زۆرکەس وەك من سەرگەردانە. ئایا دەتوانم بەشێوەی ڕێزگرتن قسە لەگەڵ ئەمانەدا بکەم؟ ڕێگا پێدراوم؟ لەوانەیە؟ ئاسان نییە بتوانین کێشەو گومانەکانی سی ساڵەی خۆمان بەجارێك پێچەوانەی بکەین.

من لەنیوان کارتەرو بگین دانیشتم. ئەم شەو باسی شەڕ ناکرێ، بابەت خۆئامادەکردنی سەربازی نییە، بابەتی ئەم شەو باس لەکوڕو نەوەکانی ئێمە دەکرێت. بگین ڕوو لەمن دەکاتو دەڵێت کچم حاسیە لەگەڵ لوبنای کچتان هاوتەمەنن. بەگین دەڵێت:((دەبێت لەگەڵ هاوسەرت سەردانی ئێمە بکەن لەئیسرائیل، منداڵەکان لەگەڵ خۆتان بێنن.)) سەردانی ئیسرائیل بکەم؟ لەبەرنامەی خۆسەرقاڵکردنی دوای نانخواردن، کاتی لێدانی موزێك لەلایەن ئۆرکسترای میسرییو ئیسرائیلیو ئەمەریکایی، تەماشای دەوروبەری خۆم دەکرد لەژێر خێمە، میسرییو ئیسرائیلییەکان دەبینم کەزۆر بەوشیاری لەگەڵ یەکتر ئاشنا دەبن. چاوەکانم دەنوقێنمو دووبارە دەیان کەمەوە هەموویان لەشوێنی خۆیاندا بوون. کوڕم جەماڵ بەردەوام لەگەڵ موشەدایان پێدەکەنی، لەوانەیە نوکتەیەك بۆیەکتر دەگێڕنەوە.

لەکاتی واژۆکردنی ڕێکەوتننامە هەمووشتێك گۆڕا. هەمووشتێك لەڕۆژی دواتر کەمنو ئەنوەر لەکۆشکی سپی دەهاتینەدەرەوە، بەشێوەیەکبوو هەستم دەکرد هەنگاو دەنێم بۆجیهانێکیتر. لەساڵی ١٩٧٤ کاتێك ئەنوەر سەردانی نەتەوەیەکگرتووەکانی کرد لە ئەمەریکا، سەرۆك شارەوانی نیویۆرك، ئەبراهام بیم، ئامادە نەبوو چاوی بەئەنوەر بکەوێت. ئەبراهام بیم وەك زۆر کەسیتر، کێشەکانی سیاسی لەنیوان میسرو ئیسرائیل دەکەن بەکێشەی نیوان یەهوودییەتو

هەموو موسلمانان. هەڵەی دەكرد. بێگومان هەندێك لایەنگری مەزهەبی بوونیان هەبوو، بەلآم كەسێكی یەهوودی لەئەمەریكا، ئەمەریكیبوو، نەك ئیسرائیلی، لەنیوانماندا هیچ كێشەیەك نەبوو. ئەوكات پرسیارم لەخۆم دەكرد لەوانەی جەنابی بیم لەجیاتی ئەوەی خۆی بەسەرۆك شارەوانی نیویۆرك بزانێت خۆی بەسەرۆك شارەوانی تل ئاویو دانابێت.

لەهەمان سەفەر من لەگەڵ بەرپرسێكی پێشوازی لەلۆس ئانجلس روبەروو بووم. كاتێك بەئۆتۆمبێل لەفرۆكەخانە بۆهوتیلَ دەرۆیشتم، خاتوونی میواندار لەپرسیارەكانی من كەناوی چییە، ئایا خاوەن منداڵی، ئایا چێژ لەكەشو هەواو خۆری باشووری كالیفۆرنیا وەردەگریت. بەناچاری وەلآمی دەدایەوە. كاتێك رۆیشتم بۆناو هوتیلَ لەكەسێكی فەرمی ناو هوتیلَم پرسیار كرد ئەم ئافرەتە چی بەسەرهاتووە. سەرەتا نەدەزانی چۆن وەلآمی من بداتەوە، دواتر بۆی باسكردم:((سەرەتا خۆی نەخوشكرد نەیدەویست پێشوازی لەتۆ بكات وەك كەسێك كەپێشوازی لەخەڵك دەكات. سەرەتا بۆم باسكرد مافی ئەوەی نییە میوانەكانی ئێمە بەباشو خراب بزانێت، بەلآم كەسێكی یەهوودییە پێشوازیكردنی لەتۆ بۆی ئاسان نەبوو.))

ئێستا ئەمانە هەموویان بەرابردوویەوە گرێدراون بەراستی هەمووشتێك پێچەوانەبوو. شەپۆلێك لەپێشنیاری بانگێشكردن بۆنانخواردنەكان لەسەرتاسەری ئەمەریكا، بەخشینی پلەی دكتۆرای فەخری لەزانكۆكان. كلیلی زێرینی نزیكەی بیست شار بەرەو ئێمە دەهاتنەخوارەوە. لەهەمان كات بەدواوە بۆهەرشوێنێك لەجیهان دەرۆیشتم گەرمترین پێشوازی لەمن دەكراو دوعای خێر لەلایەن یەهوودییەكان بۆهاوسەرم بوون هەمووكاتێك ئەم دوعایانە هاوڕابوون لەگەڵ هاتنەخوارەوەی فرمێسكەكان. ئەم جیاوازییە لەنیویۆرك سەرسورهێنەرتربوو، هەمان شەوی رێكەتن واژۆكرا، بۆرجی بەرزی ئیم پایەر ئەستیت بەرنگی ئالآی میسرو ئیسرائیل نورانی كرابوو.

بەلآم هەلومەرج لەولآتانی ئیسلامی زۆرجیاوازبوو. هەمان كات كەئەنوەر سەرقاڵی واژۆكردنی رێكەوتنی ئاشتی نیوان میسرو ئیسرائیل بوو، فەلەستینییەكان دژی میسرو ئەمەریكا داوایانكرد نەفت بۆئەم دوو ولآتانە رابگیرێت. لەسووریاو لوبنان خۆپیشاندان دژی ئەنوەر رێكخران. لەئێران، خەڵكی توندوتیژ بالیوزخانەی میسریان داگیركردو هەندێك كاریكاتۆریان بەوێنەی ئەنوەر دروستكردبوون كەلەسێدارە درابوو. مەلیك حوسێن نەرمترین رێبەری عەرەب داوای كۆتایی هاتنی پەیوەندییەكانی سیاسی لەگەڵ میسر دەكردن. ئاشتی هاوڕێی زۆری بۆپەیدا

کردین لەهەمان کات هاوڕێیەکانی دێرینی کردن بەدوژمن. جێگای سەرسوڕمان نەبوو کەقین هەڵسێنترین موعەمەر قەزافی بوو. ڕێبەری لیبیا ڕایگەیاند تاکو ئەنوەر نەمرێت ئاسوودە نابێت.
بۆئەم کورت بینییەیی زۆر داخباربووم. چەند شانازیم بەخەڵکی میسر دەکرد لەکاتی گەڕانەوەمان بۆولاْت قەراخەکانی جادەکان هەمووی بەخەڵك گیرابوون بەبەخێرهاتنەوە لەئەنوەریان دەکرد. کەسانێك کەئازاری زۆریان لەشەڕدا کێشابوو نرخی ئاشتیان دەزانی. هاواریان دەکرد:((گیانو خوێنی ئێمە قوربانی تۆبێت ئەنوەر، بەگیانو خوێنی خۆمان سەفەری تۆ تەواو دەکەین!))
تاکو ئەوکات ڕێورەسمێك مابوو، ڕیورەسمێك بۆ ئەنوەر نرخی لەهەمووشتێك زیاتربوو لەبیستو پێنجی ئایاری ١٩٧٩، دوو مانگ دوای گەڕانەوەمان لەئەمەریکا، بۆ جەژنی یەکەمی گەڕانەوەی قۆناخی یەکەمی بیابانی سینا، هاوکات لەگەڵ وەزیرانی حکومەت بەرەو العریش بەفرۆکە ڕۆیشتین. هیچ کاتێك لەژیانی خۆمدا ئەوەندە هەستم بەخوشحاڵی نەکردبوو. ئەنوەر بەڵێنی کە بەخەڵکی میسری دابوو بۆ وەرگرتنەوەی خاکی خۆمان بەجێ گەیاند، بەبێ خوێن ڕێشتن.
العریش هەمان ڕۆژ چەند ئارامو جوان دەهاتە بەرچاو. دارەکانی خورما لەشوێنی خۆیان وەستابوون، لەوبەری دەریایی شین بەبەرفراوانی خۆی دەردەخست. چەند بیرەوریم لەم شوێنانە هەبوون. لەم شوێنەبوو کەمنو ئەنوەر پێش بیستو هەشت ساڵ ژیانی هاوبەشی خۆمان دەست پێکرد. لەم شوێنەبوو کاتێك کەمیسر ئەم خاکەی لەدەست ڕۆیشت پانزدە ساڵ ڕەنجو ئازارو داماوی بەشی ئێمەبوو. خاکێك کەئێستا بەئاشتی دەگەڕێتەوە. لەکاتی ڕۆیشتنی ئەفسەرێك کەئاڵای میسری دەبرد لەبیابانی سینا بەرز بکاتەوە.، ئەنوەرو هەموو وەزیرەکان دوای ماچکردن سلاوی سەربازیان بۆئاڵای ئێمە کرد. زۆر لەکۆنەسەربازەکان کەلەتەنیشت ئێمە لەالعریش بوون تاکو شاهێدی گەڕانەوەی خاکی خۆیانبن کەئازایانە شەڕیان لەپێناودا کردبوو، وەك ئێمە فرمێسکیان لەچاوەکان دەهاتنەخوارەوە. بۆگەیشتن بەم ساتەبوو کەئەنوەر ئەم هەموو ساڵە کارو دوعای دەکردن. چ کەسێك دەیتوانی باوەڕ بکات کەبەراستی ئەم کارەی گرنگبوو بەحەقیقەتو جێگای خۆی گرت؟
لەمانگی ئەیلوول کەمنو خێزان بانگێشتنامەی بگین مان بۆئیسرائیل قبوڵکرد. هەمان هەستو گومانم هەبوون. کاتێك بەکەشتی گەیشتین بەحەیفا. بیستو یەك گولەی تۆپ بۆشانازی ئێمە تەقێندران. خەڵکانێکی زۆر لەکەناراوەکانی بەندەر وەستابوون کەجێگای دەرزییەك

نەدەبوویەوە. لەسەر پارچە کاغەزەکانی دەستیان نووسرابوو: ((بەخێربێت، سادات. بەخێربێت. بەخێربێت.)) ئەوەی لەهەستو نیگاو زەردەخەنەیان دیاربوو لەلایەن حکومەت رێك نەخرابوون، بەجۆرێك لەخۆشەویستی خۆیان هاتبوون.))

کاتێك بۆیەکەمجار ئامادەدەبووم هەنگاو بنێمە سەرخاکی ئیسرائیل بەگاڵتە بەئەنوەرم گوت:((بۆچی ئەوەندە ساڵە خەرجی شەڕکردن لەگەڵ ئەم خەڵکەی باشمان کرد؟)) ئەنوەر پێکەنیو گوتی:((جیهان ئێستا کاتی ئەم قسەکردنە نییە.))

ئەلیزا بگین لەخۆشەویستی ئەوەی لەتوانایدا بۆیکردم، پێکەوە ڕۆیشتین بۆبینینی نەخۆشخانەکان، ناوەندێك بۆپەککەوتووەکان، قوتابخانەی پرستاری، بۆپێشکەش کردنی وتارێك لەسەر چالاکییەکان من لەمیسر بۆکەسانی بیردواکەتوو لەزانکۆ. لەیەکێك لەنەخۆشخانەکان نیشاندانی ئامێرێکی سیتی سکەن کەئیسرائیلییەکان شانازیان پێوە دەکرد.

نەمتوانی ڕێگا لەخۆم بگرمو گوتم:((ئێمە جووتی ئەم ئامێرەمان لەناوەندی دەزگای ئیمانو ئومێدا هەیە.))

ئەنوەر بەچاوێك تەماشای کردمو گوتی:((بۆیان بەم شێوەیە باس نەکەیت بۆئەمانە نوێیەو بەهەبوونی شانازی دەکەن.))

من گوتم منیش وەك ئەمانە بەهەبوونی شانازی دەکەم. دواتر زیادمکردو گوتم چەند ساڵێك دەبێت ئێمە ئەم ئامێرەمان هەیە.

ئەنوەر گوتی:((بابەس بێت.))

لەدیداری لیا رابین هاوسەری سەرۆك وەزیری پێشوو، ئیسحاق رابین، لەمیوانداریيەك خوانی نیوەڕۆ خۆشحاڵبووم. پێشتر جارێکیتر یەکترمان بینیبوو، لەساڵی ١٩٧٥، لەکۆنفرانسی نیودەوڵەتی ئافرەتان لەنەتەوەیەکگرتووەکانی ئەمەریکا شاری نیو میکزیکۆ بەڕێوەچوو. بەڵام هیچ قسەیەکمان لەگەڵ یەکتردا نەکرد، تەوقەمان لەگەڵ یەکتر نەکرد، چونکە وڵاتی خاکی ئێمەی داگیر کردبوو. بەڵام ئێستا یەکتر لەباوەش دەگرین پێم گوت:((لەهەڵسوکەوتی خرابی خۆم لەنیومکزیکۆ داوای لێبوردن دەکەم.))

گوتی:((پێویست بەداوای لێبوردن ناکات.))

دەموویست لەتەنیشت یەکتر دانیشینو باس لەکێشەکانی هاوبەشی خۆمان بکەین بەڵام سیاسەت ڕێگای لێدەگرتین، ئێستا باپێکەوە لەتەنیشت یەکتر دانیشین.)) ئەمەیانم کرد. کچی

بچوکم جیهان شەیدای خەڵکی ئیسرائیل ببوو. بۆهەرشوێنێك دەڕۆیشت خەڵك دەهاتنە پێشەوەو بەخێرهاتنیان لێدەکرد. کاتێك بۆکڕینی شیرینی سەردانی دووکانێك دەکات خاوەنی ئامادە نەبوو لەبەرامبەر شیرینی پارەی لێوەر بگرێتو پێداگری دەکات:((داوا دەکەم ئەمەیان بەناوی دیاری ولآتی ئێمە بۆخێزانی خۆتان قبووڵ بکەن.)) بەبوونی هەموو ئەم لایەنانە، کاتێك کۆپتەرێکی ئیسرائیلیم دەبینی، نەمدەتوانی ڕێگا لە لەرزینی خۆم بگرم بیرەوەرییەکانی ترسناك بۆم زیندوو دەبوون کەلەشەڕەکان گیرۆدەی بووین. گومانی گەورەتر کاتێکبوو لەکاتی ڕۆیشتنمان بۆفرۆکەخانەو گەڕانەوەمان بۆمیسر لەگەڵ عیزر وایزمەن سواری کۆپتەرێك بووین.

ئەمەیان پیاوێکی زۆرباشبوو هاوسەرم خۆشەویستی زۆری بۆئەم کابرایە هەبوو گوتی: ((دەتەوێت بیتە پێشەوە لەتەنیشت فرۆکەوان دانیشیت. لەم شوێنە باشتر دەتوانی دیمەنەکانی دەرەوە ببینیت. کاتێك فرۆکەوان دیمەنەکانی خوارەوەی نیشاندام شوێنی نیشتەجێبوونی عەرەبو یەهوودییەکانی کەپێکەوە بوون، ناوچەکانی پیشەسازیی، بەردەوام تەماشای جلوبەرگەکانی سەربازی فرۆکەوانم دەکرد، بێگومان ئەمەیان یەکێك لەهەمان ئەفسەرەکان بووە کەچەند ساڵ پێش سەربازانی میسری دەکوشتن. ئێستاش منی بەلەخۆبایی لەئاسمان دەسوڕاندەوە.

لەکاتی گەڕانەوەمان بۆقاهیرە، ڕەخنەکانی کەوردە وردە لەڕۆژنامەکانی میسر سەریان هەڵدەدا خۆم بەلآرێدا برد. ئەنوەر تاوانبار دەکرا بۆگەیشتن بەئاشتی لایەنی ئیسرائیلی زیاتر سوودمەند کردووە. هیچ گرنگیان بەگەڕانەوەی سینا نەدەدا؟ خۆپیشاندانەکانی بەربلآوی نەریتخوازانی ئایینی دژی حکومەت، بێئاگا نەدەبووم. هەمان ڕۆژو شەوی کە ئەنوەرو کارتەر ڕێکەوتنیان ڕاگەیاند، پۆلیس ناچاربوو لەزانکۆی ئەسیوت بەگازی فرمێسك ڕێژ بلاوە بەخوپیشاندان بکات. دەمزانی نەریتخوازەکان هیچ کاتێك ئامادە نین ئاشتی لەگەڵ ئیسرائیل قبووڵ بکەن. بەلآم گومانم دەکرد بەخێرایی دەبینن کەمیسر هیچ جێگرەوەیتری نەبوو.

تەنیا جوڵانەوەکانی سیاسی قەزافی بێزاری دەکردم. کاتێك منو ئەنوەر دوای ڕێکەوتنی ئاشتی لەکۆشکی سپی دەهاتینە دەرەوە، جیمی کارتەر لەکاتی خواحافیزی ماچیکردم، بێگومان دەزانی ئەم شێوازە لەناو ئیسلام ڕێگا پێدراو نییە، بەلآم جوڵانەوەیەکبوو لەدەستی خۆیدا نەبووە. لەتەنیشت کۆپتەر، کاتێك کامیراکان ئەم ساتەیان دەگرت، بۆی باسکردم:((ئای جیهان، چەند ڕۆژی دژوارمان پێکەوە تێپەڕ کردن!)) بۆیان باسکردم وێنەیەکی ئەم دیمەنەی

بەگەورەی لەفرۆکەخانەی ترابلۆس دابوو لەژێرەوەی نووسرابوو:((ئایا ئەم ژنە دەتوانێت بانگێشە بکات کەموسلمانێکی راستەقینە بێت؟))

ئاگرێك کەدەرۆیشت هاوسەرم لەناو بلێسەکانیدا بسووتێنێت، وردە وردە بلێسەی دەدایەوە.



## بەشی سیانزدەهەم

## بەناوی خودا

دیسان لەخوێندنم دواکەوتووم. بەخێرایی لەدەروازەی زانکۆ بەرەو بەشی ئەدەبیاتی عەرەبی دەڕۆم بەڵام بەربەستێکی مرۆیی ڕێگایان گرتووە. کەسێك بەهیواشی باس دەکات:((نەریتخوازەکانی ئایینی، لەناوەندی حەوشەی زانکۆ نوێژ دەکەن.)) نوێژکردن لەناوەندی حەوشەی زانکۆ؟ کاتژمێر دەی بەیانی. دووکاتژمێر بۆنوێژی نیوەڕۆ ماوە. ئەمەیان شوێنی هاتووچۆی قوتابیانە بۆهۆڵی خوێندنیان، نەك مزگەوت.

ناتوانم لەنیوانیاندا تێپەڕ بکەم. هیچ کەسێك ناتوانێت. لەگەڵ قوتابیانی وەستاو ڕادەوەستم، چەند سەد کەسێك بەجلوبەرگی سپی دەبینم کەسەرقاڵی نوێژکردنن، چەند سەد کەسێك ڕێگای چەند هەزار قوتابیان گرتووە. کچێك کەلەپێشم وەستابوو دەڵێت:((دەبێت بانگی پۆلیس بکەین.)) بەڵام من بەبیرم هێنایەوە کەپۆلیس ناتوانێت بێتەناو زانکۆ. ئەنوەر بۆهاوکاریکردنی کەش و هەوای کراوەی زانکۆکان، هاتنەناوەی پۆلیسی قەدەخەکردبوو.

دووکاتژمێر درێژە دەکێشێت کەبتوانم لەسەر کورسی هۆڵی سمینار دەوری کۆتایی زانکۆ دابنیشم. تاکو ئێستاش ئەمجۆرە ئازاردان و زەحمەتدان بەردەوامی هەیە. تەق تەق یەکەم لێدان لەدەرگای تەنیشتەوە دەگاتە ئێمە، مامۆستا بێدەنگ دەبێت و بەردەوام دەبێت دواتر دەنگەکان زیاتر دەبن و ماموستا ناتوانێت بەردەوام بێت. دەنگی نەریتخوازو توندڕەوەکانی ئایینی دەهات:((خوێندنی خۆتان ڕابگرن کاتی نوێژ کردنە.)) خاوەنی دەنگەکان لەهەردوو

ڕەگەزی نێرو مێبوون. ماموستا دەرگا ناکاتەوە کەسەردانی هۆڵەکانیتر بکەن. بەڵام من دەمتوانی لەبیری خۆیاندا ببینم. کوڕانی خاوەن ریشی درێژ بەجلوبەرگی سپیو درێژ. کچان بەجلی تاکو سەرپێی درێژو لاچکەی سەریان. چاوەکانی هەموویان بروسکەی کارەبایی دەداتەوە.

ساڵانی ساڵ دەبێت کەئێمە شاهێدی زۆربوونی کەسانی نەریتخوازین لەزانکۆکان.

لەساڵی١٩٧٤، ساڵێك وەك قوتابی ماستەر ڕۆیشتم بۆزانکۆ، ئەنوەر رایگەیاند ئەگەر میسر بەرەو دیموکراسی هەنگاو هەڵگرێ، دەبێت گروپەکانی مەزهەبی ئازادی بەیانیان هەبێت، قەدەخەکردنی سەردەمی ناسر هەڵگیرا. نەریتخوازانی توندڕەو زۆر بەئارامی بەبوونێکی کەم بەڵام زۆر ڕێکخراو بۆدژایەتیکردنی سیاسەتەکانی ئەنوەر دروستبوون. لەساڵی ١٩٧٧، سێ مانگ دوای گەڕانەوەی ئەنوەر لەقودس، نوێنەرانی گروپەکانی توندڕەوی ئەنجوومەنی ئیسلامی بەلەخۆگرتنی دەنگەکانی هەڵبژاردنی قوتابیان، هەموو کەسێکیان لەناو زانکۆ گیرۆدەی بارودۆخێکی چاوەڕوان نەکراویان کردن. لەکۆتایی بەدەستهێنانی باوەڕنامەی خۆم لەپاییزی ١٩٧٩،سەرلێشیواو بووم کەهێزی توندڕەوەکان لەچ شوێنێك بەکۆتایی دێت.

من خۆم، تاکو ڕادەیەك لەگەڵ کەسانێك کەپێشوازیان لەپەیامی بنەڕەتخوازەکانیان دەکرد، هاوهەستو هاودڵبووم. کێشەکان لەمیسر، بەبێ هیچ تێڕوانینێك بۆ باشتربوون درێژەی کێشابوو. ڕێژەی هەژاری زیادیکردبوو. زۆربەیان نەیاندەتوانی خانوویەکی پێویست بۆخۆیان دەستەبەر بکەن. نەخوێندەواریان زۆربوون. زۆر لەخەڵك توانای کڕینی جلوبەرگیان نەبوو، بۆیە پۆشینی جلوبەرگێکی شۆڕەی عەرەبی نرخی زۆر هەرزانتربوو، بۆکچەکان بەهەمان شێوە. بەڵام هەموو ئەم هەلومەرجانە پەککەوتەی هۆکارێك بوون: حکومەت توانای هاوکاریکردنی ئەم هەموو خەڵکەی نەبوو.

پاڵەپەستۆکانی زۆر لەسەر پێکهاتەی کۆمەڵایەتی ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکی ئێمەی بەرەو نائومێدیو سەرگەردانی ڕاکێشابوو. بەتایبەتی چینی هەژار، هەزاران کەس کەلەگوندەکان بەرەو قاهیرە کۆچیان دەکرد. بۆ گەرەکەکانی پڕاوپڕ لەخەڵك پەیدا کردنی جێگایەك بۆمانەوە زۆر ئاسان نەبوو، هەستیان بەسەر لێشێواوییو غەریبی دەکرد. بێگومان ئەمانە ئامادەی وەرگرتنی ڕێنوێنییەکانی خێرایی بنەڕەتخوازەکان بوون، پێناسەو ئامانجیان پێی دەبەخشین.

بنەماو بنچینەی خێزان دەبێتە ئەستوونی بڕبڕەی پشتی سەقامگیری میسر. بەرەو لاوازی دەڕۆیشت. جیلەکانی کەلەشارو گوندەکان پێکەوە دەژیان، ئێستا لەیەکتر جیادەبنەوە. نەبوونی شوێنی نیشتەجێ بوون، ژیان لەتەنیشت خزمەکانی خۆیان بۆ جووتەکانی نوێی ئاسان نەبوو، زۆرجار لەبەر هەبوونی کێشەو کەم و کورتی سەبارەت بەمافی گەورەکان دەبوون بەهۆکار کەکێشە بۆمافی منداڵەکان بەهەمان شێوە دروست ببێت. زۆر لەئافرەتان لەکاتی رۆیشتنیان بۆسەر کار لەجیاتی ئەوەی منداڵەکانی خۆی بسپێرنە دەستی داپیرو باپیریان دەسپێردرانە کەسانی غەریبە. زۆر لەباوکان ناچار دەبوون رۆژانە لەشوێنێك تاکو دوو یان سێ شوێن کار بکەن. هەموویان گیرۆدە بوون. هەموویان کاریان دەکرد یان گیرۆدەی دۆزینەوەی کاربوون. هیچ کەسێك دەرفەتی بۆ نەدەمایەوە رەنگی بەخێزانی بدات.

دەمتوانی ئەم کێشەیەو کەمتەرخەمی لەقوتابخانەکاندا بەهەمان شێوە ببینم. شوێنێك کەزۆربەی قوتابیان کەدەزگایەیی هەمووکاتێك یارو یاوەری خەڵك بێزاری کردبوون. ماموستاکانی کەجاران دایك و باوکی هەموو قوتابیانی خۆیان دەناسی بازنەی پێکەوە گرێدراوی قوتابخانەو خێزانبوون، ئێستا زۆر بەزەحمەت دەیانتوانی ناوی قوتابییەکانی خۆیان بزانن. لەزانکۆکانی قەڵەباڵغ، قوتابیانی خاوەن کێشەی هاوشێوەی لەدەستدانی دایك و باوك، جیابوونەوە لەهاوسەریان، یان کێشەی فێرنەبوونی هەندێك وانەکان، لەناو زۆرینەی خەڵکدا وندەبوون. قوتابیانی زانکۆ ئەگەر کێشەیەکی هاوشێوەی ئەمانەیان نەبوو، بڕوەرگرتنی پلەیەکی باش لەکۆتایی ساڵ ماموستای تایبەتیان بۆخۆیان دەستەبەر دەکرد. بەڵام هیچ ماموستایەك توانای ئەوەی نەبوو وانە بۆئەم هەموو خوێندکارانە دووبارە بکاتەوە. بەتایبەتی قوتابیانی لەتەمەنی گەشەی خۆیاندابوون زیاتر لەهەمووکاتێك پێویستیان بەچاودێری هەبوو، هەستیار بەسەر لێشوایی و ونبوون دەکرد.

ئەوەی لەتوانام دابوو بۆخوێندکارانم دەکرد، دوای خوێندن قسەم بۆدەکردن، بۆماڵی خۆم بانگێشت دەکردن سەبارەت بەهەموو بابەتەکان قسەی خۆیان بکەن. بەڵام بێگومان من نەمدەتوانی مانەوەیان لەکۆمەڵگە قەرەبۆ بکەم. توانای رکابەرایەتیم لەگەڵ نەریتخوازانی ئیسلامی نەبوو، چونکە ئەمانە بۆزۆر لەقوتابیان لەناو مزگەوتەکان جێگای مانەوەو خواردن و جلوبەرگ و پارەی کڕینی کتێبیان بۆدابین دەکرد. زۆرجار پارەی ماموستای تایبەتیان بۆدابین دەکرد. ئیخوان موسلمین و گروپەکانی تریان لەدەرەوەی زانکۆ سەرقاڵی هاوکاریکردنی

خەڵكبوون. لەهەژارترین گەڕەكی شار دەرمانخانەو پزیشكیان بۆخەڵك دابین دەكرد، بۆمنداڵەكانی كەلەقوتابخانەكانی قەڵەباڵغ دەیانخوێند مامۆستای هاوكاریان بۆدابین دەكرد، بۆكەسانێك كەخانوویان بەدەست نەدەكەوت خانوویان بۆدروست دەكرد. چالاكی ئەم گروپانە جگە لەبودجەی باش، زۆر رێكخراوبوون. هیچ كەسێك بەتەواوی نەدەزانی كەئەم هەموو لایەنی دارایی لەچ شوێنێك بۆیان ڕەوانە دەكرێت، هەندێك كەس باسیان دەكرد لەلایەن كەسانی نەریتخوازی سوننەی میسر كۆدەكرێتەوە. بەشێكیتر گومانیان لەقەزافیو ئیخوانەكانی سعودیاو نەریتخوازانی شیعە لەئێران هەبوو كەدەگاتە میسر.

پشتراست بووم كەسانێك كەهاوكاری ئەم نەریتخوازانە دەكەن لەبەرهەمی خۆیان رازین ئیخوان موسلمین لەبەرامبەر هاوكاری دەبێت هەندێك ئامۆژگاری ئایینیان پێشكەش كردبان. شەریعەت تەنیا یاسای فەرمانڕەوا بێت بەسەر كۆمەڵگە. هەرشتێك كەڕەنگو بوونی غەریبی هەبێت دەبێت لەناو بچێت. قورئان ئاشتی لەگەڵ ئیسرائیل قەدەخە كردووە. قبتییەكان دوژمنی موسلمانانو میسریان بۆخۆیان دەوێت.

نەمدەتوانی لەناو زانكۆ دەهەنگاو بڕۆمە پێشەوە كەنەریتخوازەكان دوكانی بچوكیان دانەنابێت كەلەناویدا ئەندامانی گروپەكانی نەریتخواز كتێبەكان بەنرخێكی زۆر هەرزان بۆدۆزینەوەی ئەندامانی نوێ هەوڵی خۆیان دەدەن. كاتێك گەنجەكان رادەوەستان بزانن ئەمانە باسی چی دەكەن، لەنیوان كوڕەكانو كچەكانی جلوبەرگی ئیسلامیان بەبەبێ بەرامبەر پێشكەش دەكردن. ساڵانە خوێندكاری زیاتریان لەخۆ دەگرتنو ردێنیان درێژ دەكردو كچەكان جلوبەركی درێژیان دەپۆشین.

ژمارەیەكی زۆر لەخوێندكاران، هەندێك لەكەسانی وشیارو بەئاگای بەشی ئێمە جلوبەرگی خۆداپۆشراویان هەڵدەبژاردن. من سەرم سوڕدەما. یەكێك لەخوێندكارانی من كەسێكی ئیسلامی بوو بەردەوام خۆداپۆشینی هەبوو زۆر رێزم لێدەگرت بەلاّم كەسانێك تەنیا بۆخۆ دەرخستنی سیاسی ئەمەیان دەكرد. جلوبەرگێك كەتەنیا دووچاویان بەدەر دەكەوتن. ئەم كچانەی توندڕەو هەموو جەستەی خۆیان دادەپۆشی لەرۆژەكانی گەرمی هاوین گۆریەیی ئەستوورو پەنجەوانەیان لەدەستەكانیاندا دیاربوو. بینیی بەردەوامی ئەمانە لەناو زانكۆ دڵم ژانی دەكرد. ئیسلام ئەمە نەبوو.

نەریتخوازانی ئیسلامی لەکاتەکانی پێویستی خۆیان ڕەخنەیان لەجلوبەرگەکانی من دەگرت. زۆرجار کچەکانی سەرداپۆشراویان ڕەوانەی لای من دەکردن بۆئەوەی من هانبدەن کەهیچ نەبێت لاچکەیەك لەسەر بنێم. یەکێك دەیگوت:((خاتوون تۆبۆچی وەك شەریعەت خۆت داناپۆشی؟ ئایا نابێت ئێوە وەك هاوسەری سەرۆککۆماری میسر نموونەیەك بیت بۆژنان، بۆئێمە سەرمەشق بیت؟)) داپۆشینی شەرعی دەستەواژە یەکبوو کە گروپەکانی ئیسلامی بۆپۆشینی جلوبەرگی درێژ بەکاریان دەبرد کەپۆشین بۆژنان ئەرکبوو.

بەتوندی دژیان دەوەستامەوە:((من هەمووکاتێك جلوبەرگەکانی پێویست دەپۆشم. بەڵام کردار زۆر گرنگترە لەجلوبەرگ. ڕۆژی ئاخرەت خودا ئێوە لەبەر درێژی جلوبەرگەکانتان ڕەوانەی بەهەشت ناکات.))

لەحەدیسدا هاتووە. کرداری خەڵك لەسەر بنەمای نییەت هەڵسەنگاندنی بۆدەکرێت. نەمدەتوانی نەریتخوازەکان لەبەر بیروباوەڕەکانیان ڕەخنەباران بکەم. بەڵام ئەمانە بەهەمان شێوە ناتوانن خواستی کەمینەیەك بەسەر زۆرینەدا بسەپێنن. ئەمانە سوودیان لەبەرنامەی ئازادی بەیانی ئەنوەر لەمیسر وەردەگرت. ئازادییەکانی کەتاکو ئەوکات هاوشێوەی نەبوو. بەڵام توندڕەوانی مەزهەبی تەنیا بەشەکانی نەرێنی کێشەکانیان دەبینی، لەبەرامبەر هەموو پێشکەوتنەکان هەستیان بەترس دەکرد. گلەیی‌و گازندەکانی ئەمانە کۆتایی نەبوو.

موزیکی راکی ڕۆژئاوای کەخۆشەویستی لەلایەن قوتابیانی زانکۆ هەبوو. بێزاربوون. بیستنی هەموو موزیکێك جگە لەقورئان بەتاوانیان دەزانی. پۆشینی شلواری جین کەکچان‌و کوڕان لەزانکۆ دەیان پۆشین، لەبەرامبەر ئەمانەدا ئازاریان دەکێشا. بەرنامەکانی ڕۆژئاوایی لەسەرتاسەری میسر بینەرو خۆشەویستیان هەبوو. بەڵام نەریتخوازان دەیانوویست بڵاوکردنەوەیان ڕابگیرێت. جەژنەکانی نائایینی لەوانە بەرز ڕاگرتنی ڕۆژی دایك بەباوەڕی ئەمانە نائەخلاقی هەژمار دەکرا نەریتخوازەکانی زۆر توندڕەو بەگومانەوە تەماشای لایەنەکانی زانستیان دەکرد. هەندێك لەقوتابیانی بەشی پزیشکی لەکاتی تاقیکردنەو لەسەر جەستەی ڕەگەزی بەرامبەر دووریان دەکرد.

من بەهیچ شێوەیەك نەمدەتوانی تێگەیشتنێکی لۆژیکیم بۆئەمانە هەبێت. چەندینجار لەدەرەوەی هۆلەکانی خوێندن چاوەڕێیان دەکردم تاکو من سەبارەت بەبابەتێك بەباوەڕیان سیاسەتی نوێی حکومەتی میسر گوناحی گەورەی کردووە، ڕەخنە بگرن.

دەیانگوت:((هاوسەری تۆ گەندەڵی لەدەرەوە هاوردەی میسر دەكات.)) من دەمگوت: ((ئێوە لایەنەكانی باشی رۆژئاوای بۆخۆتان وەربگرن ئەوەی كەخرابە بەنەبینراوی بزانن ئێمە زیاتر لەئەمەیان ناتوانین خۆمان دوورە پەرێز بگرین. ئێمە وەك مرۆڤەكانی خوێندەوار دەبێت تاكو شوێنێك كەبكرێت لەجیهانی دەوروبەر فێربین، لەزانستەكانی خۆمان بۆپێشكەوتن سوود وەربگرین.)) بەڵام قسەو روونكردنەوەكانم هیچ كێشەی بۆ ئەمانە چارەسەر نەدەكرد.

لەدیدگای نەریتخوازانی مەزهەبی گەورەترین مەترسی هەڵگرتنی بەربەستەكانی نیوان رەگەزەكانبوو. بەباوەڕی من خوێندن دەبێتە یەكەم هەنگاو بۆگەیشتن بەیەكسانی نیوان هەردوو رەگەزی نێرو مێ. بەڵام نزیكبوونەوەی كچێك و كوڕێك لەناو زانكۆ نەریتخوازانی ئاڵۆز دەكرد. نەریتخوازەكان بودجەیەكی تایبەتیان بۆئامادەكردنی پاس بۆكچان دابین دەكردو خوازیاری جیاكردنەوەی كچەكانو كوڕەكانبوو لەكافتریاو هۆڵەكانی خوێندن.

لەكوژاندنەوەی گڵۆپەكان بۆبینینی فیلمێك بەتوندی كاردانەوەیان نیشاندەدا نابێت كچو كوڕ لەتاریكایی تەماشای فیلم بكەن. لەوەڵامی كەسانێك كەدەیانوویست بزانن من چۆن خۆم بەژنێكی موسڵمان دەزانمو لەلایەك لایەنگری قوتابخانەكانی تێكەڵاو لەهەمان كات یاسای پەسەندكراوی. زۆرجار لەهەندێك بابەتی قورئانم بۆلێكدانەوەو تێگەیشتنی بابەتەكان بەنموونە دەهێنانەوە:((ئێوە بەئایینی خۆتانو من بەئایینی خۆم. كردەوەكان لەسەر بنەمای نیەت هەڵسەنگاندیان بۆدەكرێت.))

چاوپێكەوتنی منو ئامینە سەعید، لەگەڵ رۆژنامەنووسێكی ئەمەریكی ئێمەی پشت راستكردەوە كە چاوپێكەوتنیان لەگەڵ گۆڤارێكی خێزانی وەك پارید چاپ دەكرێت، بەڵام كێشەكان زیاتر بوون. بالیوزی میسر لەواشنتۆن پەیوەندیكرد كەئامادەیە ئاگاداری ئەم هەواڵە بێت، چاوپێكەوتنی ئێمە لەگۆڤاری پارید چاپ نەكرابوو لەگۆڤاری پلی گرل! چاپكرابوو. باوەڕم نەدەكرد! چاوپێكەوتنی ئامینە لەلاپەڕەیەك چاپكرابوو كەوێنەی پیاوێكی رووت لەهەمان لاپەڕە چاپكرابوو! نەماندەتوانی هیچ بكەین، چونكە گۆڤار بڵاوكرابوەوە. بەڵام چەند رۆژی دواتر هەموو رۆژنامەو گۆڤارەكانی جیهانی عەرەب پڕكران لەراپۆرت لەسەر چاوپێكەوتنی ئێمە، رەخنەی توندی نەریتخوازانی مەزهەبی لەمیسر كۆتایی نەبوو.

لەگفتوگۆكانم لەگەڵ نەریتخوازەكان هەوڵی خۆمدا كەبەشێوەیەكی لۆژیكی كاریان لەگەڵدا بكەم، بەڵام لەدڵەوە زۆر دەترسام. بەبوونی تەواوی پێشكەوتنەكانی ئێمە بانگێشەی ئەوەیان

دەکرد کەمیسرمان بۆسەد ساڵ گەڕاندەوە بۆدواوە. وەگەرخستنی سەرمایەیی هاوبەش لەگەڵ کۆمپانیاکانی بیانی کەئەنجامی دروستکردنی نەخۆشخانەو قوتابخانەو ناوەندەکانی پزیشکیو دەرمانی ئەمانە هەمووی دەستکەوت بوون، نەیاندەویست. یاساکانی باری کەسیەتیان نەدەویست، ئاشتی لەگەڵ ئیسرائیلیان نەدەویست.

سەرم سوڕمابوو ئایا ئەنوەر دەیزانی دژایەتی ئەمانە لەگەڵیدا تاکو چ ڕادەیەك توندە. ئەنوەر خاوەنی راوێژکاری ئەمنیو خۆیبوو، بەڵام من زیاتر لەناوخەڵدا پەیوەندیم هەبوو. ئەنوەر بەکۆپتەر سەردانی سەرتاسەری میسری دەکرد، من بۆهەموو شوێنێك بەئۆتۆمبێل دەڕۆیشتم. ئەنوەر بەردەوام لەگەڵ کەسانی هاوڕێی سەردانی پارێزگاکانی دەکرد، بەڵام من بەتەنیایی دەرۆیشتم بۆناوچەکانی گوندنشین، ئەنوەر تەنیا لە بوونەکان سەردانی زانکۆکانی دەکرد، بەڵام من رۆژانە نەریتخوازەکانم بەچاوی خۆم دەبینین. بەپێچەوانەی راوێژکارانی، من لەگەیاندنی هەواڵەکانی نەخۆش هیچ ترسێکم نەبوو.

لەپاییزی١٩٧٩، ئاگادارم کردەوە:((ئەنوەر نەریتخوازەکان گەشە دەکەن. ئەگەر بەخێرایی کارێك نەکەیت لەوانەیە هێزی سیاسی بۆ وێرانی ئامانجەکانت بەدەستەوە بگرن.)) ئەنوەر دەستی پێکرد، جارێکیتر وەك ساڵی پێشوو بەوتارەکانی وەڵامی نەریتخوازەکانی دایەوە کەدەبێت دەست لەسیاسەت هەڵگرن. لەهەمان کات، هەوڵیدا هەلومەرجی قوتابیانی زانکۆ لەتەواوی زانکۆکان باشتر بکات، هاوکاریەکانی حکومەت بۆنیشتەجێکردنو کتێبەکانی خوێندن زیاتر کرد بۆکەسانێك خوێندنیان تەواو دەکردو لەناو حکومەت دەبوون بەفەرمانبەر بەرنامەی نوێیان داڕێشتەوە. زیاتر لەئەمەیان نەیدەویست بکاتو نەیدەتوانی. بۆی باسکردم:((جیهان من دەزانم ئەمانە مەترسین، بەڵام ناتوانم تەنیا لەبەر ئەوەی دژی سیاسەتەکانی منن، راپێچی گرتووخانەکان بکەم.))

دەبێت ئەم لایەنەمان قبوڵکردبا گرتنی کەسانی دژی حکومەت پێچەوانەی بنەماکانی دیموکراسی بوون، بەڵام پێشهاتەکانی توندوتیژی نەریتخوازەکان لەسەرتاسەری میسر بڵاو دەکردنەوە چی بەسەر دەهات؟ تەماشاکردنی بەرگی گۆڤاری ئیخوان موسلمین بەناوی، دەعوەت، منی نیگەران دەکرد. راپۆرتێك لەژمارەی ئەیلوولی ١٩٧٩ بڵاو دەکاتەوە بەناوی:((ئاگاداربن، یەهودییەکان دێن!)) لەسەر بەرگی گۆڤار کاریکاتۆرێك هەبووکەسێکی یەهوودی نیشان دەدا کەکەسێکی بەجلوبەرگی عەرەبی خاوەن ریش لەسێدارە دابوو. ئەم

راپۆرتە باسی هەڵسوکەوتی ئیسرائیلییەکانی دەکرد دوای ئارام بوونەوەی نیوان هەردوو وڵات لەشوباتی١٩٨٠ بەرنامەیان بۆداڕێشتبوو:((کاڵای میسری بکڕن ئەگەر خرابتربێت لەکاڵای یەهوودییەکان. بەهیچ شێوەیەك کار بۆ یەهوودییەکان نەکەن ئەگەر ئامادەبن دووبەرامبەر مووچەی مانگانەتان پێشکەش بکەن. دارایی خۆتان لەبانکەکانی نائیسلامی نەپارێزن.))

ئەوەی جێگای داخبوو هێرشی ناڕەوایان بۆسەر قبتییەکانبوو. ئێمە لەمیسر هیچ کاتێك بیرمان نەدەکردەوە ئەمەیان موسڵمانەو ئەمانە مەسیحی، بەچاوی میسری تەماشای یەکترمان دەکرد. ئیسلام مافی قبتییەکانی بۆبەجێ گەیاندنی داب‌و نەریت‌و ئایینیان بەتەواوی‌و بەفەرمی دەناسرا. قورئان مەسیحی‌و یەهوودییەکان بەناوی (خاوەن کتێب)) ناو دەبات‌و وەك موسلمانەکان رێزیان دەگرێت. بەڵام لەسەردەمی ئاشتی لەگەڵ ئیسرائیل، گروپەکانی نەریتخوازی مەزهەبی هەموو ئەم لایەنانە بەنەبینراوی هەژماریان دەکردن‌و بەردەوام کێشەکانی ئایینی زۆریان دروست دەکردن. لەیەکێك لەراگەیاندنەکانی کەگروپەکانی ئیسلامی بڵاویان دەکردنەوە، بانگێشەی ئەوەیان کردبوو:((نابێت قبتییەکان مافیان هەبێت سەبارەت بەکاروباری سیاسی میسر ڕاو بۆچوونیان هەبێت. مەسیحییەکان لەپیلانگێڕی ئیمپریالیزمی بێگانە هاوبەشن. دۆستایەتی لەگەڵ قبتییەکان نەکەن.))

ژمارەی خوێنەرانی کتێب‌و بڵاوکراوەکانی نەریتخوازان زۆر نەبوون، بەڵام لەبەرچاو نەگرتنی پەیامەکانی توندوتیژی کەئەم گروپانە لەهەموو مزگەوتەکانی میسر بڵاو دەکرانەوە، کارێکی ئاسان نەبوو. دژایەتی بۆئاشتی لەگەڵ ئیسرائیل، قبتییەکان، ئەنوەر، بەردەوام زیاتر دەبوو، لەهەمان کات پشتیوانی دەکران.

دژایەتی ئێمە لەلایەن دراوسێیەکانی ئێمەی عەرەب. تاکو شوێنێك کەبەبیرم دێتەوە، یەکەمجاربوو کەمیسر نابێت لەدوژمنانی سنووری رۆژهەڵات هیچ ترسێکی هەبێت. ڕکابەرانی نوێی ئێمە کەسانێکبوون کەئێمە ئەمانەمان بەهاوڕێی خۆمان دەزانین.

سەرانی وڵاتانی عەرەبی، بەقسەی خۆیان بۆسزادانی ئەنوەر لەبەرامبەر ئاشتی لەگەڵ ئیسرائیل، لەئاداری ١٩٧٩ لەبەغدا کۆبوونەوە بڕیاریاندا هاوکارییەکانی هەموو لایەنە بۆمیسر دەرکرد. ملیونان میسری لەراگرتنی هاوکارییەکان بێبەش بوون. بۆزیاتر زوڵم کردن لەوڵاتێکی هەژاری وەك ئێمە، سەرانی عەرەب بڕیاریان لەسەر گەمارۆکانی تەواوی ئابووری لەگەڵ میسردا. بەداخرانی نوێنەرایەتی کۆمپانیاکانی عەرەبی چەندین ملیون دۆلار لەمیسرو هەزاران کەس

بێکاربوون. هوتێلەکانی گەورەی قاهیرە، گازینۆکانی کەناراوەکانی نیل کەهاوینان لەگەشتیارانی ناوچەکانی گەرمی وەك کەنداو پڕدەبوون، لەهەمان هاوین خاڵیبوون. هەزاران خانووی جوان کەمیسرییەکان بەکرێ پێشکەشی میوانانی عەرەبی خۆیان دەکردن دیسان خاڵیبوون. هەندێك لەهێڵەکانی ئاسمانی عەرەبی جگە لەفرۆکەی سەرۆك وەزیر بگرن لەفرۆکەخانەی ئیسماعیلییە لەبیستو پێنجی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٧٨، هەڵفرینەکان بۆمیسر راگیران. ئەوانیتر دوای واژۆکردنی رێکەوتنی کەمپ دیوید حکومەتەکانی عەرەبی بۆئەوەی رێگا نەدەن هیچ کەسێك سەردانی میسر بکات، رۆیشتنی فرۆکەکانی میسر بۆسەر ئاسمانی ئەم وڵاتانەی عەرەبی قەدەخەکران.

لەکۆبوونەوەی بەغدا، سەرانی عەرەب بەقسەی خۆیان دەیانویست وانەیەك فێری ئەنوەر بکەن، تەواوی پەیوەندییەکانی خۆیان بڕین. ئەمەیان میسربوو لەساڵی ١٩٤٥ پێشنیاری بۆدامەزراندنی یەکێتیی عەرەب کرد، کەپێکهاتبوو لەبیستو دوو وڵاتی عەرەبی کەکارکردنیان وەك نەتەوەیەکگرتووەکان بێت. بەڵام لەبەغدا عەرەبەکان دەنگیان لەسەر دەرکردنی میسر لەناو یەکێتیی وڵاتانی عەرەبیداو گواستنەوەی بارەگای لەقاهیرە بۆتونس. نابێت بەهیچ شێوەیەك نوێنەرانی میسر بەشداریان لەکۆبوونەوەی ئاسای سەرانی عەرەب کردبا. لەساڵی ١٩٨٠ تەواوی بالیوزخانەکانی وڵاتانی عەرەبی جگە لەعومانو سوودان پەیوەندی سیاسی خۆیان لەگەڵ میسر پاراستن. بەشداری زانایانی ئیسلامی مزگەوتی ئەزهەر لەکۆنفرانسەکانی نیودەوڵەتی ئیسلامی قەدەخەکران.

بەڵام ئەنوەر کەسێك نەبوو لەبەرامبەر زوڵم خۆی رادەست بکات. تەواوی هەوڵەکان بۆتێکشکاندنی ئیرادەی ئەنوەر گۆڕان بۆ نەگۆڕو پتەو بوونو پێداگری بۆئاشتی، زیاتر ڕقو کینەی بۆکەسانێك زیاتربوو کەئازاریان بەمیسر دەگەیاند. ئەنوەر چەندینجار لە وتارەکانیدا تۆمەتی وڵاتانی عەرەبی رەتکردنەوەو پێداگری دەکرد کەئاشتی نیوانمان بەردەوام دەبێت. من لەبەرامبەر توندوتیژی وڵاتانی عەرەبی داخباربووم. هیواداربووم بەخێرایی عەرەب سوودی بەرژەوەندی ئاشتی لەگەڵ ئیسرائیل ببینن‌و کۆتایی بەشەڕ لەگەڵ میسر بێنن. لەم لایەنەوە هەوڵی خۆمدا بەهەر شێوەیەك بێت هاوکاری وڵاتی خۆم بکەم.

بەڵام ئەوەندە ئاسان نەبوو. بەردەوام کەسانێك بوونیان هەبوو کەدژایەتی کارو چالاکییەکانی منیان دەکرد لەناو کۆمەڵگە. بەڵام هیچ کاتێك دژایەتی لەجۆری دژایەتی پاییزی ١٩٧٩

نەدیبوو. لەسەردەمی ناسر خەڵك ناچار بوون لەترسی گیران توڕەیی خۆیان لەحکومەت بشارنەوە، بەڵام ئێستا میسر کەدژوارترین قۆناخەکانی ئابووری خۆیدا بەسەر دەبرد، سیاسەتی ئازادی بەیانی ئەنوەر لەئەنجامدا ڕێگای بەخەڵکدا بیرو بۆچوون و رەخنەکانی خۆیان ئاراستەی حکومەت بکەن. دژبەرەکانی ئەنوەر سادات نەریتخوازەکانی مەزهەبی، کۆمۆنیستەکان و هەندێك پارتی سیاسی، بۆ تاوانبارکردنی هەر کەسێك کەگرێدراوی حکومەت بێت یەکگرتوو بوون. وەك دیار من باشترین ئامانج بووم.

((خاوەنی سی و پێنج ئۆتۆمبێڵە. هەموو ئەمانە بەناوی دەزگاکانی خێرخوازی بەبێ ئەوەی پارەی گومرگ بدات تێپەڕ کراون. ! ))

((کۆمپانیایی کوکاکولا سەد هەزار دۆلاری بۆهاوکاری کەم ئەندامان پێشکەش کردووە هەموو ئەم پارەیە ئێستا لەسەر ژمارەی بانکی خۆیە.))

پارچە زەوییەکی گەورەی لەدەرەوەی ئەسکەندەرییە وەرگرتووە. ئێستا بەناوی خۆی کردووە، واتە داگیری کردووە.))

چیبووە؟ بۆهەر لایەك دەرۆیشتم پڕوپاگەندەیەکی گەندەڵی دژی من بڵاو دەکرایەوە. جارێك، ئیبراهیم لوتفی، سەرۆکی بانکی ناسر لەمیسر، پێشنیارێکی پێشکەش بەناوەندی ئیمان و ئومێد کرد بۆهێنانی چەند ئۆتۆمبێلێك، بەمەبەستی بەکرێدانەوە بۆگەشتیاران، بەسوودی هەردوو لایەن، بەڵام کاتێك بانك ئۆتۆمبێل و شوفێرەکانی بۆناوەندی ئیمان و ئومێد ڕەوانەکردن تاکو ئەندامانی ناوەند ببینن، شوفێرەکان بەهەڵە بەخەڵك دەڵێن ئەم ئۆتۆمبێلانە بۆ پێشکەشکردن بەمن دەبەن. دەستبەجێ دژبەرانی ئێمە دەستیان بەبڵاوکردنەوەی پروپاگەندە کرد کەمن ئەم ئۆتۆمبێلانەم بۆ سوودی تاکەکەسی خۆم کڕیوون. تاکو ئەوکاتەی کەبەڕێوەبەرایەتی ناوەندی ئیمان و ئومێد بڕیاریاندا لەبەر کەمی سوود لەم پرۆژەیە برۆنە دەرەوە بەڵام پڕوپاگەندەکان وەك خۆیان مانەوە. قسە لەسەر ((ئۆتۆمبێلەکانی جیهان)) بەردەوامبوو بەخێرایی لەهەموو شوێنێك بڵاو دەکرایەوە ناچاربووم لەچاوپێکەوتنێکی تەلەفزیونی ئەم بابەتەم بەتەواوی رەتکردەوە.

رۆژەکان زۆر خرابوون. کەسانێك کە لەوانەیە چاوم پێنەکەوتبێت بۆشاردنەوەی کارەکانی نایاسی خۆیان سوودیان لەناوی من وەردەگرت، یەکێك لەفەرمانبەرانی پێشووی ناوەندی ئیمان و ئومید بارهەڵگرێکی گەورە لەناوچەی ئازادی بازرگانی بەندەری ئیسماعیلییە پڕ

لەتەلەفزیون‌و پێداویستییەکانی ماڵەوە دەرباز دەکات‌و بۆفەرمانبەرانی گومرگ روون دەکاتەوە ئەمانە بۆناوەندی خێرخوازی ئیمان‌و ئومێد دەبات بەبڕیاری خاتوو سادات. بەختەوەرانە کابرا بۆجاری سێیەم دەیوویست دەرباز ببێت بەڵام لەبەر تەواو نەبوونی بەڵگەکان تەلەفۆن بۆنووسینگەی من دەکات، دەستبەجێ دەگیرێت. ئەگەر کەسێك ئاگادار نەدەبوو، من هیچ کاتێك ئاگاداری ئەم هەواڵە نەدەبووم.

رووداوێکیتر لەئەمەیان ناخۆشتربوو. لەساڵی ١٩٨٠ نامەیەك لەئەفسەرێکی هێزی دەریایی بەدەستم دەگات‌و دەخوێنمەوە:((من شێواو نائومێد بووم. من هەمووکاتێك ئێوە لەبەر کارەکانی کەبۆ سەربازەکانت دەکردن ستایشم دەکردی. بەڵام نەئەم کارانەو نەهاوسەر گیریت لەگەڵ سەرۆککۆماری ئێمە ئەم مافە بەئێوە نادەت داوای هەمان پارچە زەوی بکەیت کەمن لەئەسکەندەرییە بۆخێزانی خۆم کڕیبوو.))

سەرم سوڕمابوو گێژو لاڵبووم، چونکە تەنیا موڵکی کەخاوەنی بووم پێنج هێکتار زەوی لەمیت ئەبونەالکۆم بوو کەپێکەوە لەگەڵ ئەنوەر هاوبەش بووم. کاتێك کەسێکم ڕەوانەکرد بۆلێکۆڵینەوە، زیاتر گێژبووم. گوتی:((ئەم ئەفسەرە راست دەکات، لەناوی زەوی ئەم ئەفسەردا تابلۆیەك هەیە کەلەسەری نووسراوە ئەم موڵکە ئێستا موڵکی جیهان ساداتە.))

زۆر بەخێرای حەقیقەت دۆزرایەوە. ئەم تابلۆیە جیهان تەلعەت سادات، کچی تەلعەت برای ئەنوەر، لەسەر ئەم زەوییەیی دانابوو. هاوسەری لەگەڵ ئەم ئەفسەرە پێکەوە ئەم پارچە زەوییە دەکڕن، لەهاوبەشی خۆیان گیرۆدەی کێشە دەبنەوە. برازای ئەنوەر ویستیبوو هەمان ئەفسەر بترسێنێت‌و کێشەکە بەم شێوەیە چارەسەر بکات، لەجیاتی ئەوەی بنووسێت جیهان تەلعەت سادات بەئەنقەست ناوی تەڵعەت لادەبات. بۆئەوەی کاتێك ئەم ئەفسەرە ناوی من ببینێت بزانێت ئەم کێشەیە هاوسەری سەرۆککۆماری لەناودایە پاشەکشە بکات.

منو ئەنوەر زۆر تووڕە بووین. ئەنوەر دەستبەجێ بڕیاریدا کێشەکە رادەستی دادگا بکرێت، یاسا چارەنووسی ئەم دۆسییە یەکلایی بکاتەوە، بەڵام پڕوپاگەندەکان وەك خۆیان مانەوە.

ئەنوەر زۆربەی ئەم هێرشانەی بۆسەرخۆیی‌و من بەشێوەیەکی فەیلەسوفانە تەماشای دەکرد، بۆی باسکردم:((ئەم دژیەرانە جگە لەلایەنی نەرێنی دروستکردن هیچ کارێکیتر نازانن.)) ئەنوەر راستی دەکرد. دەمزانی ناتوانم هەمووکەسێك رازی بکەم، بەڵام ئەمەشم دەزانی کەلەموڵك‌و ماڵ‌و دارایی رێکخراوەکانی خێرخوازی هیچم بۆخۆم نەبردووە. هەوڵی خۆمدا تۆمەتەکانی

بێبنەما دژی خۆم بەنەبیستراوی بزانم، بەلاّم دەبوونە هۆکاری ئازاردانم‌و هێرشەکان بەردەوام بوون.

لەئەیلوولی ١٩٧٩، ئەلیزابت تیلۆر، ئەستێرەی ئەمەریکا داوای سەردانی میسری لەئێمەکرد. من زۆر خوشحاڵبووم. ئەلیزابێت تیلۆر نەك تەنیا لەبەر جوانی خۆی، چونکە خاوەنی روحێکی گەورەبوو، ئەستێرەی خۆشەویستم بوو. هەمووکاتێك دەمووویست یەکتر ببینین. بەلاّم خاتوو ئەلیزابت وەك زۆر کەسیتر سەردانی ئیسرائیلی کردبوو، ساڵانێکبوو لەکەسانی قەدەخەکراوبوو بۆمیسر.

زۆر ئاسایی دەبوو دوای رێکەوتنی کەمپ دیوید، بۆئێمە هیچ جیاوازی نەبوو کەسێك سەردانی ئیسرائیل دەکات یان نا. ئیتر لیستی رەشی قەدەخەکراوی عەرەب پەیوەندی بەئێمەوە نەبوو. لەم لایەنەوە بەخوشحاڵی بانگێشتی ئەلیزابێت تیلۆرم کرد بۆماڵی خۆمان کەچاخواردنەوەیەك پێکەوە بین. منداڵەکانم هەموویان هاتن بۆئەم میواندارییە کاتژمێرێکی خۆش پێکەوە بووین. بەلاّم چونکە ئەنوەر لەشاری ئەسکەندەرییە بەسەری دەبرد خاتوو ئەلیزابت تیلۆر نەیدەتوانی ببینێت خەمباربوو. گوتم:((لەوانەیە بیتوانم پێش گەڕانەوەت دیدارێك ساز بکەین لەگەڵ ئەنوەر.))

پەیوەندیم بەئەنوەر لەئیسماعیلییە کرد:((کەسێك لێرەیە زۆر خوشحاڵ دەبوو ئەگەر بتوانێت ئێوە ببینێت.))

ئەنوەر بۆی باسکردم کاتم نییە ناتوانم کەسیتر ببینم. گوتم:((ئەنوەر بەداخەوە، ئەلیزابت تیلۆر زۆر نائومێد دەبێت.))

دواتر بەپێکەنین گوتی:((ئێستا کەخاتوو ئەلیزابیت بێت کێشە نییە بەخێربێت.)) نووسینگەی سەرۆکایەتی کۆپتەرێکی رەوانەکرد تاکو خاتوو ئەلیزابت تیلۆر ببات بۆئیسرائیل‌و لەرێگادا لەئیسماعیلییە ئەنوەر ببینێت. ئەنوەر لەدیداری زۆر خوشحاڵ دەبێت، بەلاّم دژبەرەکانی تۆرەکردن، منو ئەنوەریان تاوانبار کرد کەکاتی خۆیان بۆئەستێرەیەکی رۆژئاوای لایەنگری ئیسرائیل تەرخان دەکەن.

دوای ئەم رووداوە کێشەیەکیتر لەسەر کەسێکیتری سەرناسی ئەمەریکا روویدا. زۆر لەرێکەوتنی ئاشتی تێپەری نەکردبوو کەبالیوزخانەی ئێمە لەئەمەریکا نامەیەك لەفرانك سیناترا پێدەگات کەپێشنیاری کردبوو شەوێك بۆکۆکردنەوەی یارمەتی بۆناوەندی ئیمان‌و ئومێد گۆڕانی

پێشکەش بکات، من لەم بیرۆکەیە زۆر خوشحاڵبووم، خوشحاڵی من کاتێك زیاتربوو کەکۆمیتەی خێرخوازیی‌و یارمەتیدانی ئەمەریکا، بەسەرۆکایەتی مایکل برگراك، سەرۆکی کارگەی پێداویستییەکانی جوانکاری ریوۆلن، بڕیاریدا ئەم شەو نشینییە لەپاییزی ئایندە لەقاهیرە بەرێوە ببات. بۆولاتی ئێمە چ رێکلامێکی باشتر لەبلاوکردنەوەی گۆرانییەکانی فرانك سیناترا لەبەرامبەر ئەهرامەکانی میسر لەرێگای تەلەفزیونەوە؟ زۆر لەخەڵکی ئەمەریکا ئاهەنگی فرانکیان لەتەلەفزیۆن دەبینیی‌و دەبوو بەهاندەرێك کەسەردانی میسر بکەن.

نرخ بۆبازرگانەکانی بیانی دوو هەزارو پێنج سەد دۆلاربوو کەبەخێزانەکانی خۆیانەوە دەیانتوانی سێ رۆژ لەهوتیلێ بمێننەوە، بەگەڕان‌و سوڕانەوە لەناو قاهیرەو بینینی لایەنەکانی سەرنج راکێش‌و مۆزەخانەکانی ئیسلامی. هیواداربووین میوانەکانی بیانی بتوانن زیاتر لەمیسر بمێننەوە دۆلارەکانی خۆیان لەشارەکانی ئێمە خەرج بکەن بەتایبەتی خواردنگەو هوتیلەکان. چەند باشبوو ئەم شەونشینییە هیچ خەرجێکی بۆئێمە نەبوو. لایەنی دارایی لەدەرەوە لەلایەن کەسانێك کەتوانایان هەبوو، سوودی بۆمیسر دەگەڕایەوە. فرانك سیناتراو ئەندامانی ئۆرکسترا بەرنامەکەیان بەخۆرایی پێشکەش دەکرد، تەنیا خەرجی فرۆکە لەسەر میسر هەژمار دەکرا کەلەهەمان لایەنی فرۆشتنی بلیت خەرج دەکرا.

کاتێك کەقسەی بەرژەوەندی دروستبوو، هێرشی کەسانی کورت بین دەستی پێکرد دەیانگوت تەنیا میسرییەکان لەم شەونشینییە بێبەشکراون، چونکە بەشێکی بچوك توانای کڕینی بلیتی بەشدار بوونیان هەیە. من دەمزانی لەم لایەنەوە راست دەکەن، گوتم:((مافی خۆیانە دەبێت بەشێك لەبلیتەکان بۆخەڵکی خۆمان تەرخان بکرێن.)) بەم شێوەیە ١٠٪ بلیتەکان بەنرخی سەد لیری میسری لەبەرچاو گیرا. بەلام بۆدژبەرەکان وەك پێویست نەبوو. کۆمیتەی خێرخوازیی‌و یارمەتیدانی ئەمەریکا بەرنامەی هەبوو پێش دەستپێکی کۆنسێرت پێشانگایەکی مۆد لەهوتیلێ مینا هۆز بکاتەوە، ئەمەش لەلایەن نەریتخوازان تاوانبار کرا، پێداگریان دەکرد بەرێز رۆیشتنی مانکەنەکان بەجلوبەرگی رۆژئاوای بەتایبەت لەبەرامبەر پیاوەکان، شەرمەزارییە.

دەستەبەرکردنی خەرجییەکان لەلایەن کارگەی ریوۆلن‌و پێشوازی ئێمە لەخۆدی فرانك سیناترا رەخنەی توند لەئێمە دەگیران، کارگەی ریوۆڵن بەبوونی بازرگانیکردن لەگەڵ ئیسرائیل لەلایەن ولآتانی عەرەبی گەمارۆی خرابوو سەر. خۆدی فرانك سیناترا لەبەر لایەنگری ئاشکرای

بۆئیسرائیل، لەناو لیستی ڕەشدابوو. ئەم لایەنە چ گرنگی هەبوو؟ نییەتی فرانك هاوکاریکردنی وڵاتی ئێمەبوو، نەك لێدانی. ئەگەر بەهەمان شێوە لەئیسرائیل گۆرانی پێشکەش کردبێت هیچ کێشەیەك نەبوو، ئێستا لەمیسر گۆرانی بۆهاوکاری منداڵانی ئێمە دەڵێت، ئەمەیانی کرد. تاکو بەیانی رۆژی بیست و حەوتی ئەیلوولی ۱۹۷۹، شەوێك وەك شەوەکانی هەزارو یەك شەو. سەماو رووناکی دەخرایە سەر ئەهرامەکان. گۆرانی گوتنی فرانك بێ وێنەبوو. خەمباربووم کەئەنوەر نەیتوانی لەگەڵ منو منداڵەکان بێت، بەختەوەرانە سیناترا پێش دەستپێکی ئاهەنگ لەماڵی ئێمە ئەنوەری بینی. سیناترا لەچاوپێکەوتنی لەگەڵ رۆژنامەکان سەبارەت بەئەنوەر دەستەواژەیەکی تایبەتی مۆزیك ژنەکانی جازی بەکاربردبوو کە منو ئەنوەر تاکو ئەوکاتەی کەمنداڵەکان بۆیان شیکردینەوە مانای ئەم دەستەواژەیەمان نەدەزانی، دەڵێت:((بەراستی پیشیلەیەکی دڵڕفێنە.))

لەگێرانی ئەم کۆنسێرتە سەرکەوتنێکی گەورە هەژمار دەکرا زیاتر لەسەد هەزار دۆلار بۆناوەندی ئیمانو ئومێد کۆکرایەوە. بەیانی رۆژی دواتر، سیناترا خۆی سەردانی ناوەندی ئیمانو ئومێدی کرد. بۆمنداڵو کەسانی کەم ئەندام لەسەر کورسییەکی تایبەتی کەم ئەندامان گۆرانی گوتن، هەرچەند ئەمانە هیچ شارەزاییان لەم جۆرە مۆزیکە نەبوو بەڵام هەوڵی خۆیاندا لەگەڵیدا دووبارە بکەنەوە. بینینی ئەمانە بەم هەستو سۆزە گەرمیو شادی، زۆر کاریگەربوو فرمێسکی زۆر کەسی بەتایبەتی خۆدی من دەرهێنان. بۆمن جێگای سەربەرزیبوو کەخەڵکانیتر پشتیوانی لەپرۆژەی ئێمە دەکەن. هەمان شەونشینیو گۆرانی گوتن گەشتیاری زۆری بۆوڵاتی ئێمە راکێشا، بەتایبەتی دەهاتن بۆتەماشاکردنی ئەهرامەکان،ئاسەوارێك کەلەهیچ شوێنێکی جیهان بوونی نەبوو، دەبوو هۆکاری زیاتر ناسینی خەڵکی میسر.

رەخنەکانی کەلە ئاهەنگی خێرخوازی گیران بەنەبیستراوی هەژمارمان کردن. ئەگەر ئەم وردەفرۆشان دەیانتوانی بەم شێوەیە هاوکاری ناوەندی ئیمانو ئومێد بکەن بێگومان گوێمان لێدەگرت، بێگومان نەیاندەتوانی. لەدەستپێك بڕیارماندا هاوکاری هەموو کەسێك بۆناوەندی ئیمانو ئومێد وەردەگرین. ئەگەر کەسانێك ئەمەیان بەکێشە دەزانی، کێشەی خۆیانبوو.

بەم دوایانە کاتێك لەئەمەریکابووم کەسێکی یەهوودی بۆی باسکردم:((خاتوو سادات، دەتانەوێت بۆپرۆژەتان هاوکاری کۆبکەمەوە؟))

بۆم باسکرد:((بێگومان زۆر خوشحاڵ دەبم.))

بەلاٚم ئاگاداری کردم:((تەنیا بەمەرجێك، ئەگەر دەتەوێت بۆناوەندی ئیمانو ئومێد هاوکاری کۆبکەمەوە، بۆدەزگای هاداسە لەئیسرائیل پێکەوە دەبێت.))

پێکەنیم. گوتم:((کێشە چییە ئەگەر پێکەوە بێت؟ ئەگەر ویستان بۆدە ناوەندو دەزگا لەئیسرائیل هاوکاری کۆبکەرەوە. ئەگەر دەتەوێت هاوکاری ئێمە بکەیت زۆرباش دەبێت.))

بەلاٚم دژبەرەکان نەیاندەویست بزانن‌و تێگەیشتنیان هەبێت کەمانای ئاشتی چییە بەرزترە لەکۆتایی هێنان بەشەڕ. پارتی چەپی (یەکێتیی) لەشوباتی ١٩٨٠،هەمان ڕۆژی یەکەم کەبالیوزی ئیسرائیل گەیشتە میسر بەسووتاندنی ئاڵای کاغەزی ئیسرائیل بەرزکردنەوەی ئاڵای فەلەستین، ڕایانگەیاند:((ئێمە دەبێت ڕێگا لەداگیرکردنی میسر لەلایەن ئیسرائیل بگرین!)) پارتی سوسیالیزمی کرێکاران کاردانەوەیەکی هاوشێوەی نیشاندا، ئاڵای فەلەستینی لەسەر بالأخانەی ناوەندی خۆی بەرزکردەوەو وێنەی ناوەندی خۆی بەئاڵای فەلەستین لەرۆژنامەیەکی خۆی چاپکرد. بێگومان ئیخوان موسلمین چەندین مانگ پێشتر سیاسەتی خۆیان بەرامبەر گۆڕانکارییەکان ئاشکرا کردبوو. ڕۆژنامەی (دەعوەت) دەنووسێت ئاسایی بوونەوەی پەیوەندییەکانی نیوان میسرو ئیسرائیل:((لوویەکی پەنچەشێرە لەناو جەستەی میسر.))بیروباوەڕەکانی ((نائیسلامی خرابی خێزانی)) دێنێتە ناومیسر. ئەنوەر نەیدەویست لەبەرامبەر ئەمانەدا خۆی لاواز نیشانبدات لەسەر بیروباوەڕەکانی خۆی بەهێز دەمایەوە. مانگێك پێش ئاسایی بوونەوەی پەیوەندییەکانی نیوان دوو وڵات، لەناو وتاری خۆیدا لەپەرلەمان فەرموودەیەکی پێغەمبەری گێڕایەوە:((ئەگەر ئەمانە بۆگۆڕینی بیروباوەڕی من سەبارەت بە(ئاشتی) خۆری لەناو دەستی ڕاستو مانگ لەناو دەستی چەپ دابنێن، لەم ڕێگایە ناگەڕێمەوە، تاکو خودا پەیامی من سەرکەوتوو دەکات یان کاتی مەرگم دەگات...)) من لایەنگری هاوسەری خۆم بووم تاکو شوێنێك کەدەمتوانی، لەبەرامبەر هەموو هێرشی دژبەرەکان، بەئارامی دەمامەوە. هیچ یەکێك لەئێمە نەیدەزانی تاکو توندترین قۆناخی ئەزموونی ئەنوەر لەبەرامبەر ئازایەتی‌و پاراستنی بنەمای ئەخلاقی تەنیا مانگێکی ماوە.

فەرەح لەمانگی ئاداری ١٩٨٠ لەپاناما پەیوەندی بەمنەوە کردو گوتی:((جیهان هەلومەرجی ئێمە زۆر خرابە. پەنجەشێری فاتەڕەشەی هاوسەرمی گرتووە ئەگەر نەشتەرگەری بۆنەکرێت دەمرێت. بەلاٚم لێرە باوەڕ بەهیچ کەسێك ناکەم.))

پرسیم:((بۆچی فەرەح، بۆچی؟))

بەقورگی گیراوی بۆئەوەی من تێگەیشتنم بۆمەبەستی هەبێت کەتەلەفۆنەکان کۆنترۆڵ دەکرێن گوتی:((کێشەیە لەرێگای تەلەفۆن بۆتان باس بکەم، بەڵام ئێمە دەبێت بەخێرایی لەپاناما بچینە دەرەوە. هەواڵەکان زۆرخرابن.))

دەمزانی باسی چ دەکات، چونکە هەندێك دەنگۆی گرێدراو بەگەڕاندنەوەی شای ئێرانم بیستبوون. کارێك کۆتایی بەمەرگی تەواو دەبوو.

((بۆنەشتەرگەری چ دەکەن؟))

((وای، جیهان، من ئیتر نازانم چی بکەم، بەهەرشێوەیەك بێت دەبێت لەم نەخوشخانە دەربێنم.))

من دەمزانی فەرەح ناتوانێت باسی چی بکات، بەڵام نەیدەویست باوەڕ بکەم. لەوانەیە لەنەخوشخانە هێرش بکرێتە سەرشا؟

پرسیم:((ناتوانی داوا لەپزیشکانی ئەمەریکی بکەیت کە نەشتەرگەری بۆ بکەن؟))

لەوەڵامدا گوتی حکومەتی پاناما رێگایان پێی نادات.

((بەڵام حکومەتی ئەمەریکا دەتوانێت لەپشتیوانیکردنی ئێوە دەستوەردان بکات.))

بەگڵەیی گوتی:((حکومەتی ئەمەریکا؟ بینیمان چۆن هاوکاری ئێمەی کرد، تاکو کۆتایی تەمەن لەیادی ناکەین.))

بەبیستنی قسەکانی فرمێسك لەچاوەکانم پەنگیان خواردبوو. دەنگی کەجاران زۆر بەهێزبوو، ئێستا بەدەنگی نزمو باوەڕ بەخۆبوونی تێك شکابوو. شاو فەرەح چواردە مانگی زۆردژواریان تێپەڕ کردن. دوای رۆیشتنیان لەمیسر، بەدوای شوێنێك بۆمانەوە، لەمەراکێش بۆدورگەی پاناما لەهەمان شوێن بۆمەکزیكو دواتر بۆئەمەریکا رۆیشتن، بەڵام هیچ شوێنێکیان نەدۆزییەوە. زاڵمانەترین لێدان بەدەستەواژە هاوپەیمان، ئەمەریکا وەشاندی. دوای داگیرکردنی بالیوزخانەی ئەمەریکا لەتاران بەبارمتەگرتنی پەنجا ئەمەریکی بەدەستی قوتابیانی شۆڕشگێڕ (قوتابیانی بەیرەوی رێگای ئیمام. و.ك) لەتشرینی دووەمی ساڵی ١٩٧٩، بەپەلە شای ئێرانیان بەنەخۆشی لەوڵاتی خۆیان دەرکرد. خومەینی هەڕەشەی لەئەمەریکا کرد:((ئەگەر شا بۆئێران نەگەڕێننەوە، بارمتەکان دادگایی دەکرێن.))

ئەنوەر لەکارو هەڵسوکەوتەکانی خومەینی بێزاربوو. بۆرۆژنامە نووسانی بیانی گوت: ((ئیسلام وانەی خۆشەویستیو برایەتییە، نەك کارەکانی کەئەم پیاوە دەکات.)) بەهەمان شێوە

هەڵسوکەوتەکانی کەلەگەڵ شا دەکران داخباربوو. مەکزیك پێش سەفەری شا بۆئەمەریکا رازیبوو بەمانەوی شا، بەڵام ئێستا رێگای بەگەڕانەوەی نەدا. لەکۆتایدا شاو فەرەح بۆماوەیەکی کاتی مانەوە. ئێستا دەبێت دیسان لەهەمان شوێن رۆیشتبان. بەخێرایی.

بۆم باسکرد:((فەرەح دەبێت بەخێرایی بگەڕیتەوە بۆمیسر من ئامادەکاری دەکەمو پەیوەندی دەکەمەوە.)) ئایا دەیتوانی زیاتر لەئەمەیان سزای خۆی وەربگرێت؟ وڵاتی خۆی لەدەستدا، ئێستا هاوسەری لەدەست دەڕۆیشت. ئەگەر من شام لەنزیکەوە نەدەناسی، دیسان ئەمەیانم بۆدەکرد. پیاوێك لەدەست رۆیشتبوو، نەخوش‌و لەناو گەمارۆی دوژمنەکان. هاوکاری نەکردنی دووربوو لەمرۆڤایەتی. لەگەڵ خۆمدا بیرم دەکردەوە ئەگەر ئێمە ئەم پیاوە داڵدە بدەین خودا هیچ کاتێك ئێمە بەتەنیا جێ ناهێڵێت. پەیوەندی بەسیاسەتەوە نەبوو. بابەت بنەمای ئەخلاقیبوو.

پەیوەندیم بەئەنوەر کرد، هەلومەرجی خرابی شاو فەرەح‌و منداڵەکانم بۆباسکرد. گوتم:((بەفەرەحم راگەیاندووە دەبێت خۆیی‌و شا بەخێرایی بگەڕێنەوە بۆمیسر. ئایا هەڵەم کردووە؟))

((گومانت نەبێت، جیهان. پەیوەندی بەفەرەح بکەن فرۆکەی سەرۆکایەتی کۆمار بەخێرایی بۆیان ڕەوانە دەکەم.))

بۆم باسکرد:((پشتراستی؟ دەزانی لەوانەیە کێشە دروست ببێت.))

بەڵام پشتراست بوو. گوتی:((خودا خوشحاڵ دەبێت.))

کاتێك بەهەواڵەکانی خۆش پەیوەندیم بەفەرەح کرد. باوەڕی نەدەکرد. بەناباوەڕی پرسی:((واتە ئێوە رێگا بەپزیشکانی ئەمەریکا دەدەن نەشتەرگەری بۆشا بکەن؟ پشتراستی؟ دوای هەمان ترس‌و دڵەڕاوکێ، ئیتر نەیدەتوانی باوەڕ بەچ کەسێك بکات.

چەندینجار بۆم دووبارە کردەوە:((بەڵێ فەرەح، بەڵێ، ئەگەر پێویست بکات. ئێمە شارەزایانی زۆری میسری بۆهاوکاریکردنی ئێوە ئامادەن. بەڵام بڕیار لەدەستی ئێوە دایە.))

لەراستیدا ئەمەیان فرۆکەی ئەنوەر نەبوو کەشاو فەرەحی لەبیست‌و سێی ئادار لەپاناما هێنایەوە بۆمیسر. ویلایەتەیەکگرتووەکان بەهۆکاری سیاسی، پێداگریان دەکرد دەبێت شا بەفرۆکەی بازرگانی سەردانی میسر بکات. پاڵەپەستۆی زۆریان خستە سەر ئەنوەر کەبەهێچ شێوەیە رێگا بەشا نەدات. بالیوزی ئەمەریکا لەمیسر ئامۆژگاری ئەنوەریکرد:((کەسێك لەوانەیە

ئاسایشی میسر بخاته مەترسییەوە رێگری لەهاتنی بکەن بۆمیسر.)) بەڵام ئەنوەر نەڕۆیشتە ژێر پاڵەپەستۆکانی سیاسی ئەمەریکا. میسر بڕیاری خۆیدەدات، نەك کەسیتر. ئەنوەر کەسێك نەبوو دەست لەبرای خۆی هەڵگرێت. بەم کردەوە بەدونیایی راگەیاند، بەبوونی تەواوی کێشەکانی میسر، ئێمە بنەمای ئەخلاقی خۆمان لەدەست نەداوە.

کاتێك بۆپێشوازیکردن لەشاو شابانۆ لەفرۆکەخانە لەتەنیشت ئەنوەر وەستابووم. بینیم شا زۆر بەزەحمەت لەفرۆکە دێتەخوارەوە، ئەوەندە لاوازبوو کەجلوبەرگەکانی دوو ژمارە گەورەتر دەهاتنە بەرچاو. رەنگی وەك مردووەکان گۆڕابوو. لەم ساتە زیاتر لەهەموو کەسێکیتر پێویستی بەهاوڕێی هەبوو. تەماشام کرد جارێکیتر لەبەرامبەر دڵڕەقی ئەمەریکا لەبەرامبەر ئەم کابرایە راچڵەکام. سوپاسی خودام دەکرد کەهاوسەری من بوێری ئەوەی هەیە کەبەشێوەی مرۆڤ هەڵسوکەوت لەگەڵ شا بکاتو بەفەرمی بەخێرهاتنی بۆمیسر بکات.

کاتێك ئێمە چوارکەس پێکەوە بەکۆپتەر رۆیشتین بۆنەخوشخانەی سەربازی معادی. شا نەیدەتوانی رێگا لەگریانی خۆی بگرێت. رووی لەئەنوەر کردو گوتی:((من هیچ کارێکم بۆئێوە نەکردووە، ئێوە تەنیا کەسن کەبەرێزەوە پێشوازیم لێدەکەیت. ئەوانی من هاوکاریم کردن هیچ قسەیەکیان نەکرد من سەرم لەم لایەنە دەرناچێت.))

من بۆم باسکرد:((جەنابی سەرۆك، تکا دەکەم، هاوسەرم هیچ کارێکی نەکردووە جگە لەهەمان ئەگەر تۆ دەبوویت هەمان کارت دەکرد، ئایا هەمان هەڵسوکەوتت لەگەڵ ئێمە نەدەکرد؟))

ئەنوەر دواتر یەکێك لەجوانترین کۆشکەکانی میسر، کۆشکی قوببە، بۆمانەوەی شاو خێزانی لەبەرچاو گرت.

چوار رۆژ دوای هاتنی شا، مایکل دباکی، پزیشکی ئەمەریکی بەهاوڕێیەتی حەوت پزیشك، کۆمەڵێك پەرستیارو شارەزا بۆدەرهێنانی فاتەڕەشەی شای ئێران گەیشتن. پزیشکانی پسپۆری میسری هاوکاری پزیشکانی ئەمەریکایان کرد لەسەرکەوتنی نەشتەرگەری شا. لەرزگاربوونی ژیانی شا خەیاڵم ئاسوودە بوو. بەڵام لەرووداوەکانی دوای هاتنی بۆمیسر روویاندا، بێزار بووم.

مردن بۆسادات! مردن بۆشای کحوولی، دیکتاتۆر، زیناکار دەبێت دەر بکرێت! دوای هاتنی شا بەشێکی بچووك لەناو زانکۆکانی قاهیرە بەردەوام خوپیشاندانیان دەکرد. ئەوەنور چاوەڕێی

ئەمجۆرە کاردانەوانە بوو. چونکە توندڕەوانی موسڵمان لایەنگری توندی خومەینی بوون، بەڵام ئامادەی گفتوگۆ نەبوون.

ئەنوەر دوای نەشتەرگەری شاو مانەوەی لەنەخوشانە لەڕێگای تەلەفزیون، پەیامێکی لەسەر وەرگرتنی شای ئێران بلاوکردەوە. خەڵکی میسر بەدەنگی بەرزو هاوارکردن وەڵامی ئەنوەریان دایەوە، گوندنشینەکان پێشنیاریان کرد بۆپاراستنی شا ئامادەن سەردانی قاهیرە بکەن. ئەندامانی پەرلەمان بە ٣٨٤ دەنگی بەڵێو ٨ دەنگی نەخێر، بەهێزەوە پشتیوانیان لەئەنوەر کرد بۆپاراستنی سەرۆکی پێشووی ئێران، بەڵام بەشێکیان رازی نەدەبوون.

دەنگوی تیرۆکردنی رزا کوڕی شای پێشووی ئێران، بوون بەهۆکار کەلەناو زانکۆ پاسەوانی بۆدیاری بکرێن. لەئەسیوت، ناوەندی توندڕەوانی نەریتخوازی ئیسلامی لەمیسر، پێکدادان روویدابوو. کاتێك شا لەقاهیرە ئامادە دەکرا بۆنەشتەرگەری، زیاتر لەدوو هەزار کەس بۆتاوانبار کردنی هاوسەرم کۆبوونەوە. لادەرترین چینی کۆمەڵگە بەسوود وەرگرتن لەم نائارامیانە، هەستان بەپروپاگەندە دژی قبتییەکان خوپیشاندانی دژی حکومەت گۆڕا بۆدژی مەسیحییەت. خەڵکی تووڕە دواتر هێرشیان کردە سەر قبتییەکان چەند کەسێکیان کوشتن. بۆکۆتایی هێنان بەتوندوتیژی سوود لەپۆلیسی دژە شۆڕش وەرگیرا کەبەگازی فرمێسك ڕێژ هێرشیان کردە سەر خوپیشاندانەکان.

ئایا بێتوانایی ئەم کەسانە بۆهەزمو تێنەگەیشتن هیچ سنوورێکی نەبوو؟ هاوکاری برایەکی پێویست، وەك هاوکاری ئەنوەر بۆشا، ئایا بنەمای راستەقینەی ئیسلام نەبوو. لەسورەی چوارەمی قورئان هاتووە:((سەبارەت بەباوكو دایكو خزمانو هەتیوانو هەژارانو دراوسێیەکانی نزیكو بێگانەکان چاكو دلۆڤانی بکەن.)) کاتێك کەعیسا مەسیح (د.خ)، خێزانی بۆخۆپاراستن پەنایان بۆمیسر هێنابوو. سەرۆك سلال، سەرۆککۆماری پێشووی یەمەن، وەك میوانی حکومەت لەقاهیرە دەژیا، وەك هاوسەرو منداڵەکانی قەوام نکرومەی وڵاتی غەنا. پل، پاشای پێشووی یونان، ئەحمەد زوغۆ پاشای ئەلبانیا. وەك سەرۆکەکانی ئێستای تونسو جەزایر، حەبیب بورقیبەو حواری بۆمدین، وەك دوورخراوەو پەنابەر لەمیسر ژیابوون. دوای لەکار لادانی مەلیك ئیدریس لەلادانی لەلیبیاو مەلیك سعود لەعەرەبستانی سعودیا، پێشوزای لەمانەوەیان لەمیسر کراوە. ئەنوەر بەڵگەنامەکانی خێزانی مەلیك فارۆقی پێشکەش کردبوون، هەندێك لەخزمانی مەلیك فارۆق بۆبەردەوامی ژیانی خۆیان گەڕابوونەوە بۆمیسر. ئێستا ئەم چینەی کەمایەتی

بۆبەردەوامی ئەم نەریتەی میسرو هاوکاریکردنی کەسانی لێقەوماو بەکافر دەزانن. چ هەڵەیەکی گەورە. ئیمانی ئەنوەر لەهەموو کەسێك بەهێزتر بوو. تەواوی قورئانی لەبەر دەخوێندەوە،، لەتەواوی مانگەکانی رەمەزان سێجار قورئانی دەخوێندەوە، جارێکیان تەواوی قورئانی بۆمنداڵەکانی ئێمە خوێندەوەو دەنگی تۆمار کرا. شەوان بەقورئانی لەژێر سەرو یەکێکیتر لەسەر مێزی تەنیشت تەختی خەوتنیبوو، ئەوکات دەخەوت. ئایەتێکی قورئان لەسەر کاتژمێری دەستیبوو. نوێژی بەرێکو پێکی دەکردن. ئەوندە لەکرنۆش بردن دەمایەوە کە خاڵێکی ڕەش لەنیوچاوانی دەرکەوتبوو میسرییەکان بەمێوژ ناویان دەبرد. ڕۆژانی هەینی بەبێ وەستان، بۆنوێژکردن سەردانی مزگەوتی دەکرد، زۆر جار بۆگوێگرتن لەشێخەکان شوێنی خۆی دەگۆڕی. گرنگتر لەهەموویان، ئەنوەر بە لەبەرچاو گرتنی بنەماو پێودانگی شەریعەتی ئیسلام، هاوکات لەگەڵ ئیمانی دەژیا. ئیسلامی ئەمانە، ئیسلامی ڕواڵەتی، ئیسلامی قینو ڕقبوو. هێرش بۆسەر مەسیحییەکانی قبتی لەئەسیوت زۆر بێزاریان دەکردم. لەدروستکردنی کێشەی مانەوەی شا لەمیسر تەنیا بۆبەدەستهێنانی مەرامەکانی شاراوەی خۆیانبوو. لەلایەکیتر بەدوایدا دەگەڕان: ویرانکردنی پێکەوە ژیان لەنیوان موسلمانو مەسیحی. لەهەمان سەردەم زیاتر لەسالێك دەبوو باسی هەندێك پڕوپاگەندە دەکرا کەئەندامانی گروپەکانی توندڕەویی ئیسلامی بۆقبتییەکانی منیاو ئەسیوت لەدوو پارێزگای میسر کەڕێژەی مەسیحی بەرزترین ڕێژەیە، کێشەیان بۆدروست دەکەن. لەکانوونی دووەمی ساڵی ۱۹۸۰ یەکێك لەم گروپانە کەناویان لەخۆ دانابوو (جیهادی) لەناو دوو کلێسای ئەسکەندەرییە بۆمبیان تەقاندنەوە. هیچ کەسێکی قبتی نەکوژراو ئەندامانی ئەم گروپە گیران.

بەلێشاو راپۆرتەکانی توندوتیژی دژی مەسیحییەت بەرەو قاهیرە دەهاتن. لەهەمان هەفتەی خۆپیشاندانەکانی ئەسیوت، لەکاتی شەڕی نیوان قوتابیانی مەسیحیو موسلمان لەشوێنی مانەوەیان لەئەسکەندەرییە، چەندین قوتابی بریندار بوون. لەسی ئادار، پاپ شنودا، پێشەوای قبتییەکان، لەکاردانەوەی بەرامبەر ئەم ڕووداوە، تەواوی بوونەکانی گریدراو بەجەژنی قیامەی لەوانە دیداری نەریتی لەگەڵ ئەنوەر بۆپیرۆزبایی کردنی جەژن هەڵوەشاندەوە. لەسێی نیسان، پێنج هەزار قوتابی موسلمان دژی شاو قبتییەکان خۆپیشاندانیان کرد. لەهەشتی نیسان، لەهێرشی موسلمانەکان لەمینا، دوو کەسی قبتی کوژرانو سیو پێنج کەس بریندار بوون. لەمانگی ئایار پڕوپاگەندەکان سنووری خۆیان تێپەڕکرد. یەکێك لەهاوڕێیانی قبتی ئێمە

لەقاهیرە بۆی باسکردم گروپەکانی جیهادی کچانی مەسیحی دەدزنو ناچاریان دەکەن هاوسەرگیری لەگەڵ موسلمانەکان بکەن.. هاورێیەکیتر بۆی باسکردم بریار هەموو کلێساکان بسووتێنن. لەراگەیاندنێکی تەواو چەواشەکارانە توندڕەوانی ئیسلامی لەقاهیرە بانگێشەی ئەوەیان دەکرد لەخۆپیشاندانەکانی منیا هێزەکانی حکومەت تەقەیان لەخۆپیشاندان کرد. قبتییەکانی توندڕەو لەهەوڵدان بۆناچارکردنی حکومەت کەیاسایەك بۆپاراستنی مەسیحییەکان، پڕوپاگەندەی زێدەڕۆ کێشەکانیان گەورەتر دەکردن. موسڵمانەکانی توندڕەو بۆهەڵگەڕانەوەی خەڵك لەحکومەت، پڕۆپاگەندەیان زۆر گەورە دەکردن. هیچ کەسێك نەیدەزانی قسەی چ لایەنێك باوەڕ بکات.

لەیەکێك لەم کێشانەی ناخ هەژێن ئەمەریکا دەستی هەبوو لەخراپتر کردنی هەلومەرج. ئەنوەر دەیزانی نەریتخوازەکان دژی دەوەستنەوە، لەمانگی نیسان رێگای بەتیمێکی ئەمەریکادا بۆرزگار کردنی گیانی بارمتەکانی ئەمەریکا لەئێران سوود لەفرۆکەخانەی ئێمە لەقنا وەك خاڵی دەستپێك وەربگرن. ئەم تیمە گیرۆدەی کارەساتێك بوون، تیمی ئەمەریکی شارەزاییان لە تایبەتمەندی بیابان نەبوو، یەکێك لەکۆپتەرەکان لەناو تۆفان لەکار کەوتو دووانیتر کەوتنەخوارەوەو هەشت سەرباز کوژران. من سەرم سوڕمابوو، هەموومان سەرمان سوڕمابوو لەکردەوەیەکی سەربازی بەرنامە بۆدارێژراو لەلایەن وڵاتێکی پێشکەوتوو وەك ئەمەریکا چۆن دەکرێت گیرۆدەی ئەم کێشەیە ببێت. ئێستا پەیڕەوانی خومەینی لەمیسر ئامانجێکی نوێیان دەستکەوت بۆهێرشکردنە سەر ئەنوەر دەبێت بەخێرایی لەم لایەنەوە کارێك بکات.

ئەنوەر لەماوەی مانگێك توانی رێگا چارەیەکی سیاسی بۆرەوتی ئاشتیو کێشەکانی مەزهەبی بیدۆزێتەوە. کۆمیتەیەکی پێکهاتوو لەنوێنەرانی موسڵمانو قبتی لەئەندامانی پەرلەمان پێکهێنا بۆئەوەی لێکۆڵینەوە لەرووداوەکانی گرێدراو بەتوندوتیژی مەزهەبی بکەن لەئەنجامی لێکۆلینەوەی کۆمیتە، شێوازێکی باشو یەکسان بۆبەرامبەر بوونەوە لەگەڵ کێشەکانی مەزهەبی دۆزرایەوە. بۆپشت راستبوونی شەش ملیون مەسیحی میسری، بریاری کاردانەوەی توندی بۆ هەموو پێکهاتەکان کەپڕوپاگەندەی توندوتیژی مەزهەبی بلاودەکەنەوە، لەوانە گروپەکانی نەریتخوازی ناو زانکۆکان دەرکرد. لەهەمان کات پێشنیارێك بەنەریتخوازانی ئیسلامیدا کەئامادەیە رستەیەك کەلەناو دەستوور دابوو بگۆرێت. لەدەستووردا هاتبوو شەریعەت یەکێك لەسەرچاوە سەرەکییەکان دەبێت بۆدانانی یاساکان. بەلام ئەنوەر بەلێنیدا بگۆرێت بۆشەریعەت

سەرەکیترین سەرچاوەی یاسا دانانە لەمیسر. ئەم هەوڵەی ئەنوەر لەلایەن قبتییەکانی توندڕەو کاردانەوەی هەبوو، بەڵام لەراپرسییەکی گشتی لەئایاری ١٩٨٠، ٩٨٪ دەنگەکانی بەدەستهێناو چەسپا.
حکومەت زۆر خۆشەویستانە پشتیوانی لەئەنوەر کرد، پشتیوانی بەشێوەیەکبوو کاتێك ویستی لەبەهار دەست لەپۆستی سەرۆکایەتی لەساڵی ١٩٨٢، هەڵبگرێت پێش ئەوەی دوو ساڵی کۆتایی خولی دووەمی تەواو بکات. نەیانوویست بڕیاری ئەنوەر لەم لایەنە قبووڵ بکەن. من لەکاتی راگەیاندنی کۆبوونەوەی ساڵانەی کۆمیتەی ناوەندی پارتی یەکێتیی میللی ئامادە بووم. ئەندامانی حیزب لەبەرامبەریدا دەیانگوت:((تاکو کۆتایی تەمەن! تاکو کۆتایی تەمەن! تۆدەبێت بمێنیتەوە سادات.)) هەموو کەسانی ئامادە دەستیان بەچەپڵەرێزان کرد. ئەنوەر لەبەرامبەر هەمان هەستی گەرمو خۆشەویستی کە ئەندامانی پارتەکەی نیشانیاندا پێکەنیو روخساری وەك گوڵ دەگەشایەوە. بەڵام شەپۆلی رووداوەکان زۆر خێرابوون. دوای کۆنگرە، بەهەموارکردنی ماددەیەکی یاساسی، سنووردارکردنی دوو خولی شەش ساڵەی سەرۆکایەتی کۆمار هەڵگیران، ئێستا ئەنوەر دەیتوانی خولێکیتری سەرۆکایەتی کۆمار بەردەوام بێت، شتێك کەبەهیچ شێوەیەك مەبەستی نەبوو.
ئاگادارم کردەوە:((ئەمانە باوەڕ ناکەن کەتۆ دەتەوێ دەست لەکار بکێشیتەوە، بەراستی دەبێت دەست هەڵگریت، نەك تەنیا باسی بکەیت کەخەیاڵی دەست هەڵگرتنم هەیە.))
بۆی باسکردم:((نیگەران نەبیت جیهان، هەرکاتێك هەموو بیابانی سینام گەڕاندەوە، حکومەت رادەستی حوسنی موبارك دەکەم، من خۆم کاتی دەزانم. وەك یاریزانەکانی پیر نیم کەئەوەندە لەمەیدان بمێنمەوە کەتەماشاوانەکان بێزار بکەم.))
دەنگدەرانی هاوسەرم زۆر رازیبوون. پاپ شنوداو پەیڕەوانی، بەشادی لەهەڵوێست وەرگرتنی نوێی ئەنوەر لەبەرامبەر گروپەکانی توندڕەویی موسڵمانان قەدەخەکردنی جەژنی قیامەی قبتییەکانی هەڵگرت. بەجۆرێکبوو نەریتخوازەکان نەیاندەتوانی خۆشحاڵیو رازیبوونی خۆیان لەگۆڕانکارییەکانی نوێی دەستوور حاشا بکەن.
بەئارام بوونەوەی قەیرانەکانی مەزهەبی، ئەنوەر هەستانەوەی لەبەرامبەر کێشەکانی ئابووری دەست پێکرد. ١٠٪ مووچەی فەرمانبەرانی زیادکرد. گومرگی لەسەر کاڵاکانی هاوردە هەڵگرت، هاوکارییەکانی حکومەت لەلایەنی خۆراکی وەك نانو، بەنزین، روونی خواردن، کارەبا، شەکر

بەردەوامی پێدا. سێبەری هەژاری لەسەر سەری کەسێکی زۆر نەدارو نارازی دەڕۆیشت. بەلام هەوڵدانەکانی ئەنوەر نەیاندەتوانی سەرانی رۆژهەلات رازی بکات.

لەحوزەیرانی١٩٨٠، رۆژێك ئەنوەر بۆی باسکردم:((دیسان نامەیەکی هەڕەشە ئامێز لەلایەن فەلەستینییەکان بەدەستم گەیشتووە دەلێن ئەگەر بەشداری لەکۆنفرانسی ئافرەتان بکەیت یان دەدزرێت یان دەکوژریت.))

بێدەنگبووم.

ئەنوەر بەردەوامبوو:((جیهان من رێگا لەرۆیشتنی تۆ ناگرم، خۆت بڕیار بدە ئایا ئەم سەفەرە ئەندەی دێنێت کەبکەویتە مەترسی.))

دوای ماوەیەك بێدەنگی گوتم: ((کێشە نییە ئەنوەر، هەرچی دەبێت بابێت، ئەم جۆرە مەرگە لەمەرگی سەرجێگا بەباشتر دەزانم.))

هیچ کەسێك نەیدەتوانی رێگا لەرۆیشتنی من بۆکۆنفرانسی ژنان کەلەلایەن نەتەوە یەککگرتووەکان لەمانگی تەمووز رێکخرابوو بگرێت. لەکۆنفرانسی یەکەم، کەپێنج ساڵ پێش لەمەکزیك بەرێوەچوو، فێری زۆر لایەنی ژیانی ژنانەی کردم. چاوپێکەوتنم لەگەڵ سەرۆك وەزیری سریلانکا. خاتوو باندارا نایکە، خاتوو نسرەت بۆتۆ لەپاکستان، ئەوانیتر بۆبەهێزکردنی پێگەی ژن لەولاتانی خۆیان چالاکی زۆریان دەکرد، گوێبیستی زۆر لایەن دەبووم کەدەبوون بەهاوکار کەلەمیسر زیاتر کار بکەم. لەمەکزیکوسیتی چاوپێکەوتنم لەگەڵ خاتوو رابین لەئیسرائیل دووریم کرد، بەلام ئەمساڵ لەکۆنفرانس منو وەفدی ئیسرائیل دەمانتوانی دۆستانە قسە لەگەڵ یەکتر بکەین. ئەمجارەیان تۆرەی فەلەستینیەکان بوو کەخۆیان بەدوژمنی من راگەیاند.

لەکاتی دابەزینمان لەفڕۆکەخانە وەك وەفدی میسر شوێنەکان پڕبوون لەکەسانی ئەمنی. رۆژنامەیەکی دانیمارکی نەخشەی ڕفاندنی منی بلاّکردەوە حکومەتی دانیمارك پێداگربوو کەرێگری لەهەموو هەڕشەکان دەکات، پۆلیسی زۆر لەبالیوزخانەی میسر، شوێنی مانەوەی من، لەناو هەموو دەرگاکان کەمن لەناویدا دەرۆیشتم بۆکۆنفرانس، نەخوشخانەکانیو خانەی بەسالاداچووان کەمن سەردانم دەکردن، لەناو باخەکانی تیوولی ئامادەی تەواویان هەبوو. لەماوەی چوار رۆژمانەوەم تەنیا لەدەبلیو سی بەتەنیابووم.

فەلەستینییەکان چونکە دەستیان بەمن نەدەگەیشت، بۆهێرشکردنە سەرمن سوودیان لەرێگاکانیتر دەبینی. وەفدی فەلەستین چونکە خاوەنی حکومەتی خۆیان نەبوون. وەك چاودێری کۆنفرانس بانگێشت کرابوون. چەندین ساڵ پێش لەگەڵ چەند ئەندامێکی ئەم وەفدەی فەلەستین لەقاهیرە ئاشنایەتیم هەبوو. لەوانە لەیلا خالد سەرۆکی وەفد. ئەوکات لەیلا ژنێکی زۆر نەرمو خۆشەویست دەهاتە بەرچاو، بەڵام ئەمەیان دەگەڕێتەوە پێش بەشداریکردنی لەرفاندنی دوو فرۆکەی ئەمەریکی. ئێستا لەناو کۆنفرانس بەجلوبەرگی شۆڕشگێرەکان زۆر توند دەهاتە بەرچاو. لەکاتێك کەمن لەکۆنفرانسی رۆژنامەوانی پێویستی عەرەبم بۆپاراستنی ئاشتی لەگەڵ دراوسێیەکانم باس دەکرد، لەیلا بۆرۆژنامە نووسەکان باسی دەکرد چونکە ئیسرائیل فەلەستین بەفەرمی ناناسێت، تەنیا زمانێك کەئەم رژێمە بۆفەلەستین بەجێی هێشتووە زمانی توندوتیژییە.

لەکاتی وتاری من لەناو کۆنفرانس، لەیلاو هاوڕێیانی بەئاشکرا توندوتیژی خۆیان نیشاندا کاتێك کەمن ئامادە دەبووم وتاری خۆم پێشکەش بکەم وەفدی فەلەستین بەدەنگی بەرز لەهۆڵی کۆنفرانس دەرۆیشتنە دەرەوە. من بێ ئەدەبی ئەوانم بەنەبینراو دەزانینو بەردەوامبووم لەوتاری خۆمدا. بەڵام فەلەستینییەکانی کەبۆ برینی وتاری من لەهۆڵی کۆنفرانس مابوون کارێکی ئاسان نەبوو. ژنێك بەزمانی عەرەبی هاواریکرد: ((وەرەخوارەوە، خائین! هاوسەرت خیانەتی لەعەرەب کردووە!)) وەك بەردەوامبووم لەوتاری خۆمدا وەك ئەوەی هیچ کەسێك لەناو هۆڵەکەدا نەبێتو من تەنیابم. هەموو فەلەستینییەکان بەدەنگی بەرز هاواریان دەکرد بەجۆرێکبوو کەنەمتوانی بەردەوامی پێی بدەم:((خائین! خائین! سادات خائینە!)) لەگەڵ خۆمدا دەمگوت جیهان خۆت کەڕ بکە، ئەوانیتر لەناو هۆڵی کۆنفرانس عەرەبی نازانن، بەڵام هاوارەکان زیاتر دەبوون بەبڕیاری خاتوونی سەرۆکی کۆنفرانس من بێدەنگبووم، بەڵام فەلەستینییەکان بێدەنگ نەبوون.

تەنیا ئەوەی کەوتە ناوبیرم رستەیەکی شکسپێربوو، بەئینگلیزی هەموویان تێدەگەیشتن، بەگێرانەوەیەك لەشا لیر دەڵێت:((کاتێك دەم دەکەمەوە رێگا بەورینی هیچ سەگێك نادەم.)) بەڵام گومان دەکەم ئەگەر فەلەستینییەکان تەنیا ئاگاداری وشەیێك بووبن، چونکە لەگەڵ پۆلیس لەکێشە دابوون کەبۆبێدەنگ کردنیان هاتبوونە ناو هۆڵی کۆنفرانس. دیسان کۆبوونەوە

کێشەی تێکەوت وەفدی ئێرانیو عێراقی پشتیوانی خۆیان لەوەفدی فەلەستین کردو ڕۆیشتنە دەرەوە. کۆنفرانس کێشەی بۆدروست دەبوو. من کۆتایم بەوتاری خۆم هێنا.

هەڵسوکەوتی ژنانی عەرەب لەناو کۆنفرانس زۆر ناشیرین بوو. ئێمە بۆباسکردنی کێشەکانی هاوبەش هاتبووین نەك دەست لەسەر جیاوازییەکان دابنێن. هەموو وەفدێك مافی ئەوەی هەبوو ئەگەر وتارێکی بەدڵ نەبێت لەهۆڵی کۆنفرانس بچێتەدەرەوە. کاتێك ژنێکی ئێرانی لەوتاری خۆیدا بانگێشەی بۆ لایەنێك دەکرد کەئەم ژنە ئێرانییە بەدڵی من نەبوو. من بەبێدەنگی لەهۆڵی کۆنفرانس ڕۆیشتمە دەرەوە، بەڵام نەك وەك وەفدی فەلەستین لەبەرچاوی ژنانی جیهان پۆلیس بۆدەرەوەی رادەکێشان کەجێگای شەرمەزاریبوو.

هەڵسوکەوتی ئەمانە منیان هەڵشێواو کرد. چونکە من خۆم هاودەردی ئەوانبووم بەبێ ئەوەی هەڵسوکەوتی فەلەستینییەکان لەبەرچاو بگرم کەچەندینجار هێرشیان دەکردە سەرمنو داوای کوشتنی منیان دەکرد، بەڵام من بەچاوێکیتر کارم بۆدەکردن. بەڵام زۆرجار دەگەیشتە شوێنێك کەئیتر لەتوانای مندا نەبوو. بۆنموونە، ڕۆژێکیان لەرێگای قاهیرە بۆ ئەسکەندەرییە لەجادەی بیابان گەیشتینە ئۆتۆمبێلێکی وەرگەڕاو. شوفێری نقوومی خوێنبوو، لەتەنیشت جادە کەوتبوو. ژنێك کەلەناو ئۆتۆمبێلبوو بەحەپەساوی لەتەنیشتی دانیشتبوو بەردەوام دەگریا.

داوام لەشوفێر کرد رابگرێت. سندووقی پێداویستییەکانی سەرەتایم هێنایە دەرەوە بۆهاوکاریان ڕۆیشتم.

کاتێك روخساری ئەم پیاوەم خاوێن دەکردەوە برینەکانم خاوێن دەکردنەوە، پیاوی بریندار بەشێوەی فەلەستینی هاواریکرد:((خواتەمەنت درێژ بکات، خوشکە جیهان، خواتەمەنت درێژ بکات، ئەی دایە!))

بۆئارامکردنەوەی گوتم: ((هیچ قسەیەك نەکەیت، خۆت نیگەران نەکەیت برینەکانت زۆر نین.))

هەمان پیاو جارێکیتر بەهەستێکی زیاتر هاواریکرد:((خودا بتان پارێزێت، خوشکە جیهان!))

بەخاوێنکردنەوەی روخساری لەئەنجامدا توانیم روخساری ببینم. فەتحی برای یاسر عەرەفات بوو، فەتحی پزیشکبوو لەگەڵ مانگی سووری فەلەستینییەکان کاری دەکرد لەهلیوپۆلیس.

دواتر رووی خۆم بەرەو هەمان ئافرەت سوڕاندەوە بینیم ئەنعام، خوشکی یاسر عەرەفاتبوو. چەندین هەفتەبوو یاسر عەرەفاتو فەلەستینییەکان داوای کوشتنی ئەنوەریان دەکرد بەئاشکرا ئەنوەریان لەبەر ئاشتی لەگەڵ ئیسرائیل تاوانبارو داوای کوشتنیان دەکرد. ئێستا ئەم دووانە

لەبەرامبەرم بوون پێویستیان بەهاوکاری هەبوو. بڕیارمدا ئەوەی لەنیوانمانبوو لەیادی بکەم تەنیا پشت بەئەرکی مرۆڤایەتیم گرێ بدەم. دوای ئەوەی ئەنعامم ئارام دەکردەوە هەندێك خوێی بووندارم پێدا، گوتم:((پاسەوانم فەتحی بەنەخوشخانە دەگەیێنێتو تۆش باشتر دەبیت.، فەتحی پێویستی بەچەند تەقەڵ دەبێتو تەواو.

دواتر پەیوەندیم بەنەخوشخانە کرد تاکو پزیشکان بەباشی چاودێری بکەن. لەکۆتایی رووداوەکان هیچ هەوالێکم نییە، چونکە نەفەتحیو نەئەنعام هیچ کاتێك پەیوەندیان نەکرد. گرنگ نییە. گرنگ ئەوەبوو رێگام نەدا سیاسەت من لەئەرکی مرۆڤایەتیم رابگرێت.

لەکاتەکانی دژوار پشوو درێژی خۆت بپارێزە: ئەمەیان وانەیەکبوو خودای گەورە لەساڵی ۱۹۸۰ فێریکردم. کاتێك لەدانیمارك دەگەڕامەوە بۆمیسر، جارێکیتر فێری ئەم وانەیە بووم. کاتێك لەناو کۆنفرانسدا بووم ئەنوەر بەتەلەفۆن پەیوەندیکردو گوتی هەلومەرجی شا دووبارە زۆر خراپە. کاتێك لەگەڵ فەرەحو منداڵەکانی بۆدیداری رۆیشتم زانیم کۆتایی تەمەنی گەیشتووە.

شا زۆر لاوازتربوو لەجاران ڕەنگو روخساری گۆڕابوو. هەناسە هەڵمژینی دژواربوو. بەڵام هیچ نیشانەیەك لەلاوازی لەهەڵسوکەوتی بەدەر نەدەکەوت، بەپێچەوانە لەشێوەی دانیشتنیو پاڵدانەوەی لەسەر جێگای، دەکرا بزانین تاکو ئێستا لەتێکۆشانی هەستانەوەی خۆی بەردەوامە. پزیشکان ئامۆژگاریان کردبوو ئازای زۆری دەبێت بەڵام شا هیچ کاتێك گلەیی لەئازارەکانی نەدەکرد. کاتێك لەتەنیشتی لەژووری چاودێری وردو چڕ وەستابووم، بیرم دەکردەوە لەوانەیە خودای گەورە خۆشەویستی زۆری بۆ شا هەبێت کەتوانای ئۆقرەگرتنی ئەم هەموو دەردو ژانەی هەیە.

بۆشام باسکرد:((هەلومەرجتان باشتر دەبێتو کاتەکانی خۆش لەئەسکەندەرییە تێپەڕ دەکەین.))

تەماشای فرمێسکەکانی فەرەحم دەکردو بۆم باسکرد:((ئازابە، هەستەکانی خۆت نیشان نەدەیت کەسێکی زۆر بەبیرهۆشو ئاقڵە تێدەگات.))

دوو رۆژ دواتر لەبیستو شەشی تەمووزی ۱۹۸۰، شای ئێران کۆچی دوایی کرد.

شکۆ گەورەی مەراسیمی ناشتنی بێ وێنەبوو. ئەنوەر خۆی سەرپەرشتی دەکردو چاودێری بچوکترین لایەنی ئەم مەراسیمەبوو. سەدان هەزار ئەفسەری ئەکادیمیایی سەربازی میسر

بەشداربوون بەجلوبەرگی سەربازی ڕەنگەکانی سپیو زەردو ڕەش مارشی سەربازیان دەژەنی. دواتر بەشێك لەسەربازەکان کەتاجی گوڵیان بەدەست گرتبوو بەدوایاندا دەڕۆیشتن. دواتر گروپێکیتری ئەفسەران نیشانەی سەربازی شای ئێرانیان لەسەر باڵێشەکانی ڕەش هەڵگرتبوو لەپێش تابووتی شا کەبەئاڵای ئێران پێچرابوو دەڕۆیشتن کەهەشت ئەسپی عەرەبی رایان دەکێشا. ئێمە بەئارامی بەدوایدا دەڕۆیشتین.

لەهەمان ڕۆژەکانی زۆر گەرمی هاوینە ئێمە لەکوشکی عابدین تاکو مزگەوتی رفاعی پێنج کیلومەتر بەپێی پیادە ڕۆیشتین. بڕیاربوو شا لەهەمان مزگەوت بنێژرێت. چونکە گۆڕی باوکی شا پێش ئەوەی شا بگەڕێنێتەوە بۆئێران لەهەمان مزگەوت بەخاکیان سپاردبوو. بەپێشنیاری ئەنوەر من لەگەڵ فەرەح دەڕۆیشتم، ئەمەیان یەکەمجار بوو کەبەشداریم لەناشتنی کەسێك دەکرد. ئەنوەر بۆی باسکردم فەرەح چ دەکات تۆش دەبێت هەمان دووبارە بکەیتەوە، ئێمە دەبێت لەم ڕۆژانەی خەمبار هاوکاریان بینو لەتەنیشتیان بمێنینەوە. من لەگەڵ منداڵەکانی خۆمو منداڵەکانی لەگەڵیدا ماینەوە.

تاکو چاو دەیبینی خەڵك وەستابوو هەموو وەزیرەکانی حکومەت لەگەڵ ئێمەدا بەشدار بوون. ریچارد نیکسۆن، سەرۆکی پێشووی ئەمەریکا، کنستانتین پاشای پێشووی یونان. بالیوزی ئەمەریکا، ئەڵمانیایی ڕۆژئاوا، فەرەنسا، ئوستراڵیاو ئیسرائیل ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکی میسر کەلەتەنیشت شەقامەکانو سەربانو ئەیوانەکان بۆبینینی ڕێورەسمی وەفاتی شای پێشووی ئێران هاتبوون. گەورەترینو ڕێکوپێکترین مەراسیمی بەخاك سپاردنی کەسێکبوو کەلەمیسر بینرابوو، دەرفەتی کۆتاییبوو کەنیشانی جیهان بدەین شای پێشووی ئێران شایستەی ڕێزگرتنو هەڵسوکەوتی باشتربوو کەلەگەڵیدا کرابوو. میسر پشتی لەهیچ هاوڕێیەکی خۆی نەکردبوو.

چوار ڕۆژ دوای مەرگی شای ئێران کارەساتێکی گەورەتر ڕوویدا، کێنێستی ئیسرائیل رایگەیاند قودس(تەنیا پایتەختی دابەش نەکراوی ئیسرائیل) هەژمار دەکرێ.

جوڵانەوەی ئیسرائیلییەکان لەپێشلکردنی ڕێکەوتنی ئاشتی کەمپ دیوید بەبەردەوامی دروستکردنی شاروچکە لەسەر خاکی فەلەستین، تێپەڕ بوونی دوومانگ بەسەر کاتی دیاریکراو بۆکۆبوونەوە لەدانی ئۆتۆنۆمی بۆفەلەستین بەبێ ئەوەی پێشکەوتنێك ڕوویدا بێت لەشوێنی خۆی چەقیبوو. بەڵام بانگێشەو ڕاگەیاندنی ئەوەی کەقودس تەنیا گرێدراوە بەئیسرائیل، بێڕێزێکی تەواوبوو بەقودسو هەشت سەد ملیون موسڵمان. ئەگەر ئیسرائیل داوای بەشێك لەم

شارەی دەکرد، دەبێت ڕێگا بدرێت وەك پێش شەڕی ١٩٦٧ دابەش بکرێت. ئەم هەولآنەی پەرلەمانی ئیسرائیل هەموومانی سەرسوڕماو کرد.

پاشای سعودیا، وەك سەرانی عەرەب، دژی ئیسرائیل جیهادی ڕاگەیاند. ئەنوەر زۆر بەدژواری دەیتوانی تووڕەیی خۆی بەرامبەر ئیسرائیل کۆنترۆڵ بکات. بەنیگەرانی زۆر بۆی باسکردم:((ئەمانە لایەنگری چ کەسێکن؟ ئیسرائیلییەکان لەجیاتی ئەوەی هاوکاربن لەگەڵ مندا، بەردەوام تەنگەتاوم دەکەن. وەك ئەوەی خۆیان بۆشەڕ لەگەڵ میسر ئامادە بکەنو لەگەڵ سەرانی عەرەب بووبن بەیەك.))

ئیسرائیلییەکان لەساڵی١٩٨١، بەفرۆکەکانی جێت هێرشی سەر ڕئاکتۆرەکانی ئەتۆمی عێلاقیان کرد، دوو ڕۆژ دوای کۆبوونەوەی سەرۆك وەزیر بگینو ئەنوەر لەسینا، جارێکیتر ڕەوتی پشتیوانی ئاشتی لاوازکرد. ئەنوەر بۆ ئەم هێرشەی سەرعێراقی هیچ شتێك بۆ ئەنوەر باس ناکات، بەلآم دژبەرانی ئەنوەر ئەمەیان بەشێوەیەك لێکدایەوە کەئەنوەر ئاگاداری ئەم هێرشەی ئیسرائیل بووە. ئەنوەر سەرسوڕماو لەم خیانەتەی ئیسرائیل بالیوزی ئیسرائیل بانگێشت دەکاتو نارەزایەتی خۆی نیشاندا، هیچ کاتێك دەنگی ئەنوەرم بەم بەرزییە نەبیستبوو، تووڕە بوونێکی ئەوەندە توند کەدەنگی هاوارکردنی دەگەیشتە نهۆمی سێیەم. دواتر. وەك ئێستا ڕۆژنامەکان لەمیسر پڕبوون لەراپۆرت دژی ئیسرائیل. بەیەك هەنگاوی ئەنوەر بۆپێشەوە سەرانی ئیسرائیل دوو هەنگاو لەپەیمانی ئاشتی دەکشانەوە.

دوای پەسەندکردنی بڕیاری قودس بۆناو خاکی ئیسرائیل، تەواوی ئیمامەکان مزگەوت لەمیسر لەنوێژی هەینی رایان گەیاند:((دەبێت قودس لەدەستی ئیسرائیلییەکان ئازاد بکرێت! دەبێت مزگەوتی ئەقسا دووبارە بگەڕێنینەوە.)) وتاری هەینی شێخانی نەریتخواز کەمینەبوون بەلآم بەوتارەکانی خۆیان لەمزگەوتو شوێنەکانی گشتیو زانکۆ زیاتر کەسانێکی لەخۆ کۆدەکردنەوە کەلەئاشتی لەگەڵ ئیسرائیل بێ ئومێد دەبوون، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاتر دەبوون.

لەپاییز، قوتابیانی زانکۆ بەردەوام کاسێتی دەنگی شێخێکی نەریتخوازو توندڕەویان بەبەردەوامی دەکڕی وەك ئەوەی گۆرانی ڕۆژبێتو ئەستی کڕینی لەبەرزبوونەوە دابێت مزگەوتەکان دەنگی بانگیان بۆزانکۆ بەشێوەیەکی ڕێکوپێك ئاراستە کردبوو کەس بەتەواوی تێنەدەگەیشت چونکە دەنگەکان لەرێگادا تێکەلآو دەبوون، لەچەندین لاوە ئەم دەنگانە ئاراستە دەکران. هیچ کاتێك منیان بانگ نەدەکرد بۆنوێژی جەماعەت بەلآم هاتووچۆی ئەمانە

لەرێڕۆیەکان دەهات. رۆژ لەدوای رۆژ توندوتیژتر دەبوون. رۆژێکیان کاتێك هەندێگ قوتابی پرۆفەی شانۆیەکیان دەکرد لەهۆڵی شانۆ، بەچاقو هێرشیان کردەسەرو زۆریان بریندار کردن. رۆژی دواتر زۆر لەقوتابیانی بریندار برینەکانی خۆیان نیشانی مندا بەراستی لەهەڵسوکەوتیان ترسام. کوڕێك کەسەرۆکی ئەنجوومەنی قوتابیانی زانکۆ دەستی گێچ کرابوو. دەستی ئەم کوڕیان شکاندبوو.

هەواڵەکانی زانکۆکانی دەرەوەی قاهیرە زۆر خراپتربوو. لەئەسکەندەرییە قوتابیانی ڕدێن درێژ هێرش دەکەنە سەر سەرۆکی زانکۆو داوای لێدەکەن ئەگەر هۆلەکانی وانەی موزیکی جۆراوجۆر دانەخرێن‌و لەکاتی نوێژ هەموویان بەشداری نوێژکردن نەبن دەکوژرێت. لەبەرامبەردا سەرۆکی زانکۆ بۆیان باسدەکات:((دەتوانن بمکوژن بەلاَم خۆم رادەستی بیروباوەڕو بڕیارەکانی ئێوە ناکەم.)) دوای چەندین کاتژمێر قوتابیانی ئیسلامی سەرۆکی زانکۆ کەوەك بارمتە گیرابوو ئازاد دەکەن، بەلاَم بەمەرجێك کەکچ‌و کوڕەکان لەناو هۆلەکانی خوێند بەجیاو دوور لەیەکتر دانیشن.

لەئەسیوت ئەم توندوتیژانەی ئایینی تاکو ڕادەیەك شۆڕشیان هەلگیرساندبوو. لەسەر شەقامەکان کاتێك دەبینن ژنێك لەگەڵ پیاوێکدا دەبێت هێرشیان دەکەنە سەر دەبێت بەلگەیەك نیشانبدەن کەئێوە هاوسەری یەکترن یان نا. قوتابیانی خاوەن ریش بەدار دەست لەپێی کچەکانیان دەدا ئەگەر دامەنی کچەکان بەدڵی ئەوان نەدەبوو. قوتابیان ئیسلامی‌و توندڕەو پەیوەندیان بەهێزەکانی توندڕەویی دەرەوەی زانکۆ کردبوو، هێرشیان دەکردە سەر دوکانەکانی کەتەلەفزیون دەفرۆشن‌و کامێرای وێنەگرتن‌و شوێنی جوانکاری ئافرەتان لەسەر دوکانەکانیان دەنووسی((گوناح فرۆشەکان)) ئەگەر لەکاتی نوێژ کەسێك دوکانی دانەخستبا گیرۆدەی هێرشیان دەبوو. شەوانە هەواڵی زۆر ترسێنەرتر لەهەولەکانی ئەم توندڕەوانە لەئەسیوت لەتەلەفزیون بلاَوکرایەوە.

لەپاییزی ١٩٨٠، رۆژانە رۆژنامەکانی دژبەرەکانی حکومەتم دەخوێندنەوە، کاتێك ئەنوەرم لەخەو هەڵدەستاند بۆم دووبارە دەکردنەوە. ماوەیەکبوو رۆژنامەکانی دژبەرانی حکومەتی بەلاَوە نابوون. بۆی باسکردم:((دەزانم باسی چی دەکەن درۆزنن، هەرکاتێك توانیان لەئازادی خۆیان بەرپرسانە سوود وەربگرن ئەوکات رۆژنامەکانی ئەم کەسانە دەخوێنمەوە.)) زۆر بەباشی ئاگاداری مەترسی نەریتخوازەکانی ئیسلامی بوو، بەلاَم نەیدەویست دژی ئەمانە هیچ کارێك بکات. رۆژێکیان لەناو باخی ماڵەکەی خۆمان دەڕۆیشتین ئەنوەر سادات لەنیوان باوەڕو

مەترسی کەرۆژانە زیاتر دەبوو لەدووڕیانێك وەستابوو، گوتی:((ئەگەر بڕیاربێت هەموو دژبەرەکانی خۆم زیندانی بکەم سوودی دیموکراسی چییە؟ لەکاتی خۆیدا کارێك دەکەم ئەوکات نیشان دەدەم کەرێگای من باشترینە، جیهان.))
بەلاّم رێگای ئەنوەر کام رێگابوو؟ لەسەرتاسەری سەردەمی دژواری، هەرچەند من نیگەران دەبووم، ئەنوەر ئارامتر دەبوو. لەسەردەمی شۆڕش‌و چاکسازی ئارامبوو، پێش ئەوەی هێرشی لەناکاو بکاتە ئیسرائیل لەساڵی ١٩٧٣ ئارامبوو. پێش سەردانی بۆقودس ئارامبوو.
مەترسی شەڕی ناوخۆ نزیکبوو پێویستیمان بەهەنگاوێکی خێرا هەبوو. بەلاّم ئەنوەر دەیویست هەنگاو بەهەنگاو لەگەلّ سەنگ‌و کێشی دیموکراسی بجولێتەوە. پێشتر هەندێك هەنگاوی هەلّدەگرتن کەبتوانی نەریتخوازنی مەزهەبی رازی بکات. رادیویەك تایبەت کرابوو بەردەوام قورئان بخوێنێتەوە، لەکاتی بانگدان تەلەفزیون بەرنامەکانی خۆی رابگرێت‌و بانگ بلاّوبکاتەوە. لەقوتابخانەکانی حکومی خوێندنی قورئان‌و حەدیس بەشێکبوون لەبەرنامەی خوێندن، دووسەدو پەنجا ملیون لیرەی میسری بۆدروستکردنی مزگەوت لەشوێنەکانی هەژارنشینی قاهیرە تەرخان کرابوون، بەلاّم دیسان کەسانی ڕدێن درێژ لەسەر شەقامەکان داوای پارەیان لەخەلّك دەکرد بۆدروستکردنی مزگەوت.
ئەنوەر زیاتر کاتی خۆی لەمالّەوە تێپەڕ دەکرد. لەناو باخی مالّەوە دادەنیشت‌و دوعای دەکردن‌و لەناوبیرکردنەوەکانی خۆیدا نقووم دەبوو. من خۆم سەرقالّی کاروبارەکانی زانکۆ بووم. مندالّەکان‌و ئەنوەر بەردەوام دەیانگوت بۆمووچەیەکی ئەوەندە کەم بۆچی خۆت ماندوو دەکەیت. لەوەلاّمدا دەمگوت:((کاری من جێگای رەزامەندی خۆمە. من عاشقی وانە گوتنەوەم. لەبیر نەکەن بڕیار نییە تاکو کۆتایی تەمەنم هاوسەری سەرۆککۆماریم.)) لەدلّەوە ئەم بەلێنەم بەخۆمدا رۆژێك ئەگەر لەپۆستی سەرۆککۆمار کشایەوە بۆپشوودان من لەگەلّ خۆیدا دەبات بۆدارستانێکی تاریك کەبەلێنی دابوو. تەنیا یانزدە مانگ لەپێش ئێمە بوون بۆگەڕانەوەی سینا بۆژێر ئالاّی میسر، ئەوکات خانەنشینی ئەنوەر دەستی پێدەکرد. لەکۆتایی مانگی ئایار بەخێرهاتی پشوودانی هاوینەم دەکرد، ئەوکات دەمتوانی پشوویەك بدەم. بەلاّم توندوتیژی وەك خۆی بەردەوامبوو. دەستپێکی مانگی حوزەیران دژوارترین روبەروو بوونەوە لەمێژووی میسر لەنیوان موسلمان‌و قبتییەکان روویدا. موسلّمانەکان داوای پارچە زەوییەکیان دەکرد کەبەشێك لەقبتییەکان بەرنامەیان هەبوو کلێسایەك لەسەری دروست بکەن. شەڕی ئاسایی

نیوان دوو خێزان گۆڕا بۆشەڕی چەکداری. دانیشتوانی (زاویه الحمرا)، گەرەکێك کەهەموو ڕووداوەکان لەهەمان شوێن ڕوویاندا، تووڕەبوون خەڵکی بۆدوو جەمسەری ڕاکێشابوو، من لەبیستنی ئەم هەواڵە زۆر تووڕە بووم ئەمجارە کێشە لەئەسیوت نەبوو لەقاهیرە بوو.

پێنج ڕۆژ دوای ڕووداوی یەکەم، دیسان موسلمان‌و مەسیحی لەهەمان شوێنی پێکدادان هێرشی سەریەکتریان کردەوە. زیانەکان دەکوژراو چلو پێنج برینداری لێکەوتەوە، ئەمجارەیان لەسەر ئەوەی کەخێزانێکی قبتی ڕێگای لەئاوی پێس نەگرتبوو کەدەرژایە سەر ئەیوانی ماڵێکی موسڵمان کەلەنهۆمی خوارەوەبوو. سەرەتا بەقسەکردن لەهەردوو لایەن دەست پێدەکات، دواتر دەست بەفڕەدانی کەرپووچ‌و هەڵکێشانی چەك دەکات، خەڵکیتر لەهەردوو ئایین گەیشتنە هاوکاریان. وەك دیار ناراستەقینەو باوەڕ نەکراو دەهاتە بەرچاوبیرمان. توندڕەوانی هەردوو ئایین هەڵسوکەوتی منداڵانەیان هەبوو. پێکەوە ژیانی زیاتر لەهەزار ساڵ چۆن بەچەند دڵۆپە ئاوێك تێك بچێت.

ئەنوەر وەك من لەم ڕووداوە بێزاربوو. تەمەنێك لەقاهیرە لەگەڵ قبتییەکان پێکەوە بووین. ئایین‌و مەزهەب هیچ کاتێك نەدەبوون بەهۆکار کەتوندوتیژی دروست ببێت، یان جیاوازیی‌و ناکۆکی دروست بێ. قبتییەکان بەهەرشێوەیەك بێت دراوسێ‌و هاوڕێیانی ئێمە بوون. لەڕۆژانی پشوودانی نامەزهەبی وەك شەم ئیلنسیم، پێکەوە دەبووین، لەبوونەکانی ئایینی ڕێزمان لەجیاوازییەکانی یەکتر دەگرت. لەمنداڵی، زۆرجار، بۆ، هاوپۆلەکانی قبتی خۆم ئازار دەدان وەك چلەی ڕۆژووگرتنیان کەخواردنی هەموو جۆرە خواردنێکی ئاژەڵان بۆیان حەرام هەژمار دەکرا، لەبەرچاویان بالۆرەمان لەبەرچاویان دەخواردن. قبتییەکان تەنیا دەیانتوانی ساڵات‌و پاقڵەی کوڵاو بخۆن، چونکە پەنیرو هێلکەی مریشك لەڕیزبەندی خواردنەکانی حەرام بوون. بەڵام دیسان ئێمەی منداڵانی موسڵمان هەستمان دەکرد ئەمانە بەختەوەرو بەبەختن چونکە لەکاتی ڕۆژوو گرتن دەیانتوانی شتێك بخۆن. بەڵام لەمانگی ڕەمەزان، ئەمجارەیان نۆرەی منداڵانی قبتی بوو کەئێمە ئازار بدەن لەکاتژمێرەکانی کەئێمە ڕێگا پێدراو نەبووین نان یان ئاوێك بخوینەوە. بالۆری خواردن‌و ئاوی میوەی خۆیان لەپێش چاوی ئێمە دەخوارد.

ئێستا ئەم جوڵانەوەی نەهەڵسەنگێندراوی توندڕەوەکان تەمەنێك باوەڕی ئێمە بەکیتریان دەخستە مەیدانی مەترسییەوە. ئەنوەر هەڵچوو:((بۆچی خەڵك هێزو توانای خۆی لەسەر هیچ بەفیڕۆ دەدات.؟ قبتی، موسڵمان، جیاوازیان چییە؟ هەمووومان میسرین، ئێمەی میسری دەبێت

كاتی خۆمان پێكەوە تەرخان بكەین بۆجەژنی وەرگرتنەوە سینا، كارەكانی زۆر گرنترمان لەپێشن لەوەی بزانین كامەیان موسڵمانەو كامەیان قبتییە.))
بەڵام نائارامییەكانی نیوانیان كۆتایی نەهاتن‌و لەپێش دەرگای هەموو كڵێسایەك پۆلیس بوونیان هەبوو، ١١٣ كەس بەتۆمەتی كێشەو نائارامی دروستكردن گیران. لەیەكێك لەگوندەكانی میسری عولیا، هێزەكانی ئاسایش توانیان سێ هەزار چەكی جۆراو جۆر دەستی بەسەردا بگرن، لەناویاندا تۆپێكی دژە ئاسمان. تای ژمارەیەكی بچوك زۆرینەی خەڵكی دەگرتەوە.
موسڵمانەكان دەستیان بەدانانی قورئان لەسەر پێشەوەی ئۆتۆمبێڵەكانی خۆیان كرد، ناوی ((لاالەالاالله، محمد رسوالله)) لەسەر جامی پێشەوەی ئۆتۆمبێڵەكان دەنووسرا.
قبتییەكان سەردەستەی كراسەكانی خۆیان هەڵدەدایەوە تاكو خاچی سەردەستیان بەدیار بكەوێت. وێنەی پاپ شنودایان لەئۆتۆمبێڵەكانی خۆیان دابوو.
خۆدی پاپ شنودا ئامۆژگارییەكانی ئایینی بەلاو نابوون‌و دەستی بەوتاری سیاسی كردبوو. وەك دیار قەشەكانیش زیاتر لەڕادەی خۆیان دەڕۆیشتن لەجیاتی كوژاندنەوەی ئاگری دوو بەرەكی زیاتر خۆشیان دەكرد. ئەمانە رایان گەیاندبوو تاكو دەتوانن منداڵ بۆخۆتان دروست بكەن هەرچی دەكەن ئێوە كەمایەتین. تووڕە بوونی ئەنوەرو قبتییەكانی توندڕەو وەك یەكبوو. پەیامێك لەیەكێك لەهاوڕێیانی قبتی بەدەستم گەیشت:((جیهان، داوا لەئێوە دەكەم هەرچی دەتوانن بكەن تاكو بتوانن هاوسەرو پاپ ئاشت بكەنەوە. هەلومەرج خراپتر دەبێت.)) هەوڵی خۆمدا كەئەنوەر لەگەڵ پاپ شنودا دانیشێت بەلۆژیك‌و ئاشتیانە قسەی خۆیان بكەن. بەڵام رازی نەبوو. لەهەمان كات موسا سەبری، سەرنووسەری رۆژنامەی (الاخبار) كەسێكی قبتی‌و زۆر لەئەنوەر نزیكبوو، توانی پاپ شنودا رازی بكات كەلەگەڵ ئەنوەر ئاشت بێتەوە، بەڵام پاپ شنودا رازی نەبوو. موسا سەبری بەداخبارییەوە گوتی:((كارێكی نەكراوە شنودا كەسێكی نەگۆڕە.))
لەگەرمای هاوین، توندوتیژی خەڵك زیادیكرد. لەمانگی ئاب، پێش سەفەری من‌و ئەنوەر بۆئەمەریكا بۆیەكەم دیدارمان لەگەڵ سەرۆك رێگان‌و هاوسەری، نانسی، ئەم توندوتیژییە سەراوژێر بوو. لەیەكێك لەزەماوەندەكان لەشوبرا، ناوچەكی زۆرینە مەسیحی لەقاهیرە، تەقینەوەیەك روویدا چەند كەسێك كوژران‌و بریندار بوون. لەم كردەوەی تیرۆریستی زۆر ترسام،

ئەنوەر زیاتر لەڕادەی خۆی تووڕە بوو.، سوێندی خوارد دوای گەڕانەوەی هەموو کەسانێك کەدەستیان لەم کردەوەیدا هەبوو بەسزای خۆیان دەگەیێنێت.

لەم نیوەدا قبتیيەکان خۆیان دەستیان بەسزادانی ئێمە کرد. لەڕۆژی دووەهەمی ئێمە بۆواشنتۆن، کاتێك رۆژنامەی واشنتۆن پۆستم خوێندەوە، باوەڕم نەدەکرد چ دەبینم.

لەوتاری نیو لاپەڕەیدا بەناوی:((نامەیەك بۆسەرۆککۆمار سادات.)) بانگێشەی ئەوەیان کردبوو کەقبتیيەکان بەزیندوویی دەسووتێنن. منداڵەکان لەنهۆمەکانی سەرەو فڕەدەدرێنە خوارەوە، مەسیحییەکان ناچار دەکرێن دەست لەئاینیو ولآتی خۆیان هەلگرن. لەرۆژنامەکانی ژێر دەسەلآتی حکومەت گاڵتە بەئایینی مەسیحی دەکرێت.)) ئەمەیان وەك دیار لەلایەن ئەنجوومەنی قبتیيەکان لەئەمەریکاو کەنەدا ئامادە کرابوو. چونکە پرسیارەکان هەموویان رێزبەند کرابوون:((جەنابی سەرۆك سادات، ئێوە زۆرجار نەریتخوازانی کەلەلایان حکومەتەکان نموونەی وەك قەزافیان بۆدەێنێتەوەو تاوانباریان دەکەیت، بۆچی کۆتایی بەم شێتایەتییەیی میسر ناهێنیت؟))

ئەگەر قبتیيەکان بەزێدەڕۆیيو دەیانوویست هەستەکان بجولێنن، تەنیا دەیانتوانی لەزیاتر تووڕەکردنی ئەنوەر سەربکەون. کاتێك ئەم نامەیەیی سەرکراوی دەخوێندەوە بەروخساری تووڕەو تێك ئالآوی گوتی ئیتر بەسیەتی! بەلآم لەکۆتایی رۆژ توانی ئارامی خۆی بەدەست بێنێتەوە. لەکاتی گفتوگۆ کردن لەگەڵ سەرۆك رێگان لەسەر مێزی نانخواردن لەکوشکی سپی هەلومەرجی زۆرباشو لەسەرخۆبوو. من بەهەمان شێوە بەگفتوگۆ کردن لەگەڵ خاتوو نانسی رێگان سەبارەت بەمندالآنو پرۆژەکانمان کاتێکی خۆشمان پێکەوە بردەسەر، بەلآم هەمان شەو، گیرۆدەی سەرئێشەیەکی خرابو نەخەوتنبووم.

لەمیسر چ هەوالێك هەبوو؟ دەبێت چی بکەین؟ کاتێك نیگەرانییەکانم زیاتربوون کە کرایسکی، سەرۆك وەزیری نەماس، لەواشنتۆن پەیوەندی بەئەنوەرکردو ئامۆژگاریکرد باشتر دەبێت پێچەوانەی بەرنامەی پێشووی خۆتان، لەرێگای گەڕانەوەی بۆمیسر سەردانی ڤییەنا نەکەیت. کرایسکی دەلێت دوو فەلەستینی لەفرۆکەخانە گیراون کەهەلگری چەکی ئۆتۆماتیكو رۆمانەبوون. بەباوەڕی حکومەتی نەمسا باشتر دەبێت لەبەر ئاسایشو ئەمنیەتی خۆمان، لەئەمەریکا راست بگەڕێتەوە بۆمیسر.

دوژمنانی ئێمە لەهەمووشوێنێك بوون. ئایا ئەم رووداوەی کۆتایی ئەم شێوەیە ئاسایی بوو؟ بەبیرهێنانەوەی مەترسییەکانی رابردوو، ئەمەشیان وەك ئەوانیتر تێپەڕ دەبێت. کاتێك بەسەلامەتی گەڕاینەوە بۆمیسر، ئەنوەر زیاتر لەجاران ئارام‌و باوەڕ بەخۆبوونی زیاتربوو. دوو سێ رۆژی دواتر لەگەڵ راوێژکارانی خۆی تێپەڕ دەکردن راپۆرتەکانی کۆتایی لەسەر هەلومەرجی قبتییەکان‌و موسلمانەکان وەردەگرتن. دواتر زیاتر لەجاران لەماڵ دەمایەوە، تەنیا لەهەیوانی ژووری خۆی دادەنیشت یان لەناو باخ لەرۆیشتندابوو ئەم شێوازەی ئەنوەرم باش دەناسی‌و هیچ کاتێك ئەم هەلومەرجەم لەئەنوەر تێك نەدەدا. ئەنوەر زۆر بەوردی گوێی لەئامۆژگارییەکانی دەوروبەر دەگرت. دواتر خۆی بڕیاری دەردەکردن.

لەپێنجی ئەیلوول، دروست هەفتەیەك دوای گەڕانەوەی لەئەمەریکا، زۆر بەوردیی‌و بەئازایانەوە دەستی بەگەڕاندنەوەی ئارامی بۆمیسر کرد: لەیەك شەودا پۆلیس تەواوی کەسانی کەدەستیان لەتوندوتیژییەکاندا هەبوو گرتن، هەزارو پێنج سەد کەس گیران، لەوانە زۆر لەشێخەکانی نەریتخوازو قەشەکانی قبتی لەناویدابوون کەبەبیروباوەڕەکانی توندوتیژ بەناوبانگ بوون. سەدان کەسی سەربەئیخوان موسلمین‌و خزمانیان کەوتنە بەر لێکۆڵینەوەی پۆلیس، گۆڤاری ئیخوان‌و دوو بلاوکراوی قبتی قەدەخەکران. رێگا لەبەیانەکانی توندی سیاسی پاپ شنودا گیرا. ئەنوەر دوای لادانی پاپ‌و دەست نیشانکردنی ئەنجومەنێکی پێنج کەسی لەجیاتی پاپ شنودا دەرکرد، پاپ شنودای بۆ وادی نەترون، پرستگەیەکی قبتییەکان لەبیابانی رۆژئاوا، دوورخستەوە.

ئەنوەر شێوەی خۆداپۆشینی قوتابیانی زانکۆ کەتەنیا چاوەکانیان بەدەر دەکەوتن قەدەخەکرد، چالاکی قوتابیانی نەریتخوازی سنووردار کرد. زۆر لەمامۆستایانی زانکۆ هەناسەیەکی ئارامیان هەڵمژی. لەئەنجامدا زانکۆ توانی وەك پێشان دەوری خۆی بگێڕێت وەك ناوەندێکی زانستی. ئەنوەر ئەندامانی سەرناسی پارتەکانی دژبەری ڕەوانەی گرتووخانە کردن‌و بلاوکراوەکانیان بۆماوەیەکی نادیارو کاتی داخستن.

میسر سەردەمێکی دژوارو هەستیاری تێپەڕ دەکرد، سەردەمێکی بەراستی ترسناکبوو بەهەمان شێوە کەئەنوەر دژبەرەکانی خۆی دوور دەخستنەوە، زۆریان توانیان خۆیان رزگار بکەن. بەتایبەتی نیگەرانی کەسێکبوو کەیەکێك لەکەسانی ئاژاوەگێڕبوو. چەند هەفتەیەك دواتر، وەزیری ناوخۆ، کاسێتێکی دەنگی بۆئەنوەر ڕەوانەکرد کەلەگەڵ بازرگانێکی چەك فرۆشتن

دەکرد کەبەردەوام داوای چەکێك دەکات کەبتوانێت ئەنوەر بکوژێت. ڕێوشوێنی گەڕان بەدوای ئەم پیاوە دەگەیشتن بەماڵی عبود زواهری، یەکێك لەئەفسەرانی دژە سیخوڕی سوپا، بەلاّم کاتێك لە پێنجی ئەیلوول ڕۆیشتن کەزواهری‌و هاودەستەکانی بگرن، خۆیان ونکردبوو. ئەنوەر زۆر نیگەرانی ئەم ئەفسەرەی سوپابوو لەوتارێکدا دەلێت:((دەزانم ئەفسەرێك نەگیراوەو ئێستا تەماشای من دەکات. ئاگاداری دەکەمەوە کەدەگیرێت.))

وەزیرانی کابینەو پارتەکەیان لەهەوڵدانەکانی ئەنوەر رازیبوون. هیچ شتێك گەورەتر لەئارادا نەبوو کەنەتوانن کێشەکانی ناوخۆ چارەسەر بکەن. لەمانگی نیسان واتە دوای حەوت مانگیتر، تەواوی خاکی داگیرکراوی ئێمە دەگەڕایەوە، من ڕۆژەکانم دەژماردن، چاوەڕێی کاتێکبووم کەئەنوەر دەست لەپۆستی سەرۆکایەتی کۆمار هەڵگرێت. ئەوکات دەمانتوانی ژیانی خۆمان بەبێ بارگرانی‌و بەرپرسیارەتی، بەسەفەرکردنی خێزانی تێپەڕ بکەین. حەوت مانگ ماوەیەکی کورت بۆچاوەڕوانی، بەلاّم چەند قورس‌و دژوار.

ڕۆژنامەکانی ئەورووپاو ئەمەریکا لەسەر گرتنی ئەم هەموو خەڵکانە تاوانباریان دەکرد بەراپۆرتەکانی خۆیان هێرشی توندیان دەکردە سەر. لەجیاتی لایەنگری دیموکراسی بەدیکتاتۆر ناویان دەبرد. ئەنوەر لەهێرشی ڕۆژنامەکانی دەرەوە بەتەواوی بێزارو تووڕە دەبوو. من هەوڵی زۆرمدا بۆئارامکردنەوەی ئەنوەر:((خۆت بەئەمانەوە خەریك نەکەیت ئەگەر ئاگاداری هەلومەرجی میسر دەبوون دەیانزانی بۆچی بەم شێوەیە هەڵسوکەوت دەکەیت.))

بەلاّم ئەنوەر ئارام نەدەبوو. بەپەریشانی لەژووری خۆی دەمایەوەو دەیگوت:((کاتم پێویستە، کات! ئەمانە هیچ لەهەلومەرجی ئالۆزو جۆشدراوی ولاّتی میسر تێناگەن. بۆئارامکردنەوەی هەلومەرج چارەیەکیتر نییە کەبەکاتی ڕێگا لەچالاکی ئەمانە بگرم. کەدەستیان لەناوبردنی ولاّت هەڵکردووە. نابێت هیچ کێشەیەك بۆ وەرگرتنەوەی سینا بێتە پێشەوە.))

بۆئارام کردنەوەی دەمگوت:((تۆراست دەکەیت ئەنوەر، بیانییەکان هەڵە دەکەن.))

بەلاّم هەستی تاڵی خیانەتی ئەمانە بەرۆکی ئەنوەریان بەرنەدەدا. دەیگوت:((تەنیا شتێك کەدەمەوێت ئەوەیە کەهەموونەوانەی کەناچار بووم بیان گرم ئازاد بکەم، بەخێرایی ئەمەیان دەکەم، زۆربەیان دەگەڕێنەوە بۆئەقڵ‌و لۆژیك. ئاگاداری چاکەی ولاّتی خۆیان دەبن. بەداخەوە لەبەرامبەر کەسانی توندڕەوی مەزهەبی ناتوانم هیچ شتێکیان بۆبکەم. لەگەڵ ئەمانە تەنیا ناکرێت قسەی لەسەر بکەین، چونکە هیچ سوودێکی نییە.))

بەڵام بوختان هەڵبەستنی ڕۆژئاواو ئەمەریکا بۆئەنوەر، هاوکات لەگەڵ هەڕەشەکانی ناوخۆ پیلانگێرییەکانی بەدوای یەك بەردەوام بوون.

لەمانگی ئەیلوول ڕۆژانە بۆی باسدەکردم: ((جیهان داوات لێدەکەم ئاگاداری خۆتانبن. تاکو من ئاگادارت دەکەمەوە هەلومەرج کۆنترۆڵ کراوە چالاکییەکانی خۆت لەم چەند مانگەدا سنووردار بکە، لەوانەیە زۆر کەس لەبڕیارەکانی من بۆگرتنی خەڵکی ئاژاوەگێڕ تووڕەبن.))

ژمارەی پاسەوانەکانی منو جەماڵی کردن بەدوو بەرامبەر، دەیزانی تەنیا کوڕی تاقانەمان ئامانج دەبێت. من بەهەمان شێوە داوام دەکرد کارەکانی کەمتر بکاتەوە. بەڵام بەهیچ شێوەیەك قبووڵی نەدەکرد. بەپێچەوانە خۆی زیاتر نیشانی خەڵك دەدا. لەکۆتایی مانگی ئەیلوول بەئۆتۆمبێلی سەرکراوە بۆبینینی کێڵگەکانی نموونەیی لەسالحییەو نوباریەو پرۆژەکانی نوێی دروستکردنی خانووبەرە لەشاری ئیسلام ڕۆیشت.

هیچ بەیانیك نەبوو لەکاتی خواحافیزی هیوادارلم کەدووبارە بەزیندوویی دەگەڕێتەوە. دەپاڕامەوە:((ئەنوەر سەفەرەکانی خۆت کەم ناکەیتەوە بەئۆتۆمبێلی داپۆشراو برۆ، یان بەجلوبەرگی دژە گولەبرۆ.))

منداڵەکانم بەهەمان ڕادە نیگەرانی باوکی خۆیانبوون. بەیانییەك لوبنا ڕووی لەباوکی کردو گوتی:((باوکە، ئێمە دەزانین زۆربەی خەڵك خۆشەویستی تەواویان بۆتۆ هەیە، بەڵام تەنیا پێویست دەکات شێتێك لەم نیوەدا دەربکەوێتو ئێوە بکوژێت.))

بەڵام ئەنوەر زیاتر پێداگری دەکرد. ڕۆژێك نامەیەکی نیشاندام کەلەپیاوێك بەدەستی گەیشتبوو کەچل ساڵ پێش لەکاتی یەکێك لەهەڵاتنەکانی لەدەستی ئینگلیزەکان دەشارێتەوە ئەم پیاوە ئەوکات شوفێری بارهەڵگرێکبوو، لەهەمان کات بەدواوە ئەم پیاوەی نەبینیبوو. ئێستا هەمان پیاو ئەنوەر بۆئاهەنگی بووکێنی کچی لەمنسورە بانگێشت کردبوو. ئەنوەر کەوتبوو ژێر کاریگەری ئەم بانگێشتەی کابرای شوفێری بارهەڵگر کەجارێکیتر ببینێتەوەو بتوانێت تۆڵەی چاکەی چل ساڵ پێشی بداتەوە. من هەوڵی خۆمدا کەنەڕۆت دەتوانێت لەجیاتی ڕۆیشتن دیارێکی بۆڕەوانە بکەیت. ئەنوەر گوتی:((جیهان خۆتان دەزانن ئامادەبوون باشتر دەبێت لەڕەوانەکردنی دیاری.)) بەم شێوەیە ئەنوەر بانگێشتنامەی ئەم پیاوەی قبووڵکرد. بڕیاریدا بەشەمەندەفەری سەرکراوە سەردانی منسورە بکات، لەسەر ڕێگای گوندەکان وەستانێکی کاتی بکات. دوای ئاهەنگی بووکێنی بەئۆتۆمبێلی سەرکراوە گەشتێك بەناو شاردا بکات. پێش

ڕۆیشتنی حوسنی موبارك داوا دەكات وەستانەكانی لەڕێگا كەمتر بكاتەوە، بەلآم ئەنوەر ئامادە نەبوو گوێی لەقسەی جێگری سەرۆككۆمار بگرێت، دەیویست ڕاپرسییەك لەناو خەڵك لەبەرامبەر كردەوەكانی گرتنی خەڵك بزانێت، كەچۆن پێشوزازی لێدەكەن. لەسەفەری منسورە بەسەلآمەتی گەڕایەوەو زۆر خوشحاڵبوو كاتێك دەبینێت خەڵك پشتیوانی لەهەنگاوەكانی دەكەن لەتیكۆشانی دژی ئاژاوە گێڕانی ناوخۆیی.

بەلآم من زۆر نیگەرانبووم، ئەنوەر ڕۆژانە ئامۆژگارییەكانی خەڵكی قبووڵ نەدەكردن، كاتی خۆی زیاتر بەتەنیایی تێپەڕ دەكرد. بەشێوەیەك خۆیی بەتەنیا دەكرد گوایە دەیەوێت پەیامێكی خودای بلآوبكاتەوە كەهیچ كەمو كورتی تێدا نەبێت. وەك دیار لەئێمە دوور كەتبوو، نەك هەمان هەلومەرجو دووریكردنی جاران لەكاتی بڕیاردانەكانی گرنگ بەخۆیەوە دەگرت. زیاتر هەلومەرجێكی سوفی گەڕێو مەعنەوەیی هەبوو، لەپەیوەندی نزیكی لەگەڵ خودای خویدا، عاشقانە لەبەرامبەری رادەوەستا. چونكە لەخواردنەكان دووری دەكرد تەنیا شۆڕباكانو سەوزەواتی دەخواردن، لاواز، زۆر لاواز، وەك سوفییەكانبوو. بەردەوام باسی مەرگی دەكرد.

لەمانگی ئەیلوول سێجار بۆی باسكردم بەدیاری خودا دەگات. جاری یەكەم لەناو باخی خۆمان لەماڵەوەبوو، جاری دووەم تووڕە بووم هەرچەند بەشێوەی گاڵتە وەرم گرت، بەلآم جاری سێیەم وەلآمم نەدایەوە.

لەدەستپێكی مانگی تشرینی یەكەم لەرێڕۆیشتن بۆی باسكردم:((خودا ئەوەندی پێی بەخشیم كەلەخەونیشدا نەمدەبینین، ئێمە لەشەڕو ئاشتیدا سەركەوتین، من پێگەی دیموكاراسیم لەمیسر داڕێشت. چوارچێوەی گەشەكردنی ئابووریم رێكخست. مرۆڤ دەبێت داوای چیتر بكات؟ بەرپرسیارەتی كەخودای گەورە بۆی دیاریكردم بەجێم گەیاند.))

زیاترم رادەكێشایە ناو بابەتەكانو بۆم باسكرد:((چۆن دەزانی ئەركی خۆت بەجێ گەیاندووە؟ خودا هیچ كاتێك نهێنییەكانی بۆبەندەكانی خۆی ئاشكرا ناكات.))

وەلآمی ئامادەی هەبوو:((جیهان هیچ كاتێك بانگێشەی ئەوەم نەكردووە كەمن نهێنی خودا دەزانم، بەلآم بەپێی باوەڕم بەرەزامەندی خودا ئەركی خۆم بەجێ گەیاند.))

دەستی كرد بەشوێنی ناشتنی، ویستی بۆ بەخاك سپاردنی لەژێر كێویی سینا كرد. بەلآم هەرچەند زیاتر باسی لەئیلهامەكانی دەكرد، من زیاتر باسی ژیانی داهاتووی خۆمانم بۆدەكرد كەهەردووكمان چاوەڕێمان دەكرد.

بیرمەندا پرسیارم لێدەکردن: یەکەمجار:((من بۆچ شوێنێك دەبەیت؟ بۆناودارەستانی تاریکی ئەڵمانیا یان ونیز، کەلەسەر بەلەم بتوانی گۆرانیم پێشکەش بکەیت.؟

گوتی:((وازبێنە جیهان.)) بەردەوامی بەرۆیشتنی خۆیدا.

نەمدەویست تەسلیمی بیروباوەڕەکانی ژیانی کۆتایی ببم، نەمدەویست رێگای رۆیشتنی بدەم. من لەدونیادا بووم دەموویست پێکەوە بین. رۆژی دووەمی تشرینی یەکەم گلەیم لەئەنوەر دەکردن:((ئەنوەر تۆ جەماڵ دەنازێنی بۆچی رێگات پێدا سەردانی ئەمەریکا بکات؟ دەبێت لەبەرامبەری راوەستیو رێگای لێ بگریت!))

ئەنوەر پێکەنیو گوتی:((دەمەوێت تاکو من زیندووم ئەوەی دەتوانم بۆی بکەم. دەبینی ئەم کوڕە کەسێکی بەناز نابێت. کاتێك من رۆیشتم نیشانی ئێوە دەدات کەچەند پیاوێکی راستەقینەیە دەتوانێت بەرپرسیارەتی خۆی هەڵگرێت.))

پرسیم:((چۆن ئەم بەڵێنە بەمن دەدەیت؟ ئەوکات تۆ نابیت، من دەمێنمەوە لەگەڵ خۆیدا.))

گوتی:((خۆتان دەبینن جیهان، خۆتان دەبینن.))

رۆژی سێیەمی تشرینی یەکەم جەماڵ گەیشتە کالیفۆرنیا. بۆخواحافیزی منو ئەنوەری لەباوەش گرت رۆیشت کەسواری ئۆتۆمبێل بێت بۆیان باسکرد فرینی فرۆکە نیوکاتژمێر دوا دەکەوێت دیسان گەڕایەوە بۆلای باوکی کەپێکەوەبن.

کاتێك جەماڵ دووبارە ویستی بڕوات، بۆی باسکردم:((کاروبارەکانی باوکم زۆر سەرسوڕهێنەرن کاتێك بۆخواحافیزی گوتم لاالەالااللە، وەك جاران وەڵامی نەدایەوە محەممەد رسول اللە، هیچی باس نەکرد، دایە، تەنیا پێکەنیو گوتی زۆر لەئەمەریکا نەمێنەوە، جەمال. زوو بگەڕێوە.))

پرسیم:((ئیتر باسی چیکرد، جەماڵ؟))

جەماڵ بەروخسارێکی نیگەران وەڵامی دایەوە:((گوتی"چاوت لەدایکت بێت." تاکو ئێستا هیچ کاتێك باسی لەم شێوەیی نەدەکردن. هەمووکاتێك دەیگوت چاوت لەخوشکەکانی خۆت بێت.))

بۆئەوەی زیاتر نیگەران نەبێت گوتم:((زۆرباشە، دەبێت چاوت لەدایکت بێت.)) ئەوکات رۆیشت.

رۆژی پێنجی تشرینی یەکەم کارەم لەسەر کۆتایی دکتۆرای خۆم دەکرد. وەك جاران خولەکێك کاتی زیادکراوم نەبوو، خەمی ئەنوەرم دەخوارد کەلەناو حەوشەیماڵەوە دانیشتبوو کاتێك یاسەمین کچی دوو ساڵو نیوی جەماڵ بەسەر سەرو گوێلاکەکانی سەردەکەوت، هەوڵی خۆیدەدا بابەتێك بخوێنێتەوە، لەپەنجەرە تەماشامکرد ئەنوەر زۆر بەختەوەر و ئارام دەهاتە بەرچاو.

دەمزانی چاوەڕێی ڕۆژی ئاهەنگی سەربازییوو کەڕۆژی دواتر دەستی پێدەکرد. داوامکردبوو جلوبەرگەکانی سەربازی نوێی تۆتۆ بکەن تاکو ئامادە بێت. چەکمەکان ڕەوانەکردبوون کەبۆیاخ بکرێن. هەموومندالّو نەوەکانم جگە لەجەمالّی کوڕم ئامادەی ئاهەنگی سەربازی یادکردنەوەی هەشتەمین سالّی سەرکەوتنمان بەسەر ئیسرائیل دەبووین. هیچ گومانێك نەدەکرا کەمەترسییەك لەلایەن سەربازانی بەشدار هەبێت. شەشی تشرینی دووەم بۆهەمووومان ڕۆژی پشوودانبوو. ئارامی لەکێشەو پێکدادانەکانی کەلە میسر دەکولا. لەم ڕۆژەدا، ئاسمان سافو خالّی لەئەور دەبوو.



## بەشی چواردەهەم

## خەمێکی بێکۆتایی

ڕۆژ گەیشتە شەو، شەوجێگای خۆی بەڕۆژدا. لەخۆیەوە ڕۆیشتم بۆناو ڕێورەسمی دوای مەرگی ئەنوەر. بەدەست گەیشتنی نامەکانی سەرخۆشی لەدۆستو هاوڕێیانم لەدەزگاو ناوەندەکانی خێرخوازیو پرۆژەکان، لەبەرپرسانی حکومەت لەقاهیرەو منوفیە، لەڕێبەرانی جیهان لەوانە سەرۆکی پێشووی ئەمەریکا، شازادە چارلزو سەرۆک وەزیری ئیسرائیل مناخیم بگین.

ڕوخساری بگین لەخەمو پەژارە خوڵەمێشی ببوو، گوتم:((زۆرخەمبارم، بەڵام خوشحاڵم کەهاوسەرەم لەپێوە کوژرا نەکەتە سەر ئەژنۆ.))

لەوەڵامی مندا گوتی:((من نەك تەنیا هاوبەشی خۆم لەرەوتی ئاشتی، بەڵکو هاوڕێیەکی خۆم لەدەستداوە.))

لەسێ ڕۆژی یەکەم سەدان کەس بۆڕێزگرتن هاتبوون، هەزاران نامە بەدەستم گەیشتن. پزیشکان بۆئەوەی بتوانم خەو بەچاوەکانمدا بێت حەبی ئارام هێنەریان بۆدیاری دەکردم. بەڵام نەمتوانی، خەو بەچاوەکانمدا نەهات. بەردەوام بیرم لەهەندێك لایەن دەکردنەوە کەدەبێت بۆ ئەنوەرم باسدەکردن، لایەنەکانی کەدەمووویست بزانێت، بەڵام دواتر بەیادم دەهاتەوە کە ئەنوەر ڕۆیشتووە.

سەرەتا ڕۆژانە بەنهێنی لەماڵەوە دەرۆیشتم بۆسەر گۆڕی، دەمووویست خۆم لەنزیك ئەنوەر هەست پێی بکەمو ئارامی بەڕوحی بدەم. دڵی خۆم دەدایەوە جێگای شوکرو سوپاسکردنە

کەئەنوەر کەسێکی بەهەشتییە چونکە بەدەستی کەسێکی دڕندە شەهید کراوە. بەپێی بیروباوەڕی ئایینی ئێمە شەهیدەکان راستەوخۆ دەچن بۆ بەهەشت. خودا بەهەمان خێرایی کەبردبوو، لەحەقیقەتدا دووجار دەبەخشێت. بەندەکانی بچوك دەبێت بەردەوام ڕەنج و ئازار بکێشن، بەلاَم خودای گەورە کەسانێك کەخۆشەویستی زیاتری بۆهەبێت لەدەردو ڕەنج دەبەخشێت.

من دەمزانی هاوسەرم لەبەرئازایەتی بۆئاشتیو بیرکردنەوەکانی لەسەر رەوەتی ئاشتی دەکوژرێت، ئامادەیم هەبوو، دڵم شکابوو.

لەهەرکاتژمێرێك کەسەردانی گۆڕی هاوسەرم دەکرد، زۆرجار درەنگانی شەو سەردانی گوڕم دەکرد دەمبینی کەسانێتر وەك من لەسەر گۆڕی ئەنوەر بوون، بۆیان باس دەکردم:((خودا سەبرتان بدات خاتوو سادات.)) هەندێکیان دوعایان دەکردن، هەندێك دەگریان، هەندێك بەناباوەڕی تەنیا تەماشای گۆڕی ئەنوەریان دەکرد:((خودای گەورە هاوکاریتان بکات خاتوو سادات.))

هەلومەرجی مندالّەکانم باش نەبوو، جەمالّ هەمووکاتێك لەرۆژی شەشی تشرینی یەکەم لەپشت ئەنوەر دادەنیشت، بەئازارەوە دەیگوت:((ئەگەر من لەهەمان شوێن ئامادە دەبووم بەخێرایی بەرەوە زەویی خوارم دەکردەوە کەنەکەوێتە بەرامبەر گولەی دوژمن. هەولّی زۆرمدا کوڕی خۆم ئارام بکەم:((نا، جەمالّ مانەوەی ئەنوەر لەدەستی تۆدا نەبوو لەدەستی خودای گەورە دابوو. کاتێك ئەجەلّ دەگات هیچ کەسێك ناتوانێت دوای بخات.))

بەلاَم جەمالّ ئارام نەدەبوو، تاکو چەندین مانگ هەستی دەکرد لەبەرامبەر باوکیدا کەمتەر خەمبووە، لەقولاَیی دلّەوە خەمباربوو.

کچی بچوکمان، نانا، زۆر ئازاری کێشا. بۆچەندین مانگ رۆژانە سەردانی گۆڕی باوکی دەکرد، هەموو جارێك بەچاوەکانی پڕ لەفرمێسك دەگەڕایەوە، نەیدەتوانی خۆی لەم خەمەی گەورە رزگار بکات، من دەترسام لەم خەمو خەفەتەی نەخۆش بکەوێت.

بەدلّسۆزی بۆم باسدەکرد:((نانا، نابێت هەموو رۆژێك سەردانی گۆڕی باوکت بکەیت، باوکت رازی نابێت تۆ بەم شێوە خەمبارییە ببینێت.))

بەڵام بەردەوامبوو، کار گەیشتە شوێنەك لەبەر سەلامەتی رێگامان لێگرت. هەرکاتێك کەلەقاهیرە بمێنینەوە منو منداڵەکان هەفتانە سەردانی گۆڕی دەکەین. نانا بەردەوام فرمێسك دەبارێنێت.

بۆبەبیرهێنانەوەی ئەنوەر مەراسیمێك لەبارەگای نەتەوە یەکگرتووەکان لەنیویۆرك ئامادە کرابوو، لەم یادەکردنەوەی دوعاکردن ئامفی تئاتر داگ هامرشولد، سیری چین موی، لەبەرامبەر فەرمانبەران دوعایان بۆ ئەنوەر کردن:((لەوانەیە جەستەی لەگەڵ ئێمەدا نەبێت بەڵام روحی ئاسمانی، کوتری روحی، تاکو کاتێك لەسەرتاسەری جیهان ئاشتی، ئاشتی، ئاشتی نەگرێتەوە لێرە لەگەڵ ئێمەدا دەبێت.)) لەیەکێك لەکۆبوونەوەکانی ولاتانی هاوبەشی بەرژەوەندی ئابووری لەملبورنی ئوستراڵیا، رێبەرانی چلو یەك ولاتی بەشدار لەکاتی کردنەوەیدا خولەکێك بۆرێزگرتن لەئەنوەر وەستانو بەیانێك بەم بوونە خەمبارە دەرکرا کەداخباری خۆیان بۆرووداوەکە نیشاندا. فریزر، سەرۆکی ئەم کۆنفرانسە ئەم بەیانەی بۆرەوانە کردم. سەرۆك وەزیری ئۆستراڵیا لەنامەیەکی تایبەت دەڵێت:((من ئەنوەر بەگەورەترین رێبەرانی جیهان دەزانم، ئێمە لەم خەمەدا لەگەڵ ئێوە هاوبەشین.))

رێبەرانی مەعنەوی سەرتاسەری جیهان بۆمەرگی ئەنوەر خەمباربوون، لەوانە پاپ ژان پۆلی دووەم، کەخۆی پێنج مانگ پێش هێرشی کرابوو سەرو بریندار کرابوو، دالآیی لاما، تزرینگ دورجی نوێنەری دالآیی لاما لەئەورووپا بۆی نووسیم:((کارەساتی چاوەڕوان نەکراوی مەرگی سادات خەمێکی گەورەیە بۆئێوەو بۆملیونان مرۆڤیترو لەوانە ئێمە لەسەرتاسەری جیهانبوو. یادی وەك کەسێکی گەورەی ئاشتی جیهان لەیادەکان دەمێنێتەوە.))

لەبەرپرسانی سەرتاسەری جیهان پەیامی هاوخەمی فەرمی، زۆر لەپەیامەکانی تایبەتی کەسایەتییەکان بەدەستم دەگەیشتن. سەرۆککۆمار گرگوریوو هاوسەری لەکۆماری ئورۆگوا هاودەردی خۆیان نیشاندابوو، سەرۆك وەزیری فنلاندا، فەرانسۆ میتران، سەرۆککۆماری فەرەنسا، زیا ئەلحەق، سەرۆککۆماری پاکستانو هاوسەری، سەرۆك کۆمار کینیت کواندا لەزامبیا، هلمۆت ئەشمیت، سەرۆك وەزیری ئەڵمانیای فیدراڵو هاوسەری هانەلور، قازی عەبدولستار، سەرۆککۆماری کاتی بەنگلادێش، دەنووسێت: ((خودای گەورە سەبر بەئێوەو خێزانەکەتان بدات لەبەرامبەر ئەم کارەساتەی گەورە، ئامین.)) سەرۆککۆمارو خاتوو سوهارتۆ لەئەندونزیا لەنامەیەکدا دەڵێن:((بۆئارامی روحی لەدەرگای خودای گەورە دوعای بۆدەکەین.))

کاریگەرترین نامە لەهاوڕێیانم لەوڵاتی ئیسرائیل بەدەستم گەیشتن. ئیسحاق ناون، سەرۆککۆماری ئیسرائیل، دەنووسێت:

منو ئۆفیرا لەولێدانە گرانەی کەبەئێوە کەوت لەقوڵاییەوە ئێمەی هەژاند، خودا لێخۆشبوو هاوسەری ئێوە نەك تەنیا رێبەرێکی نیودەوڵەتی دیارو بەتوانابوو، مرۆژێکی تایبەتبوو. لەناو دەروونی خۆیدا خۆشەویستیو هاودڵی مرۆڤایەتی بەبیری بیرمەندێکی گەورە تێکەڵاوبوو. هاوکات پێکەوە ستایشو خۆشەویستیمان بۆ هەبوو... یادی وەك نموونەیەك بۆجیلەکانی ئاییندە دەمێنێتەوە.

ئەلیزا بگین لەقودس، لەداخبار بوونی خۆی کەنەیتوانی لەگەڵ هاوسەری لەمەراسمی ناشتنی ئەنوەر ئامادە بێت، دەنووسێت:

خاتوونی ئازیز. کاتێك ئێوەم نقرۆی خەمو ماتەم بینی لەسەر تەلەفزیون، بەراستی شانازیم بەئێوە دەکرد، هەڵسوکەوتان نیشانەی خۆشەویستی ئێوە بۆهاوسەرتانبوو، ژیان پێکهاتووە لەچەند ساتێکی خۆشو دواتر تێکۆشانێکی بێکۆتایی. وەستانەوەتان لەگەڵ هاوسەرتان لەم هەموو ساڵەدا، بەگەیشتن بەهیواکانی هاوکاربووی. من بەبینیی ئەم هەموو گەرمیو خۆشەویستی لەئێوەو منداڵەکانتان سەبارەت بەمنو کچەکانم، من خۆم لەئێوەو منداڵەکانت زۆر نزیك هەست پێدەکەم. حاسیەو لیا لەدەربڕینی هاودەردی لەگەڵ ئێوەو منداڵەکان، هاوڕێیانی خۆشەویستیان، لەگەڵ مندا هاودەردن. لێشاوی نامەکان لەئەمەریکا، لەسناتۆرو وەزیرەکان، بەبەردەوامی دەهاتن. سەرۆك کۆمار ریگان نانسی ریگان ئەڵبومێك لەدیداری کۆتایمان لەئەمەریکا، لەگەڵ وێنەکانی تایبەت لەئەنوەر بۆمن ڕەوانەکردن بەقسەی خۆیان لەنامەکەیاندا((روحی راستەقینەی ئەنوەر)) نیشاندەدات. لەماوەی دوو رۆژدا ریگانو هاوسەری دووجار پەیوەندیان بەمنەوە کرد. نامەیەك پێش ئەوەی مەرگی ئەنوەر رابگەیێنن هاوخەمی خۆی دیار کردبوو لەلایەن بالیوزی ئەمەریکا لەقاهیرە بەدەستم گەیشت. چونکە شەش مانگ پێش هێرش کرابوو سەر ریگانو توانیبوو رزگاری ببێت بۆیە دەیوویست من بەئاگابم هەست بەدەردو ژانی دەکاتو دوعا بۆئەنوەر دەکات.

زۆرکەس خۆشەویستیو هاودەردی زۆریان نیشاندا. مانگێك دوای مەرگی ئەنوەر، سەرۆککۆماری پێشووی ئەمەریکا، رێچارد نیکسۆن دانەیەك لەکتێبی گەورەکانی هاوچەرخ لەنووسینی چرچیل کە گرێدراوبوو بەکۆمەڵەی کەسایەتی خۆی بۆی ڕەوانە کردم. کەئێمە دوای

کۆتایی هاتنی ماتەمینی فەرمی ئەنوەر لەسەر هەندێك رستەی ئەم کتێبە کەباسی لەهەلومەرجی ژیانی ئێمە دەکرد بەوردی باسمان کرد:((منداڵەکانی باشترین یادگاری ئەنوەرن، لەژیانی خۆیاندا پەیامو رێگای دەگرنەبەر.)) سەرۆککۆمار نیکسۆن لەسەر چەند لاپەرەی ئەم کتێبەی نووسیبوو:((منداڵەکانتان دەتوانن شانازی بەم میراسەی خۆیانەوە بکەن.))

نامەیەکی جوانم لەژاکلین کەنەدی بەپێنووسی خۆی بەدەستم گەیشت، چونکە هاوسەری لەرووداوێکی هاوشێوەی کوژرابوو:

سەرۆك ئەنوەر سادات لەچاوکراوەترین سیاسەتوانەکان بوو کەجیهان بەخۆیەوە بینی. ئەفسانەی ئەنوەر بەتێپەڕ بوونی ساڵەکان گەورەتر دەبێت. من بەختەوەری دیداری خۆمو منداڵەکانم لەگەڵ ئەنوەرو ئێوە بەبێ کۆتایی لەدروشانەوەی زیاترتان دەکرد. لەگەورەترین شانازییەکانی ژیانم دەزانم. زانینی ئەوەی مەرگی هاوسەرت جیهانی گۆڕیو ژیانی مێژووی گۆڕی. جێگای سەربەرزییە خالێکی زۆر دروشاوەیە، بەڵام بەگومانی خۆم ئۆقرەگرتن لەبەرامبەر لەدەستدانی بۆئێوە زۆر دژوارتر دەکات. باش دەبێت ئەگەر ئارامی خۆتان لەناو خێزانت بەدەست بێنیتەوە، هەستو خەمباری هەموو دونیا لەگەڵ ئێوە بەجۆرێك تواناو سارێژکردنەوەی بۆئێوە هەبێت، تۆبۆ ئەنوەر ئیلهام بەخشی گەورە بوویتو شایانی زۆر لایەنیتری.

هاوڕێیانی زۆرم لەبریتانیا نامەیان بۆڕەوانە کردم. لەوانە سەرۆك وەزیر مارگارت تاچر، سەرۆك وەزیری پێشوو جیمز کالاهان، لۆردو لیدی کارینگتۆنو مەلیکە ئەلیزابت پێشوازی لەهەموو ئەندامانی خێزانی ئێمە لەساڵی ١٩٧٩ لەکوشکی باکینگهام کرد. مەلیکە ئەلیزابت لەنامەی خۆیدا دەنووسێت:((لەبیستنی ئەم هەواڵەی سامناك سەبارەت بەهاوسەرتان بەراستی شڵەژام، منو شازادە فیلیپ هاودەردی خۆشەویستی خۆمان لەم مەرگەی خەمبار لەبەرامبەر ئێوەو خێزانەکەتان رادەگەێنین.))

شازادە چارلز بۆبەشداریکردن لەبەخاك سپاردنی ئەنوەر سەردانی قاهیرەی کرد، بۆی نووسیم لەهەواڵی مەرگی ئەنوەر گێرۆدەی حەپەسانبووم. دروست دوومانگ پێش کاتێك خۆییو هاوسەری نوێیو جوانی دایانا، لەکۆتایی مانگی هەنگوینی گەیشتنە بەندەری قاهیرە، منو ئەنوەر بۆخوانێکی خۆش لەناو گەشتی گشتوگوزاری پاشایەتی بریتانیا سەردانمان کرد. شازادە چارلز لەبالیوزخانەی بریتانیا لەقاهیرە بۆی نووسیم: ((یەکێك لەگەورەترین

داخبارییەکانم ئەوەیە کەهیچ دەرفەتێمان بەدەست نەکەوتن کەبەپێی پێشنیاری هاوسەرتان، پێکەوە سەردانی شوێنە مێژوویەکانی میسر بکەین. بەلأم بەهەر شێوەیەك بێت من گەرمی مرۆڤایەتی ئەنوەر بەیاد دێنمەوە، تایبەتمەندی وەك دیار لەناو زۆر لەرێبەرانی جیهان نایابە.))
دەنووسێت دایانا لەم کارەساتە زۆر دڵگرانو داخبارە. کەنەیتوانی پێکەوە سەردانی قاهیرە بکەن. بەلأم نامەی جوانی دایانای خستبوو ناو نامەکەی خۆی دەنووسێت:((لەم کاتەی خەماویو تەنیایی تەواوی بیرو دوعاکانم بۆئێوەو خێزانی ئێوەیە، لەکانگای دڵەوە داخبارم کەنەمتوانی لەگەڵ چارلز سەردانی میسر بکەم بەگومانو باوەڕم نووسین تەنیا رێگایە کەهەست بەنزیکبوون لەئێوە لەم کارەساتەدا بکەم. لەم نامەیەدا هەڵگری قووڵترین هەستەکانی دایانای وەفادارە بەئێوە.))
زۆرجار لەکاتی خوێندنەوەی نامەکان هەوڵی خۆم دەدا کەرێگا لەفرمێسکەکانی خۆم بگرم.
فەزیلە ئەحمەد فوئاد، بووکی مەلیك فارۆق نووسی:
من بەنۆبەی خۆم پرسەی خۆم بەئێوەو تەواوی خێزانی دڵۆڤانی ئێوە بۆمەرگی خۆشەویستی ئاشتی، محەممەد ئەنوەر سادات پێشکەش دەکەم، داوا لەخودای گەورە دەکەم کەبەبەهەشتی خۆی شاد بکاتو سەبر بەئێوە بدات. هیچ کاتێك ئەوەی کە وەك پێگەی دایك فێربوون لەیاد ناکەم، لەرۆژێکدا هەستم بەمرۆڤایەتی کرد کەرێگایان بەمندا کوڕی خۆم لەخاکی ئازیزی میسر، خاکی خۆشەویستی، خاکی ئاشتی، لەسەر خاکێك کەئەم دلاوەرە، ئەم شەهیدەی رێگای ئاشتیو خۆشەویستی، کەبەخوێنی پاکی خۆی ئاودا، بێنمە سەر دونیا. ئارامیو رەحمەتو لێبۆردەیی خودا لەئێوە بێت.
کەوتمە ژێر کاریگەری پەیامی جوانی ئەمیری جەددەو هاوسەری لەسعودیا رەوانەیان کردبوو بەهەمان شێوە پەیامی مەلیك حوسێن لەئۆردن. هەرچەند هیچ پەیوەندییەك لەنیوان میسرو ئۆردن نەبوو، بەلأم تەنیا کەسێکبوو لەنیوان سەرانی عەرەب توانی راستگۆیی کەسایەتی خۆی لەنامەیەکدا بۆدۆستی کوچکردووی دەرببڕێت. وەك من خۆم بۆکارەساتی دلتەزێنی هاوسەری عالییەو هاودەردی خۆشەویستانەی خۆم سەفەری ئۆردنم کرد، ئێستا مەلیك حوسێن لەئۆردن، وەك روحی راستەقینەی ئیسلام، هاودەردی خۆی بۆمن نیشاندا.
هاوخەمی خۆمو خێزانم بۆلەدەستدانی هاوسەرت دەردەبڕم، خودای گەورە لەپەنای خۆی، هەروەك ئێمە چاوەڕێی دەکەین، جێگای بۆبکاتەوە. داوا لەخودای گەورە دەکەینو لەدەرگای

دوعا دەكەین كەئێوەو خێزانتان لەپەنای خۆیدا بپارێزێت. منو خێزانم هەمان هەستی مرۆیی‌و خۆشەویستیمان بۆئێوە رادەگەیێنین كەخۆتان لەكاتی كارەسات سەردانی ئێمەتان كردو دڵنەوایی ئێمەتان دایەوە. ئێستاش داوا دەكەم هەستو داخباری ئێمە قبوولٚ بكەن. لەخودای گەورە داواكارم كەهێزو توانای خۆراگری بەئێوەو بدات. ئێمە هەموومان لەلایەن خودا هاتووین‌و بۆلای دەگەڕێنەوە.

لەنامەدا واژۆی برای ئێوە، حوسێن هەبوو. هیواداربووم لەناو سەرانی عەرەب كەسێكیتر هەبێت كەرێزو خۆشەویستی خۆی لەكانگای دڵەوە ئاراستەی ئەنوەر بكات. بەلاّم هیچ كەسێك نەیكرد. هاوسەرانی سەرانی عەرەب كەدۆستایەتیم لەگەڵدا هەبوو زیاتر خۆشەویستی خۆیان نیشاندا. خاتوو وسیلە لەتونس، چونكە لەبەر هۆكاری سیاسی نەیدەتوانی سەردانی میسر بكات، خوشكی خۆی نایلەی بۆهاودەردی ڕەوانەكرد. شیخە فاتیمە لەدوبەی وەفدێكی بۆهاودەردی ڕەوانەی میسر كرد. چەند خاتوونێك لەقەتەر سەردانی منیان كرد. بوێری ئەم خاتوونانە كاریگەری زۆریان لەمن كرد. بەپێچەوانەی جولاّنەوەی زۆر كەسی موسڵمان كەتەنیا خەمی ئێمەیان زیاتر دەكرد. لەبەغداد، خەڵك دەستی بەگۆڕانی‌و سەماكردن لەسەر شەقامەكان كردبوو. لەلیبیا دوای راگەیاندنی مەرگی ئەنوەر لەرادیوی ترابلۆس، خەڵك لەسەر شەقامەكان ئالاّیان بەرز دەكردەوە. پروپاگەندەی نفرەت لێكراوی لیبیا بۆهەفتەیەك بەردەوامی هەبوو، موعەمەر قەزافی راستەوخۆ داوای لەخەڵك دەكرد حكومەتی نوێ بڕوخێنن‌و لەناو قاهیرە دەست بەخۆپیشاندان بكەن‌و پەیكەری ئەنوەر پارچە پارچە بكەن. لەئێران، خومەینی داوای لەخەڵك كرد((جێگرەوەكانی فیرعەونی مردوو)) بروخێنن لەجیاتی حكومەتی ئیسلامی. لەلوبنان توندڕەوانی فەلەستینی بەگۆرانی‌و سەماكردن شەربەتیان بەسەر خەڵكدا دابەش دەكرد وەك ئەوەی خوشترین‌و شادترین رۆژیان بێت كردیان بەجەژن. یەكێك لەفەرماندەكانی ئازادی بەخشی فەلەستین رایگەیاند:((ئێمە بەتوندی ئەم دەستە دەگوشین كەتەقەی پێكرا.))

لەبینینی خۆپیشاندانەكانی سەرلێشواو زۆر بێزار دەبووم. كاتێك نورەی كەسانێك دەهات كەتاكو توانیان ئێمەیان ئازاردا تووڕە بوونم بۆئەمانە بەكۆتایی دەهات. لەجیاتی ئەوەی هەست بەشادی بكەم، سەرخۆشیان لێدەكەم. پەیامی راستەقینەی ئیسلام ئەمەیە. بەلاّم دوای مەرگی ئەنوەر هەندێكیان ئەوەندە ڕقوقین لەدڵبوون تاكو دەگەیشتە ئەوەی خیانەت لەئایینی خۆیان بكەن. هەڵسوكەوتێكی زۆر شەرمەزارانەبوو بەتایبەتی بێرێزی هەندێك لەفەلەستینییەكان

لەخۆیان نیشاندا. هیچ کەسێك بەرادەی هاوسەرم هەوڵی نەدا خزمەت بەفەلەستینییەکان بکات. لەتەواوی دانیشتنەکانی لەگەڵ ئیسرائیل، لەسەر داوای خۆی کەمافی فەلەستینییەکانە ئۆتۆنۆمیو سەربەخۆیی خۆیان هەبێتو پیداگری تەواوی دەکرد. ئەنوەر یەکەم هەنگاوی ئازایانەی بۆ چارەسەری کێشەکانمان لەرێگای گفتوگۆی ئاشتیانە هەڵگرت ئێستاش لەبەر هەمان هەنگاوی کوژرابوو.

لەمیسر حکومەتی سەربازی راگەێندراو کۆبوونەوەی زیاتر لەپێنج کەس لەسەر شەقامەکان قەدەخەکرا. شوێنی لەدایکبوونی ئەنوەر میت ئەبوئەلکۆم کەوتەژێر چاودێری سەربازی رۆیشتن بۆئەم شوێنە قەدەخەکرا. زیاتر لەهەزار کەس لەکەسانی توندڕەو بۆلێکۆلینەوە بانگێشت کران‌و خانوویەکانیان پشکنینیان بۆکرد، پۆلیس جگە لە دەستبەسەرداگرتنی چەك نەخشەی داگیرکردنی میسریان دۆزییەوە، بۆچی کەسانی ئەمنی ئێمە زووتر ئەمەیان نەدەدۆزییەوە؟ کەمتر لەچلو هەشت کاتژمێر توندوتیژی گەیشتە ئەسیوت، شوێنێك کەتوندڕەوانی نەریتخوازو پۆلیس هێرشی سەر یەکتریان کرد لەماوەی دوو رۆژی شۆڕشی نەریتخوازەکان ٦٦ پۆلیس‌و ٢١ نەریتخوازی مەزهەبی کوژران.

توندوتیژی ولآتی گرتەوە، هیچ کەسێك نەیدەزانی ئایا کودەتایەك بەڕێوەیە، ئەگەر بوونی هەیە چ کەسێك رێبەرایەتی دەکات. بەرپرسیارەتی کوشتنی ئەنوەر گروپێك بەناوی جیهاد لەئەستۆی گرت، هەمان تیرۆریستانی کەلەساڵی ١٩٨٠ بۆمبیان لەناو کلێسای ئەسکەندەرییە تەقاندەوە. هیچ کەسێك نەیدەزانی ژمارەی کەسانی جیهادی لەشوێنی رووداوی کوشتنی ئەنوەر چەندبوون‌و یان لەناو کۆمەڵگەی میسری شوێنی خۆیان گرتبوو چەندن. من لەقاهیرە نەمدەزانی دەبێت چاوەڕێی چی بکەین، نەمدەزانی ئایا من‌و منداڵەکانم لەمەترسیداین. بۆپشت راستبوون کەدەنگی ئێمە نەگوازرێتەوە رۆیشتین بۆناو حەوشەی ماڵەکەمان لەجیزە تاکو لەسەرخۆ هیواش بۆخۆمان قسەی دڵی خۆمان بکەین، ئایا لەمیسر برۆین یان بمێنینەوە. هەموومان باوەڕێکمان هەبوو، بەبوونی هەموو مەترسییەکان، یەك دەنگ بۆرێزگرتن لەئەنوەر لەمیسر دەمێنینەوە.

کاتێك ئاشکرابوو کوشتنی هاوسەرم کاری هەندێك کەسی شێتانە بووە نەك پیلانێك لەتەواوی میسر، ژیان بەکاتی گەڕایەوە بۆ رەوەتی جارانی خۆی. بەپێچەوانەی هەمان شۆڕش‌و ئاڵۆزییەکانی کەدوای مەرگی ناسر دروستبوون، گواستنەوەی دەسەلآتی سەرۆککۆمار

لەهاوسەرم بۆحوسنی موبارەك بەئارامی روویدا ئەمەیان نیشانەیەكبوو لەدیموكراسی فەرمانڕەواییەك كەئەنوەر لەمیسر دامەزرێنەریبوو. بەلاّم ولاّت هەمووی لەگوماندابوو. ئێمە یەكێك لەهەمان ولاّتان هەژمار دەكراین كە كەمترین تاوانی لەئاستی جیهان تێدا روویدابوو. ئێمە لەمیسر بەكوشتو كوشتاری یەكتر رانەهاتبووین، تەنیا نەریتخوازانی مەزهەبی كەئێستاش كەمایەتییەكی بچوكن لەخەڵكی ئێمە، وەك دیار بۆ دانانی یاساكانی لەسەر بنەمای ئایین، بەلاّم بۆباشتر كردنی مەبەستی سیاسی خۆیان توندوتیژی بەرێگایەكی دروست دەزانن.

باس دەكرا یەكێك لەچوار بكوژەكان لەكاتی هێرشكردنی بۆسەر شوێنی ئەنوەر هاوار دەكات:((بۆگەورەی میسر!هێرش!)) لەلێكۆلینەوەكان ئاشكرابوو كەرێبەری بیستو چوارساڵەیان ئەفسەرێك بەناوی خالّد ئەحمەد شوقی ئیسلامبۆلّی، لەژێر فەرماندەی زەواهری كاری دەكرد، هەمان ئەفسەری هەلاّتووی هەواڵگەری كەلەسەر ئەم كەسە ئەنوەریان ئاگادار كردبوو، بەلاّم لەدەستی پۆلیس رزگاربوو لەكاتی بەدوادا گەڕان بۆكەسانی سیاسیو مەزهەبی دژی حكومەت. كاتێك لەرێگای تەلەفزیۆن تەماشای لێكۆلینەوەكانی دادگام دەكرد لەمانگی كانوونی دووەم، رۆژ لەدوای رۆژ كێشەكان گەورەتر دەبوون، بێزار دەبووم، چوار بكوژو بیست تاوانبارو هاودەست بەردەوام جنێویان دەدان، رەوتی دادگایكردنیان تێك دەدا. من خۆم لەكاتی كۆبوونەوەكانی ئەنجوومەن لەمنوفیە، رێگام بەكرانەوەی گفتوگۆكان دەدا بەلاّم كاتێك كێشە دروست دەبوو سەرۆكایەتی كۆبوونەوەم دەگرتە دەست. ئێستا لەناو هۆلی دادگای قاهیرە، قازی هیچ هەولێكی بۆبێدەنگ كردنی ئەمانە نەبوو، دەمزانی دەبێت بێلایەن بێت، بەلاّم پێویستی نەدەكرد تاكو ئەم ڕادەیە خۆی لاواز نیشانبدات. پیلانگێرەكان ئازادانە هاواریان دەكردو جنێویان بەئەنوەرو رژێمی ئەنوەر دەدان. وەك ئەوەی لەجیاتی ئەمانە سادات گیرۆدەی تاوانبووە، سادات قوربانی نەبێت تاوانباربێت. ئەمەیان لێكۆلینەوە نەبوو لەتاوانباران، لێكۆلینەوەبوو لەگەلّ سادات.

ئیسلامبۆلّیو هاوڕێیانی نەك تەنیا لەكردەوەی خۆیان پەشیمان نەبوون شانازیان بەخۆیانەوە دەكردو كەگوایە پەیامی خودایان بەجێ گەیاندبوو. ئیسلامبۆلی پێداگری دەكرد ئەمەیان بەرنامەی خودابوو كەیاساكانی ئیسلامی بكرێنە جێگرەوەی یاساكانی مەدەنیو ئاشتی لەگەلّ ئیسرائیل، بەكوژرانی ئەنوەر، تۆلّەی گرنتی رێبەرانی موسلّمانو نەیتخوازو پەیرەوانیان لەمانگی ئەیلوول، كەبرای گەورەتری محەممەد یەكێك لەگیراوەكانبوو، وەربگرێت. وەك دیار

ئەمانە لەجیاتی وەرگرتنی سزای خۆیان لەبەرامبەر کوشتنی هاوسەرم، چاوەڕێی پیرۆز بایی بوون.

لەمانگی ئادار کاتێك تاوانبارانو عەبدوسەلام فەرج، رێکخەری هێرشو نووسەری کتێبی فەرمانەکانی نهێنی کەلایەنگری جیهادی دژی رێبەران لادەر لەئاین بوو، بەمەرگو زۆربەیان بەزیندانیکردن سزا دران، توندوتیژییەکان زیاتربوون. ئیسلامبۆلی روو لەدایكو خوشکی دەکات کەبەنەریتی ئیسلامی خۆیان داپۆشیبوو هاوار دەکات:((خەم نەخۆن، من دەگەڕێمەوە بۆلای خودای گەورەی خۆم، ئێمە ئازادینو ئێوە گیراون.)) بینی ئەم جۆرە بەندایەتییە بەراستی ترسناکبوو، چۆن کەسێك دەتوانیت لەبەرامبەر ئەم جۆرە گروپانە بەرگری لەخۆی بکات کەپەیرەوانی خۆکوژی کەخەمی گیانی خۆیانو دەربازبوون لەرووداوەکان نەبێت، خەڵکی بێتاوان بەچەكو تەقاندنەوەی بۆمب دەکوژن لەکاتی راگەیاندنی بڕیار تاوانباربوونی دیاریکرا هاواریکرد:((ئەی قودس، دەسەڵاتی مردن، موسڵمانەکان دێن!)) یەکێکیتر بەبەرزکردنەوەی قورئان ئاڵای خوێناوی ئەستێرەی داوود هاوار دەکات:((بگرن بەدەستی موسڵمانەکان دەکوژرێت. سادات گەورەترین پشتیوانی جوولەکەکانبوو.))تای دژایەتیکردنی سادات لەلایەن نەریتخوازان زیاتر دەکرا هەموو شوێنێکی دەگرتەوە. ئێستا هەموو دژبەرەکانی سادات بۆ بێڕەنگ کردنی ئەنوەر سادات دەستیان لەناو دەستی یەکتر نابوو. یەکێك لەشێخەکانی نەریتخواز لەوتاری رۆژی هەینی خۆیدا پێداگری دەکرد: ((هاوسەرانی پێغەمبەر لەماڵی خۆیان دەمانەوەو خواردنیان دروست دەکرد کاری خاوێنکردنەوەیان دەکرد. بیوەی رێبەری ئێمە کوپتەری ڕەوانە دەکرد میوەی نوێ بۆبێنن.)) لەرۆژنامەکانی دژبەرەانی ئەنوەر دەنووسرا دوای بەخاك سپاردنی ئەنوەر من لەفرۆکەخانە گیراوم بەچانتایەکی پڕ لەخشڵ، ئاسەواری هونەری میسری لەمۆزەخانەیەك دزیوون، واتە رێگا پێدرام لەزانکۆ وەك ماموستای وانەبێژ یاسایی نەبوو، منداڵەکانم مەرجی وەرگرتنیان لەزانکۆ نەبووە. هەموو بەیانییەك دوای هەڵسانەوەمان لەرۆژنامەکان تۆمەتێکیتر سەردێری رۆژنامەکانبوو کەسەر لەبەری هەمووی هەڵبستراو بوون. لەشوێنێکیتر نووسرابوو ئەنوەر لەمیسر خاوەنی دوانزدە خانوویەو من خاوەنی موڵكو ماڵم لەتەواوی جیهاندا. کاتێك کەئێمە خاوەنی خانووی خۆمان لەجیزە نەبووین. تەنیا ئەوەی هەمانبوو لەمیت ئەبوئەلکۆم بوو. شوێنەکانیتر کەئەنوەر لەکاتی

سەردانی بۆپارێزگاکان بەهۆکاری ئەمنی بۆمانەوەی خۆی نیشتەجێ دەبوو هەموویان موڵکی حکومەت بوون

نەك ئەنوەر. ئێستا لەژێر دەسەڵاتی حوسنی موبارك دابوون. بۆهاوڕێانم باس دەکرد ئەگەر تەنیا بتوانن تاپۆی شوێنێك بێنن یان بەڵگەیەکی بچووك، باوەڕ بەقسەکانیان دەکەم. سەردەمێکی زۆر دژواربوو بۆئێمە، زۆر دژوار.

هیچ کەسێك نەیدەزانی باوەڕ بەقسەی چ کەسێك بکات. خۆدی سەرۆککۆماری نوێی نەیدەزانی. ماوەیەك دوای مەرگی ئەنوەر، حوسنی موبارەك بەتەلەفۆن پەیوەندی بەمنەوە کردو گوتی هەمان بەرنامەی کەئەنوەر بۆهاوسەری ناسر بڕیاری لەسەر دابوو: دیاریکردنی هاوکاری حکومەت، دابین کردنی شوێنی مانەوە بۆخێزان. بەڵام خۆشی حەقیقەتی نەدەزانی.

پرسیاری لەمن کرد:((خانووی دورگەی جیزە موڵکی خۆتانە؟))

هەلومەرجم ئەوەندە خرابوو نەمدەتوانی پێبکەنم.((جەنابی سەرۆککۆمار، واتە تۆش بیردەکەیتەوە ئەمەیان خانووی ئێمەیە؟ منو ئەنوەر لەچ شوێنێك پارەمان دەهێنا تاکو ئەم خانوویە بکڕین؟ نەخێر بەکرێیە.))

گوتی:((تەنیا دەمویست پشتراستبم.)) تاپۆی خانووی جیزەو ئەسکەندەرییەیی تاکو منو منداڵەکانم زیندوو بین بەناوی ئێمەی کرد.

بێگومان من سوپاسگوزاری بووم بەڵام کاتێك تەلەفۆنم دانا هەموو جەستەم دەلەرزی. ئەگەر کەسێکی وەك موبارەك لەئێمە نزیك نەزانێت ئێمە خاوەنی چین‌و چیمان نییە. کەسانێك کەزۆر لەئێمە دوور بوون چۆن بیریان دەکردەوە؟

پروپاگەندەیەیتر لەگەڵ وێنەی منو منداڵەکان لەرۆژنامەکان چاپکرا:((خێزانی سادات چۆن توانیان ئەم هەموو سەرمایە کۆبکەنەوە؟ تەنیا تەماشای جلوبەرگەکانیان بکەن! هەستم بەبێچارەیی‌و تووڕەیی دەکرد، هەمووکاتێك کەمترین دارایم بۆجلوبەرگەکان تەرخان دەکرد، ساڵانە سێ تاکو چوار دەستە جلوبەرکی باشمان دەکڕین بۆماوەی دەساڵ سوودمان لێوەر دەگرت. زۆربەی جلوبەرگان بۆجەژنەکان خۆم درومانیم دەکرد لەزانکۆ قوتابیان گلەی زۆریان لەکەم خەرجی من دەکرد، بەردەوام گلۆپی ژوورەکانی خاڵیم دەکوژاندنەوە تاکو کارەبا بەخۆرایی نەچێت، من خۆم بەبێ رووناکی کارەبا وانەکانم بۆقوتابیان دەگوتنەوە. قوتابییەکان بەگاڵتە دەیانگوت دەتەوێت کورمان بکەیت؟ لەوەڵامدا دەمگوت: رووناکی رۆژ بەخۆراییە بەڵام

کارەبا خەرجی زۆری دەوێت. بەڵام دوای مەرگی ئەنوەر تۆمەت بەخشینەوەی‌و درۆی زۆر بەردەوامیان هەبوو.

ئیتر تۆقرەی ئەم هەلومەرجەم هەڵنەدەگرت. ئەگەر وەڵامی یەکێك لەم تۆمەتانەمان دەدایەوە، ئیتر کۆتایی بۆهەمان گومان نەبوو. چ سوودێکی هەبوو؟ بڕیارمدا ڕێگا بدەم هەرچییەك خەڵك دەیەوێت باس بکات تاکو ئەوکاتەی ئارام ببنەوە قسەی حەق لەسەریان بچەقێت. بەڵام لەئەنجامدا کار گەیشتە شوێنێك کەنەمتوانی بەبێدەنگی بمێنمەوە.

دوومانگ دوای مەرگی هاوسەرم یەکێك لەئەندامانی پەرلەمان منی لەئەسکەندەرییە بەتۆمەتی نەگەیاندنی پارمەتییەکانی چەند ساڵەی بۆگوندی ئیس ئۆ ئیس بانگێشت کرد بۆدادگا. دەستبەجێ پەیوەندیم بەئیس ئۆ ئیس کرد، گەیشتنی هاوکارییەکان‌و وەرگرتنی لەلایەن ئیس ئۆ ئیس وەرم گرت‌و لەرۆژنامە چاپم کرد، دادگا ڕەتیکردەوە بەدواداچوونی بۆبکات نەیتوانی هیچ بەڵگەیەك بسەلمێنێت. دواتر بانگێشت نامەیەکیتر لەدادگا بەدەستم گەیشت کەپیاوێکیتر بانگێشەی ئەوەی کردبوو من توانای ئەوەم نەبوو گەلەزانکۆ دەست بەخوێندن بکەم. سەرۆکی زانکۆ بەچاپکردنی بەڵگەنامەکانی من وەڵامی ئەم کابرایەیی دایەوە. بەڵام داواکرانم لەلایەن دادگا بەردەوامی هەبوو. گوایە لەجیاتی تاوانبارانی کوشتنی ئەنوەر سادات دەبێت من دادگایی بکرێم. دادوەر لەبەرامبەر خەڵك گوتی:((ئیسلامبوڵی دەیەوێت گوێی لەقسەکانت بگرێت.)) ئیسلامبوڵی؟ بڕیارە باسی چی بۆبکەم، بۆی باس بکەم کارێکی باشیکرد کەهاوسەری منی کوشت؟ ئامادە نەبووم وەڵامی ئەم داواکاریانە بدەمەوە.

زیاتری ئەم درۆو قسەی هەڵبەستراو بەنەبیستراوی بزانم، بەڵام هەندێکیان منیان ئازار دەدا، بەتایبەتی تۆمەتەکانی نوێ لەسەر ناوەندی ئیمان‌و ئومێد. بۆ بێباوەڕ کردنی من وەك ئافرەتێك، بۆئەوەی نیشانبدەن ئەوەی من دەمکرد تەنیا سوودم لەدەسەڵاتی هاوسەری خۆم وەردەگرت، دوو سەربازی کەم ئەندام لەناو ناوەندی ئیمان‌و ئومێد نامەیەك بۆسەرانی حکومەت‌و لەرۆژنامەکان بڵاوکردەوە کەمنیان تاوانبار دەکرد کەخواردنی خراپم پێشکەش بەسەربازەکان دەکەم‌و بەنەدانی ئۆتۆمبێلێ بەئەمانە ساختەکاریم لەکارەکاندا کردبێت.

ڕۆژنامەکان ڕۆژانە تۆمەت هەڵبەستنەکانی خۆیان چاپ‌و بڵاو دەکردنەوە، منداڵەکانم داوایان لەمن دەکرد دەست لەناوەندی ئیمان‌و ئومێد هەڵگرم، ئەم هەموو ئازارو زەحمەتان بۆ ناوەندە کێشا ئێستا دەیانەوێت بەئازاردانت چاکەی کارەکانت بدەنەوە. بەڵام من هیچ کاتێك کەسێك

نەبووم لەناو ژیانمدا شوێن بۆکەسانیتر چۆڵبکەم. بەمنداڵو دۆستانی خۆم راگەیاند کەئەمانەش هاوشێوەی منداڵەکانم داوای دەست لەکارکێشانەوەی منیان دەکرد، گوتم:((ناوەندی ئیمانو ئومێد موڵکی ئەم دوو سەربازە نییە من خزمەت بەزۆرینەی کەم ئەندامان دەکەم، ئەگەر دوو سەربازیان نارازیبن ئەمەیان بەهەمان مانا نییە هەرچییەك من کردم بەبیهۆ بووە.)) لەبەرگریکردن لەمن شەپۆلی نامەکانی نارازی کەسانی کەم ئەندام بۆ رۆژنامەکان لەناوەندی ئیمانو ئومێد دەستی پێکرد کەچەند لەم ناوەندە سوودیان وەرگرتووە. لەکۆبوونەوەی دەستەی بەڕێوەبردن بەنەبوونی من، بەلاَم بەئامادە بوونی هەموو ئەندامان دەنگ لەسەر دەرکردنی ئەم دوو سەربازە لەناوەندی ئیمانو ئومێد دەرکرا.

گیانم لەجەستەم دەردەچوو، لەبەرمنداڵەکانم، لەبەر رێزو خۆشەویستی بۆناوی ئەنوەر چاوەڕێم دەکرد کەسێك خاڵی کۆتایی لەسەر ئەم هێرشانە بۆسەرمن دابنێت، بەلاَم هیچ کەسێك ئەمەی نەکرد. لەوانەیە دروستکردنی ئەم هەموو کێشانە بەشێك بووبێت لەدیموکراسی تازە پێگەیشتووی ئێمە، من زۆر لەئازار دابووم، منداڵەکانم بەهەمان شێوە. منداڵەکانم لەبەرامبەر مەرگی باوکیان هەوڵدان بۆخرابکردنی ناوی ئەنوەر لەخۆیان دەپێچانەوە. بەلاَم من بەردەوام بۆم باس دەکرد هیچ شتێك لەدڵی خۆتان گران نەکەن، باوکتان یەکەم کەسبوو دیموکراسی گەیاندە میسر بێگومان رەخنەش لەباوکتان دەگیرێت بەلاَم ئێوە دەبێت شانازی بەباوکی خۆتانەوە بکەن. چونکە یەکەم کەس بوو رێگای بەدژبەرەکانی خۆیدا قسەی خۆیان بەئازادی بکەن. لەیادی نەکەن چەند هەوڵی بۆ میسردا توانی ئاشتی بگەڕێنێتەوە بۆمیسر. ئەوەی کەباوکتان داوای دەکرد ئەمەیانبوو، زۆرخوتان سەخڵەت نەکەن باوکتان رازییە، روحی باوکتان رازییە.))

بەلاَم دیسان منداڵەکانم خەمباربوون بۆچی رێگا بەرۆژنامەکان دەدرێ بەم شێوەیە هێرش بکەنە سەر باوکیانو بێ رەحمانە دژی قسەی خۆیان بکەن. منداڵەکانم پێداگریان دەکرد ئەگەر دیموکراسی ئەمەبێت بۆچی کاتێك کەزیندوو بوو نەیاندەتوانی بەم شێوەتوندە رەخنەیان نەدەگرت؟ وەلاَمی من ئەوەبوو:((کەسانێك کەکاری گەورە دەکەن دوژمنی زیاتریان دەبن. دژبەرەکانیان درۆ دەکەن، ئێستا دەستیان پێکردووە چونکە مردووە ناتوانێت وەلاَمیان بداتەوە.))

سێ ساڵ درێژەی کێشا تاکو رۆژنامەکان وازیان لەتۆمەت هەڵبەستن هێنا. بەلاّم جێگای شوکربوو کاتێك کەمحەممەد هیکل، سەرنووسەری پێشووی ئەهرام، کتێبێکی لەسەر تۆمەتەکانی هەڵبەستراو چاپکرد، چاپکردنی لەبەر بێ رێزییەکانی، لەمیسر قەدەخەکرا. بەم شێوەیە پروپاگەندەکان دژی ئێمە کاری خۆیان کردبوو. تاکو ئەوکات زۆر خەڵك منیان بەئافرەتێکی دەوڵەمەند دەزانی لەراستیدا تەنیا هاوکاری حکومەت کەبۆی دیاریکردبووم وەرم دەگرت.

جەماڵ لەکاتی مردنی باوکی، کەئەرکدار کرابوو چاوی لەئێمە بێت، هەوڵی خۆیدا هاوکاری من بکات، بەلاّم تەمەنی تەنیا بیستو پێنج ساڵبوو ماوەیەك وەك ئەندازیاری پترۆشیمی لەکۆمپانیایی برای هاوسەری دەستی بەکار کردبوو. دوای چەند مانگێك مەرگی باوکی، رۆژێکیان بە بەستەیەکی کاغەزی هات بۆلام.

پرسیم:((ئەمەیان چییە؟))

گوتی:((بۆئێوەیە.))

بەپێداگری گوتم:((لەچ شوێنێك هاتووە؟))

لەئەنجامدا بۆی باسکردم ئەمەیان مووچەی مانگانەی خۆیەوە وەریگرتووە لەنێوان هاوسەرو منی دابەشکردووە. بۆم باسکرد:((جەماڵ من مووچەی خۆم لەحکومەت وەردەگرم ئەمەیان بۆژنو منداڵەکانی خۆت بپارێزە.)) بەلاّم رازی نەبوو گوتی:((دایە، ئەمەیان ئەرکی منە دەبێت راسپاردەکانی باوکم جێبەجێ بکەم.))

لەبەرامبەر خوشکەکانی خۆی بەهەمان شێوە هەستی بەبەرپرسیارەتی دەکرد. دوای مەرگی ئەنوەر، یەکێك لەکچەکانی هاوسەری پێشووی لەرۆژنامە شوێنی کارکردنی لەئەمەریکا دەرکرا، بڕیاریدابوو لەزانکۆ بخوێنێت بەپێی مافی خۆی، داوای خەرجی خۆی لەبرای دەکرد، جەماڵ دەستبەجێ سەردانی بانکی کردو داوای قەرزی پێویستی تاکو کۆتایی خوێندنی خوشکی کرد، بەهاوکاری برای هاوسەری محموود عوسمان، خەرجی خوشکی خۆیدا. داخباربووم کەدەچێتە ژێرباری قورسی ئەم داواکاریانە. بەلاّم ئەنوەر لەرۆژەکانی کۆتایی تەمەنی باسی دەکرد جەماڵ ئیتر پیاوێکی تەواوە دەبێت منو تۆ شانازیی بەبوونی بکەین.

چەندین مانگ تێپەڕیکرد نەمدەتوانی بەسەر پەریشانی خۆم سەربکەوم، دەستم لەسەرۆکایەتی ئەنجوومەنی منوفیە کێشایەوە، وانەگوتنەوەی زانکۆم بەجێهێشت، توانای کارکردن

لەناوەندەکانو دەزگاکانی خێرخوازی نەبوو، لەساڵی یەکەم تەنیا دووجار سەردانی کارگەی درومانم کردو چەند جارێك سەردانی ناوەندی ئیمانو ئومێدو گوندی ئیس ئۆ ئیسم کرد.
بێگومان دەمزانی مەرگی ئەنوەر خواستی خودایە، دەمزانی ئەم رووداوە تەنیاچارەنووسی ئەنوەر نەبوو هاوکات چارەنووسی منیش بوو. بەڵام هەمووکاتێك هەستم بەتاوان دەکرد دەمتوانی رێگا لەمەرگی بگرم، دەمتوانی بەبێ ئەوەی کەسێك بزانێت زیاتر چاودێری بکەم.
بۆماوەیەك ساڵێك بەردەوام گلەیم لەهەموو کەسێکو خۆم دەکرد.
تەنیا جلوبەرگی ڕەشم دەپۆشین، کاتێك ساڵێکی تەواو بەسەر مەرگی ئەنوەر تێپەڕی دیسان بەردەوامبوو لەپۆشینی جلوبەرگی ڕەش. بەیانیان کاتێك تەماشای جلوبەرگەکانی حۆم دەکرد تەنیا ڕەشم دەبینی، جگە لەڕەش هیچ هەستێکم نەبوو، هیچ ویستێکم بۆجلوبەرگەکانی ڕەنگاو ڕەنگو خشڵو خۆرازاندنەوەم نەبوو. زۆر لەئافرەتان دەیانتوانی ئەم سنوورەی نیوان خۆیان بشکێننو رابگەیێنن سەردەمی خەمباری کۆتایی هات، بەڵام من نەمدەتوانی شتێك لەدرونمدا مردبوو.
منداڵەکانم زۆر نیگەرانی من بوون:((دایە دەبێت خۆت لەژێر ئەم بارە قورسە سووك بکەیت.))
جلوبەرگی نوێی خوڵەمێشیان بۆدەهێنام بەڵام هیچ ویستێکم بۆ ئەم لایەنانە نەبوو. بەیانیان لەخەو هەڵدەستام. دوای نوێژ دەستم بەخوێندنەوەی رۆژنامەکان دەکردو وەڵامی نامەکانم دەدایەو، داوام لەچێشت لێنەر دەکرد ئەمڕۆ دەبێت ئەم خواردنە دروست بکەیت.، بەڵام کاتەکانیتر بەبێ کاروبار لەماڵ لەخۆم دەسوڕامەوە، نەتوانای رۆیشتنە دەرەوەم هەبوو نەك دەمتوانی بیری خۆم لەسەر شتێکو لایەنێك کۆبکەمەوە، دیمەنی مەرگی ئەنوەر بەردەوام لەناو بیرم خۆی دروست دەکردەوە. دەموویست لەبەرامبەر ئەم بیرکردنەوەی ترسێنەر هەڵبێم، بەڵام بەردەوام گویم لەدەنگەکانبوو، دەنگی فرۆکەکانی جێت بەسەر سەری ئێمە، دەنگی تەقەو دەنگی هاوارەکان...
تاکو چەندین مانگ نەوەکانی من شێوەی تەقەکردنیان دووبارە دەکردەوە، یارییەکی ترسناکبوو ناویان لەسەردانابوو مەراسیمی سەربازی، یەکێك هاواری دەکرد نیشانی ئەویتری دەدا دەستەکانی لەسەر سەری خۆی دابنێتو خۆی بەزەویدا بکێشێت. هەرکاتێك یاسمین، کچی بچوکی جەماڵ وێنەی باپیری دەبینی دەستەکانی هاوشێوەی دەمانجە لێدەکردنو تەقەی لەوێنەی باپیری دەکرد، زۆر بیری باپیری خۆیان دەکرد. بەیادیان دەهاتەوە کاتێك ئەنوەر

پێدەکەنی روخساری چۆن نەرم دەبوو، رەنگی دەگۆڕا، رێگای پێدەدان لەسەرو گویلاکی بڕۆنە سەرەوەو یاری بەسمبێڵەکانی بکەن. کاتێك ویستم لەیلا، کچی لوبنا بەئەدەب بکەم، گوتی:((بەباپیرم دەلێم تۆ لەگەڵ من باش نیت.)) دواتر بەروخساری تێکلاو گوتی:((لەکوێیە؟ لەچ شوێنێك دەتوانم بیدۆزمەوە؟ دەمەوێت بۆی باس بکەم.))

مەرگی ئەنوەر بۆ نەوەی شەش ساڵەی ئێمە شەریف لەهەموویان دژوارتربوو. شەریف وەك نەوەی یەکەم، زۆر لەباپیری نزیکبوو. ئەنوەر لەساڵی یەکەمی خوێندن خۆی برد بۆقوتابخانە. کاتێك شەریف لەقوتابخانە دەگەڕایەوە ئەنوەر گوێی لەخوێندنی دەگرت ئێستا شەریف وەك جاران هیچ ویستێکی بۆخوێندنی وانەکانی نەبوو، لەقوتابخانە ئامادە نەبوو هیچ شتێك بنووسێت. ماموستا بۆی باسکردین منداڵەکان بەردەوام باسی باپیری بۆدەکەن رێگای پێنادەن لەیادی بکات.

رۆژێکیان شەریف بەتووڕەیی بۆی باسکردم:((تۆ درۆ لەگەڵ مندا دەکەیت، باپیرم لەناو بەهەشت دایە. بەلام هاوڕێیانم بۆم باس دەکەن. تەلەفزیۆن نیشانیدا لەژێر خاك دایە.)) زۆر بەنەرمی بۆم باسکرد:((ئەمانە راست دەکەن، من بەهەمان شێوە راست دەکەم. باپیرت لەناو گۆری لەژێر خاکدایە، بەلام روحی کەزۆر گرنترە لەجەستەی لەبەهەشت نزیك لەخودایە.))

دوای مانگێك کەهەموو منداڵەکانی قوتابخانە باپیریان هەبوو بەلام شەریف باپیری نەبوو ویستی بەهیچ شێوەیەك نەچێت بۆقوتابخانە، قوتابخانەی شەریفمان گۆڕی.

بکوژانەی ئەنوەر لەپانزدەی نیسانی ١٩٨٢ لەسێدارە دران، رۆژی کەدەردو ژانم زیاتربوو. ئەمانە لەجیاتی ئەوەی وەك شەهیدان، بەهەمان شێوە کەخۆیان بانگێشەیان بۆدەکرد بەرەو پێشوازی مەرگ دەچن، لەناکاو خوشحاڵی خۆیان بەخوشحاڵی خودا لەدەستدا. یەکێك لەئەفسەران کەلەشوێنی لەسێدارەدان ئامادەی هەبوو بۆی باسکردم یەکێك لەبکوژەکان بەزۆرو پاڵەپەستۆ رەوانەی شوێنی لەسێدارەدان دەکراو خۆدی ئیسلامبولی پرسیاری لەشێخێك دەکرد کەبۆبیستنی وەسییەتی کۆتاییان هاتبوو، پرسیاری لێدەکرد:((ئایا ئێمە کارێکی دروستمانکرد؟ ئایا کاری من دروستبوو؟)) دڵم لەتاڵی ئەمانە ژانی دەکرد.

بوونم لەئەمانە پڕبوو لەنەفرەت. دەمتوانی هەستی پێی بکەم کەگیرۆدەی ئەم تاوانەبوونە سەرچاوە گرتوو لەئیمانێکی مەزهەبی بەهێز بەلام لەرێگایەکی خۆونکردن رۆیشتبن، بەلام تاوانباران لەناکاو لەدروستی کردەوەی خۆیان گیرۆدەی گومان ببن، وەك ئەوەی کەکوشتنی

ئەنوەر تەنیا گاڵتەیەکی ئەحمەقانە زیاتر نەبووە. بیلال کەسێکی نزیك پێغەمبەر، بەمەبەستی حاشاکردن لەئیسلامو پێغەمبەر لەلایەن هۆزی قوریش ئەشکەنجەی زۆرکرا. بەلاّم هیچ کاتێك دەستی لەئیمانی هەڵنەگرت. ژاندارەك کاتێك لەناو بلێسەی ئاگر وەستابوو، ئیمانی نەلەرزی. ئەم ترسنۆکانە هاوسەری منیان لەمن وەرگرتبوو، باوکی منداڵەکانی منیان کوشتبوو، روحی رێبەری ولاّتێکیان وەرگرتبوو. ئێستا دەیانوویست بزانن کارێکی دروستبووە یان نا، ئەم شك گومانانە ئەنوەریان بۆ ئێمە نەدەگەڕاندەوە.

سالێك دوای مەرگی ئەنوەر، بۆیەکەمجار سەفەری دەرەوەی ولاّتم کرد. سەردانی ئەمەریکام کرد تاکو میداڵیایی دۆستایەتی لەنانسی رێگان وەربگرم، میداڵیایەك دوای مەرگی هاوسەرم پێشکەشی دەکرا، سەردانی بریتانیام کرد، شوێنێك کەسندووقی نابینایانی لەندەنی گەورە منیان وەك ((ژنی ساڵ)) ناوبردبوو، دواتر سەردانی پاریسم کرد چونکە پاتریك واچمەن سەرنووسەری رۆژنامەی سیاسەتی نیودەولەتی، ئەنوەری وەك ((کەسایەتی ساڵ)) بەناو کردبوو. هەمان رێزو خۆشەویستی کەبۆمنو ئەنوەری هەبوو سەربەرزبووم، بەلاّم هەستم دەکرد نیوەی بوونم لەگەڵ مندا نییە. دوای گەڕانەوەم بۆقاهیرە، دەستم بەوانەگوتنەوەی زانکۆی قاهیرە کردو دەستم بەکارکردن لەسەر دکتۆرای خۆم کرد لەژێر ناوی رەخنەی ئینگلیزی لەسەر رەخنەگرانی میسری مەکتەبی رومانتیك لەنیوان دوو شەڕی جیهانی. خۆئامادەکردن بۆکتێبێك سەربارەت بەهاوسەرم، کەناوەڕۆکی ژیانی هاوبەشی ئێمەو میسر بێت، دووبارە خوێندنەوەی یادەوەرییەکانمو کۆکردنەوەی رۆژنامەو وێنەکان دەستم پێکرد.

زۆرکەس دەیانگوت ئەمەیان لەپێش سەردەمی خۆیدابوو، بەلاّم من رازی نەدەبووم. چۆن دەکرێت بیرۆکەی ئاشتیو کۆتایی هێنان بەشەڕ پێش کاتو زەمەنی خۆی بێت؟ نەخێر. هاوسەرم نوێنەری زۆرینەی خەڵکی میسربوو. بەپشتیوانی خودا، ژیانی خۆی وەك پەیامێك تێپەڕکرد، خۆی تەرخانکرد ببێتە قوربانی ولاّتی خۆی. ئەنوەر لەتەواوی ساتەکانیدا لەگەڵ ئامانجەکانی دەژیا، هیچ کاتێك لەدیدگای خۆیدا لاینەدا. خاکی ئێمەی ئازاد کردو ئاشتی بۆولاّتی ئێمە هێنایەوە. حکومەتێکی جێگرو بەهێزو یاسای، دەستووری ١٩٧١ پێشکەشکرد، چوارچێوەی گەشەی ئابووری دروستکرد. سانسۆری لەسەر راگەیاندن هەڵگرتو ئازادی بۆخەڵك گەڕاندەوە کەتاکو هەمان سەردەم کەس ئەمجۆرە ئازادییەیی نەدەناسی. زۆربەیان باسیان دەکرد:((ئازادی جوانترینو پیرۆزترین بەنرخترین بەرهەمی فەرهەنگی ئێمەیە.)) بەشێك

لەبەرژەوەندی خۆیان سوودیان لەم ئازادییە وەرگرت کەبەهیچ شێوەیەك هەڵنەدەهات. فێربوون‌و ئەزموونکردن‌و خۆگرتنی دیموکراسی پێویستی بەکات هەبوو.
کەسانێتریان تاوانبار دەکردن کەلەکاتی خۆیان لەپێشتربوون. بەم بیرکردنەوەیە رازی نیم. ژنانی موسڵمان، وەك ژنانیتر مافی خۆیانە کاراو کاریگەربن لەناو کۆمەڵگەدا، مافی خۆیانە لەتەنیشت یەکترو لەگەڵ پیاوەکان بۆبەرزکردنەوەی ئاستی ژیانی خۆیان‌و دەوروبەریان کار بکەن من تێکۆشانێکم دەستپێکرد کەپێشتر نەریتەکان دەمی ئافرەتی موسڵمانی دەبەستەوە، ئەمەیان ئیرادەی خوداو چارەنووسبوو. بەڵام هەوڵی زۆرمدا، بەڵام منو ئەنوەر هەردووکمان دەمانزانی‌و قبووڵمان کردبوو بۆ هەنگاوێکی پێشکەوتن، بۆ گۆرانێك، دەبێت بەهایەك پێشکەش بکەین. ئێمە بەویستی خۆمان ئەم بەهایەمان پێشکەش کرد.
ئێستا کەتەماشای رابردوو دەکەم، ئامادە نیم یەك سات لەژیانی خۆم بگۆرم، تەنیا داخباری من ئەوەیە ئەنوەر ئەوەندە زیندوو نەمایەوە کەپێکەوە خانەنشین بکرین. تێپەرکردنی ژیان پێکەوە لەهەش‌وهەوایەکی ئارام بەبێ بەرپرسیارەتی‌و پاڵەپستۆ، بۆ ئێمە وەك بەهەشت دەبوو. هەردووکمان زۆر چاومان لەژیانێکی نوێبوو: بینینی گەورەبوونی نەوەکانی ئێمەو پشوودان لەماڵەکەی خۆمان لەمیت ئەبوئەلکۆم، ئەنوەر دەیوویست لەهەمان شوێن دەست بەنووسین بکات. بەنزیك بوونەوە لەوەرگرتنی بیابانی سینا، زۆرجار بۆم باسکرد:((هیوا بەرۆژێك دەخوازم کەمن تۆ بەبێ پاسەوان‌و نەریتەکانی پێشوازی‌و برۆین بۆ ئەمەریکا یان ئەوروپا.)) وەڵامی دەدایەوە:((نیگەران نەبیت جیهان دەرۆین.)) بەڵام ئەمەیان هیوایەکبوو هیچ کاتێك بەئامانجی خۆی نەگەیشت.
ئێستاش بەشێوەیەك بەردەوامی بەژیان دەدەم کە ئەنوەر زیندوویە، نەك وەك زۆر لەژنانی کەدەبن بەبێوەژن‌و لەماڵ دەمێننەوە بۆکارەساتی خۆیان فرمێسك دەرێژن. من ئێستاش تێکۆشان دەکەم بۆئاشتی، بۆزیاترو باشتر بوونی ئاستی ژیانی هەژاران، بۆپەروەردەی کەسانی کەم ئەندام، بۆدروستکردنی کەشێکی دڵسۆزو خۆشەویستانە بۆمنداڵانی بێ دایك‌و باوك، بەوەرگرتن‌و زیاتر کردنی مافی ئافرەتان. من باوەر دەکەم نییەت پاك‌و راستەقینەی ئێمە وەك تاك لەکاتی هاوکاریکردنی کەسانیتر دەردەکەوێت. دڵم دەوێت بیر بکەمەوە کەئەنوەر دەبینێت من چیدەکەم‌و شانازی بەمن دەکات.

ئیتر هاوسەرگیری لەگەڵ هیچ کەسێکدا ناکەم، تەنیا بیری لێناکەمەوە کەڕۆژێك لەرۆژان ناوی خێزانی خۆم بگۆڕم. تەنیا شتێك کەهەمووکاتێك دەموویست هەمان هاوسەری ئەنوەریمو لەتەنیشتی راوەستم. بەبوونی ئەم لایەنە من لەناو خەیاڵەکاندا ناژیم. ئەنوەر رۆیشتووە من دەبێت بەردەوامی بەژیان بدەم. من باوەڕێم بەئەمڕۆ سبەینێ هەیەو ئەمڕۆو سبەینێ لەژیان بەردەوامم. تەنیا خودا تەواوە، بەلاَم وەك مرۆڤێك تێدەکۆشم تاکو لەدونیادا بمێنمو لەتوانام دابێت مرۆڤێکی باشبم. من دەزانم دوای مەرگ من هاوسەری خۆم دەبینم.

لەئەنجامدا میسرییەکان رێز لەخزمەتەکانی کەئەنوەر بۆولاَتی خۆیکرد دەگرن. شوێنی راستەقینەی لەمێژوو پێدەبەخشن. بەپشوو درێژی چاوەڕێی دەکەم. نووسینو وتارەکانی پەیوەندییەکانی تەلەفۆنی لەگەڵ رێبەرانی جیهان کۆکراینەتەوە. باوەڕ دەکەم رۆژێك مۆزەخانەیە بۆکارەکانی دروست دەکرێت.

لەماڵی ئێمە لەدوورگەی جیزە، هەموو پێویستییەکانی تایبەتی بۆدانان لەمۆزەخانە کەدەبێت رۆژێك دروست بکرێت دەپارێزم. زۆرجار سەردانی ژووری نووستنی دەکەم تەماشای جلوبەرگەکانی دەکەم بەتایبەتی جلوبەرگەکانی سەربازی کەلەرۆژی کۆتایی ژیانی پۆشیبوون. کاتێك لەنەخۆشخانەم وەرگرتن نەموویست خاوێن بکرێنەوە یان شوێنەکانی هەڵدراوی وەك خۆی لێبکرێنەوە. بەهەمان کون کونبوونی شوێنی گولەکان لەسەر شانو سەر کەمەری قاوەیی رەنگی، دەستی هەڵدراوی راستی، کەپزیشکان بۆ گەیاندنی خوێن هەڵیاندڕاندبوو، وەك خۆی هەڵواسرابوون. کولاَوی سەربازی خوێناوی لەوانەیە خوێنی ئەنوەر نەبێت، چونکە لەکاتی تەقەکردن کولاَوی سەربازی لەسەر نەبوو.

جلەخوێنینەکانی ژێرەوەی وەك خۆی لەناو دۆلاَبی جلوبەرگەکانی هەڵگیراون. ئێستا هەموویان رەقو قاوەیی هەڵگەڕاون. ئەمانەم بۆرۆژێك هەڵگرتوون کەمیسر بۆشانازی کردن بەهاوسەرم ئامادە بێت، ئامادە بۆناسینو رێزگرتنی، نەك تەنیا بۆئەوەی ئەم پیاوە بەتەنیا بۆولاَتی خۆیکرد، بۆئەوەی کەلەئاست هەموومانی کرد.



## بەشی پانزدەهەم
## وتەی کۆتایی

شەش ساڵ بەسەر مەرگی هاوسەرم تێپەڕبوون بۆمن ساڵەکانی زۆر دژوار بوون. دەبێت چیم کردبا؟ چۆن دەبێت لەژیان بەردەوام بم؟ حکومەتی میسر بەهەمان شێوە کەبەڵێنی دابوو، مانگانەی منی پێشکەش دەکردو من بەردەوامبووم لەوانەگوتنەوەی ئەدەبیاتی عەرەب لەزانکۆی قاهیرە، بەڵام ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاتر هەستم بەبێ ئۆقرەیو ناجێگری دەکرد. لەساڵی ١٩٨٤، ڕۆژێکیان دکتۆر جیمز هۆڵدرمەن سەرۆکی زانکۆی کارۆلینای باشوور، سەردانی کردم. ئەم زانکۆیە لەساڵی ١٩٧٩ دکتۆرای شانازی پێشکەش کردبووم، دۆستایەتیم لەگەڵ دکتۆر هۆڵدرمەنو خێزانیدا هەبوو. دوای مەرگی ئەنوەر هۆڵدرمەنو هاوسەرو کچی بۆئەوەی هاوخەمی خۆیان نیشانبدەن سەردانی میسریان کرد. ئێستا دکتۆر هۆڵدرمەن لەهۆڵی ماڵی ئێمە لەجیزە دانیشتبوو پێشنیاریکرد من بۆگۆڕینی هەلومەرجو وانەگوتنەوە سەردانی ئەمەریکا بکەم. دوای قسەکردن لەگەڵ منداڵەکانم بڕیارمدا بەقسەی گۆڵدرمەن بکەم. ئێستاش پەشیمان نیم.زستانی ساڵی١٩٨٥ لەواشنتۆن کەخانوویەکدا تێپەڕمکرد کەسوفی ئینگلهارد لەچاکەی خستیە خزمەتم.

یەك ڕۆژ لەهەفتەدا، وانەم لەسەر شوێن و جێگای ئافرەت لەولاّتانی تازە گەشەکردوو لەزانکۆی کارۆلینای باشوور پێشکەش دەکردن، لەواشنتۆن هەوڵمدا بۆڕێکخستنی کۆبوونەوەیەك لەزانکۆی ئەمەریکا، ئەم زانکۆیە منی وەك مامۆستای پسپۆری هەڵبژاردە بۆ وەرزی بەهاری. ئەم کۆبوونەوەیە بەناوی ((ژنان لەناوجیهانی لەگۆڕاندا.)) زۆر سەرکەوتوو کارەکانیکرد ئەم سەرکەوتنە بەتەواوی قەرزاری هاوکاری هاوڕێیانی خۆشەویستم ڕۆژالین کارتەر، بتی فۆرد، جین کرك پاتریك، کورتا کینگ، باربارا بۆش و بارباراوالتەرز بوو. دکتۆر هوڵدرمەن ڕاستی دەکرد من عاشقی گۆڕانکاری جۆراوجۆری ململانێی ژیان و وانەگوتنەوە بووم لەئەمەریکا. قوتابیانم لەزانکۆی واشنتۆن و کارۆڵینای باشوور، گەنجانی بێ شێڵەو بێڵەو ساف و سادەو، قسە لەڕوو، ڕاشکاوبوون دەیانوویست لەبچوکترین لایەنی ژیانی من لەمیسر بزانن. بێگومان زیاتر لەوەی ئەوان لەمن فێربن من زیاتر لێیان فێردەبووم. کاتێك لەساڵی ١٩٨٦ داوا لەمن کرا دیسان بۆوانەگوتنەوە سەردانی زانکۆی کارۆڵینای باشوور بکەم وەك مامۆستای پسپۆر لەزانکۆی رادفۆرد لەویرجینیا بەهەمان شێوە وانە بلێمەوە، زۆر بەدڵ و ویست قبووڵم کرد.

لەیەکەم زستانی مانەوەم لەئەمەریکا بەمانای ڕاستەقینە کاروبارەکانم زۆربوون، تەواوی کاتی خۆم تەرخان دەکرد بۆ بابەتی وانەگوتنەوەم و سەفەرەکانی ئاسمانیم بۆهاتن و ڕۆیشتن، نەك تەنیا لەنیوان ویرجینیاو کارۆڵینای باشوور، بۆسەرتاسەری ئەمەریکا بۆوتار پێشکەش کردنم لەسەر پێگەی ژن و پێویستی جیهان بەئاشتی، لەبەر ماندوو بوونی زۆر بێچارە دەبووم، بەلاّم لەسەرەتا پێویستیم بەلایەنی دارایی دەبوو چونکە پێشتر هیچ کاتێك ناچار نەبووم بەهەڵسوڕاندنی ژیانم کار بکەم، هەمان مووچەی کەوەك سەرۆکی ئەنجوومەنی منوفیە وەرم دەگرت پێشکەش بەکارگەی دەرمانی تلام دەکرد، لەهیچ شوێنێکیتر مووچەم وەرنەدەگرت.

لەهەمان کات بۆوەرگرتنی دکتۆرای خۆم لەسەر ڕەخنەی ئەدەبی لەزانکۆی قاهیرە کارم دەکرد. دەبێت بابەتی دکتۆرام بێ کێشە دەبوو، چونکە دەمزانی لەمیسر بەوردی پێداچۆنەوەی پێدا دەکرێت تاکو ئەوکات کەسانی دژی من و بەتایبەتی هاوسەرم بوونیان هەبوو. لەهاوینی ١٩٨٦، لەکاتی ڕۆیشتنم بۆهۆڵی ئەزموون لەناو زانکۆ دڵم بەتوندی لەلێدانی بەردەوامبوو. هاوڕێیانم، بۆدڵگەرمیی و هاندانم سەدان دەستە گوڵیان ڕەوانەی زانکۆ کردبوون. کاتێك کەبۆماوەی سێ کاتژمێر ئەزموون وەلاّمدانەوەی پرسیارەکان هەستم دەکرد پرسیاری زۆر قورس دەکەن بەلاّم هەستم دەکرد لەناو باخێکی جواندام. دوای کۆتایی تاقیکردنەوەو

ئەزموون، کچی بچووکم جیهان لەبەر پرسیارەکانی توندی مامۆستایەکی پسپۆر رەخنەی توندی لێگرت. دکتۆر ئیبراهیم عەبدۆلرەحمان بۆی باسکرد:((هیچ چارەیەك نەبوو، نەمدەویست بچوکترین گومان لەبیری کەسێکدا دروست ببێت کەنەرمی بۆدایکت دەنوێنین. دایکی ئێوە بۆ نیشاندانی کەلەوەرگرتنی پلەی دکتۆرای مافی خۆی بێت دەبێت زانیاری زیاترو توانای زیاتری لەداواکارانیتری ئاسایی پلەی دکتۆرا لەخۆی نیشان بدابان.)) کاتێك دکتۆرای خۆم بەپلەی بەرز وەرگرت، زۆر هەستم بەرازیبوون دەکرد. ئێستا کاتم لەنیوان جیزەو کارولێنای باشوور دابەشکردووە، شوێنێك کەلەساڵی ١٩٨٥ کاتێك زانیم کەقەرزی خانووبەرە زۆر نزیکە لەکرێی خانوو، خانوویەکی بچوکم کڕی، ئێستا خاوەن ژیانێکی ئارامم هەیە لەچاو ژیانی بەردەستی سەربازی هاوسەرم، تێپەڕ دەکەم. لەپاییزی ساڵی ١٩٨٦، بۆتەواوکردنی کتێبی خۆم داوای پشوودانم لەهەردوو زانکۆ کرد. بینیم دوای ماوەیەك شێتانە بۆهەموو شوێنەکانی وڵات پشوودان لەماڵەوە زۆر خۆش‌و دلگیرە. بەتایبەتی تەماشاکردنی بەرنامەی خۆشەویستم لەتەلەفزیون زۆر چێژم دەبرد: کاتی هەواڵەکان مەك نیل لیرر، فیلمەکانی جوانی نەشناڵ جوگرافیك، پێشبرکێیەکانی وەرزشی وەك تۆپی سەرمێز، خلیسانی سەر شەختە، وەرشی خۆشەویستی نوێم باسکە. لەمیسر منو ئەنوەر وەك زۆر خەڵکی میسر لایەنگری توندی یاری تۆپی پێی بووین هەوڵی خۆمان دەدا هەموو یارییەکان ببینین. دەبێت لەنیوان خەڵك خۆمان بەبێ لایەن نیشاندابا ئێستا دەتوانم لەلایەنگری خۆم بۆتیپێکی خۆشەویستی خۆم رابگەێنم، بێگومان هەمووکاتێك لایەنگری تیپی باسکەی زانکۆی جۆرج تاونم. هاوڕێیانم لەمیسرو هاوڕێیانی نوێم لەئەمەریکا زۆرجار پرسیاریان لەمن دەکرد دوای تێپەڕکردنی ژیانێکی خۆش‌و شایستە وەك هاوسەری سەرۆککۆماری میسر، ئێستا خاوەنی ئەم ژیانە سادەی خۆتی؟ بەلآم من هیچ کاتێك دڵم بۆهەمان ژیانی خۆش‌و شایستە تەنگ نەدەبوو. بەپێچەوانە، لەسەربەخۆیی خۆم شانازی بەخۆمەوە دەکەم. وەرزشم لەهاوینان کورتکردن‌و برینی چیمەنی ناو حەوشەی خۆم‌و زستان بەفر فڕەدانە. دراوسێیەکانم لەویرجینیا خۆشەویستی زۆریان بۆمن هەیە من بۆ بۆنەکانی نەریتی خۆیان بانگێشت دەکەن، وەك جەژنی سوپاسگوزاری‌و جەژنی کریسمەس بانگێشت دەکەن ئێواران بۆخواردنەوەی چاو قسەکردن سەردانی ماڵم دەکەن. لەحوزەیرانی ١٩٨٦ کاتێك نۆهییەو هاوسەری حەسەن‌و چوار منداڵیان هاوڕا لەگەڵ جەماڵ‌و دیناو کچەکەیان یاسمین، سەردانیان کردم، جیرانەکانم بێشکەو پایسکل یاری منداڵنیان بەقەرز پێشکەش کردم‌و

منداڵانی گەورەیان لەگەڵ خۆیاندا دەبردن بۆ کەناراوەکان. هەموومان پێکەوە بۆگەشتکردن لەپارکی تایبەتی کینگز دۆمینیۆنو بینینی باخچەی ئاژەڵان رۆیشتین. بینینێك کەتاکو ئێستاش نەوەکانم باس دەکەن. حوزەیرانی ئەمساڵ کچم لوبناو هاوسەری عەبدولخالقو دووکچیان، ناناو تۆهییەو خێزانەکانیان، سەردانم دەکەن.

هاوڕێیانی کەمنو ئەنوەر لەسەردەمی ئەنوەر لەئەمەریکا ببوون بەدۆستی ئێمە تاکو ئێستا وەك خۆیان وەفادار ماون، بەتایبەتی نانسی رێگان، چەندینجار لەکۆشکی سپی سەردانم کرد. هێنری کیسەنجەر. زۆرجار تەلەفۆن دەکاتو لەحاڵم دەپرسێت، دۆستی خۆشەویستم باربارا والتەرز. دیوید راکفلەر لەبەرامبەر خێزانمدا دڵسۆزی خۆی نیشاندا. لەزستانی رابردوو بەرنامەیەکی رێکخست کەکورم جەماڵ دەوری ئەزموونی خۆی لەبانکی مەنهەتەنی نیونیۆرك تێپەڕ بکات. ئێستا کەدەبینم کوڕمو خێزانی لەئەمەریکا نزیك لەمن دەژین زۆر خوشحاڵم، هەرچەند ئەوان لەنیویۆرکو من لەویرجینایی باشوورم بەڵام بەردەوام لەرێگای تەلەفۆن پەیوەندیمان بەردەوامنو نیوانمان بەفرۆکە تەنیا کاتژمێرێك درێژ دەبێتەوە نەك وەك دەکاتژمێر بۆمیسر کەلەنیوان منو منداڵەکانی دووری دروست دەکات. لەئاداری ١٩٧٨، جەماڵو دینا بوون بەخاوەنی کچی دووەمی خۆیان ناویان لێناوە نور.

بەبوونی ئەم هەموو لایەنانە تاکو ئەم ڕادەیە دوور بوون لەمیسر بۆمن ئاسان نییە زۆرجار گیرۆدەی خەمو غوربەتی دوورە وڵات دەبم. دڵم بۆبچوکترین لایەنەکان تەنگ دەبێت. فیلمەکانی ڤیدیویی میسر تەماشا دەکەم، گوێی لەگۆرانییەکانی ئوم کەڵسوم لەناو ئۆتۆمبێل دەگرم، پەیوەندی تەلەفۆنی بەردەوامن هاوڕێیانم لەقاهیرە پەیوەندی دەکەن، زۆربەی هاوڕێیانم پەیوەندیمان هەیە. خاتوونی شازادە فەوزییە، شازادەی جەددە، لەبۆنەکانی جیاواز لەسعودیا پەیوەندی تەلەفۆنی لەگەڵ مندا هەبوون، شیخە فاتیمە لەئەبوزەبی، فەرەح دیبا لەماڵەکەی لەئەمەریکا، کچەکانم هەفتەی جارێك پەیوەندیان لەمیسر دەکرد، بەڵام زۆرجار پەیوەندییەکانی ئەمانە هەستێکی نەخۆشی دووریان لەدەرونم دروست دەکرد، دەموویست لەنزیك بەدیداریان شادبم، نەوەکانم لەباوەش بگرم، بەچاوی خۆم ببینمو پشتراستبم کەهەموشتێك باشە. بەڵام ئەمەیان رێگایەك نەبوو کەرۆژگار بۆی دیاری کردبووم.

داوام لەهاوڕێیانی نوێی خۆم لەئەمەریکا دەکرد لەمیسر سەردانی من بکەن دەزانم بەم سەردانەیان خوشحاڵ دەبن. میسرییەکان کەسانی زۆر دڵسۆزو خۆشەویستو خۆش هەڵوێستن

لەگەڵ خەڵکی هەموو دونیا. پرستگەو ئاسەوارەکانی کۆنی میسر لەسەر سورهێنەرترینەکانن. خۆر لەسەر رووباری نیل دەدرەوشێتەوە. خەڵك بەدەنگی بەرز لەسەر شەقامەکان بەخێرهاتنی بیانییەکان دەکات:((بەخێربێن بۆمیسر، بەخێربێن بۆوڵاتی ئێمە!)) ئەگەر کەسێك ویستی سەردانی میسر بکات، نابێت دوابخرێت. ئێمە وڵاتی ئاشتین، ئاشتی میراسی شانازی هاوسەری منە.

ساڵانە هاوینان، ئەگەر بتوانم بۆنەکانی ئاینیو جەژنەکانی نیشتیمانی دەگەڕێمەوە بۆمیسر، بێگومان لەشەشی تشرینی یەکەم بۆرێزگرتن لەهاوسەرم. بۆگەڕانەوەی میسر رۆژەکان هەژمار دەکەم. هەمووجارێك سەردانی ناوەندی ئیمانو ئومێدو کارگەی درومانی تلا دەکەم، هەرچەند سەرۆکایەتی هیچ یەکێك لەم دەزگایانەی خێرخوازی ناکەم. چونکە بەردەوام لەسەفەردا دەبووم بەباشم نەدەزانی سەرۆکایەتی ئەم ناوەندانە لەدەستخۆمدا بگرم.

تێکۆشان بۆمافی ئافرەتان بەردەوامە. لەساڵی ١٩٨٥دیوانی باڵای میسر گۆڕینی یاسای باری کەسی هەڵوەشاندەوە. هەڵوەشاندنەوەی ئەم یاسایە سەرکەوتنێکی گەورەبوو بۆنەریتخوازانی ئیسلامی کەبەردەوام پێداگریان دەکرد یاسای پشتیوانی ئافرەتانو تەلاق لەگەڵ لۆژیکی شەریعەتدا نییە. بێگومان رێکخراوەکانی ئافرەتان دژی هەڵوەشاندنەوەی ئەم بڕیارە دەستیان بەتێکۆشان کردو داوای گەڕاندنەوەی دووبارەی ئەم یاسا بۆ پەرلەمانیان دەکرد. دوو سێ مانگ دوای هەڵوەشانەوەی. کاتێك لەساڵی ١٩٧٩ کاتێك ئەم یاسایە لەلایەن دادگای تێهەڵچوونەوە وردبوونەوەی لەسەرکرا هیچ جۆرە ناکۆکییەکی لەگەڵ یاسای ئیسلامیدا نەبوو جارێکیتر لەپەرلەمان دەنگی لەسەر درایەوە، ئەمەیان جاری دووەم بوو کەلەسەر یاسای باری کەسی سەر دەکەوتین. بەڵام دژایەتی ئافرەتان بەردەوامو ریشەی قووڵی خۆی هەبوو. لەهاوینی ١٩٨٧ یاسای هەڵبژاردنی پێشنیارکراوی هاوسەرم کەلەتایبەت کردنی کورسییەکانی پەرلەمان بۆئافرەتان لادرا. تێکۆشان کۆتایی نییە.

نووسینی ئەم کتێبە بۆمن زۆر دژواربوو. هەندێك یادەوری بۆزیندوو دەکردمەوە کەمیوام دەخواست لەیادیان بکەم، ساتەکانی ئارامو خۆشیو شادی کەئیتر نابینم. وێنەکانی زۆر لەمنداڵەکانمو ئەنوەر بەدیواری ماڵەکەم لەویرجینا هەڵواسرابوون تاکو بتوانم رۆژانە ئەمانە ببینم، وێنەیەك لەهەمووماندا لەئیسماعیلییە پێش رۆیشتنی ئەنوەر بۆقودس، وێنەیەك لەمنو ئەنوەر لەگەڵ جەنابی کارتەرو خاتوو کارتەر لەکەمپ دیوید لەکاتی پێشبڕکێی ئۆتۆمبێلەکانی

سەر بەفر، ئەنوەرو یاسمین لەناو باخی ماڵی خۆمان رۆژی پێش مەرگی. وێنەی کۆتایی ئەنوەر، بەزەردەخەنە، کاتی تەماشاکردنی فرۆکەکانی جێت لەئاسمانو رێورەسمی سەربازی شەشی تشرینی یەکەمی ١٩٨٠. ساتەکانیتر لەدونیا نەما.

لەبەرخاتری بەهێزییو باوەڕبوونی بەمن توانیم بەردەوامی بەژیان بدەم. دواتر تەواوی کێشەکانی کەبینیمو لایەنەکانیتری بەرفرازوان تاکو ئێستاش بەهێزم. دەبێت لەسەر پێیەکانی خۆم رادەوەستامو ژیانی نوێم بەبێ هاوسەرم دەست پێکردبا. نەك داوای ئاوڕدانەوەم لەکەسێك کرد نەکەسێك ئاوڕیی لێدامەوە. من خۆم بەتەنیاییو بەپتەویی رێگای خۆم دروست دەکەم. وەك ژنێکی میسری لەم لایەنەوە بەخۆمەوە دەنازم.

# ژنێك لە میسر

میسر وڵاتی فیرعەون و قبتی و پاشا و مەلیك و سوڵتان و جنراڵ و داگیرکارانی بێگانە بوو. جیهان سادات وەك کچێکی نیوە میسری و نیوە بریتانی و هاوسەری سەرۆك کۆمار دەبێتە بەشێك لەم مێژوو دوور و درێژ و تێکەڵاوی وڵاتی میسر. بە بیرکردنەوەکانی بۆ هەموو سەردەمانێکی مێژوویی دەگەڕێتەوە، دەیەوێت گۆڕانکاریی سیاسی و کۆمەڵایەتی دروست بکات، چاکسازیی ئایینی بکات بۆ خەڵکی هەژاری میسر کە لە ناو نەریتەکانی کۆندا بەجێمابوون. جیهان سادات هەوڵدانێکی زۆر دەکات بۆ دروستکردنی ئاشتی لە نیوان گەلان و ئایینەکانی جیاواز. هەوڵیدا شارستانییەتی میسر لەسەر بنەمای پێشکەوتنخواز دامەزرێنێتەوە و شارستانییەتی کۆن وەك گەورەیی بۆ میسر نیشان بدات. تەواوی ئەم هەوڵدانانەی بە هاوکاری هاوسەری ئەنوەر سادات بوون.




کۆمەڵگای فەرهەنگی ئەحمەدی خانی
KOMELGEHA FERHENGÎ YA EHMEDÊ XANÎ

ISBN: 9784525723132
9 784525 723132